


ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: هەورەکانی دانیال
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ۲۰۱۵
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (۱۰۰۰) دانە
نرخ: (۱۲۰۰۰) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (۱۲۷٦)ی ساڵی (۲۰۱۵)ی پێدراوە.





ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# ١

مامه سیامەندم پێیگووت کە «کوشتن لە خەوندا بە یەکجار و بە یەک گوژمی کتوپڕ ڕوونادات، کوشتن چەند کتوپڕ دیاربێت، هەر لەسەرخۆ و هەنگاو بە هەنگاو هاتۆتە پێشێ ... دەبێت شتێک لە ژیانتدا هەبێت، یاخود ڕوونتر و ڕاستتر قسەبکەم، دەبێت شتێک لە ژیانماندا هەبێت وای لە تۆ کردبێت ئەم خەونە ببینیت».

خولیای بینینی جەستەی خۆی بە مردوویی هەموو خەیاڵی داگیرکردبوو. چەند شەوە بەردەوام خەونی لاشەکەی خۆی دەبینێت، لە خەو و لە زیندەخەودا، بە جۆری جیاواز جیاواز، بەڵام زۆربەی جار وەک سەرێکی بڕاو کە لاشەکەی لە حەوزێکی لیخندا سەر ئاو کەوتووە، خۆی دێتە پێش چاو. لە خەونەکەدا سەر و ڕوخساری سەراپا قەوزەیە، قژی شەپۆلێکی هێمنی ئاو یاری پێدەکات، هەردەم لە خەیاڵاتەکانیدا چاوانی خۆی بە نوقاوی دەبینێت، تا ئێستا جارێکیش نەبوو چاوانی کراوە بن، بە جۆرێکی سەیر و توند و بێڕەحمانە چاوانی نوقاندوە، وەک بیەوێت هەم مەرگی خۆی و هەم سیمای بکوژەکەی نەبینێت. هەمیشە لەو ئاوە بۆر و دزێوەدا کە لەگەڵ ڕەنگی سپی جەستەی ئەودا نەدەگونجا مەلەیدەکرد. وەک لە عیادەکەی مامم باسیکرد، شەوی پێشووتر لە خەونەکانیدا لەو حەوزە لیخنەی مەرگدا خۆی بینی بوو، ئاوەکە بۆن مەرگێکی توندی

لێهاتبوو، بۆنەکە هەراسانی کردبوو، وەها کەسکون و چڕبوو وەک لە گەنینی چەندین لاشەوە بێت، هێند بەهێزبوو لە خەوی هەستان، وەک ئەوەی نەزانێت بۆنی ئەو هەموو مەرگە لە خەونەکانییەوە دێت یاخود هەر بە ڕاستی لە هەوای هاوینەی ژوورەکەدایە، بە پڕتاو پەنجەرەکانی کردبووەوە ... هەموو پەنجەرەکان ... تەواوی پەنجەرەکانی ماڵەکەی، چ لە نهۆمی خوار و چ لە نهۆمی سەرەوە، وەک ئەوەی کردنەوەی پەنجەرەکان بتوانێت ئەو بۆنە سامناکە لە خەونەکانی دەربکات و هەوایەکی تازە بهێنێتە خەیاڵییەوە. دەمەو ئێوارە کە بە ماندوویی هات بۆ عیادەکەی مامم، هێندە ماندوو دیاربوو کە بەردەوام بە دەستەسڕێکی سپی عارەقی دەسڕی. دووجار داوای ئاوی ساردی کرد و من بۆم هێنا تا وەک خۆی دەیگووت «ڕۆحی فێنک بکاتەوە». ئەو کات دوو هەفتە زیاتر بوو بەردەوام دەهاتە «دەروونخانە» کەی مامم تا شتێک لە ناخی خۆی تێبگات. هەموو بە میرئەودال بانگیاندەکرد، من نەبێت کە بە زمانێکی ڕەسمی و وشک، بەڵام پڕ ڕێز و بێخەوش بانگمدەکرد «جەنابی میر»، جۆرە بانگهێشتێک کە هەندێ جار دڵخۆش و هەندێ جاریش توڕەیدەکرد. بۆ خەونی بە مردنی خۆیەوە دەبینی؟ ... نەیدەزانی. نە دوژمنی هەبوو، نە ئەو کەسەشی دەناسی کە لە خەونەکەیدا دەردەکەوت و سەری دەبڕی، زوو زوو بە حەسرەتەوە بە مامی دەگووت «پێدەچێت ئەم خەونە باوەحیزە لە خوێنمدا بێت». ئەوە چەند هەفتەیە بەردەوام خەون بە مردنی خۆیەوە دەبینێت. ئێستا ئارەزوویەکی تاریک لە ناخیدا بوو، دەیویست ئەو قەسابەی ناو خەونەکانی خۆی بدۆزێتەوە و بیکوژێت، یان هەر کەسێکی دی داپاچێت کە لەو بچێت. ئەوە ئارەزوویەکی کوێر و تاریک و بێهۆ بوو کە لە ناخەوە میرئەودالی ئازاردەدا.

میرئەودال کە لە عیادەکەی مامم دەرکەوت، ڕۆژێکی گەرمی هاوین بوو، گەرچی زۆربەی شوێنە پزیشکییەکان ماوەیەک بوو کەرەستەی

فێنککردنـەوەی نوێیـان بەکاردەهێنـا، بـەڵام لـە عیادەکـەی ئێمـەدا، وەک بیسـت سـاڵ لەمەوبـەر، پانکەیەکـی کـۆن، بـە جـۆری جانەوەرێکـی گێژ و مانـدوو لـە سـەقفەکەدا دەسـوڕایەوە. مامـە سیامەندم، کـە نزیکەکانـی بـە دکتـۆر سـیا بانگیاندەکـرد، عادەتـی بـوو یەکـەم شـت بەروانکـەی سـپی دکتۆرەکان بپۆشێت، چاویلکەیەکی شێوە پزیشکی دەکردە چاوی و وەک لە ستۆدیۆیەکی تەلەفزیۆندا خۆی بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەیەک ئامادەبکات، لـە پشت مێزەکـەی خۆیـەوە تەیار و لـە خۆڕازیـی دادەنیشـت. گەرچـی چاوانی لاواز نەبوون، بەڵام حیرسێکی زۆری هەبوو نەخۆشـەکان بە بێ چاویلکە نەیبینن. گەر چاویلکەکەی پاکبکردایەتـەوە، پێشـتر دەرگاکەی توند دادەخسـت و وەک لـە ناوەڕاسـتی مەراسـیمێکدا بـە دزییـەوە دەرپێـی ژێرەوە بگۆڕێت، لەسـوچێکدا چاویلکەکـەی دادەگـرت و پاکیدەکـردەوە و دەینایـەوە سـەر کەپـووی. عیادەکەمـان شـوێنێکی کـۆن و پیسـبوو، بـەڵام جـل و بەرگەکانـی مامـم تابلێـی نوێ و تـەڕ و تەمیـز بوون. هـەر نەخۆشـێکی بپشـکنیایە سـەرەتا دەستکێشـی لـە دەسـتدەکرد. هەرگیـز نەمبینیبـوو تەوقـە لەگـەڵ نەخۆشـێکدا بکات. پیاوێکی مۆن و خۆ بەزلـزان نەبوو، بەڵام بڕوایەکی عەجایەبی هەبوو کـە نەخۆشییە دەروونییـەکان وەک زۆربـەی نەخۆشـی تر، بـە بەریەککەوتنی جەسـتەیی، لـە ڕێگای پێسـتەوە، لـە ڕێگای بەکارهێنانـی کەلوپەلـی یەکدییـەوە دەگوازرێنـەوە. بەدرێژایـی ژیانـی لـەوە دەترسـا دەردی یەکێـک لـە بیمارەکانـی خـۆی بگرێـت. بـە پێکەنینـەوە لاقرتـی بـە ترسـی خـۆی دەکـرد و دەیگـووت «چـۆن تاوانبـارە ڕاسـتەقینەکان لـە ترسـی شـەیتانەکەی نـاوَ خۆیـان دەبـن بـە پۆلیـس، نەخۆشـە ڕاسـتەقینەکانیش لـە ترسـی دەردی خۆیـان دەبـن بـە دکتـۆر». بـەڵام بـە هەڵـە تێمەگـەن و حوکمـی خێـرا مەوەشـێنن، ئـەو هەمیشـە پیاوێکـی بـاش و دەم بـە خەنـدە نەبـوو، خاڵـی نەبـوو لـە خۆویسـتی و لـە خواسـتی گەورەبـوون و هەڵکشـانی زۆر. گەرچـی مـن سـەرەتا بـە عاتیفـەی بـرازا سـەیرمدەکرد، وەک دکتۆرێکـی دونیادیـدە کـە ئەوروپـای دیـوە لێـم

دەروانی، بەڵام ئەو بە هۆی بەدسوودی و هەلپەرستییەکی شەیتانییەوە «کە دواتر بۆم دەرکەوت، ئەوانە و هەندێ ئەخلاقی بەد و نەخوازراوی تر بەشێکی دانەبڕاوی کاراکتەری بوون» بەرپرسە لە هەندێک ڕووداوی ناخۆشی ناو ژیانی من... یان؟ نازانم ... ڕەنگە واش نەبێت، دواتر خۆتان هەموو شتێک دەبینن و دەتوانن بیربکەنەوە و حوکمێکی ڕاست و دروست لەسەر کۆی شتەکان و لەسەر مامە سیاشم دروستبکەن ... ڕەنگە من یەکێک بم لەوانەی گوناهی خۆم دەنێمە ئەستۆی ئەوانی تر، گەرچی بە ڕوکەش وادیارە کە شتەکان تەواو جیاواز و پێچەوانەن و من بەدرێژایی ژیانم کەسێک بووم گوناهی ئەوانی ترم خستۆتە ئەستۆی خۆم. یاخود بە دووری نازانم کە ژیانی من هەر لە سەرەتاوە بۆ تێکشکان دروست بووبێت، بۆ هەندێک یاری کە هەرگیز خۆمم بۆ ئامادەنەکردون. بەر لەوەی من بچم بۆ ناو چیاکان، ئێوارەیەک بە داوایەکی نوسراوەوە چوومە لای تا تکابکەم بوار بە «زەهاوی سۆفی عەبدی» بدات وەک هاوکار یاوەری سەفەرم بێت، کەمێک پێکەوە دانیشتین، ئەو کات چەندین ڕۆژ بوو نەمدیبوو، پێکەوە باسی ژیان و مردنمان کرد، ئەو گوتی «هەندێ کەس تەنیا بۆئەوە لە دایکدەبن تا مردن دووبارەبکەنەوە». «دووبارەکردنەوەی مردن» ئەوەی بە ئامانجی نهێنی هەموو بوونەوەرێکی زیندوو دەزانی. منی وەک یەکێک لەو بەدبەختانە دەبینی کە تەنیا لە بەرئەوە دەژیم، تا جارێک لە جارەکان مردن دووبارەبکەمەوە. سەرەتا کەسێکی خراپ نەبوو، هەتا ڕەفتار و هەڵوێستیشی بەرامبەرم شتێک لە باشەی تێدابوو، دەتوانم بڵێم تاکە غەمخۆری ڕاستەقینەی من بوو، بەڵام دەمێک لە دکتۆرێکی بچوکەوە کە هیچ کات نەخۆشێکی چاک نەکردۆتەوە، بوو بە لایەنگر و ڕاوێژکارێکی گەورەی دەوڵەت، پەیوەندی لەگەڵ منیشدا گۆڕانکارییەکی قووڵی بەسەردا هات. تا ئەو کاتەش کە منیان نارد بۆ ناو چیاکان، هەر نەمدەزانی مامم چ بایەخێک بە من دەدات، بەڵام دواهەمین ڕۆژەکانی پێکەوەکارکردنمان،

تێگەیشتم کە هیچ کات هەستێکی تایبەت یان عاتیفەیەکی قووڵ لە نێوان من و ئەودا نەبووە. ئەو کات کە وەک بەردەست لە عیادەکەی ئەودا دەست بەکاربووم، ناچاربووم هەموو شتێک قەبووڵبکەم. دڵنیابووم هەر نارەزایی و تورەییەکیش دەربخەم، باوکم دەڵێت «دەعبا ... دەتکەم بە قوربانی مامە سیات، ئەم چرت و پرتە چییە. کێ خوا دەیداتێ، لە بەردەستی عالمێکی وەها گەورەدا ئیشبکات». زۆربەی خزمانی نزیکمان مامە سیایان وەک زانایەکی گەورە سەیردەکرد، دەیانگووت، مرۆڤ لە دیلاوار نرخێکی نییە، گەر قەدر و قیمەت ببووایە، دەبوو لایەنیکەم ئەو وەزارەتێک وەربگرێت. هەڵبەت من دەمزانی کە دکتۆر زانایەکی گەورە نییە. خۆشی دڵنیابوو، بەلام بە جۆرێک حەزی لە پایە و مەقامی کۆمەلایەتی بوو، بەردەوام لە کۆششدا بوو زیاتر و زیاتر ئەو چیرۆک و ئەفسانانە لەسەر خۆی بلاوبکاتەوە. ئەو جۆرە ئەفسانانە وایاندەکرد، لە ناو بنەماڵەی «زەریاواری»دا هەیبەتێکی زۆری هەبێت، بەردەوام ناوی هاوشان بە ترس و رێزەوە دەهاتە سەر زمان. خزمەکانمان دروی زۆریان لەسەر زیرەکی و حیکمەتی ئەو هەڵدەبەست، دکتۆر نەوەک ئەو چیرۆکانەی بەدرۆ نەدەخستەوە بەڵکو شتی نادروستی دیکەی دەخستەسەری و زۆریشی بۆ زیاددەکردن. دەیگووت «بەڵێ، بەڵێ هەموو مرۆڤێک دەبێت ئەفسانەی خۆی هەبێت، ئەگینا خۆ نابێت بە مرۆڤ». هەمیشە وێنەی «زانایەکی غەدر لێکراو» ی دەدایە خۆی و چێژێکی زۆری لەوە دەبینی وەک مەزلومێک دەربکەوێت. ئەوکات لەگەڵ هەندێ دکتۆر و ئەکادیمیستی تردا، کە دڵنیام هیچیان زانای گەورە نەبوون، جەمعییەتێکی بچوک و نافەرمییان دروستکردبوو، ناوی «ئەکادیمیستە غەمگینەکانی دیلاوار» بوو. مامم، لەو جەمعییەتدا دکتۆر جاهداری ناسی کە دواتر پێکەوە تیورەیەکیان دانا، تیورەیەکی پوچ و پێکەنیناوی، کە کاریگەرییەکی گەورەی.لەسەر ژیانی خەڵکی دیلاوار هەبوو.

جەنابی میر پیاوێکی بە هەیکەل بوو، بەلام دەموچاوی مندالێکی هەبوو،

سەرێکی خڕ و جووتێک چاوی گەورە و کاڵ، پڕ لە ڕامان و سەرسامی. بەردەوام قات و هێلەکی لەبەردەکرد، هەر ڕۆژە و جۆرە بۆینباغێکی دەبەست، بەلام لەگەڵ ئەو سەرو ڕوخسارە مۆدێرنەیدا، تا خوا حەزبکات ئێلچی و عەشرەتی بوو، دەمارگیرییەکی بێوێنەی بۆ تایەفەکەمان هەبوو. جارێک بە مامە سیامی گووت «گەر تۆ سەر بە عەشرەتی زەریاواریی نەبایتایە، قەسەم بەخودا، عیلمی خۆت نەوەک لە بەریتانیا، بەڵکو لە تەبەقەی حەوتەمی ئاسمان بتخوێندایە، ڕازی خۆمم لا نەدەدرکانی». هەڵبەت میرئەودال مامی خۆش نەدەویست، بەلام هەر دەیویست دەماری ئێلگەرایی و عەشرەتچیتی خۆی دەربخات. لەو پیاوانە بوو کە شەرمدەکەن سەردانی پزیشکی دەروونی بکەن. پێشتریش لە عیادەکەدا، میوانی وەک میرمان کەم بوو. پیاوماقوولانی شار، سیاسەتمەدارەکانمان، خوێندەوارە ناسراوەکانمان خۆیان وادەردەخست وەک ئەوەی تووشی کێشەی دەروونی نەبن، شورەیی بوو یەکێکیان لای پزیشکی دەروونی ببینرێت. مامم زۆر لەوە پەستبوو، خەڵکی وایاندەزانی کە پزیشکی دەروونی تەنیا بۆ شێتەکانە. ئەو قینەی ناو دڵی وایکرد، دواتر سەدان خەڵکی ساغ بخاتە قەرەنتینەی دێوانەکانەوە، وەک بەوە بیسەلمێنێت کە دەسەلاتی پزیشکی دەروونی تەنیا بەسەر شێتەکاندا نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا بەسەر تەندروست و ساغەکاندایە. هەڵبەت هۆی ئەو ترسە لە پزیشکی دەروونی دەگەڕایەوە بۆ بڕوایەکی بەربلاو و گەمژانەی خەڵکی دێلاوار، گەر بیانبیستایە سیاسەتمەدارێک، هونەرمەندێک، دکتۆرێک، چۆتە لای دەروونناس، هەموو قاقا پێدەکەنین و دەیانگووت «بڕوانە کابرا مەملەکەت بەڕێوە دەبات، یان کابرا نوسەرێکی ناسراوە کەچی خۆی دەردی دەروونی هەیە... هاهاها ... توخودا شتی وادەبێت؟ بڕۆ بابە، لە بری کاروباری ولات، لە غەمی عەقلی خۆتدا بە». هەموو دەکەوتن بە پشتدا و پێدەکەنین و بە شتێکی عاجباتیان دەزانی، مرۆڤ ئیشێکی گرنگ یان بەهرەیەکی گەورەی هەبێت و

لەگەڵیشیدا بیماریێکی دەروونی بێت. مامە سیام هەموو ڕۆژێک لە کۆتایی دەوامدا و بەر لە داخستنی دەرگای دەروونخانەکە، دەستی بە دیتۆڵ دەشت و دەیگووت « ڕێنوار، زۆری دەوێت تا خەڵک لەم کارخانەی سەگەدا تێدەگەن دەروونیان هەیە». مامم شارەکەی بە کارخانە ناودەنا، کارخانەی سەگ، کارخانەی گورگ، کارخانەی مەیمون، کارخانەی گوو. باوەڕدەکەم مامە سیام لەوەدا لەسەر هەق بوو، شاری ئێمە باوەڕی بە جەستە، بە عەقڵ، بە ڕۆح هەبوو، بەڵام کەس باوەڕی بە دەروون نەبوو. جەنابی میر دوو هەفتەبوو، زۆربەی ڕۆژ دەهاتە لای مامم، دیاربوو گوشارێکی بێئەندازە وایکردوە ڕوو لە ئێمە بکات. یەکەم ڕۆژ گووتی «من پیاوێکی ساغم، بەڵام خەونەکانم کێشەیان تێکەوتووە». ئەو یەکەمین نەخۆشی ئێمە بوو لەوجۆرە خەونانە ببینێت. دکتۆر سیا دوو سێ ڕۆژی یەکەم، بەردەوام ستایشی میرئەودالی دەکرد، کە ئازایەتییەکی وەهای هەیە، دەوێرێت لە سەر دەروونی خۆی قسەبکات، ستایشی کەسێک خەونە تاریک و ترسناکەکانی خۆی هێناوەتە لای پزیشکی دەروونی. دوایی زانیم کە خاتوو «مرواری» هاوسەری «جەنابی میر» لە پشت ئەوەوە بووە جەنابیان پێ بە جەرگی خۆیاندا بنێن و بێترس ڕوو لە جێگایەک بکەن کە وەک خۆی دەیگووت، تەنیا شێت و شەپرێوەکان ڕووی تێدەکەن.

مامم هەموو قسە و دانیشتنەکانی خۆی لەگەڵ میوانەکانی دەروونخانەکەدا، بە ڕیکۆردێکی بچوک و کۆن تۆماردەکرد. شەوان دەبایە من ناوەڕۆکی کاسێتەکان بگوازمەوە سەر کاغەز. بۆ هەندێ نەخۆش دۆسیەی زۆر تایبەتی دەکردەوە، هەموو دۆسیەکانی لە جێگایەکی دووردەست و بەرزدا، لە ژووری خوێندنەوەکانی خۆیدا پاراستبوو. هەندێ لە نەخۆشەکانی خۆشدەویست، بۆ هەندێکیان دەگریا، زۆر جار بینیومە گریاوە، هەڵبەت بە دەنگی بەرز نا، بەجۆرێک نا ویقاری پیاوانەی بریندار بێت، وەک زۆرینەی دانیشتوانی ئەم شارە باوەڕی وابوو پیاو دەبێت بە جۆرێکی نهێنی و تایبەتی

بگری. زۆرجار کە ئازاری نەخۆشەکانی خۆی دەبینی، وەک پادشاهێک ئازارێکی نهێنی هەبێت، پاڵی دەدایەوە و بێدەنگ چاوانی پردەبوون لە ئاو و دەیگووت «دەروون دۆزەخە». من زۆر بە وردی گوێم لێدەگرت، چیرۆکی هەندێ لە نەخۆشەکانی زۆر ئازاریان دەدا، هۆکاری زۆر دەردی نەدەزانی. ڕای وابوو هەر کاتێک مرۆڤ زانی هۆکاری نەخۆشییە دەروونییەکان خودایە یاخود شەیتان، دەتوانێت لە نهێنی گەردون تێبگات. هەستمدەکرد بەردەوام دەیەوێت زانستە ئاڵۆز و پڕ کێشەکانی خۆی بە شتێکی نادیار و غەیبییەوە گرێبدات. من دەمبینی هەندێ جار ئیمانێکی بەهێزی بەخودا هەبوو، هەندێ جاریش کوفری دەکرد و لە بەرامبەر ژان و کەسەری نەخۆشەکانیدا، یەخەی ئاسمانی ڕادەتەکاند. هەندێ جار غەیب و خودای بە بەرپسی نەخۆشییەکانمان دەزانی، هەندێ جاریش هێور دەبووەوە و بیرو بۆچوونی دەگۆڕا و بە زمانێکی دی قسەیدەکرد. باوەڕی وابوو کە شوێنی شارەکەی ئێمە، ئاو و هەواکەی، چۆنێتی خواردن و جلوبەرگمان، هۆکاری سەرەکین بۆ دەرکەوتنی ئەم دەردانە. باوەڕێکی تەواوی هەبوو، هەموو ئەو زانست و زانیاریانەی خوێندونی کۆمەکی ناکەن لە دەردەکانی ئەم شارە تێبگات، ساڵ دوای ساڵ زیاتر تێدەگەیشت کە ناتوانێت بە ڕاستی هەتا یەک نەخۆشیش چاکبکاتەوە. بەڵام ئەو مامە باشەم، ئەو مامەم کە غەمی نەخۆشەکانی دەخوارد، هەمیشە وا نەبوو، دیوێکی تاریک و شەڕانی هەبوو، تەنیا چاوەڕوانی دونیا و ڕەوتی ڕۆژگاری دەکرد تا دەربکەوێت ... ڕۆژێک هات ئەویش زۆر گۆڕا ... ئەویش وەک هەموومان بوو بە کەسێکی تر.

لەدوای دانیشتنی سێهەمەوە لەگەڵ جەنابی میر، کاسێتی دانیشتنەکانی دایە دەستم و بە منی گووت «ئەم پیاوە نەخۆش نییە، بەڵکو ترسناکە». من شتێکی تایبەتم لە میرئەودالدا نەدەبینی، دەمێک گوێم لە کاسێتەکانیش گرت، بەجۆرێکی سەیر شیفتەی خەونەکانی بووم. خۆم عاشقێکی نهێنی

شیعر بووم، خەونەکانی میرئەودالم وەک دونیایەکی نهێنی و ئەفسووناویی هاتە بەرچاو. سەیربوو لام پیاوێکی وەها، کە پتر لە میرزادەیەکی گەمژە دەچوو، خەونی لەو جۆرە ببینێت... خەونەکانی گەرچی لە دەوری کوشتنێکی دڵڕەقانە دەسووڕانەوە، کوشتنی بەردەوام و دووبارەی خۆی بە دەستێکی نەناسراو، بەلام گەلێک ڕەنگین و شاعیریی بوون. بەردەوام خەونی دەبینی کەسێک دەیکوژێت، سەری لێدەکاتەوە و دەیخاتە حەوزێکی گەورەوە. بە عەشقێکی زۆرەوە خەونەکانیم دەنوسییەوە و دوای نوسینەوەش دەمخوێندنەوە، لە خەونەکانیدا هەمیشە بە ئارەزوویەکی دڕندانەوە دەکوژرا، وەک ئەوە بوو خۆی عەشقێکی نهێنی بۆ ئەو جۆرە مردنە هەبێت. هەرجارەی لە جێگایەکدا و لە ناو ڕەنگێکدا تاوانەکە ئەنجامدەدرا، جارێک لە باغێکدا کە درەختەکانی هەموو مۆرن، جارێکیش لە نزیکی ئاوی ڕووبارێکەوە کە پڕ بوو لە شەپۆلی ئەرخەوانی و قایەغی سەوز و ماسی وەنەوشەیی، ئەو جیهانەی تێیدا دەمرد، پڕبوو لە ڕەنگ، فوارەی زەرد، ئاسمانی پەمەیی، ڕێگای سوور، باڵندەی قەترانی. میرئەودال لە خەونەکانی خۆیدا هەمیشە پاڵتۆیەکی خۆڵەمێشی لەبەردا بوو، قژێکی درێژی هەبوو، کڵێتەیەکی چەسپی ڕەشی لەسەردا بوو. لە خەونەکانیدا بۆنی گوڵێکی ئەفسووناویی بەرەو پێچاوپێچی جەنگەڵێک دەیبرد، هەمیشە هەمان جەنگەڵ دووبارەدەبووەوە، بەلام هەر جارە و بە جۆرێک خۆی دەگۆڕی وەک ئەوەی جەنگەڵێکی دیکە بێت، نوێ بێت، شوێنێک بێت پێشتر جەنابی میر خەونی پێوە نەبینیبێت. ئەو لە کاتی خەوبینین و دواتریش لەگەڵ بێدارییدا، لە خۆی دەپرسی: بەڕاست من ئەم جەنگەڵەم بینیوە؟ بەلام کە بیری لە شوێنی درەختەکان، جۆری هێلانەکان، سروشتی دووبارەبوونەوەی ڕێگاکان دەکردەوە، دڵنیابوو هەمان جەنگەڵە و بە جۆرێکی مەکرباز و فریودەر خۆی دەگۆڕێت. نێو درەختەکان پڕبوون لە بانگهێشتی نهێنی، دەنگی جانەوەرانێکی خەیاڵی کە هانیان دەدا بەرەو پێش بچێت و نەترسێت،

چەشنە ئاوازێکی مۆسیقیش دەهاتە بەر گوێی کە پێشتر لە هیچ جێگایەکی دیکەدا نەیبیستبوو. میرئەودال خەونەکانی خۆی بە هەموو وردەکارییەکەوە لە بیربوو، بۆ نموونە لە زۆربەی خەونەکانیدا خاڵخاڵۆکەیەکی گەورە دەردەکەوت کە ئەویش هەر جارە و بە جۆرێک ڕەنگەکانی خۆی دەگۆڕی. دەبوو هەمیشە فڕینی ئەو خاڵخاڵۆکەیە بکاتە نیشانە تا بەرەو نیازێکی نهێنی بیبات... لە ناکاو، لە ناو درەختەکاندا ئەو پیاوە دەردەکەوت. میرئەودال دەیزانی کە بۆیە هاتۆتە ئەم خەونەوە تا ئەم پیاوە بیکوژێت، دەیزانی کە ئەم چارەنوسە، ئەم قەدەرە خوێناوییە زادەی خەون نییە، بەڵکو جێگایەکی قووڵتری هەیە، وەک قەدەرێکە کە خۆی دەسەڵاتی بە سەردا نییە. لە کاسێتەکەدا چەندەها جار لە دکتۆر دەپرسێت «نازانم من خەونەکان دەبینم یان خەونەکان من دەبینن؟ خەونەکانی مولکی منن، یان من مولکی خەونەکانم؟»، پرسیارەکەی تەنیا یاریکردنێکی گەمژانە نەبوو بە زمان، بەڵکو نەیدەزانی ئاخۆ ئەو خۆی ئەم خەونانە بانگهێشتدەکات یان خەونێک هەیە گەورەتر لەم، هێزێکە نازانێت لە کوێوە دێت، بەڵام داگیریدەکات و ناچاریدەکات ئەم خەونە ببینێت. زۆرجار لە کۆتایی دانیشتنەکاندا بە دەنگێکی ماندوو کە گەلێک لەگەڵ ئەو هەیکەل و قیافە زلەیدا دەگونجا، دەیگووت «دڵنیانیم ... ئایا ئەمە خەونی منە یان نا؟». سەرەتا دکتۆر هیچ نرخێکی بۆ ئەو پرسیارانە دانەدەنا و بە هێمنییەوە دەیگووت «جەنابی میرئەودال، هەموو کەسێک تەنیا خەونی خۆی دەبینێت، گەر دوو کەس پێکەوە یەک خەونیان بینی، دڵت هیچ نەکات، دڵنیابە کەسیان دز نین، بەڵکو دوو دەروونن لە یەک کارخانە هاتوونەتە دەر».

کە ئەو پیاوە لە خەونەکانی میرئەودالدا دەردەکەوت، هەمیشە میر موچڕکێکی پێدا دەهات، ئارەزوویەکی بەهێزی کوشتن دەیجولاند، توانایەکی نامۆ لە جەستەیدا دەگەڕا، بۆ ساتێک هەموو فەزای خەونەکەی ڕەشدەبوو، لە چرکەیەکدا دەیان جانەوەری ترسناک لە ناو درەختە

بێڕەنگەکانەوە سەریان دەردەهێنا، هەوایەکی خۆڵەمێشی و خنکێنەر باڵی بەسەر ڕێگاکاندا دەگرت، میر هەستیدەکرد ئەم پیاوە دەیکوژێت، دەترسا و دەیویست ڕابکات، بەڵام قاچەکانی لەگەڵیدا نەدەهاتن، پڕ بە جەنگەڵی خەونەکانی هاواریدەکرد، هەستیدەکرد لەگەڵ هاوارەکەیدا بازووەکانی سفت و ئەستوور دەبن، هەناسەکانی قورس دەبوون. دڵنیابوو ئێستا لە پشت ئەو پیاوەوە دەریاچەیەکی نهێنی دەرکەوتووە، دەریاچەیەکی لیخن و ژەنگین، دەریاچەیەک وەک ئەوەی ئەم پیاوە لە بری تابووت بۆ مردنی ئەم هێنابێتی. پیاوێکی لاواز و غەمگین بە جلێکی سەرتاپا ڕەشەوە، پیاوێکی بێدەنگ، بێ هەست، بێ قسە، کە وا دیاربوو شتێکی نهێنی بەو دەریاچە تاریکەوە دەیبەستێتەوە. ئاوە لیخنەکان هەڵمێکی سارد و سپییان لێ هەڵدەستا، کتوپڕ هەموو شت غەمگین و پەژموردە دەینواند، ڕەنگەکان لە خەونەکەیدا لە نێوان زەردی مات و خۆڵەمێشی تۆخدا دەکەوتنە داگیرسان و کوژانەوە. میرئەودال دەیزانی کە ئێستا دەبێت بکوژرێت، دەیزانی هیچ چارەیەکی نییە ئەوە نەبێت ملی بەرزبکاتەوە و ئامادەیبکات سەری لێ بکەنەوە. پیاوەکە وەها بوو وەک تەنیا بۆ سەربڕین هاتبێت... وەک زادەی ترسێکی دەروونی و ئەزەلی میر بێت، لە سەربڕین. پیاوەکە بێدەنگ، بەڵام بێڕەحم، بە هەموو توانای خۆی پەلاماری سەری میری دەدا، ئەم هیچ شتێکی نەدەکرد، نە بەرگری لە خۆی دەکرد، نە پەلاماری دەدا، بەڵکو وەک یەکێک نمایشی مردن بکات، چاوانی دەنوقاند و بە بێدەنگی بیری لە چەقۆکە دەکردەوە کە بێئەوەی ئازاری هەبێت، لە ملەوە دەچووە ناو گۆشتەکەی. میرئەودال سەری خۆی دەبینی کە بە هێمنی لە لەشی جیا دەبێتەوە، زیاتر وەک سەری گەورەی بوکەشوشەیەکی لاستیک دەهاتە بەرچاوی تا سەری ئادەمیزادێکی ناسراو، هیچ خوێنێکی نە دەبینی، هیچ هاوارێکی لە جەستەی کوژراوی خۆیەوە نە دەبیست. وەها دیاربوو تەنیا بۆ سەربڕین هاتووە. ئەوەی میرئەودال دەیبینی، لەشی خۆی بوو کە وەک

گامێشێکی کێویی و تووڕە و بوخاردار دەکەوت و بێ هیچ پەلەقاژەیەک تەسلیمی قەدەری خۆی دەبوو. میرئەودال لە وەسفی ئەو هەستەدا، هەندێ وشەی ناشایستەی بەکاردەهێنا، هەتا لە جێگایەکدا گووتی «قەحبە چۆن لەشی خۆی دەبەخشێت، من بەوجۆرە لەشی خۆم دەبەخشم». هەڵبەت من پەیوەندییەکی زۆر نزیکم لە نێوان ئەو دووانەدا نە دەدۆزییەوە، بەڵام میرئەودال دەیویست بڵێت کە ئەم لە خەونەکانیدا تەنیا بۆ تێرکردنی ئارەزووی وەحشیانەی ئەو قەسابە دەرکەوتوە. دواتر لە ناکاو هەموو شتێک دەگۆڕا، سەری خۆی کتوپڕ دەکەوتە سەر ئاوی دەریاچەکە... هەمیشە بەو جۆرەیە، وەک هێزێک لاشەکەی لە حەوزێکی لیخندا سەرئاو خستبێت، وەک پەیکەرێکی بەردینی قورس بێت و دەستێک بەسەر ئاوەوە ڕایگرتبێت، سەر و ڕوخساری سەراپا قەوزەیە، قژی شەپۆلێکی هێمنی ئاو یاری پێدەکات، هەردەم چاوانی خۆی بە نوقاویی دەبینێت، تا ئێستا نەبووە چاوانی کراوە بن، بە جۆرێکی سەیر و توند و بێڕەحمانە چاوانی نوقاندوە، وەک کەسێک بیەوێت هەم مەرگی خۆی و هەم بکوژەکەی خۆی نەبینێت.

دکتۆری مامم سەرەتا ویستی پەیوەندییەک لە نێوان ڕوخساری باوکی میرئەودال و پیاوی ناو خەونەکاندا بدۆزێتەوە. هەوڵی بۆئەوەبوو، بیسەلمێنێت کە بکوژی ناو خەونەکە وێنەیەکە لە وێنەکانی باوکی میرئەودال، بەڵام میرئەودال چەندین جار بۆ مامم دووبارەکردەوە کە باوکی هەر زوو، بەر لە دایکبوونی ئەم مردوە و زۆرینەی سالانی منداڵی لە ژینگەیەکی تەواو مێینەدا بردۆتەسەر - چیرۆکێک کە دواتر بۆم دەرکەوت درۆیە و میرئەودال تەنیا بۆ فریودانی مامم و بەتاڵکردنەوەی زانستەکانی پەنای بۆ بردوە - ژینگەیەک بە قسەی میر لە بری ئەوەی ئارام پەروەردەیبکات، ناخی پڕکردبوو لە جۆرێک لە شەڕانگێزیتی تایبەت کە ژنەکەی بە «شەڕانگێزیی ژنانە» ناویدەنا. دکتۆری مامم باوەڕی بەجۆرە شتێکی وەها نەبوو، دەیگووت «شەڕانگێزیی ژنانە؟ شەڕانگێزیی

ژنانە چییە؟ شتی وەها بوونی نییە». بەلام مرواری خان بە تەلەفون بە مامی گووت، کە جەنابی میر دوای ئەو خەونە بە جۆرێکی بەرچاو ترس دایدەگرێت، شەڕانگێزدەبێت، دەقریشکێنێت، دەزریکێنێت، وەک ژنانی پرسەدار جل لە بەری خۆی دادەدڕێت و قاپەکانی سەر مێزی نانخواردن دەشکێنێت و سەری دەخاتە ناو کوشی و بە دەنگی بەرز دەگری. مرواری خان کە هەندێ ڕۆژ بە ماشێنەکەی خۆی، میری تا عیادەکەی مامم دەهێنا، بۆئەوەی مێردەکەی تورەتر بکات، ئەو شتانەی ناودەنا «فەرتەنەی ژنان». بەلام مامم بە لۆمەوە نیگایدەکرد و دەیگووت «خانم، لە دەروونناسیدا زاراوەیەکی وەها بوونی نییە». لە ڕاستیدا مامم لە تێگەیشتنی تەواوەتی ئازارەکانی میرئەودالدا دەستەوەستان بوو، هیچ شتێکی ڕۆشن و مەنتیقی نەدەدۆزییەوە تا خەونەکەی پێ ڕوونبکاتەوە، خەونێک بەردەوام دووبارەدەبووەوە، ئارەزوویەکی ترسناکی لە میردا دروستکردبوو بگەڕێت پیاوی ناو ئەو خەونانە بدۆزێتەوە و بیکوژێت، دەیویست جەنگێک بەرپابکات، سەرزەمین بگۆڕێت بۆ گۆڕەپانی شەڕێکی گەورە. شتێک لە کاسێتەکاندا بیرم ناچێتەوە ئەوە بوو کە مامم لە جێگایەکدا لە میر دەپرسێت: ئایا لەو ماوەیەی ڕابوردوودا ئارەزوویەکی تایبەتیتان هەبووە کەسێکی دیاریکراو بکوژن، یاخود کینەیەکی گەورەتان بەرامبەر کەسێک هەست پێکردوە؟ . میرئەودال، لەوێدا دەوەستا و وەلامێکی دەدایەوە کە شایەنی تۆمارکردنە: «بەلێ، بەلێ جەنابی دکتۆر، هیچ ڕۆژێک لە ژیانمدا نەبووە، لە منداڵیمەوە، ئارەزووم نەکردبێت کەسێک بکوژم، بەڕێکەوم بۆ گۆڕەپانی جەنگێکی دوور ... هەر کەسێک بێت بیکوژم، هەر دوژمنێک بێت گرنگ نییە. هەمیشە هەستمکردوە، ڕۆژێک دێت دەکەومە جەنگێکەوە، لەوێدا دەکوژم و دەکوژرێم، ئەوەش ئەوپەڕی ئاسوودەیی منە».

# ٢

دێلاوار شـارێکی گەورەیـە، زۆر زۆر گەورەیـە، ئـەوەی دونیـای نەدیبێت وادەزانـی دێـلاوار نیـوەی گـۆی زەمینـی گرتـووە، گەورەیـی ڕاستەقینەی دێـلاوار تەنیـا کاتێـک دەردەکەوێـت کـە لـە باکـوورەوە، لـە لوتکـەی چیـا دوورەکانـەوە بتەوێت هەمـوو شـارەکە ببینیت. لـە هیـچ پنتێکـی شـارەکەوە ناتوانیـت بەسـەر هەمـوو دێـلاواردا بڕوانیـت، دەیـان گردۆلکـە و بەرزایـی بەرچـاوت دەگـرن، چەندیـن دەریاچـەی بچـوک بچـوک گەڕەکـەکان و بەشـەکانی لـە یەکتر جیادەکەنـەوە، مرۆڤ گـەر بیەوێت دێلاوار بگەڕێت هەم زەوی وشـکانی دێتـە ڕێـگا و هـەم دەریاچـە و جەنگـەڵ. گـەر بتەوێـت بەپێ لەمسـەری دێـلاوارەوە بچیت بۆ ئەوسـەر چەنـد ڕۆژێکت دەوێت، هۆکـەش تەنیـا درێژیـی تیـرەی دێـلاوار نییـە، بەڵکـو ئـەو هەمـوو بـەرزی و نزمـی و کوچـە پێچاوپێـچ و گەڕەکـە کۆنانـەن کـە مـرۆڤ بـە ئاسـانی سـەرودەریان تیا دەرناکات. شـارەکە چوار بەشـی سـەرەکی هەیە کە بە تێپەڕینی زەمـان و لـە مـاوەی جـۆراو جـۆردا دروسـتبوون، دێـلاواری باکـوور و دێـلاواری باشـوور، خۆرهـەڵات و خۆرئاوا. لـە سـەدان سـاڵ لـە مەوبـەرەوە ژمارەیـەک لـە خێڵەکانـی دەوروبـەر لـەم سـەر زەمینـەدا نیشـتەجێ بـوون، کـە زمـان و شـێوە زمانـی جیـا قسـەدەکەن، بنەماڵـە دێرینەکانـی دێلاواریش هـەن کە دەڵێن لەگـەڵ بناغـەی شـارەوە لێرەن. لـە مێژە دەسـەڵات بـە جۆرێکـی بنەڕەتـی لـە

نێوان هەندێ لە بنەماڵەکاندا دابەشبووە. خانەوادەی ماروفی، کە هەندێ بە «مەعروفی» ناویاندەبەن، نزیکی سەد ساڵە فەرماندەی دێلاوارن. ئەها دەبێت بڵێم، کە ئێستا لە خۆشترین ڕۆژ و لە زێڕینترین قۆناغی خۆیاندا نین، بەڵام هێشتا هەر فەرماندارن. لەو ساڵانەشدا کە دوژمنان دێلاواریان داگیرکردبوو، فەرماندار هەر لە ماروفییەکان بوو، دواتریش کە خەڵکی ناڕازیی لە داگیرکەران شۆڕشی گەورەی دێلاواریان هەڵگیرساند، دوای مۆرکردنی بەیاننامەی ئازادیی، وەک میر و فەرمانداری مەدەنی دیسان هەر ڕەزای ماروفییان دانایەوە. لە دوای شۆڕشەوە، ئەنجومەنێکی باڵا کە کونفیدراسیۆنێکی خێڵەکییە، لە پاڵ مەرکەزی فەرمانداریدا دێلاواریان دەبردەڕێوە، بەڵام گەر لە من دەپرسن دەڵێم وەزیفەی ئەو کونفدراسیۆنە خێڵەکییە وەها لاواز و بێکەڵک بووە، لە ئێستادا بە نەبوو حیساب دەکرێت. جاران وەزیفەیەکی هەبوو کە سوپای دێلاوار بەپێی ڕێژەی بنەماڵەکان دیاریبکات، بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی گەشەی سوپا و تەکنیکی سەربازییەوە، کاری وەها شیاو و شایستە نییە، زۆربەی ئەفسەرەکان ئێستا لە کۆلێژێکی باڵای سوپا دەردەچن کە تەنیا هەندێک بنەماڵەی تایبەت دەستیان بەسەردا گرتووە. لە ساڵانی دواییدا هەندێ جێگای شارەکە نوێبۆتەوە، بەڵام لە هەندێ گەڕەکیدا هێشتا خورافەت، سیحر برەوێکی گەورەیان هەیە. ئێستا هەر بنەماڵەیەک، گەڕەکێک یان چەند گەڕەکێکی لە شارەکەدا داگیرکردوە، بەڵام لە دوای لەدایکبوونی منەوە، لەم بیست ساڵەدا کۆمەڵێک گەڕەکی سەیر لە دێلاواردا دروستبوون کە وەک پشتێنەیەکی گەورە بە چواردەوری شاردا کشاون، دانیشتوانەکەی لەوانەن کە بنەماڵە و ئەسڵ و فەسڵێکی وەهایان نییە، لە شارەوانی بەو گەڕەکانە دەڵێن «دێلاواری ڕەش». بەشی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەوێ، خەڵکی ئەو گوندانەن کە دەکەونە نزیک سنووره هاوبەشاکانی ئێمە لەگەڵ دوژمندا. لە بیست ساڵی ڕابوردوودا دوژمن لەو سەر سنوورانە هەر جموجۆڵێکی کردبێت، سەدان

خێزان ئاوارەبوون و هاتوون لە شار نیشتەجێبوون. خەڵکی ئەو گەڕەکانە وەک بوونەوەری غەریبن، نە خەڵکی دیلاوارن و نە کەسیش لێرە دەتوانێت وەک دۆست و هاوزمان ناویان بنێت. خەڵکانێک بە غەوارە ناویاندەبەن، بە پارەیەکی کەم شەقامەکان پاکدەکەنەوە، لەو بینا تازانەدا کاردەکەن کە لە بەشەکانی تری دیلاواردا دروستدەکرێن، لە مەزرا و خانووە هاوینەکاندا دەبنە خزمەتکار. بەڵام ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە هەمیشە بە غەریبی دەمێننەوە. غەوارەکان پتر خەڵکانێکن وەک ئەوەی نەتەوە، شار، نیشتیمان، زمانیان نەبێت، کە یەکجار لە گوندەکانی خۆیان هەڵدەکەنرێن، ئیتر وەک مرۆڤی ئاسایی لە هیچ شوێنێک جێگایان نابێتەوە.

بەڵام مێژووی دیلاوار لەوە دێرینترە. دیلاوار، ئەم شارە گەورە و کشاوەی سەر ئەم خاکە پان و بەرینە، لە دەوری زیندانێک دروستبووە، کە لە دێرزەمانەوە پێی دەگووترێت زیندانی یەکەم. زیندانی یەکەم لە ناوەڕاستی شاردایە. پێنج ساڵ لە مەوبەر ویستیان زیندانەکە بگوێزنەوە بۆ شوێنێکی دووردەست و بیناکانی بڕوخێنن و لە جێگایدا باغچەیەک و مەلەوانگەیەکی ئەهلی دروستبکەن. بڕیاربوو زیندانێکی مۆدێرن لە دەرەوەی شار دروستبکەن، شوێنێکی پەنا تەنیا ئەو کەسانە بیگەنێ کە بۆ دیداری ناسیاوێک ڕوودەکەنە ئەوێ. بەڕێوەبەری شارەوانی نوێی شارەکە کە سەر بە خێڵی ئالیانییە، کوڕێکی گەنج بوو، هیچ شتێکی لەسەر مێژووی ڕاستەقینەی دیلاوار نەدەزانی. بڕیاریدابوو وابکات خەڵکی شار زیندان لە بیربکەن، ژیانێکی تر دەست پێبکەن و شتێک لە شادی بنۆشن، جۆرە مێژوویەکی نوێ بۆ خۆیان بسازێنن. سەیری لێدەهات چۆن ئەم زیندانە سەدان ساڵە لێرەدایە و کەس بیر لە لابردنی نەکردۆتەوە، بە سادەیی و دڵپاکی دەیگووت «بۆ دەبێت ئەم زیندانە لە ناوەڕاستی شاردا بێت، بۆ دەبێت لە هەموو هاتن و چوونێکدا چاومان بەم دیوارانە بکەوێت». بەڕێوەبەری شارەوانی لەوەدا لەسەر هەق بوو، زیندانەکە بە گەورەی

و ساردیی و ناشیرینی خۆی، هەر کەسێکی دەتۆقاند. وێنەیەکی غەمگین و ترسناکی دابوو بە سەنتەری گەورە، هەر چۆنێک بسورابایتایەوە، بتویستبایە بچێت بۆ هەر جێگایەک دەبوو بە کەناری ئەو بینا بەردین و مۆنەدا تێپەڕبێت. بەڵام هەموو بەوە ڕاهاتبووین، نەدەکرا بیر لە وێنەی شار بکەینەوە بێئەوەی زیندانێکی وا گەورە لە ناوەڕاستیدا بێت، زۆرکەس بۆیان ئاسایی بوو دەموچاوی خۆیان بێ لووت ببینن، کەچی بۆیان ئاسایی نەبوو دێلاوار بێ ئەو زیندانە ببینن. ڕاستییەکەی شاری ئێمە هیچ شتێکی تێدا نەبوو مایەی شانازی بێت، نە مزگەوتێکی کۆن، نە قەڵایەک، نە کتێبخانەیەک، نە بورجێکی تازە... هیچ شتێکی تێدانەبوو. تەنیا شتێک کە مایەی ئیفتخاری هەموومان بوو پاشماوەی زیندانە کۆنەکان و ئەم بەندیخانە گەورانە بوو. ڕاستە دێلاوار زۆر کۆن بوو، بەڵام هیچ کەس بیری لە ئەنجامدانی شتی گەورە و تایبەتی نەکردبووەوە. زیندانەکانی دێلاوار لە سەرتاسەری دونیادا ناوبانگیان هەبوو، لای هەندێ ڕێکخراو و مێژوونوس وەک ئێرسێکی بەنرخی بەشەریی لە قەڵەمدەدران و لە لیستی شوێنەوارە گرنگەکانی مێژوودا دانرابوون. هەڵبەت زیندانی مەرکەزی کە لە سەدان ساڵەوە هەیە، گرنگترینیان بوو. کەس بیری نایەت، ڕۆژێک زیندانییەک توانیبێتی لێی هەڵبێت... هیچ کات... یەک کەس نەبێت کە دواتر چیرۆکی دێتە سەر ڕێگامان، هیچ ڕۆحلەبەرێک لەوێ نەهاتبووە دەرێ، مەگەر بە ڕێگای یاسایی و دوای دەرچوونی ڕەزامەندی بەرپرسانی زیندان. وەک دەڵێن خودی شارەکە لە دێر زەمانەوە بەدەوری ئەو زیندانەدا دروستبووە، سەرەتا ماڵی بەڕێوەبەر و پاسەوانەکانی زیندان لەوێ نیشتەجێبوون و دواتر خانەوادەی دیلەکان لەو نزیکانە هەواریان خستوە، ئیتر لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، خەڵکی تر هاتوون و نیشتەجێبوون و ناوکەی شارۆچکەیەکی وەک ئەم شارەیان دامەزراندوە. هەتا دەڵێن دێلاوار ناوی شارەکەمان لە دیلاواوە وەرگیراوە، کە مانای سەرزەمینێک زیندانییەکان ئاوایان کردۆتەوە، هەڵبەت کەسانیش

هەن ئەوە ڕەتدەکەنەوە و دەڵێن ناوی «دیلاوار» لە دلاوەرەوە هاتووە کە نازناوی شارێکە سەردەمانی زوو پڕ بووە لە جەنگاوەرانی دلێر و نەبەز. مێژوونوسێکی دیمان لە ساغکردنەوەی ناوەکەدا دەڵێت هەر دوو ئەم بۆچوونە پوچن و دیلاوار لە «دێ لەوەڕ» ـەوە وەرگیراوە، واتە گوندێک خەڵکەکەی لە لەوەڕی مفتن، دەژین و جگە لە خواردن و خەو و کەیفی پوچ، عەقڵ و فکریان لای هیچی تر نییە. ناوەکە لە هەرچییەکەوە هاتبێت، دەمێک قسە هاتە سەر گواستنەوەی زیندانەکە، خەڵکی وایان دەزانی بە ڕوخانی ئەو جێیە شار دەبێتە وێرانە، پێیان وابوو ڕۆحی ئەم شارە و نهێنییە موقەدەسەکەی لەو زیندانەدایە. لای کەسانێک هەم پاسەوانەکان وەک موقەدەس و هەم دیلەکانیش بە موبارەک سەیردەکران. ئیتر دژ بە بڕیاری بەڕێوەبەری کاڵفامی شارەوانی، خەڵک ناڕەزایی زۆریان دەربڕی، زیندانەکان مانیانگرت و پاسەوانەکان هەڕەشەی دەست لە کارکێشانەوەیان ڕاگەیاند، ئەوە بووە مایەی ئەوەی بڕیارەکە لەلایەن جەنابی فەرماندار و کۆنفدراسیۆنی خێڵەکانی دیلاوارەوە دژایەتیبکرێت، سەرۆکی شارەوانیان گۆڕی و پڕۆژەی تێکدانی زیندانەکەیان بە ئاشکرا و لە بەرنامەیەکی تەلەفزیونیدا دڕاند. بەجۆرێک لە جۆرەکان هەموو خۆشحاڵ بووین زیندان لە جێگای خۆی بمێنێتەوە، لە ناو جەرگەی شاردا. ئەوە بەر لە هەر شت، دڵی زیندانەکانی ئاسوودەدەکرد کە هەستیاندەکرد هێشتا بەشێکن لە ئێمە، پارچەیەکن لە جەستەمان و جیانەبوونەتەوە.

دوو ڕۆژ دوای سەردانەکەی میرنەودال مامم ناردمی بۆ زیندان تا بزانم حاڵ و حیکایەت لەوێ چییە. چەند ڕۆژێک پێشتر هەواڵ هاتبوو کە لە زیندان نەخۆشییەکی دەروونی بڵاوبۆتەوە و وەک هەر تاعوونێک کە فایرۆسەکەی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە ، مەترسی ئەوە هەیە لە ماوەیەکی کورتدا دەردەکە تەواوی زیندانییەکان و پاسەوانەکانیش بگرێتەوە. مامم ڕۆژی پێشتر گووتی «سبەی بەرلەوەی بێیت بۆ سەر کار،

بچۆ بزانە چ باسە. ڕاپۆرتێکی سەرەتاییم بۆ بنوسە و بۆم بهێنە». پێشتر یەک دوو جاری تر کاری وەها پوچ و لابەلایی پێ سپاردبووم، هەندێ ئیشی پشکنینی سەرەتایی و سەرنجدانی یەکەمینی نابووە ئەستۆی من. من هەموو کارەکانم بە وردییەکی باش ئەنجامدەدا. مامم هەندێجار دەیگووت «ڕاپۆرتەکانت بۆنی قەسیدەیان لێ دێت، گەر لە زەمانی شکسپیردا بوویتایە، دەتتوانی لە بری ئەو ڕۆمیو و جۆلیت بنوسیت». نەمدەزانی ئەوە وەسفێکی باشە یاخود پلارێکی چەوتە و مۆرێکی ڕیسوایییە لەسەر ناوچاوانی من، چونکە مامم گەلەک گاڵتەی بە ڕۆمێو و جولێت دەهات و دەیگووت شەرمە مێژووی ئەدەبیاتی دونیا شتێکی وا پڕوپوچی پاراستووە. کە چووم بۆ زیندان شتێکی ئەوتۆم لەسەر نەخۆشییەکە نەدەزانی. من گەرچی تەنیا وەک بەردەستێکی مامم کارم دەکرد، بەڵام لەو دوو ساڵەدا هەندێ کتێب و وتارم دەربارەی دەروون و دەردەکانی خوێندبووەوە، شتگەلێکی سەرەتایی لە زانستەکانی پشکنینی دەروون فێربووبووم. هۆی خوێندنەوەکانم ئەوە نەبوو ببمە بەردەستێکی باش، یان ببمە کەسێک کە دەیەوێت شتێک لەو جیهانە تێبگات کە لە ناویدا ئیشدەکات، بەڵکو زۆرجار شتەکانم وەک مەتەڵێکی ئاڵۆز دەبینی. هێندەی نەخۆشیێکی پڕ تەلسیم و ئاڵۆز لە عیادەکە دەردەکەوت، من ئۆقرەم لەبەر دەبڕا، دەمگووت چۆن مرۆڤ دەبێت هێند دەستەوەستان بێت لە دەروونی خۆی تێنەگات. ئەو ڕۆژانە هەموو دونیا لە پێشچاوم تەماویی دەینواند... هیچ شتێک مانای نەدەما، دەنگەکان و هەستەکان بەجۆرێکی دڕندانە لەسەرمدا تێکەڵدەبوون. ئیتر لە هیچ تێنەدەگەیشتم، نە لە دەنگی ئەو فرۆشیارانەی لە پشت عیادەکەمانەوە بە دەنگی بەرز میوەکانی خۆیان هەراجدەکرد و نە هاواری ئەو مەلایانەی کە ڕۆژی پێنج جار لەمسەر بۆ ئەوسەری شار، خودایان بە هەموو تۆن و دەنگ و وشەیەک بانگدەکرد، هەتا هۆڕنی ماشێنەکان و خوێندنی کەڵەشێرەکان و دەنگی باران و گڤەی بای زستانان پڕدەبوون

لە تەلیسم و ڕەمز و ئیبهامی قووڵ. من زۆرجار بە چاوی خۆم دەمبینی کە مامم بە دەست تاریکییەکانی دەروونەوە دەینالاند. تا ئەو ئازاری زیاتر بایە و لە ئیبهامدا نوقم بایە، منیش زیاتر لە تاریکی دەروون دەترسام... مامم هەمیشە دەروونی بە وشەی شاعیرانە وەسفدەکرد، دەیگووت « ڕێنوار. دەروون فیتنەبازە، فیتنەشی ئەوکاتە دەردەکەوێت کە دەتەوێت دەرگاکانی بکەیتەوە و سەیریبکەیت. تا نەتەوێت قفڵەکانی بشکێنیت مەگر و فێڵەکانی دەرناکەوێت، هێندەی کردتەوە، ئیتر تێناگەیت چیت دیوە و چی دەبینیت. هەندێ جار وەک ئەشکەوتێکی تاریکە، هەندێ جاریش وەک باغێکی ڕازاوەیە، هەندێ جار وەک دەریا وەهایە، هەندێ جاریش ئاسمانێکی فراوان و بێبنە. پڕە لە خەڵکێک کە بینیوتن و نەتبینیون، لە سفرە و خوانێک جاری وایە ژەهری لە سەرە و جاری وایە میوەی بە تام، لە ئارەزوو هیچ وەخت تێرنابن، لە خواست کە خۆیان دەرناخەن، لە دەمامک کە بە دوای دەموچاودا ڕادەکەن، لە دەموچاو کە بۆ دەمامک دەگەڕێن. بەڵێ ئاوهایە دەروون».

ئەو ڕۆژەی کە چووم بۆ زیندان، دەمودەست لە ژووری بەڕێوەبەریی زیندانەوە ناردیانم بۆ لای دکتۆر حسامەدین، دکتۆری سەرەکی زیندان. پیاوێکی بچکۆلەی ڕیشن و کوپەڵ بوو، سەرێکی ڕووتاوە و ناوچاوانێکی تەختی هەبوو، چرچ بە جۆرێکی قات قات و یەک لە دوای یەک لە ناوەڕاستی سەریەوە تا سەر برۆی ڕیزبووبوون. نە ویقاری دکتۆری تێدابوو و نە هەیبەتی پاسەوانی زیندان، وەک مەخلوقێکی نامۆ هاتە پێشچاوم کە بێ هیچ کارێکی دیاریکراو لەم جیهانە تاریک و تایبەتەی زینداندا ونبووبێت و خەریکی خۆدۆزینەوەیەکی بێئەنجام بێت. پزیشکی گشتی بوو، دوو بەردەستی هەبوون، هەردووکیان وەک خۆی کورتەبنە و خڕکەڵ بوون، دوو دەموچاوی غەمگینیان بوو وەک سیمای دوو زیندانیی کە ئازاری دیلی شێوەی شێواندبن. کە بە دکتۆرم گووت من

ڕەوانەکراوی دکتۆر سیامەندم، گەلەک خۆشحاڵ بوو، دیاربوو لە دکتۆرەوە چاوەڕوانی خەبەرێک بوو. دکتۆر حسامەدین دەمودەست بانگیکردە هەر دوو یاوەرەکەی و پێکەوە منیان بردە ژووری تایبەتی خۆیان. دکتۆر بە دەنگێکەوە پڕبوو لە نیگەرانی گووتی «سوپاسی دکتۆر سیامەند دەکەم کە ئێوەی ناردوە، گەرچی ماوەیەکە چاوەڕوانم بەڵام ئومێدبڕاو نەبووم. لەم زیندانەدا ئومێد وەک دەرمانێکی دانسقە وایە، زۆر دەستی پێوە دەگرم. لە ڕاستیدا لە زیندان خەونێک بڵاوبۆتەوە کە ئێمە تێیناگەین... شتێکە هەم نەخۆشییە و نەخۆشیش نییە. نازانم چۆن وەسفیبکەم. زۆر جۆری دەرد هەیە باسکردنی شێتییە، بەڵام باس نەکردنیشی هەر شێتییە. خۆم و هاوکارەکانم لەو ڕووەوە دەستەوەستانین و شتێکمان بۆ ناکرێت، مرۆڤ دەترسێت باسیبکات وەک گەمژە دەربکەوێت، دەترسێت باسیشی نەکات کارەسات بکەوێتەوە». دکتۆر گەلێک نائارام و بە دەنگێکی غەمگین قسەیدەکرد، من نەمدەزانی باسی چی دەکات، بە پەلە گووتم «گەر ئێوە ڕاپۆرتێکتان هەبێت، من دەیبەمەوە بۆ دکتۆر، گەر نەبێت، دەبێت هەموو شتێکم بۆ بگێڕنەوە تا بینوسم و بیخەمە بەر دەستی بەڕێزیان». دکتۆر بە هەمان دەنگی غەمگینەوە گووتی «گێڕانەوەی ئاسان نییە. هەمووی دەربارەی خەونێکە لە ناو زیندانییەکاندا بڵاوبۆتەوە، خەونێک هەر کەس دەیبینێت وەک سەگی هاری لێدێت، شێت و شەڕانی دەبێت، پڕدەبێت لە واهیمە و خەیاڵات. دیلەکان بە ڕوکەش و ڕوخسار شتێکیان پێوە دیار نییە، بەڵام ئەوەتەی ئەو خەونە بڵاوبۆتەوە، شیرازەی زیندان تێکچووە. دەترسم گەر چارەیەک نەدۆزینەوە، شتەکان وردو وردە لە دەست دەربچن، لەبەرئەوە پێویستیمان بە کۆمەکی بە پەلەی جەنابی دکتۆر هەیە». هەر دوو یاوەرەکەی لە تەنیشتەوە سەریان بۆ لەقاند. هەردووکیان هەمان ترس و حەسرەت لە چاویاندا بوو. دکتۆر حسامەدین هەر چییەکی دەگووت یاوەرەکانی لە ڕێگای ئەو غەمەی نێو نیگایانەوە بۆیان

دەسـەلماند. مـن گووتـم «ڕاسـتیەکەی، دکتـۆر سـیامند داوای لـە مـن کردوە هەمـوو زانیارییەکـی پێویسـت لـە ئێوە وەربگرم. ئـەم ماوەیـە زۆر سـەرقاڵ و بێ مەجالـە ... بـە سـەرێک کچەکـەی زەماوەند دەکات و بـە سـەرێکی تریش ژمارەی نەخۆشـەکانمان ئـەم سـاڵ بـە جۆرێکـی بەرچـاو زیادیانکردوە. گـەر بەمجـۆرە بـڕوات ڕەنگـە لـە زسـتانی داهاتـوودا شـار پێویسـتی بـە زیـاد لـە دکتۆرێکـی دەروون هەبێت. دکتـۆری مامیشـم وا هەسـتدەکات کـە ماوەیەکـە خەڵک بەلێشـاو تووشـی نەخۆشـی دەروون دەبن». دکتـۆر حسـامەدین گووتی «مـن وەک پزیشـکێکی تایبـەت بـە نەخۆشـییە گشـتییەکان، زانیـاری دکتۆرێکـی وەک جەنابـی دکتـۆر سـیامەندم نییـە. لـەو چەنـد سـاڵەی ڕابوردوودا، مـن جگـە لـە سـتایشـی جەنابیـان، جگـە لـە پیاهەڵدان بـە نـاو و ناوبانگیدا شـتێکی خراپـم لەسـەر ئـەوان نەبیسـتووە. وادەزانـم زینـدان ئێسـتا پێویسـتی بـە دکتۆرێکـی وەک ئـەوە تـا مـن». پێشـتر جـۆرە لـە خۆبوردنێکـی وەهـام لـە نێـو دکتۆراندا نەبینیبوو. دکتۆرەکانـی دێلاوار، وەک زۆربـەی خـاوەن ئیش و پیشـەکانی تـر، جنسـێکی لـە خۆبایـی و لـە خۆڕازیـی بـوون، بیسـتنی قسـەیەکی وەهـا لـە زاری دکتۆرێکـەوە ئاسـایی نەبـوو. لـە نیوسـەعاتی دواتـری دانیشـتنەکەمدا خەریکـی کۆکردنـەوەی زانیاریـی بـووم لەسـەر ئـەو خەونـەی کـە ئاسـوودەگی زیندانـی تێکدابـوو. خەونەکـە هەمـان شـێوەی خەونـی میرئـەوداڵ لـە دەوری پیاوێـک دەسـوڕایەوە کـە دەردەکەوێـت و سـەرەکان دەپەڕێنێـت. ئـەوەی جێـگای پرسـیار بـوو ئـەو دەنگـۆ سـەیرەبوو کـە دەیگـووت، هەمـووان خـەون بـە یـەک کەسـەوە دەبینـن، بـە یـەک ڕوخسـارەوە، کەسـێک کـە سـەری خەونبینـەکان دەپەڕێنێت و تووشـی سـام و هەراسـێکیان دەکات، دەمێـک کـە وریـا دەبنـەوە، ئاسـەوار و کاریگـەری خراپـی لا ناچێت.

لـەوێ مـن چـاوم بـە یەکـەم کـەس کـەوت کـە یەکەمیـن خەونـی بینیبوو، پیاوێکـی نیمچـە لاڵـی پتەپتکـەر کـە بـە تاوانـی کوشـتنی ژنەکـەی لـە زینـدان بـوو، کەچەڵێکـی لـووت درێـژ، ڕیشـێکی کورتـی هەبـوو، جووتێـک چـاوی

نەخۆش کە وەک چاوی باڵندەیەکی نائارام بە ژوورەکەدا دەیگێڕا . بە ترسێکەوە، وەک کەسێک هەڵگری یەکەم نیشانەکانی ڤایرۆسێکی کوشندە بێت، بۆی گێڕامەوە کە شەوانە بەردەوام یەک خەون دەبینێت. لەبەر لاڵی و تەتەڵەکردنی بەردەوامی زمان، زۆر وشەی دووبارەدەکردەوە، باسی بایەکی کرد کە تەنها جلی ژنانی پێیە، بایەکی بەهێز کە هەزاران پارچە جل بە ئاسماندا دەبات، ئینجا لە ناکاو خۆی لە گوزەرێکی قەیسەرییەکانی سەنتەری دێلاواردا دەبینێتەوە، گوزەرێک پڕ لە بۆ عەترێکی خەیاڵی کە پێشتر ئەو بۆنی نەکردوە، بۆنەکان گێژیدەکەن، تەواوی خەونەکەی لە گێژی و سەرئێشە و وڕییەکی زۆردا دووبارەدەبێتەوە، دیمەنەکانی خەونەکە لەسەر یەک و بە پلان خۆیان دووبارەدەکەنەوە، لە خەونەکەیدا وەها دیارە وەک ئەو قەیسەرییە بسووتێت، تەم و دوکەڵ بەرچاوی دەگرن، هەناسەی سواردەبێت، دەیەوێت هاواربکات و ناتوانێت، هەست بە خنکان و گەرمی و لە هۆشچوون دەکات، لەناو ئەو تەم و ترسەدا ئەو پیاوە دەردەکەوێت، لاواز و غەمگین، ئەم هەست بە ئارەزوویەکی توند دەکات بۆ مردن، شتێکی تاریک لە ڕۆحیدا دەجولێت، هەستدەکات دەبێت شتێک بکات، گەردنی بەرزدەکاتەوە بۆ چەقۆی ئەو، لە دوورەوە بریسکەی ئەو کێردە کوشندەیە دەبینێت کە لە کێردی قەسابەکان دەچێت. تا دەگاتە بەردەمی ئەم چەندین جار ڕەنگی کێردەکە دەگۆڕدرێت، لە ناکاو هەستدەکات چەقۆکە لە ناو گۆشتیدایە، بە خوێنیدا ڕۆدەچێت، هەست بە ئێسکەکانی دەکات دەشکێن، دەستی ئەو پیاوە توند و دڕندانە گەردنی بەرەو دوا دەشکێنێتەوە، گوژمی خوێن بەرەو ناو گەروی دەڕژێت و خەریکە دەخنکێت، هەست بە سەری خۆی دەکات لە جەستەی ئازاد دەبێت. بۆ ئێستێک هەستدەکات باری لەشی سووک بووە، دەیەوێت بێ سەر هەستێت، بەڵام ناتوانێت. لە ناکاو وەک یەکێک لە کاتی خنکاندا، ئاو هەڵیگرێت و بە هێزێکی گەورە فڕێیبداتە دەرەوە وریادەبێتەوە و ڕادەچڵەکێت، بۆ سەری خۆی دەگەڕێت، لەسەر

زەوییەکە، لە ژێر جێگاکەیدا، لە پاڵ نوێنی زیندانییەکەی تەنیشتیدا، بەڵام نایدۆزێتەوە. تەواو وریادەبێتەوە و وەک هێزێکی ئەفسانەیی تێکەڕابێت هەڵدەستێت و هەموو گیانی دەلەرزێت... خەونەکە لەویادا تەواو دەبێت، بێئەوەی هەرگیز کۆتایی هاتبێت.

دیلەکە ئەو خەونەی بەزمانێکی لاڵ و ئاڵۆز بۆ گێڕامەوە. سەرم لەوە سوڕما، چۆن ئەم خەونە هێندە لە خەونەکەی میرئەودال دەچێت. لەگەڵ هەموو جیاوازییەکیشدا، لێکچوونێکی کوشندە لە نێوان هەر دوو خەونەکەدا هەبوو. ئەوەی سەیر بوو قسەی دکتۆرەکان بوو، خەونەکە بە خێرایی بڵاودەبووەوە، ئەوانەشی دەیانبینی ئارەزوویەکی وێرانکردن و کوشتنیان تێدا دەجوڵا، شەڕانگێز دەبوون، ئارامییان لە دەستدەدا، پەلاماری یەکتریان دەدا، تووشی وڕێنە دەهاتن، نیگاری تاریک و هەستی ناخۆش تەنگی پێهەڵدەچنین، لە خەو دەترسان، بەڵام لە وریایشدا ئەو دیمەنانە هەر ئاوقای خەیاڵیان بوو، خولیایەکی ڕەش دەیگرتن و یەخەی بەرنەدەدان.

وەک دکتۆر حسامەدین گوتی «شیرازەی زیندانەکە تەواو تێکچووبوو». سەرەتا بەڕێوەبەری زیندان ئەو کەسانەی لە قەرەنتینێکی تایبەتدا جیاکردبووەوە، ڕۆژانە گفتوگۆی لەگەڵ کردبوون، خەونەکەی پێگێڕابوونەوە، بە دواداچوونی بۆ هۆکاری شەڕانگێزییان کردبوو. تا هەفتەیەک لە مەوبەر خودی بەڕێوەبەر خۆیشی تووشی خەونەکە بووبوو. ئێستا دکتۆر حسامەدین زۆر دەترسا، هەفتەیەک بوو جێگری بەڕێوەبەری زیندان نەقیب زرار لە جێگای عەقید قزڵباش دەوامیدەکرد. عەقید خەونەکە بە جۆرێک تەنگی پێ هەڵچنیبوو، دوو هەفتە پشووی وەرگرتبوو تا لەگەڵ ژن و منداڵەکەیدا بچێتە ماڵە کوێستانییەکەی لە بناری چیا و لەوێ کەمێک ئارام بێتەوە. دیاربوو جیاکردنەوەی نەخۆشەکان لەو قەرەنتینەیەدا، سوودێکی بەرچاوی بۆ ڕێگرتن لە نەخۆشییەکە نەبوو. بەڵام ئەوەی

دۆخەکەی گەیاندبووە حاڵەتی مەترسی، پەلاماردانی پیاوێکی باریک و ریشن بوو لەلایەن زیندانییەکانەوە کە تا سنووری مردن ئەشکەنجەدرابوو. ئەوەی نەخۆشییەکەی دەگرت، تووشی وەسواسێکی ترسناک دەبوو، لە ناو خەڵکدا بۆ مۆتەکەی ناو خەونەکەی دەگەڕا، کەسانێکی تری لێ دەبووە ئەو ... بە گشتی وەک دکتۆر حسامەدین دەیگووت، هەموو خەوبینەکان تووشی واهیمەی لێکچوون و تێکەڵکردن دەبوون، خەون و ڕاستیان وەها تێکەڵدەکرد، جیاکردنەوەیان ئیتر ئاسان نەبوو .

من ویستم وەسفی دەموچاوی جەلادی ناو خەونەکەم دەستبکەوێت، قسەیەکی زۆرم لەگەڵ زیندانییەکەدا کرد، بەڵام وەسفکردنی دەموچاوێک کە لە خەوندا دەیبینیت ئاسان نییە، هیچ کەس ناتوانێت بە تەواوی بزانێت لە خەوندا کێی بینیوە، ئەوە بڕوای منە. لەگەڵ یاریدەدەرەکانی دکتۆر حسامەدینیشدا، کە دوو پیاوی هێمن و زرنگ دیاربوون، هەندێ قسەمکرد، نەمدەزانی ئەو قسانە دواتر ڕۆڵێکی گرنگ «زۆریش گرنگ» لە داهاتوومدا دەبینن. سەرسەختانە پێم لەوە داگرت کە ئەستەمە مرۆڤ دەموچاوێکی ناو خەونی وەک خۆی لە بیربێت، ئەوانەی لە خەوندا ڕوودەدەن ناکرێت لەگەڵ حەقیقەتدا تێکەڵبکرێن. بەڵام دواجار یەکێک لە زیندانییە لاوازەکان کرابووە قوربانی دەردەکە، هەندێ لە نەخۆشەکان تا لە خولیا و ترس و ئازاری خۆیان هەڵبێن، گەنجێکی لاوازیان بەوە تۆمەتبارکردبوو کە ئەو جادوبازی گەورەیە و دەستی شەیتان خۆیەتی و ئەو بە بەکارهێنانی سیحری ڕەش خزاوەتە خەونەکانیان. ئەشکەنجەیان دابوو، بە تۆمەتی جادوگەریی پەتیان کردبووە ملی و ویستبوویان بیخنکێنن. ئەوە دکتۆر حسامەدینی ترساندبوو، دەترسا لە خۆڕا تاوانێک لە بەندیخانەکەدا ڕووبدات. ئێستا دڵنیابوو شتەکان لە ژێر دەستی دەردەچن و هیچی پێ ناکرێت. بە ناچاری و بە فەرمانی نەقیب زرار زیندانییە بەستەزمانەکەیان گواستبووەوە بۆ نەخۆشخانە و لەوێشەوە بۆ زیندانێکی بچوکتر لە گەڕەکێکی دیکەی شار.

ئەو ڕۆژە تا درەنگ لە زیندان مامەوە، خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و ڕێکخستنی ئەو ڕاپۆرتە بووم کە دەبوو بیدەم بە دکتۆر سیای مامم. خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکان لە لایەن دکتۆر سیاوە هاوشان بوو بە سەرسامییەکی زۆر. دکتۆر چیرۆکەکەی وەک جۆرێک لە لادانی نامەنتیقی و تێکچوونی نەزمێکی گەردونی سەیرکرد. من هەمو زانیارییەکانم بە وردەکارییەکی زۆرەوە بۆ نوسی، پێموابوو ئەوەی من لە زیندان بینیومەوە نیشانەی شتێکی نائاساییە کە دەبێت لە ڕووی زانستییەوە تەفسیرێکی ڕۆشنی هەبێت. سەرەتا باوەڕی بە من نەکرد و خۆی بە نهێنی و بەجۆرێکی تایبەت، دوای ئەوەی دەرگای ژوورەکەی داخست، لەگەڵ دکتۆر حسامەدین بە تەلەفون قسەیکرد. دڵنیابووم وادەزانێت تەواوی چیرۆکەکە زادەی خەیاڵی شاعیرانە و لێکدانەوەی خورافاتی منە کە زۆرجار دەبووە مایەی بێزاری ئەو. دەمێک دڵنیابووهەواڵەکە دەستکردی من نییە، نائومێدانە لە ژوورەکەی هاتەدەرێ و گووتی «شتێکی باش نییە، لەم چیرۆکە ڕازی نیم. هەر شتێک تەفسیری نەبێت ترسناکە، وەک خودا، وەک شەیتان... یان هەر شتێکی تر. دنیای ئینسان لەسەر تەفسیر بەندە». مامە سیام هەمیشە پێویستی بە تەفسیرێکی ڕوون بوو، گەر تەفسیرە زانستییەکان پێدا ڕانەگەیشتبان، دەمودەست پەنای بۆ تەفسیرێکی غەیبی دەبرد. بەڵام ئەو ڕۆژە کە لەگەڵ دکتۆر حسامەدین قسەیکرد، بە هێمنی منی لە ژوورەکەی کردە دەرێ و گووتی «شتێکی بێ پێشینەیە، شتی وام تا ئێستا نەبیستووە. بەڵام دڵنیاتدەکەمەوە هیچ نەخۆشییەک لە گۆڕێ نییە، بەڵام وای بە حاڵی پزیشکێک لە دیلاوار گەر غیرەتی ئەوەی هەبێت بە خەڵک بڵێت، ئێوە نەخۆش نین. خەڵکی ئەم شارە عاشقی نەخۆشین، چەند حەزدەکەن دەوڵەمەندبن، خۆش بژین، ئەوەندەش عاشقی نەخۆشین، نەخۆشی بە جۆرێک لە پاڵەوانێتی و هونەر دەزانن. پێویستیان زیاتر بە نەخۆشییە تا لەشی ساغ»... وای گووت و دەستی برد هەندێ کتێبی

ئینگلیزیی کۆنی لە کتێبخانە هەژار و تۆزاوییەکەی خۆی دەرهێنا و خستنییە سەر مێزەکەی، بە منی گووت «توند دەرگاکە دابخە، توند دەرگاکە دابخە، دەمێکە موتالەعاتم نەماوە، کاتی ئەوەیە هەندێ شت موراجەعە بکەم». مامم چی خوێندەوە و لە دوای چی دەگەڕا، نازانم. بەڵام دڵنیابووم ئەوەی بۆی دەگەڕێت لە کتێبەکاندا نایدۆزێتەوە.

# ٣

ئـەو کاتـەی لای مامـە سیام ئیشـمدەکرد، تەمەنـم ٦٢ سـاڵ بـوو. سـاڵێک لـە کۆلێـژی حقـوق خوێندبـووم، بـەڵام هـەر زوو لـە یاسـا و ناکۆکـی و لۆژیکـە چەوتەکـەی بێزاربووبـووم، سـاڵێک بـەس بـوو تێبگـەم یاسـا لـە جەوهـەردا هیچ نییـە جگـە لـە هۆیـەک بـۆ دیـل و ئیفلیجکردنـی ئینسـان. لـە چەنـد وانـەی یەکەمـەوە تێگەیشـتم، مـرۆڤ یاسـای دروسـت نەکـردوە تـا کێشـەکانی خـۆی پێ چارەسـەر بکات، بەڵکو یاسـای دروسـتکردوە تـا ژیانـی خـۆی پڕبکات لـە کێشـەی بێ کۆتایی و لـە کوێدا کۆسـپێک یـان چاڵێک نەبوو، جەنابی یاسـاناس بێـت و خـەرەندێکمـان بـۆ دروسـتبکات، یاسـا سـەرەتای داگەڕانـی مرۆڤـە بـۆ قۆناغـی دڕندەیـی، دوایـی دروسـتبوونی یاسـا دڕندەیـی مـرۆڤ شـێوەیەکی ڕێکخراوتـر و ئامانجدارتـر وەردەگرێت، بـە پێچەوانـەی جیهانـی پێش یاسـاوە، کـە دڕندەیی ملکەچی ناچاریی و پێویسـتی و مانـەوە بـووە. دوایی بیـرم لـەوە کـردەوە ببـم بـە ئەندازیـار، سـاڵێک ئەندازیاریشـم خوێنـد و تێگەیشـتم یەکێکـە لە پوچتریـن زانسـتەکانی دونیـا، چونکـە بـۆم دەرکـەوت ئـەو یاسـایانەی دونیـای جەمـاد و مەتریاڵـە وشـکەکان دەبەنەڕێـوە، کارێکیـان بـە ئەنـدازە و پێکهاتـی دونیـای ئینسـانەکانەوە نییـە، بـە پێچەوانـەوە کێشـەی وجـودم واهاتـە بەرچـاو وەک ململانێـی دونیـای پـڕ نەزمـی شـتە بێگیانـەکان و دونیـای بێشـێوە و بێفۆرمـی زیندوێتـی بێـت، ئەنـدازە هیـچ نەبـوو جگـە لە وەبیرهێنانـەوەی ناڕێکییە

ئینسانییەکانمان، هەر چەندە یاسایەکی لۆژیکی و تیوریکی هەندەسی وردم دەخوێند، چەندە دەمبینی ئەم یاسایانە دەتوانن جیهانی شتە نەگۆڕەکان پڕبکەن لە یەقین، ئەوەندەش بێ نەزمی و ناڕێکی دونیای ئینسان تووشی پەرێشانی و سەرلێشێوانی دەکردم. بۆ ساڵێکیش چوومە بەر خوێندنی فەلسەفە ... فەلسەفەم لە یاسا و ئەندازە لا خۆشتر بوو، بەلام هەستمکرد فەلسەفە شتێک نییە ئینسان بتوانێت لە کتێبدا یان لە زانکۆدا بیخوێنێت. فەلسەفە کاتێک چێژی هەیە، مرۆڤ خۆی فەیلەسوف بێت... ئەو ساڵە زۆر بە وردی هەندێک لە کتێبەکانی ئەفلاتون و ئەرستۆ و کانت و نیتشەم خوێندەوە، بەلام لە کۆتاییدا هەستمکرد، من ناتوانم فەیلەسوف بم. من لەو کەسانەبووم کە دەمویست بژیم، فەیلەسوفیش دەبێت توانای دەستبەرداربوونی لە ژیان تێدا بێت، دەبێت بیرۆکەیەک یان خەیاڵێکی کەمژانە بتوانێت هەموو مێشکت داگیربکات تا بتوانێت لەو بیرۆکە بلح و گێلانەیە تیورەیەکی قووڵ و قەشەنگ دروستبکەیت. بەلام من لەوانە نەبووم بتوانم ماوەی درێژ لەسەر کتێبێک یان نوسینێک دابنیشم و بیربکەمەوە. وازهێنانم لە خوێندنی فەلسەفە باوکمی بە تەواوەتی نائومێدکرد و ناوم لە نێو خوشک و براکانمدا وەک کەسێکی بێکەڵک و خۆنەناس دەنگیدایەوە. هەتا برا گەورەکانم پێشنیاری ئەوەیان دایە باوکم کە لە ناوەڕاستی بازاڕدا دوکانێکی فرۆشتنی جلوبەرگی ژێرەوەی ژنانم بۆ دابنێن و چیتر کات و ژیانی خۆم بە خوێندنەوە سەرف نەکەم. بەلام باوکم وەک بزانێت بۆ هیچ ئیشێک دەست نادەم، سزایەکی دیکەی دام و جۆرە پلانێکی تری لە فیکردا بوو. دوو ساڵ نائومێد لە دوکانێکی عەجایەبدا گیریکردم و هیچ کارێکی دیاریکراوی پێ نەسپاردم، پێشتر هیچ باوکێک لەم شارەی ئێمەدا بەوجۆرە منداڵی خۆی سزا نەدابوو.

هەموو لەو باوەڕەدا بوون کە هۆی نیگەرانی باوکم ئەو دۆخە نالەبارەی خوێندنە کە تێیدا گیرم کردبوو. بەلام نا... من لە کۆتایی بیست و سێهەمین ساڵەی تەمەنمدا شتێکی ترسناکم تووشهات، شتێک کە خۆشم هۆکارەکەیم

نەدەزانی، شتێک لێرەدا دەبێت ئاشکرایبکەم. شتێک بووە هۆی تێکدانی تەواوەتی ژیانم. ئەو ساڵەی کە لە بەشی فەلسەفە بووم، لە خێزانی منەوە خانمێکیان بۆ دیاریکردم تا بیخوازم و ژیانی خانەوادەیی دروستبکەم، من کە کوڕێکی ئارام و شەرمنیش بووم، هەر زوو پێشنیارەکەم قەبووڵکرد و ڕازیبووم بێ هیچ خۆشەویستییەک خێزانێک دابمەزرێنم و لە کونجێکدا سەرە داوی ژیانێکی هێمن بگرمە دەست و دانیشم. خانمی دەستگیرانم کچێکی تا بڵێی ناسک و سەلار و لەبار بوو، من بە هێمنی و وەک کوڕێکی شەرمن و بێدەنگ دەمویست قۆناغی دەستگیرانی تێپەڕێنم و بچمە سەر ژیانی سروشتی خۆم، ڕاستییەکەی هەستمدەکرد کیژەکەش وەک من ژنێکی ئاسایی و عادەتییە کە خەون بە ماڵ و حاڵی خۆیەوە دەبینێت، هیچ کات هەستم نەکردبوو دڵی بە کەسێکی دییەوە بێت یاخود بەرامبەر من بێزارییەکی قووڵ لە ناخیدا بێت. هەر لەو سەردەمی دەستگیرانییەدا، سەرەتاکانی ئەو دەردەم لێ دەرکەوت، دەمتوانی خەونی ئەوانی تر ببینم... سەرەتا خەونی هەندێ لە برا و خوشکەکانم دەبینی، شەو من خەونەکانی ئەوانم دەبینی و دەمێک بەیانی هەموو لەسەر سفرەی بەرچایی دادەنیشتین، ئەوان بە ڕیز لەسەر کورسییەکانی مەتبەخەکە دادەنیشتن و بەخۆشییەوە دەکەوتنە گێڕانەوەی خەونەکانیان، سەیربوو لەلام کە ڕۆژێک و لە ناکاو بۆم دەرکەوت من شەو خەونی هەندێکیان دەبینم، هەندێ خەون کە ئەوان دەیانگێڕایەوە و شەو من بینیبووم، خەونی خۆم نەبوون، بەڵکو خەونی ئەوان بوو. من هیچم نەدەدرکاند و خۆم ئاشکرا نەدەکرد، بەڵکو بێدەنگ و حەپەساو لەسەر مێزەکە سەیری هەموویانم دەکرد و وەک کەسێک لە سەر لێواری شێتیدا بێت، دەمروانی و غەمگین بووم. تا ڕۆژێک خەونێکم بینی کە دڵنیابووم خەونی «سابات»ـە، ئەو کیژەی دەمویست بیکەمە هاوسەرم. زۆر خۆشحاڵ نەبووم خەونی کەس ببینم، بەتایبەت ئارەزوویەکم نەبوو بچمە دونیای خەونەکانی ساباتەوە، دەمویست پێکەوە بژین بێئەوەی شتێکی

زۆر لەسەر خەیالات و وێنەکانی ناو سەری بزانم، بەڵام بینینی خەونەکان لە دەسەڵاتی مندا نەبوو، پێدەچێت لەبەرئەوەی من خۆم خەونێکی وەهام نەبوو ببینم، دەمتوانی ئەو خەونانە ببینم کە ئەوانی دی دەیبینن. خەون بینینەکانم ڕێک و پێک و بە نەزم نەبوون، سەرەتا شتێک نەبوو بتوانم بەرنامەی بۆ دابنێم و پلانی بۆ بکێشم، هەندێ جار لە شەوێکدا خەوی چەندین کەسم دەبینی، هەندێ جاریش بە چەندین مانگ ئەو توانایەم لە دەستدەدا و ئاسوودە دەخەوتم و بەیانیان دیمەنێکیش چییە نەدەهاتەوە یادم. جارێکیان چەند شەوێک لە خەونەکانی ساباتدا، تارمایی گەنجێکی جوانم بینی کە هەمیشە لە دیمەن و هەڵوێستی عاشقانەدا لەگەڵ ساباتدا دەردەکەوت، من لە خەونەکانی ئەودا هەمیشە بە دەمامکێکی ڕەشەوە دەردەکەوتم، وەک کەسێک بووم لە تاریکییەوە دێت و شتێک دەفڕێنێت و دەڕوات. زۆرجار لە خەونەکانی ئەودا وێنەی کونەپەپوێیەکم بوو کە سەری ئادەمیزادێکی هەیە، کونەپەپوێیەک دەفڕێت و لە تاریکیدا خۆی دەکێشێت بە ڕوخساری ئەو گەنجە نەناسراوەدا و بریندارییدەکات، لە خەونەکەدا سابات بە دارێکی گەورەوە کونەپەپوەکەی ڕاودەنا کە من بووم. هەڵبەت خەونی تری ئەوم دەبینی کە تێیدا دیمەنی عاشقانەی تێدا بوو، بەجۆرێک ڕۆشن دەمتوانی تێبگەم لەسەری بێگوناهی ئەو خانمە ژیکەڵەدا چ شتگەلێکی سەیر کۆبۆتەوە. ڕۆژێک ناچار دانیشتم و هەموو ئەو خەونانەم بۆ ئەو کچە بەستەزمانە گێڕایەوە، کە وەک کەسێک بروسکە لێیدابێت واقی ورمابوو. هەر ئەو ڕۆژە بەدەم گریانەوە دانی بەوەدا نا کە چەندین ساڵە عاشقە و هەموو ئاواتی ئەوەیە بتوانێت لە من جیابێتەوە و بگات بەو کوڕەی کە خۆشیدەوێت. من هەر ئەو ڕۆژە دەستوبرد جیابوونەوەی خۆم ڕاگەیاند و ماڵاوایی هەتاهەتاییم لە سابات کرد. تاکە کەسێکیش کە سەبارەت ئەو دۆخە دەروونییە قسەم بۆ کرد مامە سیام بوو. ڕۆژێک وەک نەخۆشێک چووم بۆ عیادەکە و ژمارەیەکم گرت و وەک هەر نەخۆشێکی نەناس چوومە ژوورێ، سەیربوو

کە ئەویش هەر وەک نەخۆشیکی نەناس پێشوازی لێکردم و داوای لێکردم ڕاز و خواستی پەنهانی دڵم دەربڕم. من بۆم گێڕایەوە کە خەونی ئەوانی تر دەبینم، خەونگەلێک کە دەزانم کەسانێکی تر دەیانبینن، خەونگەلێک هی من نین. سەری سوڕما لە چیرۆکەکانم و پێیگووتم، خۆم بە دووربگرم لە تێفکرین لە نهێنی خەڵکی تر. من دەمزانی کە کەسێکی کونجکۆڵ و تاریکی دۆزم، بەڵام نە تا ئەو جێگایەی هەستەکانم وەها تیژ و دڕ بجوڵێنم، خەونی خەڵکی تر ببینن. مامم تکای لێکردم کە نهێنی خەڵک بپارێزم، هیچ شتێک چەندە بچوک و گەورە بێت نەیدرکێنم و گووتی «ئەم توانایە هەڵبگرە بۆ ڕۆژێک، بۆ کاتێکی گرنگ... کێ چوزانێت، ڕەنگە جارێک سوودێکی هەبێت»، بەڵام هەستم بە دوو شتی سەیرکرد لە چاویدا، یەکەم: ڕێز، دووەم: ترس.

چیرۆکی جیابوونەوەم یەکێک بوو لەو هۆ گەورانەی وایکرد باوکم بیر لە سزادانی من بکاتەوە. باوکم وایدەزانی من چۆن بێهۆ وازم لە زانکۆ هێنابوو، هەمان شێوە و هەر لەسەر هەوا و هەوەس وازم لە سابات هێناوە. بەردەوام دەیگووت «کچێکی ماقوڵ و سەلاری وات دەست ناکەوێتەوە». هەر هەفتەیەک دوای جیابوونەوەم، کلیلی دوکانێکی دایە دەستم و گووتی لە ئێستە بە دواوە دەچیتە سەر دوکان و کەمتەرخەمی ناکەیت، ڕێنماییەکانی ئەوە بوو هەر چی بێت و هەر شتێک ڕووبدات، بەفر بێت یان باران، تەرزە بباریت یان تەور من دەبێت ڕۆژانە لە نۆی بەیانییەوە بۆ شەشی ئێوارە لەسەر کاربم. دوکانێکی چۆڵ بوو، هیچ شتێکی تێدا نەبوو، جگە لە کورسی و مێزێک و تەلەفونێکی سپی و قاسەیەکی ئاسنینی بەتاڵ، من ڕۆژانە دوکانەکەم دەکردەوە و بەتەنیا لەوێ دادەنیشتم و سەیری ڕێبوارەکانم دەکرد، باوکم هیچ کات پێی نەگووتم بۆ دەبێت من بەردەوام بچمە سەر ئەو دوکانە چۆڵە و منیش هیچ کات نەمپرسی، هەموو ڕۆژ بێدەنگ دەچووم و بێدەنگ دەگەڕامەوە، بەدرێژایی دوو ساڵ هیچ کەس نەهات و هیچ کەس لێی نەپرسیم تۆ چی دەفرۆشیت، وادەزانم تەواوی ئەو ماوەیە مەشقێکی سەخت

بوو تا بتوانم لەگەڵ بەتاڵی ژیاندا هەڵبکەم. هەندێ جار کتێبێکم دەبرد و تا تەواوم نەکردبایە هەڵنەدەستام، هەندێ جاریش بێ خەیاڵ دادەنیشتم و تەنیا سەیری ڕێبوارانم دەکرد. دوو ساڵ بەوجۆرە تێپەڕی، لەو دوو ساڵەدا هەتا یەکجاریش تەلەفونە سپییەکەم زەنگی بۆ نەهات، وەک ڕەمزێک لە ڕەمزەکانی تەنهایی من لەوێ بوو، وەک پێمبڵێ دەرگاکانی جیهان کراوەیە و تۆ ناتوانیت بچیتە ژووری، وەک بڵێ سەدان هەزار ئادەمیزاد لەم شارەدان، سەدان هەزار ئادەمیزاد لێرەوە دێنە و دەڕۆن و هیچ کەسێکیان بیر لەوە ناکاتەوە لە تۆ بپرسێت. من تا دەهات بێدەنگتر و تەنهاتر و غەمگینتر دەبووم، بەخیلیم بە ژیانی چڕ و پڕ لە شەوق و جوڵەی خوشک و براکانم دەبرد، بەڵام وام لێهات بێدەنگی و تەنهایی و غەمگینیم بە بنەما سەرەکییەکانی هەموو جۆرە ژیانێکی ڕاستەقینە و تەندروست دەزانی. ئەوەی دەتوانم هەموو ڕۆژێک بچمە سەر دوکانێکی بەتاڵ و تا درەنگ بمێنمەوە، بووبوو بە پرسیاری زۆر کەس، بووبووم بە کەسێک کە بە جۆرێکی ئەفسانەیی بەرگەی پوچی و بێهودەیی دەگرم. زۆرینەی کەسوکارم گومانی شێتی و بێعەقڵی و لە دەستدانی هاوسەنگیان لێ دەکردم، بەڵام دەمێک دەیاندوانم و قسەیاندەکرد سەیریان لێدەهات کە دەیانبینی کەسێکی هێمن و لەسەرەخۆم و دەتوانم بە سەبر و تەحەمولەوە بەرگەی توانج و ئازاردانیش بگرم. دوو ساڵ بوو لەو دوکانەدا کارمدەکرد، ئێوارەیەک بێ هۆ و بێ هیچ پێشزەمینەیەک مامە سیام هات بۆ لام و بێئەوەی زۆر درێژە بە قسەکانی بدات گووتی « دەمەوێت بێیتە لام، من لە عیادەکە پێویستم بە هاوکارێکی باشە کۆمەکمبکات، کەسێک تۆزێک فامیدە و هێمن بێت، بەرگە بگرێت و سەبری هەبێت... تۆش گەنجێکی ئارام و سەبوور دیاری کە پێناچێت پوچی ژیان زۆر ئازارت بدات». هەندێ وەسفی دیکەی منی کرد و گووتی «زۆر بیرم لێ کردۆتەوە، وادەزانم تۆ بۆ ئەو ئیشەی من باش بێت». من وەک کەسێک کە لە نێوان ڕێزی باوک و مامیدا گیریکردبێت، داوامکرد کە مامە سیام ئەم داوایە بەرێتە لای

باوکم و چیرۆکەکە لەگەڵ ئەودا باسبکات. لە ڕاستیدا من ئەو دوو ساڵەم وەک حوکمێکی سزا سەیردەکرد، بەڵام لەو باوەڕەشدا نەبووم ئەو حوکمە ئەبەدی بێت، ڕاستە وەک خوشک و براکانم نەبووم، بەڵام هەستم نەدەکرد شایەنی سزایەکی وەها سەختیش بم. هەفتەیەک دواتر ئێوارەیەک مامم و باوکم پێکەوە هاتن و باوکم بە دەنگێکی پیر و گڕ کە خاڵی نەبوو لە توڕەیی و نیگەرانی گووتی «دەعبا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئەم دوکانە جێبهێڵیت و ئیشێکی باش و ڕاستەقینە دەست پێبکەیت... هەستە لەسەر ئەو کورسییەوە و کلیلی دوکانەکەم بدەرێ و بزانە مامە سیات چی دەڵێت. بەدبەخت، باش گوێبگرە، لەمڕۆ بەدوا، مامە سیات هەر چییەکی گووت بەسەر سەر لە فەرمایشتدا دەبێت».

کە چوومە لای مامە سیام، خودی ژن و کچەکانی مامم گەلێک ناڕازیی و نەیاربوون، منیان وەک کەسێکی بێ کەڵک دەبینی کە جگە لە دەردیسەری هیچی تر دروست ناکەم . ماوەیەکی زۆری نەبرد کە مامە سیام بە ستایش و لێدوانی باش دەربارەی من شتێک لە ڕێز و نرخی لای هەمووان بۆ دروستکردم، هەڵبەت هەموو دەیانزانی ئیشەکە شتێکی وەها گرنگ نییە و من دواجار لە بەردەستێکی دکتۆر بەولاوە هیچی تر نیم. هەتا هەندێ لە براو خوشەکەکانم دەیانگووت «هاهاهاها... دواجار دیاربوو چارەنوست ئەوەیە، بوویتە فەڕاش». من هەمیشە جنێوەکەم قەبووڵدەکرد و فرمێسکەکانم دەگرتەوە و بە خۆم دەگووت «وانییە، با ئەوان هەروابڵێن، من یاریدەدەری یەکەمی دکتۆرم». لە ماوەی کارمدا دکتۆر تەنیا وەک بەردەستێکی هوشیار سەیری منی دەکرد، هەندێ جار بیویستبایە قسەیەک بکات و بیزانیبایە هیچ کەسێک تێیناگات، منی بانگدەکرد و دەرگای ژوورەکەی دادەخست و دەکەوتە قسەکردن بۆم. مامم هەندێ کێشەی فیکری و ڕۆحی هەبوو کە دەیزانی من نەبێت هیچ کەسێکی دیکە لە خانەوادەکەمان تێی ناگات. ئەو دڵنیابوو، من تاکە خوێندەواری هەموو بنەماڵەکەیانم. لە ڕاستیدا بنەماڵەی زەریاواری

گەمژە خێڵێک بوو بۆ خۆی، هەتا یەک کەسیشم نەدەناسی لە ژیانیدا چیرۆکێکی خوێندبێتەوە، لە باشترین حاڵەتدا و گەر زۆر بلیمەت بان گوێیان لە دەنگوباسی تەلەفزیۆن دەگرت. مامم دەیزانی من چەند دەخوێنمەوە، بەلام پێی سەخت بوو بە ئاشکرا بڵێت من هاودەمێکی باشم و دەتوانم لە زۆر شت حاڵی بم، لە منداڵییەوە تەواوی بنەماڵەکە بە چاوێکی سووک سەیری منیان دەکرد، وەک گەنجێک کە لە وریایی و توانای ئیش و پارە پەیداکردندا نەچوومەتەوە سەر باوو باپیرانم، مامیشم گەرچی دەیزانی ئەم بڕوایە نادروستە، کەچی شتێکی نەدەکرد دەریبخات، من تاکە خوێندەوارەی بنەماڵەی زەریاواریم. گەر میوانێک یان کەسێک بهاتبایە هەر زوو خۆی کودەکردەوە و دەیویست بە ئەنقەست من تەنیا وەک بەردەستێکی بچوک و ئیشکەرێکی کەمێک زرنگ نیشانبدات، هەر زوو هەندێ کاری ڕێکخستن و پاککردنەوەی دەدا بە سەرمدا تا میوانەکە بزانێت من تەنیا بەردەست و خزمەتکارێکی زەلیلم، منیش هەموو کارو ڕاسپاردەیەکم بە وردی و بێ کێشە ڕادەپەڕاند. مامم دەیزانی بەدبەختی من لەوەدایە کە ناتوانم کەسێکی ئاسایی بم. خۆی سەرەتا باوەڕێکی پتەوی بە جیاوازیی نێوان مرۆڤی ئاسایی و شێت هەبوو، بەلام دواتر کە لە بەر هەندێک هۆ ئەو بیروڕایانەی خۆی بە جۆرێکی بێمانا گۆڕی، گەلێک نیگەران بووم لێی و گەلێکیش لە بەرچاوم بچوک بووەوە. ئەو سەرەتا ئەو جیاوازییەی بە بنەمای ئیشەکەی خۆی دەزانی. بەلام منی وەک مەخلوقێکی سەیر دەبینی، ئەو دەیگووت «لە نێوان مرۆڤی ئاسایی و شێتدا ڕەگەزێکی تر لە بەشەر هەیە، کە نە ئاسایین و نەشێتن، سەرنجڕاکێشترین جۆری بوونەوەران لەو ڕەگەزەن، عرقێکی زۆر بڵاو نین، بە ژمارە کەمن، بەلام هیچ مرۆڤێکی جوانم نەبینیوە سەر بەو ڕەگەزە نەبێت، تۆش سەر بەوانیت، بەلام کەسانی وەک تۆ ڕۆژێک شێت دەبن، کەم کەس دەتوانێت تا کۆتایی لەسەر خەتەکە بوەستێت، کەم کەس. تۆش یان دەبێت ببیتەوە بە کەسێکی ئاسایی یان ڕۆژێک دێت تۆش

شێت دەبێت». دەیزانی من هیچ نالێم، دەیزانی من گەر جارێکیش بمەوێت شتێک بڵێم، ئەو دەموەستێنێت و ناهێڵێت تەواویبکەم، کەم جار ... زۆر کەم ... دەیهێشت من بۆچوونەکانی خۆم تا کۆتایی باسبکەم. بۆی گرنگ نەبوو من چی دەڵێم، بەڵام دەیزانی من شتەکان جیاواز دەبینم، دەیزانی من بەجۆرێکی زۆر جیاواز دەتوانم قسەبکەم، بەڵام هیچ کات خودی قسەکانمی بۆ گرنگ نەبوو، بەڵکو ئەوەی کە من جۆرە کەسێکی ترم، جۆرە دەروونێکی ترم هەیە سەرسامیدەکرد. من سەرەتا زۆر بەختەوەردەبووم گەر کەسێک هەبایە و لەگەڵیدا هەندێ بیروڕام بگۆڕیبایەتەوە، بەڵام هیچ هاوڕێیەکی نزیکم نەبوو، لەبەرئەوە گەر کاتێکم ببوایە یان بە خوێندنەوە یان بە بیرکردنەوە یان بە خەوتن دەمبردە سەر. هێدی هێدی وام لێهات تکام لە مامم دەکرد، مۆڵەتم بداتێ شەو لە سالۆنی عیادەکە بخەوم. ئەو گەرچی خۆی نارەحەت و تووڕە دەردەخست، بەڵام چاوپۆشیدەکرد و لێدەگەڕا شەو لەوێ بمێنمەوە. ڕاستە عیادەکەی جێگایەکی کۆن و پڕ ئەساسی پەڕپوت بوو، لە ڕووی پاکی و دیکۆرەوە، چەندین ساڵ لە دوای جێگاکانی تری شارەکەوە بوو، هاوینان مێش و مەگەز سالۆنی چاوەڕوانییەکەیان پڕدەکرد، بۆنی نەخۆشەکان دەبووە مایەی تەنگەنەفەسی و غەمگینی ... بەڵام تازە بۆ من وەک ماڵی لێهاتبوو و لە زۆر جێگای دی پێم خۆشتر بوو.

ئەو شەوە دوای سەردانی زیندان من لە عیادەکە مامەوە، کەمێک سەرسام و مەستبووم، چیرۆکی ئەو خەونەی زیندان زۆر خەیاڵی گرتبووم. مامم کتێبێکی زۆری لەسەر مێز و کورسییەکانی ژوورەکەی خۆی بڵاوکردبووەوە، دیاربوو لە ناو کتێبەکاندا بۆ شتێک گەڕابوو، وەک بیەوێت بزانێت ئاخۆ پێشتر لە مێژوودا حاڵەتی وەها بووە، شتێک هەیە ناوی ڤایرۆسی خەون بێت. ئەو ژوورەکەی بەجۆرێک پژاندبوو، من هیچ ئارەزوویەکم نەبوو کۆیبکەمەوە. هەڵبەت بۆم نەبوو هیچ جۆرە پێخەفێکی تایبەت ببەمە عیادەکەوە، تاکە شتێک توانیبووم دزەی پێبکەم، چەرچەفێکی

سپی بوو کە لەسەر قەنەفەیەکی کۆن و شکاوی ژووری چاوەڕوانییەکە دەمدا بە خۆمدا. ئەو شەوە، نزیکی دوانزەی شەو، عیادەکە تەواو کش ومات بوو، من ڕۆمانێکی کازانتزاکیسم بە دەستەوە بوو، من مەستی خوێندنەوە بووم کە بە جۆرێکی ناوەخت و کتوپڕ زەنگی تەلەفونەکە لێیدا. هیچ کەس نەیدەزانی من لە عیادەکەم، زۆر کەسیش هەر نەیدەزانی عیادەکە تەلەفونی هەیە، ئەوە ژمارەیەکی تایبەت بوو کە مامم هەندێ جار لەگەڵ ماڵ و هەندێ جاریش لەگەڵ ئەکادیمیستەکانی تری جەمعییەتەکەدا قسەی پێدەکرد. من واهات بە خەیاڵمدا مامم بێت و داوای شتێکی تایبەتی لە من بکات، تەلەفونەکەم هەڵگرت و چاوەڕوانی قسەی بەرامبەرم بووم. لەوبەری خەت بێدەنگییەکی گەورە زاڵ بوو، یەکێک بە هێمنی هەناسەی هەڵدەکێشا و هیچی نەدەگووت. من پێموابوو کەسێک بێت بە هەڵە ژمارەیەکی لێدا بێت، بۆئەوەی زۆر بە هەڵەدا نەچێت، گووتم «ببورن ئەمە ژمارەی عیادەیەکی پزیشکییە، گەر ژمارەکەتان بە هەڵە گرتووە، شەوێکی ئارام و خۆشتان بێت». من بە هێمنی تەلەفونەکەم دانایەوە و چەند هەنگاوێک دوورکەتمەوە، هێشتا نەگەیشتبوومەوە سەر جێگای خۆم کە دووبارە زەنگی تەلەفونەکە لێیدایەوە، دووبارە هەڵمگرتەوە. دەنگێکی ئاشنا لەوسەرەوە، بە ئاوازێک کە پڕ بوو لە دوودڵی گووتی «تۆ دکتۆر سیامەندیت؟». دەنگی نامۆ نەبوو بۆم، بەڵام هەر چیم کرد نەمزانی کەی و لە کوێ ئەم دەنگەم بیستووە، من ترسام... بێئەوەی هێمنی خۆم لە دەست بدەم گووتم «نا، من ڕێنواری زەریاواریم، من یاریدەدەری یەکەمی دکتۆرم، بفەرموو کارێکی تایبەتتانً هەیە».

هیچی نەگووت، وەک ئەوەی بیربکاتەوە شتێک بڵێت و نەزانێت چی بڵێت، ماوەیەک وەستا و دوایی تەلەفونەکەی داخست. من ماوەیەک سەرسامانە بە دیار تەلەفونەکەوە وەستام و چاوەڕوان بووم دووبارە زەنگ بداتەوە، بەڵام زەنگی نەدایەوە.

# ٤

گەڕەکی «غەفاری» دەکەوێتە باکووری خۆرهەلاتی شارۆچکەکەمانەوە، کوچەکان لەوێ لە زستاندا دەبنە قوڕ و لیتەیەکی بێوێنە، شوێن تایەی ماشێنەکان کۆلانەکان وەها چالدەکەن و دەیکێلن، دواتر هاتوچۆ بۆ پیادەکان گەلێک سەخت دەبێت. هاوینانیش تەپوتۆزێکی خنکێنەر لەو کوچانەدا مرۆڤ خەفەدەکات، بایەکی گەرمی پێدەشتەکانی دەرەوەی شار، لەگەل خۆیدا لەپال تۆز و پوش و پەلاشدا، سەرە کەرتەشی و کەرخۆرەش دەهێنێت، ئێواران هەوا پڕدەبێت لە پۆلە مێروو و مەگەزی سەیر سەیر کە وەک هەوری ڕەش، بە کۆلانەکاندا دەسوڕێنەوە و ڕێبواران هەراساندەکەن، بەلام سەیرترین شتی تایبەت لەو گەڕەکانەدا ئەو هەموو باڵندە سەیرەیە کە ئێواران لەسەر سەربان و ستارە و تەلی کارەباکان کۆدەبنەوە، دەیان جۆرە باڵندەی جیاواز جیاواز کە هەندێکیان بە دەگمەن لە ناو شاردا دەبینرێن، باڵندەی کێوین، لە شوێنی بەردین و عاسیدا دەژین، لە کێو دوژمنی یەکن، کەچی لێرە لە شاردا دێنە سەر گۆیسەبانەکان و پێکەوە هەلدەنیشن و وەک کوڕی حەکیمان بن، دەستەیەک بن لە دوورەوە بۆ وردبوونەوە و پشکنین هاتبن، لە جێگای خۆیانەوە لە هەموو شتێک دەڕوانن، چاویان و باڵەفڕێ و بەرزبوونەوە و نیشتنەوەیان هەر کەسێک تووڕەدەکات، گەر بێت و بە وردی لە ڕەفتاریان وردبێتەوە. باڵندەکان لەسەر سەربانی مزگەوتی غەفاریی و لەسەر منارە و

بلندگۆکانی زیاتر لە هەر جێگایەک دەنیشتنەوە.

ئەو ڕۆژە دوای نوێژی نیوەڕۆ «حامید سوڵتان» و «فەراسە ڕەش» کە هەموو بە «بەرازە ڕەش» بانگیاندەکرد، لە بەردەم ماڵی «مامۆستا ئەسلان» دا وەستابوون کە دوور لە چاوەڕوانی ئەوان پۆلێکی گەورە لە باڵندە کە پێشتر ئاوها بە پۆلی گەورە نەیانبینیبوون، بەسەر ماڵی مامۆستا و دواناوەندی «شەبەیخون» دا دەسوڕانەوە. مامۆستا، کە کەسە نزیکەکانی بە سەی ئەسلان بانگیاندەکرد، نزیکی چواردە ساڵ لەو قوتابخانەیەدا وانەی مێژووی گووتبووەوە، لەوانەبوو کە هەستیدەکرد ژیان و هەستەکان و زمانی ئێمە لە دێلاوار هەمووی لە مەترسیدایە. پیاوێک بوو چاویلکەیەکی پزیشکی ئەستووری لە چاودەکرد و خۆی بە عاشقی یەکەمی دێلاوار ناودەبرد. ئەویش وەک زۆربەی خەڵکانی تری دێلاوار ڕای وابوو باڵندەی نامۆ و قەڵەڕەشان، هەمیشە پەیامێکیان لەو دونیاوە پێیە، ڕقێکی تایبەتی لەم باڵندانە بوو، لە منداڵییەوە ڕقی لێیان بووە، لە مێژبوو خەونی بوو دێلاوار ببێت بە شارێکی خاڵی لە باڵندەی نامۆ و نەناسراو، ئەم باڵندانەی بە هێمای هێرشێکی غەریب دەبینی، کە لە مێژە بە جۆرێکی نهێنی دەستی پێکردوە. کە هات دەرگا لە حامید و هاوڕێکەی بکاتەوە، گووتی «خودا ئامان، تا ئێستا پۆلی وا گەورەی تەیروتیورم لەم ناوە نەبینیوە، ڕقم لەم باڵندانەیە، کەس نازانێت لە کوێوە هاتوون بۆ دێلاوار». بەرازە ڕەش کە تەمەنی بیست و سێ ساڵێک دەبوو، خرێکی ڕەشتاڵ بوو بە قژێکی لوول و سمێڵێکی زۆر زلەوە، گەرچی زۆر گەنج بوو، بەلام بە سەروسیما لە پیاوێکی چل ساڵەی کامڵ دەچوو. هەر لە منداڵییەوە وەها بوو، نەچووبووە پۆلی سێی ناوەندی کەچی سیماو هەیئەتی پیاوانی وەرگرتبوو، ئەوە لەگەڵ ناوەوەی دەروونیدا نەدەگونجا کە هەمیشە منداڵ و ڕقاوی و گرۆزبوو. فەراس لە ڕوخساری خۆی زۆر بە گومان بوو، ئێستا هەستی بە پارچەپارچەبوونێکی ناوەکی قووڵ دەکرد. بەسەرێک قورئانی دەخوێند و خوداپەرستیدەکرد و لە مزگەوتدا لە

پێشـەوە دادەنیشـت و دەمێک مـەلا زاهیـر قسـەیدەکرد، دڵـی پڕدەبوو لـە گریـان. بەسـەرێکی دیش ڕۆژانـە چەنـد سـەعاتێک سـەیری فیلمـی ڕووتـی دەکرد و لـە کەناڵـە ئاسـمانییەکان سـەیری ئـەو کلیپـە ئیرۆتیکیانـەی دەکـرد کـە تێیدا لەشـی نیـوە ڕووتـی کیـژەکان هەمـوو خـەیاڵاتێکی فاسـید و ڕەشـیان تیـا دەخولقانـد. دەیویسـت تێبـگات خـۆی چییـە، هـەم ئیمانـی ئـازاری دەدا و هـەم جەسـتەی، هـەم دەیویسـت خـۆش بـژی و هـەم دەیویسـت تۆبەبکات و دونیـای لـەزەت و مادییـات فەرامۆشـبکات. فـەراس کـە بەشـی زۆری ئـەم سـاڵانەی دوایـی بـە دیـار تەلەفزیۆنـەوە بردبـووە سـەر، دەمێک سـەی ئەسـڵان سـەیری ئاسـمانی کـرد و باڵندەکانـی بینـی، هەسـتیکرد ئەمجـۆرە دیمەنـەی لـە چەندەهـا جێگادا بینیـوە، لـە فیلمـدا، لـە چیرۆکـدا، لـە ژیانـدا... لـە جێگایەکی دیکەشـدا. هەمیشـە ئـەم قەلەڕەشـە مەلعونانـە لـە کات و جێگای ناجایـزدا دەردەکـەون و هەردەمیـش یـەک شـێوە هەسـت لـە مرۆڤـدا دروسـتدەکەن. فـەراس بـە توڕەییـەوە گـووتی «ئینسـان بۆ هـەر کوێیـەک دەچێـت ئـەم باڵندانـە بەدوایـەوەن». توڕەبوونەکـەی هۆیەکـی گونجـاوی هەبـوو، چەندیـن شـەو بـوو لەگـەڵ حامید سـوڵتان و نزیکـی دە گەنجـی دیکـەی گەڕەکەکـەدا خەونێکـی سـەیریان دەبینـی، هەمـوو پێکـڕا یـەک خەونیـان دەبینـی، لـە خەونەکانیانـدا هەمیشـە ئـەم قەلـەڕەش و باڵنـدە کێویانـەی سـەر ئاسـمانی غەفاریـی دەردەکەوتنـەوە، ئـەم باڵندانـە، ئێسـتا هـەر بـە ڕاسـتی وەک ئـەوەی لـە خەونـی ئـەوان هەڵهاتبێتـن، بەسـەر سـەریاندا دەفڕیـن. حامیـد سـوڵتان بـە پێچەوانـەی فەراسـە ڕەشـەوە، جلێکـی گەلێـک ڕێـک و جوانـی پۆشـی بـوو، چاویلکەیەکـی ڕەشـی نابـووە سـەر چـاوی، قـژی بـە جیلێکـی بریقـەدار چەورکردبـوو، هێنـد بـە ویقـار و بـە شـکۆ بـوو، فـەراس لـە پێشـدەمیدا هـەر بـە گەدایەکـی شـڕۆڵە و لانـەوازی دەکـرد. فـەراس دوو هەفتـە لـە مەوبـەر، یەکـەم خەونـی بینیبـوو، خەونەکـەی پڕبـوو لـەم باڵندانـە... پیاوێـک لـە نـاو پۆلێکـی گـەورەی باڵنـدەدا دەردەکەوێـت و ئارەزوویەکـی توندی کوشـتن لە دەمارەکانیدا دەسـوڕێتەوە، لـە فەزایەکـی سـەیر و تەماویـی و پـڕ لـە هـاواری باڵنـدەدا بـە

چەقۆیەکی درێژ سەری ئەم گەنجانە دەبڕێت و فڕێیان دەداتە سەر بەردێکی سپی. سەرەتا ئەو خەونەکەی بینیبوو، دوای ئەو حامید سوڵتان، دوای ئەویش وەک ئاگری ناو پوش بە ناو کوڕانی گەڕەکدا بڵاوبووبووەوە، هەمووشیان هەمان خەون دەبینن، بە هەمان ئەو باڵندانەوە، بە هەمان ئەو کێردە تیژە درێژەوە، بە هەمان ئەو پیاوە لاوازەوە کە بۆ کوشتن دەردەکەوێت، بە هەمان ئەو پەلامارەوە کە پڕبوو لە ئارەزوویەکی خوێناوی، ئەو سەربڕینە بە کاوەخۆ و هێمنە، ئەو لەزەتبردنە لە دانانی چەقۆکان و سەیرکردنی خوێنی ئەوان وەختێک دەڕژێت، ئەو هاوارەی دوای لێکردنەوەی سەرەکە لە گەروی دێتەدەرێ، ئەو درەختە لە ناکاوانەی لە خەونەکەدا سەوزدەبن، ئەو هەموو گیا دڕندەیەی لە ناکاو بۆنیان دەگاتە هەناسەی خەوتووەکان، هەمیشەش ئەو سەرە بڕاوانە کە بەسەر بەردێکی سپیدا تلدەبنەوە. دوو کوڕە گەنجەکە هاتبوون بۆ لای مامۆستا ئەسڵان خەونەکەیان بگێڕنەوە، باسی ئەوە بکەن کە خەونەکە بە جۆرێکی بێمانا ژیانیانی تێکداوە، هەمیشە ڕوخساری ئەو پیاوەی لەخەونەکەدایە ئازاریاندەدا، ئەشکەنجە دەبینن، وەک خولیایەکی ترسناک دەستیان لێ بەر نادات. حامید کە لە ژوورەوە چاویلکە ڕەشەکەی داکەندبوو و بە جۆرێک لەسەر فەرشی ماڵی مامۆستا دانیشتبوو دەقی قاتەکەی تێک نەچێت، بە دەنگ و تۆنی گێڕانەوەکەیدا دیاربوو کە زۆر نائاسوودەیە و ئازار دەچێژێت، ڕوخساری مردوو و بێلایەن دەینواند، لەوانە بوو کە ناتوانیت لە چاویاندا، یان لە جوڵەی برۆ و لێو و دەستیاندا شتێکی ڕوون بخوێنیتەوە. هەموو شتێکی دەکرد هیچ لە ویقاری خۆی تێک نەدات و هەستێک یان ڕستەیەک دەرنەبڕێت دوایی بۆی ڕاست نەکرێتەوە، بەڵام دەنگی بە ڕۆشنی ئازاری پێوە دیاربوو. گووتی «کێشەکە مامۆستا لە خەوەکەدا نییە، خەو هەر چییەک بێت ئینسان گەر نەمرێت خەبەری دەبێتەوە، بەڵام من لە دوای خەوەکە یەک ئارەزووم تێدا دەجوڵێت کە مامۆستا پێشتر نەمدیوە، هەستدەکەم تەنیا بەوە لەم مۆتەکەیە ڕزگارم

دەبێت کە ئەو پیاوە بدۆزمەوە و بیکوژم... هەستدەکەم ئەم پیاوە هەر خۆی نییە، بەڵکو زۆرن، شتێکی سەیرە مامۆستا، لە دڵەوە هەستدەکەم جنسێک لە بەشەر لەم شارەدا دەژین کە خوێنیان حەڵاڵە». بەرازە ڕەش گوێی لە قسەکانی حامید دەگرت و زەردەخەندەیەکی پیس لەسەر لێوی بوو، زەردەخەندەیەک تەنیا لە کاتی خۆئاسوودەکردندا لە بەردەم فیلمەکانی پۆرنۆدا دەپەڕییە سەر لێوی، حامید چەند قسەی بکردبایە، مامۆستا ئەسڵان تەنیا سەیری ئەو خەندە شەیتانییەی سەر ڕوخساری بەرازی دەکرد، کە هەم مەکربازانە و هەم گومڕاش دەردەکەوت، پێشتر چەند جار ئەوی بینیبوو، سەرنجی خەندەی وەهای نەدابوو. دەیزانی گەنجەکانی دێلاوار، خاڵی نین لە شەهوەتێکی سەرکوتکراو و دڕ، بەڵام چ بەشەرێک هەیە پڕ نەبێت لە شەهوەتی دڕ؟ . مامۆستا ئەسڵان لە ناخەوە باوەڕی بەوە بوو دەتوانێت ئەو شەهوەتە دڕە بە جۆرێکی تر بخاتە کار، دەیویست ئەو ئارەزووە بخاتە خزمەتی شتێکی گرنگ و پرۆژەیەکی پیرۆزەوە. خودی خۆی لەو شەهوەتە کێویی و ڕام نەکراوە بێبەش نەبوو، سا بگات بەم هەرزەکارە وێڵانە کە لە سەرەتای جۆش و خرۆشی گەنجیدا بوون. سەرەتا هێندەی خەیاڵی لای ئەو خەندە ژەهرینەی فەراس بوو، خەیاڵی لای چیرۆکی خەونەکەی حامید نەبوو، کە تەنیا بە دوودڵی و چەوتبینی گەنجێکی بەدگومانی تێگەیشت. بەڵام فەراس کووتی «بەڵێ مامۆستا، شتەکە خەریکە ناخۆش دەبێت، کەسێک هەیە دەچێتە مێشکمانەوە و سەرمان دەبڕێت. تۆ ئەمە چۆن لێکدەدەیتەوە، هەموو شەوێک من لە خەومدا سەردەبڕدرێم، ئەوە هەموو گیانم دمخاتە سەر ئاو و چی دەمار و ئێسکێک لە بەدەنما هەیە سڕیاندەکات، هاتووم بە جەنابتان بڵێم کە بیر لە کڕینی چەک دەکەمەوە، شتەکە لە خۆڕا نییە، خەو لە خۆڕا نابینرێت، قەت خەو لە خۆییەوە نایەت... ئێمە قوتابی تۆین، تۆ ئەوەتەی هەیت پێمان دەڵێیت دێلاوار لە مەترسیدایە، ئێوە لە مەترسیدان، شتەکەمان بە گاڵتە گرتبوو، بەڵام جەنابتان لەسەر هەقن، ئەم خەونە وەک

تاعوون ڕۆحی ئینسان ڕەشدەكاتەوە...هاتووین ئیرشاد و ئامۆژگاری لە تۆ وەربگرین». مامۆستا ئەسڵان دووجار خەونەكەی لە سەرەتاوە پێگێڕانەوە. ئەو پێشتر لەم چیرۆكانەی نەبیستبوو. بەلام بە وردی وەسفی ئەو پیاوەی لێپرسین كە لە خەونەكاندا دەردەكەوێت. گووتی «كێ دەڵێت ئەو پیاوەی تۆ لە خەوەكەدا دەیبینیت، هەمان پیاوە كە ئەوانی تر دەیبینین، دەلیل چییە؟ . ئینسان لەم مەسەلەیەدا قەت ناگاتە یەقین، ڕەنگە ئەو دوو كەسە لەیەك بچن، بەلام ئەوەی دڵنیابین یەكێكن، شتێكی ترە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە خەونەكەدا دەردەكەوێت یەكێك بێت یاخود دووان هیچ كارێكی نییە، هیچ وەزیفەیەكی نییە. من نازانم بۆ ئێوە خەوی وادەبینن، بەلام بە دووری نازانم كە دوژمن هەندێك جادو و سیحری خستبێتە كار تا كار لە گەنجەكانمان بكات و متمانەیان نەهێڵێت، من خوێندومەتەوە كە كۆن دوژمنان، كاری وەهایان كردوە، بە فێڵ و حیكایەت و درۆكردن خەڵكی دێلاواریان كردۆتە كۆیلە و بندەستی خۆیان». فەراس گووتی «مامۆستا، بەڵێ، یەكێك بن یان دووان، هیچ لە هیچ ناگۆڕێت ، گەر دووان بن خراپتر. پێش ئەوەی ئەم خەوە ببینم، تەنیا حەزم لە ئافرەت بوو، دەزانم بێئەدەبییە لە بەردەم جەنابتدا شتی وا باسدەكەم، حەرفی لەوجۆرە دێت بەزارمدا، بەلام خۆت دەزانی ئێمە گەنجین و لە هەموو شت مەحرومین، من تەمەنم بیست و سێ ساڵە هێشتا پەنجەم بەر پەنجەی ژنێك نەكەوتووە، بەلام لەوەتەی ئەو خەوە دەبینم بیرم لای یەك شتە... بچم بۆ جێگایەك بە ئیسراحەت لولەی تفەنگەكەم بكەمە دوژمنێك، مامۆستا خەوەكە خەریكە تەواو تێكم دەدا، شتێكی لە گیانمدا دروستكردوە گەر نەجوڵێت و نەیەتە دەرێ لە ناوەوە دەمخوات».

دوو كوڕەكە زۆر بە هێمنی و عاقڵانە باسی ئەوەیان بۆ مامۆستا كرد، كە لەو كاتەوەی خەونەكە دەبینن شەڕانی بوون، باری ڕۆحیان گۆڕاوە، هەست بە غەمۆكییەكی زۆرتر دەكەن، پێیان وایە لە جاران زیاتر پێویستیان بە ناو خەڵكە، زیاتر حەز لەوەدەكەن تەنیا نەبن و لە كۆڕ و

کۆمەڵدا خۆیان ونبکەن.

سەی ئەسڵان هیچی ئەوتۆی نەبوو پێیان بڵێت، چەند ساڵ بوو هەوڵی دامەزراندنی حیزبێکی دەدا بە ناوی عاشقانی دێلاوارەوە، گەنجەکانی گەڕەکی غەفاریی زۆربەیان قوتابی خۆی بوون. فەراس تا لە قوتابخانە بوو خۆی بە موریدێکی مامۆستا و بیرکردنەوەکانی دەزانی. دوای دەرچوونیشی لە قوتابخانە، جار جار لەگەڵ هەندێ قوتابی کۆنی مامۆستا دەچوونە خزمەتی و گوێیان لە ڕەخنە توندەکانی دەگرت سەبارەت بە حوکمڕانەکانی دێلاوار، هەمیشە هەندێ دەستنوسی خۆی دەدانێ بیخوێننەوە، کە زۆریان پەلاماردانی دوژمنە چەپەڵەکان بوو، ئەو دوژمنانەی چاویان لە خاک و سامانی ئەم هەرێمە بڕیوە. مامۆستا هەمیشە فەنتازیایەکی زۆری سەرفدەکرد کە دوژمنانی دێلاوار وەک کۆمەڵێک جانەوەری دڕندە نیشانبدات. ئێستا نەیدەزانی چی لەسەر ئەم خەونە بڵێت، هەر ئەوەندە بوو پێشنیاری دا، کە هەموو ئەوانەی خەونەکە دەبینن، هەفتەی داهاتوو لە ماڵە هاوینەکەی ئەو، لە دووری چل کیلۆمیتری دێلاوارەوە کۆببنەوە. لە ڕاستیدا بۆیە ئەو پێشنیارەی دا، چونکێ قسەیەکی نەبوو بیکات. کە دوو کورەکە ڕۆیشتن، بەپەلەو بێئەوەی بوەستێت، سەرکەوتە قاتی سەرەوە بۆ لای کتێبەکانی خۆی، هەستیکرد دەبێت دووبارە هەندێ شت لەسەر خەونەکان بخوێنێتەوە. دڵنیابوو کتێبەکان زانیارییەکی پێدەبەخشن و بەجۆرێک ڕێنماییدەکەن. بەڵام بەردەوام خەیاڵی لای باڵندەکانیش بوو، لای ئەو پۆلە گەورەیە لە پەلەوەرانی شوم و نەگبەتیهێن. دوای کەمێک گەڕان لە ناو کتێبەکاندا، لە پەنجەرەی کتێبخانەکەوە جارێکی دی سەیری باڵندەکانی کردەوە، بەڵی باڵندەکان هێشتا وەک هەوری ڕەش بە ئاسمانی گەڕەکی غەفارییدا دەسوڕانەوە.

# ٥

دەڤەرێکی زۆر گەورە چواردەوری دێلاواری گرتووە، سەدان گوند و شارۆچکەی لە خۆی بچوکتر بە جۆرێکی نارێک لە دەوری شار بلاوبوونەتەوە، زستان لە هەموو لایەکەوە بای سارد ڕووی تێدەکات و هاوینانیش لە هەر چوار قورنەی دونیاوە تەپوتۆز، بەهاران زۆر شاددەبێت و پاییزان زۆر غەمگین. دێلاوار جاران بە بەروبومی دەوروبەر دەژیا، لە کەژ و کێوانی دەوروبەرەوە جووتیارەکان بەشی پێداویستی ئێمە ماست و پەنیریان دروستدەکرد، ئاژەڵیان بەخێودەکرد، بەلام چەندین ساڵە کەس نازانێت چی بەسەر ئەم هەرێمانەدا هاتووە، خەبەرێک لە بەروبومی جووتیارەکان نییە، دەڵێن ئەو پەلامارە زۆرانەی کە سوپا و میلیشیا و خێڵە دوژمنەکان دەیکەنە سەر خاکی دێلاوار هۆیەکی سەرەکییە بۆ کزبوونی بەربومی ناوخۆ. شارێگەیەکی باریک و درێژ هەیە کە دێلاوار بە دەرەوە دەبەستێتەوە، ئەو ڕێگایەش سەد ساڵە بە تەواوی لە چنگی خێڵی ماروفیدا یە، یەکێک لە دەسەلاتدارترین بنەماڵەکانی دێلاوار، شتێک قاچاغ نەبێت لەو شارێگایەوە دێت، ڕێگایەکی باریک و نەبڕاوە و غەمگینە کە کەم کەس دەتوانێت سەفەری پێدا بکات. ئەوانەی سەفەریان پێیدا کردوە ئامۆژگاریماندەکەن نەیگرینە بەر و سەفەری پێدا نەکەین، نە لەبەرئەوەی خەتارناکە یان چەتە و ڕێگر دێنە سەر ڕێت، بەڵکو زۆر درێژ و بێبڕانەوەیە،

دواجاریش لەبەردەم بنکەیەکی پشکنین و سنووریکی بیابانی و تۆزاویی و تەلبەندکراودا دوایی دێت کە بە دەگمەن کەسانێک لێی دەپەڕنەوە. مرۆڤ گەر هەزاران کیلۆمەتریش لەسەر ئەو جادەیە بەرەو باشور بڕوات، ناکاتە شارێک لە شاری ڕاستەقینە بچێت، هەمیشە بێئەوەی گەیشتبێتە جێگایەکی گرنگ، وەک سەفەرێکی پوچ بە خاکێکی وشک و گەرم و نادۆستدا کۆتایی دێت. بەڵام سەیریشە لە سەر هەمان ڕێگا بەردەوام شتی سەیر لە شوێنی نادیاری دونیاوە بەرەو ئێمە دێن، باری گەورە گەورە لە لۆری زەبەلاحدا کە هیچ کەس بە دروستی نازانێت چییان تێدایە. خۆتان دەزانن تەنیا ڕێگایەک بەسە تا لەوێوە هەموو بەدبەختی دونیا ڕوومان تێبکەن. ڕێگا ترسناکە، هیچ شتێک وەک ڕێگا ترسناک نییە، گەر ڕێگا نەبووایە ئینسان لە هەزاران بەڵا و دەردەسەر بە دووردەبوو. مامە سیام زۆرجار دەیگووت «ئینسان هەمیشە بەڕێوەیە، گۆڕ تەنیا شوێنێکە ڕێگاکان تێیدا تەواو دەبن ... گۆڕ کۆتایی ئەو بەڵایەیە کە پێیدەڵێین ڕێگا، ئیتر لەوێوە سەفەر ناکەین، پێتخستە ناو قەبرەکە، ئیتر هەموو شت تەواو، خواحافیز ڕێگاکان، ڕێگا نەما سەر ڕەحەتە». مامم لەسەر هەق بوو، خۆی یەکێک بوو لەوانەی کە بە قەولی خۆی «ڕێگای زۆر مەسرەف نەدەکرد»، دەیگووت «تا ڕێگا زۆر مەسرەف بکەیت، ژیانت سەختتر دەبێت، گەر ڕێگایەکت دۆزییەوە پیا بێیت و بڕۆیت، ئیتر مەیگۆڕە، یەک ڕێگا بەسە ... ڕێگا شتێکە وەک دەرمان، تەنیا لە کاتی پێویستدا و بە ڕەچەتەی تایبەت دەبێت مەسرەفبکرێت». من بە پێچەوانەی ئەوەوە، لەوانەبووم فزول و چەوتەسەریی بەرەو لارێیان دەبرم. گەرچی کەسێکی بێدەنگ و هێمن بووم، بەڵام لە ژێرەوە گەڕۆک و کونجدۆز بووم. پێدەچوو شارەکەمان بە گشتی بە عەقڵی مامە سیام بیریکردبێتەوە، ئەو ڕێگایە تاکە شەقامی نێوان ئێمە و دونیا بوو. چەندین ساڵە لەو ڕێگایەوە هەموو شتێک دێت، تا دێتیش خودی ڕێگاکە زۆرتر و زۆرتر پیر و بریندار دەبێت، پڕدەبێت لە تاسە و

چاڵ و داخورانی قووڵ، ڕێگایەکە پتر لە هەر شتێکی تر تەنهایی دێلاوار نیشاندەداتەوە . هیچ شتێکیش لە دونیادا وەک ڕێگای پیر ناشیرین نییە. ڕێگایەک بۆنی ماندوێتی لێدێت و ڕەنگی زەمانی لێ نیشتووە. «مەرزی ڕەش»، کە گرنگترین بنکەی بازرگانی ئەم هەرێمەیە، دەکەوێتە سەر ئەو ڕێگایە. لە جێگایەکی تایبەتدا بازرگانە بیانییەکان، جلی ڕەش و دەمامکی ڕەش دەپۆشن و لە پنتێکدا بە خۆیان و هەموو کاڵا عاجباتییەکانیانەوە دەردەکەون، بازرگانەکانی ئێمەش هەمان شێوە بە دەمامکی ڕەشەوە و لە شەوی تاریکدا لەوسەر مەرزە کاڵاکانی خۆیان دەهێنن و لەو جێگایەدا بارەکانی خۆیان ڕۆدەکەن و شتەکانیان دەفرشن، زۆربەی کاڵاکانمان مادە و مەتریاڵی کانگاکانی ژێر زەوین کە هەندێ تایەفە و بنەماڵەی ناسراو دەستیان بەسەردا گرتوون، ئەوان بازرگان و دەلاڵ و فرۆشیاری خۆیان هەیە، کە لە ژێرەوە و لە تاریکیدا کاڵاکان دەبەنە سەر مەرز. لەوەش بگوزەرێت، کاڵای سەرەکی دەفەری ئێمە دار و درەختەکانمانە کە تەختەی عەجیبی لێ بەرهەم دێت، هەندێ گژ و گیا و بەروبوومی کێوی کە لە دروستکردنی دەرمان و گیراوەی پزیشکیدا بەسوودن، لە پاڵیشیدا بەردی مەرمەڕ و چەند جۆرە خشتێک کە بە توندی و بەهێزی ناسراون، جۆرە بەردێک لە کۆنەوە زیندانەکانی دێلاواری لێ دروستکراون، بەجۆرێک ئێستا دێلاوار گەورەترین نێرەری بەردی زیندانە بۆ شوێنەکانی تری دونیا... لە هەر جێگایەک حاکمێک بیەوێت زیندانێک دروستبکات، بازرگانە تاریک و دەمامک بە سەرەکانی دێن و لێرەوە بەرد دەکڕن، وەختە بڵێم ئێستا بنکەیەکی نهێنی، زیندانێکی گەورە لە خۆرهەڵاتدا نییە، بەردی دێلاواری تێدا نەبێت. ئێستا کەس لە شار بازرگانەکان ناناسێت، هیچ کەس بە دروستی نازانێت شتەکان لە کوێوە دێن و بۆ کوێ دەچن، بەجۆرێک دەتوانم بڵێم جەمعییەتی بازرگانانی دێلاوار ، لە جەمعییەتە هەرە نهێنییەکانە کە هیچ کەس زانیارییەکی ئەوتۆی لە بارەوە نییە.

سنوورەکانی دێلاوار زنجیرە چیایەکی سروشتی و بەرز نەخشیانکێشاوە، لەو دیو چیاکانەوە سەرزەمینی دوژمن دەست پێدەکات. تا ماوەیەک لەوەوبەر دێلاوار تەواو لە چنگی دوژمندا بوو. بەر لە لەدایکبوونی من بە چەند ساڵێکی کەم، جەنگاوەرانی دێلاوار ناوچەکەیان ڕزگارکرد و لەو کاتەوە وەک هەرێمێکی ئازاد دەژین، بەڵام ترس لە دوژمن شتێکی ئەبەدییە لە ناخماندا. ئەم چەند ساڵەی دوایی ئارامی و ئاسوودەگیەکی زۆر لێرە بەرقەرارە، بەڵام چەندین ساڵە هەموو دەڵێن «شتەکان ڕووکەشن. هاکا دوژمن پەلاماری دا و شارەکەی گرتەوە». ئەو ترسە وەک دڕکێکی ژەهراوی لە دڵماندایە و بەردەوام تووشی گێنگڵ و گومان و خەونی ڕەشمان دەکات. بەڵام لە پاڵ ئەو ڕێگا باریکەدا، چەندین ڕێگای نهێنی هەیە کە پتر خەڵکانی هەڵهاتوو، قاچاغبەران، سیخوڕان، تلیاکفرۆشان و عاشقانی سەرهەڵگرتوو بەکاریاندەهێنن، ژیان لەسەر ئەم ڕێگایانە بەجۆرێکی ترە، ڕاستە ڕێگای ترسناکن، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ڕێگا ڕەسمی و نێودەوڵەتییەوە، هەر کەسێک بیانگرێتە بەر، هەر کەس ترس و سەرکێشیان لە ئەستۆ بگرێت، ئەوکات گەڕیدەی دلێری خۆیان، ڕێبواری سەرکەشیان بەرەو جێگایەکی دیاریکراو، شارێکی تر، زیندەگییەکی دی هەڵدەگرن.

بۆ گەنجێکی گۆشەگیر و بێئەزموون و کەم هاوڕێی وەک من، ناسینی شارێکی ئاڵۆز و گەورەی وەک دێلاوار ئاسان نەبوو، بەڵام سەرهەڵدانی چیرۆکی ئەم خەونە دەرگای هەندێک پرسیار و ڕووی هەندێک نهێنی بۆ دەرخستم کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوون و دەرکم بە بوونیان نەدەکرد.

ڕۆژی دوای سەردانەکەی من بۆ بیمارستان، دکتۆر سیامەند خۆی بە تەنیا چوو بوو بۆ زیندان. کە هاتەوە حاڵی ئاسایی نەبوو، ڕەنگی بەجۆرێکی سەیر زەردبووبوو. پێدەچوو لە زیندان بارودۆخێکی نالەباری دیبێت. دکتۆر گەر تووشی پرسیار و کێشەی قورس ببووایە لەگەڵیدا

سەرئێشەیەکی توندی دەگرت و دەستی دەگرت بەسەرییەوە و دەیگووت «هەستدەکەم گیا لەسەرمدا دەڕوێت، دارستان لە سەرمدا سەوزدەبێت». کە ئەو وایدەگووت، من لە ناو گەرما و هەوای خنکاوی عیادەکەدا، بۆ ئێستێک لە ناو پەژارە و ترسدا، هەستێکی ڕەش دایدەگرتم کە لە زەمینێکی شێدار و جەنگەڵیی و غەمگیندا گیرمکردوە و دەربازم بۆ نییە. هەستمدەکرد لەم هەوایەدا جگە لە جانەوەری ترسناک هیچی دی دروست نابێت. هەستمکرد مامم لە سەرەتاوە بۆنی قەومانی شتێکی ناخۆشدەکات.

ئەو ئێوارەیە عیادەکە بەجۆرێکی بێمانا جەنجاڵ بوو، میرئەودال لە پێش هەموو نەخۆشەکانی ترەوە هات و ژمارەی خۆی گرت، دوای هاتنی ئەو سالۆنی چاوەڕوانییەکە بەجۆرێکی خێرا پڕبوو. میر بەرامبەری پیاوێکی لاواز و چکۆلانە دانیشتبوو، کابرای بچکۆلە ڕیشێکی ڕەش و جووتێک بڕۆی ئەستوور و پەیوەستی بوو، کە بە جۆرێکی وەها مۆن دابوونی بە یەکدا مرۆڤ زاتی نەدەکرد لێی بڕوانێت. میرئەودال لە ڕۆژانی پێشوو خیشن و باکردوتر دەهاتە پێش چاوم، دەموچاوی بە جۆرێکی سەیر پڤی کردبوو، ڕوومەتی سوور هەڵگەڕابوو. پێش ئەوەی کاتی کردنەوەی عیادەکە بێت و مامم دەست بە بینینی نەخۆشەکان بکات، میر دەنگی هەناسەی بە جۆرێکی نائاسایی بەرزبووەوە و بێدەنگی سالۆنەکەی شکاند، بە جۆرێکی توند عارەق دەردەدا، لە ناکاو بە دەنگێکی بەرز گووتی «دکتۆر... دکتۆری چی... هیچ نازانێت، ناتوانێت گوونی خۆی و گوێزەر لە یەک جیابکاتەوە، خۆی ناوناوە دکتۆر. تڕڕڕ بۆ هەزار دکتۆری وا». پێشتر هیچ کات بەوجۆرە قسەی نەکردبوو، خێرا دەستەسڕێکی لە گیرفانی دەرهێنا و بەوپەڕیی تووڕەییەوە عارەقەکەی سڕی، لە جێگای خۆی هەستا و ڕوویکردە پیاوە بچکۆلەکەی بەرامبەری و گووتی «بۆ واسەیرم دەکەیت... خۆ شێت نیم، بۆ بەوجۆرە سەیرمدەکەیت. ئاخر هەر باوەحیزێکی وەک تۆیە ژیانی تێکداوم، هەر جانەوەرێکی وەک تۆیە دێتە خەوم». پیاوەکە

کەمێک دەستەپاچە و سەرسام لێیڕوانی و تەماشایەکی منی کرد، وەک داوای یارمەتی بکات و بیەوێت کۆمەکیبکەم، چاوانی پڕبوون لە ترس و سەرسامی. من بە هێمنی لە میر چوومە پێشێ و گووتم «جەنابی میر، فەرموو دانیشە، ئێستە نۆبەتت دێت و دەتوانیت لای دکتۆر هەموو قسەکانت بکەیت، تۆ یەکەمین ژمارەت هەیە». هێشتا لە نیوەی ڕستەکەمدا بووم کە وەک تینێکی سیحراوی تێکەڕابێت، میر بە تەواوی هێزی خۆی پیاوە چکۆلانەکەی هەڵگرت و بەوپەڕی هێزەوە فڕێیدایە کونجێکەوە کە ژنێکی پیر و کوڕەکەی بە کەساسی لەوێ دانیشتبوون. کابرا بە جۆرێکی توند درا بەو کوڕە نەخۆش و لاوازەدا و کوڕەش زیقەی لێهەستا و دایکی وەک شێت هاواریکرد و لەجێگای خۆی دەرپەڕی. تەواوی نەخۆشەکانی تر، کە هەموو پێشتر کز و مەلول لەسەر کورسییەکانی خۆیان چاوەڕوانیاندەکرد، ڕاچڵەکین و سەرسام و ترساو کەوتنە سەیرکردن. میرئەودال دوو هێندەی من دەبوو، وەک دێوێکی سورفڵ و کەفکردو، چاوانی جۆرە هەستێکی ناوازەی شێتیان تێدابوو کە پێشتر لێم نەبینیبوو. ویستم بەری پێبگرم تا جارێکی دی ڕوونەکاتەوە ئەو پیاوە بەستەزمانە، بەڵام لا لێوەکانی بەجۆرێکی سەیر کەفی زەردیان دەردەدا و هێزی بە شێوەیەکی وەحشییانە لە جۆشدا بوو. وەک ماتۆڕێکی ترسناک چۆن دادەگیرسێت، لە ناکاو میرئەودال داگیرسابوو، بێ هیچ هۆیەک پەلاماری ئەو مێزە کۆنە شوشەیەی دا کە لە ناوەڕاستی ساڵۆنەکەدا بوو و لە جێگای خۆی هەڵیگرت و بە هەموو توانای خۆی کوتایەوە بە زەویدا، شڵپە و شریخەی شکانی شوشەکەی هێندە بەرزبوو، تەواوی عیادەکەی لەراندەوە، دکتۆری مامم بە خێرایی و بێوەستان لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرێ و بەخێرایی دەستکێشەکانی هەڵکێشا و بەرەو لای ئێمە هات. لە ناو عیادەکەدا بووە قیژە و هاوارێکی زۆر، بەڵام پێدەچوو میرئەودال وەستانی بۆ نەبێت. بە مستە ئەستوورەکانی کێشای بە دیوارێکی

تەنیشتیدا و هێرشی بردەوە بۆ ئەو پیاوە بچوکەی بەزەحمەت هەوڵی دەدا خۆی ڕاستبکاتەوە. مامم چووە پێشدەمی و هاواریکرد «میرئەودال، ئارام بەرەوە، لە سەرەخۆ، لە سەرەخۆ». میر تەکانێکی دا و پاڵێکی بچوکی نا بە ماممەوە و دیسان بەرەو لای کابرای بەستەزمان هێرشی برد، کە هێشتا لەسەر زەوییەکە لەسەر چۆک هاواریدەکرد. ژمارەیەک لە نەخۆشەکان بە قیژەقیژ لە تەنیشت میرەوە هەڵهاتن و چوونەدەرێ، تەنیا کەسێک لە ژوورەکەدا مایەوە گەنجێکی چوارشانەی بەهێزبوو، ئەسمەرێکی بازودار و قژ درێژ کە بەقیافەت لە میرئەودال بەرزتربوو. ئەو لە دواوە باوەشی بە میرئەودالدا کرد و بە هەموو هێزی خۆی جەڕاندی و ڕایکێشایەوە بۆ دواوە. مامم کۆمەکی گەنجەکەی کرد و بە توندی میرئەودالیان ڕاکێشا و منیش کۆمەکمکردن تا بتوانین بە هەر سێکمان لە سوچێکدا توندیبکەین، بەڵام مامم هاواری لێکردین کە ڕایکێشین و بیبەینە دەرەوە. میرئەودال وەک کەسێک تینێکی وەحشیانەی تێگەڕابێت، جڵەوکردنی ئاسان نەبوو، من بە هەموو توانای خۆم دەنگم بەرزکردەوە و داوای یارمەتی و کۆمەکمکرد، چەند جارێک بە دەنگی بەرز قیژاندم کە کۆمەک و یارمەتیمان پێویستە. دوای چەند هاوارێک سێ گەنج لە نوسینگەکانی دەوروبەر و دوکاندارەکانی سەر جادەکە خۆیان کرد بە ژووردا و هاتن بە دەنگمانەوە. میرئەودال وەک جانەوەرێکی نەبەز و بێسرەوت لە گیانیدا بێت، تەکانی توندی دەدا و بە هەموو هێزی دەیویست لە چنگمان دەربازبێت، چەندجار خەریکبوو لە ژێر دەستی هەرسێکمان دەرچێت و دووبارە بەرەلا بێتەوە. بەڵام هەموو جارێک گەنجە قژدرێژەکە وەها مەحکەم و توند دەیگرتەوە، دەرچوونی میری سەخت دەکرد. کە کۆمەکمان بۆ هات، لە تەکانێکی تونددا بە هەر شەشمان میرئەودالمان پێچدا و لەسەر زەوی لە ناو وردە شوشەی هەڵپژاودا دامان بە زەویدا، مامم لەو جوڵە سەختەدا کەمێک دەستی چەپی بریندارببوو، بەڵام کابرای زل بە جۆرێک نیشتە سەر سنگی میر من ترسام

هەموو پەراسووەکانی پێکەوە خڕەبکەن و بوەرێنە ناو زگی. هەموومان بۆ ماوەیەکی درێژ دەست و قاچیمان توند گرت، ئەو چیتر جوڵەی نەدەکرد، بەڵکو تەنیا توند و نەخۆشئاسا هەناسەی دەدا، هەستمکرد هێدی هێدی ئارام دەبێتەوە، تا دۆخیشی ئاسایی بایەتەوە سەرسامتر دەینواند، وەک لە ناکاو هوشیار بووبێتەوە و نەزانێت چی بووە، نەزانێت بۆ شەش پیاو بەو جۆرە نیشتونەتە سەری. دوای نزیکی پازدە دەقیقە پۆلیس گەیشتە لامان، من لە ناخی دڵەوە بەزەیم بە میرئەودالدا هاتەوە کە خۆشی نەیدەزانی بۆ وای لێهاتووە، بەڵام مامم زوو زوو دەیگووت «جەنابی میر... جەنابی میر... خەریکە دەبێتە پیاوێکی خەتەر». پۆلیسەکان قۆڵبەستیانکرد و مشتگیریان لە دەست نا و لە زەوی بەرزیانکردەوە، میرئەودال کە هەستا و سەیری منی کرد عارەق و فرمێسک پێکەوە لە ڕوخساری دەبارین. وەک قارەمانێکی بریندار و زامدار و ماندوو قژی ژاکاوی نیشتبووە سەر تەوێڵی. ئەو باوەڕی نەکردبوو ڕۆژێک شتێکی وای بەسەر بێت، مامم چووە ژووری و بە تەلەفون مرواری خانی هاوسەری ئاگادارکردەوە. ئەوە دەستپێکێکی سەیربوو بۆ زنجیرە ڕووداوێکی غەمگین کە ئەوکات هێشتا بە ڕوونی لە هیچەوە دیارنەبوون. میر لە دابەزیندا شکستە و تێکشکاو دەینواند... لەو ساتەدا بۆ ئێستێکی کورت هەستمکرد، کە ئێمە زۆر بێتوانا و بێدەسەلاتین. لەو ساتەدا هەم دکتۆر سیامەند، هەم پۆلیسەکان، هەم من و ئەو گەنجە سەرسامانەی کە نەیاندەزانی بۆ وا بە خرۆشەوە پەلاماری میرئەودالیان داوە، هەموو وەک خودی میر تەنیا و بێدەسەلات بووین... بەڵکو من هەستمکرد، زۆر لە میر تەنیاتر و نەخۆشتریشین.

# ٦

دوای سەعاتێک لە دەستبەسەرکردنی میر ئەودال، لەلایەن پۆلیسەوە، بارودۆخی عیادەکە گەڕایەوە جێگای خۆی. من تەواوی وردە شوشەکانم کۆکردەوە و کورسی و مێزەکانم خستەوە سەرباری خۆیان و داوام لە نەخۆشەکان کرد، کە لە دەرەوەی عیادەکە و لەسەر شەقامەکانی دەوروبەری کۆبووبوونەوە بگەڕێنەوە ژووری. لەو ڕۆژەوە ئیدی کاتێک سەخت و سەیرمان بردەسەر، ژمارەیەکی زۆر لە میوانانی عیادەکە، تووشی دەردی ئەو خەونە بووبوون کە وەک ئافات لە شاردا بڵاودەبووەوە. چیرۆکی ئەو خەونە بەجۆرێکی وەها خێرا تەشەنەیدەکرد، ئێمەی تەواو پەرێشان کردبوو. عیادەکە بووبوو بە یەکێک لەو جێگا سەرەکیانەی چیرۆکەکان ڕوویان تێدەکرد. کەم جێگا لە شاردا وەک ئێمە خەبەری لە جێگا و شوێنی بڵاوبوونەوەی خەونەکە هەبوو. بەڵام من تا ئەوکاتیش هەستم بە مەترسییەکی گەورە نەدەکرد، لەو باوەڕەشدا نەبووم شتێکی ترسناک بەڕێوەبێت.

ئێوارەیەک، دوای تەواوبوونی هەموو نەخۆشەکان، دکتۆری مامم منی بۆ ژوورەکەی خۆی بانگکرد و گووتی « ڕێنوار دانیشە». یەکەمجار بوو دەنگی هێندە دۆستانە بێت. بە ماندوێتی دەستکێشەکانی داکەند و چاویلکەکەی لادا و بە ئارامی ماوەیەکی درێژ سەیریکردم و گووتی «گوێبگرە ڕێنوار.

باش گوێبگرە. من و تۆ و ئەم شارە ڕۆژگارێکی سەختمان لە بەردەمدایە، سەختتر لەوەی بە عەقڵماندا دێت. دەرگاکە دابخە و وەرە با قسەبکەین». من هەستام و دەرگاکەم داخست و گەڕامەوە شوێنی خۆم. سەیرێکی جیدی کردم و گووتی «تۆ ماوەیەک لەمەوبەر هاتی بۆ لای من، ڕۆژێک وەک غەریبەیەک هاتی بۆ عیادەکە ... وایە یان وانییە؟». من بە هێمنی سەرم لەقاند و گووتم «بەڵێ». مامم گووتی «گوێبگرە ڕێنوار، من لە خۆڕا تۆم نەهێناوەتە ئێرە، دەزانم ئەوەتەی لای من ئیشدەکەیت، نە ڕوویەکی ئەوتۆم داوەتە تۆ و نە مەحەبەتێکی زۆرم پیشانداویت و نە موچەیەکی بەرز، لەو ڕووەوە هەم لەسەر هەق بووم و هەم ناهەق. ئێمە خۆمان تایەفەیەکی وشکین، هەتا کەسێکیشمان خۆشبوێت، ناتوانین بە ڕوونی خۆشەویستی خۆمانی لا ئاشکرابکەین، شتەکە لە فیترەتماندایە. دەڵێن یەکێک لە مامەکانمان کاتی خۆی لە عەشقدا مردوە، بەڵام تا ساتی گیانکێشان نەیوێراوە رازی خۆی بەیانبکات. تێدەگەیت... شتەکە لە خوێنماندایە. چەندە خوێندەواری و پلەی زانستیمان سەربکەوێت، ئەو شەرمە لە ناخماندا زۆرتر دەبێت. شتەکە فیترەتە، لەوەوە نەهاتووە کە عاتیفەمان نییە. بەشەر هەموو وەک یەک عاتیفەیان هەیە، عەشرەتی زەریاواریش شتێکیان بەرکەوتووە. بەڵام بەشەر هەیە دەتوانێت دەریبخات و بەشەر هەیە ناتوانێت ... من کە تۆم هێنایە ئێرە، تووشی دەردەسەری زۆر بووم، خێزانەکەم دژم بوون. ژنەکەم حەزی بەوە نەدەکرد، برازای خۆم بێنمە سەرئیشەکەم. خۆت دەزانیت خانمی من سەر بە بنەماڵەی خانزاییە، خانزاییەکان کەیفیان بە ئێمە نایەت. باوکت برا گەورەی منە، ئەو پیاوی بازاڕە... زۆرجار لە ژیانمدا حەزمکردوە وەک ئەو سەروەت و سامانی خۆم بە کاسبی پەیدابکردایە. بەڵام من یەکێکم لەو کەسە بەدبەختانەی کە سەردەمێک دیلاوارم بەجێهێشتووە و شەهادەیەکم هێناوە. دەساڵ لە لەندەن خەریکی فێربوونی دەروونناسی بووم، ڕاستییەکەی ڕێنوار نەمدەویست بگەڕێمەوە، دەمزانی عیلمەکەم بە

کەڵکی ئێرە نایەت، لێت ناشارمەوە کە زۆری عیلمەکەشم بیرچۆتەوە، بەڵام با شتێکت پێبڵێم، خەڵکی ئەم شارە دەروونیان نییە ... کە دەڵێم دەروونیان نییە، واتیمەگە کە ئیتر یەکسەرە دەروونیان نییە و تەواو، وەک کەسێک چاوی نەبێت یاخود لاقێکی لەدەست دابێت، نا... بیهێنە پێشچاوی خۆت لە ژێر ئەم شارەدا دەریایەک مجەوهەرات و یاقووتی سوور و تەڵای ئەسڵ هەبێت، بەڵام بەچی دەچێت کە هەرگیز مرۆڤ دەستی پیادا نەگات، بە کەڵکی چی دێت، لەودیو قاپییەکی حەوت قفڵییەوە دیلکرابێت و نەکرێتەوە... دەروونیش لێرە وایە. من تا خوێندنیشم تەواوکرد هەر لەو بڕوایەدا بووم، جارێکی تر سەرنەکەمەوە بە ڕۆژهەلاتدا... بەڵام یەک دەفعە هات بەسەرمدا و گەڕامەوە. مردنی باوکم و مەسەلەی میرات و دابەشکردنی مولکەکانی شیوی سەی حەسەن، هۆی سەرەکی گەڕانەوەم بوون. براکانم بڕیاریان دابوو، گەر نەگەڕێمەوە هەموو شتێک لە نێوان خۆیاندا بەشبکەن و لە هەر جۆرە میراتێک بێبەشمبکەن. دڵنیابووم بە بیست ساڵ کاری بەردەوام بە ئەندازەی ئەو میراتەم بۆ پەیدا ناکرێت، لەبەرئەوە وازم لە خەیاڵاتە عیلمییەکانم هێنا. یەکجار وازم لێهێنان، مرۆڤ لە هەموو ئان و زەمانێکدا بزانێت. تۆ ڕەنگە هەندێ شتت بیستبێت، ڕەنگە هەندێ شتی کەم لە مێژووی ئەم شارەی ئێمە یاخود ئەم خانەوادەیە بزانیت. بەڵام کەمە، ڕێنوار ئەوەی تۆ و براکانت و خوشکەکانت دەیزانن، کەمە... باوەڕبکە هیچ نییە. نەسلی ئەمڕۆ زۆر گوێی لەوە نییە جاران چی بووە، لەوەشدا لەسەر هەقن، مێژووی دێلاوار هەرچییەک بێت، مێژوویەکی گرنگ نییە، ئەسڵەن گرنگ نییە، بەڵام ڕەنگە ترسناک بێت، زۆر ترسناک بێت».

بەردەوام سەیریدەکردم، دەیویست منیش ڕوو بە ڕوو لە چاوانی بڕوانم و خەیاڵم نەڕوات. من شتێکم لەسەر ژیانی مامە سیا دەزانی، بەڵام نەمدەزانی بۆ وەرگرتنەوەی بەشە میراتی خۆی لە سەروەت و سامانی خانەوادە گەڕاوەتەوە، هەڵبەت کێشەی خێزانی ئێمە لەسەر سەروەت و سامان لەوە

گەورەتر بوو کە مامم باسیدەکرد، بەلام چونکە من تەماحێکم نەبوو، وردەکارییەکانیم نەدەزانی. مامم کە دڵنیابوو من بە هەموو هەستێکەوە گوێی لێ دەگرم گووتی « ڕێنوار، لە خانەوادەی ئێمەدا شتێک کە لە عاتیفە زیاتر کۆماندەکاتەوە، حەزی بەردەوامی هەموو براکانە لە عەیش و نۆش... تۆ وانیت... من چەند ساڵە سەرنجی تۆ دەدەم، لە تایەفەی ئێمەدا کە بوغز دەکەوێتە بەینەوە، یەکێک داوەتێکی گەورە دەکات و هەموومان کۆدەکاتەوە، شەوێک هەموو پێکەوە دادەنیشین، دەخۆینەوە و مەستدەبین. سەمادەکەین، گۆرانی و تەسنیفاتە کۆنەکانی ئەم پێدەشتی دیلاوارە دەخوێنین، دوایی کە هەڵدەستین هەموو ئاشتین و براین... بە تایبەت من کە مەست دەبم، ئیتر ناتوانم بە کەس بڵێم نا». دوا قسەکانی پتر بێزاریی پێوە دیاربوو تا ئاسوودەیی. کەمێک ڕیشی خوراند و گووتی «دەروون چاڵێکە بەردەوام شتی تێدەکەین و سەرقاپەکەی دادەخەین. دەروون لێرە گەنجینە نییە، بەڵکو گۆڕێکی تاریکە کە یەکجار داخرا ئیتر دووبارە سەری هەڵنادرێتەوە... بەلام هەر ئێمە وانین، لەو کاتەوەی گەڕاومەتەوە ڕۆژانە بە چاوی خۆم دەبینم کە ئینسان لەم شارەدا بەردەوام شتێک دەشارێتەوە، ئەمە هەر دەردی تایەفەی زەریاواری نییە، هەموو شارەکە بەوجۆرەیە، ئەم شارە سەرقاپێکی گەورەی لەسەرە... سەرقاپێک بەس خودا دەزانێت کەی و کێ خستوێتییە سەری، بەلام ڕێنوار ئەو سەرقاپە خەریکە شل دەبێت، ئەوەش ئەو شتەیە کە من هەم دڵخۆشم پێی و هەم لێی دەترسم. ئەوەی لە میر ئەودالت بینی تەنیا سەرەتایە. بەلام ناکرێت دانیشین، نا... شتێک هەیە دەجوڵێت. سیامەندی زەریاواری لەو دکتۆرانە نییە هەروا دانیشێت، دەبێت شتێک بکەین، دەمەوێت هەندێ شت بکەم، شارەکە لە ڕووی دەروونییەوە پێویستی بە ڕێسا و یاسا هەیە، ئەم ماوەیە پێویستییەکی زۆرم بە تۆ دەبێت، لەمەولا بۆ هەر کوێ چووم دەبێت تۆم لەگەڵدا بێت. ئەمشەو فایلێکی تایبەتی بکەرەوە و ناوی بنێ «فایلی خەونەکان» یان هەر ناوێکی

تر کە خۆت دەتەوێت، لەمەولا تۆ بەرپرسی ئەو فایلە دەبیت، هەموو شتێک لای تۆ دەبێت... من چەند ساڵە لەوە دەترسم... دەترسم، ئەم شارە دەستبەرێت و دەرگاکانی ناوەوەی خۆی بکاتەوە... دەبێت چی تێدا بێت... خوای گەورە دەبێت چی تێدا بێت؟».

من تەنیا گوێم دەگرت... مامم وەک هەمیشە چاوەڕوانی قسەی من نەبوو. بەلام بەر لەوەی هەستێت و خۆی بگۆڕێت گووتی «من دەزانم تۆ لە کەسی تر ناچیت، تۆ لە تایەفەی زەریاواری گەڕێ، لە هەموو شارەکەشدا کەسی وەک تۆم نەدیوە؛ ئەوانەی دەیانگووت ڕێنوار بە کەڵکی ئەم کارە نایەت بە هەڵەداچوون. هەموو بەهەڵەداچوون، هەر هەموویان. من خۆم فەراسەتێکی باشم هەیە، ئادەمناسم، زۆجار بووە ژن و مێردم لە دوورەوە بینیوە و زانیومە بۆ یەک دەگونجێن یان نا. تۆ ئەهلی کتێبیت، کتێبیش ئینسان یان دەکات بە دڕندە یان دەیکات بە مرۆڤ... دەبلێ وانییە. تا ئێستا خراپەیەکم لە تۆ نەدیوە، ئەوەی لە هەر شت زیاتر لە تۆدا دەمجوڵێنێت، هێمنیتە... ڕاستتدەوێت، من زۆر حەزم لەو هێمنییەیە، بەلام زۆریش لێی دەترسم. هەستێکی خراپم هەیە کە تۆ شت زیاتر دەزانیت لەوەی دەریدەخەیت. تەنیا شتێک ئاسوودەم ناکات چاوتە، شتێکی تێدایە دەڵێت تۆ زۆرتر دەبینیت لە من، ئەوەش پەستمدەکات».

ئەو ڕۆژە نەمدەزانی، قسەکانی مامم هەوڵێکە تا لە داهاتوودا بە هەموو ئەو نەخشە و پلانانە ڕازیبم کە لەسەری ئەودا خولدەخۆن. ستایشی بۆ من، هەڵدانی قولاپێکی شیرین بوو، بۆ ماسییەک هەموو ژیانی لە ئاوی تاڵدا مەلەیکردبوو، دەیویست بەر لەوەی ئەم سەردەمە دەست پێبکات، بە سۆز و میهر، من بخاتە ژێر ڕێکفی خۆی . مامم پێشتر بەو جۆرە قسەی نەکردبوو، یەکەمجار بوو قسەی لەوجۆرەم لێ دەبیست... نا، من ناڵێم پیاوێکی دڕندەبوو، بەلام پیاوێکیش نەبوو ئاسان ستایشی کەسێکی وەک

من بکات کە دواجار لە باشترین هەڵسەنگاندندا، تەنیا وەک برازەیەکی ژێر و ناوازە دەیبینم. ویستم سەیری چاوی بکەم، تا باشتر تێبگەم دەڵێت چی، وەک بترسێت ڕوویکرد بەو دیودا و بە منی گووت «دوو ساڵ لە مەوبەر تۆ هاتی بۆ لام و گووتت دەتوانم خەونی ئەوانی تر ببینم... ». دەمزانی مامم دەڵێت چی، دەستوبرد پێشی کەوتم و گووتم « جەنابی دکتۆر، لە مێژە ئەو توانایەم نەماوە». مامم وەک باوەڕنەکات، سەیرێکی پڕ گومانی کردم و گووتی «ئەمجارە هەر کات خەونی کەسێکی ترت بینی، ئاگادارمبکەوە». ئەوە دوا ڕستەی گرنگی نێوانمان بوو لەو ئێوارەیەدا. من گەرچی شتێکی ئەوتۆم نەگووت، بەڵام بۆ یەکەمجار هەستم بەسەرکەوتنێکی نهێنی کرد. کاتێک مامم جانتاکەی هەڵگرت و لە عیادەکە چووە دەرێ. هەستمکرد ئەمڕۆ... تەنیا ئەمڕۆ ژیانی ڕاستەقینەی من دەستی پێکردوە.

# ٧

سەردانی ئەو ڕۆژەمان بۆ مۆزەخانە، لە بەر داوایەکی بەڕێوەبەری پۆلیس هەڵوەشایەوە. عەقید بابەتاهیری وەزیری، بەیانی زوو ناردبووی بە دوای مامدا، دەبوو سەعات یازدە لە نوسینگەی جەنابی عەقید بین. مامە سیام سووربوو من لەگەڵ خۆیدا بەرێت، نەک هەر ئەوە، کە بەیانی هات بۆ عیادەکە، چەندین بەند کاغەزی سپی و ڕێکۆردێکی نوێ و چەندین جۆر شوشە مەرەکەب و قەڵەمی کڕیبوو. بە پەلە منی نارد بۆ لای سەرتاشەکەی ژێرمان و گووتی سەر و قژت بەجۆرێکی گونجاو ڕێکبخە و هەوڵبدە لە لای «سدقی» کراسێکی تازەی سادە بهێنیت و لەلای حەسەنی بۆیاغچی پێڵاوەکانت بۆیاغبکەیت. پێمی گووت «لێرە بەدواوە لەوانەیە کارمان زۆر بکەوێتە جێگا ڕەسمییەکان، دەبێت هەردووکمان قەد و قیافەتێکی باشمان هەبێت. چوونە هەر جێگایەک بزانن کاری گرنگمان لە دەست دێت». من بەخێرایی خۆم ئامادەکرد و لە نزیکی دەو نیودا بە سەروڕوخسارێکی نوێوە لە بەردەم مامە سیامدا وەستابووم. هەستمکرد دکتۆر گەلێک کەیفی بەم خۆگۆڕینە نوێیەم هات. ئێستا لە گەنجێکی زیرەک و جوان خاس دەچووم، ئیتر ئەو بێ دوودڵی دەیتوانی من وەک یاوەرێک بخاتە دوای خۆی و شەرم لە ڕوخسار و جل و بەرگم نەکات. لە بری ئەوەی بە فیاتە کۆنەکەی مامم بڕۆین، لە بەر عیادەوە تاکسییەکمان گرت و تا بینای

پۆلیسخانەی مەکەزی نەوەستاین. دیاربوو عەقید بابەتاهیر بە شەوقە وە چاوەڕوانیکردوین. تا ئەو کات هیچ بەڕێوەبەرێکی پۆلیسم نەدیبوو، عەقید بابەتاهیر سێ جار لە هەر مرۆڤێکی ئاسایی زلتر بوو، هێندە زل بوو، هەر چاوم پێکەوت خەریکبوو بدەمە پرمەی پێکەنین. بۆ ئەوە چاک بوو، لەگەڵ سێرکێکێ گەڕۆکدا دونیا بگەڕێت و زلێتی خۆی نمایشبکات و بالای دێوئاسای پیشانی خەڵکانی دی بدات، نەوەک لێرە دڵی بەم کارە پوچەی خۆی خۆشبێت. من پێم سەیربوو لە شارێکی گەورە و بێنەزمی وەک دیلاواردا، مرۆڤ هێند بێ مێشک بێت، ببێت بە بەڕێوەبەری پۆلیس. من و مامم سلاومانکرد و خۆمان بە جەنابی عەقید ناساند کە بە پەشۆکانەوە پێشوازی لێکردین. دیاربوو عەقید زۆر شڵەژاوە، گووتی «دکتۆر بمانبورە، باوەڕبکە ئەم شارە لە زەمانی حەزرەتی نوحەوە هەیە، بەلام تا ئێستا نەبووە لە کاروباری پۆلیسدا ئیشمان بکەوێتە دەروونناس، بەخودا تا دوێنێ شەو شتێکم لەسەر دەروونناس نەبیستبوو، ئەسڵەن تا ئێستاش نازانم وەزیفەی تەواوەتی جەنابتان چییە، بەلام ماوەیەکە شار وەک خۆی نەماوە، هیچ لە شوێنی خۆی نەماوە... لێرە خەریکە تەوقیفخانەکە پڕدەبێت. نزیکی هەشت ساڵە بەڕێوەبەری پۆلیسم، لەدوای کۆچی دوایی بابەڕەسوڵی باوکمەوە من لەسەر ئەم کورسییەم کە ئێوە دەیبینن، بەلام هیچ کاتێک نەبووە دیلاوار وا پڕ شەڕ و ئاژاوە بێت، هەموو شتێکمان کردوە شارەکە لە ئەمن و ئوماندا بێت... ئێستا سێ قاوشی گەورەمان لە حەپس و خەڵکی زنجیر لە پێ پڕکردوە، زۆریان لە بارو دۆخێکی نالەباردان. خۆم زۆر سەر لە شتەکان دەرناکەم، بابەعەلی کوڕم هەموو شتێکتان بۆ ڕووندەکاتەوە. دکتۆر گیان هەرچی شتێک لە دەست من بێت، بۆ ئاسانکاری ئیشی ئێوە لەخزمەتدام و ئینشەلا درێغی لە منەوە نابینن. فەرموون دانیشن، ئێستا بابەعەلی بانگدەکەم... دانیشن قوربان، دانیشن». خۆی هەستا و چووە دەرێ و کەمێکی پێچوو لەگەڵ کوڕێکی گەنجی

سپیکەلە و ڕووخۆشدا هاتە ژووری. دەبوو گەنجەکە لەگەڵمان بێت بۆ ناو تەوقیفخانەکە. گەنجێکی زۆر وریا و بە ویقار بوو، بە پێچەوانەی باوکییەوە دەستێک جلی شیکی پۆلیسی پۆشی بوو. لە ڕێگا کوڕەکە بە زمان و شێوازێکی جیاواز لە باوکی قسەیکرد. گووتی «من پێشنیارم داوەتە سەرۆکی پۆلیس کە پەنا بۆ دەروونناس ببەین، بەوەدا لە ئێوە زیاتر هیچ دەروونناسێک لە شارەکەدا نییە، ناچار پەنامان بۆ ئێوە هێنا. دوێنێ شەو من خۆم پرسیارم لە میرئەودالّ کرد و زانیم هەندێ لە گیراوەکان نەخۆشی ئێوەن. لە ماوەی هەفتەیەکدا زیاتر لەسەد و بیست گیراومان هەیە، کە بە هۆی توندوتیژیی و پەلاماردانی بێهۆ و شەڕانگێزیی کتوپڕەوە کە وەک نۆبەتێکی هاری تووشیان دێت هاتوونەتە ئێرە. شتێکە وەک پەتایەکی کتوپڕ، ئەوەی ئێوە لە عیادە لە میرئەودالّتان بینی بوو، نزیکی بیست شەوە لە زۆر کەس و لە زۆر جێگای تردا ڕوودەدات . تا دێت ژمارەکان بەرزدەبنەوە، بە جۆرێک ئیتر مایەی نیگەرانییە... ئێمە لێرە لە تەوقیفخانەکە جێگایەکی ترمان نییە، بەڵام زیندانیش هەمان کێشەی هەیە... من خەبەری ئەوەشم هەیە کە جەنابتان لە زیندانیش بوون. مرۆڤ دەستەپاچە دەبێت». گەنجەکە گەلێک جوان و پاراو قسەیدەکرد، نە خۆی و نە شێوەی قسەکردنی لە پۆلیس نەدەچوو. ناوەکەشی لای من زۆر سەرنجڕاکێش بوو، بابەعەلی وەزیریی، هەستمکرد بە هۆی ئەم ناو و قیافە جوانەوە پاشەڕۆژێکی ڕوونی لە ئیدارە و دەوڵەتدا دەبێت. من و مامم سەرەتا تەنیا گوێمان دەگرت، دواتر ئەو بەرەو هۆڵی یەکەمی تەوقیفخانەکە بردینی، لەوێ میرئەودالّمان لەدەستێک بیجامەی سووردا بینییەوە، هەموو گیانی میر لە زنجیردابوو، پێدەچوو لە پۆلیسخانەش هەرا و زەنای کردبێت و کێشەی نابێتەوە. مامم پرسی بۆ میرئەودالّ وا لە زنجیردایە، یاوەرەکەمان گووتی «لەدوێنێ شەوەوە سێ جاری تر نۆبەتی هاری گرتوویەتی. بەهۆی قیافەتی زلییەوە پاسەوانەکان ئاسان بۆیان کۆنترۆڵ

ناکرێت. دوێنێ شەو پەلاماری زیندانییەکی داوە کە دەڵێت دێتەخەوم. ڕاستییەکەی جەنابی دکتۆر، ئێمە لێرە نازانین حیسابی چی بۆ ئەمانە بکەین. ئایا شێتی ئاساییین، یاخود تاوانباری ئاساییین. هەموو بەجۆرێکی لە ڕادەبەدەر شەڕانی دەبن. کێشەکە چەند پەیوەندی بە ئاسایشی شارەوە هەیە، هێندەش موشکیلەیەکی یاساییە. دەبێت بزانین ئەمانە ڕەوانەی دادگا و زیندان بکەین یان شێتخانەیەکی تایبەتیان بۆ بکەینەوە». بینینی میرئەودال لەو هەموو زنجیرەدا، زۆر دڵ تەنگیکردم، هەستمکرد کەسێکی لەوە باشتر و بەویقارترە، وەک شێتێکی لە زنجیرنراو کۆتایی بێت. ئێستا شێوەی هار و فێگیرێکی تەواوی گرتبوو. مامیشم پەنجەیەکی خستبووە سەر لێویی و بەجۆرێک وەک قووڵ تێبفکرێت سەیری هەموو زیندانییەکانی دەکرد. بە هێمنی سەیری هەر سێ قاوشەکەمان کرد، زیاد لە دە زیندانیمان بینی کە وەک میرئەودال لە زنجیردا بوون. ئەوانی تریش بە گشتی بێخەوی و ترس لە چاویاندا بوو. بابەعەلی گوتی «هەر یەکەیان لایەنیکەم ڕۆژی سێ جار تووشی ئەو فێیە دێن. زۆربەی جار زیندانییەکان خۆیان یەک یەکتری جڵەودەکەن، بە کۆمەڵ دەنیشنە سەر تەوقەسەری نەخۆشەکە تا پەلبەستی دەکەن و ئارامیدەکەنەوە، لەم هەفتەیەدا دەیانجار شتی لەو جۆرە لە قاوشەکاندا ڕوویانداوە، خۆیان پێیدەڵێن هاری. بەڵام هەندێ جاریش وا پێویستدەکات پۆلیسەکان بێنە ژووری و خۆیان دەست بەکاربن. شەوان حاڵیان زۆر خراپتر دەبێت، بە شەو هەموویان خەودەبینن، هەموو دەڵێن پێکەوە یەک خەون دەبینین. واهەستدەکەن کەسێک دێتە خەویان و سەری ئارەزوویەکی خنکاو لە ناخیاندا هەڵدەداتەوە، دوای ئەوە هەموو تووشی ئەم حاڵەتە دێن. حەزدەکەن یەکێک بکوژن. حەزدەکەن ئەو کەسە بدۆزنەوە کە دێتە خەویان، ئارەزووی ناو خەونەکە دواتر وازیان لێناهێنێت».

لە گەڕانماندا، بابەعەلی بە جۆرێکی ورد هەندێ خەونی بۆ مامم گێڕایەوە کە لە کاتی لێپرسینەوەدا لە دەمی زیندانییەکانی بیستبوو، منیش و مامیشم

لەو هەفتەیەدا چەندەها جار ئەو خەونانەمان بیستبوو، خەونەکان هەمووی یەکێک بوون، تەنیا هەندێ دیکۆر و پاشخان و هەستی بچوک لە ناویدا دەگۆڕان. دواجار مامم بە تێفکرینێکی قووڵەوە گووتی «بێگومان ئەمانە تاوانبار نین، هیچ یەکێک لەم زیندانیانە تاوانبار نییە. من ئێستا شتێکی روونم لەسەر خەونەکە بۆ ناگووترێت، دەبێت زیاتر بگەڕێم، زیاتر تێبگەم... بەڵام، کێشەکە لەوەدایە کە ئەگەر لێرە ڕایان نەگرن، دەیانبەن بۆ کوێ». بابەعەلی گووتی «شەو لەگەڵ فەرماندار کۆبوونەوەمان هەیە، پێویستیمان بە ڕاپۆرتێکی ئێوە هەیە. تا ئێستا لە شارەکەدا شتێک نییە ناوی پشکنینی دەروونی بێت، کە ئەمە عەیبێکی ترسناکی دەزگای پۆلیس بووە. من لە سێ ساڵی ڕابوردوودا چەندجار پێشنیاریی دانانی پشکنینی دەروونیم بۆ هەندێ زیندانی کردوە. بەڵام لێرە شتێکی لەو جۆرە بوونی نییە. ئینسان شێت یان عاقڵ دێتە دونیا و دەمرێت. شارەکە هێدی هێدی پێویستی بە شێتخانەیەک هەیە، بەوەدا ئێوە تاکە پزیشکی دەروونین دروستکردنی شێتخانە بێ ئێوە نابێت... تاکە کەسێک بتوانێت ئەو شێتخانەیە ببات بەڕێوە، ئێوەن».

دیلاوار هیچ شێتخانەیەکی نەبوو، شێتەکان بەرەڵا و لە کوچە و بازاڕاندا دەژیان. ئەو ڕۆژە مامم هیچی نەگووت، تەنیا بیریدەکردەوە. بابەعەلی دووجاری تر داواکەی دووبارەکردەوە. مامم کە لە تێفکرینێکی قووڵدا بوو گووتی «دەبێت بیرێکی ورد لە هەمووی بکەمەوە، بێگومان من دوێنێ لە زیندان بووم، شتەکان پێویستیان بە کۆبوونەوەیەکی گەورە هەیە. دەبێت بڕیاری خێرا بدرێت».

من تا ئەوکات نەمدەزانی کە مامم چەند دۆخەکە بە ناجۆر و خەتەرناک دەبینێت. بەڵام بینینی ئەو هەموو زیندانە هەردووکمانی دوودڵ کردبوو. پۆلیسە گەنجەکە گووتی «من پێویستیم بە ڕاپۆرتێکی دەروونی هەیە،

یان بەڕێزتان خۆتان ڕاپۆرتێک ئامادەبکەن یاخود خۆتان لە تەکمدا وەرن. بەلام بەر لە هەر شت وای بەباش دەزانم ئێوە چاوتان بە هەندێ لە زیندانەکان بکەویت و چیرۆکەکەیان وردتر بزانن تا بتوانن ڕاپۆرتی خۆتان بە باشی بنوسن، باوەردەکەم لە دۆخێکی وەک ئێستادا جەنابی فەرماندار زۆر گوێ لە ئێوە دەگرێت».

دیاربوو گەنجەکە تەواو خۆی بۆ قسەکانی ئامادەکردوە، ڕۆیشتن و ڕەفتاری بڕوا بەخۆبوونێکی تێدابوو کە زۆر بۆ من نامۆ و شایەنی ستایش بوو، بەتایبەت من خۆم هیچ کات توانای ئەوەم نەبوو لە بەردەم غەریباندا بەو بڕوا زۆرەوە دەربکەوم. من و مامم ئەو ڕۆژە چاوپێکەوتنی تایبەتمان لەگەڵ نزیکی شازدە دیلدا ئەنجامدا کە زۆربەیان کوڕی گەنج بوون، ئامانجی سەرەکیمان دیاریکردنی نیشانە و هۆکارەکانی نەخۆشییەکە بوو. من هەموو چاوپێکەوتنەکانم لەسەر کاسێتە بچوک و تایبەتەکان تۆمارکرد و چەندین جار گوێم لێگرتنەوە. کۆکردنەوەی زانیارییەکان شتێکی سەخت نەبوو، هەموو دیلەکان یەک چیرۆکیان دەگێڕایەوە. دوای چەند سەعات کارکردن مامم پەیمانی دا ڕاپۆرتێکی گونجاو بۆ بەڕیوەبەرایەتی پۆلیس ئامادەبکات.

ئەو ڕۆژە لە زۆر ڕووەوە بۆ من گرنگ بوو، لە نزیکەوە چەندین پرسیارم لە مامم کرد، دەبوو پێکەوە بگەینە هەندێ دەرەنجام. مامم گووتی «زۆر دەرەنجامگیریی گرنگ لە ژیاندا بە هۆی زانستەوە نایەنەدی. زانست تەنیا مرۆڤ فێردەکات چۆن بیربکاتەوە. مرۆڤ بۆ کێشە قورس و گرێ کوێرەکان زیاتر پێویستی بە مەنتیق و خەیاڵ هەیە». مامم بەو قسانە دەیویست منیش لەگەڵیدا بیربکەمەوە و بۆچوونی خۆمی پێبڵێم.

نەخۆشەکان چەند نیشانەیەکی هاوبەشیان هەبوو، لە کاتی ئاساییدا ترس دایدەگرتن، ترسێک وایدەکرد حەزبکەن چوار دەوریان قەرەباڵغ بێت،

لە ناو دەستە و تاقمی گەورەدا بن، پێکەوەبن و یەک خۆیان بە یەکەوە بنوسێنن. بەڵام هەر ئەو ترسە وای لە هەندێکی دییان دەکرد بچنەوە ناو خۆیان، کرژ و گرمۆڵەبن، دەست و قاچیان توند پێکەوە بنوسێنن و وەک یەکێک لە سامی شتێکی گەورە کوڕ بوو بێت، سەر بخەنە بەینی ئەژنۆیان و هەوڵبدەن بێ ئەندازە بچوک ببنەوە، هەندێکیان ئازارێکی سەیریان لە ملیاندا هەست پێدەکرد، وەک چەقۆیەکی ڕاستی گۆشتی گەردنیانی بڕیبێت، هەندێکیشیان ملیان بە شتێکی ئەستوور پێچابوو، چونکە ترسی ئەوەیان بوو یەکێک ئامبازیان بێت، لە هەندێکیاندا پلەی شەڕانگێزی بەرزتر بوو، توڕەتر و جەنگاوەرتر دەیاننواند، لە هەندێکی دیشدا پلەی ترس و خۆشاردنەوە بالاتر و بەهێزتر بوو.

مامم گووتی «باوەڕم بە بوونی خەونێکی وەها نییە، خەونەکە بوونی نییە، بەڵام دەبێت هەموو وا ڕەفتاربکەین، وەک ئەوەی ئەو خەونە بوونی هەیە». قسەکانی مامم بۆ من سەیربوو، من دەمزانی دەروونناسەکان گرنگییەکی تایبەت دەدەن بە خەون، بەڵام هەستمکرد مامم دەیەوێت نهێنی خۆی نەدرکێنێت و هیچ لەسەر ئیشەکەی خۆی ئاشکرانەکات. من بە گومانەوە سەیرمکرد و گووتم «پێتوایە خەونەکە تەنیا درۆیە و هیچی تر، چۆن؟ نابینیت هەموو بەدەستییەوە داغانن». مامم کەمێک بیریکردەوە و گووتی «نا. ڕێنوار ترسناکترین خەون ئەوەیە کە مرۆڤ بە هوشیاریی دەبینێت. باوەڕم بە خەونی بێهۆشی نییە، خەڵکی ئەم شارە دەمێ ساڵە دەوری مرۆڤی ساغ و تەندروست دەبینن، ئێستا جۆرە شێتییەک هەیە هاتۆتە سەری. هیچ شتێک لەوە خراپتر نییە ئینسان شێتییەکانی خۆی بشارێتەوە، دیلاوار شارێکە شێتییەکانی خۆی دەشارێتییەوە، ئەوەش زیاتر و زیاتر شێتیدەکات، ژیان ئەوەیە بتوانیت شێت بیت، ئازادی ئەوەیە بتوانیت تائەوپەڕی شێتی شێت بیت، بەڵام لە دیلاوار نەعەقڵ و نەشێتی بوونیان نییە، هەمووی شتێکی ترە ، مامۆستایەکم هەبوو

سەی فەتحولا، بە رەحمەت بێت دەمێ ساڵە مردوە، دەیگووت لە دیلاوار - زیرەکی گەمژەکان - کوشتووینی، بەڵێ زیرەکی گەمژەکان. ئەوەی ئێستا بلاوبۆتەوە نە دەردی شێتییە و نەدەردی عەقل، بەڵکو زیرەکی گەمژەکانە. ئێمەش چارمان نییە، جگە لەوەی لەگەڵ زیرەکی گەمژەکاندا برۆین». من پرسیم «مامە گیان، بەلام تکایە... نهێنی ئەو کەسە چییە کە لە هەموو خەونەکاندا دەردەکەوێت. ئەو کەسە کێیە؟ چ کارەیە؟» قۆڵی گرتم و وەک بیەوێت سەرزەنشتم بکات گووتی «ئاسانە بزانین کێیە. ئەو کەسە هیچ کەس نییە، هیچ کەسێکی دیاریکراو نییە، دەکرێت من بم، تۆ بیت، یان هەر بێگوناهێکی تر». ئینجا کەمێک توند ڕایوەشاندم و وەک بیەوێت لە بێهۆشییەک وریامبکاتەوە گووتی «باش بزانە، ئەوەی پێت دەڵێم نرخی خۆی هەیە. ئەم شارە پێویستی بە قوربانییە ... من لەو ڕۆژە دەترسم کە هەر مرۆڤە و پێویستی بە لاشەیەک بێت. گوێبگرە، دەبێت بە وردی لە ڕابوردووی دیلاوار تێبگەین. سبەی دەبێت بێ وەستان بچین بۆ مۆزەخانە بۆ لای پرۆفیسۆر بەهنام، ئەو تاکە کەسێکە دەتوانێت یارمەتیمان بدات... دەمەوێت شتێکی زیاتر لەسەر دیلاوار بزانم».

من زۆر بیرم لە قسەکانی کردەوە و پرسیم «بەلام قەت بووە پێشتر شارێک لە شارەکان هەموو یەک خەون ببینن، چۆنە شتێکی وەها لێرە ڕودەدات؟». مامم سەیریکردم و گووتی « خەڵکی دیلاوار لە شتێک دەترسن، شتێکی خراپ بەڕێوەیە. شتێکی ترسناک بەڕێوەیە. دەبێت بیربکەینەوە بزانین چی بۆ خەڵکی ئەم شارە پێویستە؟ نا من گەشبین نیم، گەشبین نیم».

# ٨

ئێواره دووباره عەقید بابەتاهیری وەزیری بانگیکردینەوە و پێی ڕاگەیاندین کە دەبێت لەگەڵ بابەعەلی کوڕیدا بچین بۆ دانیشتنێکی تایبەتی لەگەڵ جەنابی فەرماندار و «لیوا یاسین» حاکمی سەربازیی. من کەمێک سەرسام بووم، ئەو دووانە دوو پایەدارترین فەرمانڕەوای دێلاواربوون. گەیشتن بەوان و بینینیان لە دۆخی ئاساییدا کاری نەکردەبوو. ئەوەی ئێستا ئێمە هەروا سووک و ئاسان دەچووین بۆ بینینیان، شتێکی ئاسایی نەبوو. هەوا زۆر گەرم بوو، هاوین تا دەهات بێڕەحمانەتر دەیکوتاین، ئەو ڕۆژە تەپوتۆزێکی خەست لە باشوورەوە ئاسمانی سەر دێلاواری گرتبوو. ئەوەی مامم لە ناکاو کەوتبووە بەرچاوی بەرپرسە بالاکان و ئیشەکەی بووبوو بە جێگای سەرنجی ئەوان، لای من شوێنی خۆشحالی نەبوو، بەلام خۆی گەلێک کەیفی پێدەکرد، لە پاڵ نیگەرانییە زانستییەکانیدا، هەستیدەکرد لەم ڕێگایەوە ئەستێرەی ڕۆشنتر دەدرەوشێتەوە. ئەو ئێوارەیە لە بری ئەوەی لە بینای فەرمانداری کۆببینەوە، داوەتی ماڵی خودی فەرماندار بووین. من سەرەتا سەیرم لێهات کە دانیشتنێکی بەوجۆرە لە ماڵدا بکرێت، بەلام پۆلیسە بۆشناخ و خۆش ڕوخسارەکە بۆی ڕوونکرینەوە کە چەندین ساڵە زۆربەی کۆبوونەوە گرنگەکان لە ماڵی بەرپرسە بەرزەکاندا دەکرێن و لە سەر سفرەی خواردن و خواردنەوەی ڕازاوە ئەنجام دەدرێن.

ماڵی فەرماندار لە باکووری دیلاوار بوو، ڕاستییەکەی من گەرچی خۆم بە گەڕۆک و شارەزای دیلاوار دەزانی، بەڵام بۆ گەیشتن بە ماڵی فەرماندار کۆمەڵێک شەقام و گەڕەکی نوێمان بینی کە پێشتر لە دیلاوار نەمبینیبوون. یاوەرەکەمان گووتی «دیلاوار لەوە گەورەترە مرۆڤ بتوانێت هەمووی ببینێت. لە سەنتەری شاردا وا هەستدەکەیت لە شارۆچکەیەکی بچوکدایت، بەڵام وا نییە، من چەند وەختە بەرپرسی بەشی نەخشە و پلاندانان و ڕێکخستنم لە پۆلیس، هەمیشە کێشەم لەگەڵ گەورەیی ئەم شارەدا هەبووە». سەیربوو بەلامەوە کە بابەعەلی وەزیری لە بەیانییەوە تا ئێستا نە ماندوو بووبوو، نە شتێک لە قیافەی تێکچووبوو، نە چرچێک کەوتبووە جلە پۆلیسییە جوانەکانییەوە. لە دڵەوە غەمم لەوە خوارد کە بۆ دەبێت گەنجێکی وا جوان و بە توانا، پاشەڕۆژی خۆی بە پۆلیسەوە گرێبدات، بەڵام دواتر زانیم کە لە سیستمی دابەشکردنی دەسەڵاتدا لە دیلاوار، هەر بنەماڵەیە و بوارێکی کارکردنی بۆ براوەتەوە، واتە دەمێک کە دەسەڵات لە نێوان تایەفە و خانەوادە جیاوازەکاندا بەشکراوە، بنەماڵەی «وەزیری» ئیدارەی پۆلیس و گومرگیان بەرکەوتوە و ئێستاش نەوە لە دوای نەوە، پۆلیسی دیلاوار لە بن دەستی ئەوانە.

ئەو ئێوارەیە تەپوتۆز بەجۆرێک بوو، کە من و مامم دابەزین دەتگووت لە بەرمیلێک خۆڵیان هەڵکێشاوین، هەموو سەر و قامەتمان تۆزبوو، بە پێچەوانەی یاوەرەکەمانەوە کە هەستم نەکرد گەردێکی وەهای لێ نیشتبێت. جەنابی فەرماندار لە بەردەرگاوە پێشوازی لێ کردین، پیاوێکی باڵا مامنەوەندی سمێڵ زەرد بوو، چاوێکی کاڵ و مەکربازانەی هەبوو، سەلیقەیەکی جوانی لە ڕێکخستنی جل و قژ و پێڵاوەکەیدا بەخەرج دابوو، دوای بەخێرهاتنێکی گەرم ئێمەی ڕێنماییکرد بۆ دەستشۆرییەکی زۆر پاک و بریقەدار کە هیچی لەو تەوالێتە پیس و بۆهاتووانەی ناو ئیدارەکانی شار نەدەچوو، لەوێ خزمەتکارێک کە جلی تایبەتی لەبەردابوو، کۆمەکیکردین

تەواو خۆمان لە ئاسەواری تەپوتۆزی ئەمڕۆ پاکبکەینەوە، دەموچاومان بشۆین و بە هەیەئەتێکەوە کە مایەی شەرم نەبێت بچینە سەر سفرەی فەرماندار. جەنابیان وەک خۆی دەیگووت، سفرەیەکی جوانی لەسەر شەرەفی تاقانە دکتۆری دەروونی دێلاوار ڕێکخستبوو. چەند جارێک خۆی ئەوەی دووبارەکردەوە کە داوای لێبوردن دەکات کە چەند وەختە نەیزانیوە زانایەکی دەروونی وا گەورە لە دێلاوار دەژی. جگە لە جەنابی فەرماندار کە ناوی «عەبدولسەلامی ماروف» بوو، حاکمی سەربازیش لەوێ بوو کە پیاوێکی جیدی و مۆن دیاربوو، هەر بە حاکم بانگیاندەکرد، نەقیب زرار و دکتۆر حسامەدینیش، لەگەڵ دکتۆر مالیک بەڕێوەبەری بیمارستانی گشتی لەسەر سفرە چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. جەنابی فەرماندار لە ناو هەمووان‌دا ڕێزێکی تایبەتی لە من و مامم گرت. دوای خوانێکی لایەق و چەور، کە دیاربوو تیپێکی تایبەت لە چێشتکەری زۆر شارەزا دروستیانکردوە، ئێمەیان بردە ناو سالۆنێکی دانیشتنی شاهانەوە کە دڵنیام هیچ پارچەیەک لە دیکۆرەکەی دەستکردی وەستاکانی دێلاوار نەبوو، بەڵکو سەرتاپا لە کاری هونەرمەندی ولاتانی تر بوون. دوای چا خواردنەوە ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو، بچینە سەر ئەسڵی چیرۆک و بزانین جەنابی حاکم و فەرماندار چییان دەوێت.

من و مامم گەرچی ئەو ڕۆژە نەمانتوانیبوو ڕاپۆرتێکی ورد ئامادەبکەین، بەلام زانیارییەکانمان بەشی ئەوە بوو بە وردی باس لە «نەخۆشییەکە» بکەین. مامم خۆی قسەیکرد و بۆ هەندێ وردەکاری، بواری بە من دەدا زانیاری زیاتر بخەمە سەر قسەکانی. لەگەڵ قسەکردندا هەمووان شەرابیان دەخواردەوە، دوو خزمەتکار پەیتا پەیتا لەسەر مێزێکی گەڕۆک خواردنەوە و مەی و عارەقی گرانبەهایان دەگێڕا. مامم بێ لەمپەر و بێ سەبر، وەک یەکێک گومان و دوودڵییەکانی ئارامیان لێ بڕی بێت دەیخواردەوە، پێشتر نەمدیبوو بەوجۆرە بێشەرم و قوڵقوڵی بخواتەوە، بەشێوەیەک هەر لە

سـەرەتاوە ترسـم لـێ نیشـت، شـەومان بـە جۆرێکـی بـەد تـەواو بێـت. مـن پێکێکی بچوکم داکرد و بێئـەوەی قومـی لێبدەم، خۆم ئامادەکرد، هەر شتێکی نەگونجاو ڕوویدا زوو ڕاستیبکەمەوە.

دیاربـوو فەرماندار لـە بوونـی نەخۆشییەکی نائاسـایی ئاگادارکراوەتـەوە. مامـم لـە سـەرەتادا زۆر بـە دوودڵـی وشـەی نەخۆشـی بەکاردەهێنا، دەیویست وادەربکەوێـت کـە وردەکاری و دیقەتـی زانسـتی ڕێـگای ئـەوەی لێدەگـرن سـەرپێی هەندێ ناو و وشـە بەکاربهێنێت. حاکم یاسین لەوانی تر کۆنجکۆلتر دیاربـوو، مـن بـەردەوام سـەیری ڕوتبەکانیـم دەکـرد، هـەر لـە سـەرەتای قسـەکانەوە گووتـی « ناکرێـت وا دەستەوەسـتان دابنیشـین، دەبێـت شـتێک بکەیـن گەنجانـی خۆمـان بپارێزیـن و دۆخەکـە ئارامبکەینـەوە، هەرچییـەک بێت گەنجەکانمـان ترسـیان لـێ نیشـتووە و پەشـۆکانیان پێـوە دیـارە». مامـم بۆئەوەی هێوریبکاتەوە، گووتی «شـتەکە تا ئێسـتا ترس و خەیاڵێکی نابەجێیە و هیچـی تر. ڕاسـتە لـە هەندێ جێگادا کرداری توندوتیژییش دەبینرێت، بەڵام شـتەکە لـە سـەرەتادایە. مـرۆڤ دەبێـت بزانێـت سـەرچاوەی ئـەم ترسـە چییـە، بۆئـەوەش کارێکـی زانسـتی دوورودرێژمـان پێویسـتە».

مـن و مامـم چەنـد جۆری جیاوازمـان لـەو خەونـە بیسـتبوو خسـتمانە بـەر دەسـتی جەنابی فەرماندار. هەسـتمکرد بابەعەلی وەزیری و جەنابی فەرماندار لـە ئەوانـی تـر خۆگرتـر و وردتـر دەتوانـن بیـر لـە دۆخەکـە بکەنـەوە. دکتـۆر مالیـک و دکتـۆر حسـامەدین پەیتـا پەیتـا قسـەیان لـە ئافەتێکـی نادیـار دەکـرد کـە لەوانەیـە لـە دەسـت دەربچێـت و وەک تاعـوون ژیانـی شـار لـە بنـەوەڕا لـە بـەر یـەک هەڵتەکێنێت. هەردووکیـان ترسـا بـوون، هەوڵیاندەدا نەخۆشـییەکە لـە ئەسـتۆی خۆیـان دووربخەنـەوە و بڵێـن تەنیـا پۆلیـس و دەروونناسـەکان دەتوانـن لـەم بـوارەدا دەسـت بەکاربـن. لـە سـەرەتاوە تـەواوی پرسـیارەکان دەربـارەی ئـەوە بـوون، چـۆن ڕێـگا لـە بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـییەکە بگریـن.

سەیرم لێهات کە بینیم مامە سیامەندم لەو ڕووەوە زۆر خەتێکی توندگیر دەگرێتە بەر. پێشنیارەکانی مامە سیام، پتر لە پێشنیاری ژەنراڵێکی توندڕەوی سوپا دەچوو تا پزیشکێکی پسپۆر و مرۆڤدۆست. من دەمزانی مامم پیاوێکی خۆپارێز و موحافەزەتکارە، بەڵام پێشنیارەکانی بۆ من مایەی نیگەرانی بوون. ئەو لە ناخدا کەسێکی ناسک بوو، بەڵام ئێستا ترسێکی نادیار لە چاویدابوو، پێشنیاری ئەوەبوو بە توندی ڕێگا لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە بگیرێت بۆ ڕای گشتی، گووتی ئەوەی بڵاودەبێتەوە ئارەزوویەکی نهێنییە، ئینسانەکان لە هۆشیاریدا بێت یاخود لە خەونا ترسێکی ناوەکیان هەیە یەخەیان دەگرێت. پلانی مامم ئەوەبوو خەونەکە لە میدیاکانی دێلاواردا زۆر باس نەکرێت، ڕۆژنامە و تەلەفزیونەکان بێدەنگی لێ بکەن، بەهانەیەک نەدرێت بە خەڵک دەردەکە لە ناو خۆیاندا بگوازنەوە و یەک ترسەکە بدەن بە ئەویتریان. بەجۆرێکی هیستیریی و تووڕە، وەک بیەوێت لە ڕێگای حەماسەتی زۆرەوە دڵسۆزی خۆی بۆ دێلاوار و حاکمەکانی نیشانبدات گووتی «ئەوانەی خەونەکە دەگوازنەوە بۆ ئەوانی تر، دەبێت بخرێنە حیجزی کاتییەوە. دوو سەد ساڵە ئەورووپییەکان ئەم کارە دەکەن، کەس لێرەدا نابێت باسی دڵنەرمی و بەزەیی بکات». جەنابی فەرماندار زۆر لەگەڵ ئەو ڕۆحە سەربازیی و توندەی مامە سیادا بوو، من گەرچی پێشتر زۆر بە بیروڕای سیاسی مامم ئاشنا نەبووم، بەڵام هیچ کات باوەڕم نەدەکرد لەم مەسەلەیەدا وەها توند بچێتە پێشێ، بۆچوونەکانی بۆنی سیاسەتی پیاوێکی ترسنۆکیان لێ دەهات کە دەیەوێت دڵسۆزیی خۆی پیشانبدات. حاکمی سەربازیی لەگەڵ هەر پێشنیارێکی مامەمدا، دەنگی بەرزدەکردەوە و دەیگووت «احسنت». بابەعەلی وەزیری زۆر لە قسەکان نیگەران بوو، بە هێمنی گووتی «گرتن و جیاکردنەوەی هەموو ئەوانە ماوەیەکی تر دەبێتە کارێکی ئەستەم. توانای پۆلیس لە گرتن و جیاکردنەوە و دروستکردنی قەرەنتینەدا سنووردارە، نابێت لەو ڕووەوە پشت بە ئێمە

ببەستن، دائیرەی ئێمە چەند ساڵە کەمبودێکی زۆری بودجەی هەیە کە هەمووتان هۆکەی دەزانن، هەر دەزگایەک بەدەست بنەماڵەی وەزیرییەوە بێت، خانەدانەکانی خێڵی «باڵول» کە کاروباری ماڵیاتیان لەلایە گرفت و کێشەی بۆ دروستدەکەن. لەوانەش بگوزەرێین، بەڕێزان، ئێمە لە ناو تەوقیفکراوەکاندا ڕوو بە ڕووی هەندێ حاڵەت دەبینەوە کە نازانین چۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین، لە توانای دائیرەی ئێمەدا نییە بریاریان لەسەر بدات. یەکێک لە باشییەکانی دەزگای پۆلیسی دێلاوار ئەوەیە کە بۆ هەموو کارێکمان دەبێت چوارچێوەی قانونیمان هەبێت بەشێک لە حاڵەتەکان تایبەتن بە شێتخانە و بیمارستانی دەروونی، بۆیە یەکەم کارێک بیکەین ئەوەیە جێگایەکی تایبەتی بکەینەوە کە شێتەکان لە خۆ بگرێت، دێلاوار ناتوانێت تا هەتاهەتایە بەمجۆرە بمێنێتەوە، تاکە شارێک بێت کە شێتخانەی خۆی نییە. بەبڕوای ئێمە هەندێ لە تووشبووەکان دەبێت لە شێتخانەیەکی تایبەتدا جیابکرێنەوە، شار دەم و دەست پێویستی بە جێگایەکی باشە تا شێتەکانی تێدا جیابکەینەوە».

مامم کە پێدەچوو هەموو دەمارە خراپەکانی هەستابێت، بە کەیفێکی زۆرەوە پێشوازی لەم پێشنیارە کرد. من لەو گۆڕانە کتوپڕەی مامم سەرسام بووم، ئەو بەیانی هیچ جۆرە جۆش و حەماسێکی بۆ ئەم پێشنیارە نەبوو، بەڵام لە ناکاو، لەم جەمعەدا دڵگەرمانە هوتافی بۆ دەکێشا. من شێتەکانم بە کەسانێک نەدەزانی شایەنی زیندان بن، بەشێک لە جوانی شارەکە لە شێتە بەرەڵا و ئازادەکانیدا بوو. دیاربوو خواردن و خواردنەوەی زۆر ماممی لە ڕێگا لادابوو، بەڵام توانام نەبوو کارێک بکەم بەری بگرم و نەهێڵم زیاتر تەسلیمی ئەم فەنتازیا شەڕانییە بێت کە کتوپڕ لە ناخیدا گوژمی گرتبوو.

لەو قسانەدابووین کە جەنابی حاکم هەموومانی گێڕایەوە بۆ سەر ئەو

پرسیارەی کە دەبێت بزانین ئەو کەسە کێیە دەچێتە خەونی گەنجانی دیلاوار و سەریاندەبڕێت. من ئەو شەوە زۆر لە مامە سیام ترسابووم. بەر لەوەی مامە سیام قسەبکات و بێتە زمان، پەڕیمە ناو قسەکان و گووتم «جەنابی حاکم، ئەو کەسەی لە خەونەکاندا دەردەکەوێت یەک کەس نییە، هیچ کەسیش نییە، مرۆڤ نابێت لە راستیدا بۆ وێنەی ناو خەونێک بگەڕێت. ئێوە وەک کۆمەڵێک دەزگای ڕەسمی دەبێت مەودای نێوان خەون و حەقیقەت وەک خۆی بە پارێزراوی رابگرن، تێکەڵکردنی ئەو دوو دنیایە زۆر خەتەرناکە ... ئینسانەکان لە خەوندا لە تەواوی هوشیاری خۆیاندا نین و نازانن چی دەبینن».

جەنابی حاکم عەسکەری بە مۆنییەکەوە گووتی « وا نییە، ئێمە وەک حاکم و بەڕێوەبەرانی شار دەزانین خەوی ئینسان پەیوەندی بە ناخییەوە هەیە. وایە جەنابی دکتۆر یان نا؟ . هەموو هاولاتییەک ناتوانێت بە ئارەزووی خۆی چی خەونێکی بوێت ببینێت. دەولەت تەنیا بەر پرسی ژیانی ڕۆژی هاوولاتیان نییە، بەڵکو بەرپرسی شەویشە». سەیرکردنەکەی حاکم یاسین سەیر بوو، مامم کە بەردەوام سەیری هەمووانی دەکرد، بە ترسێکەوە گووتی «بەڵێ جەنابی حاکم بێ گومان، بێ گومان خەون پەیوەندی بە ناخی ئینسانەوە هەیە».

حاکمی سەربازیی تا دەیخواردەوە و سەرگەرمتر دەبوو، کوڵمانی سوور هەڵدەگەڕان و مووی سمێلە سولتانییەکەی بەجۆرێکی بەرچاو ڕەپدەبوون. حاکم بۆئەوەی مانایەکی ڕەوانتر بدات بە قسەکانی و بێئەدەب دەرنەکەوێت گووتی «جەنابی دکتۆر، من خزمێکی خۆم هەبوو، خزمێکی زۆر نزیکم. ئەم حیکایەتەی بۆت دەگێڕمەوە زۆر کۆن نییە، دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێک لەمەوبەر، خزمێکی تابڵێی عاقڵم. شەوێک خەوی بینی ژنەکەی لە خەودا دەیکوژێت... تێدەگەیت جەنابی کاک عەبدولسەلام، شەوێک ئاسایی

وەک من و تۆ دەخەوێت و لە خەویدا دەبینێت ژنەکەی چەقۆی خستۆتە سەر گەردنی و خەریکە نیخە نیخ سەری ببڕێت. خزمەکەمان کە خەبەری دەبێتەوە هەموو گیانی دەنیشێتە سەر عارەق، تووشی لەرزوتا دێت و وەک لە ناکاو تۆفانی لێ نازل بووبێت، دەکەوێتە دانەچۆقە. بەلام هەرچۆنێک بووە، خۆی دەگرێت و هیچ نالێت، چەند شەوێک دەڕوات و دواتر جارێکی تر خەوەکە دەبینێتەوە. جا گوێگرە قوربان، خەو شتێک نییە هەروا بەسەریدا تێپەڕیت، لە قەدیمەوە هەموو دەزانین کە خەو هەروا نابینرێت. خەو شتێکی خۆڕا نییە، ئاگادارییەکە یان نامەیەکی غەیبییە یان شتێکی لەو جۆرەیە. خزمەکەمان کە ئەگەر ناوی بهێنم ڕەنگە زۆرتان بیناسن، چەند جار خەونەکەی بۆ زۆربەمان گێڕایەوە، بەلام هەر دەستەوەستان دانیشت و هیچی نەکرد... شەش مانگی نەبرد شەوێک ژنەکەی بە کۆمەکی دۆستەکەی لە شیرین خەودا سەریانبڕی ... خەو شتێک نییە هەر بلێین بابڕوات و تەواو. جەنابی کاک عەبدولسەلام، گەر خزمەکەمان زوو فریای خۆی بکەوتایە، شتی وا ڕووی نەدەدا ... بەستەزمانە چی لە خەوندا بینیبوو، هەر بەڕاستی هاتەوە ڕێگای».

جەنابی فەرماندار زۆر بە وردی و سەرسامییەوە سەیری حاکم یاسینی کرد، کاتێک ئەو قسەی دەکرد فەرماندار بەردەوام و بێ ئیرادەی خۆی سەری بۆ دەلەقاند، دواجار وەک باسێکی زۆر جیدی بیستبێت گووتی «بەلێ، جەنابی حاکم، منیش دلنیام خەو بۆی هەیە، منیش چیرۆکێکی سەیر لەو بارەوە دەزانم، ئەوەی بۆتان دەگێڕمەوە عەینی حەقیقەتە، سی و پێنج سال لە مەوبەر من هێشتا گەنج بووم، لە گوندی خەزنەبا مامۆستا بووم، باوکم بە ڕەحمەت بێت خۆی حاکمی دێلاوار بوو، بەلام بۆئەوەی کەس نەلێت خاتر و خۆتر دەکات و کوڕەکەی خۆی غەرقی ناز و نیعمەتە، منی ڕەوانەی دوورترین گوند کردبوو کە حاشا لە ڕووی ئێوە، بە جۆرێک لە دوژمن نزیک بووین، لەوێوە بۆ تسی ئەوانمان دەگەیشتن. ئەوەی بۆتان

دەگێڕمەوە خۆم بە چاوی خۆم بینیومە، مامۆستایەکمان هەبوو کە هەموو شەوێک خەوی دەبینی مارێکی گەورە قووتی داوە، مارێکی زۆر گەورە، کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستا و وەسفی مارەکەی بۆ ئێمە دەکرد، موچڕک بە لەشماندا دەهات. مامۆستاکە هەموو شەوێک ئەو خەونەی دەبینی بەجۆرێک وردە وردە کاری لە ژیان و تەندروستیشی کرد، وای لێهات نەیدەتوانی وانەکانی بە باشی بڵێتەوە، نەیدەتوانی بە راحەتی بخەوێت. خەوەکە ئارامی لەبەر هەڵگرتبوو... ڕەنگە باوەڕنەکەن، بەڵام ئەوەی پێتان دەڵێم عەینی حەقیقەتە، باوەربکە جەنابی دکتۆر سیامەند، دوو مانگی نەبرد، بەیانییەک بە مردوویی دۆزییانەوە، ئەژدیهایەکی گەورە لە ملی ئاڵا بوو، مارێکی زەبەلاح کە دەیانگووت تا ئەو دەم کەس ماری وا گەورەی لەو ناوچەیەدا بە چاوی خۆی نەبینیوە».

دکتۆر حسامەدین کە تا ئەوکات شتێکی ئەوتۆی نەگوتبوو، یەک لەسەر یەک بیرەی دەخواردەوە و بەسەرسامی بە چواردەوری خۆیدا دەیڕوانی. بۆ یەکەمجار سەیری هەمووانی کرد و گووتی «بەڵێ، خەون پەیوەندییەکی زۆری بە ڕاستییەوە هەیە، خەون دونیایەکی جیاواز نییە. من پزیشکم، لە ئەزموونی خۆمەوە دەزانم. ناتوانین بڵێین لە بەر ئەوەی شتێک خەونە کەواتە هیچ نییە، بەڵێ عەزیزی من کاک ڕێنوار زەریاواری، خەوی جڕنی و فڕنیش هەیە، بەڵام خەوێکی وەک ئەوەی ئێمە قسەی لەسەر دەکەین، خەوی جڕنی و فڕنی نییە، دیارە شتێکی لە پشتە... خۆ شتەکە خۆی هاواردەکات». دکتۆر مالیک کە جووتێک چاویلکەی ڕەشی لە چاودا بوو، شێوەی وەستان و قسەکردنی زیاتر لە هی نابینایان دەچوو، سەری بۆ هەموو قسەکان دەلەقاند، بەڵام بێزارییەکی ڕوونیش لە ڕوخساریدا بوو، قاتێکی شەکەری زۆر جوانی لە بەردا بوو کە زۆر لەگەڵ گرژ و مۆنییەکەیدا نەدەگونجا. قسەکانی بە دکتۆر حسامەدین بڕی و گووتی «لە حیکایەتی ئۆدیبی پادشادا، کارەساتێک و فاجیعەیەکی گەورە بە ئافاتێک

دەس پێدەکات. من لەگەڵتم کوڕم، من لەگەڵ جەنابی دکتۆر حسامەدینم. ئافاتێکی وا نیشانەیە بۆ شتێک، بەڵێ، بێ مەلامەت نییە. من لە دوێنێوە کە خەریکە لە شتەکە تێدەگەم، دەڵێم دەبێت دەستوبرد بکەین. جەنابی فەرماندار ئێوە لە هەمووومان دلسۆزترن، پێشنیارەکانی جەنابی دکتۆر سیامەند و کاک بابەعەلی وەزیری دەبێت هەر زوو لە ئەنجومەنی شار بخرێنە کارەوە. نابێت شتەکە فەرامۆشبکرێت، دەبێت بزانین هۆی ئافاتەکە چییە، ئەم تاعوونە چییە یەخەی گرتووین. بزانین چی قەوماوە و چی ئەم بەدبەختییەی بۆ شارەکەمان هێناوە...».

من و مامم نەبێت کە ئاگاداری چیرۆکی ئۆدیب بووین، ئەوانی تر هیچیان دەربارەی ئەفسانەکە نەدەزانی. من هەستم بە وەڕزییەکی زۆر دەکرد لە ناو ئەم بەرپرسانەدا. یەکەمین جارم بوو کۆمەڵێک پیاو ببینم، لە پلەیەکی وا بالادا، بەوجۆرە وەحشیانە بخۆن و بخۆنەوە، بە شێوەیەک بەردەستەکان پیا نەدەگەیشتن، پەرداخی شەرابەکان و قاپی مەزەکان پڕ بکەنەوە.

من بێدەنگ بووم، نەمدەویست شتێک بڵێم لەگەڵ بڕوا و بیرکردنەوەمدا نەبێت، بەلام مامە سیامەندم تەواو هەوای ئەو شوێنە شاهانە و دانیشتنە لۆردانەیە گرتبووی، هەستمدەکرد هەموو ژیانی چاوەڕوانی فرسەتێکی وەها بووە خۆی لە حاکمانی دێلاوار نزیکبکاتەوە، جارێک لە گەرمەی قسەکانیدا، مەستی وەها کەمەی بە هۆشی کردبوو، هەستایە سەرپێ و بەدەنگی بەرز گووتی «بەڵێ جەنابی فەرمانداری بەڕێز، ئێوە نازانن چ شەرەفێکی گەورەیە بۆ من لەگەڵ ئێوەدا دانیشم. گرنگترین شت ئەوەیە هەموو بە یەک دەست ئیشبکەین، ئێمەی هاولاتیان و ئێوەی فەرمانڕەوایانی دلسۆز. جەنابی حاکم تۆ لەسەر هەقی، دەبێت بزانین ئەو پیاوە کێیە کە بەوجۆرە لە خەونەکەدا دەردەکەوێت. ئەمە کێیە و ئەم چەقۆیەی دەستی ئیشارەت

بۆ چی دەکات و کێ دەترسێنێت. بەڵێ بەڕێزان، دەروون مەکینەیەکی سەیرە، مەکینەیەکی ناشیرینە. کاتی ئەوە هاتووە بزانین دەروونی ئەم خەڵکەی دیلاوار چی تێدایە».

بابەعەلی بەردەوام سەیری منی دەکرد و زەردەخەنەیەک لەسەر لێوی بوو. هەرجار کە پێکێکی هەڵدەدا، نەرم چاوێکی لێ دادەگرتم، دەیزانی نامۆم بە دانیشتنەکە و لە ڕەفتارەکانی دکتۆر بێزار و تووڕەم. هەستمکرد ئەویش لە دڵەوە وەک ئەوان بیردەکاتەوە، بەڵام تەنیا بۆ ئەوەی من زۆرتر نیگەران نەکات هیچ ناڵێت. تەواو خۆم کێشابووەوە و نەمدەویست قسەیەکی تر بکەم، هیوام دەخواست مامیشم زۆر نەڵێت و خۆی نەکات بە ژێر بارێکەوە لە توانایدا نەبێت.

دواجار فەرماندار ئەو قسەیەی کرد کە من لە سەرەتاوە لێی دەترسام، پێکێک عارەقی یۆنانی هەڵدا و کەمێک دەستی بە سمێڵ و ڕیشیدا هێنا و گووتی «خۆزگە بۆ جارێکیش بووە ئەو خەونەم دەبینی، خۆزگە هەر یەکێک لە ئێوە خەونەکەتان دەبینی. دەمەوێت بزانم ئەو پیاوە چۆنە کە ئەم هەموو ترسەی ناوەتەوە ... هیچ شتێک لە دونیادا لەوە باشتر نییە حاکمیش ئەو خەونە ببینێت کە خەڵک دەیبینن». مامە سیامەندم کە خەریکبوو تەواو مەستدەبوو، هەر ئەو قسانی بیست لە شوێن خۆی دەرپەڕی و هەستایەوە سەرپێ و گووتی «ئاسانە، جەنابی فەرماندار ئاسانە، من دەتوانم کارێک بکەم ئەو پیاوە ببینین. سبەی هەندێ نیگارکێش دەهێنم و وادەکەم نیگاری ئەو پیاوەمان بۆ بکێشن... ڕاستییەکەی کونجکۆڵی منیش ڕوو لە زیادبوونە، فزوڵی منیش وەختە بترەکێ، تا بتوانم ئەو پیاوە ببینم، دەمەوێت بزانم لە کێ دەچێت، دەی تەمەنادەکەم لە یەکێک لە ئێمە نەچێت». وای گووت و هەمووان دایانە تریقەی پێکەنین. حاکم یاسین جارێکی تر دەنگی بەرزکردەوە و گووتی «ئافەرین، دەبێت ئەو پیاوە ببینین، دەبێت ببینین،

هەرچییەکمان کردوە دەبێت تۆزێک بچینە ناو ئەو خەونەوە». لەو کاتەدا مامم ڕوویکردە من و گووتی «بەڕێزان، تۆزێک بێدەنگی، تۆزێک ئارامی. من ئێستا و لە بەرچاوی ئێوە ڕێنواری زەریاواری، هاوکاری خۆم، دەستە ڕاستی دڵسۆزی خۆم ڕادەسپێرم ببێتە بەرپرسی ئەو کارە، ئیشی ئەوە هەم نیگارکێشمان بۆ بدۆزێتەوە و هەم وێنەکان ئامادەبکات ... ڕێنوار گوێت لێ بوو ... تۆ لە سبەینێوە ئەو کارەمان بۆ بکە، دڵنیام پێت دەکرێت. بەو بۆنەیەوە ئێستا داواتان لێدەکەم پێکرا پێکێکی تر هەڵبدەین». حاکم و فەرماندار بە خۆشی و سەرسامییەوە سەیری مامە سیایان کرد، کە مەستی وەها زەفەری لێهێنابوو، من دەترسام هەر بجوڵێت لەترێک بدات و بکەوێت بەسەر مێزەکەی بەردەمماندا .

***

بوونم بە بەرپرسی تایبەت بە دۆزینەوەی وێنەی ئەو پیاوەی دەچێتە خەونی خەڵکەوە، خستمییە دۆخێکی سەختەوە. نازانم لە بەر هەر هۆیەک بێت دڵنیابووم، هیچ نیگارکێشێک ناتوانێت وێنەی ناو خەونێک بکێشێت. تا ئەوکاتە چی نیگارێکم بینی بوو، کە گوایە لە قووڵایی خەوندا گیراون، لای من هەر نیگاری عەقڵی هوشیار و خەیاڵی هوشمەندانە بوون. ئەو شەوە لە گەڕانەوەدا کەمێک نیگەران بە مامم گووت «تۆ خۆت دەزانیت، من باوەڕم بەوە نییە ئینسان هیچ کات بتوانێت نیگاری کەسێکی ناو خەون بکێشێت. مرۆڤ چەندە هەوڵبدات، هیچ کات ناتوانێت خەونێک وەک خۆی ڕەسمبکات، چونکە ئینسان هیچ کات خەونێکی وەک خۆی لە بیر نامێنێت ... تۆ خۆت پزیشکی دەروونیت، ئەوە باش دەزانیت».

مامم لەوە مەستتر بوو بتوانێت وەڵامم بداتەوە، بەڵام بە دەمێکی نیوەخوار و لەفزێکی شکاوە وە، بێئەوەی خۆشی بزانیت دەڵێت چی گووتی «کوڕە تۆ دەڵێی چی. حکومەت وا دەڵێت، منی چی، خۆ کاری

بە منەوە نییە... خەتای حکوومەتی سەخیفە ... هەمووی خەتای حکومەتی حیزە، کاری بە منەوە چییە». مامم بەجۆرێک مەست بوو، چەناگەی یەک و دووی دەکرد، هەموو لەشی دەلەرزی... لە دۆخێکدا نەبوو وەڵامێکی دروست بداتەوە.

ئەو شەوە مامم گەیاندەوە ماڵ و خۆم گەڕامەوە بۆ عیادەکە و تەنیا لە بیری ئەوەدا بووم پەیوەندی بە چ هونەرمەندێکەوە بکەم تا خەونەکانمان بۆ نیگاربکات. سەرەتا خواستی دروستکردنی نیگارەکانم بە ئیشێکی گەمژانە لەقەڵەمدا، هەستم نەکرد هیچ مەترسییەک لە جۆرە کارێکی وەها بکەویتەوە، بەڵام وەک بێسوود لێم دەڕوانی. بەڵام خۆشم فزولێکی زۆرم هەبوو، ئەو دیمەنانەی ناو خەونەکە بە تابلۆ ببینم، هەستمکرد بابەتێکی باش دەست هونەرمەندان کەوتووە تا نیگارییبکەن. منیش ئارەزووم بوو بەجۆرێک لە جۆرەکان بەشێکی ئەو خەونە ڕوونتر بێتە بەرچاوم. تا ئەوکاتە لە هەموو خەونێک ترسا بووم، بەڵام هەستمکرد ئەم خەونە نامترسێنێت، بەپێچەوانەوە ئارەزوویەکی سەیرم لە خۆمدا هەست پێکرد هەوڵبدەم بیبینم. ئەو شەوە ناوی هەندێ نیگارکێشی ناسراوی دێلاوارم لە خەیاڵمدا هێنا و برد. ڕاستییەکەی چونکە هیچ زانیارییەکی ورد و زۆرم لەسەر هونەرمەندانی دێلاوار نەبوو، بڕیارمدا سوود لە ناسیاوێکی کۆن وەربگرم، کە خۆی نیگارکێش و پەیکەرتاش بوو، لە یەکێتی هونەرمەندانی دێلاواریشدا پلە و پایەیەکی هەبوو. بۆ ڕۆژیی دوایی دەمی چێشتەنگاو، تەلەفونم بۆ هاوڕێکەم کرد و ڕێکەوتین ئێوارە لە شەقامی قاوەخانەکان لە سەنتەری دێلاوار، لە قاوەخانەی «عەشق و کتێب» یەکتری ببینین.

# ٩

بۆ ڕۆژی دواتر مامم سەعاتێک زووتر گەیشتە عیادەکە. جۆرێک لە پەشۆکانی پێوە دیاربوو، بە هیچ جۆرێک نەیدەویست سەیری من بکات، کاتێک بۆ جێبەجێکردنی کارە پێویستەکانیش قسەی لەگەڵ دەکردم، هەوڵی دەدا چاومان بەر یەک نەکەوێت. منیش شتێکم نەکرد وەڕزیبکەم و بەهانەی بدەمە دەست تورەبێت. زۆربەی نەخۆشەکانی ئەو ڕۆژەمان خەڵکانێک بوون بە دەست سەرهەڵدانی شەڕانگێزییەکی کتوپڕەوە دەیاننالاند. دوو باوک بوون کوڕەکانی خۆیان بە بەستراوەیی هێنابوو بۆ عیادەکە چونکە ماوەیەک بوو دەستیان دەوەشاند، شتیان دەشکاند و ئازاری غەریبە و دەرودراوسێیان دەدا، کچێکیش بوو لە ناکاو خواستی ئاگرکردنەوەی لە ناودا جولابوو، ویستبووی ماڵی خۆیان بسووتێنێت، ژنێکیش بوو مێردەکەی هێندەی لێدابوو تووشی خەیالاتی چرت و پرت بووبوو.

دوای تەواوبوونی وادەی پشکنین، بە مامە سیام گووت، دەبێت زووتر لە ڕۆژان بڕۆم و چاوم بە کەسێک بکەوێت کە دەتوانێت لە دۆزینەوەی نیگارکێشێکی باشدا یاریدەدەرم بێت. ئەو پێی گووتم بەر لەوەی بڕۆم، دەبێت پێکەوە کەمێک قسەبکەین. کە مامم دەستیکرد بە قسەکردن، هەستمکرد شتێک لە شەرم لە دەنگیدایە، بەڵام شەرمێک نا کە مرۆڤ هێمن و هێور دەکاتەوە، بەڵکو شەرمێکی دڕندە، شەرمێک وا لە مرۆڤ

دەکات، تیژئاژۆ و دڵڕەق بێت. دڵنیابوو لە دوێنێ شەوەوە شتێک لە مندا بەرامبەر ئەو گۆڕاوە، شتێک تەنیا لە بەر کەمی ئازایەتی و نەبوونی جورئەتە ناتوانم بە ڕوونی دانی پێدا بنێم. مامم لەم ساتانەدا تا بۆی بکرایە دەیویست مەنتیقی بێت، بە هێمنی گووتی «دانیشە کوڕم، هەندێک شت هەیە دەبێت بۆتی ڕوونبکەمەوە». من بێئەوەی هیچ جۆرە هەست و چاوەڕوانییەک لە چاومدا بێت گووتم «بەڵێ مامە، فەرموو». «دانیشە ... دانیشە و ئیسراحەتی خۆت وەربگرە» «بەڵێ مامە» «ڕێنوار. شتێک هەیە دەبێت بیزانیت، شتێکی گرنگ، ڕەنگە بۆ زۆر کەس بایەخی نەبێت، بەڵام دەزانم بۆ تۆ گرنگە و باشترە بیزانیت. کوڕم ڕەنگە لە داهاتوودا دانیشتنی تری وەک دوێنێ شەومان بێتەوە ڕێ، تۆ گەر لە مامی خۆت تێنەگەیت و بڕوات پێم نەبێت ڕەنگە بکەویتە دوودڵی و گومانەوە. دانیشە... بەجوانی دانیشە، زۆر قن مەنێرە سەر قەراغی کورسییەکە. بەڵێ... چیمان دەگووت؟ . ئەها... ئەم شارە لەسەرەتایەکی تازەدایە، تێدەگەیت، دیلاوار لەسەر ڕێگایەکی نوێیە. دەبێت بەر لەوەی هیچ شتێک بکەین و هیچ حوکمێک دەربکەین لەو ڕاستییە تێبگەین، دیلاوار ئێستا بە ساتێکی قورسدا دەڕوات، ساتێکە هەموو شارەکانی تری دونیا پیا ڕۆیشتوون». «بەڵێ مامە». «ساتێکی خۆش نییە، بە هیچ جۆرێک ساتێکی خۆش نییە، نا من بە جۆرێک لەدایکبوونەوەی تازە نایشوبهێنم، هەموو شارێک یەک جار لە دایکدەبێت، بەڵام دەیشوبهێنم بە دۆنادۆنێکی گەورە. دۆنادۆن شتێکە جیاوازە لەگەڵ لەدایکبووندا، لەدایکبوون شتێکی گەورەیە، هاتنە دونیای مەخلوقێکی تازەیە کە پێشتر نەبووە، بەڵام دۆنادۆن وانییە... دەزانێت دۆنادۆن چییە؟» «نەخێر مامە نازانم چییە». «دۆنادۆن سەفەری ڕۆحێکە لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر، وەک ئەوەی دیلاوار جەستەیەک بێت بێ ڕۆح. وەک ئەوەی شارێک بێت لە دێر زەمانەوە چاوەڕوانی ڕۆحێکی کردبێت، ئێستا لە ناکاو، گیانێکی تر ئەم شارەی

دۆزیبێتەوە» . «بەڵێ مامە دەزانم» . «بۆئەوەی جەستەیەک ڕۆحێکی تازە وەربگرێت، دەبێت چی بکات؟». من تەنیا تەماشامکرد و هیچم نەگووت. «دەبێت توند بێت، زۆر توند بێت، دەبێت بەرگەی هاتنی ئەو ڕۆحە تازەیە بگرێت. من دوو ڕۆژە بیر دەکەمەوە، هەموو ڕۆحێکی تازە، کۆمەڵێک خەیالات، تراوێلکە، ورێنە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. ڕۆح ؟ ڕۆح چییە؟ . تەنیا زنجیرەیەکە لەو شتانە. زۆر بیری لێ بکەیتەوە ناکام دەردەچێت... ئینسان هەمیشە خەیالات، ورێنە، زیندەخەوەکانی خۆی ناودەنێت ڕۆح. ڕۆح هەر ئەو شتانەیە... ئەوەیە و بەس ... ترسێکی تازەت هەیە، یەعنی ڕۆحێکی تازەت هەیە. ئەی چی، ڕۆح قابیلە چی بێت. ئەم خەوە تەنیا نیشانەیەکە... نیشانەیەکە بۆ ڕۆحێکی تازە. لەگەڵ هەموو ئازارەکاندا دەبێت دڵمان خۆش بێت، دیلاوار ڕۆحێکی تازەی هەیە». من نازانم چی بڵێم، وەک هەمیشە ناتوانم خۆم کۆبکەمەوە، لە دەستەپاچەیی و پەشۆکاندا وەک گەمژە دەپرسم «مامە، کەواتە ئێوە پێتان وایە ئەو خەونە پەیوەندی بەو ڕۆحە تازەیەوە هەیە؟». «گوێبگرە ڕێنوار، عەزیزم خەڵکی ئەم شارە وزەیەکی زۆریان هەیە، تین و تاوێکیان هەیە کە چەند ساڵە خنکێنراوە. ئێستا هەستدەکەم شارەکە خەریکە دەجوڵێت، وزەیەکی گەورە خەریکە سەردەکەوێت، خەریکە دێتەدەرێ ... ئێمە شایەتحاڵی ئەوەین، شێتی تەنیا دەرکەوتەیەکی ئەو وزەیەیە، گەر زیرەک بین دەتوانین زۆر سوود لەو وزەیە ببینین. ئەو ڕۆحە تازەیە جارێک خەونی پڕوپوچ دەبینێت، مۆتەکەی خۆی هەیە، دەترسێت، ڕادەچڵەکێت، بەڵام بە دیویکی تر دەتوانێت هێزێکی گەورە بێت، هێزێک کە دیلاوار پێویستی پێیەتی». لەو ساتەدا کە ئەو ڕستانەی دەگووت چاوانی بریقەیەکی تایبەتییان تێدابوو، توند دانی بە وشەی هێزدا دەنا. «نابێت ڕێگا لەو ڕۆحە بگرین دەربکەوێت، دەبێت شێتەکانی لە جەنگاوەرەکانی جیابکەینەوە... شێتەکانی بخەینە لایەک و بە زنجیر بیانبەستینەوە و ستایشی قارەمانەکانی بکەین. من دوێنێ شەو

کە لەگەڵ جەنابی فەرمانداردا قسەمدەکرد، بە هێزی ئەو ڕۆحە تازەیە هەستبووم. ئەو شەڕانگێزییەی بڵاوبۆتەوە تەنیا سەرەتایە بۆ سەرهەڵدانی شارێکی نوێ، نەتەوەیەکی نوێ، کە لەو نەتەوە حیزە ملکەچەی ئێستا ناچێت... ڕۆح کە ماوەیەکی درێژ گیربوو، دوایی وەک لافاو بەردەبێت، من و تۆ و جەنابی فەرماندار و ئەوانی تر دەتوانین وای لێبکەین ئەو لافاوە بە ڕێگایەکی باشدا بڕوات، دەبێت لە پێناوی ئەو ئەرکە دا سوود لە توانا و هێزی دەسەڵاتداران وەربگرین، لەگەڵ حاکم و کەسانی بە توانادا ببین بە دۆست. ئەمە خەون نییە دێلاوار دەیبینێت، ئەمە دڵێکی نوێیە لێدەدات، هێزێکی تازەیە لە خەو هەڵدەستێت، وەک چۆن لافاو لەگەڵ خۆیدا ترس دەهێنێت، ئەویش ترسێکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، وەزیفەی من وەک دکتۆر ئەوەیە نەهێڵم ترسەکە بمان خنکێنێت، وەزیفەی ئێمە گۆڕینی پیاوە ترساوەکانە بۆ جەنگاوەر... بۆ خەڵکێکی ئازا و بوێر ... من دوو ڕۆژە بەردەوام بیر لەو خەونە دەکەمەوە و گەیشتوومەتە ئەو دەرەنجامە».

•

یەکەم جار بوو مامم بەوجۆرە قسەبکات. ئەو ڕۆژە زۆر قسەیکرد، زۆر باسی لە ئایندەی دێلاوار کرد ... من ئێستا هیچیانم لە یاد نییە، هیچیان... بەڵام ئەوە یەکەمجار بوو بە ڕوونی هەستبکەم کە چیتر دکتۆری مامم جێگای متمانە نییە.

***

من لە گوزەری قاوەخانەکان لە سەنتەری دێلاواری باکوور، لە قاوەخانەی «عەشق و کتێب» کە کۆمەڵێک کوڕی قژدرێژ دەیانبرد بەڕێوە، قاسم وەلیدم بینی کە پێکەوە لە دواناوەندی دەمانخوێند. قاوەخانەکە سەنتەری کۆبوونەوەی ئەو گەنجانە بوو کە تازە پێیان دەخستە جیهانی کتێب و هونەرەوە، هەر یەکەیان خۆیان بە کامۆیەک، مۆزارتێک یاخود مایەرهۆڵدێکی نوێ دەزانی. زۆربەیان کە دەهاتنە ژووری بۆ قاوەخانەکە،

چاوەڕوانی ئەوە بوون قەدر و حورمەتی بلیمەتێکیان لێ بنرێت. هەموو بە شێوەی وەستان و نیگاکردنیاندا دەیانگووت «ئێوە نازانن، ئێستا وەک کەسێکی گرنگ نامبینن، بەڵام بوەستن، ماوەیەکی تر تێدەگەن کە بلیمەتێکتان بینیوە». من مانگی جارێک یان دووان دەچووم تا چایەک بخۆمەوە و گەر ڕێکەوتبایە هەندێ لە ناسیاوە دێرینەکانیشم ببینم. قاسم یەکێک بوو لەوانەی لە دوای تەواوبوونی سەردەمی خوێندکاریی، بە بەردەوام لە چایخانە و قاوەخانە و کافیتریاکان دەمبینی، هەر جێگایەک شوێنی دانیشتن بووایە، ئەو لەوێ بوو. گەنجێکی ڕیشنی دەموچاو درێژ بوو، هەمیشە کاسکێتێکی تایبەتی لەسەر دەکرد کە ناوی نابوو کاسکێتی پرۆلیتاری، بەردەوام دەیگووت «شێوەی کاسکێتی چالاکوانە چەپەکانی سەرەتای سەدەی بیستە و من عەلاقەیەکی ڕۆحیم لەگەڵیدا هەیە». خۆی وەک چەپ پیشاندەدا، بەڵام لەوانەبوو کە چەپبوون تەنیا وەک کەرەستەی بەرهەمهێنانی بۆڵەبۆل بەکاردەهێنن، بەردەوام خۆی نیگەران پیشاندەدا و جنێوی بەم دونیا و بەو دونیا دەدا، گەرچی ڕێزێکی زۆری منی دەگرت، بەڵام خەڵکانی تر وەک جنێوفرۆشێکی ئەبەدیی دەیانبینی کە زۆر لەزەت لە بێحورمەتییەکانی خۆی دەبینێت و جنێوفرۆشی خۆی لێ بۆتە جۆرێک لە تێفکرینی بلیمەتانە. قاسم لە دواناوەندی هاوپۆلی خۆم بوو، وانەی هونەر نەبێت لە تەواوی وانەکانی دیدا خراپ بوو، من لە پێش ئەزموونەکان کۆمەکم پێ دەکرد و لە کاتی تاقیکردنەوەشدا بۆم بگونجایە زۆر لە پرسیارەکانم پێ دەگووتەوە. ئەو جگە لەوەی نیگارکێشێکی دەست ڕەنگین بوو، تاکە پەیکەرێک لە شاری دیلاواردا دانرابێت « پەیکەری بزنێک بە کڵاو و بۆینباخ و کۆمەڵێک کتێبەوە» لەدەستکردنی ئەوبوو. هەندێ وایان لە قەڵەمدەدا، شارەوانی دیلاوار بۆ سوکایەتی بە ڕۆشنبیرانی شار ئەو تاکە پەیکەرەیان ڕێداوە دابنرێت، هەندێیش بە گاڵتەیەکی تاڵی هونەرمەندیان دەزانی بە خوێندن و زانکۆ و ئەکادیمیستەکان، بەتایبەت پەیکەرەکە لە

ناوەندی فولکەیەکدا بوو، دەبووە شوێنی هاتوچۆی مامۆستا و قوتابیانی زانکۆی گەورەی دێلاوار. قاسم خۆی لەوانەبوو کە تەنیا کەیفی بەوە دەهات ناوی ببرێت، بۆی گرنگ نەبوو خەڵک چی لەسەر کارەکانی دەڵێن، تاکە شتێک لەلای بایەخی بوو، بتوانێت سەرنجی خەڵک ڕابکێشێت، ئەوەشی بۆ گرنگ نەبوو ئاخۆ خەڵک لە عەشق و خۆشەویستی هونەرەوە باسیدەکەن یان بۆ لاقرتی و گاڵتەکاری. هێندەی من لەگەڵیدا دانیشتم و گووتم «داواکەم پەیوەندی بە ئەنجامدانی ئیشێکی هونەرییەوە هەیە». ئەو وەک قسەکانی لەبەرکردبێت گووتی «ئاه ڕێنواری برام، تۆ ئاگات لێ نییە، هونەر مردوە، نیگارکێشان مردوە، پەیکەرتاشی مردوە. ئەم شارە هەموو شتێکی کوشتوە، نازانم تۆ باسی چ کارێکی هونەری دەکەیت، مرۆڤ زۆرجار دەبێت خۆی ڕیسوابکات، خۆی نزمبکاتەوە، بپارێتەوە، پێڵاوی هەندێ ناکەس بەچە بسڕێت، بەسەر دەستی ئەم و ئەودا بنوشتێتەوە، بۆئەوەی بینەرێکی هەبێت، بۆئەوەی بێن و تەماشای کارێکت بکەن، دەبێت گوێ لە قسە پوچەکانیان بگریت، گوێ لە ڕەخنە نابەجێکانیان بگریت...».
قاسم ویستی زۆر لەسەر قسەکانی بڕوات. من دەستم خستە سەر شانی و گووتم «قاسم من دەمەوێت، خۆت لەگەڵ کەسێکی تردا وێنەی خەونێکم بۆ بکێشێت، خەونێکە لەم ماوەیەدا خەڵکانێکی زۆر دەیبینن».
قاسم جگەرەیەکی داگیرساند و گووتی «مەبەستت چییە؟ خەونی چی؟ گاڵتەدەکەیت یان بەڕاستتە؟». «ماوەیەکە خەونێک بڵاوبۆتەوە، نازانم چۆن بۆت وەسفبکەم، من بە حوکمی ئەوەی لە عیادەکەی مامم ئیشدەکەم، ڕۆژانە گوێ بیستی دەبم... خەونێکی سەیرە، ئەوانەی دەیبینن، بەجۆرێک لە جۆرەکان دەکەونە ژێر کاریگەرییەکی نادیارەوە، هێزێکی نهێنی کە تەفسیری زانستی نییە، ئێستا خەونەکە خەریکە زۆر بڵاودەبێتەوە، خەریکە دەبێتە هەڕەشە، حاکمان و بەرپرسانی دەوڵەتی دەیانەوێت نیگارێکیان لەو کەسە هەبێت کە لە خەونەکەدا دەردەکەوێت... ئەو کارە بە من سپێردراوە.

لە بەر هەر هۆیەک بێت، من بە ڕێکەوت کەوتمە ناو جەمعێکەوە و ئەو کارەیان دا بە ملی مندا. ئێستا پێویستیم بە کۆمەکی تۆیە». قاسم دایە قاقای پێکەنین و گووتی «بیستوومە ... بیستوومە، شتێکی لەو جۆرەم بەرگوێ کەوتووە، بەڵام ڕێنوار کاتی خۆی کە خوێندکاربووین، تۆ تەنیا کەسی ناومان بوویت، تاکە کوڕی پۆلەکەمان بوویت کتێبت دەخوێندەوە و شتت دەزانی ... نازانم بۆ زانکۆت تەواو نەکرد؟ بەڵام خۆ دەبێت بزانیت کە خەون ڕەسم ناکرێت...». من دەستم خستەوە سەر شانی و گووتم «دەزانم، بەڵام ئەمە یەک خەونە، یەک خەونە و تا ئێستا سەدان کەس دەیبینن، کەسێک کە بۆ جارێک خەونەکە دەبینێت ئیتر بەردەوام دەیبینێتەوە، خەونەکە وەک خولیایەکی لێدێت، وازناهێنێت، کەسێک لە خەونەکەدا هەیە کە هەمووان سەردەبڕێت. خەونەکە دەبێتە مایەی ئازار و ترسێکی دەروونی قووڵ کە من ڕۆژانە لە دەمی نەخۆشەکانەوە چیرۆکەکەی دەیبیستم». «ئۆکێی ... ئۆکێی، تێدەگەم. بەڵام ڕەسمیان بۆچییە، دەیانەوێت کابرای ناو خەونەکە بگرن یان چی؟». دەنگم نزمکردەوە و گووتم «نازانم بۆچییانە، گەر بمزانیایە دڵنیابە پێم دەگووتی. بەڵام خۆت دەزانی بەشی زۆری خەڵکی دێلاوار خورافاتین، پێیان وایە ئەوەی بە خەون دەیبینین بەڕاستی دێتەوە ڕێگایان، خەون پێشبینیکردنی پاشەڕۆژە... دەیانەوێت شتێک بکەن، بە هەر ڕێگایەک بووە خۆیان بپارێزن. دڵنیام هەر هونەرمەندێکیش ئەو نیگارانە دروستبکات هەقدەستی خۆی وەردەگرێت. من دەزانم باری دارایی هونەرمەندانی دێلاوار باش نییە». قاسم ڕەنگی گۆڕا و ئەو زەردەخەنە گاڵتەجاڕییەی سەر ڕوخساری پەڕی. کەمێک کاسکێتەکەی جوڵاند و گووتی «بەڵام چۆن؟ دەبێت چی بکەم؟ من هێشتا نازانم تۆ مەبەستت چییە، بە ڕاستتە یان گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت؟». من نیگەران ڕوانیم و گووتم «نا قاسم، من ئەهلی گاڵتە نیم. من پێتدەڵێم، من هەموو شتێکت پێدەڵێم، من دەتبەم بۆ لای هەموو نەخۆشەکان... دەتبەم بۆ لای یەکەیەکەیان...

من دەتبەم، بەڵام پێویستیمان بە نیگارکێشێک یان دووانی تر دەبێت. من دەمەوێت زیاد لە نمونەیەکم هەبێت. دەمەوێت زیاد لە هونەرمەندێک تابلۆکەم بۆ دروستبکەن». قاسم دوای کەمێک بیرکردنەوە، دوای هەندێ پرسیاری دیکە، ژمارەی تەلەفونی عیادەکەی وەرگرت و گووتی هەوڵدەدەم دوو نیگارکێشی وردەکار بدۆزمەوە تاسبەی هەموو شتێک ئامادەبکەم. هەستمکرد لە ناخەوە دڵخۆشە، بۆی گرنگ نەبوو چی نیگار دەکێشێت، ئەوەی بۆ گرنگ بوو ئیشێک هەبوو بیکات، تا شتێک دەستکەوتی ڕەوای هەبێت و گرفتێکی ژیانی پێ لابدات.

شەو قاسم وەلید تەلەفونیکرد و گووتی بەیانی ئەو لەگەڵ هەر دوو هونەرمەند ئاسەف بورهان و مستەفا لەیلان دێت بۆ لام و دەتوانین لەوێوە بڕۆین بۆ هەر جێگایەک من دەمەوێت. ئەو شەوە بە تەلەفون قسەم لەگەڵ بابەعەلی وەزیری کرد و ئاگادارمکردەوە کە هونەرمەندەکان ئامادەن و دەتوانین بەپێی فەرمانی کاربەدەستانی باڵا دەستبکەین بە کێشانی نیگاری ئەو خەونە.

# ١٠

چەند ڕۆژ بوو سەی ئەسڵان لە کتێبخانەکەی نەدەهاتە خوارێ تا بتوانێت لە دوو توێی کتێبەکانی مێژوودا دەربارەی دوژمنان زۆرتر بخوێنێتەوە. دەیویست بیسەلمێنێت کە دوژمنان چ عەقڵێکی ترسناکیان هەیە، نوسەر و زاناکانیان بە چ رق و کینەیەک لەسەر دێلاوار نوسیویانە. سەری لە ناو کتێبەکاندا بوو کە هەواڵ هات، دوژمن لە بەری دەریاچەی دێلاوارەوە، پەلاماری ژمارەیەک ماسیگریان داوە و چەندانیان لێ کوشتوون. ساڵانە چەند جارێک ئەو جۆرە هێرشانە لەلایەنە دوژمنەوە لە سەر سنوورەکانی دێلاوار ڕووی دەدا. چەندجا ڕێکەوتی کردوە کە دوژمن بە چەکدارکانی خۆی پێشرەوی کردوە و چەندان کیلۆمیتری چوارگۆشەی لە خاکی دێلاوار گرتووە و تالانیکردون و باغ و بێستانی سووتاندون و دواتر پاشەکشەیانکردوە. دوژمنەکانی دێلاوار ناوێکی تایبەتیان نەبوو، ئێمە لە دێلاوار هەر پێیان دەڵێین دوژمن. ئەوان لە یەک ڕەنگ و یەک خوێن و یەک زمان نین، بە یەکشێوەش ڕێک نەخراون و یەک نیاز و یەک سەنگەریان نییە، لە نەتەوە و عرقی جیاواز دروستبوون، لە سوپای ڕێکخراو و پرچەکەوە تیایاندایە تا دەگاتە گروپی نەتەوەپەرستی بچوک. لەو پەڕی چەپەوە تیایاندایە کە دێلاوار وەک هەرێمێکی دواکەوتووی خێڵنشین سەیردەکەن، تا ڕاسترەوە ڕەگەزپەرستەکان کە خەڵکی دێلاوار

بە عیرقێکی لاواز و نەرم و درندە دەزانن... سەی ئەسلان دێلاواری بە «خاکی بۆ ئەبەد گەمارۆدراو» ناودەنا، خەڵکی مەمەدحەساریشی وەک ترسناکترین دوژمنانی ئێمە دەناساند. کوشتاری ماسیگرەکان ئەمجارە ترسێکی زۆری دروستکرد، ڕۆژنامەکان و تەلەفزیۆنەکان بایەخێکی زۆریان پێدا. ئەوە بەهانەیەکی باش بوو، کە سەی ئەسلان، پێ لەسەر نیازی تاریکی دوژمنان دابگرێت و گەنجانی هەواداری خۆی سەرگەرم و سەوداسەرتر بکات.

ماڵە هاوینەکەی سەی ئەسلان دەکەوتە دەرەوەی شار، نزیکی چل کیلۆمەتر لە سەنتەری دێلاواری باکوورەوە دوور بوو. ئەو زیاد لە بیست ساڵ بوو خەونی بەوەوە دەدی هێزێکی سیاسی نوێ دروستبکات، هەموو بە جۆرێک لە گومانەوە سەیریاندەکرد، بەڵام گەر ببوایەتە سەرۆک، ڕوخسار و هەیکەلی لە سەرۆک پارتەکانی دیکەی دێلاوار باشتر بوو. لاجانە سپییەکانی، ڕیشی پرۆفیسۆریی، قژی ماش و برنجی، قامەتی قیت و بەرزی، هەموو ڕوخسارێکیان دەدایە گەلێک لە سەرۆکەکانی ترمان شایستە و لەبارتر بێت. وەک خۆی دەیگووت، باوەڕی بە سێ شت هەبوو«خودا ـ نیشتیمان ـ گەنجان». پێشتر نەبووبوو مامۆستایەکی قوتابخانە پارتێکی سیاسی دابمەزرێنێت و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. بەڵام لە مێژە ئەو یەک هەست دڵ و دەروونی گرتووە، یەک ترس هەموو ژیانی بەڕێوەدەبات، ئەویش ئەو ترسەیە کە دێلاوار بکەوێتەوە دەست دوژمن. ماڵە هاوینەکەی لە خۆشترین کۆشکە تازەکانی ئەو ناوە بوون، سەرجەم ژوورەکانی فەرشی گرانبەهایان لێ داخرابوو، دیوارەکان بە تفەنگی کۆن و تەوری داربڕە مردووەکانی دێلاوار ڕازبوونەوە. ماوەیەک بوو خولیای کۆکردنەوەی تەور بوو، لە ژێرخانی ماڵەکەیدا کۆمەڵێک لە تەورە هەرە دێرینەکانی دێلاواری هەبوو، کە دەیگووت چەکی قارەمانە کۆنەکانی ئەم نیشتیمانە بووە. سەی ئەسلان، لە ڕاڕەوەکاندا لە بری تابلۆ، فۆتۆی ئەو

جەنگاوەرە دێرینانەی هەڵواسیبوو کە پێدەچوو لە سەرەتای دروستبوونی کامێرادا گیرابن. ماڵەکەی بەجۆرێک پڕبوو لە چەک و تفاقی دێرین، یەکێک نەیزانیبایە، دەیگووت ئێرە ماڵی سەرلەشکرێکی سەدەی نۆزدەیە. بەڵام ئەسلانِ بە ڕاستی دەترسا، ئەو هەستە تاڵترین و ئازاربەخشترین هەستی ژیانی بوو. هۆی بایەخدانی بە مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ پشکنینی ئەو ترسە. ساڵانی یەکەم کە بە قووڵی خەریکی خوێندنی مێژووی خۆرهەڵات بوو، تووشی نەخۆشییەکی دەروونی گەورە بوو. ئاخۆ نەخۆشییەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەو هەموو کوشتار و جەنگ و ناڵەبارییەی لە مێژووی ئەم دەڤەرەدا هەبوو یان هەر دەرکەوتەیەکی سەربەخۆی دەروونی بوو؟ هیچ کەس نەیدەزانی. بەڵام کەسە نزیکەکانی دەڵێن، پەتای زۆر، لەرزی پەیتاپەیتا، لە هۆش خۆچوون، کەف دەردان، هەموو ئەو دیاردانە ژیانیان تێکداوە و زوو سەریان سپی کردوە. ئەو هێشتا گەنج دەبێت کە دێلاوار ئازاد دەکرێت، ئەو ئازادییە جێنەگر و لەرزۆکە تووشی ئەم ترسەی دەکەن... ئەو، لەگەڵ خەڵکانێکی زۆری ئەم شارەدا دڵەڕاوکێ و وەسواسی ئەوە دەیگرێت کە دوژمن بەم زوانە دەگەڕێتەوە. ئەو ترسە وای لێدەکات لە ژنی یەکەمی جیاببێتەوە، چونکە بڕیاریدابوو منداڵی نەبێت و هیچ وەچەیەک بۆ ناو ئەم ئاگرستانە دروست نەکات. هەموو سامی ژیانی ئەوە بوو گەر منداڵی ببێت، لەوانەیە ڕۆژێک دوژمن بدات بەسەر دێلاواردا و منداڵەکانی سەر ببڕن. ئەو خەیاڵانە هێندە دەیانترسان، ئارامیان لێ دەبڕی و تووشی کینەیەکی قووڵ و ترسێکی ناسروشتیان دەکرد. کەسانێک کە ساڵانی گەنجی سەی ئەسلانیان لە بیرە، دەڵێن، بەردەوام باسی هێرش و پەلامارەکانی مێژووی دێرینی کردوە. سەربوردی قرمتییەکان، فاتمییەکان، مەغۆلەکان، سەلجوقییەکان، سەفەوییەکان، ئیسماعیلییەکان، عوسمانییەکان. سەری پڕدەبێت لە هێرشی لەشکری خەیاڵی، لە تەپوتۆزی ڕەش، لە هەرا و قرمەقرمی جەنگ، شەڕی گەورە کە شەوان لەسەر دەنگی پێی ئەسپەکان

و هاواری کوشتەکانی بەخەبەردێت. هەر ئەو ترسە وای لێدەکات بیر لە دروستکردنی شورای گەورە و خەندەکی قووڵ و لەشکری دڵڕەق بۆ دیلاوار بکاتەوە. وەک دەڵێن چەندین جار پێشنیاری دروستکردنی سوپایەکی پڕ چەکی داوەتە فەرمانداران و حاکمانی هەرێم و هەمیشە بە پێکەنین و گاڵتە پێشوازی لێکراوە. لەگەڵ تێپەڕینی ساڵاندا ترسەکانی هێور دەبنەوە، تەپوتۆزی جەنگەکانی ناو سەری دەنیشنەوە و خولیاکانی لە خولیای نەخۆشێکەوە کە پڕە لە ترس و هەراسی دەروونی دەگۆڕێت بۆ خولیای سیاسییەک کە دەیەوێت عەشقی دیلاوار لە خەڵکدا سەوزبکات. دەگەڕێتەوە بۆ بواری خوێندن وەک مامۆستایەکی قسەزان و شارەزا و دووربین، ترس لە پاشەڕۆژێکی نادیار لە هەموو خوێندکارەکانیدا دەچێنێت. وانەکانی لە خوێندنگای غەفاریی لە هەموو دیلاواردا دەنگدەدەنەوە، بەردەوام لە سەر ئەو دوژمنانە دەدوێت کە دەبێت خۆمانیان بۆ ئامادەبکەین، قسە لەسەر پەیداکردنی چەک و مەشقکردنی بەردەوام دەکات. وەک نیشتیمانپەروەرێکی بێ وێنە لەلایەن مامۆستایان و خوێندکارانەوە ڕێز و مەحەبەتێکی تایبەت بە دەستدەهێنێت، لە قسە و نوسینەکانیدا، کە هەمیشە بە دەستنوس دابەشیاندەکات، خۆی وەک کەسێک دەردەخات کە جگە لە زامنکردنی پاشەڕۆژ هیچ غەمێکی تری نییە. ئەو هەفتەیە کە فەراسە ڕەش و حامید سوڵتان دەچن بۆلای، بڕیاردەدا گەر زەمینە لە بار بێت یەکەم هەنگاوی ڕاستەقینە بنێت بۆ جێبەجێکردنی خەونە دێرنەکەی خۆی. لە نوسینەکانی پێشتری خۆیدا هەمیشە باسی لە «نەفرەتی مێژوو» کردوە. وشەی مێژوو سیحراویترین و سەیرترین وشە بوو لای، نوسینەکانی پڕبوون لە زاراوەگەلی وەک «نەفرەتی مێژوو» «زەلکاوی مێژوو» «ڕەوڕەوەی مێژوو» «تۆڵەی مێژوو» «زبڵخانەی مێژوو» «دەرفەتی مێژوو» «حوکمی مێژوو» «دادگای مێژوو». هەر کەس نوسینێکی بدیبایە دەیزانی وشەی مێژوو تا چ ئەندازەیەک هۆش و خەیاڵی گرتووە. ئەو ماوەیە

تاکە شتێک لە خەیاڵیدا بوو، وشەی «فرسەتی مێژوو» بوو. ئەو ڕۆژانە وەک دەرەنجامی خوێندنەوەیەکی درێژ لە کتێبە کلاسیکییەکانی سیاسەت و تیوریزەکەرانی فیکری نەتەوەیی، لەو باوەڕەدابوو کە خەڵکی دێلاوار نابنە میللەتێکی ڕاستەقینە تا هەموو پێکەوە یەک خەون نەبینن. کە کوڕانی غەفاریی هاتن بۆ لای و داوای ئیرشاد و یارمەتیيان لێ کرد، هەستیکرد ئیدی کاتی ئەوە هاتووە شتێک بۆ ئەم شارە بکات.

ئەو ڕۆژەی گەنجەکان چوونە ماڵە هاوینەکەی، لە نیوەڕۆوە لە بەر هەیوانێکی بچوک و فێنکدا کە بەسەر سروشتی شێتی ئەو دەڤەرەدا دەیڕوانی، سەری لە دەفتەرێکدا نوقمکردبوو تا وتارێک بۆ ئەو کۆبوونەوەیە ئامادەبکات. دەمەو ئێوارە، کاتێک گەنجەکانی غەفاریی لە پاسێکی گەورە و چەند ماشێنێکی تایبەتیدا گەیشتن، خۆی لە پێشوازییاندا بوو... گەنجان هەمیشە بە شەوق و زەوقەوە دەهاتنە دیدەنی سەی ئەسڵان. ئەو پێشتر جێگای تەواوی لە حەوشێکی پشتەوەی ماڵە هاوینەییەکەیدا سازکردبوو. لە جلێکدا کە نە شێوەی پیاوی فیزن و لاف لێدەری دەدایە، نە ڕەنگی مامۆستایەکی پەڕپوت و کەمتەرخەم، پێشوازی لێکردن... بە مەبەست کەمە ڕیشێکی غەمباری هێشتبووەوە تا ڕۆمانسیتر و کاریگەرتر دەربکەوێت. گەنجەکان سەرو بیستوپێنج کەس دەبوون... هیچ کەسیان تێدانەبوو پێشتر دەستنوسێکی سەی ئەسڵانی دەربارەی گرنگی نەتەوە و مێژوو و خۆپاراستن نەخوێندبێتەوە. سێ برازای سەی ئەسڵان خزمەتی میوانەکانیان دەکرد. گەنجان هێندەی دانیشتن و ئاو و شەربەتیان خواردەوە، سەی ئەسڵان دەستیکرد بە پێشوازی و بەخێرهاتنی گەرمیان، دەستی زۆریانی دووبارە گوشییەوە و چەند دانەیەکیانی گرتەوە ئامێز و گووتی «ماشەڵڵا لە دێلاوار و لەم گەنجە خوێن گەرمە جوانانە». هەوای ئێوارە بە جۆرێک فێنک بوو، حەوشەکەی سەی ئەسڵان بەجۆرێک سەوز و ئارام بوو، هێمنی بەسەر هەمووواندا سەپاند. ئەو دڵنیابوو ئەم دانیشتنەی دەرگای قۆناغێکی تازە لە

ژیانیدا دەكاتـەوە. كـەم كـەس لـە دیـلاوار دەیتوانـی ئـاوا گەنجـان لـە خـۆی كۆبكاتـەوە، دانیشـتنێكی وەهـا سیاسـییە بـەرزەكان و بەرپرسـە پایـە بڵندەكانی دیـلاوار خەونیـان پێـوە دەبینـی. سـەی ئەسـلان زۆر هەوڵـی دەدا جـۆش و خرۆشـی سـاتەكە وەهـا نەبیزوێنـن پەیامـی ڕاسـتەقینەی خـۆی لـە بیربـكات. پێش هاتنـی گەنجـەكان لـە بـەر خۆیـەوە گووتـی «ئەسـلان، تـۆ نـە پـارە و پولـت دەوێت، نـە پلـەو پایـە. ئـەوەی هەتـە و نیتـە ترسـێكە لـە دڵتدا. ترسـێكە دانامركێتـەوە تـا گەنجانـی دیـلاوار بـە یـەك ڕیـزی و ڕێكخراوەیـی نەبینیت، ئـەم گەنجـە تـورە و خوێـن گەرمانـە پێویسـتیان بـە پیاوێكـی دڵسـۆزی وەك تۆیـە ڕابـەر و چاوسـاغیان بێت، نابێـت تـۆ لـە ژێـر بـاری ئـەرك و فەرمانـی خـۆت هەڵبێیت»، ئـەو قسـانە قسـەی ڕاسـتەقینەی دڵـی بـوون، ئـەو بەراسـت دڵسـۆزی دیـلاوار بـوو. ئەسـلان گەرچـی زۆر دڵـی خـۆش بـوو، هەوڵـی دەدا وا نیشـانبدات كـە هـۆی دڵخۆشـییەكەی تەنیـا بینینـی حەماسـەت و دڵگەرمـی گەنجانـە، بـەڵام نەشـیدەتوانی ڕێزێـك بـۆ ئـەم ڕێبـازە شەخسـییەی خـۆی دانەنێت كـە دەیگـووت «تـا ئەمـڕۆ بـە پاكـی هێناومـە». گەنجـەكان كـە ڕووی گەشـی مامۆسـتایان دی پتـر كرانـەوە، هاتبـوون و بـاوەڕی تەواویـان هەبـوو كـە تەنیـا كەسـێكی وەك مامۆسـتا ئەسـلان دەتوانێت ڕابـەر و ڕێنیشـاندەریان بێـت. هەندێكیـان سەرسـامیان بـە مامۆسـتا و دەسـتنوسـەكانی دەگەیشـتە سەرسـامی بـە فریادرەسـێكی غەیبـی. مامۆسـتا بـە زمانێكـی سـادە دەینوسـی، شـتێكی دەخسـتە سـەر كاغـەز وەك خـۆی دەیگـووت قسـەی دڵـی خەڵـك بێـت.

كە گەنجـەكان هاتنـە قسـە، زۆریـان دەیانویسـت لەسـەر ئـازاری خەونەكان قسـەبكەن، بـەڵام خەونەكـە وردە وردە لـەوە دەردەچـوو هـەر خەونێـك بێـت. یەكێـك لـە گەنجـەكان، كـە سـورفلێكی مـوو زەرد بـوو، دەنگێكـی غەمگینـی نێـر و قرخنـی بـوو، لـە پێـش هەمووانـدا سـوار كۆڵـی كۆڕەكـە بـوو و گووتـی «مامۆسـتا خەڵكێـك هەیـە لـەوە سەرسـامە كـە ئێمـە خەونێكـی وا عاجباتـی دەبینیـن، بـەڵام مـن سەرسـام نیـم. هیـچ سەرسـام نیـم، ئێمـەی گەنجـان لـە

ڕاستیدا ڕۆژانە سەردەبڕدرێن، خەونەکانمان سەردەبڕدرێن، ژیانمان لە پوچیدا نوقم بووە. من هەر خۆم بگرە، هیچ هیوایەکم بە ژیان نییە، هەر خۆم بگرە، تا ئێستا چەند جار بیرم لە خۆکوشتن کردۆتەوە. من واهەستدەکەم مردوم، ئەو کەسەی لە خەونەکەدا دەیبینم جەلادێکە پێشتر منی کوشتوە، ژیانی من چ نرخێکی هەیە... چەند ساڵە لە فەقیرییەکی خراپدا دەژیم، هەرچی زەوی و زارێکمان بوو، هۆزی ئالیانی هەرزان لە چنگیان دەرهێناین، ئێستا ژیانی باوکم هەر لە ژیانی سەگێکی نەخۆش دەچێت، بەستەزمانە بووە بە سەگێکی نەخۆش کە دایمە بۆن بە چاک و دامێنی ئەم و ئەوەوە دەکات بەڵکو ئاوڕێکی لێبدەنەوە. من ئەوە ناشارمەوە کە باوکم هەمیشە ئەخلاقی سەگی بووە... هەمیشە مایەی شەرمەزاریمان بووە، لووتێکی هەیە بە بۆن دەزانێت، کێ کۆمەکیدەکات و کێ لەقە لە لمۆزی هەڵدەدا، بەڵام قەسەم بە خوا، هەندێ جار خۆشحاڵە لەقە لە لمۆزی هەڵدەن. من لێتان دەپرسم، گەر باوکم لە دێلاوار لە دایک نەبووایە وادەردەچوو؟ . نا دڵنیام کەسێک دەبوو خاوەنی کەرامەتی خۆی، دوێنێ کە باسی ئەو خەونەم بۆ کرد کە دەیبینم، دەزانن چی گووت، دڵنیام باوەڕناکەن چی گووت، گووتی بەو جووتە گوونەمەوە سەرت دەبڕن... گووتی دڵنیایت ئەو کابرایە سەری بڕیت، هەتیو دڵنیاییت هیچی تری لێ نەکردیت؟ ...». هەموو پێکەنین، سەی ئەسلان خەندەیەکی تاڵ کەوتە سەر لێوی و گووتی «چ خۆشحاڵم گوێم لێتان بێت، باسی خۆتانم بۆ دەکەن، وادانێ من لە بری باوکتم و چ غەمێکت هەیە بۆ منی ڕۆبکە». زۆرینەی گەنجەکان، لە هەژارانی گەڕەکی غەفاریی بوون، هەڵبەت غەفاریی هەژارترین جێگای دێلاوار نەبوو، چەندین گەڕەکی زۆر هەژارتر، لە باشووری خۆرئاوا هەبوون کە هەتا گەنجانی غەفاریی لە بینینی ماڵ و پۆشاک و ئاستی زیندەگی ئەوێدا شەرم دەیگرتن. مامۆستا ئەسلان کە یەکە یەکە لە گەنجانی دەڕوانی، هەستیکرد بەم قسانە، خەریکە لە ناکاو

شـەوقی خۆشـی و بریقـەی هاتنـی سـەرەتا دەڕەویتـەوە و غەمێکـی قـووڵ لـە سـەر دەموچـاوەکان دەردەکەویت. یەکێکیان کـە بـەو هاوینـە پاڵتۆیەکـی ڕەشـی لە بەردابوو و جامانەیەکی ڕەشـی لـە مللی پێچابوو، کەمێک ڕیشـی هاتبوو، قژێکی ڕەشی پەشـۆکاوی هەبـوو، کـە دیاربـوو پتـر لـە سێ مانگـە سەرکورسـی سەرتاشـی نەبینیـوە، جووتێک چـاوی هەبـوو کە مرۆڤ نازانێت وەک چاوانـی شـێتێک یـان بلیمەتێـک بیانبینێـت، هاتەقسـە. بـە «نەجمـەی ئایشـەگوڵ» بانگیاندەکرد. هـەم زیـرەک وهـەم خەتەرنـاک دەینواند، بەجۆرێک سـەی ئەسـڵان هـەر چـاوی پێکـەوت، زانی کـە پێشـتر هیـچ کات ئـەم کوڕەی لـە نـاو قوتابییەکانـی خۆیـدا نەبینیـوە. سـەرەتا وایزانـی کرێچییەکـی نوێـی گەڕەکی غەفاریی بێت، بـەڵام دواتـر زانی کـە گەنجێکی نەخۆش بـووە و لـە دوایی چەنـد سـاڵێک چارەسـەریی لـە یەکێـک لـە بیمارستانەکانی ویلایەتێکی دوور لـە دیلاوارەوە گەڕاوەتـەوە. نەجمـە بـە شـتێک لـە گرژییـەوە تەماشـای قسـەکەری یەکەمـی کـرد، وەک ئـەوەی هەقێکـی ئەمـی خواردبێـت. گووتـی «بەڕێز سـەی ئەسـڵان، مـن یەکەمجارمـە ئێـوە دەبینـم، بـەڵام لـە شـەش مانـگ لەوەوە پێشـەوە ئێـوە دەناسـم، هەڵبـەت ئیدیعای ناسـینی ئێـوە زیادەڕەوییەکی زۆری تێدایـە، بەتایبـەت مـن ڕقـم لـە زیادەڕەوییـە، مرۆڤێکی میانـەڕەوم، هەتـا ڕقـم لـەو شۆفێرانەشـە کـە تیـژ دەئـاژۆن، هەمـوو کـەس دەزانێ مـن لـە کاتـی پێویسـتدا نەبێت و بۆ مەبەسـتی پیـرۆز نەبێت، ڕقم لە زیادەڕەوییە. نا ناتوانم بڵێـم کـە زۆر دەتانناسـم، هێنـدە دەتانناسـم ئەوەنـدەی خوێندنـەوەی هەنـدێ دەسـتنوس ڕێـگا دەدات خوێنەرێـک نوسـەرێک بناسـێت». شـتێک لـە نائارامـی و دوودڵـی لـە دەنگیدا بـوو، کـە سـەی ئەسـڵان خێـرا سـڵی لێکردەوە. چاوانـی بـە جۆرێکـی شـێتانە دەگـەڕان... نائـارام و شـەڕانگێز بـوون. «تاکـە شـتێک بـۆم گرنـگ بـوو ئەوەبـوو یەکـەم کـەس قسـەبکەم، چونکـە دەمەوێت لـە قسـەی پـوچ دەرچیـن، شـتێک ئارامـم لەبـەر هەڵدەگرێـت قسـەی پوچـە، قسـەی دووبارەیـە کـە ناگەنـە هیـچ. هیـچ شـتێک لـەو قسـانە گرنگتـر نییـە کـە ڕاسـتەوخۆ ئامانجـی

خۆیان دەپێکن. من یەکێکم لەوانەی ئەو خەونە دەبینم، بەڵام ئەو خەونە نامترسێنێت... هەڵبەت هەر یەکێک لە ئێمە ئاگرێک لە ناخیایەتی، هەر یەک لەم گەنجانەی تۆ دەیبینیت، ئەو ژیانە شایستەیەی نییە کە خۆی دەیەوێت. بەڵام بوەستە بەڕێزم، ژیانی شایستە چییە؟ من لە هەمووتان دەپرسم ژیانی شایستە چییە؟ . ژیانی شایستە ئەوەیە کە خۆش بژیت و لە هیچ شتێکت کەم نەبێت؟ ئێوە وادەڵێن... قەسەم بێت بەر لەوەی بێم دەمزانی گوێم لە قسەی وادەبێت، دەمزانی خەڵکانێک هەڵدەستن و باس لە هەژاری خۆیان دەکەن، یان باس لەوە دەکەن باوکیان بۆ پاروویەک نان وەک سەگ لەسەر قاچێک سەمایکردوە. من بەر لەوەی بێم هەموویم لە بەرچاو بوو. من بەو بەڕێزانە دەڵێم کە هاتوون لێرەوە بۆ ژیانی خۆش بگەڕێنەوە، من هەموو ئەو ژیانە خۆشەم بینیوە کە ئێوە بۆی دەگەڕێن. من نیوەی ژیانم لە دەرەوەی دێلاوار بووم، بەڵێ نەخۆش بووم، بەڵێ سەرمایەکی ڕەش چووبووە ئێسقانمەوە، بەڵێ دکتۆرەکان دەیانگووت من جۆرە لەرزێکی ئەبەدییم هەیە کە هەرگیز چاک نابێت، بەڵام ئەو هەموو ساڵە لە دەرەوەی دێلاوار کاتی تەواوم بەدەستەوە بوو تا خۆش بژیم، کاتی تەواوم هەبوو خۆم لە هەر عەیش و نۆشێکدا نوقمبکەم کە گەنجانی دێلاوار خەویشی پێوە نابینن، تا سەر ئێسقان هەموو لەزەتێک تاقیبکەمەوە کە بە خەیاڵی شەیتانیشدا نایەت... بەڵام دواجار هەر دەبوو بێمەوە بۆ دێلاوار، بۆ کوێ بچوومایە؟ . شتێکی گەورەم کەم بوو. شتێک ناوی دەنێم ئاگر... وامەزانن حەزی من لە ئاگر پەیوەندی بە نەخۆشییەکەمەوە هەیە، بەڵام ئینسان بە فیترەتی خۆی گڕێک لە دەروونیایەتی بە خۆشی و کامەرانی ناکوژێتەوە. بەڵێ من قسەم لە گڕێکە کە جۆشێکی تر خامۆشیدەکات، جۆشێکە بەس ڕەنگە لە جەنگێکدا ئارام بێتەوە. دیارە من باسم لە جەنگی ڕاستی نییە، باسم لە بۆشاییەکە لە ژیانمدا کە بە شتێک پڕدەبێتەوە کە بە تەنیا ناکرێت، هەر شتێک من لەم پێستە نەخۆشەم بهێنێتە دەرێ و بە ئێوەوەم ببەستێت

گەرمەدەکاتەوە... ئەم خەونە بۆ من شتێکە لەو جۆرە، ئەو خەونە هەر چییەکە لای من گرنگ نییە، بەڵام ئەوەی گرنگە بە تەنیا نایبینم، لەزەتی ئەوەیە بە تەنیا نایبینم، ئەوەیە لەو کاتەدا دەخەوم و چاوەڕوانی دەکەم بێت، دەزانم ئێوەش هەمووتان لە هەمان کاتدا چاوەڕوانی ئەو ترسەن بێت... ئەوە گرنگە بۆ من، ئەوەی هەموومان پێکەوە چاوەڕوانین، ئەو هەستەیە کە تاسەر ئێسقان گەرمی بەجەستەم دەبەخشێت، شتێک کە هەتا نوسینەکانی ئێوە ناتوانێت پێم ببەخشێت». کە قسەیدەکرد بەردەوام بە جۆرێکی نائاسایی سەیری دەوروبەری دەکرد، دیاربوو پێشتر تەنهاییەکی زۆری چەشتووە، دیاربوو هەر چیی کردوە نەیتوانیوە لەو تەنهاییە بێتە دەرێ، بەڵام ئێستا ڕوناکییەک دەبینێت و وەک شێت بەرەو ڕووی دەفڕێت.

هەندێکی دیکەش قسەیانکرد، یەکێکیان کە کوڕی بەقاڵێکی پیر بوو لە غەفاریی، هەموو بە بۆقبۆقیلە بانگیاندەکرد قسەکانی لە هەمووان سەرنج ڕاکێشتر بوو، گووتی «خوام نەمابێت، ئەوەی بڵێ ئەوە خەونە خێری ناگات، خەونی چی کاکە گیان، من ئەسڵەن خەونم هەر بیر نایەتەوە، لە دایکبووم و دوو گوێم لێ ڕاوە خەونم بیر نەکەوتۆتەوە، هەموو لە شەودا ماوەیەک خەبەرمان دەبێتەوە و ئەو ترسە دەچێتە دڵمانەوە. کاکە گیان. ترسەکە شتێک لە ئاباو ئەجدادمانەوە ماوەتەوە. من باپیرە گەورەم سەر قافڵەچی بووە، لە سیستان و بلوچستانەوە ئاوریشمی هیندی هێناوە و ناردویەتی بۆ ئەستەنبوڵ، چی لێ بکات ئەو کات لە هەموو دێلاواردا پەنجا کەسی تێدا نەبووە قاتێک جلی تەواویان لەبەردا بێت، ئاوریشمی بە دیاریش بدایەتە خەڵک، چڵمیان پێ دەسڕی. باپیرم لە جێگایەک کە بەس خودا دەزانێت کوێیە، لەسەر ڕێگایەک کە بەس خودا دەزانێت چ ڕێگایەکە، سەر دەبڕدرێت... سەرەکەی دەخەنە مەشکەیەک ئاو و خوێوە و دەمی دەبەستن و دەیدەنەوە بە قافڵەچییەکانی تر، ئەوانیش دەیهێننەوە بۆ نەنکم، یەعنی بۆ نەنەگەورەم. کاتێک نەنکم سەری مەشکەکە دەکاتەوە، ئاوێکی ڕەش و بۆگەن

دێتەدەرێ، لەگەڵ کەللـەسـەرێک و دوانـزە دانـی ئاڵتون. کە بەقسـەی باوکـم بێت تـا ئێسـتاش هـەر مـاون. دەڵێن دوژمـن باپیـرە گەورەیـان سـەربڕیوم... دوژمـن... ئـەوە ڕاسـتییەکەیەتی. مـن دوو گوێم لـێ ڕواوە دەترسـم، شـەو نییە کـە دەچمـە نـاو جێگا نیـو سـەعات لـە خـودا نەپاڕێمـەوە ڕەحمـم پێبکات و بەیانی بە زیندوویی و سـاغ و سـەلامەتی خەبەرم بێتەوە. ترسـەکە لە گۆشت و ئێسقانمدایە... ئێسـتا شـار کە جاران جێگایەکی ئاسـایی و ئاسایشدار بـوو، وا نەمـاوە. لـە هەنـدێ گەڕەکـی دێلاواردا مـرۆڤ نازانێت خەڵـک بـە چ زمانێک قسـەدەکەن، لـە ئەترافی ڕۆژهەلاتـی شـارەکەوە بـەردەوام خەڵکی دەوروبـەر دێنە ژوورێ، خەڵکێک پێشـتر کـەس نەیبینیون، هەتـا دەموچاویشیان لە بەنی ئـادەم ناچێت. مـن هەشـت مانـگ لـە مەوبـەر بۆئـەوەی لـە حەقیقـەت تێبگـەم، بـرا گیان تێگەیشـتن لـە حەقیقـەت شـتێکی ئاسـان نییە. هەشـت مانگ لەمەوبەر بۆئـەوەی لـە حەقیقـەت تێبگـەم، بەڵـێ، هەشـت مانگـی ڕەبـەق لەوەوبـەر، چووم بـۆ نـاوچـە سـنوورییەکان، بەڵـێ بـرا گیـان لـە هـەر چوارلای دێلاوارەوە، نـە تەرەفێک و نـە دووان، لـە هەمـوو لایەکـەوە ... مەبەسـتم هـەم تەرەفـی چیا بـەرزەکان و هـەم تەرەفـی بیابانـە، هـەم کەنارەکانـی دەریاچـە و هـەم بـەری جەنگەڵ. ڕاسـتە ئێمـە لێرە دانیشـتووین و دڵمـان خۆشـە دەڵێین دێلاوار یـەک شـەقامی هەیـە، یـەک سـنووری هەیـە، بـەلام گـەر وەک مـن گەشـتێکتان بـە دوای حەقیقەتـدا بکردایـە دەتانزانـی کـە دوژمـن لـە هـەر چوار لاوە دزەیکردوە، دەیـان خێڵـی نیشـتەجێی ئـەو هەرێمانـە، خێڵ و عەشـرەتێک کـە لـە دارسـتان ژیـاون، قـەوم و تایفەیـەک لەسـەر دەریاچـە بە ڕاوە ماسـییەوە سـەرقاڵ بوون، کۆچەرانێک لـە تەرەفـی بیابانـەوە کـە هەتـاو دەموچـاوی وەک ڕەژووی ڕەش براژانـدون، هەمـوو دابزیونەتـە دێلاوار. وەک مـن و تـۆ خۆیـان بـە خـاوەن ماڵ دەزانـن، وەک مـن و تـۆ خۆیـان کـردوە بـە ئەسـڵی دێلاوار، لـەو دیـو چیاشـەوە بـەردەوام خەڵکانێک دادەبـەزن... ڕاسـتە زمانیـان لـە زمانـی ئێمـە دەچێت، بەلام غەریبـەن، ناتوانـن هەمـوو وشـەیەک بـە ڕوونـی وەک ئێمـە تەلەفوزبکـەن، بۆ

نمونە ناتوانن وەک من و تۆ بڵێن پونگە، یان قورباقە، یان پاقلە... برا گیان هەمووی بە جۆرێکی تر دەڵێن، بە شێوەیەک ئینسان دەبێت دەست بخاتە سەر دڵی و بڵێت وای خاک بەسەرمان چەند ساڵانێکی تر لەم دێلاوارەدا کەسێک نابێت بە دروستی عەیب نەبێت بڵێت قنگر».

بۆقبۆقیلە تەنیا کەس نەبوو کە ترس لە دەنگ و چاویدا بوو، بەشی زۆری قسەکەران وەک ئەو لە غەزەبێکی نادیار و نهێنی دەترسان. سەی ئەسڵان بە هێمنی و سەبرەوە گوێی دەگرت، دەیویست بەو هێمنی و ئارامییە تەواوی گەنجەکان بخاتە ژێر حوکمی ویقاری خۆی. هەمووان قسەیانکرد «ئاڵ موراد» نەبێت، کە هەڵبەت هەر خۆی دواتر هەموو شتەکانی بۆ گێڕامەوە، ئەو تەنیا بێدەنگی ئەو ڕۆژەبوو.

ئاڵ موراد ناوی بنەماڵەکەیان ال المراد بوو. نازانم بۆ بنەماڵەکەیان جۆرە ناوێکی وەهای هەبوو، کوڕێکی زۆر چکۆلانە بوو، کەس بە ناوی خۆیەوە بانگی نەدەکرد، هەموو هەر بە ئاڵ موراد بانگیاندەکرد. ڕەنگ ئاڵێک بوو، جووتێک چاوی کاڵی منداڵانە و پاکی هەبوو، لووتێکی زلیش کە زۆربەی کات زیپکەیەکی بەسەرەوە بوو. ئەو هەموو شتێکی ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواتری بۆ گێڕامەوە.

سەی ئەسلان وەستا تا دوایی، تا کاتێک ئیدی هەمووان ئارەزووی قسە و دەنگی مامۆستایان دەکرد، کە هاتە گۆ، بێدەنگی و گوێگرتن لە جوانترین ئاوێتەی خۆیاندا بوون. سەی ئەسلان، ئەو ڕۆژە دوای خەونێکی دێرین کەوت، شتێک هەمیشە لە مێشک و خەیاڵیدا بووە، گووتی «ئەزیزانم، کوڕە دڵسۆزەکانی ئەم نیشتیمانە، هەمووتان من دەناسن، منیش زۆرتان باش دەناسم، ڕۆژی لە دایکبوونی هەندێکتانم لە بیرە، منداڵی هەندێکی ترتان لە بەرچاومە، یادمە چۆن لە کوچەکانی غەفارییدا گەورە بوون، چۆن چوونەتە بەر خوێندن، چۆن ساڵی یەکەمی خوێندن هاتوون بۆ قوتابخانە،

سـاڵانی خوێنـدن چیتـان لـە بـەر بـووە. هەمـوو دەزانـن مـن ئـەولادم نییـە، وەچـەم نەخسـتۆتەوە، هـەر کەسـێک چیرۆکـی منـی بیسـتبێت دەزانێت بۆ. دەزانێت بەندە، هەمیشـە ترسـاوم، دەبوو واز لـە ژیانی خانەوادەیی بهێنـم، دەبـوو دەسـتبەرداری ئـەو خەونەبـم کـە هەمـوو پیاوێکـی ئاسـایی خەونـی پێوەدەبینێت. مَن ئەوەتـەی هۆشمکردۆتەوە بیر لـە دێلاوار دەکەمـەوە، هیچ شـەوێک نەبـووە سـەر بخەمـە سـەر سـەرین و پێش ئـەوەی چاوانـم بچنـە خـەو بیر لـە داهاتووی ئـەم وڵاتـە نەکەمـەوە، خەڵکی تر سـەردەخەنە سـەر بالیـف و ئەسـتێرە دەژمێـرن، سـەردەخەنە سـەر بالیـف و بیـر لـە یاریـان دەکەنـەوە، مـن جگـە لـە خەیاڵـی دێـلاوار، جگـە لـە مەسـتبوون بـە عەتـری گیـای ئـەم نیشـتیمانە هیچـی تـر لـە خەیاڵمـدا نەبـووە. هـەزار سـوپاس بـۆ خـودا کـە ئێسـتا لـە بەرامبـەر پۆلێک گەنجـدا دانیشـتووم کـە دەزانـن چەنـد ساڵە من چی دەنوسـم و باسـی چـی دەکـەم». چاوانی پڕبـوون لـە بریقـەی خۆشـی. دەنگی پڕبـوو لـە شـور و شـەوق، گووتـی «مـن هەمـوو ژیانـم ئاشـتی خـواز بـووم. بـەڵام ئاشـتی عەزیـزم بـە مانـای توانـا، ئاشـتی کاتێـک دەبێـت کـە دوژمـن لێـت بترسـێت، هێـزت هەبێـت، زەبـرت هەبێـت، کارێکبکەیـت دوژمـن سڵـت لـێ بکاتـەوە. ئـەوەی عاشـقی ئاشـتی بـوو، دەبێـت عاشـقی هێزیـش بێـت، دەبێـت خوێنیشـی بـۆ بڕێژێـت. مـن زۆر بیـرم لـە چیرۆکـی ئـەم خەونـەی ئێـوە کردۆتـەوە. دڵنیاتـان دەکەمـەوە کـە مـن سوپاسـی خـودا دەکـەم بـۆ ئـەم خەونـە... نـا وامەزانـن حـەزم لـە ئازارتانـە، بـەڵام شـتێک لـەو خەونـەدا دەیبینـم بێباکییەتـی. خەونێکـی بێباکـە، خەونێکـە دەسـت ناپارێزێـت، ڕەحـم بـە نێچیرەکـەی ناکـات. لەبەرئـەوە ئـەو شـتەی ئێـوە دەیبینـن خـەون نییـە، بەڵکـو دێوەزمەیـە و چێنـراوە لەسـەرتاندا، مۆتەکەیـە و چێنـراوە لـە ڕۆحتانـدا، بـە هـەزاران سـاڵ خسـتوویانەتە نـاو خوێـن و ئێسـقانی ئـەم میللەتـە. ئێسـتا سـاڵانێکی زۆر نییـە کـە دوژمـن لێـرە چۆتـە دەرێ، مـن لـە بیرمـن، لـە بیرمـە ج ڕوخسـارێکیان هەبـوو، ئێسـتاش خـەوی ئـەو ڕۆژە ترسـناکانە دەبینـم، ئـەو

ڕۆژانەی سەربازانی دوژمن بە خۆیان و چەک و خودە و پۆستاڵەکانیانەوە بە درێژی و پانی بە شەقامەکانی دیلاواردا دەهاتن و دەچوون، ژنەکانی دیلاواریان بە پرچ کێشدەکردە ناو پادگاکانی خۆیان... من هەموویم لە بیرە. بەلام خۆش خەیاڵییە؟ کێ دەڵێت دوژمن ڕۆیشتووە، دوژمن لێرەیە، لە ناوەوە و لە دەرەوەیە، لەو دیو سنوورەکانەوە بە چاوە زەقەکانی تەماشاماندەکات و دەیەوێت پەلاماربدات و لەم دیوەوە، لە ناوماندایە، لە ژێر پێستەکەماندایە، چۆتە ناو خەو و خۆراکمان. ڕۆڵەکانی من و باغەوانەکانی دیلاوار، ئەم خەوە مەلعونە گەر باشییەکی هەبێت، ئەوەیە بیری خستینەوە کە دوژمن هەیە، کە دوژمن نەمردوە، کە دوژمن چۆتە ژێر پێستەکەمان. خەوەکە لە خۆشخەیاڵی بە ئاگای هێناینەوە. ئەمە نە ساڵێکە و نەدووە و نە سێیە و نە چوارە ئێمە خەوتووین، ئەمە نە دوژمنێکە و نە دووانە و نە سیانە لە بۆسەدایە بۆمان. دوژمنەکانمان لێرەن، نزیکن، دزەیان کردۆتە ناخمانەوە، دزەیان کردۆتە عەقڵمانەوە، بە خۆیان و چەقۆکانیانەوە چوونەتە ناو سەرمان، دزەیان کردۆتە ناو عەقڵی فەرمانڕەوا و سیاسییەکانمانەوە. سەردەمی ئەوە بەسەرچووە میللەتان بێباک دانیشن... ئێوە دەتانەوێت چی بکەن، گەنجە دلاوەرەکانی نیشتیمان، دەتانەوێت تا مردن دانیشن و لە ژێر لێفەکانتانەوە خەون ببینن، دانە چۆقەتان بێت، بلەرزن و دوودڵ بن، ئێوە باغەوانەکانی دیلاوارن، ئەم نیشتیمانە باغێکی ڕازاوەیە، بەهەشتێکی بێوێنەیە، ئێوەش ئەو باغەوانەن کە دەبێت بە ئازایەتی خۆتان، بە خوێنی خۆتان، بە عارەقی خۆتان ئەم باغە ئاوبدەن، ئێوەن باغەوانەکانی دیلاوار... ئێوەن ...». لەگەڵ هەموو قسەیەکی سەی ئەسلاندا حەماسەت و دەماری گەنجەکان بەرزدەبووەوە، هەستیاندەکرد گوێگرتن لەم پیاوە ئیلهام و ئازایەتیان دەداتێ. ئاڵ موراد کە دانیشتنەکەی ئەو ڕۆژەی بە وردەکارییەکی زۆرەوە بۆ گێڕامەوە، گووتی « ئەسلان، هیچ شتێکی تایبەتی و ڕاستەوخۆی لە ئێمە داوانەکرد، بەلام ئێمە کە هەموو گوێ

بیستی وشەکانی بووین، دەمانبینی مامۆستا چۆن و بە چ هەستێکەوە باس لە مەترسییەکان دەکات، موچڕک بە جەستەماندا دەهات، زۆر لە گەنجەکان لەرزیان لێهاتبوو. شێوازی مامۆستا لە قسەکردندا هێند کاریگەر و ئەفسوناویی بوو، سادەترین وشەی ئەو لە سیحراویترین ڕستەی خەڵک کاریگەریی زیاتری لەسەر گەنجانی غەفاریی دادەنا. مامۆستا بەدرێژایی چەندین سەعات قسەی بۆ کردین، هەموو دەمانبینی کە گریانێکی شاراوە لە گەرویدایە، بەڵام ئەو لەو کەسانە بوو کە هیچ کات بە تەواوی نەدەگریا، هیچ کاتیش بە تەواوی پێ نەدەکەنی، هیچ کات بە تەواوی توڕەنەدەبوو، بەڵام هیچ کاتیش بە تەواوی لە ناوەوە ئارام نەبوو. هەر ئەو دەموچاوە سەیرەی وایانکرد من لێی بترسم نەوەک خۆشم بوێت».

ئەو شەوە گەنجانی غەفاریی تا درەنگ لەماڵی سەی ئەسلان دەمێننەوە. مامۆستا پێیان دەڵێت لەو خەونە نەترسن، چونکە خەونێکە یەکیاندەخات، ئامانجی گەورە لای ئەو گەڕان بوو بۆ دوژمن ، ئامادەبوون بوو بۆ جەنگ، دەیویست هەمووان چاو بکەنەوە و بزانن لە ڕیزی غەریبەکاندا خەڵکانێک هەن دەیانەوێت دێلاوار لە «ڕەوتی مێژوو» بسڕنەوە.

شەو گەنجەکان سەریان پڕبوو لە ڕستە ئاگرینەکانی مامۆستا ئەسلان، دڵیان پڕبوو لە ترسێکی گەورە لە دوژمن، بە هەمان ئەو ماشێنانە گەڕانەوە کە ئێوارە پێی هاتبوون. هاوارەکانی مامۆستا، خەیاڵی هەموانی داگیرکردبوو. ئاڵ موراد گووتی «هەموو دڵنیابووین لە ڕۆژانی داهاتوودا لە دێلاوار شتی سەیر ڕوودەدات، شتی زۆر سەیر، بەڵام نە تا ئەو ئەندازەیەی کە دوایی بە ڕاستی بینیمان».

# ١١

ئەو بەیانییە کە من لەگەڵ هونەرمەندەکاندا چووم بۆ بنکەی سەرەکی پۆلیس، کەسمان ئاگاداری دەنگوباسە سەیرەکانی ئەو ڕۆژە نەبووین. دواتر زانیمان کە لە هەمان کاتدا تەلەفزیۆنەکان ڕاپۆرتیان لەسەر ڕودانی سێ پێشهاتی ناخۆش داوە کە هەر سێکیان دۆخێکی شڵەژاو و نائاساییان لە دیلاوار دروستکردبوو. ڕۆژی پێشتر، کوڕی جێگری فەرمانداری دیلاوار لە کاتی ئەسپسواریدا لە دەرەوەی دیلاوار بەدەستی هەندێ نەناس فڕێندرابوو، بەشێوەیەکی دڕندانە سەربڕدرابوو، لاشەکەشی شەو لە سەر یەکێک لە شەقامە سەرەکییەکانی دیلاوار فڕیدرابوو. لەلایەکی ترەوە دەیان ماسیگر لە دەریاچەیەکی سەر سنووردا بە دەستی تاقمێک لە خەڵکانی توندڕەویی مەمەدحەسار، گیرابوون و قولاپ خراپووە گەرویان و لاشەکانیان شێوێنرابوو، هەواڵی سێهەمیش ڕودانی شەڕێکی نائاسایی بوو لە خوێندنگایەکی دیلاواری باشووردا لە نێوان کەسانێکدا کە خەونە ترسناکەکە دەبینن و کەسانێک کە نایبینن... شەڕێک دوازدە قوتابی پۆلێکی تیا دەسووتێت، کاتێک دەستەیەک خوێندکار کە ئەو خەونە دەبینن، کۆمەڵێکی دی لە ژوورێکدا دیلدەکەن و ئاگریان دەدەن.

من و قاسم وەلید و ئاسەف بورهان و مستەفا لەیلان لە ڕارەوەکەدا وەستابووین و ئاگاداری هیچ نەبووین، هەر چوارمان لەوانە بووین کە

بەیانیان گوێ لە هەواڵ ناگرین. بێ خەیاڵ لە ڕیزی یەک پاڵمان دابوو بە دیواری ژووری بەڕێوەبەری پۆلیسەوە و بێئەوەی کەسمان تاقەت و وزەی قسەی هەبێ سەیری بنمیچی ڕاڕەوەکەمان دەکرد. هەوا بە جۆرێک خنکێنەر و گەرم بوو، مرۆڤی دەپیشاند. ئاسەف بورهان کە ڕیشێکی درێژی هەبوو، بەردەوام بە جۆرێکی سەیر دەستی بە ڕیشیدا دەهێنا و پەشۆکانی پێوە دیاربوو. چەندین جار لە بەر خۆیەوە گووتی «یەکەم جارە بۆ کارێکی هونەری بێم بۆ پۆلیسخانە ... یەکەم جارە». کەسمان ئارەزوومان نەبوو هیچ تێبینییەک لەسەر قسەکەی بدەین. پاش کەمێک بەڕێوەبەری پۆلیس بابەتاهیری وەزیری هاتە دەرێ و بێئەوەی سلاومان لێ بکات، فەرمانی پێداین دوایبکەوین. خۆی بە هەنگاوی زۆر خێرا دەڕۆی، بەلام ئێمە چونکە کەرەستەیەکی زۆری نیگارکێشانمان پێبوو، نەماندەتوانی بە هەمان خێرایی دوای بکەوین. ماوەیەک لە پێشمانەوە ڕۆیشت بێئەوەی ئاوڕمان لێ بداتەوە، ئێمەش لامان ئاسایی بوو، دەمانزانی هەندێ لە پۆلیسەکان بە فیترەت بێئەدەب بارهاتوون. دواجار لە جێگایەکدا وەستا و جارێکی تر بەدەست ڕێنماییکردنەوە دوای بکەوین. ئێمە هەر چوارمان بە ڕیتمێکی خاو دەڕۆیشتین، هەر چوارمان ... وەلامی ئێمە بۆ ئەو بێحورمەتی و کەم ڕێزییەی بەڕێوەبەری پۆلیس، ئەوە بوو خاو و بەکاوەخۆ بڕۆین. هەر سێ هونەرمەندەکە هەر بە سروشتی خۆیان، لە فیترەتەوە، پۆلیسیان وەک گا و گەمژە سەیردەکرد. ئاخۆ پۆلیس مەخلوقێکی نزمترە لە هونەرمەند؟ من لەو ڕووەوە نەمدەتوانی ڕایەکی تایبەت بە خۆم دروستبکەم. عەقید بابەتاهیر زۆری پێ ناخۆش بوو، بە ناوی ڕووتی خۆی و بێ ڕوتبەکەی بانگیبکەیت، بەلام سێ هونەرمەندەکە بە «کاک بابە تاهیر» بانگیاندەکرد. دواجار ئێمە گەیشتینە ڕاڕەوێک پڕبوو لە ژووری چۆڵ، ژوورەکان چەشنێک بوون، پێدەچوو پێشتر ئاوەدان نەبووبن و لە هیچدا بە کارنەهاتبن. دەبوو نیگارکێشان لەو ژوورانەدا ئیشی خۆیان بکەن. من چۆنێتی ئیشەکەم بۆ

هونەرمەندەکان ڕوونکردەوە. وابڕیاربوو کۆمەڵێک زیندانی، کە بە بڕوای من دەبوو لە دە کەس تێنەپەڕێت، بە جۆرێکی تێکەڵ و نەناس بێن و وەسفی پیاوی خەونەکانیان بکەن. دوای ئەوەی هەموو گیراوەکان لە وەسفی خۆیان بوونەوە، نیگارکێشان هەر یەکەی بە پێی سەلیقە و تێگەیشتنی خۆی، بە جیا و لە ژوورێکی سەربەخۆدا، نیگارێکی فانتۆم لە ڕوخساری خەونەکە بکێشێت، بە جۆرێک هیچ یەک لە نیگارکێشەکان وێنەی ئەویدیکە نەبینن. من گوێم لە شەهادەتی زیندانییەکان گرت، خەونەکە گەرچی هەمیشە یەک بابەتی هەبوو، بەڵام بەردەوام لە کاتی جیا و فەزای جیادا ڕوویدەدا، زۆربەی ئەوانەی خەونیان دەبینی دەیانگووت پێشتر ترسێکی نادیاریان هەبووە، بەڵام هیچ کات بیریان لەوە نەکردۆتەوە یەکێک سەریان ببڕێت. پێکڕا خەوبینەکان ئارەزوویەکی دڕندانەیان هەبوو ئەو پیاوە بدۆزنەوە و بیکوژن. هەندێکیان دوودڵ بوون و نەیاندەزانی، ئایا سەرەتا ئارەزووی کوشتنیان هەبووە و دواتر خەونەکە هاتۆتە ژیانیانەوە، یاخود خەونەکە ئەو ئارەزووەی تێدا چاندوون؟ . وەک ئەوە بوو خەونەکە بە جۆرێک سەری لێ تێکدابن، خەون و ژیانیان بۆ لە یەک جیا نەکرێتەوە. زۆریان باوەڕیان بەوە بوو کە ئەوەی ئازاریان دەدات جادوویەکی ڕاستەقینەیە و دەیەوێت ڕۆحیان وێرانبکات، هێزێکی نهێنییە و دەیەوێت بیانترسێنێت و لە ڕێگای جادووەوە گیرۆدەیانبکات.

ئیشی هونەرمەندەکان ئاسان نەبوو، هەر سێکیان دەیانزانی کە دەبێت بێ ئاگای یەک نیگارێک بکێشن کە تا ڕادەیەکی زۆر لە زۆربەی سیفاتدا نزیک بێت لە یەکەوە. حاکمانی دێلاوار دەموچاوێکی دیاریکراویان دەویست. ئەوان پێشتر تاقیکردنەوەی وا سەختیان نەدیبوو، ئاسەف بورهان زوو زوو دەیگووت «ئاخر ئێمە ستیلمان لە یەک ناچێت». بەڕێوەبەری پۆلیس پێشتر ئەو وشەیەی نەبیستبوو، بێئەوەی خۆی وا دەربخات کە لە مانای وشەکە تێناگات گووتی «هەوڵبدەن ستیلتان بە یەک بخوات.

چونکە ئەم نیگارانەی ئێوە دەیکێشن، بایەخێکی گەورەی لەسەر مان و نەمانی شارەکە هەیە». من قسەکانیم وەک زیادەڕەوییی وەرگرت، هەڵبەت کێشەیەک هەبوو، بەڵام قسەکردن لەسەر مان و نەمانی دێلاوار و لەو کاتەدا، گەورەکردنێکی بێبایەخ و پوچی دەسەلاتداران بوو. بەڕێوەبەری پۆلیس بۆئەوەی قسەکەی ڕوونبکاتەوە گووتی «دوێنێ چەندین پیاوی ئاینی، باسیان لەوە کردوە کە شەیتان پەلاماری دێلاواری داوە، هەندێکیان گووتوویانە دوژمن سیحربازەکانی هێناوە تا جادو لەم شارە بکەن و ژمارەیەکی زۆر جادوباز کە لەمسەرە و سەری دونیاوە هاتوون ئێستا بە بەرگی شاردراوەوە لێرەن، ئەم قسانە خەڵکانێکی نەفام لە خشتە دەبات، دوێنێ کوڕێک خوشکەکەی خۆی کوشتووە و لە کاتی لێپرسینەوەدا گووتوویەتی لە ژێر کاریگەری خەونەکەدا ئەو کارەی کردوە... دەبینن خاڵە گیان، دەبینن، خەڵکی لە ئێستاوە شتەکەیان کردۆتە بەهانە یەک بکوژن، دەزانن چۆن... خوشکەکەی گۆشاو گۆش سەربڕیوە، گۆشاوگۆش و بە کەللەسەرەکەیەوە وێنەیەکی خۆی گرتووە، هەڵبەت لە ژێر لێپرسینەوەدا بۆمان دەرکەوت کە ئەسڵەن ئەو خەونەی نەبینیوە، ئەسڵەن هەر نازانێت خەونەکە چییە و چۆنە... ماوەیەکی دی دەبینن هەر کەسێک هەڵدەستێت و دەڵێت خەونم بینیوە و دەست دەخاتە خوێنی عالەم . سوێنددەخۆم کە ئەم خەونە بوونی نییە... سوێنددەخۆم هەموو دروستکراوی ئەم خەڵکە نەخۆشەیە کە مەبەستیانە بەهانە بۆ ئێشی ناقانونی بهێننەوە. ئەم دێلاوارە تا ماوە قانون تیا حاکم نابێت، من خۆم و باو باپیرم لەم شارەدا بەرپرسی پۆلیس بووین، دەمێک ئێمە ئیدارەی پۆلیسمان لە دەست بووە، خەڵکی بە پۆلیسیان دەگووت حەیتە، دەیانگووت جەندرمە و فلتەی بێ پلیتە و نازانم چی... بەڵام لە قسەوباسی ڕەسمی دەریبکەن، لە نێوان خۆماندا بێت، من ئەسڵەن باوەڕم بەم خەونە نییە، دوێنێ ڕێک و ڕاست ئەوەم بە جەنابی حاکمی عەسکەری گووت، کە پێیوایە خەونەکە جۆرێکە لە پێشبینی و ئەو

قسە هەڵەت و پەلاتانە، هەندێ سیاسی خوا سەلامەتیان بکات بە دوای بچوکترین شتدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بڵێن ئا با توزێکی تر گوونی ئەو خەڵکە بجەڕێنین ... میزدەکەم بە ڕوتبەکەمدا گەر ئەم خەونە ڕاست بێت و بوونی هەبێت. خەتەرە، بەڵێ خەتەرە... بەلام خەتەرەکەی لە کونجێکی ترەوە دێت. عەزیزم هەمووی بای کونە ڕەشێکی ترە کە ئێوە نایزانن».

گەرچی قسەکانی جەنابی عەقید شتێکی خراپی تێدانەبوو، بەلام شێوازی گووتنەکەی جۆرێک لە گەمژیی پێوە دیاربوو. هونەرمەندەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان دەترسان. تا دەهات پتر هەستیاندەکرد ئەو ئەرکەی چوونەتە ژێر باری ئەرکێکی سیاسییە تا ئیشێکی هونەریی بێت، من بە گوێی هەر سێکیاندا چرپاندم کە دەتوانن تا کات تێنەپەڕیوە و شتەکە لە دەست دەرنەچووە پەشیمان ببنەوە و من هۆیەکی ماقوڵ دەتاشم، تا جەنابی عەقید ڕازیبکات و بەریان نەگرێت. بەلام سروشتی هونەرمەندان گەلێک دوودیو و ناکۆکە، بۆ هەندێ لەوان تا ئیشەکە ڕوو لە سەرکێشی و ورووژان بێت، جوانتر دەنوێنێت. ئاسەف بورهان کە بە ڕیشە درێژەکەیەوە لە دووانەکەی دی زیاتر دەترسا، بەر لە هەموویان گووتی «نا ڕێنوار بەگ، نا. ڕاستە فەرمانەکە مەترسی خۆی هەیە، بەلام من بە خۆشحاڵییەوە ئامێز بۆ جۆرە ترسی وەها دەکەمەوە». وای گووت و دوودڵییەکی شاردراوە لە چاویدا دەبریسکایەوە.

لە نیوەڕۆدا دیلەکان یەکەیەکە گەیشتن، یەکەیەکە دەستیان بە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆیان کرد. میرئەودال یەکێک بوو لەوانەی هەڵبژێردرابوو چیرۆکی خۆی بۆ نیگارکێشان وەسفبکات، تاکە کەسێک بوو لە زیندانییەکان کە بە زنجیرەوە هێنابوویان، پۆلیسەکان گووتیان خۆی پێداگرییکردوە لەسەر ئەوەی دەیەوێت چیرۆکی خەونەکەی بگێڕێتەوە، بەلام هەستدەکەم ویستبووی بێتەدەرێ، کەمێک هەوا بخوات و

ڕوناکی بەربکەوێت و شوێنێکی دی لە زیندانەکەدا ببینێت. بینینەوەی میر خۆشحاڵیکردم، لە ڕاستیدا هەستم بە گوناهێکی گەورە دەکرد بەرامبەری، وابیرمدەکردەوە کە ئەوە ئێمە بووین نەمانتوانی هیچ کۆمەکێکی ڕاستەقینە پێشکەش بەم پیاوە بکەین کە لە دەست خولیا و مۆتەکێکی ئازاربەخش دەناڵێنێت. لە جاران ڕەنگ زەردتر و غەمگینتر دیاربوو. دەستێک بیجامەی سووری لە بەردابوو، کە لەگەڵ زلی و کەتەیی خۆیدا هێشتا بە بەری گەورەبوو. یەکەم جار بوو لە ژیانمدا مرۆڤێک ببینم لە بیجامەی سوور و زنجیردا. قژی بە جۆرێک کە هەستمکرد شێوازێکی تایبەتی شێتان بێت کەوتبووە سەر چاوی. هەر هات و دانیشت، بێئەوەی کەس هیچی لێ بپرسێت گووتی «کێشە خەونەکە نییە، بەڵکو ئەوەیە لە بێداریشدا وازم لێناهێنێت». زۆر قسەیکرد، چەندجار خەونەکەی وەک خۆی گێڕایەوە، کە قسەیدەکرد زوو زوو سەیری منی دەکرد، وەک بپرسێت «ئەها... تەرەس، تۆ چی دەکەیت لێرە». زۆر باسی هەستە سارد و غەمگینەکانی خۆی کرد، ئەوە ئازاری دەدا کە بێدەسەڵاتە و دەستی بە هیچ شتێکدا ناگات تۆڵەی بەدبەختی خۆی پێ بکاتەوە، خۆی گەلەک بە کەساس و بەشخوراو دەبینی، وەک مرۆڤێک زوڵمێکی گەورەی لێکرابێت و زاڵمەکەی هێشتا ئازاد و بێسزا بێت. گووتی بەردەوام هەستدەکات ئەو پیاوە یان کەسانێکی تری وەک ئەو بەدوایەوەن، ترسێکی هەیە کە ئەگەر غافڵ بێت ئامبازی دەبن و سەری دەبڕن. شێوەی قسەکردن و سەیرکردنی، شڵەژانێکی قووڵی دەروونی تیا دەبینرا... چاوانی چیتر لە چاوانی پیاوە نەجیبزادەکەی جاران نەدەچوو، بەڵکو لە شێتێک دەچوو، وەسواسێکی دەروونی بیخوات. من لە ئازاری میر تێدەگەیشتم. بە بڕوای من، مرۆڤ گەر هەمیشە عاقڵ یان هەمیشە شێت بایە هەردووکیان جۆرێک بوون لە بەختەوەریی، بەڵام بەشی هەرە زۆری مرۆڤەکان، ماوەیەک شێت و ماوەیەک عاقڵن، ئەوەش ئازار و ئەشکەنجەیەکی قووڵ دروستدەکات. میر ئەوداڵیش ئەو ساتانە

کە تووشی ڕابوونێکی کتوپڕی عەقڵ دەهات و خەونەکەی لە بیردەکرد، دەیبینی بەرامبەر بە ڕۆحی خۆی بێدەسەڵاتە و ئازاری دەچەشت. دواجار بەر لەوەی هەستێت و بیبەنە دەرەوە ڕوویکردە من و گووتی «بە جەنابی عەقید بابەتاهیر بڵێ بەرمبدات، بە دکتۆر سیامەند بڵێ کارێک بکات بێمەدەری، گرتنی من سوودی نییە. دەمەوێت تاقمێک دروستبکەم، گەشتێک بە سەر زەویدا دەست پێبکەین، هەموو دونیا و هەموو وڵاتانی سەر زەوی بگەڕێین تا ئەو کەسە دەدۆزینەوە و دەیکوژین». من لەگەڵ پاسەوانەکەدا دەستیم گرت و گووتم «جەنابی میر، تکایە... تکایە، تا دەتوانیت ئارام بە، خەونەکە و حەقیقەت تێکەڵ مەکە. باوەڕناکەم ئەوەی لە خەونەکەدا دەیبینن کەسێکی ڕاستەقینە بێت، هەوڵبدە خەیاڵەکەی لەسەری خۆتدا بکوژیت و بیری لێ نەکەیتەوە». گووتی «وامنیش بیرم لێ نەکردەوە، وا منیش توانیم لە خەون و خەیاڵی خۆم دەریبکەم، ئەی چی لەو هەموو خەڵکەی تر دەکەیت؟ ... چی لە هەموو دیلاوار دەکەیت؟ . عەزیزم ئەوە چاری نییە، نەیگریت و بە دەستی خۆت نەیکوژیت، چاری نییە». هەر دەمودەست لەویادا هەستمکرد، داواکەم لە جەنابی میرئەودال پوچ و بێ مانایە، چونکە ئەوەتا خۆم وەک هەموو ئەوانی دی لە ناو جەرگەی ماشێنێکی گەورەدام کە ئیشمان ئەوەیە، خەونەکە لە حەقیقەت نزیک بکەینەوە.

پرس و گفتوگۆی نێوان نیگارکێشەکان و زیندانییەکان چەندین سەعاتی خایەند. من بە ئیشێکی گونجاوم نەزانی بەشدارییەک لەو قسانەدا بکەم. نیگارکێشان تەنیا پرسیاریان لە ڕوخساری ئەو مرۆڤە دەکرد. لە هەموو شتێکیان پرسی، لە ڕەنگی، لە چاوی، لە برۆی، لە درێژی، لە پانی، لە لاوازیی، لەڕیشی، لەسمێڵی و لە دەیان شتی تر. لە ڕاستیدا گەرچی لێکچوونێکی گشتی لە قسەکاندا هەبوو، بەڵام بەشی ئەوە نەبوو، مرۆڤ بڵێت هەموو دیلەکان یەک خەونی وەکو یەک و یەک فیگەری هاوشێوەیان بینیوە، هەستمکرد نیگارێک خەیاڵە و خەیاڵ هاتووە، وێنەیەک بە فەنتازیا

دروستکراوە و دیلەکان هەر یەک بەخشیوێتی بە ئەویدی، ئێستا هەندێکیان ئەو وێنەیە بە وردی و هەندێکیان تێکەڵ بە خەیالاتی تایبەت دەیگێڕنەوە. دڵنیانەبووم لەوەی ئاخۆ وێنەکان لە یەک دەچن، بەلام دڵنیابووم هەر سێکیان وێنەی سێ پیاوی لاوازی ئەسمەر و چاو غەمگین و قژ کورت و ریشهاتوو و چەناگە باریک دەکێشن.

لە نزیکی سەعات چواری ئێوارەدا نیگارکێشەکان هەر یەکەیان چوونە ژوورێک بۆ کێشانی روخساری ئەو پیاوەی لە خەونەکاندا دەردەکەوت، من پێش ئەوان بە خێرایی پۆلیسخانەم بەجێهێشت تا بگەڕێمەوە و فریای ئێشی ئێوارانم بکەوم.

# ١٢

ئـەو ڕۆژە کـەگەڕامـەوە بـۆ کۆمەکـی مامـە سـیام، بـەر دەرگای عیادەکـە، زۆر زیاتـر لـە ڕۆژان شـڵەژاو و پـڕ خەڵـک بـوو، زۆرینـەی نەخۆشــەکان کوڕ و کچی گەنـج بوون کە لەلایـەن دایک و بـاوک و خـزم و کەسـیانەوە قۆڵبەسـت هێنرابوون تـا تاکە پزیشـکەکەی دێلاوار بیانبینێت. بـەوەدا زۆربەی نەخۆشـەکان گەنجانی توندکار و هەڵچوو بوون، کە گرتن و ئارامکردنەوەیان ئاسـان نییـە، هـەر نەخۆشـێک و زیـاد لـە سـێ کـەس لەگەڵیـدا هاتبـوون، کـە هەندێـک لـەو هاودەمانـە لـە خـودی نەخۆشــەکان تووڕەتـر و شـپرزەتر دەیاننواند، بـە درێژایی مـاوەی کارکردنـم لـەم خانـەی دەروونـەدا، دەمبینی کە هاودەمی نەخۆشـەکان بیمارتر لـە خـودی نەخۆشـەکان دیـارن. جەنجاڵـی ئـەو ڕۆژە، زۆر کاریگـەر بـوو. بۆ یەکەمجـار هەسـتمکرد چیتـر ئـەم جێگا بچوکـە ئـەو هەمـوو نەخۆشـە ناگرێت، ئیتـر ئـەم دەروونخانەیـەش ڕۆژگاری بـەرەو کۆتایـی دەڕوات و سـەردەمی بەسـەر چـووە.

نەخۆشــەکان تـەواوی هۆڵـی چاوەڕوانییەکەیـان پڕکردبـوو، لـە دەرەوە لەسـەر پلەکەکان کۆبووبوونەوە ، هەندێ کە نەیانتوانی بوو خۆیان بپەسـتێننە ژووریێ، لە بەردەرگای بیناکە و لەسـەر شـەقامە گشـتییەکە کۆمەڵ بووبوون. مـن بەزەحمـەت و دوای پاڵەپەسـتۆیەکی زۆر گەیشـتمە بـەردەم مامـم کـە هـەم خـۆی ژمـارەی بـە نەخۆشـەکان دەدا و هـەم خۆیشـی پشـکنینی بـۆ دەکـردن.

کە منی بینی بە نیگەرانییەوە گووتی «برازا گیان، دەبینیت شتەکان لە دەسەلات دەرچوون. گەر وا بڕوات دەبێت لە کۆتایی ئەم هەفتەیەدا دەرگای عیادەکە دابخەین. تکایە پێیان بڵێ بڕۆن و کاتێکی تر وەرنەوە. من گەر مانگێکیش لێرە دانیشم و نەخۆش ببینم هەر فریاناکەوم». هەڵبەت قسەی وا بێسوود بوو، خەڵکانێکی زۆر دەهاتنە ئێرە، چونکە پەناگا و شوێنی تریان نەبوو ڕووی تێبکەن. من گووتم «بەمجۆرە بڕوات، تەواوی دێلاوار دەڕژێت بە سەرماندا». مامم بە غەمگینییەوە سەیریکردم و گووتی «ڕاستدەکەیت، بێئەوەی هیچ عیلاجێکمان پێبێت». منیش بە نائومێدییەوە سەیرمکرد و گووتم « ڕاستە. ئاخر عیلاجی چیمان پێبێت و بۆ چەند کەس؟».

ئەوەی لە هەندێ لە نەخۆشەکانی ئەو ڕۆژە سەرنجمدا، ئەوەبوو خەونەکەیان نەدیبوو، بەلام ترسێکی ناوەکیان هەست پێکردبوو، تووشی فۆبیایەکی کتوپڕ بووبوون، هەندێکیان بێ هیچ هۆ و بەهانایەکی ڕۆشن، ترسێکی گەورەیان هەست پێکردبوو، خواستێکیان لادروست بووبوو خۆیان بشارنەوە، تووشی وەسواس و کینگلی ئەوە بووبوون کە چاوێکی نهێنی بەدوایانەوەیە، هەندێکیان تووشی هەڵچوونی هیستیریی بووبوون و کەوتبوونە پەلاماردانی هەر کەسێک و هەر شتێکی نزیک لە خۆیان. مامە سیام گووتی «ترسەکە شتێکە لە ناخی خەڵکی دێلاواردا هەیە، پێویستی بە هیچ بەهانەیەک نییە بۆ ئەوەی زیندووببێتەوە. زۆربەی نەخۆشەکان هەستدەکەن کارەساتێک بەڕێوەیە، شتێک وەک بومەلەرزە یان تۆفان یان چەشنێک لە تاعونی ڕەش کە لەزەمانی زوودا بووە، زۆربەی نەخۆشەکان قسە لەو جۆرە ترسە دەکەن، پێشیان وایە نەفرەتێک، دۆعایەکی خراپ لە شارەکە کراوە. هەر کەسێک بێتو ڕقی لە یەکێک بێت، ئەو بە تاوانبار دەزانێت، ئەمڕۆ نەخۆشێکم هەبوو، خوشکە بچوکەکەی خۆی، کە تەمەنی شەشە ساڵە بە مایەی هەموو نەگبەتی شارەکە دەزانی ». لە کاتێکدا لە

جلە پزیشکییە سپییەکانیدا تەواو نیگەران و بێچارە دەردەکەوت، پێیگووتم «سبەی بچۆ بۆ لای پرۆفیسۆر بەهنام، لە مۆزەخانەی گشتی، هەستدەکەم من و تۆ هەردووکمان زانیاریمان لەسەر مێژووی ئەم شارە نییە. لە ڕاستیدا هیچ کات هەستم نەکردوە پێویستیم بەوە بێت، کە دەبێت شتێک لەسەر مێژووی ئەم شارە بزانم. دیلاوار چییە و مێژووی چییە. مرۆڤ هەر دەیخوێنێتەوە باشترە مێژووی فەرەنسا یان ڕوس، یاخود چین بخوێنێتەوە. مێژووی دیلاوار ... مێژووی دیلاوار. بەردەوام باسی ئەوە دەکەن، دەمەوێت بزانم پرۆفیسۆر بەهنام دەڵێت چی».

مامم بەردەوام بە دەست کەمی زانیارییەکانی خۆیەوە دەیناڵاند، هەندێ جار دەستی دەگرت بە سەرییەوە و دەیگووت «سەرم وەک بیابانی لێ هاتووە، سەرم بووە بەسەحرای لووت، تەیر هیلانەی تێدا ناکات». کە دەیزانی پێویستی بە زانیاری زۆرترە و دەبێت کاتێکی زیاتر بۆ خوێندنەوە دابنێت وەڕز دەبوو، دەیگووت «خوای گەورە، ڕێنوار من کەی لە عومری خوێندنەوەدا ماوم، هاوڕێکانم ئێستا ئەندامی جەمعییەتی شاهانەن لە بریتانیا، خەڵک لەم تەمەنەی مندا دادەنیشن و توتی فێری حیکایەت دەکەن یان بەسواری ئەسپ و لەگەڵ تاژی ڕەسەندا دەچن بۆ ڕاوە کەروێشک، هەر هیچ نەبێت لەماڵ ڕۆبێک لەبەردەکەن و لە باغچەکەیاندا ڕۆژنامە دەخوێننەوە ... وای چۆن ژیانی خۆم بەهەدەر دا». من خەندەیەکم دەگرت و نەمدەزانی بڵێم چی. جارێک گووتی «ئەم ئیشەی ئێمە، پێویستی بەوەیە، مرۆڤ لەسەر هەموو شت زانیاری هەبێت، کێشەی دەروون ئەوەیە کە لە هەموو شتێکدا خۆی قووتدەکاتەوە... لە هەموو شتێکدا. ئینسان دەبێت لە جۆری دار و درەختەوە بیپشکنێت تا دەگاتە جەشنی جانەوەر و مار و مێروو، دەروون هەموو شتی دونیای تێدایە».

ئەو شەوە زۆر درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵێ. نزیکی سەعات هەشت جگە

لە دوو سێ نەخۆش کە سووربوون تا کۆتایی بمیننەوە، دەروونخانەکە تەواو خاڵی بوو، بۆ عارەقی نەخۆش و میوانان هێشتا لە ژوورەکەدا بوو، هەوای پانکە کۆن و ژەنگاوییەکە ئەو بۆنەی بە توندی گێژدەدا و بەخێرایی دەیکرد بە کەپووی مندا. منیش و مامم وەک هەر ئێستا لە گەرماوێکی تورکی هاتبینەدەر تک تک عارەق لە گیانمان دەچۆڕا. دوای ڕەوانەکردنی دوا کەس و داخستنی دەرگای عیادەکە، مامم دەستکێشە سپییەکانی داکەند و لە جانتاکەی نەخشەیەکی گەورەی دەرهێنا و گووتی «جەنابی فەرماندار و ئەندامانی کۆنفیدراسیۆن لەسەر کردنەوەی یەکەم شێتخانە ڕازیبوون، ئەمە یەکەم جارە دیلاوار دان بەبوونی شێتەکانی خۆیدا دەنێت». بەدەستەسرێکی سپی عارەقەکەی سڕی و گووتی «هەڵبەت ئێمە ناوی نانێین شێتخانە، وشەیەکی وەها کاریگەرییەکی خراپی لەسەر باری دەروونی نەخۆشەکان و کەسوکاریان دەبێت، ناوی دەنێین سەنتەری تەندورستی دەروونی». من سەیرێکی نەخشەکەم کرد و پرسیم «بەڵام ئەوە چییە؟». زەردەخەیەکی مەکربازانەی گرت و چاوێکی نەرم داگرت و گووتی «ها .. لە مامی خۆت مەترسە. من لەگەڵ دەرچوونی بڕیارەکەدا، پارچەیەک زەویم لە بەڕێوەبەری شارەوانی سەند، ها .. دەزانی بەڕێوەبەری شارەوانی ناوی چییە، ناوی هاردییانییە. بەڵێ وادەزانم ناوی بنەماڵەکەیان هاردیانییە، سەر بە ئێلاتی هاردیانن ». من بەسەرسامییەوە پرسیم «پارچە زەوی بۆ چی؟». گووتی «هەڵبەت نامەوێت دیلاوار جارێکی تر بێ شێتخانە بێت. شارەکە گەورە بووە، پێویستی بە سەنتەرێکی دەروونی گەورە هەیە، لەسەر ئەو پارچە زەوییە شێتخانەیەکی گەورە دروستدەکەین، تا ئێستا دیلاوار بە زیندانەکانی ناسراوە، لەمڕۆ بە دواوە دەبێت بە شێتخانەکانیشیدا بناسرێتەوە. هەموو ئەم بەیانییە لەگەڵ ئەندازیار مستەفا باسیلیدا خەریک کێشانی نەخشەیەکی سەرەتایی بووین بۆ شێتخانەکە، لێرە پێویستیمان بە شێتخانەی زۆرە ... یان نازانم ڕەنگە دواجار پێویستیمان بە هیچ نەبێت، تەنیا بگەڕێین و گەر

چەند عاقڵێک هەبن لە ناوەڕاستی شاردا لە سێدارەیان بدەین و خۆمان ڕزگاربکەین». من پێکەنیم و گووتم «چی؟ ها؟ گەر بە تەمای ئەوە بین شێتخانەیەک لە بنەوەڕا دروستبکەین، چەند ساڵی دەوێت تا تەواو دەبێت، ساڵێک؟ دووان؟ دە؟ . ها بەس خوا خۆی دەزانێت پرۆژەیەکی وا کەی دەست پێدەکات و کەی تەواو دەبێت». مامە سیام سەرێکی لەقاند و گووتی «بیرمان لەوە کردۆتەوە، هەر دەمانەوێت کات بە فیڕۆ نەچێت، تۆزێک خێرایی بهێنینە مێژووی شارەکەوە، تۆزێک خێرایی. لە ئێستادا شێتخانەکە لە دیلاواری خۆرئاوا، لە جێگەی زیندانە کۆنەکەی ماڵی شوکور ئاغا کە چەندین ساڵە چۆڵە دەکرێتەوە. ئەوە دەکەینە بنکەیەکی کاتی. تۆ پێم بڵێ کەس دەناسیت؟ من پێویستم بە سەرکارێکی وریایە بتوانێت بە خێرایی ئەو جێگایەمان بۆ پاکبکاتەوە و بەپێی پلانێکی باش تەخت و جێخەو و کەلوپەلی پێویست بخاتە ژوورەکان... کەس دەناسێت، یەکێکی باش کاروباری وا ڕاپەڕێنێت؟ یان لێگەڕێ، سیڤەری کوڕی مامە شەهاب لە تۆ باشترە، ئەو سەری زیاتر لەو جۆرە ئیشانەدایە... نا، نا، نا.. تۆ هیچ مەکە، تۆ بەس بەیانی بچۆ بۆ لای پرۆفیسۆر بەهنام، خۆم قسەم لەگەڵ کردوە، دوێنێ شەو تەلەفونم بۆ کرد و گووتم برازاکەم دەنێرمە خزمەتتان. ئاه، بەڵام لە دوێنێوە تەنیا لە بیری ئەوەدام کە زوو ئەم عیادەیە دابخەین و سەنتەرێکی دەروونی گەورە بکەینەوە. من دوێنێ لەگەڵ ڕاوێژکاری باڵای کاروباری تەندروستی قسەمکرد، خۆی هاوڕێیەکی نزیکی وەزیری تەندروستییە. ئەو تەواوی مەسرەفی جێگاکە دەخاتە ئەستۆی وەزارەت. دەبێت سوپاسی خودا بکەین کە جێگایەکی وا لە شوێنێکی دواکەوتووی وەک دیلاواردا هەیە. من هەموو شتێکم بۆ جەنابی ڕاوێژکار ڕوونکردەوە. هەستمکرد هەست بە شانازی دەکات دیلاوار لە پاڵ زیندانە گەورەکاندا، کۆمەڵێک شێتخانەی گەورەشی تێدا بێت، دەیگووت دەبێت بە یەکێک لە نیشانەکانی گەشە و پێشکەوتن ... نازانم، کێ چوزانێت،

ڕەنگە لەسەر هەقیش بێت». مامە سیام لەگەڵ ماندووبوونی زۆری ئەو ڕۆژەدا ئارەزوویەکی باشی هەبوو بەردەوام قسەبکات. گووتی «ڕێنوار، من زۆر بیر لە تۆ دەکەمەوە. گەر عیادەکە دابخەین تۆ بکەم بە چی؟ وەزیفەیەکت بدەمێ؟ . نازانم هیچ ئارەزوویەکت هەیە ببیت بۆ شێتخانەکە، حەزدەکەیت لەوێش لەگەڵمدا ئیشبکەیت؟ من زۆر پێویستم بە تۆیە». من هیچم نەگووت، لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بڵێم، گووتم «پرسیاری من ئەوەیە، ئەم شێتخانەیە گەر بکرێتەوە، چەند شێت لە خۆی دەگرێت ... لێت ناشارمەوە، من ترسێک دایگرتووم، لە هەموو شتێک دەترسم، بەڵام بە تایبەت لەم شێتخانەیە زۆر دەترسم». مامە سیام پیاوێکی زیرەک بوو خۆی دەیزانی من ترسێکی گەورەم لەوە هەیە لە شێتخانەکە ناڕاستەوخۆ ببین بە جەلادێکی بێڕەحم کە ئیشمان تەنیا بەستنەوە و ئازاردانی خەڵک بێت. مامم بە گومانێکی کەمێک چەپەڵەوە سەیریکردم و گووتی « ڕێنوار دانیشە، دانیشە بەرلەوەی بڕۆم دەبێت هەندێ شتی ترت بۆ ڕوونبکەمەوە، تۆ تا ئێستا گەنجێکی بەرزبینی. چی پێدەڵێن؟ ئا ... ئایدیالیست... بەڵێ ئایدیالیستیت. خۆت دەزانیت گەنجێکی ئایدیالیست واتای چی؟ دەزانیت؟ دە زۆر باشە». هەندێ جار زۆر ڕقم لە قسەی مامم دەبوو، بەڵام هەندێ جار بە پێچەوانەوە. ئەم شەو لەو شەوانە بوو کە دڵنیابووم قسەی گرنگ و تایبەت دەکات. گووتی «بەڵێ. ڕێنوار گوێبگرە ئەم شتانەی پێت دەڵێم زۆر گرنگن و دەبێت تەنیا بۆ خۆتیان هەڵبگریت. هەندێ شت هەیە مرۆڤ نابێت بۆ هیچ کەسی بدرکێنێت، هەتا عەزیزترین کەسیش، بەڵام من زۆر جار خولیایەکی خراپ دەمگرێت، چی لە دەروونمدایە هەڵیڕێژم. من نزیکی دەساڵە ئەم عیادەیەم داناوە، بەڵام ڕاستت دەوێت بە دەگمەن توانیومە نەخۆشێک چاکبکەمەوە. من دکتۆرێکی سەرکەوتوو نیم. بەشی ئەوە خۆم دەناسم و دەزانم کە دکتۆرێکی سەرکەوتوو نیم. فاشیلم... خۆزیا دەبووم بە شاعیر، بەڵام تازە درەنگە، زۆر درەنگە. مامی خۆت لە

گەنجیدا شیعریشی نوسیوە. بەڵام ئێستا ئەوانە بەسەرچوون، ئێستا تەنیا ئاواتم ئەوەیە بتوانم یەک جار نەخۆشێک بە تەواوەتی چاک بکەمەوە. بەلام ئەوەی ناتوانم نەخۆشەکانم چاکبکەم، هەمووی گوناهی من نییە. نا مەلی مامە سیام دەیەویت وەک پشیلە عەیبەکانی خۆی بکات بە ژێر خۆلەوە. من نە بلیمەتم، نە هیچم. گەمژەکان لە تایەفەی زەریاواریدا کە هیچ شتێک نازانن، پێیان وایە من بلیمەتم، من زانایەکی گەورەم. باوکت وادەزانێت من هیچم لە ئەنشتاین کەمتر نییە، بەلام دلنیام تۆ کەسێکی عاقلیت و فریوی ئەو قسانە ناخۆیت... من پیاوێکی فاشیلم، کەسیش لە پیاوێکی زیرەک ترسناکتر نییە کە دەزانێت فاشیلە و وەک منیش دەتوانێت خۆی بشارێتەوە، خۆی وادەربخات کە دەتوانێت شتی گەورە بکات. ئەوە لای هیچ کەس مەدرکێنە، ئەوە نهێنی منە، نهێنی مامە سیاتە. من دەمەوێت ڕاست و دروست پەروەردە بیت و چاوت بکەیتەوە تا بزانیت لە کوێ دەژیت. نەخۆشی دەروون وەک نەخۆشی جەستە نییە، لە جەستەدا دکتۆر دەزانێت نەخۆشەکەی کوێی دێشێت و چ پشکنینێکی پێویستە و دەبێت چ دەرمانێکی بداتێ. بەلام دەروون چییە... کوێیە؟ لە ئیشەکەی ئێمەدا، چاککردنەوەی نەخۆش پێویستی بەوەیە قوول چنگ بخەیتە ناو ڕۆحی نەخۆشەکانتەوە، دەست بخەیتە ناو ژیان و نهێنییەکانیانەوە، بەلام لە جێگایەکی وەک دیلاوار کاری وا ئەستەمە. ئینسانەکان دەروونیان قفلێکی گەورەی لەسەرە. من نە باوەڕم بە بوونی مرۆڤی ئاسایی، نە باوەڕم بە بوونی مرۆڤی شێت هەیە. بەلام باوەڕم بە تاریکی و ڕوناکی ناخ هەیە. مرۆڤی تاریک ئەوانەن کە ناخیان نابینرێت، وەک شەوەزەنگێکی ڕەشە، وەک بنکی دەریایەکی قوول و تاریکە کە هیچ کەس نازانێت چی تێدا خەوتووە. مرۆڤ لە دێلاوار، بوونەوەرێکی تاریکە، هیچ کەس نازانێت لەو دەریا تاریک و ترسناکەی ژێرەوەیدا چی خەوتووە و چ جانەوەرێک خۆی حەشارداوە». وەستا و کەمێک بیریکردەوە و گووتی «بەلێ ...

تاریکە. زۆر تاریکە. ئەم جانەوەرانەی ناو تاریکی زۆربەی کات خەوتوون، بەڵام ڕۆژێکیش دێت کە وریادەبنەوە، جانەوەری زیرەکن، دەتوانن لە هەموو شتێکی مرۆڤ سوود وەربگرن، لە خەیاڵەکانی، لە خەونەکانی، لە فەلسەفەکانی، هەتا لە باشییەکانی مرۆڤیش، لە عەشقی، لە ئومێدی، لە ئاواتە پاکەکانی... لە زانستەکانیشی. کە ئەم جانەوەرانە بەربوون تەنیا دوو ڕێگامان لە بەردەمدایە بۆئەوەی بیانوەستێنین». وەستا و قووڵ سەیری چاوی کردم، وەک ئەوەی بیەوێت جانەوەرەکانی ناو ناخی منیش ببینێت، بە هێمنییەکی ترسناک دووبارەیکردەوە «تەنیا دوو ڕێگا ... تەنیا دوو ڕێگا، کە هەردووکیان وەک یەک بەرەو وێرانی دەڕۆن». ماوەیەکی کەم بێدەنگ بوو، وەک نەیەوێت درێژە بە قسەکانی بدات یاخود هەستبکات خەریکە شتێک دەدرکێنێت کە نابێت بیدرکێنێت، گووتی «نامەوێت گەنجێکی ئایدیالیست بیت. سەری خۆت پڕبکەیت لە تروهاتی مرۆڤدۆستانە. دەبێت ئەوە بکەیت کە پێویستە. ئەوە بکەیت کە ڕزگارتدەکات. شتێک مەکە جیاواز دەربکەویت، لە شارێکی شێتی وەک دیلاواردا عەقڵ مرۆڤ شێتدەکات». من بە هێمنی پرسیم «ئەو دوو ڕێگایە چیین؟». دوای هەناسەیەک و ئێستێک گووتی «یەکێکیان ئەوەیە شتێک بدۆزینەوە، مرۆڤەکان بتوانن بۆی بژین و بۆی بمرن، بتوانن پەلاماری بدەن و جانەوەرەکەی خۆیانی تێبەربدەن. ئەویتریشیان ئەوەیە بیانگرین، بیانخەینە زیندانەکان و شێتخانەکان، لەوێش ناتوانین زۆر نەرم بین، ناتوانین پاسەوانی نەخۆشمان نەبێت، ناتوانین سزای قورس دانەنێین. دەبێت پاسەوانەکان و پزیشکەکان و هاوکارەکانیان بە هەمان شێوەی دیلەکان و شێتەکان، تاوانبار و نەخۆش بن تا بتوانن شێتخانەیەک ببەن بەڕێوە».

موچڕکێکی سارد بە هەموو لەشمدا هات. نەمدەزانی بڵێم چی. مامم وەک بیەوێت زیاتر بمترسێنێت، سەیری ناو چاوی کردم و بە دەنگێکی بێسۆز گووتی «ئەوە ڕاستییەکەیەتی. تا لەم دەروونخانە بچوکەداین

دەتوانین هێمن بین، نەخۆشەکانمان کەس و کاری خۆیان لەگەڵدایە کە دەیانبەستنەوە، بەڵام لە شێتخانە دەبێت هەمیشە زنجیرێک و قامچییەکت بە دەستەوە بێت، ئەوە تەنیا ڕێگایە، ئەوە تەنیا شێوەیە». من هاوارمکرد «بۆ؟ بۆ دەبێت وابێت؟ چ پێویستدەکات وابێت؟». گووتی «لە بەرئەوەی دکتۆرێک یان دە دکتۆر کە خۆیان شێتن، ناتوانن شارێک دەرمانبکەن کە هەموویان شێتن».

وایگووت و بەجۆرێک دەستی ڕاوەشاند، وەک بڵێت ئیتر بەسە، با لێرەدا هەموو شتێک کۆتایی بێت. جوڵەی دەستی توندییەکی شاردراوەی تێدا بوو کە لە مانا و ناوەڕۆکی وشەکانی تاریکتر و ڕەقتر بوو.

## خەونێك لە دەفتەری خەونەکانەوە

شەو ساردبوو کە چوومە دەرێ، هیچ کات شەوی هاوین وا سارد نەبووە، نەمدیوە هەوای شەوی هاوین وەک هەوای زەمهەریر بێت. هەستمدەکرد تەمێکی ترسناکم لێ دەئاڵێت، تەمێک ئازارم دەدات، بۆنێکی تیژی ئەو گەڵا و درەختانە چوون بە سەرمدا کە پێشتر لە کاتی وریایمدا بۆنیان نەبوو. شتێک بۆنی نهێنی درەختەکانی دادەگیرساند، وەک مانگ کە بە جۆرێکی سامناک و ترسێنەر ڕوناکی خۆی لەسەر سەرم داگیرساندبوو. سەیری دەستی خۆم کرد وەک یەکێک هێمایەکی تایبەتی لەسەر کێشابێت، وەک شەیتانێک پیتەکانی کتێبێکی پیرۆزی پێچەوانە لەسەر دەستم نوسیبێت. زەخرەفەی پیتەکان بەجۆرێک تێکەڵاو و پێچ خواردوبوون، بە ئەژدیها دەچوون. شەو ساردبوو، من باڵندەی زۆرم دەبینی، باڵندەکان هێندە ڕوناک بوون، وەک ئەوەی ڕۆژ بێت. شەو ساردبوو، من تاریکی زۆرم نەدەبینی، وەک ئەوەی بۆ تاریکی بگەڕێم، دەستم بە زوڵمەتێکدا دەگێڕا کە

زولمەت نەبوو. لە ناکاو دەنگێک بانگمدەکات ڕێنواری زەریاواری. ڕێنواری زەریاواری. ڕێنواری زەریاواری. بە پێداگرییەکی زۆرەوە بانگمدەکات... وەک ئەوەی بەو بانگکردنە بیەوێت بمکوژێت، بەجۆرێک دان بە پیتەکانی ناوەکەمدا دەنێت وەک بیەوێت خوێنم لێبهێنێت. تا ئەو بانگمبکات، من زیاتر ئازارم دەبێت، ئازارێک نازانم لە کوێوە دێت، نازانم چ جۆرە ئازارێکە. نازانم ئەو دەنگە لە کوێوە دێت، بەڵام دەزانم نزیکە لێمەوە، هێندە نزیک کە دەبێت ناو سەری خۆمی بۆ بگەڕێم. لە ناکاو شەقامی درێژ دەبینم، ئەستێرە دەبینم کە ڕوناکیان لە ڕوناکی هەموو ئەستێرەیەک گەورەترە، پیاوانی ترسناک دەبینم کە تەنیا سێبەرە درێژەکانیان بە شەقامەکاندا دەڕوات و خۆیان دیار نین. لە ناکاو وەک لە جەنگەڵدا بم، هەزاران ئادەمیزادی ڕووت دەبینم کە هەموو لە نەخۆش دەچن، پێدەچێت هەموو بیمارییەکی نادیاریان گرتبێت، هەموو بە زنجیر بە درەختەکانەوە بەستراونەتەوە، بەردەوام ئەو جەنگەڵە گەورە دەبێت و بەردەوامیش ئەو پۆلە باڵندەیەی لەسەر ئەو جەنگەڵە دەسوڕێتەوە گەورەدەبێت و بەردەوام ژمارەی مرۆڤە خەستەکان کە جەنگەڵ دیلیکردون زۆرتر دەبێت. هەندێ شت بەسەر شەقامەکاندا تلدەبێتەوە کە لە کاتژمێری گەورە دەچن، بەڵام کاتژمێر نییە، قاڵبێکە ڕوخساری کەسانێکی لەسەرە کە چاویان نوقاوە، ڕوخساری کەسانێکە پێدەچێت خەوتبن یان مردبن. بەسەر ئەو ڕێگایەدا ڕادەکەم و وا هەستدەکەم ئەوە باڵندەکانە بانگمدەکەن. بەڵام دەنگێکی گەورەیە، دەنگێکی بریندار و ترساوە، هاواردەکات «ڕزگارم کە ... ڕزگارم کە». سەیری چواردەوری خۆم دەکەم و هیچ کەس نابینم ڕزگاریبکەم... بەڵام دەنگێکی بریندارە کە وەک ژەهر دەچێتە خوێنمەوە. دەمەوێت بڕۆم و ناتوانم، دەمەوێت بگەڕێمەوە ناتوانم، خەونەکە توند دەمگرێت، نە دەتوانێت بمبات بۆ پێشەوە و نە دەتوانێت بمگێڕێتەوە بۆ دواوە. دەزانم گەر بە ئاگانەیەمەوە دەخنکێم...

# ١٣

پرۆفیسۆر بەهنام، پیاوێکی لاواز و بچکۆلەیە، ڕیشێکی سپی درێژی هەیە، وەک زۆر لە پرۆفیسۆرەکان چاویلکەی لە چاودایە، وەک ئەوان کتێبێکی توند ناوە بەسنگییەوە. بەڵام جیاواز لە پرۆفیسۆرەکان خەندەیەکی پیرانەی شیرین لەسەر لێوێتی، هەر کاتێک دەتبینێت وەک ئەوەیە وەچەیەکی خۆی بینیبێت کە خۆشیدەوێت، خەندەکەی جوانییەکی تایبەتی بەخشیوەتە دەموچاوە باریک و ئێسکن و چرچەکەی، ناوچاوانێکی بەرزی هەیە لەگەڵ قژێکی سپی چڕ، جەستەی بە جۆرێکی بەرچاو بێجورم و پوکاوەیە، بەڵام ئەو خەندەیە ڕوخسارێکی داوەتێ کە سەیریدەکەیت وادەزانیت پیاوێکی زۆر بەهێزە، کە سەیریدەکەیت جگە لە ڕوویەکی خۆش هیچی تر نابینیت. من لەو هەیکەل و قیافەتە شیرینەدا پرۆفیسۆرم بینی. لەگەڵ سێ ژنی وەک خۆی پیردا لە ناوەڕاستی کتێبخانەی گەورەی مۆزەکەدا وەستابوو، بە دەستێکی کتێبێکی گەورەی نابوو بە سنگییەوە، بە دەستەکەی دیکەشی یاری بە چاویلکەکەی دەکرد. ژنەکان هاتبوون ئیشی ڕۆژانەی خۆیان بکەن. کە منی بینی بەو خەندە گەشەوە بەرەو ڕووم هات و گووتی «قسە مەکە بزانم ناوەکەتم لە یاد ماوە؟ مامە سیامەندت لە هاوڕێ نزیکەکانمە... هاوڕێ نا، هاوڕێ دروست نییە، من زۆر لەو بەتەمەنترم، هەندێ جار هەستدەکەم هێندە پیرم کە ناشێت باسی هاوڕێتی بکەم، زریڤار، تۆ

ناوت زریڤارە کوڕی سەعیدی زەریاواریت، باوکت بازرگانێکی ناسراوە».
من پێکەنیم و ناوەکەم بۆ راستکردەوە. بە هەمان خەندەی شیرینەوە گووتی «ناو گرنگە. ناو دەبێت وەک خۆی بنوسرێت و بخوێنرێتەوە، بۆ ئەمانەتی مێژوویی. بۆئەوەی مرۆڤ بە هەڵەدا نەچێت و شتەکان وەک خۆیان بنوسرێنەوە ناو گرنگە. بمانبورە، کاک ڕێنوار نازانم پێشتر هاتویتە مۆزەخانەکەمان، پێشتر سەردانت کردوین؟». من بە شەرمێکەوە دەڵێم «نەخێر ئەمە یەکەمین جارە رێگام دەکەوێتە مۆزەخانەکەی بەڕێزتان».
بۆئەوەی هێمنمبکاتەوە دەڵێت «ئاساییە، ئاساییە.... هەر تۆ نیت، چەندین ساڵە میوانەکانمان تەواو کەم بوونەتەوە، لە مانگدا لە چەند کەسێک تێناپەڕێت، خەڵکێکی زۆر دوژمنایەتیماندەکەن، بەڵام ئێمە ئیشی خۆمان دەکەین، وەک دەبینیت ئەم ژنانە هەموو ڕۆژێک تۆزی سەر کتێبەکان دەسڕن، پاکیاندەکەنەوە، بۆئەوەی هەمیشە ئامادەبن، جوانی کتێب لەوەدایە کە هەمیشە ئامادەیە یەکێک بیخوێنێتەوە، بە پێچەوانەی ئێمەی مرۆڤەوە کە ناهێڵین کەس بمانخوێنێتەوە. وەرە کوڕی خۆم، وەرە... بەشی هەرە زۆری ئەم کتێبانە هیچ کەس نەیخوێندونەتەوە، بەشی هەرە زۆری ئەم کتێبانە لێرە چاپکراون، هەندێکیشیان لە ولاتانی دیکەوە، بە هۆی پەیوەندیم بە نوسەران و پرۆفیسۆرانەوە داوامکردون، هەندێکیان بە پۆست لە دوورەوە گەیشتوون، هەندێکیشیان بە قاچاغ. بەڵام هەر چۆنێک بێت گرنگ نییە، دواجار کەس نایانخوێنێتەوە، کتێبەکان چاوەڕێدەکەن و چاوەڕێدەکەن، بەڵام کەس دەست نابات بیانخوێنێتەوە. هەستدەکەم ناخۆشترین جۆری چاوەڕوانی، چاوەڕوانی گەنجێک نییە بۆ خۆشەویستەکەی، چاوەڕوانی دایکێک نییە بۆ گەڕانەوەی کوڕەکەی، بەڵکو چاوەڕوانی کتێبێکە بۆ خوێنەر. هەندێک لە کتێبەکانی من دەمێ ساڵە چاوەڕوانن. هەندێ جار خۆم کتێبێک یان دووان هەڵدەگرم و دەیانخەمە بندەستم و دەیانبەمەوە بۆ ماڵەوە، دەمەوێت کتێبەکان دونیا ببینن، بێنە دەرێ، بکرێنەوە و حەرفەکان هەتاو

لێیان بدات. من وادەکەم، جار جار کتێبەکان دەبەمە دەرێ و دەیانکەمەوە تا خۆر لە لاپەڕەکانیان بدات، تا هەوا هەڵمژن، تا لەم کتێبخانەیەدا نەخنکێن». دەنگێکی خۆشی هەیە، دەنگی پیرێکی بە توانایە کە هێشتا ژیان بە هەموو توانایەوە لە خوێنیدا دەجوڵێت. بە هێمنی دەستم دەگرێت، زۆر لە مێژە هیچ کەس بەم جۆرە دەستی نەگرتووم، دەڵێت «دەتەوێت لە کوێ دابنیشین، لێرە یان لە دەرەوە یاخود لە نوسینگەکەی خۆم کە لە هەموو جێگایەک هێمنترە. ئەوێ لە هەر شوێن باشترە، با بچین بۆ ئەوێ. بەڵێ باسی چیم دەکرد... ئا گیان. گوتم، خەڵک نایەن بۆ مۆزەخانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەکە دەبێت هەبێت، گەر مۆزەخانە نەبێت وەک ئەوە وایە مێژوو نەبووبێت، وەک ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ لەدایک بووبێتین، لە کاتێکدا مرۆڤ کۆنە، دیلاوار کۆنە، من کۆنم. من سەرنجم داوە، خەڵکی جیاوازییەکی زۆر لە نێوان سەردانی مۆزەخانە و سەردانی گۆڕستاندا ناکەن... یەکێک لە بەدبەختییەکانیش ئەوەیە کە من وەک دامەزرێنەر و بونیادنەری ئەم مۆزەخانەیە هیچ کات نەمتوانیوە بۆیان ڕوونبکەمەوە. ئینسان کە ژیانی وەک بەڕێوەبەرێکی مۆزەخانە بەسەربرد کاتێکی زۆری بۆ نامێنێتەوە قسە لەگەڵ هاودەم و هاوسەردمی خۆیدا بکات، ئەو کاتێک دەبینێت مێژوو لەلای خەڵک شتێکی بێنرخە، ئیدی ئێستاش لە پێش چاوی بێنرخ دەبێت، چونکە هەموو شتێک دواجار دەبێت بە مێژوو. بەداخەوە من پیاوێکی ئیماندار نیم، شتەکان نە دەچن بۆ بەهەشت و نە دەچن بۆ دۆزەخ، بەڵکو دەچنە مێژووەوە، ئەوە تاکە مەخزەنێکی ڕاستەقینەیە کە ئێمەی ئادەمیزاد هەمانە، لەوە زیاتر هیچ جێگایەکی ترمان نییە شتەکانی تێدا هەڵبگرین... هەڵبەت گەر بەهەشت و دۆزەخیش هەبێت، هیچ لەوە ناگۆڕێت، مرۆڤ دواجار ناتوانێت مێژووی خۆی یان شارەکەی لەگەڵ خۆی ببات بۆ بەهەشت یان دۆزەخ».

هەمیشە بەو خەندە شیرینەوە لە ژێر چاویلکەکەیەوە سەیریدەکردم.

دەیزانی من حەزم لە بیستن و بینینی قسە و خەندەکانیتی، تا بەردەم نوسینگەکەی خۆی بەردەوام قسەی بۆ کردم. گووتی «من خۆم ئەم مۆزەخانەیەم دروستکردوە، تەمەنم پازدە ساڵ بووە کە دەستم پێکردوە، لە پازدە ساڵیدا نەخشەکەم لەسەری خۆمدا کێشابوو، هەموو ئەم مۆزەخانە گەورەیە کە ئێستا تۆ دەیبینیت لە پازدە ساڵیدا بە تەواوی، بەم شێوەیە، بە هەموو ئەم دیکۆر و ڕێکخستن و ئەساسەوە لە خەیاڵمدا بووە، دوو هاوڕێ بووین، هەردووکمان پێکەوە ئەم خەیاڵە کەوتە سەرمان، بەڵام بە هۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە هاوڕێکەم زوو دوورکەوتەوە، دێلاواری بەجێهێشت و چوو بۆ جێگایەکی دی. من لە شازدە ساڵیدا پرۆژەکەم خستە سەر کاغەز، لە حەڤدە ساڵیدا ئەم پارچە زەوییەم بۆ تەرخانکرد کە بە ئیرس لە باپیرمەوە بۆم مابووەوە، لە هەژدەدا دەستمکرد بە دروستکردنی. هەڵبەت ساڵانێکی خایەند تا تەواو بوو، لە پەنجا و پێنج ساڵی ڕابوردوودا بەردەوام ئیشم تێدا کردوە، بەردەوام گەورەم کردوە».
لە ناکاو سەیریکردم و گووتی « ڕێنوار، بزانە جێگام زۆر زۆرە، ژێر پێی ئێمە بە دوو قات، چەندین ژێرزەمینی گەورەی تێدایە، جێگای ئەوەی تێدا دەبێتەوە هەم ئێستای تێدا بشارینەوە و هەم ڕابوردوو ...» کەمێک سەرسامانە سەیریکردم و گووتی «هەم پاشەڕۆژ... هەم پاشەڕۆژ ... ئەوەت لە بیر نەچێت». قسەکانی سەیر هاتنە بەر گوێم، وەک ئەوەی شتێک لەسەر داهاتووی من بزانێت، یان وەک سەرەتا کۆمەکێکم پێشکەشبکات کە دڵنیایە ڕۆژێک پێویستم پێی دەبێت. نوسینگەکەی خۆی زۆر گەورەبوو، بەڵام لەبری ئەوەی لە ژووری پێشوازی بەڕێوەبەری مۆزەخانەیەک بچێت، لە ژووری خەوتنی نوسەرێکی دێوانە و شپرزە دەچوو. بە پێکەنینەوە گووتی «کەسێک خەریکی ڕێکخستنی مێژوو بێت، ناتوانێت ژیانی تایبەتی خۆی زۆر ڕێکبخات، ئەوە یەکەم شتە کە دەبێت لەسەر هەر مێژوونوسێک بیزانیت... مرۆڤ ناتوانێت بەردەوام نەزم و ڕێکی بخاتە ناو شتەکانەوە،

عەفومكـە ... عەفومكـە كـوڕم، ئێـرە وەک بەشـەكانی تـری مۆزەخانەكـە سـەیرمەكە. لێرە هەمـوو شـتێک نـەزم و جوانـی خـۆی هەیـە ئـەم ژوورەی خۆم نەبێت، ئێرە وەک جێگای ژیانـم وایـە، زۆرجاریش هـەر لێرە دەخـەوم، هەڵبـەت ماڵی خـۆم هەیـە، بـەڵام هیچ كات ئارەزووم نییە نـەزم بخەمـە ژیانـی خۆمـەوە، نا حـەزی ئینسـان لـە جێگایەكەوە بۆ جێگایەكی تـر دەگۆڕێت. من ناڕێكی لە ژیانی خۆمدا بەوە ڕاستدەكەمەوە كە ئەم مۆزەخانەیە لەوپەڕی نـەزم و ڕێكخسـتندا ڕابگـرم. بەڵـێ، لـەوەدا ڕەحـم و بەزەییـم نییـە». مـن لەسـەر كورسییەک بەرامبەر خـۆی دانیشـتم، لـە پشـت مێزەكەیـەوە، هەرچەند خەندەكـەی گەورەتـر و درەوشـاوەتر دیاربـوو، بـەڵام خـۆی بچكۆلەتـر دەردەكـەوت. قەڵەمێكی هەڵگرت و كەمێک هێڵی ناڕێكی لەسـەر لاپەڕەیـەک كێشـا، كەمێک سەرسـام سـەیریكرد و گووتـی «بۆم باسبكە چیت دەوێت؟». پرسـیارەكەی تۆزێک كتوپڕ بـوو، چونكـە مـن نەمدەزانـی چیـم دوێت. مامـم ناردبوومـی زانیاری لەسـەر مێژووی دێلاوار وەربگرم، بەڵام چیم بگووتایە، بڵێم زانیاریـم لەسـەر مێژووی دێلاوار دەوێت؟ . ئـەوە قسـەیەكی گەمژانـە نەبوو؟ . مـن سـەیریمكرد و دڵنیابووم خـۆی زۆر شـت دەزانێت، بێئـەوەی زۆر بیربكەمــەوە گووتـم «بێگومــان جەنابـی پرۆفیسـۆر، خـۆت دەزانیـت». هەسـتیكرد دەسـتەپاچەم، بـە ئارامییـەوە گووتـی «حیكایەتـی ئـەو خەونـە منیشـی ناڕەحەتكردوە، منی لـە هـەر كەسێكی تـر زیاتر ماندووكردوە». مـن بـە سەرسـامییەوە پرسـیم «جەنابی پرۆفیسـۆر ئێوە خەونەكەتـان بینیوە؟». «نـا. بـەڵام وەک مێژوونوسـێک ترسـێكی گـەورەم لـە خەونەكـە هەیـە. خەونەكە پێشـینەیەكی كۆنـی لـە مێژووی دێلاواردا هەیـە، ئەمـڕۆ هیچ كـەس نازانێت كـە دێلاوار چـۆن و بۆچـی دروسـتكراوە، مـرۆڤ گـەر وردبێتـەوە دەتوانێت هەمـوو شـتێک بـە ڕۆشـنی ببینێت ... مـن لـەو سـوڕە گەورەیـەی كارەسـات دەترسـم». مـن بـە وردی گوێـم گـرت و پرسـیم «پرسـیارەكەی مـن ئەوەیـە: ئایـا زانیـاری پێویسـتمان لـە بەڕێزتانـەوە سـەبارەت بـەو ڕابـوردووە

دەستدەکەوێت، چونکە وەک مامە سیاشم پێی ڕاگەیاندوون، زانیارییەکانی ئێمە لەو ڕووەوە شتێک نییە بە زانیاری بەڕێزتان بەراوردبکرێت. هەندێک خەڵک، گەر بە ژمارە کەمیش بن خەونێک دەبینن، دەمانەوێت ئەوە...». قسەکانی پێبڕیم و کەمێک پێکەنی و گووتی «سەرەتا مرۆڤ دەبێت بزانێت دیلاوار کوێیە. بزانێت لە کوێ دەژی، هەر وەختێک ئەو شتانەی زانی ئیتر هیچ شتێک سەیر نامێنێت. من دەمێ ساڵە دکتۆر سیامەند دەناسم، کەم کەسم بینیوە دیلاوار بەجێبهێڵێت و بگەڕێتەوە، ئەو یەکێکە لەوانە. ڕاستت پێبڵێم من زۆر ئەو کەسانەم خۆش ناوێت کە دیلاوار بەجێدەهێڵن و دەگەڕێنەوە. گومانیان لێ دەکەم، دەشێت هەموو کارێکی ترسناک بکەن تا بۆ خۆیان بسەلمێنن هەڵە نەبوون، بیسەلمێنن لێرەش دەتوانن خۆش بژین، بیسەلمێنن شتێکی زۆر گەورەیان لە دەست نەداوە کە جیهانیان گۆڕیوەتەوە بە ژیان لەم شارەدا. من دەیانناسم، هەمیشە دەیانەوێت ئەو دەستکەوتانەی بە دەستی دەهێنن، ئەو پلەوپایانەی دەیگرن لە خەڵکی دیلاوار بەرزتر بێت، بەڵکو ئەوە قەرەبووی دۆڕانی دونیایان بۆ بکاتەوە. بەڵام گەر هەق بڵێم تا ئێستا شتێکی لەو جۆرەم لە دکتۆر سیامەند نەبینیوە. ئەو لەوانە بوو کە هاتەوە بۆ دیلاوار و دەیزانی هەڵەیکردوە، ئیتر لەگەڵ هەڵەکەی خۆیدا ژیا. سەرەتا تا لە ماڵە کۆنەکەی باپیرتدا بوو، زۆر سەردانمدەکرد. بەر لەوەی ژن بهێنێت. هەڵبەت زەمانێکی زۆر تێپەڕیوە، ئەو کات دەبێت تۆ منداڵ بوویبێت، ماشەڵا، من نەمدەزانی کاک سەعید زەریاواری کوڕی وەهای هەیە». من سوپاسمکرد و پەلەم بوو زوو بکەوێتە باسی دیلاوار. بۆ ئێستێک خۆم وەک غەریبەیەک هاتە بەرچاو کە ئێستا گەیشتبێتە ئەم شارە و بۆ باسێکی تایبەت ڕوویکردبێتە زانایەک، تا نهێنییەکی ئەم جێگا نامۆیەی بۆ ئاشکرابکات. بێئارامی منی خوێندەوە و گووتی «دیلاوار زۆر کۆنە، زۆر کۆنترە لە زیندانی سەرەکی دیلاوار کە لای زۆربەی مێژوونوسەکان وەک سەرەتای سەرەتاکان ، وەک بەردی بناغەی شارەکە

سەیریدەکەن. نا، جێگاکە مێژوویەکی کۆنتری هەیە، هەڵبەت وەک شار لەگەڵ بناغەی زیندانەکەدا دەست پێدەکات، بەلام خاکەکەی مێژوویەکی دێرینتی هەیە». خەندەیەکی گەورەی گرت و چاویلکەکەی تۆزێک جولاند و گووتی «هیچ شارێک سەرەتا شار نییە، هەموو شارێک سەرەتا زەوییە، زەویش ژیانی خۆی هەیە. هەندێ کەس زەوی بە رووتەن تێدەگەن، بە پارچە خاکێکی مردوو، بەلام زەویش ژیانی خۆی هەیە، مێژووی خۆی هەیە». قاقایەکی جوان و مۆسیقی لێدا، دەنگی زۆر گەنجانە بوو. گووتی « دیارە ژیانی وەک ژیانی ئێمە نییە، خاوتر و درێژتر و هێمنترە». من پێکەنیم و پرسیم «بەلام ژیانی زەوی چۆنە؟ بۆ نمونە، ژیانی زەوی دێلاوار دەبێت چی بوو بێت؟». «بەڵێ ئەوە ئەسڵێ چیرۆکەکەیە. دێلاوار بەر لەوەی ببێ بە شار سەرزەمینێکی تایبەت بووە، دیارە هەموو سەر زەمینێک سەرزەمینێکی تایبەتە، بەلام دێلاوار سیفەتێکی تێدابووە لە هیچ زەمینێکی دیکەدا نەبووە. خاکێک بووە مرۆڤ تێیدا خەونی نەبینیوە... هەڵبەت، ئەفسانەکان وادەڵێن. مرۆڤ لە هەموو جێگایەکدا خەونی بینیوە، لە چوارقورنەی دونیادا ئادەمیزادەکان خەوبین بوون، خەونی خۆشیان دیوە، ناخۆشیان بینیوە، لێرە نەبێت. خێڵە کۆچەرییەکان یەکەمینی ئەوانە بوون کە دەرکیان بەم نهێنییە کردوە، ئەو کەسانەی بە دەست بەدخەونی و مۆتەکەکانەوە نالاندویانە، ئەوانەی شەویان پڕ ترس و دێوەزمە بووە، روویان لێرە کردوە، نزیک دەریاچەی دێلاوار دەواریان هەڵداوە، پێیان وابووە هەندێک رۆحی پیرۆز کە لەو دەریاچەیەدا دەژین، هەموو جۆرە شەیتانێک دەردەکەن کە وادەکەن مرۆڤ خەونی خراپ ببینێت، ئەوانەیان ناوناوە پاسەوانەکانی خەو ... هەڵبەت وەک ئێمە نەبوون، ئێمە خورافاتی ترین، لە زۆر رووەوە خورافاتی ترین. بەلام واز لەوە بهێنە. وەک چیرۆکەکان دەگێڕنەوە، هەر زوو ناوبانگی ئەم سەر زەوییە بە دونیادا رۆیشتووە. کێ چوزانێت، لەوانەیە هەمووی چیرۆک بێت، من هەموو ژیانم بە مێژووەوە

سەرقاڵ بووم، مێژوو زانست نییە، زانست شتێکە یەقینی تێدا بێت، مێژوو یەقینی تێدا نییە. مرۆڤ مۆزەخانەکان دروستدەکات بۆئەوەی باوەڕ بە خۆی بهێنێت، بڵێت مێژوو دەبینم، خۆی فریوبدات و بڵێت ڕاستییەکان لە دەستمدان، بەڵام دوای تەمەنێکی درێژ لە مۆزەخانەکاندا، دوای تەمەنێکی درێژ درێژ... من لە هیچ دڵنیانیم».

گەرچی قسەکانی زۆر غەمگین بوون، بەڵام هەستم نەکرد خۆی مرۆڤێکی غەمگین بێت. هەستایە سەرپێ، سوراحییەک ئاوی گەورەی لە سوچێکدا دانابوو، کەمێک ئاوی تێکرد و فەرمووی لە من کرد، من گووتم «سوپاس». چەند پەرداخێکی پڕی لەسەر یەک داکرد و خواردییەوە، وەک ماندوو بێت دەستی گرت بەسەرییەوە و گووتی «خەڵک هەن هۆگری جگەرە دەبەن و ناتوانن وازی لێبهێنن، هەیە هۆگری شەراب و مەی دەبن، من هۆگری ئاو بووم. دکتۆرەکان دەڵێن دەبێت وازی لێبهێنیت، دەبێت وازی لێبهێنیت... بەڵام بەردەوام هەستدەکەم ناوەوەم وەک ئینسان پێویستی بە شتنە. ئەوەی مێژوو زۆر بخوێنێتەوە، ناچارە بەو جۆرە خۆی لە گوناهەکانی ئادەمیزاد پاکبکاتەوە. دەزانم ئێستا مامە سیات دەڵێت، نەخۆشیت و دەبێت پشووبدەیت، دەبێت بزانین کۆن چ گوناهێکت کردوە. بەڵام من هێندەم دەربارەی گوناهی ئەوانی تر خوێندۆتەوە، کاتم نەبووە فریای گوناهی خۆم بکەوم». من پێکەنیم و گووتم «ڕاستتان دەوێت پرۆفیسۆر من لە مامە سیام تێناگەم، هەندێ جار دەڵێم دەربارەی ئەم بابەت یان ئەویتر، دڵنیام مامە سیام بەمجۆرە بیردەکاتەوە، بەڵام دوایی دەبینم وانییە و من بە هەڵەدا چووم... سەیردەکەم پێچەوانە شتەکان دەبینێت». دەستی ڕاوەشاند و هەندێ کتێب و فایلی لەسەر مێزەکە جوڵاند و گووتی «ئەهلی زانست بەو جۆرەن، هەمیشە دەیانەوێت شتێک بڵێن کە کەس چاوەڕوانی نەکردوە. بەدرێژایی مێژوو وابوون. زۆرجار خیانەتیش دەکەن، بۆئەوەی بیسەلمێنن وەک خەڵکی تر نیشتیمانپەروەری گەمژە نین».

من پرسیم «بەڵام دێلاوار کەی دروستبووە؟».

دەمویست بە ڕاستی بکەوێتە سەر باسی مێژوو، بەهێمنی لە جێگای خۆی دانیشتەوە و گووتی «دەڵێن یەکێک لە شاهەنشاکان چیرۆکی ئەم سەرزەمینە دەبیستێت، خۆت دەزانی شاهەنشاکان ڕاستە حوکمی ئاسمان و زەوی دەکەن، بەڵام دەسەلاتیان بەسەر خەونی خۆیاندا نییە. دەتوانن بەر لە سەدان لەشکری بەهێز بگرن، دەتوانن تاج و تەختی دەیان میر و گزیر تێکبدەن، بەڵام بەری مۆتەکە و دێوەزمەی ناو خەونیان پێ ناگیرێت. وەک دەڵێن، شاهەنشا کە هەموو خەڵک و خودای زەمانی خۆی لێی بەقین بوون، بە دەست مۆتەکەی ناخۆش و وڕێنەی شەو و هاوار هاواری جانەوەرانی ناو خەونەوە هەراسان دەبێت. دەمێک چیرۆکی ئەم سەرزەمینە دەبیستێت، دەم و دەست تەدارەک دەبەستێ و لەگەڵ هۆردویەک لە دەست و پێوەندا دێنە ڕۆخی دەریاچەی دێلاوار. شاهەنشا بەم هەوارە گەلەک بە کەیف دەبێت، خۆشییەکی ئێجگار و ئاسوودەگییەکی زۆر هەست پێدەکات. چی لەوە خۆشتر هەیە پادشا بیت و زەمینێک بدۆزیتەوە خەونی تێدا نەبێت. ئیتر هۆردو دەخات و هەوار هەڵدەدات و دەیەوێت لێرە بژی، بەڵام دەمێک خەڵکانی ستەم دیدە و داخ لە دڵ بە کۆچی پادشا دەزانن، خەونی ئازادبوون دەپەڕێتە سەریان. شەڕێکی سامناک دادەگیرسێت، لافاوی خوێن لە دەیان گوند و شاردا هەڵدەستێت، زیندانەکان پڕدەبن لە ئازادیخوازانێک کە خەون بە ڕزگارییەوە دەبینن، شاهەنشا بە ناچاری و بە لەشکرێکی گەورەوە بەرەو پایتەختی کۆن دەگەڕێتەوە. گەڕانەوەی شا هەرەس بە شۆڕشگێران دەهێنێت. زیندانەکان پڕدەبن لە دیل، سێدارەدان دەبێت بە کار و پیشەی ڕۆژانە. بەڵام هەندێ لە شۆڕشگێران هیچ نایانترسێنێت، خەونی جەنگێکی نوێ، هەڵگێڕانەوەیەکی تازەی تەخت و تاجی شاهانە لە زیندانەکاندا بەردەوام دەبێت... تا شەوێک پادشا دەکەوێتە سەر خەیاڵێکی شەیتانی».

دیاربوو بەشی زۆری ژیانی لە گێڕانەوەی چیرۆکە مێژووییەکاندا بردۆتەسەر. هەناسەیەکی هەڵکێشا و خەندەیەکی گەورەی گرت و بە هێمنی گووتی «دێلاوار لەوێوە دروستدەبێت. پادشا بڕیاردەدات زیندانێکی گەورە دروستبکات، زیندانێکی زۆر گەورە. هەموو پادشاکان و حاکمەکان لە کۆنەوە تا ئێستا بۆ جێگایەک دەگەڕێن ئینسانەکان خەون نەبینن. دەستەیەک لە سەرانی یاخییەکان هەڵدەبژێرێت و دەیانێرێت بۆ یەکەم بەندیخانە. دروستکردنی بەندیخانەکە چەند ساڵێک دەبات، دیلەکان ئەو ماوەیە، لە کۆلیت و قۆخەڵەی بچوکدا دیلدەبن. زیندانەکان ئارام دەبنەوە، نە هەوای ئازادی لەسەریاندا دەمێنێت و نە مەیلی شۆڕش. دێلاوار لەوێوە هاتووە... لە سەرەتاوە خەون لە دێلاوار مانایەکی ترسناکی هەبووە. خەون لە دێلاوار جیاواز لە هەموو جێگاکانی دونیا، ئەو ترسە گەورەیەیە کە شارەکە بەرەو وێرانەیی دەبات».

« زیندانەکە سەرەنجی هەموو حاکمان و زۆردارانی دونیا ڕادەکێشێت، دەڵێن وردە وردە ئیدارەی زیندان وەک شتێکی سەربەخۆ لێدێت. پێدەچێت بەڕێوەبەرانی زیندان بنکە و بناغەی شارەکەیان دامەزراندبێت، پاسەوانەکان و دەستەی ڕاییکردنی کاروباری زیندان یەکەمین کەسانێک بوون ماڵیان پێکەوەناوە و خانوویان دروستکردوە. یەکەم بەڕێوەبەری زیندان ناوی موسەیلەم بەگە، پیاوێکی بلیمەت و کارا و دڵڕەق بووە، دەسەڵاتی موتڵەقی خۆی بێڕەحمانە بەکارهێناوە، وەک دەڵێن جگە لە خودی شا هیچ مەرجەعێکی تری نەبووە، بەوەدا شاهەنشاش هێدی هێدی پیر و کەنەفتە کەوتووە، موسەیلەم بەگیش سەربەخۆیی تەواوی وەرگرتووە. موسەیلەم بەگ پەیوەندی لەگەڵ زۆر لە مەملەکەتە دوورەکانیشدا دەبەستێت. دەڵێن بە کاروانێکی گەورەوە گەڕاوە و گرێبەستی لەگەڵ پادشا و ئەمیر و والی و خاوەن ئەمارەتە دوورەکاندا مۆرکردوە، لە هەموو جێگایەکی دونیاوە دیلی هێناوە، مانگانە بە قافڵەی تایبەت، زیندانیانی خەتەرناک لە زۆر جێگای

دونیاوە هێنراون بۆ دیلاوار. بەرامبەر هەموو دیلێكیش موسەیلەم بەگ و دواتر كوڕەكانی بودجەیەكی براوەیان وەرگرتووە، شتێك وەك كۆمپانیا تازەكانی ئەم سەردەمە، بەلام بە شێوازی كۆن. ژمارەی دیلەكان هێندە زۆربوون، نزیكی پەنجا ساڵ، وەستا و كرێكار لە زیندانەكانی دیلاواردا شەو و ڕۆژ ئیشیانكردوە، كرێكاری شارەزا خۆیان و بنەماڵەكانیان لە كاردا بوون و لەگەڵ دروستكردنی زینداندا، زیندەگییەكی بچوك و ئارامیشیان بۆ خۆیان سازكردوە. لە ماوەیەكی كەمدا ژمارەی ژوورەكانی یەكەمین گرتوخانە دەگاتە سەرو هەزار ژوور، دەڵێن گەورەترین زیندانی ئەوكاتی دونیا بووە. ئیتر ژمارەی پاسەوانەكان زۆردەبێت، ژمارەی ئەو بنەمالانەی كە دێن و دەیانەوێت لە نزیك كوڕ و مێرد و كەسیانەوە نیشتەجێ بن و زوو زوو لە ئەسارەت و دیلیدا دڵنەواییان بدەنەوە زۆردەبێت. لەدەوری زیندان بناغەی شارێكی پەرشوبلاو و ناڕێك دادەمەزرێت كە دانیشتوانی خەڵكی دەیەها جێگای جیاوازن، بە چەندەها زمان قسەدەكەن، ژیان و ئیمانی جیاوازیان هەبووە، بەلام هەموو لە یەك شتدا بەشدارن، ئیتر خەون نابینن یان هەموو پێكڕا حاشا لەوەدەكەن خەون ببینن... لەدوای مردنی موسەیلەم بەگ، كوڕەكانی بازرگانییەكەی باوكیان دەگرنە دەست، لە هەموو جێگایەكەوە گرێبەستیان بۆ دێت، دەبن بە هاوڕێی ئەمیر و شالیار و والییەكان، دەبن بە میوانی تایبەت لە ماڵی بەڕێوەبەرەكانی زیندان و ساڵ دوای ساڵ ئەزموونی زۆرتر لەسەر شێوەی بەڕێوەبردنی زیندان كۆدەكەنەوە. وەك لە كتێبەكاندا هاتووە، دیلاوار دەبێت بە شاری هەزار زیندان، لە هەر جێگایەكی خۆرهەلات بیانەوێت یەكێك دووربخەنەوە، بۆ ماوەیەكی زۆر حوكمی بدەن، دەینێرن بۆ دیلاوار. بەلام جیا لەوانە، دیلاوار دەبێت بە شاری ئەوانەش كە خەونێكی ناخۆش یان ئومێدێكی مەحاڵیان هەیە. لە زۆر جێگادا، خێزان و بنەماڵەگەلێك كە كچ و كوڕیان بە دەست دەردی بێئەمانی عەشقەوە دەناڵێنن، لە كەژاوەی تایبەت و بە

کاروانی خسوسی کچ و کوڕیان دەنێرن بۆ ئەم شارە تا ئازاری دڵ و خەونی عاشقانە لەسەریان بکەنە دەر. دەڵێن خاکی دیلاوار ئارامبەخش و هێورکەر بووە بۆ سەدان چیرۆکی عەشق، ئەوە وایکردوە زۆر دایک و باب و بنەماڵە ڕەنجێکی زۆر بەخەرجبدەن و لێرە و لەم خاکەدا کۆشکی تایبەت بۆ فەرزەندانیان دروستبکەن، تا لێرە دوور لە هەر ئازارێکی سەختی خۆشەویستی بژین. گەر سەیربکەیت ڕاستییەکان بەوجۆرەیە، بناغەی دیلاوار لەسەر دوو شتی گەورە دامەزراوە، نەبوونی خەون و نەبوونی عەشق ... دەڵێن باپیرە گەورەکانی ئێمە، ئەو نەوەیە لە منداڵ کە لێرە لەدایکبوون، نە عەشق و نە خەونیان نەناسیوە. ئێمە لێرە لە مۆزەخانەی دیلاوار شتێکی زۆرمان ئەرشیفکردوە، زیندانەکان لە مێژووی سەدان ساڵەی خۆیاندا خەزنەداری دڵسۆزیان بووە، بەڕێوەبەرەکانی شێوەیەکی بالایان لە تۆمارکردن و دەفتەرداری بەکارهێناوە کە جێگای ستایشە، ناوی زیندانەکان و هۆی گرتنیان و ماوەی مەحکومییەتیان بە جۆرێکی ورد تۆمارکراوە. هیچ زیندانێک نەبووە لێرە ڕۆژێک زیاتر یان کەمتر لە مودەتی مەحکومییەتی خۆی بباتەسەر، موسەیلەم بەگ و کوڕەکانی هیچ دیلێکیان وەرنەگرتووە ساڵ و ڕۆژی ئازادکردنی دیاری نەبووبێت. یاساکانی زیندان دڕندانە و بێڕەحم نەبوون، بە جۆرێک دەکرێت بڵێم باشترین زیندانی زەمانی خۆیان بوون. لە ڕاستیدا مێژوو هیچ کات چیرۆکێکی ئەوتۆی دەربارەی دڕندەیی زیندانەوانەکانی دیلاوار تۆمار نەکردوە، وەک دەڵێن جۆرێک لە ڕێز و خۆشەویست لە نێوان دیل و زیندانەوانەکاندا هەبووە... ڕێز و خۆشەویستییەک تا ئەمڕۆش ماوە. تا ئەمڕۆش مرۆڤە دیل و بەدبەختەکانی دیلاوار هەر بە حورمەتێکی فیترییەوە کڕنوش بۆ زیندانەوانەکان دەبەن و خەڵکیش لێرە بە کینەیەکی غەریزییەوە سەیری خۆشەویستی دەکەن».

پێدەچوو یەکەمجار بێت پرۆفیسۆر بەهنام ئەم چیرۆکە وەها بگێڕێتەوە،

هەڵبەت لە دیلاوار زۆربەی خەڵک شتێکیان لەسەر شێوەی دامەزراندنی شارەکە دەزانی، بەڵام پرۆفیسۆر لە هەر کەس زیاتر لەو مێژووەدا قووڵ بووبووەوە، خۆی دەیگووت «کامە ئەفسانە زۆر نزیکە لە راستییەوە، تەنیا ئەوە دەگێڕمەوە». لەگەڵ دوا ڕستەکانیدا هەستا و دەستی گرتم و گووتی «تۆ کوڕی سەعید زەریاواری بازرگانیت، باوکت و مامەکانی تریشت هیچ کات دیلاواریان بۆ گرنگ نەبووە. زەریاوارییەکان نزیکی دوو سەدەیە لە ژیانی سیاسی کشاونەتەوە و خەریکی بازرگانین، ڕەنگە نەزانیت کە نازناوی زەریاواری لەوەوە هاتووە کە باپیرانت زۆر هاتوچۆی شارە دوورەکانیان دەکرد، قافڵەچی ناودار بوون، سوار کەشتی بوون و دەریای دووریان تەیکردوە. باپیرە گەورەتان «عاتیفی زەریاواری» لە هەرە بازرگان و کاروانچییە ناودارەکانی دونیا بووە، لەسەردەمی خۆیدا پێیان گووتووە سەندبادی دووەم، لە هیند و چینەوە ئاوریشم و میسک و خەنەی هێناوە، قافڵەکانی هێند درێژ بوون فەسیلی پاسەوانی خۆی بووە تا لە چەتە ئەفغانی و پشتونی و بەلوژەکان بیپارێزن. دەڵێن کاڵای تا ڕۆما گەیشتووە. ئەمڕۆ سەردەمی ئەوجۆرە بازرگانییە بەسەر چووە، بەڵام پیاوانی تایفەی ئێوە هێشتا هەر بازرگانن... هەستیان هەستی گەڕیدە و خوێنیان خوێنی بازرگانە دێرینەکانە، باوکت پێش ژنهێنانی بازرگانێکی ناوداری چەک بوو، ئەو کات دیلاوار لە شۆڕشدا بوو، قورسایی شۆڕشگێڕان لەسەر ئەو چەکانە بوو کە باوکت لە بازرگانەکانی تری دەکڕی و بۆ شۆڕشگێڕانی دیلاواری دەهێنا ... بەڵام هەموو شتێکی بە عەقڵی بازرگانان ئەنجامداوە. سەیرە، زۆر سەیرە... هیچ نیشانەیەکی ئەو جنسە لە تۆدا نابینم. تۆ یان ڕۆحێکی گەورەیت یاخود گەمژەی بنەماڵەکەی، تۆ کامیانیت؟». وای گووت و پێکەنینێکی ناسک و ئارام پێکەنی. منیش بە پێکەنینەوە گووتم «هەردووکیانم، خزمەکانم وەک گەمژەی عەشرەتی زەریاواری دەمبینن، منیش خۆم وەک بلیمەت دەبینم». هەر دووکمان دامانە قاقای پێکەنین.

گووتی «گرنگ نییە، ئێستا وەک جاران نییە، منداڵان و گەنجانی نوێی دێلاوار ناچنەوە سەر سەنعەتی باوباپیریان. کەی گرنگە». من بۆئەوەی بیخەمە سەر هەوای قسە گووتم «بەڵام جەنابی پرۆفیسۆر، ئەم دێلاوارەی ئەمرۆ بۆ هیچی لەو دێلاوارە ناچێت کە ئێوە باسیدەکەن؟». گووتی «ئەوە ئەسڵی چیرۆکەکەیە. دێلاوار دوو قۆناغی هەیە، دوو قۆناغی زۆر گەورە». لەویادا وەستاو کەمێک بیریکردەوە و بە زمانێک کە کەمێک ترس و تێڕامانی تێدابوو گووتی «ئەوە شتێکە زۆر کەم کەس دەیزانن، ژمارەیەکی زۆر کەم لە مێژوونوسانی دێلاوار دەرک بە نهێنییە قوڵەکەی دەکەن. من و چەند کەسێکی تر... ئەوە چیرۆکێکە لە بیر دونیا چۆتەوە». بە هەموو گیانم گوێم لە قسەکانی دەگرت، بە ئەسپایی گووتی «دوو قۆناغ. قۆناغی پێش دانیال و قۆناغی دوای دانیال». ئەوە یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا ناوی دانیال ببیستم. بەجۆرێک گوێبیستی بووم، نەمتوانی هیچ بپرسم. بە هێمنی گەڕایەوە دۆخی ئاسایی خۆی و گووتی «دێلاوار سەدان ساڵ لە بێ خەونیدا نوقمدەبێت، سەدان ساڵ... کێ چوزانێت ڕەنگە لە هەزار ساڵیش تێپەڕی بێت تا دانیال دێت... هاتنی دانیال هەموو شتێک دەگۆڕێت ... ئایا دانیال ڕاستییە یان خەیاڵ کەس نازانێت، بەڵام من باوەڕم پێیەتی، لە مێژووی دێلاواردا دانیال هێڵی جیاکردنەوەی دوو سەردەمە. زۆر کەس باوەڕیان بە بوونی نییە، بەڵام لای من دانیال ڕاستییە، بووە، لایەنی کەم من بەڵگەیەکی بەهێزم هەیە». دەستی گرتم و گووتی «هەستە بڕۆینە ناو مۆزەخانەکەوە، شتێک هەیە پێویستە بیبینیت». یەکەمجار بوو دەنگی زۆر جیدی بێت... نازانم لە بەر هەر هۆیەک بێت، ناوی دانیال ترسێکی کتوپڕی خستە دڵمەوە کە دڵنیابووم پرۆفیسۆر بەهنام بە ڕوونی لە چاومدا دەیبینی.

## ١٤

بۆ ڕۆژی دوای کۆبوونەوەی نیگارکێشان، دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ بابەعەلی وەزیری تەلەفونی بۆ کردم و تکایکرد بچمە لای. وەک خووی هەمیشەیی خۆم هەوڵمدا بزانم چی دەوێت، بێزاربووم لە کەسانێک لە تەلەفوندا دەڵێن «تکایە تا ئێرە وەرە ... ئیشێکی بچوکم هەیە و سەرێکم لێبدە ... شتێک هەیە ناتوانم بە تەلەفون پێت بڵێم». ئەو جۆرە قسانە زۆر تورەیاندەکردم. بابەعەلی وەزیری گووتی «شتێکی زۆر تایبەت نییە، دەمانەوێت تۆ وێنەکان وەربگریت. لەو باوەڕەدام ئێوە دەبێت وێنەکان ببەنە لای فەرماندار و حاکمی عەسکەری، چونکە ئەوان چاوەڕوانن». هەستمکرد تووشی دەردەسەرییەکی بێسوود بووم و لەم کارەدا نە بارم هەیە و نە هێستر. تەلەفونم بۆ مامە سیام کرد و هیوام بوو ئەو بڵێت مەچۆ، تا خۆم لە ئیشەکە بکێشمە دواو و چیدی نە پۆلیسخانە و نە فەرماندار نەبینم. بەڵام ئەو بە حەماسەتی منداڵێکەوە گووتی «واووو، فزولم گوڵی گرت، فزولم گەورەبوو، کونجکۆڵیم گڕی گرت، نەچیت عەزیزم، هەر ئێستا خۆشم دێم و پێکەوە دەچین. من لە هەر کەس زیاتر مافم هەیە ئەو شەیتانە ببینم کە ئاوا دەچێتە خەونی خەڵک». وەڵامەکەی مامم هێندەی تر نائومێدیکردم، گەر هەر خۆم بوومایە کارم خێراتر و بێدەنگتر بەڕێوەدەچوو. بەڵام ئێستا دڵنیابووم هەموو شەوەکەم بە چیرۆکی ئەو وێنانەوە دەڕوات.

سەعات نۆی شەو بوو کە من و مامە سیام گەیشتینە پۆلیسخانە، لە سالۆنی چاوەڕوانییەکەدا مامم گەرموگوڕییەکی زۆری پیشاندەدا کە لە سروشتی تایبەتی خۆیدا نەبوو، من لە گوماندا بووم، ئاخۆ بە ڕاست هێندە ئارەزووی بینینی ئەو نیگارانەی هەیە یاخود هەر بۆئەوەی وادەربکەوێت لە گەرمەی کێشەیەکی گرنگدایە و حەزی لە دەرخستنی حەماسەتە، وادەکات... ئەمشەو مامە سیام نائاسایی دەهاتە بەرچاوم، هەندێ جار دەبووە پرسیار بۆم: ئاخۆ کەسێکی حەکیمە یاخود نمایشبازێکە بە کۆمەڵێک دەمامک و زمانی جیاوازەوە؟ . ئەو توند دەستی لە دەستی دەخشکاند و وەک یەکێک چاوەڕوانی لەزەتێکی گەورەبێت دەیگووت «هەر ئێستا، ڕێنوار، هەر ئێستا ئەو گوناهبارە دەبینین». قسەکانی دەیانترساندم، هەستمدەکرد شارەکە هەمووی خەریکە خەون و ڕاستی تێکەڵدەکات، بەلام دەبوو مامە سیام وەک دکتۆرێکی دەروونی دواهەمین کەس بێت بکەوێتە هەڵەی لەوجۆرە. بە نیگەرانییەوە گووتم «مامە، ئێستا ئێمە هیچ شتێک نابینین، هیچ شتێک، تەنیا وێنەیەک دەبینین کە هەندێ نیگارکێشی ئەم شارە دروستیانکردوە... وێنەکە وێنەی خەونێکە کە کەسمان دڵنیانین ڕاستە یاخود دروستکراوە». بە گەرمییەوە گووتی «هەموو دوژمنێک لە ناخدا وێنەی دوژمنێکە لە دەرەوە ... ئەوە بخەرە مێشکتەوە» هێند توند و توڕە قسەیکرد، ویستم بە نیگەرانییەوە بڵێم «هەموو دوژمنێک لە دەرەوە وێنەی دوژمنێکە لە ناخدا». بەلام هیچم نەگووت.

مامە سیام کە بابەعەلی وەزیری بینی بە گەرمییەوە بەرەو پیری چوو. شێوەی سلاو و تەوقەکردنی نوشتانەوە و خۆ نزمکردنەوەیەکی بەرچاوی تێدا بوو. بابەعەلي وەک پۆلیسێکی شارەزا کە دەزانێت چۆن خەڵکی ئازار بدات، بێئەوەی بایەخێکی گەورە بداتە مامم، ڕوویکردە من و گووتی «فەرموون کاک ڕێنوار، ئێوە وەرن سەیرێکی نیگارەکان بکەن و با ڕاستەوخۆ لە دەستی هونەرمەندەکانەوە بگاتە دەستی ئێوە... دواتر پیشانی جەنابی فەرمانداری

بدەن و بزانە ئەو و حاکمی عەسکەری چ بڕیارێکی لەسەر دەدەن ... جەنابی دکتۆر فەرموون ئێوە لە جێگای خۆتان پشووبدەن، فەرموون دابنیشن».
مامم بە خەندەیەکەوە لە جێگای خۆی دانیشت، بەڵام بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا هەستم بە کینەیەک کرد لە چاوانیدا بریسکایەوە. لە عیادەکە زۆرجار توڕەدەبوو، زۆرجار پێیخۆش بوو لە بەرچاوی میوانە تایبەتییەکانی سووکایەتیم پێکات. بەڵام هەموو ئەو شتانەی بە جۆرێک دەکرد، ئاسەواری کینەیان پێوە نەبوو، وەک ئەوە بوو بۆ خۆشی ئازاری منداڵێک بدات، بەڵام ئەوەی ئێستا دەمبینی، ئەو خواستە شەڕانییە سادەیەی ناو دەروونی نەبوو، بەڵکو شتێک بوو قووڵتر... کینەیەک بوو تۆختر و گەورەتر.

هەر سێ هونەرمەندەکە لە حەوشی بنکەدا پێکەوە وەستابوون و جگەرەیان دەکێشا، دوو ڕۆژ و شەوێکی سەختیان بردبووە سەر، کەسیان نیگاری ئەویدیکەیان نەبینیبوو، من یەکەم کەس دەبم هەر سێ نیگارەکە دەبینم. بابەعەلی وەزیری کلیلی ژوورەکانم دەداتێ و دەڵێت، هەر سێکیان بپێچەرەوە و بیبە بۆ ماڵی فەرماندار. من دەچمە ناو ژوورەکانەوە، هەر سێ ژوورەکە بۆن جگەرەیەکی کوشندەیان لێدێت، لە هەر سێکیاندا بۆنی ماندوێتییەکی نادیار دەکەم، دیارە چەند ڕۆحێکی شپرزە بە درێژایی شەو لێرە نیگاریان کێشاوە، هەر سێ وێنەکە دەبینم، سێ شاکاری ڕاستەقینەن کە دەبێت بخرێنە مۆزەخانەکانی هونەرەوە، هەر سێ نیگارکێشەکە بەپێی ئەو چیرۆکانەی بیستوویانە نیگارێکیان کێشاوە، پیاوێکە ئەسمەر، دەموچاوێکی باریک و قژێکی کورتی هەیە، نیگایەکی وشک کە هیچ جۆرە گوزارشت و پەیامێکی تێدا نییە. کێشەکە ئەوە نییە کە وێنەکان لە چوارچێوەی گشتیدا لە یەک دەچن، بەڵکو لەوەدایە کە ئەم وێنانە دەشێت لە زۆر کەس بچن... وێنەی دەموچاوێکی نێرانەیە، مۆنییەکی تایبەت بە خۆی نییە، سەیرکردنەکەی لە هەزاران نیگای تردا هەیە، قژێکی کورتی مەیلەو لوولی هەیە، فەزای دەوری ڕوخساری کپ و بێدەنگییەکی قووڵە. زۆر لە وێنەکان

وردەبمەوە، هەر سێکیان بەشی ئەوە لەیەکدەچن بتوانین بۆ خاوەنەکەی بگەڕێین، بەلام بەشی ئەوەش لێک ناچن بتوانین کەسێکی وەها بدۆزینەوە. هەر سێ وێنەکە بە پارچە ڕۆژنامە دەپێچمەوە، نامەوێت نهێنی ئەم نیگارانە لە منەوە بلاوببێتەوە، هەر سێکیان هەلدەگرم، ئەو پەڕە و ڕەشکار و سکێچە سەرەتاییانەی نیگارکێشەکان دروستیانکردوە کۆدەکەمەوە و دەیانخەمە سەر یەک، وەسواسێکی تایبەتم تێدا دروستدەبێت کە ئەم سکێچانە هەلگرم، نازانم بۆچیمە یاخود چ سوودێکیان هەیە، بەلام دەمەوێت هێلکارییە سەرەتاییەکان و قۆناغی پێش بڕیار لە نیگارەکەدا لای من بێت، وێنە سەرەتاییەکان لە وێنەی کۆتایی ناچن، هەر هونەرمەندە و دەیان سکێچی کێشاوە، دوودل بوون لە هەموو نیگارەکە، دوودل بوون ئەو پیاوە لە چی دەچێت، چەندەها جار درێژی و پانی ڕوخسارەکەیان گۆڕیوە، سەرەتا شێوەی زۆر دووریان لە نیگاری کۆتایی ڕەسمکردوە. بە وریاییەوە نیگارەکان جیادەکەمەوە، لە دلی خۆمدا دەلێم «گومانم لەوە نییە، کەس ناتوانێت وێنەی خەون بکێشێت». بە هەموو کەلوپەلەکانەوە دێمەدەرێ، داوای کۆمەک لە یەکێک لە پۆلیسەکان دەکەم. لە ناو حەوشەکەدا بابەعەلی وەزیری پارە بۆ نیگارکێشەکان حسابدەکات، هەر سێکیان دلخۆش دیارن، پێدەچێت پارەکەیان بەدل بێت، هەر سێکیان دەست بۆ من بەرزدەکەنەوە و خەندەیەکی گەورە لەسەر دەموچاویانە، من بە ڕوویانەوە پێدەکەنم و بە ڕێگای خۆمدا دەڕۆم و ئیتر ئاوڕنادەمەوە، لە دەرگایەکی پشتەوەی پۆلیسخانە ماشێنێکی تایبەتی چاوەڕێماندەکات، من نیگارەکان بە هێمنی دادەنێم، داوای مۆلەت لە شۆفێرەکە دەکەم و دەچم بەدوای ماممدا. ئەو لە جێگای خۆی، بە هەمان ئەو هەستی کینەیەوە، بێدەنگ و بێ هیچ هەستێکی تایبەتی سەیرمدەکات، پێکەوە دەگەڕێینەوە و سوار ماشێنەکە دەبین، شۆفێرەکە بە شەقامەکانی دیلاواردا دەمانبات... شار نیشانەیەکی ئەوتۆی پێوە دیار نییە، بەلام من بەردەوام سەیری دەرەوە دەکەم و دلنیام ئەمشەو یەکێکە لە شەوە هەرە تاریکەکانی دیلاوار.

# ١٥

پێکەوەبووین ... لە شارێکی غەریبدا، لە ڕۆژانێکی سەختدا ... ماوەیەکی کورت پێکەوە بووین. شەوان گەر دنیا هێمن بایە، گەر ترسمان نەبایە، ئال موراد بەسەرهاتەکانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە.

ئەو بۆی گێڕامەوە «من لەو ڕۆژەوە لە ماڵ و مەزرا تایبەتەکەی سەی ئەسلان، گوێم لە قسەکانی بوو، ترسێک بەرامبەر ئەو پیاوە کەوتە دڵمەوە. ترسێک پێشتر نە بەرامبەر باوکم، نە بەرامبەر مامۆستاکانی قوتابخانە هەستم پێ نەکردبوو. بە هۆی ئەو ترسەوە نەمتوانی دووربکەومەوە. چەند ڕۆژێک دوای کۆبوونەوەکەی ماڵی سەی ئەسلان، بەرازە ڕەش و فاتیحی سەی فەیتحولای هەلاج هاتن بۆ لام و گووتیان هەموو کوڕگەل، هەرچی گەنجێک ئەوی ڕۆژ لای سەی ئەسلان کۆبووینەتەوە بڕیارمانداوە هێزێک دروستبکەین و خۆمان ڕێکبخەن و ناوی خۆمان بنێین باغەوانەکانی دیلاوار. هاتنیان بۆ لای من بۆئەوە نەبوو پرسیارم پێ بکەن، من هەر لە شێوەی قسەکردن و جۆری سەیرکردنی ئەواندا تێگەیشتم، کە بۆم نییە بڵێم: نا ناتوانم، نا لەگەڵتان نیم».

هەندێ دەڵێن «باغەوانەکانی دیلاوار» وەک ڕێکخراوێکی نهێنی پێشتر هەبووە، کەسانێک مێژووەکەی دەگێڕنەوە بۆ زیاد لە سەد ساڵ لە مەوبەر،

پێدەچێت سەی ئەسلان سالانی پێش دەرکەوتنی خەونەکەش، هەر ئیشی بۆ بونیادنان یان بونیادنانەوەی ڕێکخراوێکی لەو جۆرە کردبێت، پێدەچێت دەمێک ئان و ساتی ڕاستەقینەی کار هاتوتە پێش، سەی ئەسلان هەموو زەمینەیەکی پێویستی خۆشکردبێت بۆ بانگەشەکردن و بلاوکردنەوەی بیروڕاکانی خۆی. گومانم لەوە نییە کە ئەو لە ناو دەزگاکانی دەوڵەتدا، لە ناو وەزیرەکان و کابینەی شارەوانییەکان و پۆلیسی دەڤەرەکاندا خەڵکی بەهێز و نزیکی بووە کە پشتگیریان لێ کردوە. هەر لەو هەفتەیەدا کە فەراسە ڕەش دەچێت بۆ لای ئاڵ موراد، سەی ئەسلان و دە گەنجی خوێنگەرم، بە جلی جەنگاوەرانی سەردەمی جەنگی ڕزگارییەوە، دەچن بۆ لای فەرماندار و داوایەکی تایبەت بۆ دامەزراندنی هێزی باغەوانەکانی دیلاوار پێشکەشدەکەن. سەی ئەسلان دەمێک دەچێت بۆ پێشەشکردنی داواکەی هەموو ڕۆژنامە و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان ئاگادارەکاتەوە، لە ئوتومبیلێکی گرانبەها و لە قیافەی سەربازێکی دلاوەردا لە بەردەم ڕۆژنامەنوساندا دەردەکەوێت و دەڵێت «دایکی وەتەن، دیلاواری عەزیزمان بانگماندەکات. دوژمن گەیشتۆتە ژێر پێستمان، ناو عەقڵمان، ژیان و زمان و کولتووری داگیرکردوین. ئێستا ساتی ئەوەیە دووبارە گیانی بەرەنگاری و خەبات لە خۆماندا زیندوو بکەینەوە، چونکە دوژمن خۆی ئامادەدەکات، ئەوان شەو و ڕۆژ لەشکر و هێزەکانیان مەشق دەدەن و ئێمەش هیچ، دەبێت ئەمە کۆتایی بێت. لەمڕۆوە دوژمن دەبێت بزانێت، کە دیلاوار ڕۆڵەی نەبەردی هەیە و دەیپارێزێت». بە قیافەی ژەنراڵێکی نەبەردەوە، بە هەنگاوە جێگر و درێژەکانی، وەک یەکێک دەیان ساڵ وانەی دادابێت لەم ساتانەدا چۆن ڕەفتاربکات، لەبەردەم دەرگای فەرمانداریدا دەرکەوت. وەک ئەوە بوو دڵنیابێت ئەمجارە دەوڵەت ڕێگری لە پێشنیارەکەی ناکەن، شێوەی خۆ گۆڕین و دەرکەوتنی بە تەرزی سەرکردەیەکی مێژوویی بوو کە دەمێکە دیلاوار چاوەڕوانیدەکات. من وەک هەموو خەڵکی دیلاوار لە تەلەفزیۆنەوە بینیم چۆن «شێرەکەی غەفاریی»

وەک هەوادارانی ناویاندەنا داوای دامەزراندنی سوپایەکی میللی بە ناوی «باغەوانەکانی دێلاوار» ـەوە، پێشکەش بە فەرماندار کرد. بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆژنامەکان بە مانشێتی گەورە باسیان لە سەی ئەسلان کردبوو، وەک هاوڵاتییەکی دڵسۆز، مامۆستایەکی شارەزای مێژوو، وتارخوێنێکی لێزان و سیاسەتمەدارێکی پڕ موژدە، وەسفی جوان و سیفەتی باشیان دابووە پاڵ. هەموو هەستمانکرد کە فەرماندار یاخود لە هێزی ئەم پیاوە تێنەگەیشتووە یان لە ژێر فشاری تاقم و دەستەگەلێکی بەهێزی تردا «لە هەلومەرجێکی وا کەرنەفالی و بە شێوازێکی وا پرۆتۆکۆلی» پێشوازی لە سەی ئەسلان کردوە. هەموو دەمانزانی فەرماندار مەبەستێتی لەم کارە سوود بە خۆی بگەیێنێت و هەم وەک دیموکراس و هەم وەک دڵسۆزی دێلاوار دەربکەوێت، بەلاَم کەسیش گومانی لەوە نەبوو کە بەم نمایشە سەی ئەسلان لە مامۆستایەکی نەناسراوی مێژووەوە دەبێتە کۆڵەکەیەکی ئەستووری سیاسەت لە هەرێمەکەدا .

ئاڵ موراد لە یەکەمین فەسیلی باغەوانەکانی دێلاواردا دەبێتە جەنگاوەر، شەوێکی هاوینەی گەرم کە مێشوولەکان نەبێت تەواوی جانەوەرانی تر خەوتوون، لە کاتێکی گوماناویدا کە دەکەوێتە نێوان تاریکستانی شەو و بولێلی پێش بەیانیدا، پاسێکی گەورە دێت بە دوایدا و لەگەڵ دەیان گەنجی دیکەدا، بە ڕێگایەکی شاخاوی و پێچاو پێچدا، دەیانبات بۆ جێگایەکی دوور. دوای سەفەرێکی دوو سەعاتی بە ناو شەودا، بە ناو چیا و جەنگەڵی کپ و خەوتوودا، هەموو گەنجەکان لە کەمپی یەکەمی مەشق و پێگەیاندندا دادەبەزن، کەمپی شینوا. وێنەی درەختە بەرزەکان و هەناسەی دڕندانەی جەنگەڵ و کزەی ساردی چیا دوورەکان هەستێکی نامۆیی قووڵ لە ئاڵ مورادا دروستدەکەن، بەلاَم گەنجەکانی دی دڵخۆشن، گەنجەکانی دی وەک بەرەو باغی ڕزگاربوونی ڕۆح و جەستەیان بڕۆن بە پرتاو دادەبەزن و خۆیان دەکەن بە کەمپەکەدا.

«هیچ کەس باسی خەونەکەی نەدەکرد. گەرچی هەموومان ئەو شەوە و شەوانی دواتریش ئەو خەونەمان بینییەوە، بەلام هەستمکرد بوونی ئێمە لێرەدا پەیوەندی بە خەونەکەمانەوە نەماوە. گەنجەکان لە ڕۆژی یەکەمەوە خۆیان لە مەشقی سەختدا نوقمکرد. من هەم جورمم بچوک و هەم بە هۆی ئەوەی دەبووَ بەردەوام چاویلکەم لە چاودا بێت، ڕەنجێکی زۆرم دەکێشا، هەولی خۆمم دەدا لاوازییەکانم دەرنەکەوێت و کەس تێنەگات من حەزم لەم کارە نییە. بۆئەوەی کەس نەزانێت چۆن بیردەکەمەوە هەموو شتێکم دەکرد تا وەک ئەوانی تر دەربکەوم، سرووودەکانی بەیانیم بە حەماسەتەوە دەخوێند، واجباتی پاسەوانی و ئێشککگریم بێ هیچ دواکەوتن و لادانێک دەبردە ڕێوە، بەلام لە زۆربەی مەشقەکانی جەستە و وەرزشە سەختەکاندا لەشم نەیدەکرد، نە تواناى هەلگرتنی کێشی قورسم هەبوو، نە بڕەوی جەنگاوەرێکی ڕاستەقینە لە هەلمەت و پاشەکشەدا، لاوازیی قاچەکانم بەجۆرێک بوو هەموو دەیانبینی چۆن دەلەرزێت. ڕۆژێک ڕاهێنەرەکەمان، کە ئەفسەر نەجمی ناوبوو، بانگیکردم و لە بەرچاوی هەموو گەنجانی مەشقگا پێیگووتم «تۆ دلنیایت بە ئەسل خەلکی دێلاواریت «. گووتی «ئەم لاوازییەی تۆ بۆتە پرسیار بۆم، بە ڕاست دەبێت ڕۆلەیەکی دێلاوار هەبێت هێندە لاواز و قوول باریک و مل پەتک بێت، تۆ دلنیایت دەتەوێت بۆ ئەم نیشتیمانە جوانە و بۆ ئەم میللەتە ڕەسەنەی خۆت ببیتە جەنگاوەر؟ «. من تەنیا سەرم داخستبوو و هیچم نەدەگووت. دەبوو هەر کاتێک ئەفسەر نەجم پرسیاریکرد وەلامی بدەیتەوە، لە کامپی شینوا هیچ کەس بۆی نەبوو وەلامی پرسیار نەداتەوە. دوای ئەوەی ئەفسەر نەجم پرسیارەکەی دووجار دووبارەکردەوە، من بە دەنگێکی لاواز وەلامدایەوە «بەلێ گەورەم ، حەزدەکەم ببم بە جەنگاوەر بۆ دێلاوار». دەبوو ئەو وەلامە دە جار بە دەنگی بەرز دووبارەبکەمەوە، دەبوو بە هەموو هێزم بقیڕێنم و هەموو فەسیلەکەمان گوێیان لێ بێت. من لە ناخی دلەوە درۆمدەکرد، دەمویست

بڵێم بەڵێ من کەسێکی لاوازم و تینێک لە لەشمدا نییە و بەرگەی ئەم مەشقانە ناگرم. لە ماوەیەکی کەمدا من بووبووم بە نیشانە بۆ لاوازیی، بەو کەسە تەنیایەی لە سوچێکدا دادەنیشێت و خۆی بە خوێندنەوەی کتێبێکەوە سەرگەرمدەکات تا منداڵە بیزێ و سەر بە هەواکان وازی لێبهێنن. من گەرچی لەو فەرمان و ئیشانەدا کە پێویستییان بە هێز و تاقەتی جەستەیی قورس هەیە، مایەی پێکەنین بووم، بەڵام لە نیشانەشکاندن و پێکانی ئامانجدا، لە سەلیقەی بەکارهێنانی تفەنگدا توانایەکم تێدابوو کە تا ئەو کات هەستم پێ نەکردبوو ... لە مەشقی هەڵوەشاندن و بەستنەوەی چەکدا، لە دەست ڕاستیدا، لە دەرهێنانی تەوەر و خاڵی سەر نەخشە بەیانییەکاندا بۆ هاوەن هاوێژان، یەکەم بووم. ئەو وریاییەم تا ئەندازەیەک لە گوناهی بەخشیم و توانیم کارێک بکەم لەگەڵ هەموو دەردەسەری و سەختییەکدا، بەردەوام سەرشۆڕ نەبم. زۆر لە منداڵەکان خۆیان بە ئەسڵانچی ناودەنا، ڕۆژانە چەند سەعاتێکیش وانەی تیورییمان هەبوو کە نوسینەکانی سەی ئەسلانمان دەخوێند. مامۆستاکەمان کە جەوانمەردی ناوبوو، هاوڕێیەکی نزیکی سەید و یەکێک لە قوتابییە دێرینەکانی بوو، هەموو ڕۆژێک وانەکانی بەوە دەست پێدەکرد کە خاکی موبارەکی دیلاوار دەبێت بە هەر چواردەوردا لە دوژمن پاکبکرێتەوە. من تا ئەو کات شتێکی زۆرم لەسەر جوگرافیای دیلاوار نەدەزانی، ئەو هەموو ڕۆژێک یەکەم شت نەخشەیەکی دیلاواری هەڵدەواسی و دەیپرسی «کوڕان، ئێرە کوێیە؟ » هەموو بە یەک دەنگ دەمانگووت « ئێرە دیلاوارە، سەرزەمینی شێران». ئەو لەسەر نەخشەکە بازنەیەکی سووری بە دەوری هەموو دیلاواردا دەکێشا و دەیگووت «کوڕینا، ئەی ئێرە کوێیە؟ » . هەموو بە یەک دەنگ دەمانگووت «سەرزەمینی دوژمن ». هاواریدەکرد «کوڕینا دوژمن، ناوی چییە ؟ ». هەموو بە یەک دەنگ دەمانگووت «دوژمن ناوی دوژمنە، گرنگ نییە کێیە و ڕەنگی چییە، ئەو هەر کێیە، دوژمنی ئێمە یە و لە نەوەی دوژمنە». ئەوە

ڕستەیەکی مامۆستا ئەسڵان بوو کە لەسەر دیواری مەشقخانە و لە سەر دەرکی گۆڕەپانی مەشقەکەش نوسرابوو».

ئال موراد هەموو هاوینی لە مەشقگا بردەسەر، سەرەتای پاییز دەبوو بگەڕێتەوە بۆ دێلاوار. کە گەڕایەوە بێئەوەی بە خۆی بزانێت، ئەندامی چالاکی «باغەوانەکانی دێلاوار» بوو. سەیربوو یەکەمین کارێک باغەوانەکان کردیان کوشتنی باڵندەکان بوو.

# ١٦

پرۆفیسۆر بەهنام دەیزانی من دەترسم، گووتی «شتێکت پیشاندەدەم کەم کەس پێشتر بینیوێتی. هەر کات سەیری چاوی یەکێک بکەم و بزانم بە ڕاستی دەیەوێت لە مێژووی شارەکە تێبگات، هەستدەکەم دەبێت ببینێت و بیزانێت. باوەڕم بە هەڵگرتنی نهێنی نییە لە مێژوودا، بەڵام هەندێ ڕاز حورمەتی خۆیان هەیە و دەبێت بیانپارێزین. بە تایبەت دیلاوار پڕە لە مێژوونوسی بێمێشک». دوو قات بە پلەکانەیەکی درێژ و تاریکدا چووینە خوارێ، گەرچی هەندێ گلۆپ لەسەر پلەکە و لە ناو ساڵۆن و لە ڕاڕەوەکاندا داگیرسابوون، بەڵام لە چاو گەورەیی جێگاکاندا، ڕوناکییەکان کز بوون و هەموو شتێکیان ڕۆشن نەدەکردەوە. ساڵۆنی مۆزەخانەکە پڕ بوو لە مێز و دۆلابی تایبەت بە هەڵگرتنی ئاسەواری دێرین، چەندەها هەڵگریی شوشەیی بۆ پاراستنی ئاسەوارەکان دانرابوون. پێشانگاکان پاک ڕاگیرابوون و بە تیشکێکی زەرد و مات ڕوناککرابوونەوە. پرۆفیسۆر بەهنام نەیهێشت لە هیچ جێگایەکدا بوەستم و گووتی «سەرەتا پێویستە گرنگترین شتی مۆزەخانەکە ببینیت، دەستنوسی دانیال... گرنگترین بەڵگەنامەیەکی مێژوویی کە وێنەی نییە، بەڵگەیەکی گەورە دژی هەموو ئەوانەی گومان لە بوونی دانیال دەکەن، بەڵگەیەک بە بڕوای من لە بەڵگەکانی تۆفانی نوح، یان نغرۆبوونی سەدوم و ئامۆرا بۆ دیلاوار گرنگترە». منی بردە

ژوورێکی تاریک کە دەرگایەکی ئاسنینی زۆر ئەستووری هەبوو، خۆی دەستی کێشا و لە جێگایەکی تایبەتدا گڵۆپەکانی هەڵکرد. ژوورەکە یەک دۆلابی ئاسنی گەورەی تێدابوو، بە دەستەیەک کلیلی تایبەت کە پێدەچوو تەنیا لای خۆی هەبێت، دەرگاکەی کردەوە، سندوقێکی گەورەی دەرهێنا، ئەو سندوقەشی کردەوە و کتێبێکی کۆن و کاڵەوەبووی دەرهێنا، کۆنترین کتێبێک تا ئەو کاتە لە ژیانمدا دیبێتم... دڵنیانەبووم ئایا پەڕەکانی لە کاغەزن یان لە جۆرە مادە و کەرەستەیەکی تایبەت، کە خەڵکی دێرین بۆ نوسین ئامادەیانکردوە. بە دەنگێک کە زۆر ئاسایی بوو، دیاربوو نایەوێت شتەکەم لا تاریک وترسناک بکات گووتی « کتێبی دانیالە... کۆنترین تێکستێکە لە مێژووی دێلاوار مابێتەوە، دەستنوسی یەکەمی کەسێکی نەناسراوە، نوسەرەکەی دیار نییە کێیە. ئەو هەموو شتێکی وەک خۆی گێڕاوەتەوە، وتەکانی دانیال و چیرۆکەکەی گواستۆتەوە... دەبوو مامە سیات بێت و بیبینێت. ماوەیەک لە مەوبەر ڕۆژێک بە ڕێکەوت لە سەر ڕێ بینیم و پێمگووت، وەرە شتێکی سەیرت پیشاندەدەم، بەڵام نەهات... دەبوو بێت و بە دەستی خۆی هەڵیگرێت. ناوێرم کتێبەکە ئاشکرابکەم یان چاپی بکەمەوە یاخود ناوەڕۆکەکەی لە بۆنەیەکی گشتیدا یان لە ڕۆژنامەیەکدا بخەمە ڕوو. دانیال تا ئەمرۆ دوژمنی زۆرە، کتێبەکە واسەیردەکرێت وەک ئەوەی دانیشتوانی دێلاوار بەوە تاوانباربکات کە کوشتەی خەون و خەیاڵ و واهیمە و ترسەکانی خۆیانن، کارەسات لە ناخی مرۆڤ خۆیدایە، دوژمن سەرەتا لە خەونەکانی ئینسان خۆیدا لەدایکدەبێت. دەڵێن دانیال هەمیشە پێش کارەساتەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان، بە شێوەیەکی ئاماژەیی، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەم ڕاستییە بیر خەڵک بهێنێتەوە. من کەسێکی خورافاتی نیم، بەڵام باوەڕێکی زۆرم بەم چیرۆکەیە. چاپکردنی کتێبەکە مەحاڵە ... چەند ساڵ لەمەوبەر ویستم چاپیبکەم، بەڵام کار گەیشتە ئەوەی هەڕەشەی سووتانی مۆزەخانەکە بکەن، کتێبێکە دەڵێت دێلاوار لە بنەوەڕا

لەسەر ستەم دروستبووە، ئەوە قسەیەکە دڵی زۆر کەس خۆش ناکات. ئیدی وازم لێهێنا».

خەندە گەورەکەی هەر لەسەر ڕوخساری بوو، بەڵام من ئێستا جۆرێکی تر دەمبینی، شتێک لە ڕەمز و ڕازی ترسناک پەڕیبووە سەر سیمای پرۆفیسۆر کە زۆر دوودڵی کردم. گووتی «کتێبەکە بگرە، بیگرە، تا تۆش شاهید بیت کە کتێبی دانیال بوونی هەیە. کێ دەزانێت ڕەنگە ڕۆژێک تۆ یان یەکێک لە نەوەکانی تۆ بتوانن ئەم کتێبە چاپبکەن». من کتێبەکەم وەرگرت و بە دوودڵییەکەوە گووتم «بەڵام جەنابی پرۆفیسۆر من نازانم دانیال کێیە؟». کتێبەکە سەنگێکی زۆری نەبوو، بەڵام هێندەی هەڵمگرت غەمگینییەکی کتوپڕ دایگرتم، ویستم زوو بیخەینەوە جێگای خۆی و لەو جێگایە دەرچین. پرۆفیسۆر وەک بزانێت من ترسێکم لە جێگاکە هەیە، دەستی خستە سەرشانم و کتێبەکەی وەرگرتەوە و گووتی «نا مەترسە، مەترسە، من هێندە خورافاتی نیم باوەڕم بەوە بێت دانیال دەگەڕێتەوە، لەوانە نیم کە ئەمڕۆ بە ڕابوردوو دەپێون. مێژوو پڕە لە دۆخی دووبارە، بەڵام دڵنیابە کوڕم، شتێک کە سەدان ساڵ لە مەوبەر ڕوویدابێت ئەمڕۆ وەکو خۆی، وەک دۆخی دێرین دووبارە نابێتەوە. مێژوو لە لێکچوون دروستبووە نەوەک لە دووبارەبوونەوە، ئەوە دوو شتی جیان. ئەوەی ئێستا ڕوودەدات گەر لەوەی کۆن دەچێت، هۆکەی ئەوە نییە نەفرەتێک هەیە لە کۆنەوە دوامان کەوتووە. من مێژووم خوێندۆتەوە، شتێکی وا نییە. زۆرجار پێچەوانەکەی ڕاستە، ئێمە ئەو وێنەیە دەدەین بە ڕابوردوو کە ئێستا پێویستمان پێیەتی ... ئەوە ئێمەین نەفرەتی ئەمڕۆ بەسەر ڕابوردوودا دەبارێنین. دانیال گووتویەتی «جانەوەری ناو ناخی مرۆڤ هەر سەردەمە و خەونێک دەبینێت، بەڵام کارەسات هەر کارەساتە و تۆفان هەر تۆفانە»».

قسەکانی پرۆفیسۆر کەمێک ئارامیکردمەوە. پێکەوە گەڕاینەوە ناو

سالۆنەکە و بە پلەکاندا بردمی بۆ سەر بالکۆنێکی بچکۆلە. بینینی ڕوناکی لەو ساتەدا زۆر ئارامبەخش بوو. پرۆفیسۆر دوو کورسی هێنا و گووتی «دانیشە با چیرۆکی دانیالت بۆ بگێڕمەوە». من دانیشتم و بە هێمنی گوێم لە قسەکانی پرۆفیسۆر گرت.

« گوێبگرە، ئەم چیرۆکە وەک خۆی، بەو جۆرە کە من بۆت دەگێڕمەوە بۆ مامە سیاشت بگێڕەوە، بەلام نا ... نا... بە هیچ جۆرێک نا، ببورە. یەکێک زۆر بڕوات پێی نەبێت، یەکێک زۆر خۆشت نەوێت، نەزانێت دەتوانێت حورمەتی ڕاز و نیاز بگرێت، بۆی باس مەکە. هەندێ چیرۆک هەن، نابێت کەسانێک بیزانن کە تێناگەن چیرۆک حورمەتی خۆی هەیە. چیرۆکی دانیال وەک هەموو چیرۆکەکانی تری دونیا ڕەنگە بەشێکی خەیال بێت، بەلام بەشێکی ڕاستییە. دانیال دیل بووە... هیچ نەبووە جگە لە دیلێک وەک هەزاران دیل کە بە زنجیرەوە هاتوونە شاری زیندانە گەورەکانی سەر زەوی، شاری هەزار زیندان. هەندێ دەڵێن چەندین ساڵ لە زیندانێکدا ژیاوە کە ئەو کات زیندانی دوازدەهەمیان پێ گووتووە، کە هەڵبەت ئێستا ئاسەواری نەماوە و شوێنەکەی دەکەوێتە ژێر گەڕەکەکانی عەشرەتی شاهیلار. ئاشکرایە دانیال لە جێگایەکی زۆر دووری دونیاوە هاتووە، بازرگانەکانی دیلاوار بەرامبەر پارەیەک لە حاکمەکانیان وەرگرتووە و هێناویانە بۆ ئێرە. گەنجێکی جوان و زمانزان و پڕ ماریفەت بووە، دەگووترێت هەر بە هۆی زانینی زۆر و دەسەلاتی بەسەر هونەری جادودا گیراوە و ڕەوانەی دیلاوار کراوە، بەلام لە هیچ جێگادا چیرۆکێکی ڕوون و سەلمێنراوم نەبیستوە باسیبکات دانیال بۆ گیراوە. دانیال جیا لە زیندانەکانی تر زوو لە زیندان ڕزگاری دەبێت. دەڵێن هۆکەی ئەوە بووە، حاکمی دیلاوار تووشی گەڕی بووە، پێستی چەشنە زامێکی ڕەش خواردوێتی، جۆرە برینێکی بەد بەربۆتە لەشی و بە خێرایی جەستەی گرتۆتەوە. دەڵێن زام وەها گرتوویتی منداڵەکانی خۆشی نەیانتوانیوە تەماشایبکەن. پێدەچێت دانیال کە لە مەملەکەتێکی دوورەوە

هاتووە، خوێندکارێکی پزیشکی سەردەمی خۆی بوو بێت و لە شار و مەملەکەتی خۆیدا زانیارییەکی زۆری دەربارەی نهێنییەکانی دەرمانکردن و هەتوان گرتنەوە و مەرهەمسازی کۆکردبێتەوە. دەمێک حەکیم و پزیشکەکەکانی دێلاوار و دەوروبەر لە بەردەم ئەم دەردەدا دەستەوەستان دەبن، حاکم کەسی خۆی دەنێرێت بۆ ناو زیندانەکان و ڕایدەگەیێنێت، هەر کەسێک بتوانێت حاکم لە ئازارەکانی ڕزگاربکات و دەرمانێک بۆ دەردی بدۆزێتەوە، پاداشتەکەی ئازادیی دەبێت. دانیال تەنیا کەسێکە لە هەموو زینداندا، دێتەپێشێ و داوادەکات ڕێگابیدەن حاکم ببینێت. کە دانیال چاوی بە لەشی حاکم دەکەوێت، سەری لە سەختی برین و پیسی دەرد و قورسی داوەشانی جەستەی دەسوڕمێت، تا ئەو کات لەشێکی نەدیوە بەوجۆرە برین تەنیبێتی و زام سەرتاپای خواردبێت. دەڵێن دانیال بە حاکمی گووتووە، تۆ بەختەوەرترین کەسی دونیایت کە ڕێگات کەوتۆتە سەر ڕێگای من، گەر ڕێگام بدەیت مانگێک بۆ گەڕان بچمە کێوان، گژ و گیای پێویست کۆبکەمەوە، لە ماوەیەکی کەمدا دەتکەمەوە بە مرۆڤەکەی جاران. حاکم کە ناوی لوتفولای نەسیر بووە، دەکەوێتە گومانەوە. کەسانی نزیک و ڕاوێژکارانی دەوروبەر ئامۆژگاریدەکەن، یاسا و ڕێسای زیندانەکانی دێلاوار نەشکێنێت و بەم غەریبەیە بڕوا نەکات کە پێ ناچێت جێگای متمانەبێت، بەڵام حاکم کە دەرد و نائومێدی زۆری بۆ هێناوە، هیچ ڕێگایەکی نییە جگە لەوەی متمانە بکات و ژیانی خۆی بداتە دەست ئەم حەکیمە گەنجە. دانیال مانگێک لە کەژ و پیدەشتی ئەم هەرێمانەدا گیا کۆدەکاتەوە و ئاوێتە دروستدەکات و مەرهەم دەگرێتەوە. کە دەگەڕێتەوە دەکەوێتە سەر کار و لە ماوەیەکی کەمدا حاکم وای لیدێت دەست بە هەندێ کاروباری ڕۆژانەی خۆی بکاتەوە. دەڵێن لە ماوەی ساڵێکدا حاکم تا ئەندازەیەکی زۆر بۆتەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی و لە پاداشتی ئەو دەرمان و چارەیەدا، دانیال ئازاد دەکرێت و ئیدی ناگەڕێتەوە زیندان. هەندێ دەڵێن بووە بە پزیشکی تایبەتی

خێزانی لوتفولا نەسیر و هەندێکیش دەڵێن نا، هەر وەک مرۆڤێکی ئاسایی لە کەنار دەریاچەی دیلاوارماڵێکی دروستکردوە و تیا ژیاوە. دوای چەندین ساڵ لەوە، کە دانیال بۆتە هاولاتییەکی دیلاوار، ڕۆژێک لە ماڵ دێتەدەرێ و ڕوودەکاتە کۆشکی فەرماندار و لە بەردەم حاکمدا سەر دادەنەوێنێت و ڕستەیەک دەڵێت کە هەموو مێژووی دیلاوار دەگۆڕێت. ڕستەکە لە هەموو جێگایەکی سەر زەمین ئاسایی و بێ مانایە، بەلام لێرە، لەم مەملەکەتەدا کە هەزاران ساڵ خەونی دەرکردوە، هەموو شتێک هەڵدەتەکێنێت. دانیال بە ئەسپایی و بە ترسەوە دەڵێت: جەنابی حاکم، ئەمشەو خەونم بینیوە. ئەم ڕستەیە وەکو تەزوویەکی ترسناک بە لەشی فەرمانڕەوادا دەڕوات، ڕستەیەکە لەو جۆرە ڕستانەی کە مێژووی ولاتێک سەر لە بەر دەگۆڕێت. حاکم دەزانێت ئەم ڕستەیە چەندە سامناکە، بەلام بە هێمنی داوا لە دانیال دەکات خەونەکەی بگێڕێتەوە. خەونەکەی دانیال سەرەتا شتێکی گرنگ دیار نییە، کۆمەڵێک پەڵە هەوری سوورن کە بارانێک دەبارێنن وەک خوێن، بەلام هەر زوو هەورەکانی دانیال لە هەموو دیلاواردا دەنگدەداتەوە. پێش دانیال هیچ ئادەمیزادێک لە دیلاوار خەونی نەبینیبوو، هەورەکانی دانیال یەکەمین خەونی دیلاوارن، وە یەکەمین خەونی دیلاواریش هەڵگری مژدەی کارەسات و نوخشەبەری خوێنە ... خەونێکە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ لەگەڵ خۆیدا بۆنی ترس و زەنگی کارەسات دەهێنێت. چیرۆکی دانیال لەو خەوەدا دوایی نایەت، حاکمی دیلاوار ترسێکی گەورەی لێ دەنیشێت کە خەونەکە درم بێت و وەک تاعون بلاوبێتەوە، هەر ئەو ڕۆژە فەرمان دەدات دانیال بگرنەوە و لە زیندانێکی چەپەک و دووردەستدا دیلیبکەن، بەجۆرێک هیچ کەس لێی نزیک نەبێتەوە ... بەلام هەر ئەو شەوە، شتێکی سەیر ڕوودەدات، هەر ئەو شەوە لوتفولا نەسیر، حاکمی بە زەبر و دڵڕەقی دیلاوار، خۆی خەون بە هەورەکانەوە دەبینێت، هەورە خوێنینەکانی دانیال ... هەورەکانی کارەسات».

# ١٧

لـە کۆتایـی هەفتـەدا دەرگای عیادەکەمـان داخسـت. مامـم بـە دەسـتی خـۆی تابلۆیەکی نوسـی و هەڵیواسـی، لەسـەر تابلۆکـە نوسـرابوو «تکا لـە هەمـوو ئەو برا و خوشکانە دەکەیـن کـە بـۆ سـەردانی دکتۆری دەروونناس سیامەند زەریـاواری دێنـە ئێرە، لـە هەفتـەی داهاتـووەوە ڕووبکەنـە بنکـەی یـەک بـۆ تەندروسـتی دەروونی لە سـەر شـەقامی شـەهرەیار، شـوێنی زیندانە کۆنەکەی بنەماڵـەی شـوکور ئاغـا ... سـوپاس بـۆ هاوکاریتـان».

داخسـتنی عیادەکـە بـۆ مـن مایـەی دڵتەنگـی و بەدبەختـی بـوو، ئـەوێ جێگایەکی پەنـا بوو کە تێیدا ئاسـوودە و دڵ ئارام بـووم. تا دوای چەنـد ڕۆژ لە داخسـتنی عیادەکـە مامـە سیام پەیوەندییەکی پێوە نەکردم و نیشـانەیەکم لێوە نـەدی بەڵگـە بێت کـە بیر لـە دوا ڕۆژی مـن دەکاتـەوە. مـن نەمدەزانـی ڕۆژانـی داهاتـوو چـی ڕوودەدات و دەبێـت مـن لـە نـاو ئـەو دونیـا جەنجاڵـە تازەیـەدا چـی بکـەم. مـن باوکیشـم لـەو کەسـانە بـوو گـەر منداڵەکانی بێئیش و بێ موچـە بوونایـە، گینگڵـی زۆری دەدا و مـەراق دایدەگرت. کەچـی ڕۆژانـی دوای داخسـتنی دەروونخانەکـە شـپرزەیی و تەنگەتاویـم پێوە نەبینـی. بـەڵام خـۆم بـە پێچەوانـەی جارانـەوە بێخەیـاڵ نەبووم، ترسـێکی ناوەکیـم تێدا بـوو، بۆ یەکەمجـار لـە خۆمـم دەپرسـی بۆ کوێ دەچـم و چـی دەکـەم. ئـەو ماوەیـە بۆ ئـەوەی خەیاڵاتـی خراپ لەسـەرم دەربکـەم، زیاتـر خەریکـی خوێندنـەوەی

کتێب بووم، لە ژوورەکەی خۆم نەدەهاتمە دەرێ و بێئەوەی لەزەتێک لە خوێندنەوە ببینم، کتێب لە دوای کتێب تەواومدەکرد. دوای نزیکی مانگێک ئێوارەیەکیان کەسێک لە دەرگای ژوورەکەی دام و گووتی « ڕێنوار... بیکەوە، هەندێ کارم پێتە». دەنگی مامە سیام بوو کە دیاربوو هەواڵێک و بڕیارێکی تایبەتی بۆ من پێیە. قاتێکی ڕەشی پۆشی بوو، چاویلکەیەکی نوێی دانابوو، سەعاتێکی نوێی کردبووە دەست و هاتبوو. گووتی «ببورە، لەسەر ڕێگادام، لەگەڵ باوکت و مامە شەهاب و منداڵەکان دەچین بۆ شایی کچەکەی غەفوری زەریاواری، گووتم پێش ئەوەی بڕۆین هەندێ شت هەیە پێتی بڵێم». دەنگی زۆر وشک و حاکمانە بوو «من ئەم ماوەیە خەریکی دامەزراندن و دۆزینەوەی خەڵکی پێویست بووم بۆ شێتخانەکەی دیلاوار. ئێستا چەند ڕۆژە ئیش دەستی پێکردوە و هەموو شت ڕێک و پێک دەڕوات. جێگاکە بە کەڵکی مرۆڤی لاواز نایەت، کەسانێک خەیاڵی ئینسانییەت و شت زۆر پەرییتە سەریان، لەو ئیشەدا غەمی زۆریان دەبێت. من ڕێزی زۆرم بۆ بۆچوونەکانی تۆ هەیە، بەڵام من دواجار لەوێ بەڕێوەبەری شێتخانەم، سەرپەرشتی باغچەیەک نیم بۆ ساوایان تا نەرم و نیان بم، سەروکارمان لەگەڵ هەندێ شێتی ترسناکدایە، من ئەو ڕاستییانەم بە سەعیدی باوکت و برا و خوشکەکانیشت گووتووە، کە هەموو غەمی تەندروستی دەروونی تۆیانە. هەموو دەزانین تۆ ماوەیەک زۆر سەرکەوتووانە لای من ئیشتکردوە، ئێستاش هەستدەکەن دووبارە چوویتەوە سەر ژیانی گۆشەگیریی جاران. دەمانەوێت شتێکت بۆ بکەین لە ئیش و لە ژیان دوورنەکەویتەوە، کەسمان ئەوەمان پێخۆش نییە، کوڕێکی گەنجی وەک تۆ بێئیش لە ماڵەوە بکەوێت، بە تایبەت من. گەر دەتەوێت لە شێتخانەکە ئیشبکەیت، دوو سبەی بەیانی وەرە بۆ ئەوێ، بەڵام کەمێک سەبر و تەحەمول لەگەڵ خۆت بهێنە ... من وەک گووتم، پێویستیم بە تۆیە».

لە ڕاستیدا ڕێگام زۆر لە بەردەمدا نەبوو، دەبوو هەوڵبدەم سەرچاوەیەکی

ژیان و داراییم دەستبکەوێت، بەڵام شانسی کارکردن و دۆزینەوەی ئیشێک بتوانم سەربەخۆ پێی بژیم، کەم بوو. دەمزانی ماوەیەکی کەمی دی باوکم دەمخاتە سەر یەکێک لە کارە سەخت و بێپشووەکانی خۆی و دوای ماوەیەک ناچاردەبم هەم لە ماڵ هەڵبێم و هەم لە کار. دەبوو هەرچۆنێک بووە و تا دەرفەتێکی گونجاوترم دەستدەکەوێت، گوێ لە مامە سیام بگرم و بچمە ژێر باری داواکانی. کێشەی گەورەم ئەوە بوو، من کەسێکی توندوتیژ نەبووم بەرامبەر ئادەمیزادان، بەڵام نەمدەزانی گەر توندوتیژیی ببینم چی دەکەم.

ڕۆژی یەکەم کە گەیشتمە ناو زیندانە کۆنەکەی «شوکور ئاغا» مامم پێشوازیی لێکردم، ڕووی خۆش و کەمێکیش پڕ غرور بوو، هەستمکرد ئاسەواری ئەو کینە کۆنەی ڕۆژانی پێش داخستنی عیادەکە هێشتا لە دڵیایەتی، بەڵام وەها جوان دەستکێشە سپییەکانی هەڵکێشابوو، وەها گورج و گۆڵ و مەتین دەردەکەوت، بینینی دڵی دەکردەوە. دەمزانی دکتۆرێکی بێ بەهرە و سەرنەکەوتووە، بەڵام لەو ساتەدا ئەوە تاکە شتێک بوو بۆم گرنگ نەبێت. هەمیشە پڕ بوو لە شتی سەیر، لە ناکۆکی چاوەڕوان نەکراو، دڵنیابووم هەموو کاتەکە وەک لەسەر پشکۆ بێت چاوەڕوانی منی کردوە. وەک میوانێکی تایبەت پێشوازیبکات لە بەرم هەستا و یەک وچان و بێ پچران، دەستی بە یەکێک لە وتارەکانی خۆی کرد و گووتی « ڕێنوار، باش بوو هاتی، ئینسان دەبێت واقعی بێت، لە خۆرهەڵات ناتوانیت بە خەڵک بڵێیت ئارام بگرن، کەس گوێ ناگرێت، خۆت دەزانی من دەمویست شاعیر بم. بەڵام شاعیریی لەم ڕۆژەدا کەس ناپارێزێت، مەسەلەکە خۆپاراستنە، دەمەوێت لە جێگایەکی ئەمیندا بین، هەم من، هەم تۆ، هەم هەموو تایەفەی زەریاواری... گوێبگرە ئەم تایەفە مەلعونەی ئێمە هیچ وەخت هەوڵیان نەداوە لە حوکمڕانیدا بەشێکیان هەبێت، ئێستا من خۆشحاڵم کە بووم بە پادشای شێتەکان، بە حاکمی شێتەکانی دیلاوار، ئەوە پلەوپایەیەکی

کەم نییە، هەر کەس لێی پرسیت دەتوانیت بە شانازییەوە بڵێیت مامم حاکمی شێتەکانە… پادشای شێتەکانی دیلاوار… هێزم لە هێزی حاکمەکان کەمتر نییە». هەستمکرد بە ڕاست هەست بە مەزنی و گەورەییەکی تایبەت دەکات. دوایی بە بێباکییەوە گووتی «سەردەمێکی پڕوپوچ بەڕێوەیە، شاعیر بەکەڵکی ئەم ڕۆژانە نایەت. گەر دەتەوێت ئارامی بەرقەرار بێت، دەبێت کوتەکت پێ بێت. لە شێتخانە بین یان لە دەرەوە هەمووی یەک شتە. بەڵێ گەر خەڵک شتی باشتری هەبێت، وەک سەیران و گەڕان و خوێندن و ڕابواردن شەڕناکەن، بەڵام کە هەموو ئەم شتانەت لە مرۆڤەکان حەرامکرد دەبنە جانەوەر. خەڵکی شێت نابن بەڵکو دەبن بە جانەوەر و تەواو … من لێرە هیچ شێتێکی تەواو نابینم، بەڵام جانەوەری تەواومان زۆرە. بەخێربێیت بۆ بنکەی تەندروستی دەروونی لە دیلاوار. دەتەوێت بتکەم بە چی… دەتەوێت هەر لەگەڵ خۆم بیت یان کارێکی ترت پێبسپێرم. شارەکە پزیشکی دەروونی تێدا نییە، خۆت دەزانیت… تۆ بۆ ئەوە باشیت کەمێک قسە لەگەڵ نەخۆشەکان بکەیت، هەموویان شێتی تەواو نین. ئاە… هیچ کەس شێتی تەواو نییە، هەتا منیش شێتی تەواو نیم». وایگووت و قاقا پێکەنی، زۆر کەم لەگەڵ مندا پێدەکەنی. دەیویست زۆر کراوە و ئاسوودە دیار بێت. مامم کەسێکی مەزاجی بوو، بەڵام تا ئەو کاتە ئومێدم وابوو، هەم وەک پیاوێکی زانست، هەم وەک تاکە پزیشکێک کە خەڵکی ڕووی تێدەکەن، ڕەوشتی کاری خۆی بپارێزێت.

من بە مامم گووت «ئەوەی من داوایدەکەم، تەنیا بەزەیی و ڕەحمەتە بۆ نەخۆشەکان، بەزەیی و ڕەحمەت و هیچی تر. من تۆم بینیوە بۆ نەخۆشەکان گریاویت، تۆم بینیوە یەخەی ئاسمانت گرتووە، تۆم بینیوە کە غەم بەر گەرو… ». دەستی ڕاوەشاند و پێی بڕیم و بە توندی گووتی «بەزەیی دابەزاندنە لە قەدری مرۆڤ. باسی بەزەیی مەکە، من لە جێگایەکدا بڕیاری خۆمدا. بەڵێ من زۆر بۆ نەخۆشەکان گریاوم، لەوانەیە لە

داهاتووشدا بگریم، دڵنیاشم دەگریم. هەڵبەت کە من ئینسانێکی بە ڕەحمم، تۆ من بەچی دەزانێت. بەڵام ڕێنوار، کە شێتەکان زۆر دەبن، پزیشکەکان جگە لەوەی لیس هەڵبگرن، قامچی بوەشێنن، تفەنگ هەڵبگرن چاری تریان نییە. من دکتۆرم و دەزانم، هەندێ نەخۆش یەک چارەیان هەیە، تفەنگ هەڵبگریت و گوللەیەک بنێیت بەسەریەوە و پێی بڵێیت دەبڕۆ دەی، ئەوە عیلاجی تۆ. تا ئەو کاتەی کە عیادەی خۆمم هەبوو، دەترسام شتی وابڵێم، بەڵام ئێستا موچەخۆری دەوڵەتم، وەک فەرمانبەرێکی باڵای دەوڵەت مافی ئەوەم هەیە بڵێم هەندێ نەخۆش پێویستە تیربارانبکرێن و تەواو، ناشێت ژیان لە هەموو شارەکەدا بکەوێتە بەر مەترسییەوە، ئێستا هەموو شتێک بەرەو گۆڕان دەچێت و منیش بەشێکم لەم جیهانە گەورەیە. ئیتر قسەی ناوێت. لە تۆ وایە من بە خۆشحاڵییەوە بڕیارمداوە توندوتیژبم. شەڕ تا دێت زیاتر دێتە ناو شارەکەوە. بەڵێ، من کە عیادەکەم داخست لە بەرئەوە بوو دڵنیابووم کە شەڕ دەستی پێکردوە، هەموو جێگایەک ئێستا گۆڕەپانی جەنگە. ئینسان لە دیلاوار چۆتە دۆخێکەوە لە عاتیفە تێناگات، عاتیفە بۆتە شتێکی زیان بەخش. ڕاستە من بۆ نەخۆشەکان دەگریم... بەڵام تۆم بۆیە هێناوە یارمەتیم بدەیت، بەشێک لە ئازارەکەم لەگەڵ هەڵبگریت. شێتخانە وایە دەبێت یەکێک ئازارەکان هەڵبگرێت». وای گووت و گووتی «دوامکەوە با نەخۆشخانەکەت پیشانبدەم، دوامکەوە، ژوورێکم هەیە بۆ هێورکردنەوەی نەخۆشەکان، بۆ لاواندنەوەیان، بۆ ئەوەی ئینسانییەتیان پیشانبدەیت ... ناوم ناوە ژووری ڕەحمەت، تۆ دەکەم بە بەرپرسی ئەو ژوورە، خۆت کەسێک هەڵبژێرە هاوکارت بێت، بۆت هەیە یەک هاوکارت هەبێت»

تەنیا چەند ڕۆژێک بوو خەستەخانەکە نەخۆشی وەردەگرت، ژمارەیەکی زۆر لە شێتەکانی پۆلیسخانەی ناوەندی گوازرابوونەوە بۆ ئەوێ. لە مامە سیام پرسی «چەند کەس لێرە ئیشدەکات؟». گووتی «زۆرن، زۆر زۆرن، لە هەفتەی پێشوودا هەشتا کەسمان دامەزراندوە، بیست و پێنجیان ژنن،

لێرە دەبێت ئاگات لە چاو و دەست و ئەخلاقت بێت. بەیانیان هەشت تا دوانزە نەخۆش وەردەگرین، خۆم لە نۆدا دەگەمە ئێرە ... تۆش ڕۆژانە لە نۆوە لێرەبە».

نەخۆشخانەکە کۆنە زیندانێکی گەورەبوو، کە لەگەڵ تێپەڕینی زەماندا، هەندێک بەشی بەجۆرێک داڕوخابوون، کەڵکی نیشتەجێبوون و بەکارهێنانی پێوەنەبوو. زۆر جێگای کۆن و شێدار و پێویستی بە چاککردن بوو، هەندێ شوێنی درزی گەورە کەوتبووە دیوارەکان، بەڵام هەندێ بەشی هێشتا بە کەڵکی نیشتەجێبوون دەهات، لەو بەشانەدا ژوورەکان بە ئەساسێکی هەرزان و پەڕپووت و کۆن ڕاخرابوون، لە چەندین جێگادا دەیان کرێکار کاری چاککردنیان ئەنجامدەدا. پتر لە شەست ژووری زیندانەکە پڕکرابوون لە نەخۆش. کۆمەڵێک ژووریش بۆ پاسەوان و فەرمانبەران و ئۆفیسی تایبەتی مامم. کاتێک لەگەڵ مامە سیامدا بە سەنتەرەکەدا گەڕام، هەستم نەکرد مامم وەک پزیشکێکی دەروونی کە ئەرکی چارسەری نەخۆشەکانی لەسەرشانە ڕەفتاردەکات، زیاتر بە پیاوێک دەچوو کەشتییەکی گەورەی کۆنی کڕیبێت، بیەوێت چاکیبکات تا دووبارە بیخاتەوە ناو دەریا. ڕەفتاری جیاوازبوو لەگەڵ ئەو کاتەدا کە پێکەوە لە عیادەکە کارماندەکرد، بە شانازی و فەخرێکەوە کە پێشتر کەم لێم بینیبوو، گووتی «گەر بتوانین جێگاکە بە تەواوی چاکبکەین، هەزار نەخۆش زیاترمان دەبێت. نیازم نییە ئێرە بکەمە تەمەڵخانە... ئەوانەی دێنە ئێرە دەبێت ببنە مرۆڤی سوودبەخش، یان بۆ جەهەنەم، شوێنی تر هەیە بیاننێرم. یەکێک لە پرۆژەکانم ئەوەیە کە نەخۆشەکان بخەمە کار... شتێکیان پێ بکەم ... باوەڕدەکەم ئیشی سەخت دەتوانێت مرۆڤ لە دەروونی خۆی دووربخاتەوە. گرنگ ئەوەیە لێرە کارێک بکەین ئینسان لە دەروونی خۆی نەڕوانێت. دێوێک هەیە هەزاران ساڵە خەوتووە، ناوی دەروونی ئینسانە، لێرە ناتوانین بەسەر ئەو دێوەدا سەربکەوین، بەڵام دەتوانین دووریبخەینەوە، خۆمان وا لێبکەین وەک ئەوەی

نییە، نایبینین، هەستی پێ ناکەین... ئەوە تەنیا دەرمانێکە لەم وێرانەیەدا من بتوانم بیبەخشم».

ئەو هەستەی کە دەسەلاتی بە سەر چارەنوسی سەدان مرۆڤدا هەیە، شانازی و غرورێکی ترسناکی پێ بەخشیبوو. وەک فەرماندەیەک قسەیدەکرد، نەوەک پزیشکێک.

لەگەڵ ئەوەی هەتاوی هاوین لە دەرەوە هێشتا گڕدار و بەتین بوو، بەلام ڕاڕەوەکان سارد و نسرم بوون. گەرچی نەخۆشەکان، زۆر نەبوو بەندەی ئێرە بوون، بەلام زۆریان ترساو و ڕەنگ زەرد دەیاننواند. لەگەڵ ئەو ترسەی ناوچاویشیاندا هەستم بە گڕی توڕەیی دەکرد. زۆربەیان نیشانەیەکی ئەوتۆی شێتیان پێوە دیارنەبوو، ڕوانین و قسەکردن و مۆنییان ئاسایی بوو. هەندێکیان کە ئێمەیان بینی وەک دیلی ئاسایی سلاویانکرد و پرسیان «دکتۆر کەی دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ماڵێ». مامە سیام بە خەندەیەکی شەیتانی و مەکربازەوە کە خاڵی نەبوو لە گاڵتە و بەدکاری گووتی «لە کاتی خۆیدا ... لە کاتی خۆیدا». هەستمکرد مامم زۆر دڵخۆشە، لەشێکی سووک و خەیاڵێکی ئاسوودەی هەیە. دوای ئەوەی گەشتێکی خێرامان بە بیمارستانەکەدا کرد، پێش ئەوەی دەستکێشەکانی دابکەنێت و دەستی بە پاکژاو بشوات، دەستی خستە سەرشانم و گووتی «هەموو دکتۆرێکی دەروون لە ناخیدا ئومێدێکی گەورەی هەیە، ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێتە خاوەنی شێتخانەی خۆی».

لە ڕۆژی دواییەوە دەستم بە کارکردن کرد. ڕۆژی یەکەمی کارکردنم شتێکی ئەوتۆم نەکرد، ژوورەکەمم کەمێک ڕێکخست و کەلوپەلەکانم خستە ناو دۆلابێکی بچوک و کەوتمە گەڕان بە نەخۆشخانەکەدا. شوێنەکەم وەک زیندانێک هاتە بەرچاو نەوەک بیمارستان و سەنتەری دەرمانی نەخۆشان. ئەوانەی لەوێ دامەزرابوون زۆربەیان ژنان و پیاوانێکی بەهێز بوون کە

تەنیا هێز و توانای بازوویان حیسابکرابوو. ئیشیان لێدان و کۆنترۆڵکردن و ڕاکێشان و بەستنەوەی نەخۆشەکان بوو، نەوەک دواندن و لاواندن و گوێگرتن. زۆرینەیان نەخوێندەوار بوون، یان تەنیا کوێرەخەتێکیان هەبوو بتوانن ناوی خۆیان بنوسن و بخوێننەوە. بەڵام دەستێکی زیرەک، کە هەر دەستی مامە سیام خۆی بوو، زیندانەکانی کردبووە سێ بەش، شێتەکان و نیوشێتەکان و عاقڵەکان... ڕۆژی یەکەم لە گەشتەکەمدا سەرنجی جۆرە دابەشبوونێکی وەهام نەدا، بەڵام ئەو ڕۆژە بینیم کە دابەشکردنێکی وەها بیمارستانەکەی کردۆتە سێ کەرتەوە. «شێتەکان» هەندێ بوون لە جیهانی داخراوی خۆیاندا دەژیان، گروپێکی بچوک بوون کە هاتنیان بۆ سەنتەر پەیوەندییەکی بە خەونەکەی دیلاوارەوە نەبوو. زۆربەیان فایلێکی بچوکیان بۆ کرابووەوە، جگە لە دوو سێ دێڕی بچوک کە پتر وەسفێکی سەرزارەکی خێرا بوو، شتێکی ورد و زانستی لەسەر دۆخیان نەنوسرابوو. هەندێکیان کۆمەڵێک نوسراو و بەڵگەی تر هەڵپێچی فایلەکانیان بوو، ڕاپۆرتی هەندێ پزیشکی دیکە کە تایبەت نەبوون بە بواری دەروونی. لەلای شێتەکان مرۆڤ دەیتوانی نیشانەی بێئاگایی تەواو، دابڕانی هۆش، ئازاری وەسواسە کوشندەکان ببینێت. بەڵام نیوشێتەکان مرۆڤگەلی غەمگین و تەنیا و ئەفسوردەبوون، خەڵکانێک کە کێشە و مەراق و حەسرەتێک لە دونیای دابڕیبوون. زۆرینەیان ئازاری عەشق، دەردی خیانەت، خەنجەری ناجوامێرانەی دۆست تووشی غەمۆکی قووڵی کردبوون، بێباوەڕییان بە مرۆڤ لە ژیان دابڕیبوون، وەک ڕەگەزێکی لاواز و بێدەنگ دەیاننواند، کەسانێک بوون کەڵکی ژیانیان پێوەنەمابوو، بووبوون بە بار بە سەر خێزان و بنەماڵەکانیانەوە، بە جۆرێکی سەیر لە سەر هێڵی نێوان ژیان و مردندا وەستابوون، نە ئەوەبوو بمرن، نە ئەوە بوو بژین. ئەم گروهە هێمنترین گروپ بوون، کەمجار دەنگە دەنگ و هاواریان تێدەکەوت، بە پێچەوانەی عاقڵەکانەوە یان شێتە عاقڵەکان وەک مامم ناویدەنان،

کە گرووپێکی ترسناکی پڕ جموجۆڵ بوون، زۆربەیان لەوانە بوون کە خەونەکە ڕاپێچی ئەم جێگایەی کردبوون، هەندێکیان بە ڕاستی شەڕانی و پڕ ئاژاوە بوون، کێشەیەکی دەروونی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام نائارام و تووڕە و جەنگخوابوون. ڕۆژی یەکەم و دووەم شتێکی وەهام نەبینی، زۆربەی کاتەکەم لە ژوورەکەی خۆمدا بردەسەر، شوێنەکەم ڕێکدەخست و هەوڵمدەدا لەگەڵ جێی تازەمدا بسازێم.

لە ڕۆژی سێهەمدا مامم بانگیکردم و پارچە کاغەزێکی دایە دەستم و گووتی «بچۆ بۆ بەشی پەروەردە و تەمێکردن، لەوێ هەندێ نەخۆش هەیە وەریانگرە». من تا ئەو کات بەشی پەروەردە و تەمێکردنم نەبینیبوو، دەبوو لە بەشی باشووری سەنتەرەکەوە، بە پلەکانەیەکی تایبەت دابەزیتە ژێر زەمینێکی گەورەوە، کە پێدەچوو لە زەمانی زوودا بۆ عەمبارکردن بەکارهێنرابێت. شوێنەکە چەندین مێزی درێژی کۆن و ئەستووری لێ بوو کە لە داری قایم و تەختەی فرە ئەستوور دروستکرابوون ، بە مێخی ئاسنینی درێژ نرابوون بەیەکەوە، شێوەی سەنعەت و ناڕێکی لێوارەکان و گرێی سەر ڕووکاری مێزەکان نیشانەی ئەوەبوون بەرهەم و دەستکاری ئەم سەردەمە نین، دیاربوو لە دێر زەمانەوە لێرەن و سەنتەرەکە دووبارە خستوونییەوە بەر کار. تێپەڕینی زەمان و شێی ئەم ژێر زەمینە و کەمی ڕوناکی ڕەنگی تەختەکانی تۆخکردبوو، بەجۆرێک هەندێکیان ڕەش دەیاننواند. مامم ئەو مێزانەی وەک جێگایەک بۆ بەستنەوە و تەمێکردنی نەخۆشەکان دیاریکردبوو، لە ژێر زەمینەکەدا نزیکی دە پیاو و ژنی زۆر زل کاریاندەکرد، بەشی ژنان بە حەسیرێکی کۆن لە بەشی پیاوان جیاکرابووەوە. هێندەی پێت دەخستە ناو ژێر زەمینەکەوە، بۆیەکی تایبەت پێشوازی لێ دەکردیت، بۆنی زەمانێکی بەسەرچوو تێکەڵ بە بۆی یەقێکی توند و شێیەکی ئازاردەر، جۆرە بۆیەک هەم وەسفی و هەم بەرگەگرتنی بۆ من ئاسان نەبوو. هەموو ژن و پیاوەکانی ئەوێ وەک مامم دەستکێشیان لە دەستدابوو، بەر لەوەی

من هیچ شتێک بڵێم جووتێک دەستکێشی سپیان دامێ و گووتیان ئەوە فەرمانی دکتۆر سیامەند زەریاوارییە. چ پیاوەکان و چ ژنەکان جزمەی درێژیان هەڵکێشابوو، بەروانکەیەکی قاوەیی تۆخیان لەبەرکردبوو، جلەکانی ژێرەوەیان پێکڕا ڕەشێکی قەترانی بوو. شێوەیان پتر لە قەساب دەچوو تا کەسانێک لە بیمارستانێکی دەروونی ئیشبکەن. سەرۆکی بەشەکە نیمچە دێوێک بوو، کەسێک چوار هێندەی من بە هەیکەل بوو، ناوی خۆی نابوو «تەمێکاری گەورە»، هەمووان بە « وەستا سەلاحەدین» بانگیاندەکرد. بە فەرمانێکی مام دەبوو کارمەندانی سەنتەرەکە یەکدی بە «چاودێر» بانگبکەن، بەلام لە بەر هەر هۆیەک بێت، ئەم پیاوە زلە کە پێشتر وەستای دروستکردنی خانووبەرە بوو، هێشتا هەر ناوی دێرینی خۆی پاراستبوو، کەس بە چاودێر بانگی نەدەکرد، هەموو وەستای گەورەیان پێدەگووت.

ئەو کاتەی من یەکەمجار پێم خستە ژێرزەمینەکەوە، هەستم نەکرد جێگایەکی ترسناک بێت، ڕاستە دیمەنەکان هێمن و دڵئارامیان نەکردم، بەلام لە نیگای یەکەمدا شتێکی وەها وروژێنم نەبینی ئازارم بدات. بەلام تەنیا مرۆڤی کەمژە بە نیگای یەکەم فریو دەخوات، دیمەنی یەکەمی شتەکان هەمیشە درۆزن و نادروستە... نا من باوەڕێکی ئەوتۆم بە قوولایی نییە، بەلام لە نێوان ڕوکەش و قوولایی تاریک و نادیاردا ڕوویەکی تر هەیە، ڕوویەک نە ڕوونی و ڕۆشنی درۆزنانەی دونیای ڕوکەشی هەیە و نە تاریک و نەبینراویی دونیای ناوەوە، کە هیچ کەس نازانێت بوونی هەیە یاخود نا، لەوێدا لە ئاستێکی دیدا کە نە دەکەوێتە سەر ڕوو و نە دەکەوێتە قوولاییەوە، حەقیقەت نوستوە، ئەو جێگایە، جێگایەکی میانەیی و ناوەڕاست نییە لە نێوان سەرەوە و خوارەوەدا، بەڵکو لایەنێکی ترە کە مرۆڤ پێویستی بە چاوێکی تر هەیە بیبینێت، وەک خودی ژیان کە کورتناکرێتەوە بۆ وەزیفەی هیچ ئەندامێکی جەستەمان، بەڵکو پنتێکی نهێنی و نادیارە لە ناوەڕاستی ئیش و جوڵەی هەموو ئۆرگانەکانماندا. ئەو ڕۆژەش کە چووم

بۆ بەشی پەروەردە و تەمێکردن دەمزانی ڕوکەشی ئەم جێگایە و ڕوکەشی هەموو دیلاوار درۆیەکی گەورەیە... لەوێشدا بۆ پنتێکی نادیار دەگەڕام، کە گرتن و دۆزینەوەی، وەک گرتن و بینینی خودی حەقیقەت وەها بوو لام. وەستا سەلاحەدین، وەک بزانێت من برازی بەڕێوەبەری سەنتەرەکەم، بە خەندەیەکی پان و ڕیاکارانەوە پێشوازی لێکردم، پارچە کاغەزەکەی مامە سیامی وەرگرت و پێکەنی. لە چەند دەقیقەی یەکەمدا سەرنجمدا کە ژێردەستەکانی خۆی بە «فەعلە» بانگدەکات. پێشتر ئەو وشەیەم لە هیچ جێگایەکی دی نەبیستبوو، بەڵام شێوازی هەڵسوکەوت و جۆری پێکەنینەکەی و تۆنی دەنگی هەستێکی ناخۆشیان تێدا دروستکردم. بینیم بەردەستەکانی لە دەوری تەباخێکی گەورە وەستاون و سەرقاڵی دروستکردنی خواردنێکی تایبەتن. هەموو بە شتێک لە ترس و گومانەوە سەیریاندەکردم. پێدەچوو بە هۆی تازەیی و یەک نەناسینەوە هێشتا شەرمێکی تەنک لە نێوان ئیشکەران خۆشیاندا مابێت، بەڵام ئەو شەرمە بەشی ئەوە نەبوو لەگەڵ نەخۆشەکاندا بە ڕەحم بن. نەخۆشەکان دوو گەنج بوون، من هیچ شتێکم لە سەر کێشەکەیان نەدەزانی، بەڵام وەستا سەلاحەدین، منی بردە ژوورێکی پشتەوە، بۆ جێگایەکی تاریک، لەوێ دوو گەنجی زامدارم بینی کە سەرتاپایان خوێن بوو، بەجۆرێکی دڕندانە ئەشکەنجەدرابوون. وەستا گووتی «ئەوە دوو تەمێکراوەکەن، هیوادارم دکتۆر بە دڵی بێت». بینینی دوو نەخۆشەکە لەو دۆخەدا تووشی پەشۆکانی کردم. پرسیم «کێ وای لەمانە کردوە؟». وەستا سەلاحەدین بە هێمنییەوە گووتی «جەنابی مامۆستا، ئێمە وامان لێکردون، بەپێی ئەو ڕێنمایی و داواکارییانەی لە جەنابی دکتۆرەوە بۆمان هاتوون». من هیچ تێبینییەکم لەسەر قسەکانی نەدا و بە کەمێک دلگرانییەوە گووتم «بیانکەنەوە با بیانبەم». هەر دوو گەنجەکە لەسەر دوو مێزی درێژ ڕاکێشرابوون و دەستیان بە کەلەپچەیەکی زنجیردار بە کۆڵەکەیەکی دیکەوە بەسترابوو. دەموچاوی نەخۆشەکان

بـە جۆرێکـی خـراپ زامداربووبـوو، دیاربـوو کەسـێک بـە کەرەسـتەیەکی ڕەق چەندیـن جـار کێشـاویێتی بـە شـان و ڕانیانـدا، لەشـیان لـە زۆر لاوە شـین بووبـووەوە، دەموچاویـان لەسـەروو بـرۆوە و لـە لای لێوەکانیانـەوە زامـی خوێنینـی پێوەبـووە. مـن بـە وەسـتام گـووت «تکایـە، دەموچاویان بۆ خاوێنبکەنەوە و جلی تەواویان لە بەربکەن و گەر توانـای ڕۆیشـتنیان هەیە، بابێنـە دەرێ، مـن لـە بـەر دەرگا چاوەڕوانیاندەکـەم». بینینی برینەکانیان تورە و دەهـری دەکـردم. دوو نەخۆشـەکە زۆر هێمـن دیاربـوون، ئاشـکرا توانـای قسـەکردنیان نەبـوو. منیـش لـە ڕاسـتیدا نەمدەزانـی چییـان لەگەڵدا بڵێم. شـتێکم لـە مێژووی ژیانیان نەدەزانـی، بـەڵام بینینیـان ئاهێکـی قووڵـی لـە ناخدا چاندم. دەترسـام هێدی هێدی ئـەم دیمەنانـە ببێتـە شـتێکی ئاسـایی، ڕۆژێـک بێـت و ئـەم جۆرە ڕەفتارانـە ئازارم نـەدەن. مـن دەسـتەپاچە و بێچـارە خـۆم دەبینـی، ویسـتم دەمودەسـت لەگـەڵ پەیکـەری تێکشـکاوی نەخۆشـەکاندا بچمـە لای مامـە سـیام، بـەڵام دڵنیابـووم بـە موحازەرەیەکـی درێـژ دەربـارەی گرنگـی ترسـاندن و تەمێکردن بێدەنگمـدەکات و مـن جورئـەت ناکـەم هیـچ بڵێم. ئەوەی نەمدەتوانـی ڕەق و بێپـەردە هەمـوو ڕازی دڵـم ڕۆکـەم، زۆر ئـازاری دەدام. بـەڵام هەسـتمدەکرد هەرجـۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیـەک لەگـەڵ مامـە سـیام مانای کۆتایـی ئـەم ئیشـەم و دەسـت پێکردنـی سـەرگەردانییەکی گـەورە. مـن یەکێـک بـووم لـە هـەزاران گەنجـی تـر لـە دیـلاوار کە هیـچ شـتێکمان نەبـوو بیکەیـن، جگـە لـەوەی بژیـن، زیندووبیـن، بچینـە ئـەو جێگایانـەوە کە بۆمـان دیاریدەکـەن... دەبـوو بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان بیسـەلمێنین کـە شایسـتەی ئـەو هەوایەیـن کـە هەڵیدەمژیـن، مـن زۆرجـار لـە نـاو خێزان و لـە بنەماڵەمدا پێیـان دەگووتـم شایسـتەی ئـەو هەوایـەش نیـم کە هەڵیدەمژم، شایسـتەی ئـەو نانـە نیـم کـە دەیخـۆم، شایسـتەی ئـەو پێخەفـە نیم کـە تێیدا دەخـەوم. ئێمـە لـە دیلاوار هـەزاران گەنـج بوویـن کـە بـەو جـۆرە دەژیایـن، لە ژێر بـاری قەرزێکدا بوویـن کـە دەبـوو بیدەینـەوە، دەبوو بیسـەلمێنین کـە شایسـتەی ئەوەیـن هـەوا

هەڵمژین، نان بخۆین، پێخەفی خۆمان هەبێت. من لە ناخمدا گەرچی دەمزانی ئەم قەرزاربارییە چ بێداد و ناهەقە، بەڵام شتێک وای لێدەکردم نەتوانم لێی هەڵبێم، من گەرچی لە هوشیاریمدا دڵنیابووم قەرزداری کەس نیم، بەڵام گرێیەک لە ناخمدا وایدەکرد بەردەوام خۆم بە گوناهبار بزانم. بەجۆرێک لە جۆرەکان هەموومان لە دیلاوار هەستماندەکرد کە شایستەی ژیان نین، هەموومان پێمان وابوو قەرزێکی قورسمان لەسەرە کە جارێک دەبێت بیدەینەوە... دەبوو شتێک بکەین تا خۆمان پاکژبکەینەوە و بیسەلمێنین کە شایەن بە ژیانین. ئەو ڕۆژە تاقیکردنەوەیەکی قورس بوو بۆ من ... تا ئەو کات بەردەوام لە خۆمم دەپرسی، چۆن خەڵکی دەتوانن ببن بە پاسەوان، بە زیندانەوان، بە کۆیلە، بە سەربازی ملکەچ، بەڵام ئەو ڕۆژە کە دوو گەنجە زامدارەکەم لەگەڵ خۆمدا هێنایەوە بۆ ژوورەکەم، هەستمکرد ئێستا بە ڕوونی ئەو گوشارە سەختە دەبینم کە مرۆڤەکان تووشی دێن دەمێک تێکەڵ بە کار و کردارێکی سامناک دەبن. دوو نەخۆشەکە بەسەختی بە ڕێگادا دەهاتن، تا ڕادەیەکی زۆر توانای قسەکردنیان نەبوو. ستراتیژی ئیشکردنی مامم ئەوەبوو، دوای تەمێکردنێکی قورسی نەخۆشە بزێو و نەسرەوتەکان، لەگەڵیان دانیشین و ئارامیانبکەینەوە و دڵنیاییان پێ ببەخشین. دەبوو نەخۆشەکان هەر دوو دەموچاوەکەمان ببینن، هەم دەموچاوە دڵڕەقە کوشندەکەمان، هەم دەموچاوە نەرم و تیمارکەر و ئارامبەخشەکەمان. دەبوو کەسانێک لە بیمارستانەکەدا گوناهبکەن و کەسانێکیش باری ئەو گوناهە بگرنە ئەستۆ و لە بری هەموو ئەوانی دی داوای لێخۆشبوون بکەن. من ئەو کەسەبووم کە ئێستا دەبوو ئەو کارە بکەم. هێندەی بیمارەکان گەیشتنە ژوورەکەی من، بێ خواستی خۆم، بێئەوەی پێشوەخت بیرم لێ کردبێتەوە، چوومە بەردەمیان و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە داوای لێبووردنم لێکردن. گووتم «من ڕێنوارم، من بە ناوی خۆم و هەموو مرۆڤێکی بە ڕەحمی سەر زەمینەوە، داواتان لێدەکەم بمانبورن... من نازانم ئێوە چیتان

کردوە، ئێوە چی دەکەن، بەلام گوناهی ئێوە هەر چییەک بێت، لەم ساتەدا وەک گوناهی ئێمە گەورە نییە، ئێستا گوناهباری گەورە منم بمبەخشن».
هەر دوو نەخۆشەکە سەرسام سەیریاندەکردم. من وەک بارانی بەهار فرمێسک لە چاوانم هاتەخوارێ، پێشتر نەبووە وا دڵ پڕبم. نەخۆشەکان هەر سەراسیمە سەیریاندەکردم، من دەمزانی ئەم ئازارەی دەیکێشم، ئازارێکە لە بری هەمووان ... من لەو ساتەدا بە فرمێسکەکانی خۆم، داوای لێبوردنم بۆ هەموو گوناهبارەکان دەکرد. گریانێک لە ڕێگایەوە هەستمدەکرد، وەزیفەی خۆم لەم بیمارستانە تازەیەدا جێبەجێدەکەم، کە ئیدی نانی ئەوە دەدات بە من کە بگریم و بەسەر دەستی قوربانییەکاندا بنوشتێمەوە و لە بری هەمووان، لە بری خەڵکی دێلاوار، لە بری هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی، لەبری زەمین و لە بری ئاسمان داوای لێبوردن لەم نەخۆشە بەستەزمانانە بکەم کە زۆریان بە ناهەق کەوتبوونە ئێرە.

# ١٨

پرۆفیسۆر بەهنام بە هێمنی لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەی بەردەوام بوو ، هەستمدەکرد هەموو شتێک دەکات تا من ئارام گوێبگرم. گووتی «بەڵێ حاکمی دێلاوار هەمان ئەو خەونە دەبینێتەوە کە دانیال دەیبینێت. هەمان ئەو هەورانە، هەمان ئەو ئاسمانە، هەمان ئەو بارانە. موسیبەت لەوەدایە کە خەونەکە بەجۆرێکی خێرا بڵاودەبێتەوە، حاکم بۆ بەیانی پیاوانی خۆی دەنێرێت بۆ ناو شار و ڕایاندەسپێرێت کە باس و خواسی نێو خەڵک هەرچییەک بێت بۆی کۆبکەنەوە، هەواڵدز و کونجکۆلانی فەرماندار هەر زوو هەواڵی تێکچوونی شیرازەی شار و بڵاوبوونەوەی ترس و دوودڵی بۆ حاکم دەهێننەوە، خەونەکەی دانیال هەموو ئەو ئارامی و جێگرییە دێرینەی تێکداوە کە مەملەکەتی ڕاگرتووە... بەڵێ ... جگە لە دانیال خەڵکانێکی تریش دەڵێن هەمان خەونیان بینیوە. فەرماندار دەستەوئەژنۆ و بێچارە دادەنیشێت و بۆ یەکەمجار هەستدەکات دێلاوار چیتر خاکی ئەو ژیانە ئاسوودەیەی جاران نییە. خەون مانای گەڕانەوەی شتێک ... هەموو لە دەرباری فەرماندار ئەو ڕاستییەیان دەزانی. ئاشوبێک لە دەرووندا سەری هەڵدابوو، بڵێسەی ئەو ئاشووبە گەیشتبووە ژێر عەرشی حاکمانی شار... گەیشتبووە ناو کوچەکانی دێلاوار. بەهەرحاڵ ... هەورەکانی دانیال وەک ئاگربن و لە دارستانێکی وشک بەربن بڵاودەبنەوە، شار دەکەوێتە ترسەوە، خەونەکە دەچێتە هەموو

جێگایەک و خۆی دەگەیێنێتە ناو زیندانەکانیش، هەورەکان لەم خەیاڵەوە دەپەڕنە ناو ئەو خەیاڵ، لەم سەردا دەبارن و دەگوازنەوە بۆ ئەو سەر، هەور و گەواڵەی ڕاستەقینە چۆن دەجولێت، ئاوا هەورەکانی سەری دانیال لەم سەرەوە بەرەو ئەوسەر دەجوڵێن، لە هەموو خەونێکدا دەبارێن، لە هەموو شەوێکدا دەردەکەون. خەونەکە ترسێکی ئەوتۆی تێدا نییە، بەڵام هەر کەس دەیبینێت دەزانێت سەرەتای جیهانێکی تر و دەستپێکی جۆرە ژیانێکی تازەیە. لە هەر سەرێکدا وەهم و خەیاڵ بڕەوێتەوە، هەورەکان زوو دەیگەنێ و تیا دەبارن. خەونەکە وا دەکات، هەندێ دێلاوار جێبهێڵن و بەرەو شوێنی تر سەری خۆیان هەڵگرن، دەڵێن چەند مانگ و چەند هەفتەیەک زۆرینەی خەڵک تەنیا ئەو خەونەیان بینیوە. فەرماندار دەنێرێت لە شارەکانی ترەوە موفەسیر و خەونخوێن دێن، هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە هەوری خوێنین مانای جەنگ، مانای هاتنی ئافاتی نوێ، دەستپێکردنی کارەسات. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی خەونەکەدا دێلاوار ئەو هەستە دێرینەی وندەکات کە شاری ئاسوودەی هەزاران زیندانە، شاری پێکەوە ژیانی شادومانانەی دیل و پاسەوانانە، بەڵکو وەک زەمینێکی ترساو خۆی دەبینێت کە دوژمن لە بۆسەدایە بۆی، نەیاران گەمارۆیانداوە و گەر لە خەو هەڵنەستێت، گەر نەبزوێ و شمشێری خۆی تا ئاسمان بەرزنەکاتەوە، دوکەڵ و خوێن دەیخۆن. ئیدی دەبێت سوپا و هێز و یەکەی خۆپاراستن و پەلاماری هەبێت. کتێبی دانیال دەڵێت «دەمێک کە هەوری خوێنین باری، هەموو شمشێرەکان، تەورەکان، چەقۆکان، دێنە دەرێ». لەو ساتەوە تا ئەمڕۆ دێلاوار بەدوای دوژمندا دەگەڕێت. ئەوەی زانراوە و لە هەندێ سەرچاوەدا تۆمارە ئەوەیە لە دێلاوار ترسێک و ڕقێکی زۆر بەرامبەر دانیال دروستدەبێت، دانیال بەو سیحربازە دەزانن کە سەری سندوقێکی پڕ ئافاتی هەڵداوەتەوە، شتێک دێلاوار سەدان ساڵ لە بیر خۆی بردۆتەوە، ترسێک دێلاوار سەدان ساڵ لە خۆی تەراندوە، دڕندەیەک دێلاوار سەدان ساڵ لە تاریکییەکانی ناخی خۆیدا

دیلیکردوە... ئەو دێت و یەکجار ئاشکرایدەکات. بەڵام دانیال خۆی بەبێگوناهـ دەزانێت، بۆ گوناهباربێت؟ دانیال چی کردوە؟ ئەو کێیە جگە لە کەسێک کە بوێری ئەوەی تێدابووە خەونێک ببینێت و بیگێڕێتەوە.

هیچ خەونێک بە تەنیا نایەت و بە تەنیا نامێنێتەوە، زۆر نابات خەونێکی تر دێتە پێشێ، خەونێکی کاریگەرتر و مانادارتر لە خەونی پێشوو. هەورەکان لە جێگای خۆیان دەمێننەوە، بارانە سوور و خوێن ڕەنگەکە وەک خۆی هەر دەبارێت، بەڵام لە خەونە تازەکەدا بۆ یەکەمجار خەڵکی خۆیان دەردەکونەوە، ئەو کەسەی خەون دەبینێت، خۆی لە خەونەکەدا دەبینێت ... ئەو کات لایان سەیربووە ئینسان خۆی خەونی خۆی ببینێت... بیهێنە پێشچاوی خۆت دەبێت یەکەمین خەون چۆن بووبێت، لە خەوندا جۆرە ژیان و بوونێکی تریان بینیوە کە هیچ لە پتەوی و خۆگریی ژیانە ڕاستەقینەکەی خۆیانی نەبووە. لە کۆنەوە تا ئێستا خەڵکی لە خەوندا تەنیا پەرێشانی و ترس دەبیننەوە. خەون بۆ ئەو دەم و زەمانەی دێلاوار وەک ئەوە بوو لە ناکاو دەمی چاڵێکی گەورە لە ژێر پێی خەڵکدا کرابێتەوە، چاڵێکی تاریک. مرۆڤ ئەوەی بەسە کە بزانێت دونیایەکی تر هەیە بۆ ئەوەی شیرازەی ژیانی تێکبچێت. چەندین ساڵ بوو خەڵکی دەڤەرە دوورەکان لە دێلاوار کۆدەبوونەوە تا خۆیان لەو چاڵە سامناکە بپارێزن، بەختەوەربوون کە بوونی دونیایەکی تر و ژیانێکی تریان لە بیر خۆیان بردۆتەوە. بەڵام ئێستا لە ناکاو هەمووان خەونیان دەبینی... هەورەکان دەیانسەلماند هیچ سەر زەمینێک نییە بەبێ خەون. لەم خەونە تازەیەدا دانیال خۆی وەک جەلادێک دەردەکەوت، وەک دوژمنێک، وەک قەسابێک، زۆر کەس دەیانگووت دانیال دەبینن سەریان دەبڕێت. هەموو دێلاوار دانیالیان دەناسی، بینیبوویان، ئێستا لە ناکاو لە کونجی زیندان دەردەپەڕی و بازیدەدایە ناو خەونەکانیان ... ڕەنگە بینینی دانیال تەنیا واهیمەیەک بووبێت، یان ڕەنگە لە هەر ئان و زەمانێکدا بەر لە کارەساتەکان دانیال ناوی ئەو خەونە بێت کە مرۆڤەکان لە هاتنی

کارەسات ئاگاداردەکاتەوە، بیریاندەهێنێتەوە کە چەقۆیەکی نهێنی لەسەر گەردنیانە. هەورەکانی دانیال ناوێک بوو بۆ کارەساتێک کە هەمیشە لە خەیاڵ و هەست و نەستی دێلاواردا بووە، لە ناکاو هەموو شارەکە دەگەنە پنتێک کە چیتر ناتوانن نیشانە و ئاسەوارەکانی کارەسات فەرامۆش و نادیدە بگرن. دەڵێن، دانیال خۆی لە ژێر ئەو شەستە بارانەدا دەرکەوتووە، بە چەقۆیەکی مشتوماهی درێژ و تیژ و بریسکەدارەوە، هەر کەس خەونەکەی دیبێت گووتوویەتی خۆیەتی، دانیالە. بەڵام هەر کەسەو لە ڕوخسارێک و لە جلێک و لە سیمایەکدا بینویەتی. ئاخۆ چیرۆکی ئەم جۆرە خەونانە دروستە؟ من مامۆستای مێژووم و شتێکی ئەوتۆ لە نهێنییەکانی ناخی ئینسان نازانم. دانیال دەرکەوتبێت یان نا... چووبێتە خەونەکانەوە یان نا، ئەو تەنیا پەیامهێنی کارەسات بووە، لەسەردەمێکدا کە زۆرینەی پەیامبەران، مژدەی درۆ و بەڵێنی ڕزگارییان داوە، دانیال وەک ڕیزپەڕ و نامۆ، مژدەهێنی بەدبەختی و پەیامهێنی کارەسات بووە. پەیامبەران دوو جۆرن، هەیانە پێشبینی کارەسات دەکەن و ئەوانی تر مژدەهێنی بەهەشت و ڕزگارین. دانیال بۆ دێلاوار، وەک نوح وایە بێ کەشتی، پەیامهێنی دەردە، ئادەمیزادەکان لە هاتنی وێرانە و کارەسات ئاگاداردەکاتەوە. بەڵام بۆ زۆر خەڵک دانیال دەبینن، بۆ کاتێک پێشەنگەکانی ئافات و وێرانەیی نزیکدەبێتەوە، کەسێکی وەک دانیال لە خەونەکاندا دەردەکەوێت ؟ . خەڵک چۆن ترسەکانی خۆیان دەدەن بەیەک، خەونەکانی خۆشیان دەدەن بە یەک... ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئاخۆ ئەمە بۆ ئەم سەردەم و ساتەی ئێمەش دەبێت؟ ئەوە مامت باشتر دەیزانێت، ڕەنگە تۆش بیزانیت... ئینسانەکان چۆن حەز لە ماڵی یەکتر، لە هاوسەری یەکتر، لە زێڕ و سامانی یەکتر دەکەن، بەوجۆرەش حەز لە خەونی یەکتر دەکەن، هەتا زۆرجار حەز لە مردنی یەکتریش دەکەن. مەرج نییە ئەو حەزە لە بەر ئەوە بێت خەونێک حەزی لێ دەکەن، جوان، خۆش یان ڕەنگاوڕەنگ بێت... نا شتی وەها نییە. مرۆڤەکان حەز لە ترسەکانی یەکتریش دەکەن، حەز لە ژان و ئێشی یەکتریش

دەکەن، حەز لە نەخۆشییەکانی یەکتریش دەکەن. ئایا دەبێت خەڵکی دێلاوار هەموو دانیالیان لە خەوندا بینیبێت؟ نا من زۆر باوەڕم بەمەیان نییە، هێند هەیە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی چیرۆکی خەونەکاندا، لەگەڵ پڕبوونەوەی کوچە و کۆڵان و زیندانەکانی دێلاواردا بە خەون، خەڵک بەربەیانێک لە جێگادا ڕابوون و هەموو پێویستییان بە دوژمنێک بوو، دوژمنێکی ئامادە، دوژمنێک کینە و نەفرەتی خۆیانی بەسەردا بڕێژن. لە مێژوودا تۆمارکراوە کە هەموو دانیالیان بەو کەسە بینیوە کە دەرگای دونیایەکی ترسناکی لێ کردونەتەوە، زۆربەی کتێبەکان وەک کەسێک باسیدەکەن کە دێلاواری پڕکردوە لە سام و دڵەڕاوکە و مۆتەکە و لە بری نەتەوەیەکی گەش و بێخەیاڵ، شارێکی پڕ ترس و دوودڵی دوای خۆی جێهێشتووە. لەو کاتەدا دانیال نوێنەری ئەو خاک و سەرزەمینە بوو کە خەڵکی دێلاوار لێی هەڵهاتبوون، ئەوەی باوباپیریان کردبوویان بە ژێر خاک و خۆڵەوە ئێستا لە گۆڕ هەڵدەستایەوە ... ئەوە مێژووی هەمیشەیی مرۆڤە، ئەو شتەی لێی ڕادەکات، هەمیشە دەگەڕێتەوە. بەڵێ کتێبەکە دەڵێت «یەکەمین سەربڕین نە لە سیاسەت، نە لە عەشق، نە لە تۆڵەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە تاریکی ناخەوە، لە قووڵایی خەونەوە هاتووە». خەون لەو سەردەمەدا لە حەقیقەت ئازاربەخشتر بووە، مرۆڤەکان هەندێ جار بۆ تەفسیری خەونێک، چەندین وڵات و مەملەکەت گەڕاون. دەڵێن حاکمی دێلاوار دوای ماوەیەک لە بڵاوبوونەوەی خەونی دووهەم ناردوێتی بە دوای دانیالدا، بەڵام ئەو نەیویستووە ببینێت، دەمێکیش لە زنجیردا کێشیانکردۆتە بەردەمی فەرمانڕەوا، بێدەنگ سەری داخستووە و هیچی نەدرکاندوە ... ئایا ئەمە چیرۆکێکی هەڵبەستراوە یان نا؟ نازانم. بەڵام ئاشکرایە شارەکە لە خرۆشان و نائارامیدا بووە، زۆربەی خەڵکی شار لە خەونەکانیاندا یەکێکی وەک دانیال دەبینن دەردەکەوێت و سەریاندەبڕێت. دیمەنەکان ترسناک و بە ئازار بوون، خەڵکانێک شەوان نەیانوێراوە بخەون، گەر چاویان بۆ وەنەوزێکی کورتیش لێکنابێت دانیالیان بینیوە. کتێبی دانیال

دەڵێت «خەڵک هەموو پێویستیان بە جەلادێکە سەریانببڕێت، پێویستیان بە جەلادێکی دیکەشە تۆڵەیان لە جەلادی یەکەم بۆ بکاتەوە، بەختەوەردەبن ببینن خۆیان چۆن دەکوژرێن، بەختەوەریش دەبن بۆ خۆیان بگرین، بەختەوەریش دەبن یەکێک تۆڵەیان بۆ بکاتەوە» ».

پرۆفیسۆر بەهنام وچانێکی گرت، بەڵام بەردەوام سەیریدەکردم، بەردەوام لێمی دەڕوانی، ئەو خەندە گەورەیە هەر لەسەر لێوانی بوو، کە هەندێ جار بێمانا دەهاتە پێشچاوم. من زۆر ماندووبووم، ڕانەهاتبووم وا بێوچان گوێ لە کەسێک بگرم. لە کاتێکدا ئەو پەرەگرافە کورتانەی لە کتێبی دانیال دەخوێندەوە، هەستم بە ترس دەکرد، وەک ئەوە بوو کتێبەکە نەفرەتێکی تێدا بێت و بترسم بەر من بکەوێت. گەرچی هەموو وشەیەکی بۆ من گرنگ بوو، هەموو دێڕێکی سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام زوو ماندوویکردم، ئیتر شتەکانم بۆ وەرنەدەگیرا و ڕستەکانم بۆ بەیەکەوە نەدەنرا. ئێستاش کە دەیگێڕمەوە، دوودڵم توانیبێتم هەموو قسەیەکی پرۆفیسۆر و هەموو واتەیەکی وەک خۆی بگەیێنم. پرۆفیسۆر پیاوێکی زیرەک بوو، گووتی «چیرۆکی دانیال مرۆڤ ماندوو دەکات. تۆ ئازادیت ئەم چیرۆکە دەگێڕیتەوە یان نا، ئەو خەونەی ئەمرۆ دەیبینن بە جۆرێک لە جۆرەکان دەچێتەوە سەر دانیال، تۆ کوڕێکی وریایت، گەر شتێک نەدرکێنیت، گەر ڕاستییەک بشاریتەوە، دەزانیت لەبەرچی نایدرکێنیت». لە ناخمدا هەستێکی سەیرم هەبوو کە مامە سیام ئەم چیرۆکەی بۆ گرنگ نییە. بە پرۆفیسۆرم گووت «من ماندووم و دەمەوێت پشوویەک بدەم». پرۆفیسۆرماندووبوونی منی خوێندەوە و پێکەنی، دەستیگرتم و گووتی «دەچینەوە نوسینگەکەی خۆم. لەوێ پشووبدە، دەنێرم نانێکی ئامادەت بۆ بهێنن، نان بخۆ، خۆت کەمێک بە کتێبەکانی کتێبخانە تایبەتییەکەی منەوە سەرقاڵبکە. من ئیشێکی بچوکم هەیە، جێبەجێیدەکەم و دێمە لات و چیرۆکەکەت بۆ تەواودەکەم».

# ١٩

دوای ئەوەی وێنەکانمان خستە بەر دەستی فەرماندار و حاکمی سەربازیی، ئیتر خەبەرم لێیان نەما. چەند ڕۆژێک دوای ئەوە عیادەکە داخرا و من گەڕامەوە بۆ ماڵێ و ژیانم ڕەوتێکی دیکەی گرت و چیرۆکی وێنەکانم تەواو فەرامۆشکرد. هێشتا هەفتەیەک بوو کە لە سەنتەری تەندروستی دەروونی کارمدەکرد، مامم بانگیکردم و گووتی «بۆ ئەوە بانگمکردویت پێت بڵێم، ئەمشەو لە تەلەفزیۆنی دیلاواردا وێنەکان بڵاودەبنەوە». من کەمێک نیگەران و سەرسام گووتم «عەجایەبە. بەڵام کاتێک وێنەی کەسێک بڵاودەکەنەوە کە بەس بە خەون بینراوە دەڵێن چی و دەبێت پاساویان چی بێت؟ شەرم نییە حوکمداران لە شارێکی وا گەورەدا کاری وابکەن؟ مایەی خەجاڵەتی نییە، خەڵک بخەنە سەر خولیای ڕاوی کەسێک کە بوونی نییە؟». مامە سیام گووتی «دەبێت ڕاستگۆبم لەگەڵت، من ئەندامی ئەو لیژنەیە بووم کە بڕیاری بڵاوکردنەوەی وێنەکانمان دا، هەفتەی پێشوو کۆبووینەوە. بڕیارەکە دەستەجەمعی بوو، هەموو بە یەک دەنگ گووتمان با وێنەکان بڵاوبێتەوە». من دڵتەنگ و نیگەران پرسیم «بەڵام بۆ؟ چ حیکمەتێک لەوەدایە، چ عەقڵێک ئەوە قەبووڵدەکات؟». مامم هەستا دەرگای ژوورەکەی داخست و بە وریایەوە چاویلکەکەی داگرت و بە هێمنی پاکیکردەوە و گووتی «دڵنیابووم تۆ پێت ناخۆشە. تۆ پێت وایە

ئەوەی لە نیگارەکاندا هەیە و هونەرمەندەکان کێشاویانە، هەر نیگارێکە و هەندێ نیگارکێش بۆ خەونێک کێشاویانە، بەڵام حوکمداران وانابینن، خەڵکیش وا نابینن. لای خەڵک ئەو کەسە بوونی هەیە... ئەوانەی خەونەکە دەبینن ناتوانن لەو هەوەس و هەوایە دەرچن کە پیاوی ناو خەونەکانیان حەقیقەتە. ئینسان هیچ کات ناگاتە جێگایەک بتوانێت بە تەواوی خەون و ڕاستی لە یەک جیابکاتەوە، بەردەوام ڕاستی دەبێت بە خەون و خەون دەبێتەوە بە ڕاستی، ئەوە سوڕێکی ئەبەدییە. بەڵێ ڕێنوار گیان، کوڕی خۆم، حوکمداران بە چاوێکی تر سەیری شتەکە دەکەن. پیاوانی دەوڵەت کە ئێستا من و تۆش یەکێکین لەوان، ناتوانن خۆیان بدەنە باری نەفامی و بڵێن ئەمە ڕەسمی ناو خەونێکە. کاری وا ناکرێت... هەموو ترسێک، هەموو وەسوەسەیەک دەبێت بەرگی حەقیقەتی لەبەربکرێت، هەر جار ترسێک بوو دەبێت ترسناکیش هەبێت. خۆت دەزانیت دۆخی دیلاوار نالەبارە، هەموو دەزانن شتێک هەیە هەڕەشەیان لێ دەکات. من بە لیژنەکەم گووت کە لە کۆمەڵێک نەفام و گەمژە دروستبوون، بەڕێزان خەونەکە نیشانەیە بۆ ئەوەی خەڵکی دیلاوار لە ژیانی خۆیان دڵنیانین، هەموو هەست بە ترس دەکەن، شارەکە نوقمی خەوف بووە، من و تۆش کە خەون نابینین ئەو ترسەمان هەیە، وجودی هەموومان پڕبووە لە نادڵنیایی. دەوڵەت دەبێت حسابی خۆی بکات... بۆ دەوڵەت چی گەر کەسێک یان سەد کەس خەونی ناخۆش ببینن. بەڵام ترسەکە زۆر بووە، پۆلیسخانەکان و خەستەخانە و زیندانەکان بەرناکەون، گەر خەڵک شتێکیان نەبێت پیا بتەقنەوە، ئەوکات بە یەکدا دەتەقنەوە، بە من و تۆدا دەتەقنەوە، بە حوکمڕاناندا دەتەقنەوە. دەبێت شتێک بدرێت بە دیلاوار... من وەک تاکە دەروونناسی شارەکە ئەرکێکی سەختم لەسەرە، دەبێت نەهێڵم بەلەمەکە نوقم بێت، من کارم سەختە، من کەس تێم ناگات، بۆیە پێم داگرت، من گووتم دەبێت ترسەکە لە واهیمە بێتەدەرێ، بیکەین بە بەری کەسێکدا، دەموچاوێک بدەین بە گوناهباران».

مامم لەو ماوەیەدا بووبوو بە ڕاوێژکاری فەرماندار و بە ئەندام لە لیژنەی لێکۆڵینەوەی قەیرانەکان. من کە ئەو قسانەم گوێ لێ بوو خەریکبوو بگریم، هەستمکرد هەرچی گومانێک لە دڵمدا سەبارەت بە مامە سیام دروست بووە لە جێگای خۆیدایەتی، هەستمکرد بۆ هەتاهەتایە ئەم پیاوەم لە دەستداوە کە لە هەر کەس زیاتر کۆمەکی منی کردوە، پیاوێک کە ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێکی دڵناسک بوو، کەچی تا دێت دەبێتە جۆرە مرۆڤێکی دی. مامم سووربوو من تێبگەیێنێت و بمخاتە سەر بڕوای خۆی، دەیویست هەرچییەکی کردوە، ڕێزی من لە دەست نەدات. زانی من دڵم گیراوە و هەواڵەکە غەمگینی کردوم، بە حەسرەتێکەوە گووتی « تێبگە... ئیشەکە لە ڕووی ناچارییەوەیە. دۆخی دێلاوار بە ڕاستی بەرەو خراپی دەڕوات، جەنابی حاکمی عەسکەری چەندین جار ئاماژەی بەوە کرد کە دەیەوێت بارودۆخی نائاسایی ڕابگەیێنێت. بە گیانی تۆ من نەمهێشت، بەڵام وەزع باش نییە. گەر وازبهێنین خەڵکی وەک ئەم ماوەیە پەلاماری یەک بدەن، وەرزێکی تر نابات هەموو دێلاوار دەبنە دوژمنی یەک، بنەماڵەکان دەکەونە گیانی یەک، کوڕی ئەم خێزان کوڕی ئەو خێزان دەکوژێت، هەر ئێستا خوێن کەوتۆتە بەینەوە، حیکایەتی ئەو مندالانەی لە قوتابخانەکەدا سووتان، دەیان خێزانی داوە بە یەکدا و بەس خودا دەزانێت چیتری لێ دەکەوێتەوە... چیت دەوێت؟ دەتەوێت گەنجەکان هەموو بکەونە ئەم شێتخانەیەوە... بە درندەم مەزانە، واجبێکم هەیە دەبێت جێبەجێیبکەم. دەبێت خەڵک بۆ تاوانبارێکی ڕاستەقینە بگەڕێن، دەبێت سەرقاڵیان بکەم، دەبێت شتێک هەبێت یەکیان بخات، هەستبکەن کە نزیکن لە یەک، خەڵکی شارێکن، منداڵی مەملەکەتێکن... لە هیچ دڵگران مەبە، لە هیچ دڵگران مەبە».

مامم زۆر هێمن و مەنتیقی قسەیدەکرد، گەر بیویستبایە قەناعەت بە کەسێک بهێنێت و خۆی وەک زانایەکی ئارام و لە سەرەخۆ نیشانبدات ئەو جۆرە تۆنەی بەکاردەهێنا. لە بەر ئەو شێوازی قسەکردنەی بوو، زۆربەی

خزمەکانمان بە زانایەکی گەورەیان لە قەڵەمدەدا. بە جۆرێک قسەیکرد، من لە پاڵ هەموو نیگەرانییەکانمدا شتێکم نەگووت و ناڕەزاییەکی تەواوم نیشان نەدا. بە بێسوودم زانی لەگەڵ مامە سیام بکەومە قسە و باسێکی توندەوە. بە سەرێک هەستمکرد ئەو لەسەر هەقە کە شارەکە بەرەو تێکچوون و دۆخێکی نائاسایی دەڕوات، بەسەرێکی تریش نەمدەزانی دەبێت چارە چی بێت و خۆم دەرمانێکم نەبوو بیخەمە سەر دەردی کەس.

ئەو شەوە تەلەفزیونی دیلاوار هاوشان بە بەیاننامەیەک وێنەکانی پەخشکرد، داوای لە هاولاتییان دەکرد، هەر کەس دەموچاوی ئەم تاوانبارە دەناسێتەوە، ڕادەستی بەرپرسانی بکات. بەیاننامەکەی دەولەت قسەی لە سەرهەڵدانی فیتنەیەکی ناوخۆ دەکرد، لە کەسانێک ئاسایشی گشتی تێکدەدەن، دەیگووت کە دوژمن بە هەموو شێوەیەک شپرزەیی و نارێکی دەخاتە دیلاوارەوە، هەموو فێڵ و مەکرێک بەکاردەهێنێت تا ترس بنێتە دڵی خەڵکی سفیلەوە، هاولاتییانی تووشی گومان کردوە و یەکێتی ڕیزەکانی گەلی لە یەک ترازاندوە. بەیاننامەکە دەیگووت خەونەکە نیشانەی یەکێتی و یەکڕیزی خەڵکی دیلاوارە، نیشانەی هەستکردنی ئەوانە بە مەترسییەکان. داوای هاوکاری لە هاولاتیان دەکرد کۆمەکیانبکەن لە دۆزینەوەی خەتاکارانێکدا کە ئاسوودەگی هاولاتیانیان تێکداوە و خاوەنی هێزێکی شەیتانیین و لە پشت تێکچوونی باری دەروونی ژمارەیەک هاونیشتیمانییەوەن. بەیاننامەکە بە زمانێکی رەسمی ورد داڕێژرابوو، وەک زۆربەی ئەو بەیاننامە سیاسیانەی لە سەد ساڵی ڕابوردوودا لە دیلاوار نوسرابوون، شتێکی ڕۆشن و ڕوونی تێدا نەبوو، جگە لە قسەکردن لەسەر دوژمنێکی ترسناک، لە هەڕەشەیەکی نادیار، وەک هەمیشە هانی خەڵکی دیلاواری دەدا یەکێتی خۆیان بپارێزن و دەرفەت بە بەکرێگیراوان نەدەن دزەبکەنە ناو هەست و هۆشیان، دەیگووت دوژمنان چاویان بە سەرکەوتن و گەشەی دیلاوار هەڵنایەت و بەردەوام لە بۆسەی ئەوەدان

ئەم ئازادییەمان لێ زەوتبکەنەوە.

من دڵنیابووم بڵاوبوونەوەی وێنەکان دەرەنجامی خراپی دەبێت، بەڵام باوەڕم نەدەکرد کار بگاتە هەندێ جێگای ترسناک. بۆ ڕۆژی دوایی سەدان وێنەیان لە جێگا گشتییەکاندا هەڵواسیبوو، وێنەکان لە هەموو جێگایەکدا بوون، تەواوی دێلاوار ڕاوی تارماییەکی دەکرد کە لە خەونەکانیدا دەیبینی... تەواوی دێلاوار بەدوای تاوانبارێکەوە بوو کە نەماندەزانی ئایا تەنیا زادەی خەونەکانمانە یاخود بوونەوەرێکی ڕاستەقینەیە. ئەو دیوارە هەمیشەییەی کە لە نێوان خەون و ڕاستیدا هەیە بە یەکجار ڕووخابوو، ڕووخانێکی وەها ئیتر دروستکردنەوەی ئەستەم بوو. ڕۆژنامەکان و تەلەفزیۆنەکان پەیتا پەیتا سێ نیگارەکەیان بڵاودەکردەوە، منداڵان لەسەر شەقام و کوچەکان بە پارەیەکی هەرزان دەیانفرۆشتن. هەر ئەو ڕۆژە ڕۆژنامەکان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ هەر سێ هونەرمەندەکەدا کردبوو، بێئەوەی ناوی من بەرن، گووتبوویان دوای بیرکردنەوە و وردەکاری زۆر، دوای دانیشتنی چڕوپڕ و گوێگرتنی ورد لە خەونی دەیان کەس، نیگارەکانیان کێشاوە... لە ڕۆژان و مانگانی داهاتوودا، سێ نیگارکێشەکە دەبنە ناودارترین کەسانی دێلاوار کە خەڵکی بە کرێیان دەگرن و خەونەکانی خۆیانیان پێ دەکەنە تابلۆ. لە ناکاو ئەو نەخۆشییە لە دێلاوار بڵاودەبێتەوە، خەڵک خەونەکانیان دەگێڕنەوە و نیگارکێشەکان بانگهێشتدەکەن بیانکەنە تابلۆ، بە جۆرێک ماوەیەک دواتر دوو ڕۆژ بەرلەوەی دێلاوار بەجێبهێڵم، ڕۆژێک مستەفا لەیلانم لەسەرجادە بینی، وەک برایەکی ئازیز باوەشی پێداکردم و گووتی «هەزار سوپاس بۆ تۆ، تۆ بتەوێت و نەتەوێت، مێژووی هونەری شێوەکارت لە دێلاوار گۆڕی». تا وێنەکان بڵاونەبوونەوە بە تەواوی دەرنەکەوت چ ترسناکە مرۆڤ نیگاری کەسێک بکێشێت کە بوونی نییە. من بێئەوەی جیهانناسێکی بە ئەزموون بم، دەمزانی کە گەڕان بە دوای شتێکدا کە نییە، دەیانجار ترسناکتر و کاریگەرتر و کارەسات هێنترە لە گەڕان بە دوای شتێکدا کە

پێشوەخت بینوومانە و دڵنیاین لە بوونی. نادیار ئەو شتەیە کە دەتوانێت ببێتە دەمامک بۆ هەموو سەرێک.

هەفتەیەکی نەبرد لە یەکێک لە گەڕەکە هەژارەکانی دیلاواری خۆرئاوادا، جەمعێکی شێت و گڕگرتوو، دەیان خەڵک کە هیستیریایەکی لە ناکاو دەیانگرێت، پیاوێک لە ماڵی خۆی کێشدەکەنە دەرێ و تۆمەتی ئەوەی دەدەنێ کە فیتنەبازی سەر وێنەکە بێت. هەندێ لە دیلاوارییەکان ناوی پیاوی سەر نیگارەکە دەنێن فیتنەکار. ناوەکە بۆ من، وەک خودی نیگارەکە و وەک ڕەوتی هەموو چیرۆکەکە سەیربوو. یەکێک لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن دیمەنی ئەو حەشاماتەی گرتبوو کاتێک پەلاماری تاوانباری ناوبراو دەدەن. گەڕەلاوژەیەکی گەورە، دەیان مرۆڤ کە لە دۆخی هەڵچوونێکی سەیردان، چاویان بە جۆرێکی نائاسایی دەرپەڕیوە، تورەیی و ترسێکی گەورە لە سیمایاندایە، لالێویان کەفیکردوە، بەر گەرویان هەستاوە. هەموو لە ماڵێکی هەژاردا پیاوێکی لاواز کێشدەکەنە دەرێ، کە سەرسام و ترساو و بێئاگا بە دەست هەڵچوانەوە گیرۆدە و بێبەرهەڵستە، پیاوەکە لە وێنەکە دەچێت و لە وێنەکەش ناچێت... بەلام هەموو وەک شێت، بە جۆش و گەرمییەکی نەخۆشانەوە، بە بڕوا و گڕەیەکی کتوپڕەوە، سوورن لەسەر ئەوەی کە ئەم پیاوە کەسی سەر وێنەکەیە.

ئەوە یەکەمین و دواهەمین پەلامار و پەلکێشکردن نەبوو، خەڵک هێندەی یەکێک دەکوژن، پێیان وایە ئەم گوناهکارە هاوشێوەیەکی تر و هاوکارێکی تر و هاوڕەگەزێکی تری هەیە کە درێژە بە ترس و ئازاری ئەوان دەدات. هێندەی یەکێک دەکوژرێت دەردەکەوێت کە گوناهبار لە جێگایەکی دیکە و لە سوچێکی ترەوە سەری هەڵداوەتەوە. هەندێ جار وادەزانن خۆی زیندووبۆتەوە، هەندێ جاریش پێیان وایە کە ئەم پیاوانە لەشکرێکن لە خەڵکی هاوشێوە کە لە هەمو کوچە و کۆلانێکدا بلاوبوونەتەوە، ئەو هەستە

زەمینە خۆشدەکات بۆ هەمیشە و بەردەوام درێژە بە کوشتن بدرێت. دواتر ڕۆژانە هەواڵەکان چیرۆکی پەلامار، سووتاندن، کوشتنی خەڵکی بێتاوان بڵاودەکەنەوە کە هەموو بە تاوانباری سەر وێنەکە حیسابدەکران. لە ماوەی کەمتر لە هەفتەیەکدا دەیان ڕووداوی لەو جۆرە ڕوویاندا. من بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بە دڵگەرمی و بەردەوامی دوای هەواڵەکان دەکەوتم. بەیانیان پێش ئەوەی بچم بۆ سەرکار هەموو ڕۆژنامەکانم دەکڕی، تکامکرد لە شوێن کارەکەمدا تەلەفون و تەلەفزیۆنێکی کۆنیان بۆ هێنام، تا بتوانم لە نزیکەوە ئاگام لە دۆخی دیلاوار بێت. هەر شتێکم دەبیست غەم و خەفەتێکی قورس لەسەر دڵم دەنیشت، بەڵام هێشتا هێندەم ترس لە مامم هەبوو نەوێرم یەخەی بگرم و بڵێم «بۆ ئەم کارەساتەمان نایەوە». خۆم بە بەرپرسێکی گەورە دەزانی لە کۆی ڕووداوەکاندا و ئەنگوستی خۆم دەگەست کە ئەم کارەم بە نیگارکێشەکان سپارد. هەستێکی تاڵ و تاریک پاڵی پێوەدەنام دوای بەسەرهات و سەربوردی ئەوانە بکەوم کە لە ناکاو وەک دوژمنی گەل، وەک شەیتانی ناو خەونەکان سەیردەکران. حوکمڕانان بە ئاشکرا کارێکیان نەدەکرد تا شتەکان لە جێگایەکدا بوەستێت. بە پێچەوانەوە هەموو ڕۆژنامەکان و ڕاگەیاندنەکان پێکەوە بەردەوام باسیان لە دوژمن دەکرد. خەونەکە بە جۆرێک بەرگی حەقیقەتی کرایە بەر کە گێڕانەوەی بۆ دونیای خەون کارێکی ئەستەم بوو. لە ڕێگای ڕۆژنامەکانەوە زانیم کە لایەنیکەم چوار کەس لەوانەی خەوبینە تووڕەکان کێشیانکردون گیانیان لەدەستداوە، بەردەوامیش باس لە هێزێکی چەکداری نوێ دەکرا کە گومان لێ کراوان دەگرن و سەریان دەبڕن. پێدەچێت هەموو هەڵچوونەکان زادەی جۆرە هیستیریایەکی دەستەیی بووبێتن کە کەسانی هەمەجۆر تیا بەشداربوون، لە هەندێ جێگادا بێ بەرنامەیەکی پێشوەخت و لە هەندێ جێگای دیکەشدا وەک کارێکی پلانرێژکراو سەریان هەڵدابێت ... من هەموو ڕۆژێک بە وردی هەواڵی هەڵچوونی حەشاماتەکانم

دەخوێندەوە. خواستم بوو جارێک ئەو هەڵچوون و تورەبوونانە لە نزیکەوە ببینم، بەڵام وابەستەییم بە دەوامی خەستەخانەکەوە بواری گەڕانی ئازادی نەدەدامێ و جگە لەوەش هیچ کات ڕۆشن نەبوو، ئاخۆ کەی و لە کوێ فتیلی تورەییەکان دادەگیرسێت. من کە شتەکان تێکەڵ بە غەم و مەراقیان کردبووم، ئارامم لێ برابوو، نە دەمتوانی لەگەڵ مامە سیام باسی هیچ بکەم، نە لەگەڵ خوشک و براکانیشمدا قسەوباسێکی وەهام هەبوو، تا پرسیان پێ بکەم و ڕێنماییان لێ وەربگرم. ڕۆژێک تەلەفونی ژوورەکەی خۆمم لە سەنتەری چارەسەری دەروونی هەڵگرت و زەنگێکم دا بۆ بابەعەلی وەزیری، بە ئومێدی ئەوەی هەندێ زانیاریم دەست بکەوێت. تەلەفونەکەم بەوە پاساودا، کە لە بیمارستانەوە بە پێویستی دەزانین قسە لەگەڵ هەندێ لە گیراوانی دۆسییەی «فیتنەبازی» دا بکەین، بەڵکو بتوانین لە چارەسەری بیمارەکانماندا سوودیان لێ ببینین. بابەعەلی دۆستانە قسەی لەگەڵ کردم و لە دەنگ و ڕەفتاریدا هەستم بە ڕێز و قەدرزانییەک کرد، گووتی «بەڵێ کاکە ڕێنوار، تا ئێستا هەشت کەس بە تۆمەتی لێکچوون لەگەڵ پیاوی سەر وێنەکاندا گیراون، جگە لە کەسانێک کە کوژراون یان خۆیان شاردۆتەوە یان ئەشکەنجە دراون و ئێستا لە بیمارستانن. بە وردی ناتوانم هیچ ژمارەیەکت پێبڵێم. لە دیلاوار دەسەڵاتی حاکمی عەسکەری لە دەسەڵاتی ئێمە بەهێزترە، پۆلیس هێزێکی بچوک و بێئاگایە، جەنابی حاکم یاسین کە سەر بە بنەماڵەی قەرەقازانییە، گەر دیقەت بدەن تا ئێستا بەیاننامە و ڕاگەیاندنە ڕەسمییەکان بە نێوی یاسینی قەرەقازانی ئیمزادەکات، گەرچی بڕیاربوو لە سوپادا نازناوی بنەماڵەیی نەمێنێت. قەرەقازانییەکان لەگەڵ بنەماڵەی ماروفیدا لە مێژە هاوپەیمانن، من لێتی ناشارمەوە کە خەڵکێکی دەسەڵاتخواز و شەڕانگێزن کە تا دێت ئێمە ناڕەحەتتر دەبین لە دەستیان. دۆسیەی ئەم گیراوانە دەبوو بدرێتە دەست دائیرەی پۆلیس، شتەکە پەیوەندی بە تێکچوونی باری مەدەنییەوە هەیە و

تەواوی ئەو کێشانە بەپێی دەستووری دیلاوار لە ڕکێفی ئێمەدان، بەلام دەسەلاتی بنەماڵەی ماروفی و قەرەقازانی وایانکرد کە بێ هیچ پێشینەیەکی قانونی دۆسییەکە ببەسترێتەوە بە ئاسایشی گشتی دیلاوارەوە. ئێستا ئێمە هیچ ئاگادارییەکمان لە دیلەکان نییە، هەموو ئەو کەسانەی لەسەر ئەم دۆسییەیە دەگیرێن ڕاستەوخۆ دەبرێنە جێگایەکی نهێنی کە تەنیا حاکمی عەسکەری و جەنابی فەرماندار دەزانن لە کوێیە».

هەستمکرد پەیوەندی نێوان بنەماڵەکانی دیلاوار لە خراپترین ئاستیدایە. بابەعەلی وەزیری وێڵی ئەوەبوو زانیاری وردتری لەسەر هەموو ئەم چیرۆکە دەستبکەوێت، بەلام ئەویش وەک من شتێکی وەهای دەست نەدەکەوت. شتێک کە بابەعەلی وەزیری گووتی و سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوە بوو، کە زۆربەی قوربانییەکان خەڵکانێکن یان لە دیلاواری ڕەش دەژین یاخود لەوێوە هاتوون و تازە بە تازە لە گەڕەکە کۆنەکانی دیلاواردا نیشتەجێبوون و پێشتریش وەک غەریب سەیرکراون. بابەعەلی گووتی «شتەکە وەهایە وەک ئەوەی گوناهبار دەبێت ڕەگێکی غەریبەی هەبێت. بە ئەسڵ خەڵکی دیلاوار نەبێت. لەگەڵ هەموو ئەو بێدەنگی و نهێنییەی کە خراوەتە سەر دۆسییەکە، ئێمە وەک بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بە دوای هەموو زانیارییەکەوەین، هەرچی شتێک بگاتە دەستمان بە وردی لێی دەکۆڵینەوە. گوناهباران یان خەڵکی دیلاواری ڕەشن، لە گەڕەکە فەقیرنشینەکان ، یان لەوانەن لەم دوو ساڵەی دواییدا لە پشتێنەکانەوە گواستویانەتەوە بۆ گەڕەکە کۆنەکان. زۆربەیان ئەوانەن کە پێشتریش کەس و دراوسێکان وەک غەریب سەیریانکردون... ئەوە شتێکە منی دوودڵکردوە. خۆت دەزانیت کەسانێکی زۆر، لەوانەی بۆ پاکژی و خاوێنی دیلاوار بانگەشەدەکەن، دژی تێکەڵکردن و گواستنەوەی ئازاد بوون لە نێوان پشتێنەی ڕەش و دیلاواری کۆندا. ئێستا لە ناکاو ئەم ڕووداوانە دێنە پێشێ».

دڵنیابووم ململانێکان لە نێوان بنەماڵەکانی دیلاواردا خەریکە دەچێتە ئاستێکی ترسناکەوە. وەزیرییەکان هەستیاندەکرد تا دێت پەراوێزدەخرێن و شتی گرنگیان لێ دەسێنرێتەوە، لە قسەکانی بابەعەلی وەزیریدا سێبەری ئەو ترس و تووڕەییە بە ڕۆشنی دیاربوو، کاتێک قسەی بۆ من کرد، وەک ئەوە بوو بیەوێت خەڵک هەموو بە چیرۆکی ئەم ناکۆکییانە بزانن. هەر ئەو شەوە تەلەفزیۆنی ڕەسمی دیلاوار، یەکەمین بەرنامەی پێشکەشکرد کە ماوەیەک بوو بانگەشەی بۆ دەکرد، ناوی بەرنامەکە «دیلاواری پاک» بوو. من بڕیارمدابوو ئەو ماوەیە لە هەر جێگایەک بم، دوای ئەو شتانە بکەوم کە دوور و نزیک پەیوەندییان بەم کێشەیەوە هەیە... کۆی شتەکان بۆ خۆم تەلیسماوی بوون، شوێنێک هەیە تێیدا سروشتی پڕ نهێنی ئینسان، تێکەڵ بە سروشتی پڕ نهێنی جیهان دەبێت، وەها بوو وەک ئەو خەونە ئەو خاڵی یەکدی بڕینەبێت. بەرنامەکە لەسەر ئەوە بوو کە ساڵانی دوور و درێژی ژێر دەستی، هەڕەشەی هەمیشەیی دوژمن، وایکردوە دیلاوارییەکان لە ترس و لەرزێکی هەمیشەییدا بژین. میوانی بەرنامەکە گەنجێکی بۆینباخ پۆشی چاویلکەداربوو، لەو گەنجە خوێندەوارە تازانەی کاریکیان بە تێگەیشتنی خەڵکەوە نییە. قسەکانی پڕبوون لە زاراوەی سەخت و سەیری لە بابەت «یادەوەری دەستەجەمعی» «نەستی نیشتیمانیمان» «ترسی دیلاواری» «بەرزەمنی شەیتانی» «حافیزەی ڕەش»... ئەوەی منی لە بەرنامەکەدا دەترسان، ئەوە نەبوو کە بەردەوام قسە لەسەر ترسێک دەکرا کە دەروونی دیلاوارییەکانی بە تارمایی و جانەوەر و خواستی تاریک پڕکردوە ، بەڵکو ئەوە بوو کە جەنگی پاککردنەوەی خۆمان، جەنگی پاکژبوونەوەی دەروونی دیلاوارییەکانی گرێدەدایەوە بە شەڕ و بەرگریکردنەوە. «تەنیا شتێک دیلاوار بە پاکی و نەمری بهێڵێتەوە شەڕێکی بێوچانە دژ بە دوژمنان». پرۆفیسۆرە گەنجەکەمان وایدەگووت.

لەو هەفتانەدا سەرەتاکانی کوتانی تەپڵی جەنگ دەستی پێکرد. سرودی

«دێلاوار ئەی سەرزەمینی شێران» بە دەنگی بەرز و لە بڵندگۆی گەورەوە لە هەموو جێگایەک پەخشدەکرا. مامم لە شەقاوێکی سەیر و کتوپڕدا بڕیاریدا کە ڕۆژانە سێ جار سرودی «دێلاوار ئەی سەرزەمینی شێران» لە بیمارستانەکەماندا لێ بدرێت، بۆ ئەو مەبەستە تیمێکی کارەبایی تایبەت هاتن و لە سێ جێگای بیمارستاندا بڵندگۆیان دامەزراند. هەر لەو کاتەدا نیوەڕۆیەک مامم بانگیکردم و گووتی «ئەمڕۆ مەحمودی قەرەقازانی دێت بە میوانیمان، من پێشنیارێکم داوەتە یەکە جەنگاوەرەکانی دێلاوار کە لە کاتی پێویستدا ئێمە ئامادەین هێزی کاریان بدەینێ، لەو ڕێگایەوە بیمارەکانمان تۆزێک لە ژوورەکانی خۆیان دووردەکەونەوە و کەمێک بای باڵی خۆیان دەدەن و سوودێک بە نیشتیمانیش دەگەیێنن». مەحمودی قەرەقازانی ئامۆزای حاکمی عەسکەری بوو، پیاوێکی لووت زل و سمێڵ زل بوو، چاویلکەیەکی ڕەشی دەکردە چاوی و بەردەوام خۆی وەک ژەنراڵێک نیشاندەدا کە خەریکی ئامادەسازییە بۆ جەنگێکی مەزن و گەردونی. لە دوای جەنگی ڕزگاریی دێلاوارەوە نەمبیستبوو پلەدارە سەربازییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دێلاواردا هەبێت، هەرێمەکە دەیویست ڕوخسارێکی مەدەنی بداتە خۆی، بەڵام ئێستا کە سەیری ڕووی ڕاستەقینەی شتەکانم دەکرد، هەستمدەکرد من و هاوڵاتیانی دیکە بەردەوام بە هەڵەدابراوین. ماوەیەک بوو، هەرچیم لە زاری ئەم و ئەو دەبیست، دەیگووت ڕوتبەدارەکان لە ژێرەوە دەسەڵاتێکی گەورەیان هەیە، پلەکانی سوپا چکۆلەکەمان زۆربەی بۆ بنەماڵە ناودار و دەسەڵاتدارەکان بڕابوونەوە. مامە سیام گووتی «بڕیارە زۆر شت لە دێلاوار بگۆڕێت. هەفتانە ئێمە لە لیژنەی ئیدارەی قەیرانەکان دووجار کۆدەبینەوە، ئەوە کاردەکاتە سەر ئیشەکەمان لێرەش، من لە سبەینێوە دکتۆر سەبری جاهدار، کە هاوڕێیەکی نزیکی خۆمە دەکەمە جێگری یەکەمم. دکتۆر سەبری هاوڕێی خۆمە لە جەمعییەتی ئەکادیمیستە غەمگینەکانی دێلاوار. دە ساڵ

لە مەوبەر بەرپرسی بەشی پەروەردە بوو لە زانکۆ، دوایی لە شەڕێکدا بە دەرنەفیز گوپی سەرۆکی زانکۆی بریندارکرد و ناوچاوانیشی بە بۆکس شکاند، لەو کاتەوە بێئیشە، بەڵام شارەزاییەکی زۆری لە پەروەردەدا هەیە، یەکەمین مامۆستای پەروەردەیە، خۆت دەزانیت ئیشی ئێمەش لێرە، هەر پەروەردەیە. من لەمەولا زوو زوو دەڕۆم و کاتێکی زۆرم دەوێت بۆ کۆبوونەوەکانی لیژنەی قەیرانەکان، تۆش کاری زۆرت دەبێت، تۆ تا دێت ڕۆڵت لێرە گەورە دەبێت، دوێنێ لەگەڵ جەنابی وەزیری تەندروستیدا قسەمکرد، لیستی ناوەکانمان بەسەرکردەوە کە لێرە ئیشدەکەن... جەنابی یەک بە یەک دەیویست بزانێت کاری کارمەندان چییە. پیاوێکی ئیشکەر و نەجیبە. کاتێک هاتە سەر ناوی تۆ، گووتم ئەمە تەسلییەبەخشە، ئیشی ئەوەیە دڵی نەخۆشەکانمان دەداتەوە، تێیانبگەیێنێت کە ئێمە هەر سزادەر نین، بەڵکو دڵیش خۆش دەکەین و دڵنەوایش دەبەخشین... وەزیر پۆستەکەی تۆی زۆر بە دڵ بوو، زۆریش پێکەنی، گووتی خودا فرسەتی بدات، دەبێت چ پیاوێکی ئارام و میهرەبان بێت».

بۆم گرنگ نەبوو وەزیر چۆن سەیری ئیشەکەی من دەکات، بەڵام هاتنی مەحموودی قەرەقازانی و ئەم دکتۆرە تازەیە نائاسوودەیاندەکردم. کاتێک ژەنراڵ مەحموود هات، دوو سەعات پێشتر چاودێرەکان لە ژێر زەبری کوتەک و قامچیدا سەدان نەخۆشیان لە قاوشەکان دەرهێنا و لە حەوشی گەورەی سەنتەرەکەدا ڕیزیانکردن. قەرەقازانی سەعات دووی پاشنیوەڕۆ گەیشت، هاوین خەریکبوو بەرەو کۆتایی دەڕۆی، بەڵام هەوا هێشتا گەرم بوو. چاودێرەکان بۆ ئەوەی نەخۆشەکان بە ڕێکی و لە ڕیزدا ڕابگرن ئەوپەڕی زەبر و دڵڕەقییان بە خەرج دەدا. من و مامم و بەرپرسی بەشەکان کە زۆریان زەلامی هەیکەلدار و زل بوون لە ڕیزێکدا وەستاین و چاوەڕوانی ژەنراڵمان کرد. هاتنی ژەنراڵ ڕۆژێکی گرنگی ژیانی من بوو، نەمدەزانی کەسێکی وا نەناس دەتوانێت ڕەوتی زیندەگی

من سەر لە بەر بگۆڕێت، ژیانم بەرەو لایەکی دی و بەرەو شێوەیەکی نوێ ئاراستەبکات. ژەنراڵ دەموچاوێکی گەمژانەی هەبوو، زۆربەی ئەو کەسانەی دەتوانن ژیانت سەر لە بەر تێکبدەن کەسانێکن دەموچاوێکی گەمژانەیان هەیە، تۆ لە ناخی دڵی خۆتدا گاڵتەیان پێدەکەیت، بە شایەنی کلکە و لاقرتیان دەزانیت، کەچی تۆی زانا خەبەرت نییە کە ئەو گەمژەیە، ئەم کەنیندارە کە تۆ لە پێشچاوی خۆت سووک و ڕیسوا دەیبینیت، دەتوانێت ژیانت تووشی ئافەت و ئاشووبی وابکات، تا ماویت نەچێتەوە سەر باری سروشتی خۆی. من هەر ژەنراڵم بینی لە خۆمم پرسی چۆن گەمژەکان وا ئاسان بە پلەوپایەیەک دەگەن کە هیچ کات زانا و داناکان دەستیان پیاناگات. بەرجەستەترین نیشانەی گەمژەیی ژەنراڵ ئەوەبوو کە دەیویست سادە و خۆشەویست و ئاسایی دەربکەوێت، وەک ئەوەی لە فیلمێکدا نمایشبکات زەردەخەنەی دابەشدەکرد و میهرەبانی دەبەشییەوە. ژەنراڵ لە سەرچاوەیەکی زاناوە زانیاریی تەواوی هەبوو کە نەخۆشەکانی ئێرە جۆرە مەخلوقاتێکی هەڵواسراون، جەشنێکن لە بەشەر کە نە ئەوەیە نەخۆشبن و نەئەوەیە ساغ، نە ئەوەیە دیل بن و نە ئەوەیە ئازاد، نە ئەوەیە کاری ئاسایی بکەن و نە ئەوەیە تەواو بێ کەڵکیش بن... دڵنیابوو ئێرە بیمارستانێکی دەروونی، شێتخانە، یان سەنتەری چارەسەریی نییە، بەڵکو مەخزەنێکی تایبەتە بە جەستەی ئادەمی کە دەشێت ژەنراڵ سوودی لێ ببینێت.

ژەنراڵ تەنیا بۆ سەیرکردن و هەڵبژاردن هاتبوو، خۆی وتەیەکی کورتی پێشکەشکرد و باسی لەوەکرد دیلاوار پێویستی بە وزەی هەمووان هەیە، گوتی پێشتر هەندێ لە قوتابخانە پیشەییەکان و زیندانەکان و گرتوخانەکانی پۆلیس گەڕاوە ئەوسا هاتۆتە ئێرە. قسەکانی ژەنراڵ وەک قسەی زۆربەی سەرکردە سەربازییەکان گەوجەگۆییەکی تەواو بوو، بەس بوو مرۆڤ گوێی لێبگرێت تا تێبگات ئەم جۆرە کەسانە گەر وتارەکانیشیان بۆ بنوسنەوە،

هێشتا بە دروستی ناتوانن بە دەنگێکی ڕوون بیخوێننەوە. لە ڕاستیدا ژەنرال مەحمود لەلایەن دەستەیەکی بالاترەوە هاتبوو کە ناوی دەستەی بالای ئامادەکاریی سەربازیی بوو. ئیشی دەستەکە ئەوە بوو زەمینەسازی بۆ ساتەکانی بەرگری و پەلامار لە هەر جەنگێکدا بکات، هەڵبەت دەستەکە چەندین ساڵ بوو دامەزرابوو، بەلام لە هەموو ئەو ساڵانەدا کارێکی وەهای نەکردبوو، بەلام ئێستا بنەماڵە دەستدار و بەهێزەکان هەستێکی ناخۆشیان هەبوو کە شتەکان بەرەو دژواریی دەڕوات، لە بەرئەوە خەریکی چالاککردن و بەهێزکردنی ئەو دەستەیە بوون.

ئەو ڕۆژە لە کاتی سەردانەکەدا هەموو وەک ئەوەی تیپێکی سەربازیی بین، لە بەر قرچەی هەتاودا وەستابووین، وەک پشکنینێکی گشتی بکات، ژەنرال یەک بە یەک سەیریکردین، هەستمکرد ئاسوودەییەکی نهێنی لە نیگایدایە، خۆشحاڵ بوو کە پیاوانێکی بەهێز و گەنجی دەبینی، لە بازرگانێکی دەکرد کەوتبێت بەسەر کاڵای باش و هەرزاندا. هەندێ لە بیمارەکانمان نەیاندەتوانی ماوەیەکی زۆر لە ژێر خۆری نیوەڕۆدا بمێننەوە، بەلام ئیشی چاودێرەکان ئەوە بوو، بێئەوەی گوێبدەنە بوونی ژەنراڵ، بە قامچی و کووتەکی سەر بزماریی، هەمووان بە پێوە ڕابگرن. دوای پشکنینی ورد، ژەنراڵ فەرمانیدا بیمارەکان بگەڕێنەوە ژوورەکانی خۆیان و خۆشی لەگەڵ مامە سیام چوو بۆ کۆبوونەوەیەکی دوو قۆڵی داخراو. دواتر مامە سیام بە منی گووت کە تەواوی کۆبوونەوەکەی لەسەر ئەوە بووە، لە ڕۆژانی داهاتوودا سەد کەس لە بەتواناترین و سەرەحاڵترین کەسانی بیمارستان، دەبێت بچین بۆ سەر سنوورەکانی باکوور، بۆ دامەرزاندنی بنکەیەکی سەربازی گەورە، چونکە گومانێکی زۆر هەیە دووبارە دوژمن لە سنوورەکانی باکووری ڕۆژهەلاتەوە پەلاماربدات. من سەرسام بووم، بە دەنگێکی کەمێک بەرز گووتم «ئەوانە نەخۆشن، وەک ئەمانەتێک وان لە گردنی ئێمەدا، خەڵکانێکن کەسوکاریان هەیە و دەبێت تا دەتوانین بە ساغی

و سەلامەتی بیاندەینەوە دەست بنەماڵەیان». مامم سەیریکردم و شێوەی پیاوێکی هەقانی لە خۆی گرت و گووتی «تۆ ڕاستدەکەیت، من لەگەڵتدام ... من بە جەنابی حاکمی عەسکەریم گووت کە من ناتوانم هیچ کەس بێ ڕەزامەندی خانەوادەکەی بنێرم بۆ دەرەوەی دێلاوار. من پێمگووت نەخێر ئێمە دکتۆرین، ئێرە بیمارستانە، ئێمە هەروا ناتوانین خەڵکی بدەینە دەست سوپا. جەنابیان هاوڕابوون لەگەڵمدا، بەڵام ئەمە لە حاڵێکدا دەبێت و دەتوانم جێبەجێیبکەم کە خانەوادەکان بێن و بیمارەکانی خۆیان ببەنەوە بۆ ماڵ و جارێکی دی نەیانهێننەوە. گەر بنەماڵەکان بیانەوێت نەخۆشەکانیان لای ئێمە بن، ئەم جۆرە کارانە بەشێکن لە بەرنامەی چارەسەریمان... بەڵێ من ئەمە ناو دەنێم چارەسەریی لە ڕێگای ئێشەوە، لە ڕێگای خزمەتەوە».

مامم باوەڕی تەواوی هەبوو کە تاکە ڕێگا بۆ چارەسەریی نەخۆشەکانمان ئەوەیە، ژیانی نوێ بژین، بچنە ژێر باری زەحمەتی قورس. دەیگووت «لەگەڵ شێتی ئاسایی و ستانداردا دەزانم چی بکەم، بەڵام لەگەڵ شێتی دێلاواردا نازانم چی بکەم، باوەڕم بەوە نییە کە سەری کەسیان لە کارەبا بدەم، بیانبەستم بە ئامێری تێماترۆنەکەمەوە، یان تۆپەڵێک پڕفەنازین و کۆیتاپین و کلۆزاپین بکەم بە قوڕگیاندا، تا دێوانەکانی ئەم شارە پتر بە کوتەک، بە ئێش، بە ماندووکردن چاکدەبنەوە... ئەوە تاکە ڕێگایە».

هەندێ جار گومانمدەکرد مامە سیام دکتۆر بێت، یان هیچ زانستێکی لە خۆرئاوا خوێندبێت ... ئەوە یەکێک بوو لەو جارانە.

# ٢٠

دوورکەوتنەوەم لە ژیانی عیادەکە سەخت بوو، شەوخەوەکانی ئەوێ گەرچی لە نوێنی زۆر خۆش و نەرمدا نەبوون، بەڵام دووریم لە ئامێزی خێزان و لە چاوی پڕ گومانی باوک و خوشک و براکانم ئاسوودەییەک بوو بەرتەقای پادشاهی. ج شتێک لە ژیانی گەنجێکی سەرنەکەتووی کەمدوو سەختتر نییە کە چاوی بێدەنگی خێزان وەک مار هەمیشە لە دووی بێت، من لەو کاتانەدا ئامادەبووم بچم بۆ دۆزەخ و نەگەڕێمەوە بۆ ماڵ ... ماڵ، ئاه، ماڵ... ئەی دۆزەخی سەرزەمین. کێشەی گەورەی من ئەوە بوو مەخلوقێکی تەنیا و ژوورەکی بووم، دانیشتنی نێو ژوورانم لە گەشتی بەهەشتیش پێ خۆشتر بوو. بە دەگمەن شەوان دەچوومە دەرێ، ڕاستی من نە مەخلوقی شەو بووم و نە مەخلوقی ڕۆژ، هەر دوو وادەکە وەکو یەک بێزاریاندەکردم. ڕۆژ بە ڕوناکییەکانی و شەو بە تاریکییەکانی ئازاریان دەدام. هەوای ناو ژوور و ڕوناکی ئەو جێگایەی کە تێیدا تەنیا دەبووم، لە هەر هەوا و ڕۆشناییەک لام جوانتر بوون. بێزاریم لە شەو و ڕۆژ دەگەڕایەوە بۆ بێزاریم لە ئادەمیزادەکانی ئەو دوو وادەیە. لە ڕاستیدا من ماڵ و جێگا و شوێنم بۆ گرنگ نەبوو، نە ئەهلی دیکۆری جوان بووم، نە لە خوازیارانی ژیانی ئاسوودە و جێخەوی مەخمەڵی. خۆشترین جێگا لام هەمیشە باوەشی تەنیایی بووە. لە کۆشکە پۆخڵەکەی باوکمدا، ژوورەکەم لە قاتی سەرەوە بوو، ژوورێکی چەپەک و

تەنیا کە تێیدا لەزەتێکی زۆرم لە بێدەنگی و لاتەریکی دەبینی. لە گەنجییەوە خوشک و براکانم بە تەنهایی و بێدەنگی من ڕاهاتبوون، هەندێ جار چەند مانگێک دەچوو بێئەوەی وشەیەک لەگەڵ هەندێکیاندا بگۆڕمەوە. شەوانێک کە سەران و خزمانی بنەماڵەی زەریاواری لە ماڵی ئێمە کۆدەبوونەوە و دەنگەدەنگ و هاواریان تا دوور دەچوو، من بۆئەوەی هیچ شتێک تەنیاییم نەشێوێنێت، هەردوو گوێچکەی خۆم بە لۆکە دەئاخنی. لەو شەوانەدا، باوکم جار جار دەهاتە ژوورەکەم و بە داوایەکی تایبەت بانگهێشتی خوارەوەی دەکردم. من تا بێزێزی نەنوێنم و وەک باوکم دەیگووت «سەروفەساڵی عەقڵ سووکێک» لە خۆ نەگرم، بە ناچاری بۆ وچانێکی کورت دەچوومە خوارێ. هەر کات من دادەبەزیم، هەموو بەجۆرێکی سەیر بێدەنگ دەبوون، خوشکەکانم و کچە مامەکانم و پورزاکانم، نیگایان پڕبوو لە توڕەیی و گاڵتەکردن، لە کەنینی شاردراوە و بزەی گەندگۆ. بێدەنگیان پڕ لە نیشانەی بێزاری و گاڵتەکردن بوو. من بە هێمنی و ڕێزێکی درۆزنانەوە، بەجۆرێک هەموو بزانن لە ناوەوە ئاسوودەنیم سڵاوم لێ دەکردن، منیش بەشی ئەوە وریابووم بە هەندێ جوڵەی لێو و دەست و چاو، بێزاریی و قیزی خۆم بۆ هەندێکیان نیشانبدەم و بە ڕوونی دەریبخەم وەک گەوج و گێژ دەیانبینم. شتێک هەموو هەستیان پێ دەکرد و دەیانبینی باوکم نەبێت، کە هاتنە خوارەوەی من و دانیشتنی کورتم لە ناو میوانەکاندا لەو توانجە دەیپاراست، کەس تۆمەتی ئەوەی بداتە پاڵ کە یەکێک لە کوڕەکانی شێت و ناتەواوە. زۆربەی خزمەکانمان لە بنەماڵەی زەریاواری دەیانزانی من شێت نیم، بەتایبەت کارکردنم لەگەڵ مامە سیا، تۆمەتی شێتی و پەشێوی عەقڵی لێ دوورخستبوومەوە. بەلام هەموو وەک «بەدجنس» ناویان دەبردم. هەتا ناوی « ڕێنواری بەدجنس» جێگای ناوەکەی خۆمی گرتبووەوە. لە ڕاستیدا من بەدجنس نەبووم، ئەسڵەن کارم بە کاری کەسەوە نەبوو، بەلام تەنیا ئەوەی نەمەوێت لەوانی تر بچم بەس بوو لە تایەفەی زەریاواریدا وەک

کەسێکی نەخۆش و لەشێکی دەرداوی سەیربکرێم. جارێکیان مامە سیام پێی گووتم «خزمانی خۆمان کەیفیان بە تۆ نایەت، تۆ نە کەسیانت خۆشدەوێت، نە ڕقت لە کەسیانە. لە دێلاوار خەڵکی پێویستیان بە دۆست و دوژمنە... دوژمنیشیان لە دۆست پێ باشترە، دوژمن بۆ ژیان وەک ترش و خوێ وەهایە بۆ ناو خواردن و بۆ سەر سفرە، تۆزێک ڕەنگ و بۆ دەدات بەم ژیانە بێفەڕە. لە شارێکی ناخۆشی وەک دێلاواردا کە ئێمەی داماو هیچ بەزم و سەفایەکمان نییە، دوژمن سەرگەرمییەکی خۆشە، بۆیە خەڵکی دەپاڕێنەوە «خودایە دەی دوژمنێکی باش و لاوازم بۆ بنێرە، لە عەیبدا غەنی بێت، لە نەنگیدا شاز بێت، لە سووکیدا هاوتای نەبێت، تا منیش لەم ژیانە پوچەدا سەرگەرمی و کەیفێکم هەبێت». بەڵام کەسێکی وەک تۆ کە بێدەنگ بێت و بچێت، نە دۆستی کەس بێت و نە دوژمنی کەس، بەشەری وا وەک ئافات وەهایە ... دەدات بە زەوق و ئارەزووی خەڵکدا». من سەبارەت بەو قسانە شتێکی تایبەتم نەبوو. هەندێ جار دەمگووت «دەی مامە گیان. من بەوجۆرە دروستبووم و ناتوانم خۆم بگۆڕم».

مانەوەی شەوانەم لە عیادەکە باری شانی زۆر سووککردبووم، ڕاستە شەوان کە دەخەوتم جیڕەجیڕی پانکەی بنمیچەکە زۆر ئازاری دەدام، هەندێ جار دەنگە دەنگی سەرخۆش و گەڕۆکەکانی شەو کە بە بەردەم عیادەکەدا تێدەپەڕین لە خەوی دەکردم... بەڵام نزیکی ساڵێک بوو خەونێکی وەهام نەدەبینی نارەحەتم بکات. کە گەڕامەوە ماڵی خۆمان ژیانم دووبارە تێکچووەوە، خواستی دوورکەوتنەوە و هەڵهاتن کەوتەوە سەرم، ئێستا جارێکی تر ئەم بیمارستانە ئومێدی ئەوەی پێ بەخشیمەوە بگەڕێمەوە بۆ ژیانی جارانم. هەر هێندەی ژوورەکەم خۆشکرد و مۆبلی تەواوم خستە ناوی و دوو پەتووم لە خەزنەداری بیمارستان سەند، کەوتمەوە خولیای ئەوەی دیسان لە ماڵ هەڵبێم و شەوانی خۆم لەم جێگایەدا ببەمەسەر. دوای هەفتەیەک ڕوخسەتم لە مامە سیام خواست هەندێ شەو لە ژوورەکەی خۆم

بمێنمەوە و لەوێ بخەوم. مامم ئەمجارە خۆشحاڵ بوو، دەیزانی کارمەندانی ئەوێ بە خزمایەتی من و ئەو پێدەزانن و شەوانە بوونی من لەوێ ڕێکی و نەزمێکی زۆرتر دەبەخشێتە بیمارستانەکە.

هەفتەیەک دوای سەردانەکەی ژەنرال قەرەقازانی، شەو من لە ژوورەکەی خۆم لە بیمارستان دانیشتبووم، سەرگەرمی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان بووم، بەڵام لە بەر شەکەتی کار و مەراقی ئەو نەخۆشانەی دەمبینین، بێهێز و گەنەفتە بووم. بە درێژایی ڕۆژ، زیاد لە جارێک چووبوومە لای وەستا سەلاحەدین و لە تەمێخانەکەی ئەو بیمار و برینداری دەرهێنا بوو، بە فرمێسک و تکا گوناهەکانم لە بەردەمدا شتبوون، گریابووم بۆیان و داوای بەخشین و لێبوردنم لێ کردبوون. ئەو شەوە هێند بە ڕۆژ گریابووم، هەر زوو سەرم لەسەر مێزی کارەکەم دانا و خەوم پیا کەوت. شەو درەنگ نزیکی کاتژمێری دوو، لەسەر دەنگی زەنگی تەلەفونەکە بە ئاگاهاتم. هەستمکرد زەنگەکە چەند جارێک لێیداوە و ئینجا منی بە خەبەر هێناوە. گێژ و نیوە کوێر تەلەفونەکەم هەڵگرت و بە دەنگێکی خەواڵو گووتم «ئەلۆ». هەمان دەنگی جاری پێشوو، ئەو دەنگەی کە ماوەیەک لەوەو پێش زەنگیدا، لەوسەری خەتەوە وەڵامیدامەوە و پرسی «ئایا لەگەڵ کاک ڕێنواری زەریاواریدا قسەدەکەم؟». ئەمجارە دەنگی هێمن و دڵنیاتر بوو. بە سەرسامی و بێزارییەوە گووتم «دەزانی سەعات چەندە؟ بەڵێ من ڕێنواری زەریاواریم، بەڵام کاتت نەدۆزیوەتەوە بۆ تەلەفون ئێستا نەبێت ... کاکە گیان کەی ئێستا کاتی تەلەفونە». ئەو گووتی «من یاوەرەکەی دکتۆر حسامەدینم، ببورە، گەر شەو نەبێت و کات درەنگ نەبێت و دڵنیانەبم کەس نایبیستێت ناتوانم تەلەفونبکەم. ئیشێکی گرنگم بە تۆ هەیە. دەبێت بتبینم». زۆر خەوم دەهات، من لەو خەوخۆشانە بووم کە سەعاتێک خەوی قووڵم لە بینینی سەد موعجیزە لا گرنگتر بوو. کە کابرا وای گووت، من بە جۆرێک ناحاڵ و خەوگیربووم، دەبوو ئیستێک بکەم و کەمێک بیربکەمەوە تا دکتۆر حسامەدینم بێتەوە یاد.

بە بێزارییەوە گووتم «باشە بە سەر چاو، تۆ برای منیت، دەتوانم بتبینم، بەلام سبەی تەلەفونێکم بۆ بکەرەوە، ئێستا شەو زۆر درەنگە و من لە جێگایەکی وەها نیم بتوانم بەم شەوە هیچت بۆ بکەم ... ئاخر مال خراپ کەی ئێستا وەختی یەکتر بینینە، تۆ هۆشت بە خۆتەوەیە، دەزانیت سەعات چەندە؟». کابرا گووتی « دەبێت ئەمشەو بتبینم. گەر دەتەوێت یارمەتیم بدەیت، با ئەمشەو بتبینم، ئێستا بکەوە ڕێ». داوایەکی نابەجێ و سەیر بوو، بەلام هەستێکی کتوپڕم لا دروستبوو گەر نەچم دواتر زۆر پەشیمان دەبمەوە. لە کابرام پرسی «عەزیزم، تۆ دەزانیت من لە کوێم، دەزانیت دەلێیت چی، ئەسلەن من نازانم تۆ چۆن ئەم ژمارەیەی منت دەستکەوتووە، ئاخر هێشتا ئەم ژمارەیەم نەداوەتە باوکیشم؟». کابرا بە دلنیاییەوە گووتی «بەلێ دەزانم، تۆ لە زیندانە کۆنەکەی مالی شوکور ئاغایت. لە سەنتەرە تازەکەیت، گەر بێیتە دەرێ و پێنج سەد مەترێک تا سەری شەقامی حاجی عینایەت بێیتە خوارێ، نیوسەعاتی تر ئۆتومبیلێکی سپی کۆن دێت بەدواتا». لەشم زۆر قورس بوو، تەمبەلییەکی زۆر دایگرتبووم، نەمدەزانی چی بلێم و چی بکەم، هەستمدەکرد گەر دەربچم لەشم نایکات، بەلام دلنیابووم شتێکی گرنگ لە پشت ئەم تەلەفونەوەیە. لە ناکاو هەستێکی سەیرم تێهات کە دەبێت دەم و دەست بڕۆم ... هەر کونجکۆلی ئەوەی کە بەم شەوە درەنگە چیرۆکێک هەیە چاوەڕوانی من دەکات، وای لێدەکردم دەست و برد دەرچم و شەو بە دەمەوە بگرم. دەنگێکی بەهێز لە ناوەوە پێمی دەگووت «لەو ڕۆژەوەی میرئەودال لە عیادەکەی مامت دەرکەوتوە، تۆ چاوەڕوانی ئەم تەلەفونەی». ئەو هەستە لە چییەوە هاتبوو ... هۆکاری چی بوو؟ نەمدەزانی.

کاتژمێر دوو و نیوی شەو، لە شەقامی حاجی عینایەت سوار ئۆتومبیلێکی سپی بووم و بێئەوەی بزانم شۆفێرەکەی بۆ کوێم دەبات، خۆم دایە دەست غەریبەیەک تا بە شەقامە تاریکەکانی دیلاواردا بەرەو جێگایەکی نادیار، بە خێراییەکی شێتانە بمفڕێنێت.

# ٢١

هەندێ چیرۆک هەن، بێ هیچ هۆیەکی تایبەتی ئازارت دەدەن، هەستدەکەیت تۆ ئەم چیرۆکە دەزانیت، بەڵام بە زۆر لە یادی خۆتت بردۆتەوە. وادەزانی ئەم حیکایەتخوانەی بەردەمت، کەسێکی مەکربازە و بە نیازێکی ناپاک ئەو چیرۆکەت بیردەخاتەوە کە تۆ دەتەوێت لە بیریبکەیت. پرۆفیسۆر بەهێنام بە مەکرێکەوە گووتی «بەڵێ... بەڵێ... تێدەگەم... حەقی خۆتە ماندووبیت، ئەو جۆرە چیرۆکانە زۆر ئازاردەرن کە یەکەم جار لە خەیاڵدان و دواتر دەبنە حەقیقەت. بەڵام هەموو کارەساتی دونیا بەو جۆرەیە، سەرەتا لە خەیاڵدایە و دواتر دەبێتە حەقیقەت».

وەک ئەوە بوو بزانێت، من چی لە خەیاڵمدایە.

ئەو دوا نیوەڕۆیە لە نوسینگەکەی پرۆفیسۆر بە تەنیا و بە لەزەتێکی زۆرەوە نانم خوارد، لە ڕۆژانی دیکە برسیتربووم، شێوەی نانخواردنەکەم پەلە و نەوسنانە بوو، زوو زوو سەرم بەرزدەکردەوە نەبا کەسێک بمبینێت، نەمدەویست کەس لەو چلێسییە کتوپڕەدا تەماشامبکات. دڵم ترسێکی تێدابوو دەمویست خواردن دایپۆشێت و بیرم بەرێتەوە. دواجار کە تێربووم، هەستمکرد زۆر تێربووم. هەستمکرد بە جۆرێکی قێزەون تێربووم، بە شێوەیەک ڕقم لە خۆم بوو. کە پرۆفیسۆر گەڕایەوە سەیری چاوی کردم

و تێگەیشت من بۆ شتێک دەگەڕێم دوودڵی و نائارامی خۆمی پێ داپۆشم. فەرمانی بە بەردەستەکانی دا، پاشماوەی خواردنەکەم کۆبکەنەوە. دڵنیابووم نایەوێت کاتێکی زۆر بە فیڕۆبدات، یەکسەر دەستی خستە سەرشانم و گووتی «هیوادارم دانیال نەتترسێنێت، دواجار ئەویش هەر چیرۆکێکە. کتێبخانەکەم پڕە لە هەزاران چیرۆک. من وەک مێژوونوس فێربووم چیرۆک و حەقیقەت تێکەڵبکەم، ئەوە نەخۆشی کوشندەی مێژوونوسانە، شێرپەنجەی ئەوانە، بەردەوام چیرۆک و حەقیقەت تێکەڵدەکەن. تۆ دەتوانیت وانەبیت... بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە کەسایەتی دانیال بوونی نەبووە، مرۆڤ مەخلوقێکی زیرەک نییە، گەر حەقیقەت نەبینێت ناتوانێت ئەفسانەش دروستبکات». ئەمجارە زۆر بە دەنگی بەرز پێکەنی، من خۆم کەسێکی دوودڵ و بەد گومان بووم، لە دۆخێکی رۆحی نائارامیشدا بووم، پێکەنینەکەی ئازاریدام. خۆی زوو هەستی پێکرد و گووتی «سەیرکە با ڕاستییەکت پێبڵێم، من لەو باوەڕەدام خەڵک لە دیلاوار پێش هاتنی دانیالیش هەر خەونیان بینیوە، بەڵام سەدان ساڵ چاوەڕوانی دانیالیان کردوە تا بێت و بڵێت ئێوە خەون دەبینن. وڵاتی ئێمە بەو جۆرەیە، خەڵک شتە هەرە سادەکانی بەر لووتی خۆیان نابینن، سەدان ساڵ دەچەوسێنەوە، کەچی دواجار دەبێت یەکێک بێت پێیان بڵێت ئێوە دەچەوسێنەوە، گەر خودا لە کتێبێکدا بیگووتبایە خەون بۆ هەتاهەتایە قەدەغەیە، ئێستا هیچ مرۆڤێکت نەدەبینی دان بەوەدا بنێت کە خەون دەبینێت».

لە جێگای خۆی پاڵیدایەوە، جەختێکی سەیری تێدابوو ئەو چیرۆکە بۆ من بگێڕێتەوە.

«دانیال کەسێکە بەرگەی درۆکەی نەگرتووە، لە کتێبی دانیالدا هاتووە «قەسابی ڕاستەقینە، ئەو قەسابە نییە کە لە بازاڕدا گۆشت دەفرۆشێت، ئەوە نییە لە مەیدانی شەڕدا خەڵک سەردەبڕێت، ئەوە نییە لە زیندانەکاندا

سـەری تاوانباران دەپەڕێنێت، بەڵكو ئەوەیە لـە خەونەكانتدا دەیبینیت و تەنیا بۆ تـۆ چەقۆی هەڵگرتـووە». بەڵـێ، لـە نـاكاو خەڵكی دێلاوار ئـەو ڕاسـتییە دەدۆزنـەوە كـە دەبێت لـە خۆیـان بترسـن، دەبێت لـە جانەوەرەكانـی ناخیـان بسـڵەمێنەوە، بـۆ یەكـەم جـار دەروونـی خۆیـان دۆزیوەتـەوە، زانیویانـە چ تۆفـان و تـرس و خوێنێـک لـە ناویدا خەوتـووە. بـەڵام چ هێزێـک، چ كەسـێک، چ میللەتێک هەیە باوەڕبكات كە ناخی پڕە لـە تاریكی؟ نا هیچ كـەس ئامـادە نییە بچێتە ژێر باری حەقیقەتی وەهـا، هەمـوو ئەوانـە ئامـادەن سـەدان سـاڵ شـەڕبكەن، كاولكارییكەن، بـەڵام بۆ كورتـە سـاتێكیش چییـە باوەڕنەكەن كە كوشـتەی وەهـم و تـرس و دڵەڕاوكێكانـی خۆیانـن. دانیـال ئـەو ئاوێنەیەیـە كە بـە هەمـوو شارێک، بـە هەمـوو جێگایەكی ئـەم دونیایـە دەڵێت، سـەرەتا جانـەوەرەكان لە دەرەوە نین، بەڵكو لێرەدان، لـە دڵـی خۆماندان، لە هەسـتە وروژاو و ترسـاوەكانماندان. «شـەیتان بوونـی نەبـوو، ڕاوچییـەكان بـەر لـەوەی بچن بۆ ڕاوشكار دروستیانكرد» دانیال وایگووتووە. واتـە شـەیتان زادەی تینیوێتی مرۆڤە بۆ كوشتن و ڕاوكردن و لەتكردنـی گۆشتی ئەوانـی تـر. دانیـال نوسـیویەتی « باشـترین ڕێـگا بـۆ ئاسـوودەكردن و تێركردنـی شـەیتانەكەی ناخت، ئەوەیە ڕاوی شـەیتانێكی تر بكەیت، شـەیتان حـەزی لـە هیچ شـتێک نییـە، ڕاوی خـۆی نەبێت».

حیكایەتەكـە دەڵێت، كاتێـک خەونەكـەی دانیـال بڵاودەبێتـەوە، ئێوارەیـەک سـەدان كەسـی تـوڕە لـە بـەردەم زینداننـی گـەورەدا كۆدەبنـەوە و هـەرا و زەنـای گـەورە سـازدەكەن، دەیانەوێت ئاگـر لـە زینـدان بـەردەن، داوادەكـەن دانیـال بدرێتـە دەسـتیان و بیسـووتێنن، وادەزانـن بـەوە ڕزگاریـان دەبێـت. زۆربـەی خەڵک ئـەوە دەچێتـە مێشـكیانەوە كـە دانیـال جادوبازێكی گەورەیە، وادەزانـن هـەر خەونێـک ئـەوان دەیبینـن، هـەر وەسوەسـەیەک چۆتـە دڵـی ئـەوان، هێزێكـی بـەد كـە لـە دانیالـەوە هاتـووە دروسـتیكردوە. خـۆی بـە ڕووی خەڵكدا هـاواردەكات «گرمـەی هەورەكانـی سـەری من، لەگـەڵ گرمـەی

هەورەکانی سەری ئێوەدا یەکێکە، هاواری من، نیشانەی ترسەکانی ئێوەیە». خۆی لە کتێبەکەبدا نوسیویێتی «من ترسم دروست نەکردوە، من تەنیا دۆزیومەتەوە». لەوەدا لەسەر هەق بووە. دێلاوار بە درێژایی سەدان ساڵ وەک شارێکی خۆشبەخت و هێمن بە دەوری زیندانەکاندا دامەزراوە، مرۆڤ لە بیری چۆتەوە کە ئێرە بەهەشت نییە، بەڵکو شاری دیلە بێخەونەکانە. بەلام خەڵکی ناتوانن ژیانی خۆیان بگۆڕن، لە بەرئەوە بەردەوام بۆ گوناهبارێک دەگەڕێن، بۆ دوژمنێک دەگەڕێن ئەو ئیفلجی و ترسەی خۆیان لە بیرببانەوە. من مێژووم خوێندۆتەوە، بیرت نەچێت من پرۆفیسۆری مێژووی دێلاوار نیم، پرۆفیسۆری مێژووم، مێژوو بە گشتی. سەرەتا گوناهبار دروستکراوە و دواتر گوناهـ گەر ئەو ڕاستییە نەزانین هیچ شتێک لە مێژووی مرۆڤ تێناگەین. دێلاوار خاکی هەزار زیندان، تا ئەو کات گوناهباری گەورەی خۆی نەبوو، دیلەکانی زۆربەیان میوان بوون و لە جێگای ترەوە هاتوون. تا ئەو کاتە کەسێک نەبووە هەمووان پێکەوە نەفرەتی لێ بکەن. هەموو شارێک، هەر چەند ساڵ جارێک پێویستی بە کەسانێک هەیە نەفرەتیان لێ بکات، تا بتوانێت بژی ... نەفرەت خوانی مرۆڤەکانە، لە دێلاوار، خەڵکی تەنیا و تەنیا لەسەر سوفرەی نەفرەت دەتوانن کۆببنەوە».

پرۆفیسۆر بێدەنگی و گوێگرتنی منی بەکاردەهێنا تا خێراتر و ڕوونتر قسەبکات، لەو کەسانەبوو گەر قسەی پێ نەبڕیت خۆی وەلامی هەموو پرسیارێکت دەداتەوە.

«کتێبی دانیال، ئەو کتێبەی تۆ گرتت بە دەستەوە، بەڵگەیەکی مێژووییە، کتێبێک نییە مرۆڤ لێی بترسیت. هەموو ئەوانەی ئەو کتێبە دەگرن بە دەستەوە ترسێک دایاندەگرێت. ئەم کتێبە دوژمنی زۆرە، زۆر دەست دەیانەوێت بیسووتێنن. هەر شارێک بۆ نەفرەت بگەڕێت خەونەکانی

پڕدەبێت لە تارمایی ترسناک. خۆی دەڵێت «ڕۆژێک دێت شارەکان پڕدەبن لە نەفرەت، ئەم شار دەبێتە دوژمنی ئەویتر، ئەم نیشتیمان بە نەیاری ئەویتر، ئینسانەکان دەستە دەستە و تاقم تاقم دابەشدەبن، جگە لە چەقۆ زمانێکی تر قسەناکات، جگە لە خوێن ڕەنگێکی تر نامێنێت، جگە لە ئاگری شاڵاو، ئاگرێکی تر لەسەر زەوی ناکرێتەوە «. دانیال زانیویتی کە دیلاوار بۆ گوناهبار دەگەڕێت، خەڵکانی ترساو هەموو بۆ گوناهبار دەگەڕێن. تا ترس گەورەتر بێت مرۆڤەکان دڕتر و خوێنڕێژتر دەبن. بزانە ئەو کەسانەی دەبنە تۆقێنەر و دروستکەری ترس، لە ناخی خۆیاندا لە هەر بوونەوەرێک ترساوترن. لە مێژوودا هەر کەس کوشتاری گەورەی کردبێت، بۆئەوە بووە بەسەر ترسەکانی خۆیدا سەربکەوێت. خوێنڕێژێک نییە لە مێژوودا ترسنۆک نەبووبێت، هەموو خوێنڕێژەکان ترسنۆکن. هەر شارێکیش تووشی دەردی نەفرەت و کینە بوو، پێشتر بە ترس و هەراسی گەورەدا ڕۆیشتووە. بیرت نەچێت، ڕق دایکی هەموو بەڵاکانە، ئەوانەی لە دیلاوار خەونیان دەبینی، خەوبین نەبوون، بەڵکو بۆ بەهانەیەک دەگەڕان کینە و تووڕەیی خۆیان بهێننە دەرێ، بۆ هۆیەک دەگەڕان یەکێک بە مایەی ترس و بیماری و بەدبەختی خۆیان بزانن و جانەوەرەکەی ناخیانی بۆ لەخەو هەستێنن ... دانیال دڵنیایە کە حاکمەکانی دیلاوار دەیانەوێت بیکەن بە قوربانی ترسەکانی خۆیان، دەزانێت فەرماندارانی دیلاوار پلانی ئەوەیان هەیە ڕادەستی خەڵکانی تووڕەی بکەن، کەسانێک دەیانەوێت بە گۆڕینی دانیال بۆ شەیتان، خۆیان لە بەردەم شەیتانەکەی ناخی خۆیاندا پاکبکەنەوە. مرۆڤ بۆئەوەی شەیتانەکەی خۆی تێربکات، دەبێت شەیتانێکی تر دروستبکات و بیسووتێنێت. خۆی لە جێگایەکدا بە خەڵکی ئەو زەمانی دیلاواری گووتووە «شەیتانی ڕاستەقینە، تەنیا بە خواردنی گۆشتی شەیتانێکی دەستکرد تێردەبێت». بەڵێ، ئێستاش بە هەمان شێوەیە، تا من تۆ نەکەم بە شەیتان ناتوانم گۆشتت بخۆم و بتسووتێنم.

شەوێک بە پێچەوانەی هەموو چاوەڕوانییەکانەوە دانیال لە زیندان هەڵدێت. ئەوە یەکەمجار دەبێت لە مێژووی دێلاواردا زیندانێک هەڵبێت. هەڵهاتنی دانیال شیرازەی ژیان لە دێلاوار تێکدەدات، شارەکە دەکەوێتە ترسێکی گەورەوە، لە ماوەی دوو هەفتەدا پتر لەسەد کەس بە تۆمەتی ئەوەی لە دانیال دەچن لە شوێنی جیاواز جیاوازدا و بەشێوەی دڕندانە سەریان دەپەڕێنرێت و لاشەکانیان دەسووتێنرێت. لەگەڵ دانیالدا مێژووی قەسابخانەکان دەست پێدەکات. لەو سەردەمەدا یەکەمین کۆمەڵەی نهێنی دروستدەبێت، کە ئیشیان ڕزگارکردنی مرۆڤەکانە، هەندێک دەڵێن کتێبی دانیال لە کاری ئەو کۆمەڵەیەیە. دانیال دڵنیابووە قەسابەکان لە خەوهەستاون، سەربڕەکان بەزەییان بە هیچدا نایەتەوە، ڕێنمایی لایەنگرانی دەکات یەکتری بپارێزن، حەشارگە دروستبکەن، وە هیچ کات نەچن بۆ هیچ جەنگێک. دوای ئەوە بە ماوەیەک دێلاوار دەچێتە جەنگێکی مەزهەبییەوە نزیکی سەد ساڵ دەخایەنێت. لەو سەدەمانەدا دانیالییەکان، ئەوانەی ئیشیان پشکنینی ڕیشەکانی خراپە و توندوتیژی ناو مرۆڤ بووە، وەک خائین، خەیالاتی، بێبڕوا سەیرکراون. لەسەردەمێکدا دانیالییەکان لە ناو دەچن، یەکە یەکە هەموو دەکوژرێن، بەڵام خواستی ئەوەی مرۆڤ بە دوای ڕیشەکانی دڕندەیی و بێڕەحمی ئینساندا بگەڕێت، هەمیشە لای کەمایەتییەک دەمێنێتەوە.

«تۆ من وەک دوژمن دەبینیت و من تۆ وەک دوژمن دەبینم ... تۆ من وەک جەلاد دەبینیت و من تۆ وەک جەلاد دەبینم ... ڕۆژێک شەڕێک لەسەر زەمین ڕودەدات کە هەموومان تێیدا جەلادین و بێ گوناهی تێدا نییە». ئەوە سەرەتای ئەم مێژووەی ئەمڕۆیە، سەرەتای ئەو خەونەیە کە دێلاوار دەیبینێت. سەیرکە ڕێنوار... کتێبی دانیال دەڵێت؛ خەڵک بۆئەوەی ببن بە دڕندە، پێویستیان بە هیچ بەهانەیەک نییە، بەهانەکان دواتر

دروستدەبن، ئینسان دوای کینە، دوای ڕق، بەهانەکانی خۆی دەتاشێت. دینەکان، نەتەوەکان، مەزهەبەکان بەهانەن بۆ نەفرەت و کینەیەک کە پێشتریش لە مرۆڤدا هەبووە. مرۆڤ بەر لەوەی خودا بناسێت، بەر لەوەی زمان فێربێت، بەرلەوەی بزانێت سەر بە چ نەتەوەیەکە، کینە و نەفرەتێکی گەورەی تێدابووە. ڕقی مرۆڤ لە مرۆڤ ئەزەلییە، لە پێش دروستبوونی شارستانییەتەوەیە، هێزێکە بە یەک شێوە بوونی هەیە و درێژەی هەیە و بەردەوامە، هەندێ جار کەمدەکات و هەندێ جار بەهێز دەبێت. لە هەندێ جێگادا خاودەبێتەوە و لە هەندێ قۆناغی تردا گڕدەستێنێت. ئایا مرۆڤ هیچ کات لە دەست ئەو ڕقەی ناو ناخی خۆی ڕزگاری دەبێت؟ نازانم. ڕەنگە تۆ و مامە سیات باشتر بزانن، ئیشی ئێوە لەسەر جیهانی دەروونە و ئیشی من لەسەر ڕووداو و بەڵگەیە. بەڵام من دڵنیام هەرچییەک بکەین و چەند هەوڵبدەین، چەند پاک بین و چەند بمانەوێت خۆمان وەک مرۆڤی بێ کینە دەربخەین هەمیشە کەسێک و شتێک هەیە کە بێ هۆیەکی مەنتیقی دەمانەوێت لە ناوی بەرین... هەمیشە دوژمنێک هەیە دەمانەوێت لەتوپەتیبکەین. من ئەم مۆزەخانەیەم بۆئەوە دروستکرد تا خۆم بە سەردەمە کۆنەکانەوە سەرقاڵبکەم، بەڵام هێشتا پڕم لە کینەی گەمژانە... بەڵێ، کێ هەیە پڕ نەبێت لە کینەی وەها. هیچ کەس. لەم سەر ئەستێرەیە هیچ مرۆڤێک نییە پڕ نەبێت لە کینە.

دانیال کە لە زیندان هەڵدێت ئیتر بێ ئەسەر وندەبێت و هیچ کەس نازانێت چی بەسەردێت... ئاخۆ لە دانیالکوژییەکەدا بەرکەوتووە، ئایا هەڵهاتووە، لە بەرگی کەسێکی تردا خۆی گۆڕیوە و هەر لێرە ژیاوە؟ کەس نازانێت. بەڵام بەش بەش کتێبێکی نهێنی لێرە و لەوێ بڵاودەبێتەوە بە ناوی کتێبی دانیالەوە. کتێبەکە، کتێبێک نییە بڕوایەکی تێدا بێت، ئیمانێک، یان مەزهەبێک، بەڵکو سیپارەی ڕەوینەوەی وەهمە ... لەو سەردەمەوە تاکە شتێکی سەیر کە هەمیشە دووبارەدەبێتەوە ئەوەیە، هەر کاتێک

شـەڕانگێزیی زۆر دەبێت، جەنـگ نزیکدەبێتـەوە، مرۆڤـەکان دەکەونـە گـەڕان بـە دوای دوژمنـدا، ئیتـر هـەورەکان دەگەڕێنـەوە و دەسـتدەکەن بـە بارین.. هەورەکان دەکەونـەوە گەشت لەسـەری ئێمـەدا، لەسـەری ئەوانـەدا کە هەست بـە نزیکبوونـەوەی کارەسـات دەکـەن».

کەمێک وەستاو و سەیرێکی منی کرد و گووتی «تۆ بۆچی هاتوویت؟ هەموو شتێک ئاشکرایە. ئەوەی ئەمڕۆ تیا دەژین، سەرەتای کارەساتەکانە... تۆ نایبینیت؟».

من لەوێدا هەڵمکووتایە ناو قسەکانی و گووتم «تۆ دەڵێیت ئەو کەسەی لە خەونەکەی ئێستادا دەردەکەوێت هەر خودی دانیالە.. هەر ئەوە گەڕاوەتـەوە؟»

پرۆفیسۆر کەمێک سەرسام و ترساو سەیریکردم، پێدەچوو پرسیارەکەم شڵەژاندبێتی، گووتی « ئـەوەی لـە خەونەکەی ئێستادا دەردەکەوێت جەلاد نییە، بەڵکو لـە هاتنی جەلاد ئاگادارماندەکاتەوە. بەدرێژایی مێژوو، خەڵکی درەنـگ لـەو پەیامانـە تێدەگـەن. هـەر کەسـە و جـەلادی خـۆی دەبینێت، تـا کەس نەبێتـە جەلاد. بـەڵام ئارەزووی کوشتن لـە مرۆڤدا لـە هـەر ئاگاداری و پەیام و پێغەمبەرێک گەورەترە. لـە هەندێک سـەردەمدا مرۆڤ هەمـوو هێزی خەیـاڵ و عەقڵی دەخاتـە خزمـەت ئارەزووی کوشتنەوە، هـەر پێغەمبەرێکیش بێـت و ئاگادارمانبکاتـەوە، پەیامەکـەی دەبێتـەوە بـە چەقـۆ و دووبـارە دەچەقێتـەوە گۆشتی ئێمـە. دانیـاڵ حەکیمێکی ئاسـایی بـووە، زانیوێتی سـەری دەپەڕێنـن، دەیسـووتێنن، لاشـەکەی بـە زەویـدا ڕادەکێشـن، نـە لەبەرئـەوەی شـەیتانە یـان گوناهێکی کـردوە، بەڵکو لەبەرئـەوەی ئەوانی تر بەوە ئاسـوودە دەبن. «ئـەی ئـەو کەسـەی دەمکوژیـت، تـۆ بـۆ وا ئاسـوودەیت؟ « ئـەوە پرسیاری یەکەمـی دانیالـە، پرسیارێک کـە مـن تـا ئێسـتا وەڵامەکـەیم چنـگ نەکەوتـووە». کەمێـک وەسـتاو و نیـگای بـەرەو جێگایەکـی نادیـار لـە بـاڵادا

بەرزکردەوە و گووتی «بەلام هەورەکان شتێکی ترن، هەورەکان چەند ساڵە لەگەڵماندان، یان هیچ نەبێت لەگەڵ مندان، هەورەکان شتێکی ترن». ئینجا دەنگی زۆر نزمکردوە، هێند نزم منیش بە ئاستەم گوێم لێ بوو «ئەوان لە تاریکییەوە دێن، تاریکییەک کە من بۆم دەستنیشان ناکرێت. پێش هەموو کارەساتێکی گەورە هەورەکان دەگەڕێنەوە... کارەسات قەدەر نییە، لە غەیبەوە دانابەزێت. ئینسان دەیبینێت، دروستیدەکات، بەشداری تێدا دەکات. هەورەکان نیشانەی هەستی ناوەوەمانە، نیشانەی ئەوەیە ... ئێستا چەند هەفتەیە لەسەری مندا دەستیانکردوە بە بارین».

من بە دوودڵییەوە پرسیم « چۆن لەسەری تۆ دا دەبارێن؟ بۆ دەبارێن؟ ... ».

پرۆفیسۆر سەری لەقاند « ئەی من چیت پێدەڵێم، لە بەرئەوەی کارەسات بەڕێوەیە. دەبێت یان لە دیلاوار هەڵبێین یان کۆمەکی یەکتر بکەین. ئەمجۆرە شارانە مەڵبەندی ترسن. کوچەی ئەم شارانە، شەقامیان، باغیان، هەموو شتێکیان پڕە لە نیشانەی مۆتەکەیەک، دێوەزمەیەک کە دەنیشێتە سەر گیانمان. دیلاوار بەردەوام چاوەڕوانی ئەوە دەکات دڕندەیەک، جانەوەرێک، کارەساتێکی گەورە بدات بە سەریدا و وێرانییکات. ئەو چاوەڕوانییە چووەتە خوێنمانەوە، دیلاوار یەکجار و بۆ ئەبەد تووشی ئەو دەردە بووە ... هەندێ جار پەنجا ساڵ، سەد ساڵی ئارام تێدەپەڕێت، بەلام هەموو ئەو ئارامیانە درۆن، ڕۆژێک کەسێک دێت، خەونێک دێت، مەزهەبێک دێت و بە خەڵک دەڵێت دوژمن هاتووە نابوتتان بکات. ئەوە دووبارە هەموو گیانمان پڕ دەکاتەوە لە ئارەزووی جەنگ. من سی ساڵە دەخوێنمەوە بۆ ئەوەی بزانم، ئایا ئەو ترسە دەرمانی هەیە. ئاخۆ فەلسەفەیەک هەیە بتوانێت بە مرۆڤ بڵێ لە مرۆڤ مەترسە، بەلام نییە... هیچ کتێبێک نییە مرۆڤ فێربکات لە مرۆڤ نەترسێت».

ڕەنگە پرسیارەکانم منداڵانە بووبێت، بەڵام من جگە لە پرسیاری منداڵانە خەیاڵم بۆ هیچی تر نەدەچوو. وەک لە بەردەم فاڵگرەوەیەکدا وەستابم بە تکاوە پرسیم «ئەی جەنابی پرۆفیسۆر دێلاوار چی لێدێت؟». پرۆفیسۆر کەمێ بێدەنگ بوو، ئینجا بە دەنگێکی نزم گووتی«من خۆم بۆ شتی ترسناک ئامادەدەکەم. دەبێت دەستبەردارنەبین، دەبێت دانەنیشین، مرۆڤ ناتوانێت دونیا بگۆڕێت، بەڵام دەتوانێت درندە نەبێت. لە شارێکی وەک دێلاواردا، دەبێت هەر ژیانێک کەوتە مەترسییەوە بیپارێزین. ئەوە بڕوای من بووە، ئەوە تاکە شتێکە من ئیمانم پێیەتی».

دوا ڕستەی پرۆفیسۆر بەهنام ڕستەیەک بوو لە کتێبی دانیال «گەر ڕۆژێک هەورەکانت بینی، ئاگاداربە، خەریکە لە ڕاستی نزیکدەبیتەوە. ئاگاداربە، ڕاستییش هەمیشە نزیکی دۆزەخە».

من لای پرۆفیسۆر هاتمەدەرێ و بەردەوام لە بەر خۆمەوە ئەو دواهەمین ڕستەیەم دەگووتەوە. من نەمتوانی جارێکی تر بەوجۆرە لەگەڵ پرۆفیسۆردا دانیشم و سوود لە زانستەکانی ببینم، کە هاتمەدەرێ باوەڕم نەدەکرد ئیدی جارێکی دی ببینمەوە، بەڵام زۆری نەبرد لە جێگایەکی سەیردا چاومان بەیەکدی کەوتەوە.

# ٢٢

ئاڵ موراد بۆی گێڕامەوە :

کە چوومە ڕیزی باغەوانەکانی دێلاوارەوە، بەوەدا دەستم زۆر ڕاست بوو، هەر زوو لەگەڵ دەستەی یەکەمدا، بوومە خاوەنی یەکێک لە تفەنگە کەمەکانی سوپا بچکۆلەکەمان. بەفەرمانی سەی ئەسلان هێزەکەمان ناوی «سوپای باغەوانەکانی دێلاوار» ی لێنرا . من کورتەبالاترین تفەنگ بەدەست بووم، دەبێت بڵێم وەک ئەوانی تر خەونی ئەو پیاوە سەرپەڕێنەم نەدەبینی، لەگەڵ ئەوەشدا وەک هەزارانی تر دەمگووت بەڵێ ئەو خەونە دەبینم. جارێک ئەو درۆیەم کردبوو و لەگەڵیدا تووشی دەردەڕەشی خۆم بووبووم و نەمدەتوانی لێی بێمە دەرێ. خەونەکە شتێکی وا ئاڵۆز نەبوو نەکرێت منیش دایبڕێژمەوە، خەونەکە بوو بوو بە قاڵب و کلێشەیەک کە هەر کەس بیوستایە دەیتوانی بۆ خۆی و بە ئارەزووی خۆی دروستیبکاتەوە، بە مەرجێ درۆ و زیادەڕەویی زۆریێ پێوەنەنێت، خەونەکە ئێستا بووبوو بە حیکایەتێکی سادە کە هەر منداڵێک دەیتوانی بە شێوازی خۆی بیگێڕێتەوە. هەر ئەو کاتیش باوەڕم وەهابوو ئەوانەی بە ڕاستی خەونەکە دەبینن، ژمارەیەکی کەمن... بەڵام منیش لای خۆمەوە پێم خۆش بوو، وادەربکەوم وەک لە ژێر هێرش و پەلاماردابم، وەک ئەوەی نەفسێک بم دوژمن نیشانەی لێ گرتبمەوە. ئەو ماوەیە سەی ئەسلان

ڕۆژانە نوسینێکی خۆی بڵاودەکردەوە، نوسینەکانی هێشتا بە دەستنوس و بە نوسراوی کاربۆنی دەستاودەستیاندەکرد. لەو کاتەوەی چووبووە لای فەرماندار و باغەوانەکانی بە ڕەسمی دامەزراند، ئاسانکاری زۆر بۆ دەکرا، خەڵکی دەیانگووت سەی ئەسلان بۆتە پیاوی بنەماڵەی ماروفی و قەرەقازانی، ئەو نوسینگەیەکی تایبەتی دانابوو، سێ کەس تێیدا نوسینەکانی ئەویان بە دەست دەنوسییەوە و سیانی دیش دابەشیاندەکرد. ئەو دژی تەکنیکی نوێ بوو، گەر ناچاری نەبایە نەیدەهێشت دەستیشمان بەر چەک و تفاقی تازە بکەوێت، بڕوای وابوو چەکی پیاوی قارەمان هەر تەور و خەنجەرە و هیچی تر، بەڵام چونکە دوژمنی ترسنۆک چەکی دوورهاوێژ بە کاردەهێنن، ئێمەش دەبێت گەوجی نەنوێنین و خۆمان وا تەیاربکەین، بۆ شەڕی مان و نەمان ئامادەبین. سەی ئەسلان لە نوسینەکانیدا ئەو هەستەی لا دروستدەکردین کە هەر یەک لە ئێمە و بە تایبەت لەلایەن دوژمنەوە کراوینەتە ئامانج. ئەو هەستە زۆر شانازییەکی گەورەی تێدا دروستدەکردم، من گەرچی ترسێکی نهێنیم لە سەی ئەسلان هەبوو، بەڵام ئەوەی هەستمدەکرد کە دوژمن نیازێتی من بگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی ترسنۆک، غیرەتێکی زۆری دەدامێ.

من لە مەشقگاوە وەک دەستڕاست ناوبانگم ڕۆیشتبوو، ڕۆژێک فاتیحی سەید فەتحوڵای هەڵاج هات بۆ لام و گووتی هەستە با بڕۆین تفەنگی خۆت وەربگرە. ئەو کات چیرۆکی ماسیگرە کوژراوەکان و پەلاماردانی پەیتا پەیتای دوژمن بۆ سەر گوندەکانی سنوور قسە و باسی ڕۆژانە بوون. ڕاستە من دەستم ڕاست بوو، بەڵام دەنگی فیشەک و ناڵەی گوللە دەیانترساندم. دەبوو هەر چییەکم کردوە بەسەر ترسەکانمدا سەربکەوم، چونکە بێئەوەی بزانم چۆن، ئەم واجیبە هاتبووە سەر ڕێگام و دەبوو جێبەجێیبکەم. دڵنیابووم پێم خۆش بێت یان ناخۆش، هەر دەبێت ببم بە جەنگاوەر، دەبوو هەر کاتیش فەرمان هات و ڕابەرمان گووتی چەک

هەڵبگرن، گوێڕایەڵ و ئامادەبم. سەیی دەیگووت «ئەو ڕۆژە زۆر نزیکە یان دەبێت ئێمە سەری دوژمن بپەڕێنین یان دوژمن سەرمان بپەڕێنێت، خاک بەسەری ئەو کەسەی ئامادەی شەڕ نییە». سەی ئەسڵان پرۆژەیەکی پێشکەش بە فەرماندار کردبوو، تا لە قوتابخانەکان مەشقی چەک دەست پێبکات. فاتیحی سەید فەتحوڵا دەیزانی من زۆر ڕاحەت و شادومان نیم، ئەو گووتی «درەنگ یاخود زوو هەموو دەبێت چەک هەڵبگرن، ئێمە شانسدارین زوو چەکی خۆمان دەست کەوتووە».

ئەو ئێوارەیە من و فاتیح چووین بۆ بنکەیەکی تایبەت، لەوێ حامید سوڵتان و بۆقبۆقیلەمان بینی لەگەڵ پیاوێکدا ناوی حوسامی قەرەقازانی بوو، کە هەموو دەیانگووت نوێنەری جەنابی فەرمانداره. لەوێ ڕیزمان بەست و من و هەژدە کەسی تر تفەنگمان وەرگرت، ئێمە یەکەم دەستەی تفەنگ بەدەستان بووین. لەگەڵ تفەنگەکەدا هەر یەکەمان پسوڵەیەکی ڕێپێدانی هەڵگرتنی چەکمان پێدرا، لە پسوڵەکەدا نوسرابوو هەڵگری ئەم چەکە لە کاتی پێویستدا دەتوانێت بۆ بەرگری لە خۆی و نیشتیمان بەکاریبهێنێت، پسوڵەکانمان بە ناوی سوپای پارێزەرانی دێلاوارەوە بوو، مۆری جەنابی حاکمی سەربازی لەسەربوو، بەڵام بۆقبۆقیلە بە منی گووت ناوی ئێمە هەر وەک خۆی وەک باغەوانەکانی دێلاوار دەمێنێتەوە. هەر ئەو شەوە هەشت لە تفەنگچییەکان بۆ یەکەمین جار لە غەفاریی یەکەمین ئەرکمان پێسپێردرا. بەوەدا سەی ئەسڵان خۆی لە باڵندەکان دەترسا، لە قەڵەڕەشەکان دەترسا، دەبوو وەک یەکەمین دەرچوون و یەکەمین ئەزموون لە کوشتنی باڵندەکانەوە دەست پێبکەین. سەی ئەسڵان هۆی باڵندەکوژییەکەی وەها پاساودابوو کە ئەوەی لە خەونی گەنجەکاندا دەفڕێت و دڵیان دەترسێنێت ئەم باڵندانەیە. شەو بە خۆمان و تفەنگەکانمانەوە لە ماڵی بۆقبۆقیلە خەوتین، دایکی ژنێکی میهرەبان بوو کە بینینی تفەنگەکان دڵی خستبووە خورپەوە ... دووجار پێمگووت دایە گیان نەترسێت، پسوڵەکانمان مۆری

حاکمی سەربازیی پێوەیە. لە ڕاستیدا من زۆر دڵم بە پسوڵەکە و بە مۆرەکەی حاکم خۆشبوو، کاتێک دەمگرت و تەماشامدەکرد هەستم بە دڵنیاییدەکرد. ئەو گووتی «کوڕی خۆم ئەوەی لە تفەنگ نەترسێت، لە خوداش ناترسێت». ئەو شەوە هەر هەشتمان پێکەوە نوسینێکی تازەی سەی ئەسلانمان خوێندەوە کە بە بۆنەی دامەزراندنی یەکەمین گوردانی سوپای دێلاوارەوە بڵاویکردبووەوە. سەی ئەسلان نوسیبووی دوژمن لە بەر دەرگایە و پلان و نەخشەکانی بەرەو نابووتیمان دەبەن. چەند جار هاواریکردبوو «دەی میللەت لە خەو هەستن درەنگە، تاکەی ئێوە لە خەوی غەفڵەتدا نوقم و لە بەحری زیلەتدا دەژین». باوەڕی وابوو ئەم کۆمەڵە گەنجەی گەڕەکی غەفاریی بەردی بناغەی سوپایەکی سەدان هەزار کەسین کە وەک گڕکانێک هەڵدەستن و دێلاوار دەکەن بە هێزێکی نوێی لە بن نەهاتوو، هێزێک جیهان حسابی بۆ بکات و دوژمنان لەبەردەمیدا بلەرزێن. نوسیبووی ئەم لاوانە دەبن بە ڕەمزی ئیفتیخار و هەڵگری چرای پاشەڕۆژ. ئەو زمان و ئینشایە هەموو گەنجانی مەستدەکرد، من نەبێت. من کە ئەو هات و هاوارەی ڕابەرم دەخوێندەوە، حەزمدەکرد دەستبخەمە سەر دەمم و پێبکەنم. بەڵام هەستمدەکرد وردە وردە ترسێکی نهێنیم تێدا دروستدەبێت و ناوێرم بە ئاشکرا بە هیچ قسەیەکی سەی ئەسلان پێبکەنم. من بۆم گرنگ نەبوو سەی ئەسلان چی دەنوسێت و چۆن بیردەکاتەوە، ئەوەی من زۆر حەزم لێ بوو، ئەوەبوو بەیانی بەر لە کەوتنی خۆر و پێش ئەوەی زەوی ڕوناک بێتەوە دەچین بۆ ڕاوی باڵندەکان. لێتی ناشارمەوە حەزم لە تەقەکردن بوو، ئەوەی نیگا لەگەڵ جاسوسی تفەنگەکەدا جووتبکەم و نیشانە لە شتێک بگرمەوە و بیپێکم، لەزەتێکی بێوێنەی هەبوو... پێکان ... ئەو وشەیە وەها مەستیدەکردم، مەپرسە. ئەو شەوە تا بەیانی تفەنگەکەمم کردە باوەش و تەنیا بیرم لای لەزەتی ئەو کاتە بوو کە نیشانەیەک دەپێکم... ئەوەی ناوبانگم وەک دەستڕاست و نیشانەپێک گەیشتبووەوە خودی سەی

ئەسلان، مایەی شانازیی بوو بۆ من.

بۆ سبەی دوای ئەوەی دونیا کەمێک ڕوناک بووەوە، بۆقبۆقیلە هەموومانی لە خەو هەستان و پێی گووتین پشکنینێکی سادە بۆ تفەنگەکانمان بکەین و لە ماڵ دەرچین. هاوڕێکانم هەر حەوتیان بە دەنگ و لەفزێکی تورە و ناڕەحەتەوە خەونەکانی شەویان دەگێڕایەوە، قسەیان لە ترس و عارەقرێژی و تەنگەنەفەسی کاتی خەو دەکرد. ئەوە یەکەمین بەیانی ئەم ژیانە نوێیەم بوو، من یەکەم کەس بووم یەکەم فیشەکم لە تفەنگەکانی سوپای باغەوانەکانەوە تەقاند. ئەو کات کە لە ماڵ دەرچووین کەسیان نرخی ئەو یەکەمین فیشەکەی نەدەزانی من نەبێت، ئەوانی تر بێخەیاڵ دەڕۆیشتن و قسەیاندەکرد. لە دڵی خۆمدا گووتم، وەک لەم ئیشەوە ئاڵاوم، با مێژوویەک تۆماربکەم و بە پێچەوانەی چاوەڕوانی هەموانەوە، یەکەم فیشەک لە تفەنگی منەوە بتەقێت. لە نزیک ماڵی سەی ئەسلان و چەند مەترێک دوور لە مزگەوت، من باڵدارێکی ڕەش و گەورەم بینی، باڵدارێک لەسەر درەختی بەرزی بەر ماڵێکی خۆشدا، پیر و باڵقورس لەسەر چڵێک نیشتبوو، پێدەچوو هەموو شەو لەوێدا ئارامی گرتبێت. من گووتم «برایان بهێڵن با ئەم باڵندەیە بۆ من بێت، سوێند دەخۆم کە ئەمە لە تەیرێکی ڕەشی قێزەون دەچێت کە زوو زوو دێتە خەوم». هەستمکرد ئەوانی تر بۆیان گرنگ نییە، لە مانا و نرخی فیشەکی یەکەم نازانن. بێئەوەی ناڕەزابن، قەبووڵیانکرد من نیشانە بگرمەوە و یەکەم گوللەی سوپای دیلاوار بتەقێنم. دەنگی گوللەکەم وەها بە شریخە و ناڵە بوو، هەستمکرد هەموو دیلاواری لە خەو هەستاندوە، لەگەڵ زرمەی لێدانی مندا هەزاران باڵندە پێکەوە فڕین، هەزاران باڵندە لە سەدان حەوش و سەر سیلە و سەر درەخت و ناو هێلانەوە. لە چاوتروکانێکدا کە من هێشتا سەیری دوکەڵی لوولەی تفەنگەکەمم دەکرد، کە خەریکبوو دەمبینی چۆن باڵندە ڕەشەکە بەردەبێتەوە و بەر چڵان دەکەوێت و گەڵا و وردە لق لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە

خوار، سەرم هەڵبڕی و بینیم خەریکە بەری ئاسمان بە باڵندەی سەیر و بە قەڵەڕەشکەی گەورە گەورە دەگیرێت کە هەموو بە سامێکی گەورە وە بەرەو ئاسمان دەچوون، بێئەوەی بزانن کە ئەوە فیشەکی یەکەمە لە جەنگێکدا کە پێناچێت وا زوو کۆتایی بێت. دەنگی گوللەکەی من بە ناڵە و نەعرە بوو، پێدەچوو لە مێژبێت خەڵکی غەفاریی گوێیان لە دەنگی فیشەکی ڕاستەقینە نەبووبێت... ترساو لە دەرگا و پەنجەرە و سەربانەکانیانەوە سەریان دەرهێنا. من باکم نەبوو، تەنیا شتێک بیرم لێدەکردەوە ئەوە بوو، ئیفتیخاری یەکەم گوللە لەم جەنگەدا، هی دەست و تفەنگی منە.

## خەونێك لە دەفتەری خەونەکانەوە

خەون بە ڕێگای ڕەشەوە دەبینم، بە ڕێگایەکەوە دەڕوات و ناگاتە جێ. ڕێگایەکی ناکۆتا و بێسنوور، ڕێگایەک بە دەوری چەندین قەڵادا دەسوڕێتەوە و ونمدەکات، پێچ خواردنی بێ دەرباز بە دەوری قەڵای بڵند و کێونشین و سەختتدا، لە خەونەکەمدا دەمەوێت بچمە ناو قەڵاکان، بەڵام دەرگاکان داخراون، دەرگاکان ناکرێنەوە. من لە دەرگای ڕەشی قەڵایەک دەدەم، دەستم وەک چەکوشێکی گەورە وایە. لە دەرگای قەڵاکانەوە، لەو جێگایانەدا کە من بە گورزی کوشندە دەیانکوتم هاڵاوی سوور هەڵدەستێت، من دەرگاکان دەکوتم و دەبینم هاڵاوی خوێنییان لێهەڵدەستێت. لە جێگای کوتانی منەوە دەنگێک دێت، لە ناکاو دەر و دیواری قەڵاکە وەک جەستەیەکی زامدار هاواردەکەن. لە ناکاو زەوی لە ژێر پێمدا وەک ڕوخسارێکی ناشیرینی لێ دێت، ڕادەکەم و هەستدەکەم بەسەر دەموچاوی جانەوەرێکی ترسناکدا دەخلیسکێم. من لە خەونەکەمدا دەپرسم زەوی بۆ لە زەوی ناچێت، هیچ کەس وەڵامم ناداتەوە. لە ناکاو هەموو قەڵاکان دەبن بە هەڵم، دەبن بە شتێک وەک گڕکان، دەبن بە نورێکی دڕ کە دەنگێکی لێوەدێت وەک

نرکەی مرۆڤ. چواردەورم هالاویکی مۆر دەیگریت، دەمەویت ڕابکەم، بەلام دەروازەیەک نادۆزمەوە لیی دەرچم. دلنیام کە بیهۆشدەبم، لە خەونەکەمدا لە ناو تابووتیکدا بە ئاگا دیمەوە، هەستدەکەم دەستیکی ڕەش باوەشینمدەکات، تەنیا دەستیکی هەلواسراوە لە هەوادا، دەستیکە بێ جەستە. من دەمەویت بلیم مردوەکان باوەشینیان ناویت. کە لە ناکاو باوەشینەکە دەبیت بە چەقۆیەکی گەورە، دەبیت بە چەقۆیەک خوینی لێ دەتکیت و تک تک بەسەر ڕوومدا دەتکیت. من هیز دەدەمە خۆم هەستم، بەلام هیزیک دەمگریت و فەرمانم پیدەدات: بخەوە... بخەوە ... بخەوە.

# ٢٣

ژیان لە سەنتەرەکەدا وردە وردە جۆرە ڕیتمێکی خۆی وەردەگرت. تەمێکردن بە جۆرێک لە جۆرەکان بوو بە کەرەستەی سەرەکی بەڕێوەبردن، زۆربەی نەخۆشەکان کەمێک داڕووی ئارامبەخشیان وەردەگرت، هەندێکیشیان هەندێ دەرمانی تایبەت کە تووشی وڕیی و لە هۆشخۆچوونی بەردەوامی دەکردن. بەڵام بە گشتی شێوازی سەرەکی چارەسەر تەنیا لێدان و بەستنەوە و جیاکردنەوە و کوتکردن بوو. سەرەتا نەخۆشەکان ڕۆحییەتێکی هەڵچوو و یاخیان تێدابوو، بەڵام تەمێکردنەکان وەها قورس و دەروونشکێن بوون، هەر زوو بەشی زۆریان دایانە باری کزی و شێوە کپی و بێدەنگییەکی غەمگین باڵی بەسەر سەنتەرەکەدا کێشا. من هەر لە چەند ڕۆژی یەکەمدا دڕندەیی پاسەوانەکان تووشی قێز و بێزاریان کردم، پاسەوانەکان مۆڵەتیان بوو بەرامبەر هەموو سەرپێچییەک سزای توند بگرنەبەر. هەمووی دە ڕۆژێک بوو لەوێبووم کە ئێوارەیەک چووم بۆ بەشی پەروەردە و تەمێکردن و لەوێ میرئەودالم بینی. میر بە زنجیرێکی زۆر ئەستوور بەسترابووەوە، بە شێوەیەکی دڕندانە لێی درابوو، کە من بینیم تەنیا دەرپێ کورتێکی چڵکنی لە پێدابوو، لەشی لە زۆر جێگاوە برینداربووبوو، یەکێک چەند جگەرەیەکی لەسەر لەپی دەستی کوژاندبووەوە. میر کە منی بینی چاوانی پڕبوون لە ئاو و فرمێسکەکانی بە

پێدەمنگی لە چاوی هاتنەخوار. بەڵام لە بری توڕەیی و ناڕەزایی، سەبرێکی یلشکێن لەسەر ڕوخساری بوو. وەستا سەلاحەدین، زیادەڕەوییەکی زۆری لە ئەشکەنجەدا بەکاردەهێنا. دوو ڕۆژ پێشتر بەجۆرێک لە نەخۆشێکی دابوو، دەم و دەست بردبوویان بۆ بیمارستان، تووشی ڕاتەکانی مێشک، شکانی کاکیلە، کلافەبوونی زمان بووبوو. زۆربەی ئەوانەی لە بەشی پەروەردە و تەمێکردن ئیشیاندەکرد، جار دوای جار مۆنتر و گرژتر دەردەکەوتن، شێوازی ڕۆشتنیان دەگۆڕا، پۆز و سنگ دەرپەڕاندنیان زیادیدەکرد. سەیر بوو بە لامەوە ئەم کەسانە کە تا چەند هەفتەیەک لە مەوبەر هەر کەسەیان لە جێگایەک و لە فەرمانێکی دیکەدا دەستبەکاربوون، هیچ کات لێدان و توندوتیژی پیشەیان نەبووبوو، لە ناکاو، دوای چەند هەفتەیەک لەم ئیشەدا بووبوون بە بوونەوەری نوێ، بە کەسانێک هیچیان لەو مرۆڤانەی پێشتر نەدەچوو. من کە ئەوانەم دەبینی لە خۆشم دەکەوتمە گومان و دەچوومە دوودڵییەوە. هەرجارێک کەسێکم لە بەشی پەروەردە و تەمێکردن وەربگرتایە، دەمبینی چاودێرەکانی ئەوێ بە لە خۆڕازیبوونێکی زۆر و بە لە خۆباییبوونێکی گەورەوە تەماشای نەخۆشەکانیان دەکرد. لەوێ نەخۆشەکان هەر بەر لێدان و ئەشکەنجە نەدەکەوتن، بەڵکو هەندێکیان ناچاردەکران خەونەکەی خۆشیان بگێڕنەوە، ناچاردەکران گوێ لە لاقرتی و گاڵتە و سووکایەتی بگرن. کاتێک بیمارەکان دەگەیشتنە باسی ئەو بەشەی خەونەکەیان کە پیاوێکی نەناسراو چەقۆ دەخاتە سەر ملیان، چاودێرەکان بە نیازی تۆقاندن، بیمارەکەیان دەگرت و چەقۆی تیژیان دەخستە سەر گەردنی و ماوەیەکی درێژ بیمارەکەیان دەخستە دۆخێکی ترسناکەوە و هەڕەشەی سەربڕینیان لێ دەکرد.

ئەو ڕۆژەی کە میرئەودالم وەرگرت، میر تەواو بریندار بوو، لە کاتی لێداندا ئازاری زۆر پێگەیشتبوو. لەو ماوەیەدا کێشی زۆر دابەزیبوو، لە بەشی پەروەردە و تەمێکردن، خۆم بەدەستی خۆم زنجیرەکانیم کردەوە و

کۆمەکم کرد جلەکانی لەبەر بکاتەوە، شەرواڵێکی دەڵب و زلی لەبەردابوو، کراسێکی ڕەشی پان، ویستم بچمە ژێربالی، بەلام بەوەدا هێشتا زۆر قورس و بە کێش بوو، داوای کۆمەکم لە دوو چاودێری گەنج کرد، کە هەر زوو بە دەنگمەوە هاتن. بە هەر سێکمان میرمان گەیاندە ژوورەکەی من.

میرئەودال بە ئەستەم دەیتوانی هەنگاو بنێت، هەستمدەکرد برینەکانی دەروونی لە برینەکانی جەستەی سەنگینترن. قژی زۆر درێژبووبوو، بە ڕەنگی بزرکاو و مووی پەشێویدا دیاربوو زیاد لە دوو هەفتەیە ڕیشی نەتاشیوە. لە ژوورەکەی من، لەسەر کورسییەکی تایبەتی دامنا و بە پەڕۆیەکی تەڕ دەموچاویم بۆ سڕی و داوام لێکرد کە کەمێک پشوویدات. میرئەودال پاش وچانێک بەدەنگێک بەرز و ڕوون پرسی «تۆ هەر کوڕی عیادەکەی دکتۆر سیامەندیت؟». بە هێمنی وەلامدایەوە «بەلێ، جەنابی میر. من و تۆ یەکتر دەناسین. من ئەوم». پاش بێدەنگییەکی زۆر پرسی «تۆ لەو باوەڕەدایت، من شێت بم». من بە دڵنیاییەوە گووتم «نا جەنابی میر، تۆ شێت نیت، هیچ کەسیش وای بە تۆ نەگووتووە». «ئەی من چیم؟ گەر شێت نیم چیم؟». «کەسێکی ماندوویت، کەسێکیت بە بارودۆخێکی دژواردا تێدەپەڕیت. بەلام شتەکان کاتین، زۆر نابات و چاک دەبیتەوە، هەموو ئینسانێک تووشی گرفتی لەم جۆرە دێت». « لە منداڵییەوە ئەو ترسەم هەیە، یەکێک بمکوژێت. بەردەوام ئەو ترسەم بووە ... تۆ لەو باوەڕەدایت ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێک بمکوژێت؟» «نا هیچ کەس ناتکوژێت، جەنابی میر. هێندە هەیە تۆ ئارام بە، تووڕەمەبە، پەلاماری کەس مەدە با ئەزێتت نەدەن». «هەستدەکەم ڕۆژێک یەکێک دەمکوژێت و تۆش لەوێ دەبیت و دەمبینیت». من پێکەنیم و گووتم «نا جەنابی میر، هەمووی خەیالاتی چرت و پرتە، منیش لەو جۆرە خەیالاتانەم هەیە، بیر لە شتی وا مەکەرەوە». پاش ئێستێکی کەمێک درێژ گووتی «پاسەوانەکان ئیشیان ئەوەیە لێمان بدەن، دکتۆر سیامەند بۆئەوە داینـاون. قسەبکەین یان نا

هەر سزامان دەدەن ... من کەسێکی ئارام بووم، لە منداڵییەوە ئارام بووم، من میربووم، میر دەبێت ئارام بێت، یەکەمین میربووم. من لە بنەماڵەی زەریاواریم، خۆمان میرمان نییە، من منداڵ دەبم کە باوکم نیەتی ئەوەی لێدەهێنێت من بکاتە میر. زۆربەی بنەماڵەکان میریان هەیە ئێمە نەبێت، تەمەنم حەوت ساڵ دەبێت کە نازناوی میرئەوداڵ بە من دەبەخشن. منداڵ بووم کە باوکم پێیگووتم ئیتر تۆ میریت. ئەوکات نەمدەزانی میربوون چ جۆرە عیللەتێکە. باوکی ڕەحمەتیم یەکەم کەس بوو پێیگووتم، بەوەدا تۆ یەکەمین میری تایەفەی زەریاواریت لەوانەیە دوژمن بترفێنێت و بتکوژێت. میرەکان گەر ئاگایان لە خۆیان نەبێت یەکێک لە شیرین خەودا ئامبازی سەریان دەبێت و دەیانکوژێت. نەیاران چەقۆ دەخەنە ملیان و سەریان دەبڕن. من سەد حیکایەتم بیستووە لەسەر ئەو میرانەی لە شیرین خەودا یان لە جەنگدا سەربڕدراون». من لەو کاتەدا زانیم کە چیرۆکی مردنی باوکی بەر لە لەدایکبوونی ئەم، تەنیا سەربوردێکی درۆیە و بۆ فریوی مامە سیام دروستیکردوە. بە فرسەتم زانی و گووتم «ڕاستە جەنابی میر، میرەکان عادەتەن لە شیرین خەودا یان لە شەڕدا دەکوژرێن. بەڵام جەنابی میر، تۆ بە ڕاست ئەو خەونەت دەبینی، دڵنیایت... دڵنیایت ئەو خەونەت بینیوە، مەبەستم ئەو خەونەیە کە لە عیادەکە بۆ مامە سیات دەگێڕایەوە». میر بۆ یەکەمجار قووڵ سەیریکردم و گووتی «نا... دڵنیانیم... چۆن دڵنیابم، هیچ کەسێک نییە دڵنیابێت لە خەونێک بینیوێتی. بەڵام لە خەودابم یان لە هوشیاریدا ئەو شتانە دەپەڕنە سەرمەوە. چەندین ساڵە ئەو وڕێنە و خەیاڵاتانەم لەگەڵە. ئێستا زۆر بوون، ئازارم دەدەن. هەندێ جار بە شەو دەپەڕنە سەرم، هەندێ جار بە ڕۆژ. هەندێ جار لە خەو هەڵدەستم و هەستدەکەم ئەو خەونەم بینیوە و هەندێ جاریش نا، بەڵام هەمووی هەستە، من کە وریادەبمەوە لە هیچ شتێکی کاتی خەو دڵنیانیم، هەر لە بەر ئەوەیە زۆر دەترسم». «بۆ؟ بۆچی؟ میرئەوداڵ... لە چی

دەترسیت؟». «نالێم، پێم نەگووتی، لە منداڵییەوە دەترسم بمکوژن، شەو و ڕۆژ ... هەر من وانیم، زۆربەی ئەوانەی لێرەن ئەو ترسەیان هەیە. هەموو دڵنیان ڕۆژێک شتێک دەقەومێت، شتێکی زۆر ناخۆش». «جەنابی میر، دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ ماڵێ، دەتەوێت بچیتەوە بۆ لای مرواری خان؟». بێئەوەی سەیرمبکات گووتی «نا... نامەوێت بگەڕێمەوە. باسی شتی وا بۆ من مەکە. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە خۆم دەترسم. من پێویستیم بە سزایەکی وەها گەورە بوو، سیامەند دکتۆرێکی زۆر باشە، پێشتر وام نەدەزانی. نا، بەڵام دکتۆرێکی زۆر باشە، دەزانیت ئێمە پێویستمان بە چییە. لەم بارودۆخەی ئێستامدا کەڵکی ماڵەوەم پێوە نییە... گەر ئێستا بمبەنەوە، مێز و پەنجەرە و ئاوێنەکانی ماڵەوە دەشکێنم. ئێمە کەسمان ئامانمان نییە. ئێرە شێتخانە نییە، هەر کەسێک لێرە دەستبەسەرە تاوانبارە. هەفتەیەک لەمەوپێش مرواری هات بۆ لای من، من کەوتم بەسەر پێڵاوەکانیدا و گریام کە نەمباتەوە، داوامکرد لێم گەڕێ. ئێرە شوێنی ئێمەیە... هەر کەسێک دکتۆر سیامەند بیخاتە ئەم قەرەنتینەوە هەقی خۆیەتی. هەموو پیاوکوژی خەتەرناکین، کەسمان نییە پیاوکوژی خەتەرناک نەبین. من دەمێکە خولیای ئەوەم تێدا دروستبووە کە خوێن بڕێژم... ». قسەکانی میر سەرسامیانکردم، چاوانی تووڕەییەکی نهێنی تێدا بوو، سەیریدەکردم و هەستمدەکرد دەیەوێت بە چاو ئازارم بدات. پرسیارم زۆربوو، بەڵام خۆی پاش وچانێکی کورت پرسی «بیستوومە دەمانبەن بۆ جەنگ، هەقە بمانبەن بۆ جەنگ... تۆ دەڵێیت دەمانبەن؟». من گووتم «نازانم... جەنگی چی، کامە جەنگ، خۆ جەنگێک لە گۆڕێ نییە؟ » «بەڵێ دەمانبەن بۆ جەنگ. جەنگێک هەر دەبێت، لە تۆ وایە جەنگ نابێت؟ ئەی ئەو ڕۆژە ئەو کابرا کەردەموچاوە بۆ هاتبوو، مەبەستم ئەفسەرە زلەکەی سوپایە. گەر ڕۆژێک جەنگ هەڵگیرسا، من یەکەم کەس دەبم کە دەچم بۆ شەڕ. بەو ئەفسەرە بڵێ، کە من یەکەم کەس دەبم تفەنگ هەڵدەگرم. تکایە بیرت

نەچێت ناوی من بنوسێت. من دەمەوێت بچم بۆ شەڕ... وەک پیاوێکی زل و گەلحۆ تێمەگە، دەتوانم شەڕکەرێکی باش بم، وامەڕوانە، وەک ئەوەی لیاقەتی هەڵگرتنی چەکێکم نەبێت». «جەناب میر، بەوجۆرە باسی خۆت مەکە، تۆ کەسێکی خراپ نیت، پێویست ناکات بچیت بۆ شەڕ، شەڕ جێگای کەسێکی وەک تۆ نییە... تۆ پیاوێکی بەڕێزیت، خێزانداریت، دەبێت زوو بگەڕێیتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆت». میرئەوداڵ بەخۆی و گوپە سوور و گەورەکانییەوە وەک منداڵێکی گەورە و گرۆز دەهاتە پێشچاوم. دوای ئەو قسانەم ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، چەند پرسیارێکی بچوکم لێکرد هیچیانی وەلام نەدایەوە. لە ناکاو وەک بیری کەوتبێتەوە ئەو میرە و من هیچ نیم، بە دەنگێکی زاڵ گووتی «من لە منداڵییەوە باوکم ترساندومی. هەمووومان لە منداڵییەوە ترساوین، ئەی تۆ خەون نابینیت کەس سەرت ببڕێت؟ . ئەی تۆ، وەک ئێمە ئەو ترسە سەری لێ نەشێواندویت. گوێگبگرە، من قەناعەتم وایە کە هیچ کەسێک لەم مەملەکەتەدا نییە لە خەونیدا یان لە خەیاڵیدا نەکوژرابێت، قسەی قۆڕم بۆ مەکەن، بە دکتۆرەکەی خزمتان بڵێ قسەی قۆڕم بۆ نەکات. لە کەناری دەریای سپییەوە بیگرە تا دەگاتە سەر سنوورەکانی چین، بەشەرێکی تێدا نییە، خەوی نەدیبێت یان لە خەیاڵیدا نەکوژرا بێت». من هیچم نەگووت. ئەو پەیتاپەیتا دووبارەیدەکردەوە کە دەبێت ببرێت بۆ جەنگ، دەیگووت لە منداڵییەوە عاشقی مەیدان و دوکەڵ و تەقینەوەیە، سەیری منی دەکرد و دەیگووت «هۆو کوڕە، بە ڕاستیمە گەر ناویان نوسی بۆ شەڕ، من فەرامۆش نەکەیت». من پەیمانم دایە جەنابی میر، گەر شەڕ هەڵگیرسا، من و ئەو پێکەوە بچین بۆ جەنگ.

من زۆر هەستم بە گوناهـ دەکرد بەرامبەر ئەو، دەمویست هەر شتێک کە دەکرێت و لە دەستم دێت درێغی نەکەم، هەتا لە بیری ئەوەدابووم بە مامم بڵێم هەندێ کاروباری تایبەت بە میر بسپێرێت و لە قاوشە گەورەکان دووریبخاتەوە، وەک ئەوەی لە فیکری دامەزراندنی کتێبخانەیەکی بچوکدا

بووم، دانانی فرۆشگایەک کە هەندێ بسکیت و بنێشت و کەلوپەلی پێویستی تری تێدا بێت، یاخود گۆڕینی هەندێ بەش لە حەوشی فەرامۆشکراوی سەنتەرەکە بۆ باغێک کە میر باغەوانی بێت. دەمویست شتێک بکەم میر ئەودال دڵی خۆش بێت. هەڵبەت هەموو نەخۆشەکانی تریشم بە ئەندازەی ئەو بۆ گرنگ بوو، بەڵام بەوەدا کە ئاشناییم لەگەڵ ئەم چیرۆکەدا لە خەونەکانی میرەوە دەستی پێکردبوو، ئەو لای من جێگایەکی تایبەتی بوو. مامە سیام دڵگەرمییەکی بۆ پێشنیارەکانی من دەرنەخست، بیرکردنەوەی ڕۆژانە و بەردەوامم، غەمخۆریم بۆ بیمارەکان، پرسینەوەی بەردەوامم لە تەندروستییان، گوشاری زۆرم بۆ تەرخانکردنی ئەمبولانسێکی تایبەت لە نێوان سەنتەر و بیمارستانی سەرەکی دیلاواردا ... ئەو هەموو هەوڵەکانی منی بە ڕەنجی بێبەری ئیدیالیستێکی بێچارە ناودەنا، هەندێ جار پێدەکەنی و هەندێ جاری تر قینی دەکرد، هەندێ جاریش دەیگووت «باشترین ڕێگایەک، بۆ کارکردن لەگەڵ ئیدیالیستێکی وەک تۆدا ئەوەیە داواکانت بۆ جێبەجێبکەم. تا تێبگەیت بەم کارانە موویەک لە گوونی دونیا ناگۆڕێت». مامە سیام دەیگووت «هیوادارم وردە وردە تێبگەیت کە بیمارەکانی ئێرە بۆ ئەوە هاتوون لێرە سزایەک بخۆن، نە هاتوون سەیرانبکەن. ئینسان بە فیترەت حەزی لە سزایە، بۆی دەگەڕێت، وڵاتە و وڵات دوای دەکەوێت».

ئەوە هەستێکی بەربڵاو و سەیر بوو کە ڕۆژانی دواتر لای چەندەها نەخۆشی تر سەرنجمدا، زۆربەیان ڕەزامەندبوون لە سزاکان، کاتێک من دەگریام و بەسەر دەست و پێکانیاندا دەکەوتم، پڕ بە دڵ هاوارمدەکرد «لێمان ببورن». ئەوان سەرسامدەبوون و پێیان وابوو شایستەی ئەو سزایەن و ئەو لێدانە سوودی هەیە بۆیان. هەر کات شتێکی وەهام بۆ مامە سیام دەگێڕایەوە، قاقایەکی بەرزی لێدەدا و دەیگووت «پێم نەگووتی، تۆ هەر بڕۆ و بە قسەی من مەکە».

ڕۆژانی دواتر کە سەبری جاهدار هات بۆ سەنتەرەکە، ژیان سەختتر بوو. سەبری جاهدار پیاوێکی بچکۆلانەی مۆن و شەڕفرۆش بوو، وەک دەیانگووت لە پەروەردەدا تەنیا باوەڕی بە ڕەوشێکی توند هەیە. باوەڕی وابوو پەروەردکار دەبێت وەک پەروەردگار توند و بەهێز و بە زەبر بێت. پیاوی فۆرم و ئەتەکێت و نەزم بوو. هاتنی ئەو پرۆژەکانی منی بۆ کردنەوەی کتێبخانە و دروستکردنی باغچەیەک و دامەزراندنی فرۆشگایەکی بچوک، تەواو هەڵوەشاندوە. ئەو بە توندی و ڕەقییەکی بێوێنەوە گووتی «ئەمجۆرە شتە پروپوچانە وادەکات نەخۆشەکان چاوەڕوانییەکی زۆریان لە ئێمە هەبێت، لە کاتێکدا جەوهەری ئەو جۆرە پەروەردەیەی من باوەڕم پێیەتی، ئەویە کە مرۆڤ جگە لە ئازار چاوەڕوانی هیچ نەبێت». دەم و دەست شێوە جلێکی تایبەتی سەپاند بەسەر هەموو بیمار و چاودێرەکاندا. بەشی پەروەردە و تەمێکردنی گەورەترکرد و ژمارەیەک کارمەندی نوێی بۆ گواستەوە. گرنگترین بڕیاریشی ئەوە بوو کە شەوان دەبێت لە سەعات نۆوە هەموو نەخۆشەکان بخەون و چراکان هەمووی بکوژێتەوە. هەڵبەت خۆی شەوان نەدەمایەوە، منی ڕاسپاردبوو کە ئەو بڕیارە جێبەجێبکەم، بەلام من هەمیشە تا نزیکی دەونیو ئەو بڕیارەم دوادەخست و جێبەجێم نەدەکرد. ئەو پێی وابوو خەوتنی زووی بیمارەکان ئارام و لە سەرەخۆیان دەکات. بەلام من دڵنیابووم زوو خامۆشکردنی چراکان، توڕەیی و غەمۆکی و تەنهایی نەخۆشەکان زۆرتر دەکات. هاتنی سەبری جاهدار ژیانی منی کەمێک گۆڕی، من لە ڕۆژی یەکەمەوە بڕیارمدا ئاسان نەچمە ژێر باری فەرمانەکانی ئەم پیاوە بچوکەوە، کە خۆی ڕاستەوخۆ و بە لەزەتەوە لە لێدان و تەمێکردنی سەرپێچیکەراندا بەشداریدەکرد.

دوو هەفتە بەسەر سەردانەکەی مەحمود قازاندا ڕۆیشتبوو کە ڕۆژێک مامە سیام بانگیکردم و گووتی «ئیتر کاتی ئەوە هاتووە سەد کەس هەڵبژێرین و بیاننێرین بۆ سنوور، بەڵێ ئەوە ئەمری جەنابی حاکمی

عەسکەرییە، فەرموو خۆت بیخوێنەوە. سەد کەسیان لێمان دەوێت، تا لە کاری سەنگەر لێدان و ئامادەسازیدا بەشداربن، هێزە چەکدارەکانی دێلاوار ئەوە چەند ڕۆژە لە ئامادەباشیدان، کاروبارێکی گەورە بە نهێنی بەڕێوەیە، جەنگاوەرانمان پێویستیان بە پشتگیری و کۆمەک هەیە، ڕەنگە زۆر کەس ئاگادارنەبن، بەڵام من لە لیژنەی قەیرانەکان و وەک ڕاوێژکاری کاروباری ستراتیژی جەنابی فەرماندار خەبەرم لە هەمو شت هەیە. من دەمەوێت تۆ وەک بەر پرس و هاوشانی ئەو سەد کەسە بنێرم بۆ سەر سنوور، بڕۆ و بیرێکی لێ بکەرەوە. من وادەزانم تۆ لە هەر کەس باشتریت بۆ ئەم کارە. هەم دەتوانیت لەم کاتی ناخۆشی و میحنەتەدا کۆمەک بە نەخۆشەکان بکەیت، هەم خۆشت بڕۆیت و ماوەیەک لە دەرەوە بژیت... دڵنیام پێویستیت بە کەمێک ژیانی ناو سروشت هەیە، ژیانی ڕاستەقینە ... تا واز لەم خەیاڵاتانەی خۆت بهێنیت و ببیتەوە بە کەسێکی واقعی».

من هەم خۆشحاڵ بووم و هەم دوودڵ ... لەو کاتانەدا کۆمەڵێک کاری گرنگم بۆ هاتبووە پێش کە جێهێشتنیان ئاسان نەبوو، بەڵام خولیای ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێک لەم مرۆڤە بەدبەختانەدا بچم بۆ ناو چیا دوورەکان، ئەفسوونێکی تایبەتی لەسەرم هەبوو.

# ٢٤

ئەو شـەوە کـە لـە شـەقامی حاجی عینایـەت سـوار ماشـێنە سـپییەکە بـووم چاوەڕوانی بینینی هەموو کەسێکم دەکرد، پرۆفیسـۆر بەهنام نەبێت. ماشـێنەکە بە جۆرێکی خێرا و شـێتانە دەڕۆیشـت، وامدەزانی بایەکی تـوڕە هەڵیکـردوە و دەمانڕفێنێت. من ڕقـم لـە شـەوی بێدەنگی دێلاوار بوو، هەندێ سـەگی وێلگەرد و پاسـەوانی خەواڵوو نەبێت هیـچ گیاندارێک بە شـەقامەکانەوە نەبوون. خەڵکی دێلاوار لـە زەمانـی دێرینـەوە ڕاهاتبـوون شـەوان لەماڵەکانی خۆیاندا بمێننەوە، سروشـتی زیندان بووبـوو بـە سروشـتی مـاڵ و ژیانیش، هەمـوو مرۆڤەکانـی دێلاوار بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان وەک زیندانـی دەژیـان، فێربووبـوون کـە زیاتر لـە پەنجـەرەوە دونیـا ببینـن، لـە پەنجـەرەوە سـەیری ئەسـتێرە و شـەو و خۆرهەڵاتن بکەن، لـە پەنجـەرەوە خۆشـەویستی بکـەن و لـە پەنجـەرەوە تف لە جیهـان بکـەن و لـە پەنجـەرەوە شـۆڕشـی خۆیـان بەرپابکـەن.

شـۆفێری ئـەو شـەوەم پیاوێکـی بێدەنـگ و مـۆن بـوو، ئامادەنەبـوو هیـچ زانیارییەکـم بداتـێ، کڵاوێکـی ڕەشـی زسـتانەی گـەرمـی کردبـووە سـەر، کـە هێشـتا وەرزی جـۆرە کڵاوی وەهـا نـە هاتبـوو، دیاربـوو لـەو کەسـانەیە کـە لـە چلـەی هاوینیشـدا دەسـتبەرداری جلـی گـەرم نابێـت. مـن کـە زانیـم ئـەو پیـاوە زانیارییەکم ناداتێ، بێدەنـگ لـە تەنیشـتییەوە دانیشـتم و بێئـەوەی خـۆم ئەزیێتبـدەم، چاوەڕوانبـووم بزانـم خـۆی بـۆ کوێـم دەبـات. سـەرم دابـووە بـەر

بایەکی نهێنی و ئێستا هەستێکی ناخۆشم هەبوو کە لەوانەیە بەرەو دەرەوەی دیلاوارم بەرێت، بەڵام لە پێچێکدا بەرەو باشوور لایکردەوە و ڕوویکردە ئەو گەڕەکانەی دەکەونە سەر سنووری خۆرئاوا و باشوور، بەرەو ئەو جێگا ترسناکەی پێیدەڵێن دیلاواری ڕەش. چەندین کۆڵانی پێچاوپێچی بردم کە پێشتر پێم نەخستبووە ناویان. ناوچەیەکی کپ و نامۆ و دوور هاتە پێشچاوم، وەک شارێکی دیکە بێت و پەیوەندییەکی بەو دیلاوارەوە نەبێت کە من دەیناسم. گەرچی جامی ئوتومبیلەکەمان دادابووەوە، بەڵام بۆی زێرابەکان و ئاوەڕۆی پیس هەر دزەیدەکردە ژوورەوە. ماڵەکان تەواویان نیشتەجێی خەڵکی بێدەرامەت بوون، کە لە خانووی زۆر بچوک و هەژارانە دروستبووبوو، ماڵ کە لە بلۆکی شکاو و تەنەکە و لەتە چینکۆ و نایلۆن و پلاستیکی کۆن نرابوون بە یەکەوە. سەیرم لێدەهات چۆن تێپەڕینی خێرای ماشێنەکە ئەم کۆڵیتە تەپیو و ماڵتەنەکانە ناڕوخێنێت، بەتایبەت شۆفێرەکەم هەر بە هەمان خێرایی و شێتی لە پێچاوپێچی ئەو کوچە تەسکانەدا دەیئاژوو. دوای نزیکی نیوسەعات ڕۆیشتن، ماشێنەکە لە بەردەم ماڵێکدا وەستا، هەر دووکمان لە ئوتومبێلەکە پیادەبووین و کابرای شۆفێر بەسەر ئاماژەی بۆ کردم و گووتی «دوامکەوە». لەوێوە نزیکی دە دەقیقەی تر ڕۆیشتین و لە کۆڵانێکی تردا، چووینە ماڵێکی کۆنەوە، لە ژوورێکی بچوکدا و لە بەر شەوقی گڵۆپێکی کز، پرۆفیسۆر بەهنام و یاوەرەکەی دکتۆر حسامەدین و چەند پیاوی ترم بینی کە لە تاریکیدا وەک تارمایی نەخۆش هاتنە بەرچاوم.

پرۆفیسۆر بەر لەوەی بەخێرهاتنم بکات یان هیچ شتێکم بۆ ڕوونبکاتەوە، بە نارەحەتییەوە گووتی «تەنیا ئەمشەو و بە زەحمەتێکی زۆر توانیومانە لێرە کۆببینەوە، بڕوانە چ کارەساتێکت دروستکردوە، تۆ ئاگاداری چ دەرد و بەڵایەک لە تووە کەوتۆتەوە، هیچ کات لە دیلاوار کارەساتێکی وا ڕووی نەداوە، هیچ کات هەتا لە زەمانی دانیالیشدا».

هەموو شتێکم وەک خەو هاتە بەرچاو، ژوورەکە پڕبوو لە دوکەڵی جگەرە، پیاوەکان سەیر و نامۆ دەهاتنە بەرچاوم، هەتا دەموچاوی پرۆفیسۆر بەهنامیش لە دەموچاوی کەسێک دەچوو لە خەوندا بیبینم. من حاڵی نەدەبووم، کەمێکیش تورە و سەر لێشێواو بووم، تێنەدەگەیشتم بۆچی بەم نیوەشەوە لێرەم و ئەوانە کێن و چییان لێم دەوێت. ڕوناکی ژوورەکە بە جۆرێک زەرد و کزبوو، وەک ئەوەی لە بەر مۆمێکی گەورە دانیشتبێتن، دەموچاوەکان تەماوی و ترسناک دەردەکەوتن، وەک ئەوەی بە درێژایی ژیان، چین دوای چین تەنیا دوکەڵ لە سەریان نیشتبێت. هەموو ئامادەبووان بە گومانەوە سەیری منیان دەکرد. پرۆفیسۆر هیچی لەو پیاوە دەم بە خەندەیەی ئەو ڕۆژە نەدەچوو کە لە مۆزەخانە بینیم، ئێستا تیشکێکی زەرد و دوکەڵێکی چڕ لە دەوری سەمایانبوو، بەڵام هەر وەک مۆزەخانەکە کتێبێکی نابوو بە سنگییەوە. بێ ئەوەی هیچم بۆ ڕوونبکاتەوە گووتی «نەدەبوو ئەو نیگارکێشانە بەرێت، نەدەبوو بیانبەیت، سەیرکە چیت کرد، سەیرکە چ کارەساتێکت خستەوە. من بابەعەلی وەزیری هاوڕێم پێیگووتم کە تۆ نیگارکێشەکانت هێناوە، ئەوانیش بێئاگا لە ئەنجامی ئیشی خۆیان ئەو نیگارانەیان کێشاوە». دەنگی قووڵ و پڕ سەرزەنشت بوو. دەستی بۆ پیاوێکی ڕەشتاڵەی باریک و قژ کورت و سەر خڕ ڕاکێشا و گووتی «تۆ وادەزانی ئێمە توانامان چەندە؟ وادەزانیت لە تواناماندایە ئەم هەمووە بشارینەوە. ئێستا چی بکەین بۆ ئەوەی ئەم پیاوانە ڕزگاربکەین. شوێنمان لە کوێ بوو؟ جێگامان لە کوێ بوو؟».

من نەمدەزانی باسی چی دەکات. چاوەکانی تر گەرچی بە گومان و غەمگینییەوە سەیریاندەکردم، بەڵام شتێکی وەک کینە و ڕقیان تێدا نەبوو، چاوانێک بوون پڕبوون لە پرسیار. من بە هێمنی سەیری هەمووانم کردەوە و لە پەرێشانیدا چەند جار سڵاوم کرد و بە گێژییەوە گووتم «جەنابی پرۆفیسۆر... جەنابی پرۆفیسۆر... ئەمشەو بۆ شەوێکی هێند سەیرە، بۆ من

لە هیچ تێناگەم؟». دڵنیابووم ئەوانیش چاوەڕوانی ڕستەیەکی لەو جۆرەیان نەدەکرد. بەڵام من لەو کاتەوەی چووبوومە ژوورەکەوە هەستێکی سامناکم هەبوو کە دووبارە لە خەون و مۆتەکە و تاریکییەوە ئاڵاوم. بە جۆرێک لە جۆرەکان هەموو هەوڵێکم دەدا بۆئەوەی بە خۆمی بسەلمێنم ئەوەی دەیبینم خەونە. بەڵام دڵنیابووم خەون نییە، دڵنیابووم دەرکەوتنی پرۆفیسۆر بەهنام لەم جێگایەدا شتێکە مەنتیقی خۆی هەیە. دکتۆر گووتی «وا دیارە تێناگەیت، وا دیارە هیچت نەبیستووە... نەمدەزانی وا بێباکیت، تۆ هەموو شتێک لەسەر چیرۆکی دانیال دەزانیت. لەسەر قوربانییە بێگوناهەکان، بێخەتاکان». دەنگی بە جۆرێکی سەیر لە گوێمدا دەزرنگایەوە، وەک ئەوە بوو گوێم لە بیرکردنەوەکانی پرۆفیسۆر بێت، وەک ئەوە بوو دەنگەکەی لە سەری مندا بێت، بێئەوەی ئەو دەمی جوڵاندبێت، یاخود هیچی گووتبێت. من گووتم «چی بووە جەنابی پرۆفیسۆر، چی بووە؟». هەموو بە سەرسامییەوە سەیریانکرد. پرۆفیسۆر بە زمانی سەرزەنشت گووتی «چۆن نازانیت چی بووە، هێزەکانی دەوڵەت، ئەو میلیشیا تازەیەی سەی ئەسلان... هەر کەسێک بە شێوەش لە وێنەکانی تۆ بچێت، هەژارێک، بێکەسێک نیشتەجێی ئەم گەڕەکە فەقیرانە بێت، دەیدۆزنەوە و دەیکوژن. دەڵێن ئافەت و دەردەکە لە دیلاواری ڕەشەوە دێت، لەم گەڕەکانەوە کە زۆربەیان خەڵکی هەژارن، غەریبەن، تازە لە گوندەکانەوە هەڵهاتوونە دیلاوار». من سەرم داخست، وەک بۆ یەکەم جار هەست بە گەورەیی تاوانەکەم بکەم، بە غەمگینییەوە گووتم «جەنابی پرۆفیسۆر خۆت بخەرە جێگای من، من لە کوێ بزانم... نەمدەزانی شتەکان دەگەنە ئەم ئاستە، نەمدەزانی تووشی ڕۆژێکی وادێین. چۆن بزانم کە دواجار خەڵکی بێگوناهـ دەکوژرێت. من نیگارکێشەکانم دۆزییەوە، من ڕێنماییمکردن چۆن نیگارەکان بکێشن، بەڵام ئەوان دواجار وێنەیەکیان کێشاوە، بە ڕاست چۆن دەکرێت کێشانی وێنەی خەونێک وا بشکێتەوە؟ چۆن دەکرێت؟ وێنەیەک کە لە کەس ناچێت، تەنیا نیگارێکە، وێنەیەکە و تەواو. من خۆم نیگارەکانم ڕادەستی

فەرماندار عەبدولسەلامی ماروفی کرد و پیمگووت، ئەمانە تەنیا وێنەی ناو خەونێکن، خەونێک کە دەشێت سەر لە بەری درۆ بێت». پرۆفیسۆر گەلێک نیگەران و نارەحەت گووتی «لە تۆ وایە خەڵک دەتوانن درۆ و ڕاستی، وێنە و ئەسڵ لە یەک جیابکەنەوە. زۆر نەفامیت گەر وا بیرتکردبێتەوە. خەڵکی شەیدای ئەوەن ئەو شتانە تێکەڵبکەن، ئەوە زەحمەتی بیرکردنەوە و جیاکردنەوەیان لە کۆڵدەکاتەوە. ئینسان هەر خەیاڵپلاوێکی سەری خۆی لێدەبێت بە ڕاست و ئامادەیە لە پێناویدا هەزاران کەس بکوژێت... هەزاران».

ماوەیەک هەموومان بێدەنگ بووین و تەنیا سەیری یەکترمان دەکرد. دوای ئەوە یاوەرەکەی دکتۆر حسامەدین هاتە دەنگ و بە غەمگینییەکەوە گووتی «گەر وێنەکە لە کەسێک بچووبایە غەممان چی بوو؟ بەلام ئێستا وێنەکە لە کەس ناچێت، کە لە کەسیش نەچوو، پیاوەکانی سەی ئەسلان، بە ئارەزووی خۆیان هەڵیدەبژێرن لە کێ بچێت. گەر تاوانبار بناسن ئیتر خۆشی نامێنێت، هەموو شت تا ئەو کاتە خۆشە کە نازانن بۆچی یان بۆ کێ دەگەڕێن ... من بینیومن، هەفتەیەک لەمەوپێش لە کاتی ڕاونانی قوربانییەکی بێ خەتادا لە فولکەکەی مەیدانی جوتیاران، بە خۆیان و ئوتومبیلەکانیانەوە هاتن و بەخێرایی دابەزین، جلی تایبەتییان لە بەردابوو، یەکی چاویلکەیەکی ڕەشیان کردبووە چاویان، یەهو لەو ناوەدا بلاوبوونەوە، وا بە خێرایی دابەزین، دڵی هەموومان کەوتە خورپە. گەر بیانبینیت ناتوانیت لێیان نەترسیت. هەموو گەنجی منداڵکارن کە ئالای دێلاوارییان بە قۆڵیانەوە بەستووە. خۆشی گەورەیان ئەوە بوو نەیاندەزانی بۆ کێ دەگەڕێن... کە دەرکەوتن هەموو ترساین، هەموو هەستمانکرد ئێستا ئێمە دەگرن، هەستمانکرد تیاچووین». پیاوێکی غەمگین هەڵیدایە و گووتی «نەوەڵا ئێستا سەیری وێنەکە هەر ناکەن. لە گەڕەکی خوداداوا یەکێک لەو نەگبەتانەی کەوتبووە چنگیان، هیچی لە وێنەکە هەر نەدەچوو، گووتبووی برا ئاخر من چیم لەم ڕەسمە دەچێت، بۆ منتان هێناوەتە گاز و گیر. یەکێکیان گووتبووی تۆ دەم و قلقت دابخە، من

دەڵێم کێ لە ڕەسمەکە دەچێت و کێ لێی ناچێت ... بەستەزمانەکەیان بێخەتا گۆشاوگۆش وەک سابرین سەربڕی بوو».

هێدی هێدی تەلیسمی ژوورەکە لەبەرچاوم دەشکا، ئەو فەزای خەونەی لە سەرەتاوە باڵی بەسەر جێگاکەدا گرتبوو دەڕەوییەوە. ئێستا لە ناو دوکەڵی جگەرە و غوباری مەراق و بۆنی نیگەرانیدا سەیری پیاوەکانم دەکرد و دەمزانی هەموو کەسانی هەڵهاتوون، کەسانێکن لەوە ڕایانکردوە لە وێنەیەک نەچن. شەوێکی وشک بوو، بێ شێ، گوماناویی. من سەرسامانە لە هەموویان وردبوومەوە و پرسیم «ئێوە کێن؟». شێوەی پرسیارکردن و ڕوانینم وڕییەکی ئەوتۆی تێدابوو کە هەموو هەستیان پێکرد. هێشتا سەیربوو بە لامەوە بەم شەوە منیان هێناوە تا ئێرە. پرۆفیسۆر بێدەنگ سەیری منی کرد و چاوێکی بەوانی دیدا گێڕا و گووتی «ئەمانە ئەو کەسانەن کە دەبێت بیانشارینەوە، پێم بڵێ ئەمانە خەتایان چییە، پێم بڵێ گوناهیان چییە. بۆ دەبێت خۆیان بشارنەوە... ؟». یاوەرەکەی دکتۆر حسامەدین کە ڕوخساری تەواو وەک ڕوخساری ئەو ڕۆژە بوو کە من لە زیندان بینیم، سەیری چاوی کردم و وەک بمخوێنێتەوە گووتی «تەنیا خودای گەورە دەتوانێت وێنەیەک بۆ ئێمە بکێشێت کە لە خۆمان بچێت، هیچ نیگارکێش و پەیکەرتاشێک ناتوانێت ڕەسمێکی من بکات لە من بچێت». یەکێک لە پیاوەکان کە دیاربوو پەروەردەیەکی مەزهەبی هەیە، بە توڕەییەوە سەیریکرد و گووتی «ئاگات لە دەمت بێت، خودا نیگار ناکێشێت، خودا خەلقدەکات. تۆ دەڵێیت چی. ڕەسم پیشەی عەبدە، خودا هەر شتێک دروستبکات ڕۆحی دەکاتە بەر». بۆ من گرنگ نەبوو خودا یان مرۆڤ دەتوانن چی بکەن، بەڵام نیگەران بووم لەوەی ئینسان هەمیشە وێنەیەک بۆ هاوسێکەی دەکێشێت کە لەو ناچێت، کەچی باوەڕ بە وێنەکە دەکات نەک بە هاوسێکەی. من گێژبووم، دۆخی کەسێکم هەبوو داڕوویەکی بێهۆشی خواردبێت، بەڵام هێشتا تەواو لە هۆش نەچووبێت.

لـە پرۆفیسـۆرم ڕوانـی و وەک یەکێـک داوای یارمەتیبـکات گووتـم «بـۆ مـرۆڤ بـاوەڕ بـە وێنـەکان دەکات؟»، پرسـیارەکەم بـۆ خۆشـم سـەیر و بێوەڵام بـوو. پرۆفیسـۆر وەک لـە بیمیشـکی و گەمژەیـی مـن سـەری سـوڕما بێت وەڵامیدامـەوە «چییـە؟ لەبەرئـەوەی چاوی ئینسـان بـە ناخـی خۆیـەوە بەسـتراوە، چاومـان تەنیـا ئـەوە دەبینێت کـە دڵمـان پێشـتر بـۆی دەگەڕێت». مـن گووتـم «مـن بـۆ لێرەم، دەتانەوێت چـی بکـەم. مـن نازانـم بڵێم چـی. سـەر لێشـێواوم، مـن نیگارکێشـەکانم بـەو نیازە نەبرد». پرۆفیسـۆر گووتـی « ئێسـتا تـۆ دەڵێیت چـی؟ دەتەوێت لـە ژێر بـاری ئـەم گوناهـە دەرچێت کـە کردوتـە؟ دەتەوێت بڵێیت کـە هیچـت نەکـردوە؟ نازانیت چـی گوناهێکت کـردوە؟ دڵنیام کـە دەزانیـت. نازانیـت کـە زۆربـەی گوناهـەکان لـە دیلاوار مـرۆڤ بـێ ویسـتی خـۆی دەیانـکات. کـەس نەڵێت مـن نەمدەزانـی دەبـم بـە گوناهبـار، بەشـی زۆری گوناهـە گەورەکانـی دونیـا ئینسـان بێویسـت و بێئاگای خـۆی دەیانـکات». مـن وەک بپاڕێمـەوە دەڵێـم « مـن هەرچییـەک بـم، گوناهبـار یـان بێگوناهـ بـە پێـی خـۆم هاتـووم، شـەوم گرتـووە بـە دەمـەوە و هاتـووم. دەمزانـی گـەر نەیـەم ئازار و پەشـیمانیم زۆرتـر دەبێـت، مـن لـە سـەنتەرە تازەکـە ئیشـم ئەوەیـە دڵنەوایـی زامدار و ئەشـکەنجەدراوەکان بدەمـەوە، دەکـەوم بەسـەر قاچـی خەڵکدا و داوایان لێدەکـەم بمانبـورن، مـن ڕازیـم هەمـوو تاوانێـک بخەمـە ئەسـتۆی خـۆم، مـن چەندیـن هەفتەیـە ئیشـم ئەوەیـە کـە گوناهـی هەمـوو خەڵکانـی گوناهبـار بخەمـە ئەسـتۆی خـۆم. مـن پیشـەم داوای لێبوردنـە، پیشـەم ئەوەیـە بەسـەر دەسـت و پێـی بێگوناهەکانـدا بکـەوم و بگریـم و بپاڕێمـەوە لێمـان ببـورن، لـە خەتـاکاران ببـورن... مـن ئامـادەم بەسـەر برینـی هەمـوو قوربانییەکـدا بنوشـتێمەوە و ماچیبکـەم و داوای لێبـوردن بکـەم. بەڵام دکتـۆر پێـم بڵـێ بـۆ بـەم شـەوە تاریـک و بێدەنگـە منتـان هێنـاوە، ئێـوە کێـن؟ چیتـان لـە مـن دەوێـت؟ بـۆ سـەبرتان نەگـرت، بـۆ نەوەسـتایت بەیانـی بێمـە خزمەتتـان و هەمـوو تانـە و سـەرزەنشـتی خـۆت بدەیـت بـە ڕوومـدا؟ . مـن کەسـێکی ئـازا نیـم، ترسـنۆکم، هـەر لـە حاکـم و

فەرماندار ناترسم، وەک سەگ لە مامم و باوکیشم دەترسم، گەر ناھەقیشم پێبکەن ناوێرم دەنگ بەرزبکەمەوە ... بەس پێم بڵێ من بەم شەوە عەجایەب و سەیرە چی دەکەم لێرە؟».

بۆ یەکەم جار خەندەکەی خۆی کەوتەوە سەر ڕووی، خەندەیەک ئێستا دڵی فێنک دەکردمەوە. پرۆفیسۆر گووتی «بەڵێ شەوێکی عەجایەبە. وادەزانیت ئێمە دەتوانین هەموو شەوێک لێرە کۆببینەوە، وادەزانی دەتوانین دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆمان دەربخەین. دیلاوار لە ئەزەلەوە شاری پاسەوان و زیندان بووە، شاری کەسوکاری پاسەوانەکان و کەسوکاری زیندانەکان، لە سەرەتاوە تا ئێستا. مرۆڤ هەستدەکات هەمیشە کەسێک بەدوایەوەیەتی، ترس ... هەندێ شار هەیە هەتا لەو پەڕی ئارامی و ئاشتیدا مرۆڤ لە ناویاندا دەترسێت، هیچ هۆیەک نییە بۆئەوەی بترسێت، بەلام هەر دەترسێت. من ئەوەتەی لە دیلاوارم دەترسم. تۆ وادەزانیت ئێمە نابێت خۆمان بپارێزین... من و دکتۆر سوعاد بە ڕێگایەکی پێچاوپێچدا هاتووین. مەسەلەکە ڕزگارکردنی ژیانی خەڵکە. دەبوو بێیت چونکە ڕەنگە تا هەفتەیەک یان دووانی تر نەتوانین کۆببینەوە، ئێمە ناتوانین زوو زوو کۆببینەوە... تۆ لەم مەسەلەیەدا گوناهباریت. من بە هەموو ئەمانەم گووت کە کەسێک هەیە دەبێت بە ڕوونی دان بە گوناهی خۆیدا بنێت و قوربانییەکیش ڕزگاربکات، من دەزانم تۆ کەسێکی دەتوانیت ئەوە بکەیت، دەتوانیت دان بە گوناهی خۆتدا بنێیت. هیچ کەس لە ئێمە ناتوانین بگەینە فریای هەموو قوربانییەکان، بۆیە دەبێت بگەڕێین، دەبێت بیربکەینەوە کێ هەیە دەتوانێت کەسێک ڕزگاربکات. هەر یەکێک لە ئێمە دەبێت بتوانین یەکێک بشارینەوە، یەکێک ڕزگاربکەین... ئەوە بچوکترین کارێکە لە دەستمان بێت. تۆ مایەی ئەم هەموو نارەحەتی و کێشەیەیت، مایەی ئەو هەموو بەدبەختییەیت، ئێستا لە بەرت گرانە شەوێک لە خەو هەستیت و شان بخەیتە ژێر باری ئەرکێکی پێویست، شتێک بخەیتە ئەستۆی خۆت کە کەمێک لە ئەنجامی کارە خراپەکانت کەمبکاتەوە... من لێت

ڕادەبینم ... ئێمە لەو کاتەوەی لێرە کۆبووینەتەوە و دانیشتووین، هەموو بیر لە خەڵکانێک دەکەینەوە بتوانن یارمەتیمان بدەن، کەسێکمان بۆ داڵدەبدەن، هەر مرۆڤێکی باش بناسین هانای بۆ دەبەین، بزانین یەک مرۆڤی باش هەیە بانگهێشتیدەکەین. تۆ یەکەم کەس نیت کە ئەمشەو هانامان بۆ بردوە. هەموو ترسی ئەوەمان هەیە کە ئەم شێتییەی دیلاواری گرتووە بەردەوام بێت. هەموو گوناهەکەیان خستوتە ملی خەڵکی بەستەزمانی ئەم گەڕەکە کاول و وێرانانە، هەموو دەڵێن غەوارەکانن، پیاوانی سەی ئەسلان ئەمانە وەک دوژمنی دیلاوار سەیردەکەن، وەک خەڵکێک لێیان دەڕوانن کە نە دینیان هەیە و نە نیشتیمان، وەک غەریبە کە دوژمن ڕەوانەی شارەکەی کردون. تۆ لەسەرتە لایەنیکەم مرۆڤێک ڕزگاربکەیت. لەسەرتە یەکێک لەوانە داڵدەبدەیت...».

نەمدەزانی چۆن پرۆفیسۆر و دکتۆر سوعاد گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی بەم کارە هەستن. من سەرم سوڕما بوو، هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی ئاسایی بمەوە، نەمدەتوانی لە هەندێ شت تێبگەم. هەڵبەت تاریکی ژوورەکە، هەوای سەنگێن، پەردە زەردە کۆنەکان، هێشتا هەر قورس بوون لای من و هەر هەناسەیان دەتاساند. کە پرۆفیسۆر قسەیدەکرد هەموو پێکڕا سەیری دەموچاوی منیان دەکرد، هەموو وەک کۆمەڵێک بت و پەیکەر لە یەک خاڵ ڕامابن بێجوڵە، بێبزە، بێ چاوتروکاندن لە منیان دەڕوانی. هەموو هەوڵی ئەوەیان بوو کە هەستی سەر دەموچاوی من بخوێننەوە. من لەو ساتەدا نەمدەتوانی وەسفی هەستەکانی خۆم بکەم، مرۆڤ لە ناو گێژی و سەرسامیدا ناتوانێت تێبگات چۆن بیردەکاتەوە. من بیرم نەدەکردەوە، من تەنیا دەمڕوانی، سەیری دەموچاوەکانم ددکرد، سەیری گڵۆپەکانم دەکرد، سەیری سووتووی جگەرەکانم دەکرد، سەیری چاوی ئەو پیاوە غەریبانەم دەکرد کە تەنیا سەیری منیان دەکرد. من دەمتوانی بڵێم چی... مانای چی کەسێک ڕزگاربکەم، من کێم بتوانم کەسێک ڕزگاربکەم؟ . لە نیگای پیاوانی

ئـەو ژوورەدا دەمـدی کـە دیـلاوار چەنـد ڕۆژە نوقمـی جـۆرە تاریکییەکـی پڕ نهێنـی بـووە، دەوەسـتام و بیرمدەکـردەوە کـە تاریکـی ئەمشـەو، تاریکـی کوچـەکان، تاریکـی دیـلاوار لـە هـەوای پڕ تەلیسـمی ئـەم ژوورە دەچێت... ئێسـتا تێدەگەیشـتم بـۆ لـە سـەرەتاوە لـەم ڕوناکییـە ترسـاوم، بـۆ لـە ڕەنگـی زەرد و غەمگینـی ئـەم ژوورە سـڵم کردۆتـەوە.

من سـەیری پرۆفیسـۆرم دەکرد و دەمگـووت «جەنابی پرۆفیسـۆر تێناگەم، مانـای چـی یەکێـک ڕزگاربکـەم... مـن کێـم بتوانـم کەسـێک ڕزگاربکـەم، چـۆن کاری وا لـە دەسـت مـن دێـت، ئەسـڵەن دەتوانـم چـی بکـەم؟». دکتـۆر سـوعاد چاویلکەکـەی جولانـد و گـووتـی «مـن تێـت دەگەیـنـم. جەنابـی پرۆفیسـۆر بـە ئیجازەتـان مـن تێـی دەگەیـنـم. مـن ماوەیـەک لەوەوبـەر کـە هاتـی بـۆ زینـدان، ویسـتم ئاگادارتبکەمـەوە، گـەر یـادت بێـت مـن ماوەیـەک لەوەوبـەر تەلەفونـم بـۆ کردیت، ئەوکات هێشـتا لـە عیادەکـەی خۆتـان بـوون ویسـتم بـە هـەر ناوێکـەوە بێـت بـە جەنابـی دکتـۆر بڵێـم خـۆی لـەم کێشـەیە دووربخاتـەوە، ئـەو کات نەمویسـت نـاوی خـۆم ئاشـکرابکەم. ویسـتم بـە شەخسـی لەگـەڵ جەنابـی دکتـۆر سـیامەندا قسـەبکەم، تـا بـە نـاوی زانسـتەوە هیـچ شـتێکمان پـێ مـۆر نەکـەن. مـن لـەم ڕۆژە دەترسـام کـە بـە نـاوی زانسـت یـان هونـەر یـان مێـژووەوە تاوانێـک بەڕێوەبچێـت. حاکمانـی دیـلاوار دەیانەوێـت هەمووومـان لـە یارییەکـی خراپـەوە بئاڵێنـن، وەک چـۆن تـۆ و نیگارکێشـەکانیان تێوەئالانـد. مـن دەزانـم چەنـد وەختـە دەیانەوێـت دیـلاوار بچێتـە شـەڕەوە. ویسـتم بـە دکتـۆر بڵێـم کاری وانەکات، خـۆی لـە زینـدان و پۆلیـس و دیـداری حاکـم بپارێزێـت. خەڵکێـک هـەن دەیانەوێـت هەمووومـان بخەنـە خزمەتـی شـەڕەوە. مـن ویسـتم واتـان پێبڵێـم، بڵێـم هەمـوو شـتێک پێشـوەخت ڕەسـمکراوە، هەمـوو بۆنـە و بەهانەیـەک بـۆ ئـەوە بەکاردەهێنرێـت. دکتـۆرەکان، مامۆسـتاکان، نەخۆشـەکان... هەمووومـان بەکاردەهێنـن، هەمووومـان، بـەڵام بەداخـەوە دکتـۆر سـیامەند خـۆی بـە قاچـی خـۆی چـووە نـاو قوڕاوەکـەوە و تۆشـی لەگـەڵ خۆیـدا بـرد. مـن بـۆ ئـەوە زەنگـم

بۆ دایت، شەویک بوو من پڕبووم لە دوودڵی، نەدەکرا لەگەڵ تۆ قسەبکەم، باشتر بوو راستەوخۆ دکتۆر خۆی بدوێنم. بەڵام شتەکان خێرا هاتن و خێرا چوون. خۆت دەزانیت چەند هەفتەیەکە شار بارودۆخی نائاساییە، تۆ خۆت هەواڵت لە هەموو شت هەیە. بۆ زانیاریت، من ودکتۆر تا دە رۆژ لە مەوبەر یەکترمان نەدەناسی، ببورە مەبەستم جەنابی پرۆفیسۆرە، بەڵام بە رێکەوت برای کوڕێک کە لە زیندان لای ئێمە ئیشی سڕین و پاکژکاری دەکات تووشی گێچەڵی ئەم سوپا تازەیەی سەی ئەسلان بووبوو، خۆی گەنجێکی سەرەڕۆیە، بە تۆمەتی ئەوەی غەوارەیە و لە وێنەکە دەچێت تووشی دەردەسەری بووبوو. دوایی بە هۆی زیرەکی و بزێوی خۆیەوە لە دەست تفەنگچیان هەڵدێت و خۆی دەکات بە مۆزەخانەدا. جەنابی پرۆفسیۆر دەیگرێتە خۆی و لە ژێر زەمینی مۆزەخانەکەدا دەیشارێتەوە و خەبەر بە فەرمانبەرەکەی لای ئێمە دەدات بێت بە دەنگ براکەیەوە ... هەموو چیرۆکەکە لەوێوە دەستی پێکرد. ئەو رۆژە منیش لەگەڵ ئیشکەرەکەی خۆماندا چوومە مۆزەخانە بۆ لای پرۆفیسۆر، خۆی تکایکرد لەگەڵیدا بچم، بەڵێ خۆی تکایکرد، چونکە دەترسا لە رێگا تووشی کێشەیەکی لەوجۆرە بێت... من کە گەیشتمە حزوری پرۆفیسۆر، دەم و دەست زانیم پیاوی وا لە دیلاواردا کەمە، دەم و دەست هەستم بە سەلیقە و زیرەکی ئەم پیاوە کرد. چەند سەعاتێک قسەمانکرد. ئەوەی هەر کەسێک و کۆمەکی مرۆڤێک بخاتە ئەستۆی خۆی، بیرۆکەی ئەو بوو. بەڵێ، هەر مرۆڤێک و خۆی بە بەرپرس لە بێگوناهێک بزانێت، ئەوە فەلسەفەی ژیانی ئەم پیاوەیە. جەنابیان لە نزیکەوە ئاگاداربوون لەسەر جادەکانی دیلاوار چی دەقەومێت، ئەوان مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی شتێک بکەین، مەسەلەکە ئەوەیە کە شتێک روودەدات، دەبێت بجوڵێین. منیش بەرگەی ئەم راوە ناشیرینەی مرۆڤ ناگرم ... نامەوێت زۆر سەرت بێشێنم، دکتۆر حسامەدین هەموو شتێکی لەسەر ئەو شەوەی ماڵی فەرمانداربۆ گێڕامەوە، باسی ئەوەی کرد کە یەکێک تۆی کردوە بە بەرپرسی کارێکی

خەتەرناک، من تۆم پێشتر یەک جار بینیوە، یەک جار بەس نییە مرۆڤ یەکتری بناسێت، بەڵام شتێکت تێدایە کە لێت ناترسم... بەڵێ بە ڕاشکاوانە بە جەنابی پرۆفیسۆرم گووت، من ترسم لەو کوڕە نییە، کەسێکە بێ هیچ دوودڵییەک دەکرێت ڕازی خۆمانی بۆ باسبکەین، تورەیی خۆمانی پێ بڵێین... خۆت دەزانیت من چەند بە دەست ئەم چیرۆکەوە نارەحەتم، تۆ منت بینی لە زیندان، دەزانیت ئێمە چەند بەدەست ئەم چیرۆکەوە پەریشانین».

بە ترسەوە گووتم «باشە، من دەزانم، من لە زیندان بووم، بەڵێ دەزانم... بەڵام کێ هەیە ئەم خەونە پەریشانی نەکردبێت، بەڵام هەر یەکەی بە جۆرێک. خەونی چیی، کەی ئەوە خەونە.ئەوە شەیتانەکەی دەروونمانە و جوڵاوە ... وانییە جەنابی پرۆفیسۆر، ببورە ڕەنگە زمانم زۆر ڕەوان نەبێت و نەتوانم ئەوەی هەستی پێدەکەم بیگەیێنم. بەڵام من دەبێت چی بکەم، من بێ جێگەم،ماڵم نییە، شوێنێکی باشم نییە بۆ ژیان... چۆن دەتوانم کاری وەها بکەم».

وام گووت و سەیری هەموویانم کرد و دواجار لەسەر پرۆفیسۆر گیرسامەوە. چاوانم ترسیان لێ دەباری.

پرۆفیسۆر دەیزانی دەستەپاچەم گووتی «بیربکەوە، بیربکەوە. مرۆڤ هەر چییەک بێت دەبێت بتوانێت یەکێک ڕزگاربکات... باوەڕم بەوە نەماوە بکرێت هەموو مرۆڤەکان پێکەوە ڕزگاربکەین. ئەوە درۆیە، نەفرەت لە هەر کەسێک درۆی وای هێناوەتە دونیاوە. من پرۆفیسۆری مێژووم، مرۆڤ گەر هەوڵبدات یەک مرۆڤ ڕزگاربکات، یەک مرۆڤ... بەڵێ یەک مرۆڤ ... ئەوە تەنیا ڕێگای خۆشبەختی ئینسانە، بە مەرجێک هەموومان ئامادەبین، هەموو کەسێک ئامادەبێت، گەر یەکێک دوابکەوێت هەموو شتێک دەکەوێتە مەترسییەوە. تۆش دەبێت بتوانیت، هەموو کەسێک دەبێت بتوانێت... هیچ کەس نابێت هێند دەغەڵ و ملهوڕ بێت بڵێت ناتوانم بەرپرسیارێتی مرۆڤێک هەڵبگرم. من دڵنیام دەتوانیت، هەتا گەر جێگاشت نەبێت، پارەشت نەبێت... دەتوانیت شتێک بۆ

یەک مرۆڤ بکەیت. هەموو ترسیان لەوە هەبوو تۆ داوەتبکەن، هەموو ئەم پیاوە داماو و لیقەومانەی تۆ ئێستا دەیانبینیت، کۆمەڵێک ڕاوچی دڵڕەق وان بەدوایانەوە. ئێوارە کە دانیشتنمان دەست پێکرد، هەموو گووتیان، با ئەو کەسە نەیەتە ئەم بازنەیەوە، با چارەنوسی کەس نەکەوێتە بندەستی... بەلام من دەزانم تۆ دەتوانیت ئیشێکی باش بکەیت، دەتوانیت ... دەزانم دەتەوێت ... دڵنیام دەتەوێت».

پرۆفیسۆر ئەمجارە هەم نیگای و هەم دەنگی دۆستانەتر بوو، بەلام من ئارام نەبوومەوە و ئاسوودەنەبووم. ترسێکی کتوپڕ لە دڵمدا بوو کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو، گەرچی لەو هەفتانەی دواییدا دونیا لە بەرچاوم گۆڕابوو، گەرچی شتی نوێم زۆر بینیبوو، هەستی نوێم زۆر تاقیکردبووەوە، بەلام ئەوە یەکەمجار بوو بزانم کە بە ڕاستی گیرۆدەی کێشەیەکی گەورەم. قورسایی هەموو ڕووداوەکان و ئەو ڕەوتە ترسناکەی کە دەشێت بیگرنە بەر، تەنیا لەو کاتەدا ڕوون لە پێشچاوم دیاربوون. تا ئەو کاتە خۆم نە بە گوناهبار و نە بێگوناه دەزانی، یەکێک بووم شەپۆل بردبوومی، نە هیچم بۆ دەکرا و نە دەمتوانی بەرگرییەکی سەخت پیشانبدەم. چاوانم سامێکی گەورەیان تێدابوو، سامی ئەوە نەبوو ئێستا و لەم شەوەدا سەیری ئەم ڕوخسارە نامۆیانە دەکەم، بەڵکو شتێکی سەیر تر و نهێنیتر و تاریکتر بوو، سامی ئەوەی بێ ویستی خۆم لە تۆڕێکی ترسناکدام و ناتوانم بێمە دەرەوە. من لەو ماوە کەمەی ئەزموونی سەنتەری چارەسەرییەکەدا، هەستێکی قووڵی گریانم تێدا سەوز بووبوو، هەر کاتێک لە بەردەم ئەو نەخۆشانەدا دەگریام کە خۆم لە بەشی پەروەردە و تەمێکردن دەمهێنانەوە، هەر کاتێک فرمێسکم هەڵدەخست، ڕۆحم لەگەڵ گریانەکەمدا دەردەهات، بەڕاستی ئەسرینم دەباران و غەم لە ناوەوە ڕایدەتەکاندم. من خۆم بێ هیچ هۆیەک، بێ هیچ گوناهێکی وەها، خواستێکی زۆرم بۆ شیوەن تێدابوو ... ئامادەگییەک بۆ ئەوەی بە فرمێسک شەڕ لەگەڵ کارەساتەکاندا بکەم، بە فرمێسک شەڕ لەگەڵ جیهاندا

بکەم. باوەڕم نەدەکرد ئەو شەوە لە ناو ئەو سەرسامییەدا، لەو فەزا تەلیسماوی و پڕ نهێنییەدا بگریم. بەلام لە کاتێکدا هەمووان سەیریاندەکردم، دەستم بە گریان کرد... هیچ شتێکی ترم نەبوو جگە لەوەی بگریم و داوای لێبوردن بکەم. لە ناکاو بە دەنگی بەرز و لەگەڵ هەنسکدا کەوتمە ئەوەی لە هەمووان بپاڕێمەوە لێمببورن، من لە ژێر باری فرمێسکدا وەعدم بە پرۆفیسۆر بەهنامدا هەموو شتێک بکەم تا مرۆڤێک ڕزگاربکەم، دەگریام و دەمگووت «گەرچی زۆر سەختە، گەرچی نازانم چۆن دەبێت، بەلام سوێند دەخۆم کە هەموو شتێک بکەم، مرۆڤێک ڕزگاربکەم. جەنابی پرۆفیسۆر... جەنابی دکتۆر ... ئێوە برا غەمگینەکانم ... وامەزانن کە ڕزگارکردنی مرۆڤێک لە ڕزگارکردنی هەموو دونیا ئاسانترە». وام دەگووت و هۆن هۆن فرمێسک لە چاوم دەباری. هەموو زانیان من لە دۆخێکی دژواردام، پرۆفیسۆر گووتی «بەو کارە خراپەت، دونیات ئازاردا. ئێستا پێویست بە گریان ناکات، هەستە. من دڵنیام بەرپرسیارێتی یەکێک لە بەدبەخت و لێقەوماوەکان هەڵدەگریت، یەکێک حەشاردەدەیت و دەیپارێزیت... بەس بگری، هەستە و بەر لەوەی ڕۆژ بێتەوە دەبێت هەموو ئێرە بەجێبهێڵین. مامی شۆفێر لە کوێیە، با وردە وردە ئێرە چۆڵبکەین». لە گەڕانەوەدا دەنگی پرۆفیسۆر بەدرێژایی ڕێگا لە گوێمدا دەزرینگایەوە، دڵنیابووم پرۆفیسۆر منی خۆشدەوێت، دەیەوێت یارمەتیمبدات، بەلام زۆر بەلامەوە سەخت بوو بتوانم دڵی ڕازیبکەم . من بە جۆرێک ماندوو و بێبڕست بووم، قسەکانی پرۆفیسۆر بێ هیچ نەزم و مانایەک تەنیا وەک ژاوەژاوێک لە گوێمدا بوو.

ئەو شەوە کە گەیشتمەوە ژوورەکەی خۆم، وەک بێهۆش لێی خەوتم... کە بێداربوومەوە خۆر هەڵهاتبوو و مامە سیام و سەبری جاهدار هەر دووکیان وەک بە سەر مردوویەکەوە وەستابن، لەسەر سەرم وەستابوون.

# ٢٥

دەنگوباسی ڕۆژانە پڕ بوو لە هەواڵی ناخۆش. چەند هەفتەبوو بەردەوام گوێم لە تەقە و ناڵەی دەستڕێژ و فیشەک دەبوو، هیچ سەعاتێک تێنەدەپەڕی بێئەوەی زرمەی تفەنگێک، گا دوور و گا نزیک، نەگاتە گوێم. بەوەدا من زۆربەی کاتم لە سەنتەرەکەدا دەبردە سەر، سەرچاوەیەکی زۆری زانیاریم لە بەردەستدا نەبوو، نەشمدەویست هیچ کەسێک بزانێت کە مرۆڤێکم بایەخ بە حاڵی دونیا دەدەم. بارودۆخی خراپی نەخۆشەکان و خراپی نیشتەجێکە و ژیانە سەختەکەیان لە ناخەوە منی کردبووە کەسێکی دڵتەنگ و گەمژە، جگە لەوەی بیر لە ژیانی ئەم نەخۆشانە بکەمەوە، بیر و هۆشم لای هیچی تر نەبوو. دەمێک ئازاری ئەم هەموو نەخۆشانەم دەبینی، بێ ویستی خۆم چاوانم پڕدەبوون لە فرمێسک. بە جۆرێک نەوەک بووبووم بە شوێن گاڵتەی چاودێر و فەرمانبەران، بەڵکو بە بابەتی کلکە و لاقرتی نەخۆشانیش. لەو کاتەدا بوو، ڕۆژێک بۆ پرسینەوە لە حاڵی یەکێک لە بیماران ڕوومکردە یەکێک لە قاوشەکان. نەخۆشەکەم سێ ڕۆژ بوو دوای هاتنە دەرەوەی لە «پەروەردە و تەمێکردن» هێشتا بە دەست ورێنە و بێهۆشبوونی پەیتاپەیتاوە دەیناڵاند، هەر چوومە قاوشەکەوە یەکێک لەوسەرەوە دایە پڕمەی پێکەنین و گووتی «چاو چاو، کێ لێرەیە، چاو چاو ... مستەر گرینۆک».

قاوشەکان زۆریان درێژ و تاریک بوون، گەرچی دونیا گەرم بوو،

نەخۆشەکان زۆریان ملپێچی ئەستووریان لە ملیانەوە پێچابوو، هەندێکیان بەردەوام بە دەست برینێکی وەهمییەوە دەیانناڵاند، سەربڕینەکانی ناو خەون، وردە وردە وەک ئازاری ڕاستەقینە لە سەر گەردنی هەندێکیان دەردەکەوت، وەک خەتێکی ڕۆشنی برین لە ئەڵقاوئەڵقی ئەستۆیاندا خەتێک کشابوو، هەبوو هەموو ملی خۆی بە نینۆک بریندارکردبوو. چەقۆ لە هەموو قاوشەکاندا قەدەغەبوو، چونکە ترسێکی وەهای دەخستە دڵی نەخۆشەکان، ئارام و سوکناییان لەبەردەبڕا. لەگەڵ شپرزەیی و باری دژواری بیمارەکان، قاوشەکان پاک و بە نەزم بوون. چاودێرەکان بە زەبری کوتەک و گۆچان ڕێکوپێکییەکی ئاسنین و دەستکردیان سەپاندبوو، بەڵام هەر ئەو یاسا و نەزمە وایکردبوو ڕەنگی ماتەمینێکی قورس باڵ بەسەر جێگاکەدا بکێشێت. کە دەچوومە ناو قاوشەکان، جۆرە هەوایەکی وشک دەهاتە ناو سینەم، دەنگی پرسەیەک لە فەزای جێگاکەدا دەسوڕایەوە، شیوەنێک بێئەوەی بوونی هەبێت دەهاتە گوێم، شیوەنێکی سەیر بوو کە من چەند ڕۆژ بوو لە زۆر جێگادا دەمبیست، هاواری شەپۆڕ و لە خۆدانێکی بەرز کە سەرەتا وامدەزانی دەنگی ڕاستەقینەی سەدان مرۆڤی گریاوە و لە نزیکمەوە بەرز دەبێتەوە، بەڵام چەند دەگەڕام، ئاوڕمدەدایەوە، دەوروبەری خۆمم دەپشکنی... هیچم نەدەبینی.

کاتێک ئەو دەنگە منی بە «مستەر گرینۆک» ناونا، پرمەی چەند قاقایەکی گەورە وەک چەند بەردێکی گەورە بن و شوشەی ئەو کپییە بشکێنن، لە مسەری ژوورەکەوە تا ئەوسەر هات و ڕۆی. چەند دەنگێکی کپی دیکە، لە ژێر پەتۆکانیانەوە، وەک لاسایی دەنگی توتییەک بکەنەوە، چەندین جار ئەوەیان دووبارەکردەوە «چاو چاو کێ لێرەیە، مستەر گرینۆک»، «چاو چاو کێ لێرەیە، مستەر گرینۆک»، «چاو چاو کێ لێرەیە، مستەر گرینۆک».

یەکێک منی ناونابوو «مستەر گرینۆک».

هێدی هێدی دێلاوار مالاوایی لەسەردەمێکی دوورودرێژی دڵنیایی دەکرد و سووڕی زەمان بەرەو ناو تونێلێکی تاریک دەیبرد. ڕۆژنامەکان و تەلەفزیۆنەکان بەردەوام قسەیان لە دوژمن دەکرد، دوژمن هەم لە ناو دێلاوار بوو و هەم لە دەرەوە ، دەبینرا و نەدەبینرا، زۆر نزیک و زۆر دوور بوو، سوپایەکی گەورە بوو لەسەر سنوورەکان، بەڵام ترس و مۆتەکەی ناو خەونەکانیش بوو، پاسەوانی سەر سنوورەکان بە دووربینەکانیان لەو دیو هێڵێکی خەیاڵییەوە دەیانبینی، بەڵام خەڵکی دێلاوار لە پێخەفەکانیاندا، لە ژێر پەتۆ و لەسەر بالیفەکانیان دەهاتە خەویان. هەموو ڕۆژێک هەواڵەکان باسیان لە سەری بڕدراوی خەڵکانی دێلاوار دەکرد، وێنەی هەندێ ڕەشەکوژی و کۆمەڵکوژییان بڵاودەکردەوە کە لە سەر سنوورەکان ڕوودەدەن، گوند و سەر زەمینەکانی قەراغی دێلاوار هەمیشە تخوبی پێکدادان بوون ... سنوور جێگایەک بوو هەموو شتەکان تێیدا دەکەوتنە بازنەی دوودڵی و گومانەوە، هەر هەواڵێک لە سنوورەوە دەهات تەماوی و ئاڵۆز بوو، دەبوو هەم باوەڕی پێبکەین و هەم باوەڕی پێ نەکەین. ئێستا هەواڵەکان، قسەیان لە ئامادەکاری دوژمن بۆ پەلاماری دێلاوار دەکرد، جەنگاوەرە تارمایی ڕەنگەکانی سەر سنوور، خورافەتە دووبارەکان، ترسە بولێڵییەکان، ئەوانەی نەماندەزانی هەن یاخود نین، ڕاستن یان درۆ، دزەیان کردبووە ناو ژیانەوە. ئیتر دوژمن لە هەموو جێیەک بوو، پەلاماری دوژمن بۆ کێڵگە و مەزراکانمان، بۆ سەر ترۆپکی چیا ستراتیژییەکان، گرتنیان بۆ ئاوی ڕووبارەکان، ژەهراویکردنیان بۆ خواردنەکان، دزینی مەڕومالاتی خەڵکانی گوندنشین... هەواڵی بەردەوام بوون. تەلەفزیۆنەکان بەردەوام فیلمی ئەو ژن و منداڵە هەڵهاتووانەیان پیشاندەدا کە میلیشیاکانی دوژمن لە زێد و ماڵی خۆیان هەڵیاندەکەندن، دیمەنی ساوای کوژراو، ژنانێکی زگپڕی سەربڕدراو، پیاوان کە بە درەختی سەر ڕێگاکانەوە دەبەسترانەوە و تیرباراندەکران. هەموو هەستێکی ناخۆشمان

هەبوو کە دوژمن پەلاماردەدات، شار بە گشتی وردە وردە ئەو هەستە ترسناکە دەیخنکاند کە درەنگ یان زوو کارەساتیکی گەورە دەقەومێت و لەشکرێکی وەحشی لە جێگایەکەوە دێت و دیلاوار وێراندەکات.

هەندێ باسیان لە خەونێکی تازە دەکرد کە هێدی هێدی لە دیلاوار بڵاودەبووەوە، لە بری ئەوەی جەلادی ناو خەونە نهێنییەکانمان تەنیا دەربکەوێت و تەنیا سەربپەڕێنێت، هەم جەلادەکان و هەم قوربانییەکان بە کۆمەڵ دەردەکەوتن و لە گۆڕەپانی گەورە و حەوشی بەرین و فراواندا ئاهەنگی سەربڕینیان سازدەکرد. هەموو شەوێک لە خەونەکانی دیلاواردا هەزاران سەر دەپەڕی، بەجۆرێک کەم کەس مابوو لە سەری خۆی دڵنیابێت، هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان دیمەنی خۆیان دەبینی، ڕۆژێک تەنیا وەک لاشەیەکی ڕووت، بێسەر، بەسەر زەویدا دەگەڕێن. لە ناو شار ترسی خەڵک لە خەونەکانی خۆیان و ترسیان لە دوژمن ئاوێتەی یەکدەبوون. خەڵکانێک دەرکەوتن کە بەردەوام جاڕی هاتنی زوو بە زووی سوپایەکی ڕەشیان دەدا کە جگە لە چەقۆ و کێرد و ساتوور، نەخۆشی نادیار و ئافاتی ڕەشی پێیە کە هیچ کات ماکی دەردەکانیان ناپەڕێت.

لە دیلاوار خواستی تۆڵەیەکی کوێر تا دەهات گەورە دەبوو. چەندین گروپی چەکداری نەناسراو دەرکەوتن کە ئیشیان ئەوە بوو بۆ دوژمن بگەڕێن. ژمارەی ئەو خەڵکانەی باوەڕیان بەو ئەفسانەیە هێنابوو کە دوژمن لەشکرێک لە سیحرباز و ئەفسونکاری بەدی ناردوە تا دیلاوارییەکان تووشی ترس و پەرێشانی دەروون بکات، تا دەهات زیادیدەکرد. بۆ من وەهابوو وەک شتەکان یەک یەکتری تەواو بکەن، ئەو ڕۆژانە مامۆستایەکی دینی دەرکەوت کە دروشمی ئەوە بوو «هەموو شتێک دوژمنە»... ئیدی هەموو شتێک بە دوژمن تەفسیردەکرا، نەخۆشییەکان، خواردنی خراپی چێشتخانەکان، پیسی ئاو، تەپوتۆزی هاتوو لە بیابانەوە، ڕووداوەکانی هاتوچۆ، گەمژەبوونی

بەردەوامی خەڵکی دێلاوار، شەڕانگێزی فرۆشیارەکان، بێدەنگی زۆر و قووڵی فەرمانبەرانی دەوڵەت، زیادبوونی فاڵچییەکان، زۆربوونی سەعاتەکانی خەو، زیادبوونی بێشومار و لە ژمارە نەهاتووی شێتەکان ... هەموو شتێک بە دوژمنێکی نادیارەوە گرێدەدرا، دوژمنێکی بێناو، بێڕوخسار.

من لە هیچ شتێک نەترسام، بە ئەندازەی ئەو قسانە کە ڕۆژێک مامە سیام و سەبری جاهدار لە کۆبوونەوەی کۆنفیدراسیۆنی بنەماڵەکانی دێلاواردا کردیان. ئاخافتنی دوو قۆڵی مامم و یاوەرەکەی، تەنیا دوو ڕۆژ دوای شەوی بینینی من بوو بۆ پرۆفیسۆر و دکتۆر سوعاد. مامم هەفتەیەک بوو لە بیمارستان کەم دەردەکەوت، بە پەلە دەهات و بە پەلە دەچوو، فەرماندار ئۆتومبیلێکی ژاپۆنی خستبووە خزمەتییەوە. هەر کە دەگەیشتە سەنتەر بە پرتاو خۆی دەکرد بە نوسینگەدا و کەمێک دەمایەوە و بەپرتاو بۆی دەردەچوو، ئەو ماوەیە هەرگیز بە منی نەدەگووت بۆ کوێ دەچێت و چی دەکات، تەواو لە ناو کاروباری ئەو لیژنانەدا نوقمبوو کە ئیدارەی دێلاوار دروستیکردبوو. هەستمدەکرد مامم منی بیرچۆتەوە، جاران خۆشحاڵ بووم کە کەسێک هەبوو غەمی منی دەخوارد، بەڵام ئێستا بە جۆرێک گیرۆدەی ئیش و ئامادەکاری و لیژنە و کۆمیسیۆنەکان بووبوو، کاتێکی کەمیش بۆ ژیانی تایبەتی خۆی دەمایەوە. ئەو ڕۆژە لە ناو فەرمانبەران و چاودێران و پاسەوانەکانی سەنتەرەکەدا بوو بە قاو کە ئەمڕۆ هەردوو بەڕێوەبەری سەنتەرەکەمان لە تەلەفزیۆن دەردەکەون و قسە و لێدوانی سەر سەکۆیان دەبێت. من هەواڵی دەرکەوتنەکەی ئەوانم لە زاری بەرپرسی بیرۆکەی مامەوە بیست، ئەو پێیگووتم کە جەنابی دکتۆر سیامەند و دکتۆر سەبری، سەعاتی یەکی پاش نیوەڕۆ لە گردبوونەوەیەکی گەورەدا وتار دەخوێننەوە.

بە پەلە گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم و دانیشتم تا هەردووکیان لەسەر ڕووی تەلەفزیۆنەکە دەرکەوتن. مامم قاتێکی گرانبەهای پۆشیبوو کە شیهابی

داوزێڕین، ناوداترین بەرگدرووی دیلاوار بۆی درووبوو، هەموو کەناڵەکان پێکەوە دیمەنەکەیان دەگواستەوە، هەستمدەکرد مامم و سەبری جاهدار لە ترۆپکی ژیان و گرنگی خۆیاندان. جاهدار گەرچی هەمیشە مۆن و بوغزن دیاربوو، لەوێ خۆی کردبوو بە پەپولە، گوڵێکی سپی بچوکی دابوو لە یەخەی چاکەتێکی ڕەش و پێکەنینێکی نەرم و ویقارێکی لێ نەهاتووی نیشاندەدا. دیاربوو هەردووکیان پێش ئەوەی بچن بۆ کۆبوونەوەکە دوو سەعات لای ئارایشتگەر بوون. ئەوە یەکەم جارم بوو مامە سیام لە ڕوخسارێکی وادا ببینم، پێشتر بایەخی بە جوانی سەرو ڕوخساری خۆی دەدا، بەڵام نە بگاتە ئەوەی بەوجۆرە شێوەی خۆی بگۆڕێت. ئارایشتگەرەکە هەوڵیدابوو هەموو هونەرێک بخاتە کار تا مامە سیام وەک زانایەک دەربکەوێت، قژی بۆ سەرەوە هەڵدابووەوە و سمێڵی بە بۆیەیەکی ڕەش ڕەنگکردبوو. لە مەراسیمەکەدا بەدەستکێشە سپییەکانیەوە دەرکەوت، وەک یەکێک لە گەورەترین زاناکانی دیلاوار ناسێنرا. لەو باوەڕەدا نەبووم کە پێشوازی وەها لە مامە سیام بکرێت، بەڵام ئێستا وەک زانایەکی بێوێنە و پسپۆڕێکی پلە یەک و تەکنۆکراتێکی شایستە هاتبووە مەیدان. لە کۆبوونەوەی کۆنفدراسیۆندا کاتێک وەک پیاوێک کە شوێنگە و غروری خۆی هەیە لەسەر سەکۆی لێدوان دەرکەوت، کامێراکان وەک وێنە لە کەسێکی ئەفسانەیی بگرن، فلاش بارانیان کرد. ڕەنگی شینی بۆینباغەکەی و چێوەی زێڕین و بریسکەداری چاویلکەکەی و سەعاتە زێڕینەکەی دەستی بە جۆرێک سەرنج ڕاکێشبوون، ڕۆژی دوایی ڕۆژنامەکان لەسەریان نوسیبوو. یەکەمجار لەو سەکۆیەدا تیورەی «چاککردنەوە بە شۆکی دوژمن» یان خستە ڕوو.

کۆبوونەوەکە وەک زۆربەی ئەو کۆنفرانس و گردبوونەوە گەورانەی دیلاوار بێبەرنامە و نارێک بوو، بەڵام دەرفەتێک بوو مامە سیام و یاوەرەکەی ئەو ڕوانینەی خۆیان بخەنە ڕوو تا لەسەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونەدا دیلاوار بەرەو کەناری دڵنیایی بپەرێتەوە. بۆچوونەکەیان وەک

تیورەیەکی زانستی نوێ پێشکەشکرا کە دەبێت لە ڕۆژانی دواتردا دیلاوار و دەزگا دەوڵەتییەکان ڕەچاویبکەن. من بە درێژایی وتارگۆیی ئەوان، دەمم ماق و سەراسیمە سەیری تەلەفزیۆنە کۆنەکەمم دەکرد و نەمدەتوانی هیچ بڵێم. کورتەی ڕوانینیان ئەوەبوو، کە بوونی دوژمن گەرچی ڕەگەزێکی ژیان تێکدەر و ئازاربەخشە، بەڵام بە کەمێک وردبینی و زیرەکییەوە دەتوانین وەک کانگایەکی هێز و سەرچاوەیەکی بەرهەمهێن سەیریبکەین. بۆچوونی ئەوان ئەوە بوو، دوژمن بکرێتە ئاراستە و نیازی هەمیشەیمان، بە ئامانجێک کە هەردەم لە پێش چاومان بێت، ئیدی مرۆڤەکان چ کینە و گری و ترسێکیان هەیە دەتوانن لە دوژمندا خاڵیبکەنەوە، پێویستیان بەوە نابێت کینەکانیان بگرنە یەک یان بیگرنە فەرمانڕەوایان و بابسالارانی ناوخۆ... کە مرۆڤ دوژمنێکی هەبوو، ئیتر دەزانێت دەبێت چی بکات، ژیانی لە بێمانایی دێتە دەرێ، لە زومرەی سەر لێشێواوان نابێت، نیاز و ئامانجێکی ڕۆشن کار و کرداری دەبەن بەڕێوە.

مامم بە جۆرێکی وەها ڕوون و بە لیاقەتێکی وەها زانایانەوە قسەیکرد، هەتا کەسانێکیش کە تێی نەدەگەیشتن، ئاسان دەکەوتنە ژێر هێزی قسە و زمانبازیی ئەوەوە. سەبری جاهدار لەو ڕووەوە نەیدەتوانی بە نیوەی مامىدا ڕابگات. پێدەچوو هەردووکیان چەندین شەو پێکەوە دانیشتبن، بیریانکردبێتەوە چۆن ترس لە دوژمن گەورەبکەن و دواتر بیگۆڕن بە سەرچاوەی وزەیەکی لە بنەهاتوو. مامم لە تەلەفزیۆندا شێوەی جۆرە کەسێکی تری وەرگرتبوو، گەرچی سەرسامبووم بە دەرکەوتنی، بەڵام نامۆ و دوور هاتە پێش چاوم. پێشتر ئەمجۆرە بیروڕایانەم بە کاڵی لەو بیستبوو، بەڵام بوونی بە تیورییەکی وەها ڕوون لە کاری جاهدار بوو. جاهدار باوەڕی وابوو گەر مرۆڤەکان دوژمنێکی ناسراویان هەبێت و هەموو شەڕانگێزی خۆیانی ئاراستەبکەن، ئەوکات مرۆڤی ڕێک و ڕاست و تەندروستیان لێ دەردەچێت. پەروەردە لای جاهدار یەک مانای هەبوو، مرۆڤەکان هەموو پێکەوە لەسەر دوژمنێک

ڕێکبکەون و پێکەوە هەوڵبدەن تێکی بشکێنن.

بۆچوونەکانیان بە چەپڵەڕێزانێکی زۆر پێشوازی لێکرا، هۆڵەکە سەر لەبەری خرۆشا، سەی ئەسڵان لە ڕیزی پێشەوەی گوێگراندا دانیشتبوو، بە گەرمی و جۆشێکی شێتانەوە چەپڵەی بۆ لێدان و هوتافی بۆ کێشان. وەک کەسێکی بە ئەمەک کە قەدری هەموو شتێکی بە نرخ دەزانێت، بە ویقارێکەوە کە پێشتر لە پیاوانی دیلاواردا نەمبینی بوو، چووە سەر مینبەرەکە و ناوچاوانی مامە سیامی ماچکرد، هەموو تەلەفزیۆنەکان ماچەکەیان بە ڕوونی گواستەوە، باوەشە گەرم و گوشینەکەی سەی ئەسڵان چەپڵە و ستایشی تری بەدوای خۆیدا هێنا. من هێشتا دڵنیانەبووم چی دەگوزەرێت، نەمدەزانی بۆ کوێ دەچین، کەمێک بە سەرسامی و کەمێک بەترسەوە تەماشای ئەو ئامێزانەم کرد، دەستم لەرزێکی لە ناکاوی تێدا بوو کە نەمدەزانی هۆکەی چییە. ئەو دیمەنە تووشی سڕبوونێکی لە ناکاوی کردم، بەجۆرێک ترسام دەبوو هەر خێرا تەلەفزیۆنەکە خامۆشبکەم و لە ژوورەکە بڕۆمەدەرێ.

چەند ڕۆژ دوای ئەوە بەرنامەیەکی گشتی لە دیلاوار دەستی پێکرد کە نەخۆشخانەکان و زیندانەکان و سەربازگاکان و قوتابخانەکانی دەگرتەوە. هەموو کەسێک لە دیلاوار دەبوو بەوە پەروەردە بێت کە ڕقی لە دوژمن بێت. نامیلکەیەکی بچوک بە سەر مامۆستای قوتابخانەکاندا دابەشکرا کە بەرگی پێشەوەی نیگارێک بوو وەک نیگاری ئەو خەونە ترسناکە، پیاوێک بە چەقۆیەکی درێژ سەری کەسێکی سپی پۆش لێدەکاتەوە، لە ژێر وێنەکەدا بە خەتێکی شکاو و چرچ نوسرابوو، چۆن نەهێڵین دوژمنان بمانکەن بە نێچیری خۆیان. کتێبەکە دەبوو ڕێنماییکەری مامۆستایان بێت تا قوتابییەکان فێربکەن، کینە و تورەیی خۆیان ئاراستەی دوژمن بکەن و نەهێڵن دوودڵی و دابڕان بکەوێتە ڕیزی خۆیانەوە. لە هەموو جێگایەک وانە و پانێلی ئامۆژگاری و سیمیناری بەرچاو ڕوونی لەسەر دوژمن سازدەکرا... دوژمن...

دوژمن... وشەیەک کە مرۆڤ دەبوو لە بەیانییەوە لە خەو هەڵدەستێت، تا کاتێک دەخەوێت سەدان جار بیبیستێت، بێئەوەی بتوانێت لە ڕوخسارێکی دیاریکراودا کۆیبکاتەوە.

ڕۆژێک لە سەنتەری چارەسەرییەکە دوو کوڕی گەنج دەرکەوتن کە هەردووکیان وەک یەکیان دەپۆشی و وەک یەکیان دەخوارد و وەک یەک پێدەکەنین. بە یەکەوە دەڕۆیشتن و بە یەکەوە دەهاتن، هەمیشە لە ڕاڕەوەکاندا پیاسەیان دەکرد و بە میهرەبانی سڵاویان لە هەموو کارمەند و فەرمانبەرێکی سەنتەرەکە دەکرد. دوو ڕوخساری پاک و فریشتەییان هەبوو، خۆیان وەک کوڕی خانەوادەی نەجیبزادان دەناساند. وەک خۆیان دەیانگووت هاتبوون باسی دوژمن بۆ نەخۆشەکانمان بکەن. ناساندنی دوژمن بووبوو بە جۆرە زانستێکی نوێ، مامۆستا و شارەزاکانی لە مەکتەبێکی تایبەت کۆرسێکی کورتی چەند ڕۆژەیان دەبڕی و بە ناوی دوژمنناسەوە دادەمەزران. هەموو دەیانگووت ئەم مامۆستایانە چاوی تایبەتی دەزگایەکی نهێنین کە حاکمی سەربازی دایمەزراندون. لە ڕۆژی یەکەمەوە هەندێ لە چاودێران ئاگاداریانکردمەوە، هەموو بە هێما و تانەوە دەیانگووت «مامۆستا ئاگاداربە، دیاریمان بۆ هاتووە لەلای حەزرەتی پاشاوە». ئاخۆ ئەم دوو کوڕە گەنجە، سیخوڕی دەزگایەکی تایبەت بوون؟ نازانم ... بەڵام پێکەنینیان هێندە پاک بوو، خەندەیان هێندە پڕ ڕۆشنایی بوو، من گومانم لێ کردن، هەر چیم دەڕوانی ئەو هەموو گەشی و ڕوخۆشییە لەگەڵ ئیشەکەیاندا نەدەگونجا. دوو مامۆستاکە ئیشیان ئەوەبوو نەخۆشەکانی بیمارستان وابێکەن خەیاڵی خۆیان بخەنە سەر دوژمنێک کە دەبێت ئامادەبن ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕوو بە ڕوو بۆیان بچنە مەیدان. بەڵام نەخۆشەکانمان خۆیان پڕبوون لەو وێنەیە... پڕبوون لەو کینەیە... لەو ڕووەوە هەموو گەیشتبووینە جێگایەک ئیدی کەس پێویستی بە مامۆستا نەبوو.

# ٢٦

ئال موراد بۆی گێڕامەوە :

«دوو هەفتە لەسەر یەک باڵندەکانمان ڕاوەکرد، بڕیارماندابوو تا دەتوانین باڵندە بکوژین ... تەقەکردن لە باڵندەکان خۆشییەکی زۆری تێدابوو، ئەو فیشەکانەی دەمانتەقاندن، ترسی لە شاردا بڵاوکردەوە. سەرەتا واتێگەیشتم کە نیازی ئێمە پاککردنەوەی شارە لەم باڵندە غەریبانە کە سەی ئەسڵان دەیگووت نەخۆشی و ئافاتمان بۆ دەهێنن. سەی ئەسڵان دەیگووت ئەم تەیرانە لە شار و دارستانی دوژمندا گەورە بوون و دواتر بەرەو دێلاوار بەریانداون تا دەرد و بیماری نەناسراومان بۆ بگوێزنەوە. من و هاوڕێکانیشم زۆر باوەڕمان بە قسەکانی سەی ئەسڵان هەبوو. گەر وانییە، بۆ ئەم باڵندانە ساڵێک لەوەوبەر لە دێلاواردا نەبوون؟ ... هەر دەبێت هاتن و دەرکەوتنیان لە کاری کەسێکی ناحەز بێت، کە هیچ نەبێت دەیەوێت دێلاوار ڕیقنە باران بکەن. بەلام ئەرسەلانی موفتی کە گەنجێکی گروپەکەی ئێمەیە ڕایەکی جیاوازی هەبوو، سوێندی دەخوارد کە باڵندەکان هەمیشە هەبوون، بە دڵنیایی کەسێکەوە کە ڕاستی دەزانێت دەیگووت هەموو ئەو باڵندانەی لە منداڵییەوە بینیوە و هەرچییەک دەربارەی تازە دەرکەوتنی ئەم باڵندانە دەگووترێت تەنیا درۆی ڕووتە. بۆقبۆقیلە پێی گووت «دەمت دابخە، تۆ چوزانیت، دوژمن تازە ئەم باڵندانەی ناردوە بۆ

دێلاوار، زۆربەیان تەیری نەخۆشی مەمەدحەسارن، نەخۆشی خەتەرناکیان پێیە، فێربە لە خۆتەوە قسە لە قسەی سەرۆکدا مەکە». ئێستا هەموو بە سەی ئەسلانیان دەگووت سەرۆک، هەر کەسێکیش بۆقبۆقیلە پێیگووتبا دەمت دابخە دەبوو دەمی دابخات.

بۆقبۆقیلە و هەندێ لە کورانی تر هیچ کات دەست لە باڵندە کوژراوەکان نادەن، بەڵام من وانیم، من دەتوانم باڵندەکان بکوژم و دەستیشیان لێبدەم. من چێژێکی زۆر لەوە دەبینم سەیری باڵندەی کوژراو بکەم. بە پەنجە پێڵویان هەڵبدەمەوە و سەیری چاویان بکەم، دەست بە پەڕەکانیاندا بهێنم. تا من بەر لەوەی لەگەڵ باغەوانەکانی دێلاواردا بکەومە تەقەکردن، هیچ کات نەمدەزانی ناو شار ئەوەندەی باڵندە تێدایە، سەر درەختەکان پڕن لە حەشاری نهێنی باڵندە. ڕۆژی یەکەم من سێ باڵندەی جوانم هەڵگرت بیبەمەوە بۆ ماڵ تا دایکم ببینێت من چ جۆرە تەیرێکم کوشتوە، دەمزانی دایکم حەزی لە باڵندەی جوانە، لە ڕێگا مامۆستا سمکۆ سوهەیبی دراوسێمان منی بینی و گووتی «عاسمان، عاسمان ئەوە چییە. وای چ جوانن، باوکەڕۆ، ئەوە ئەم تەقانەی ئەمرۆ ئەم شتە جوانەی بە دواوە بوو؟ دەی دەستی ڕاوکەری خۆشبێت، کورە گەر باڵندەی وا جوانت دەستکەوت بۆم بهێنە، من بە پەڕەکانیان تابلۆ و شت دروستدەکەم ... وەی خالق .. برا ڕۆ لەو ڕەنگانە، دە وەرە ڕۆحت دەرنەچێت». وشەی ئاسمان لە دەمی مامۆستادا وەها شیرین بوو، دواتر هەر کاتێک وشەی ئاسمانم بەکارهێنابێت، هەر بە تۆن و دەنگی ئەو گووتوومە «عاسمان، عاسمان، وەی خالق». باڵندەکان وەها سەرسامیان کردبوو، من خۆم باوەڕم نەدەکرد کەس هەبێت بە جوانی باڵندەیەکی مردوو وا بکەوێتە جۆش و خرۆش. نەمدەزانی مامۆستا دەیەوێت چی بکات، بەڵام ڕۆژی دواتر کە نزیکی دوازدە باڵداری کوژراوم بۆ بردەوە، لە حەوشی ماڵدا ڕایگرتم و گووتی «پەڕی باڵندە نرخی خۆی هەیە، من چەند ساڵە بیر

لـە دروسـتکردنی باڵندەیەکـی گـەورە دەکەمـەوە کـە پەڕەکانـی لـە پـەڕی هەمـوو باڵندەکانـی دونیـا دروسـتبووبێت، نانـا باوکـە گیـان تـۆ دەڵێیـت چـی، لـە شـوێنێکی بەربـاران داینانێم، دەیخەمـە قەفەزێکـی شوشـەوە، لـە شـوێنێکی زۆر تایبـەت هەڵیدەگـرم، دەمەوێـت شـتێک بێـت ببێـت بـە ڕەمـزی دیـلاوار». مـن هـەر تێنەگەیشـتم مامۆسـتا سـمکۆ سـوهەیب دەیەوێـت چـی بـکات، بـەڵام مـن ڕۆژانـە دەیـان باڵنـدەی کـوژراو و جوانـم بـۆ دەبـرد، ئـەو ژنەکـەی زۆر جـوان بـوو، هەمـووش دەیانگـووت دڵپیسـی لێـدەکات، بـەردەوام لـە حەوشـەکەدا ڕایدەگرتـم و نەیدەهێشـت بچمـە ژووری، یـەک یـەک سـەیری تەیرەکانـی دەکـرد و دەیگـووت «وەی قوربانـی خالـق... وەی دایـە ڕۆ، ئـەوە چییـە ... سـەیر سـەیر ئـەو ڕەنگـە، تـو شـەرەف فەنـان هەیـە ڕەنگـی وا دەربهێنێـت ...».

مـن و تفەنگچییەکان لـە هەمـوو گەڕەکەکانـدا ڕاوە باڵندەمـان کـرد. سـەی ئەسـلان مەبەسـتی بـوو خەڵـک گوێیان بـە دەنگـی گوللـە و شـریخەی دەسـتڕێژ ڕابێـت. دەیگـووت دەبێـت دیـلاوار لـە خـەو هەسـتێت. دەیویسـت تفەنگـەکان زرمـە و ناڵەیـان بێـت.

کـە سـێ وێنـەی پیـاوە نادیارەکە لە شـاردا بڵاوبـووەوە، ئیتر وەزیفەی ئێمە گـۆڕانی بەسـەردا هـات. ئـەو ڕۆژە سـەی ئەسـلان کۆبوونەوەیەکـی گـەورەی پێکردیـن، ئەمجـارە لـە بـری ماڵـە هاوینەکـەی خـۆی، هەمووومانـی بانگهێشـتی هۆڵـی کۆبوونـەوەکان کـرد لـە ناوەڕاسـتی شـاردا. ئـەو کات بۆقبۆقیلـە بـە ڕەسـمی بووبـوو بـە بەرپـرس و سـەرپەرشـتیاری ئێمـە. ئـەو لـە حەوشـی ماڵـی خۆیانـدا ڕیزیکردیـن و گووتـی «ئێمـە وەک تاقمێـک جەنـگاوەر کـە بڕوامـان بـە عەقیدەیـەک هەیـە، بـە ڕۆیشـتنێکی مەحکەمـی سـەربازیی، ڕیـز دوای ڕیـز و بـە نەزمـی سـوپایەکی ڕێکخـراو، لەسـەر ئـاوازی سـرودی «دیـلاوار ئـەی سـەر زەمینـی شـێران» دەبێـت بچینـە نـاو هۆڵـی کۆبوونەوەکـە». هـەرواش بـوو، زۆربـەی تیپـەکان بەوجـۆرە و بـە مارشـی سـەربازیی چووینـە نـاو

هۆڵەکە. کۆبوونەوەی ئەمجارە لە گردبوونەوەی هێزێکی ڕێکخراو دەچوو، خەڵکانێک کە یەک بڕوا و یەک ئامانج کۆیاندەکاتەوە. سەی ئەسڵان چ قسەیەکی تازەی پێ نەبوو، من لە کاتی قسەکانیدا ملم خستبووە ناو یەخەی کراسەکەم و دەمویست کەس سەرەنجم نەدات کە گوێ ناگرم. بە تیلەی چاو یەک یەک تەماشای باغەوانەکانم دەکرد، هەموو بە جۆرێک نوقمی گوێگرتن بوون، وەختەبووم خۆم بدەم بە فەوتان و قاقا پێبکەنم. سەیی دەستێک جلی سەربازیی کۆنی لەبەرکردبوو کە دەیگووت جلی جەنگاوەرانەی باوکی بووە، بە دەنگی بەرز هاواریدەکرد کە لە زەمانی باوباپیرانمانەوە تا ئەمڕۆ هەمان جل و هەمان فەرمان چاوەڕێماندەکات. بینینی سەی ئەسڵان لەو جلانەدا زۆر پێکەنیناوی بوو، دیاربوو باوکی لە خۆی کورتتر و بچکۆلەتر بووە، جلەکانی لە بەر ئەودا وەها تەسک و کورت بوون، دەترسام قۆپچەکانی بپەڕێت و بدات بە ناو چاوی کەسێکدا. ئەو سێ وێنەکەی بە دەستەوە گرتبوو و ڕایدەوەشاند و دەیگووت «ئەم تاوانبارانەم بۆ بدۆزنەوە... هیچ کەسێک جێمەهێڵن لەمانە بچێت، هەر کەسێک، هەر بەشەرێک لەمانە چوو، بیگرن و کارتان نەبێت... دێلاوار هیچ ڕۆژێک وەک ئەمڕۆ لە مەترسیدا نەبووە». من کە سەی ئەسڵانم لەو جۆش و خرۆشەدا دەبینی وەخت بوو دەمدایە قاقای پێکەنین. ڕاستی نەمدەزانی شتەکان چەند خەتەرن، گەر بمزانیایە چەند خەتەرن پێنەدەکەنیم. ڕۆژی دواتر ئیتر پێنەکەنیم، مەگەر شەوان درەنگ لە بەر خۆمەوە خەندەیەکم بگرتایە.

نا ... کەسمان لەو باوەڕەدا نەبووین بکەوینە ڕاوێکی وا بێوچانەوە. لە کەمپی شینواوە من دەمزانی بۆ شەڕی ڕاستەقینە پەروەردەماندەکەن، بەڵام لەوێ هیچ دیار نەبوو، دڵمان خۆشبوو کە تەنیا بۆ دۆخی تایبەتی و بۆ حاڵەتی مەترسی خۆمان ئامادەدەکەین، جەنگاوەرەکان لەگەڵ یەکدا دەیانگووت «شتەکە بۆ ڕۆژی تەنگانەیە، نە با جەنگ یەخەمان بگرێت، تا

گەر شتێک قەوما دەست و پێ سپی نەبین». نە من و نە هیچ جەنگاوەرێکی تری کەمپەکە چاوەڕێی جۆرە ڕۆژێکی لەو جۆرە نەبووین. دەمانزانی ئێمە بووینەتە جەنگاوەر، بەڵام بچین بۆ جەنگی ڕاستەقینە، نا... باوەڕمان بە شتی وەها نەدەکرد.

بۆ ڕۆژی دوایی کوڕی بەقاڵەکەی غەفاریی «بۆقبۆقیلە»، لە پاسێکدا هات بە دواماندا و یەکی سێ وێنەی داینێ و گووتی «ئەوە کابرای سەگبابی ناو خەونەکەیە، لە خوشک و دایکی بەم، با ئێمەش پیاوبین و بگەڕێین و بیدۆزینەوە، لە ئەژدادی بەرین». ئەوە هەمان ئەو وێنانەبوو کە دوێنێ سەی ئەسڵان بە توڕەییەوە ڕایدەوەشاند. هەموو بە گومانەوە سەیری وێنەکانمان کرد و لەوەدا ڕێکبووین کە وێنەکان لە کابرای ناو خەونەکانمان ناچێت. بەوەدا من ئەسڵەن خەونەکەم نەبینیبوو، ئەسڵەن نەمدەزانی ئەو کابرایە چ جۆرە دەعبا و دەعجانێکە، مکوڕ و بێترس گووتم «ڕاستتان دەوێت، ئەم ڕەسمانە لە فایەقی پورە شەمسەم دەچێت تا لەو کەسەی دێتە خەوی من». هەموو لاقرتێماندەکرد، تانە و توانجمان دەدا، پێدەکەنین، بە گاڵتە دەستمان بۆ ڕێبوار و خەڵکی سەر شۆستە و شەقامەکان درێژدەکرد، دەمانگووت «وەی وەی ئەوە چەند لەم وێنەیە دەچێت، بابیگرین»... شتەکان هەمووی لە گاڵتەوە دەستی پێکرد، لە پێکەنینەوە. تا بۆقبۆقیلە گووتی «گوێبگرن، وێنەکان ئەسڵەن گرنگ نین، وێنەکان بخەنە قوونتانەوە، من خۆم هەشت مانگی ڕەبەق لەسەر سنوورەکان بووم، هەشت مانگی ڕەبەق، دەزانم کێ لە دوژمن دەچێت و کێ لە دوژمن ناچێت. خۆم بینیومن...زۆریان دەناسمەوە. ئێستا دەچین بۆ باشوور، بۆ دێلاواری ڕەش، هیچ کەسێک ئەم ئێشە بە گاڵتە نەگرێت. سەیربکەن ئەمری هەموو شتێکمان پێیە، بۆمان هەیە ئەوەی گومانی لێدەکەین بیگرین و وەک قاز و قەلەموون سەرببڕین... ئەوەتا، ئەوە ئەمری سوپاسالاری دێلاوارە. بە ناموسی دایکم درۆ ناکەم، ئەوەتا ... بە مۆر

و ئیمزای خۆیەوە. لەمڕۆ بە دواوە کەس باڵندە نەکوژێت... ئیتر ئیشی باشترمان هەیە».

لە دوازدەی نیوەڕۆدا بە خۆمان و چەکەکانمانەوە لە دێلاواری ڕەش دابەزین، لە جێگایەک فولکەی غەوارەکانی پێدەڵێن. نزیکی دوو سەعات لە بەر خۆردا وەستاین، هەموو هەستمان بە گەرمایەکی زۆر دەکرد، بۆقبۆقیلە پەڕۆیەکی ڕەشی بەستبوو بە ناوچاوانییەوە، زریزەیەکی زیوی لە مەچەکییەوە ئالاندبوو، تیرئەندازێکی درێژ و یەدەک خڕی خستبووە سەر شانی، ئێمەش هەموو تفەنگی خۆمان پێ بوو، من تەنیا چاویلکە لە چاوی ناویان بووم کە هەتاوی نیوەڕۆ زۆر ئازاری چاوی دەدام.

فولکەی غەوارەکان شوێنێکی پیس و ناخۆشە کە چوار دەوری بە دوکانی تەنەکە و کەپری وردەواڵەفرۆش گیراوە، منداڵانی پێخاوس و گاوگۆلکی بەرەڵا و قاز و مریشکی ماڵە هەژاران بەردەوام بە شەقامەکەدا دێن و دەچن. زۆرینەی ئەو ئوتومبێلانەی ڕوو لەو فولکەیە دەکەن، پیکابی کۆنن کە باری کاڵەک یان شووتییە کوڵەیان پێیە و لە چوارڕێگاکەدا دەوەستن تا کڕیارێک پەیدا بکەن، ئەوەی منی تووڕەدەکرد زۆری باڵندە پیرەکان بوو کە دەمبینی بەسەر ئاسمانی فولکەکەدا بە خاوی و ماندوێتی دەفڕین، یان ئەو سەگە گەڕۆلانەی دیاربوو منداڵان شەکەت و زامداریان کردوون . نزیکی دوو کاتژمێر لەوێدا وەستاین، مێش و مەگەز بە جۆرێک زۆربوون، من هەستمدەکرد گەر ڕۆژێکی تەواو لەوێدابم چاوم لە گلێنە دەردەهێنن. هەوا وەها سەنگین بوو، هەموو هەستماندەکرد دەبێت شتێک بکەین تا کەمێک ژیانی ئەم جێگە مەنگە بجوڵێت، هەموو ئەو گەڕەکە لە گێژییەکی سەیردا دەژیا ... دوای سەعاتێک خەڵکی زانیان کە دەبێت لێمان بترسن، وورده ورده دەستمانکرد بە وەستاندنی خەڵک و پشکنینی شوناسنامەکانیان، بۆقبۆقیلە خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێکی دەکرد،

خەڵکی زۆر بەمجۆرە پرس و ڕاگرتنە ڕانەهاتبوون، هەموو بە گومان و تورەییەوە سەیریاندەکردین. بۆقبۆقیلە گووتی «ئەم باوەحیزانە لیمان ناترسن بابچینە ژووری». هێدی هێدی خۆمان و پاسەکەمان فولکەی غەوارەکانمان بەرەو ناو کۆڵانەکان بەجێهێشت.

ناو کۆڵانەکانی دیلاواری ڕەش هەر تەسک و تاریک نین، بەڵکو مەخلوقات و خەڵکێکی تێدان پێدەچێت لە ڕۆژێکەوە هاتوون ئیدی ئەو کوچانەیان جێنەهێشتبێت، مۆن و تورە، وەک غەزەبی خودا سەیری ئێمەیان دەکرد... هەموو لە گوماندا بووین، هەمووچاوەڕوانی شتێک بووین. من وەک ڕۆژانی پێشووتر هەڵگرتنی تفەنگەکە ئەزیتی دەدام، هێشتا هەر چاوم لە ئاسمان بوو بۆ سەیری باڵندەکان، گەر باڵندەی ناوازەم بدیبایە دەمویست تەقەی لێبکەم. بەلام بۆقبۆقیلە دەیگووت ئەمرۆ تەقەکردن لە باڵندەکان قەدەغەیە، دەبێت خەڵک بزانن بە دوای کەسێکدا دەگەڕێین.

بۆقبۆقیلە ڕقی لە خەڵکی ئەم گەڕەکانە بوو، دەیگووت «بێئەسڵ و فەسڵن» «کەس نازانێت چین» «دز و چەتە و گیرفانبڕن» «فەسادی دیلاوار هەموو لێرەوە دێت» «ژنە ساغەکەیان بە ڕوپییەکی کۆن دایدەکەنێت» «ئەسڵەن زمانی ئێمە باش نازانن» . کە ئەو شتێکی بگووتبایە نەدەبوو ئێمە هیچ بڵێین، گەر بمانگووتایە «بۆ؟ چۆن؟» یان «وانییە؟». دەیگووت «ئەدەبسز کەی فێری زەبت و ڕەبتی نیزامی دەبیت؟». لە پشووەکاندا پەڕۆکەی ناوچاوانی دەکردەوە و دەیگووت «خوا شوکور، بەس نییە ئێمە خەڵکی گەڕەکی غەفارییین، گەر لێرە لەدایکبووینایە چیمان بکردایە، ئەمە کەی شوێنە... ئەم پیس و چەپەلانە کەی بەشەرن، بە دەست من بێت هەموو ئەم ناوە دەسووتێنم». عادەتی بوو زۆربەی کات یان پەڕۆیەکی بە ناوچاوانییەوە دەبەست یان کلاوێکی مەکسیکی زلی دەکردە سەری، هەر کات پەڕۆکەی لابردایە یان کلاوەکەی بەرزبکردایەتەوە دەتزانی بۆ ناویان

ناوە بۆقبۆقیلە، لووتێکی سووری زلی هەبوو، چەناگەیەکی کورت، دەمێکی تەپیو، جووتێک چاوی زەق و ناوچاوانێکی دەرپۆقیو. ناو دەمی دوو ڕیز ددانی وەها مەحکەمی تێدابوو، دەیتوانی گۆشتی گا بە ساغی وەک بنێشت بجوێت. من لە هیچ شتێکدا بەغیلیم پێ نەدەبرد، لەو کەڵبە تیژانەیدا نەبێت کە خۆی زوو زوو پیشانیدەداین و دەیگووت «دامناوە کە شەڕ هەڵگیرسا، قوڕقوڕاگەی دوو سێیەکی پێهەڵدڕم».

لە ناو کۆڵانەکاندا هەستمکرد بۆقبۆقیلەش دوودڵ و نائارام بوو، نەیدەزانی چی بکات، نەیدەویست ڕۆژی یەکەمی خزمەتی ڕاستەقینەی لە سوپای باغەوانەکاندا وەها پوچ بێت، حەزیدەکرد شتێک بکات سەرەنجی سەی ئەسڵان و ئێمە و هەموو خەڵکی ڕابکێشێت. من زۆر سەیرمدەکرد، دەمویست تێبگەم بیر لە چی دەکاتەوە، کە هەستیدەکرد من سەیریدەکەم ڕووم دەکرد بەولاوە، بەڵام خۆی وریا و بەخەبەر بوو، هەموو جارێک مچی دەگرتم و دەیگووت «هێی، ئەوە سەیری چی دەکەیت». هەمیشە وابوو، من هیچم نەدەگووت و ئەویش هیچی تری نەدەگووت. هەستمکرد تا زیاتر بچینە ناوەوە، ئەو هەست بە ترس و خنکان دەکات، مێشەکانی فولکەکە هەر بەدوامانەوە بوون، تا دەهات زیادیشیان دەکرد، لە هەندێ جێگادا مامر و جوجکی بەرماڵان وەها زۆربوون، نەماندەتوانی بڕۆین، بۆقبۆقیلە و کوڕەکان بە توڕەییەوە شەقیان لە هەر مامر و مراوییەک هەڵدەدا، بهاتبایەتە بەر قاچیان. لە کوچەیەکدا بۆقبۆقیلە لە خۆیەوە بەسەریدا هات و پیاوێکی ڕەشتاڵەی باریک و موو کورتی گرت، کە سەری تۆزێک لەسەری پیاوی ناو وێنەکە دەچوو. پیاوەکە ترسێکی کتوپڕ گرتی، نەیدەزانی ئێمە چیین و کێین، تفەنگەکانی شانمان و نیگاکانمان دوودڵیانکردبوو. چەند جار پرسی «ئێوە چیین؟ ئێوە کێن؟». کەسمان نەماندەویست وەڵامی بدەینەوە، خۆشمان نەماندەزانی ئێمە کێین، بەڵام کابرا بێدەنگ نەدەبوو، دەیپرسی و کۆتایی نەدەهێنا، تا بۆقبۆقیلە بە هەموو هێزی خۆی، مشتێکی

توندی کێشا بە دەمیدا. پیاوەکە کەمێک گێژبوو، تاڵێکی باریکی خوێن بە لای لێویدا هاتە خوار، ترسێکی زۆر پەڕییە چاوی، ڕەنگی وەها پەڕی دەتگووت ڕەنگی مردوانە... بۆقبۆقیلە، بەکرە درێژی بانگکرد کە کردبووی بە هاوکاری دەستە ڕاستی خۆی و وێنەکەی دایە دەستی و گووتی «جوان سەیریبکە، لە وێنەکە ناچێت؟». بەکر لە هەموومان لۆقن و باریکتر بوو، لووتێکی منگنی درێژی هەبوو، یەکەمین درۆزنی سەر زەوی بوو، هەزار سوێندی دەخوارد تا درۆیەکی مفتی خۆیت بە سەردا ساغبکاتەوە، ئەو بە درۆ گووتی «بەڵێ لە خۆی دەچێت... هەر عەینەن خۆی، بە موو جیاوازییان نییە». دوای ئەوە یەکەیەکە هەموومانی بانگکرد و پرسی «لە خۆی دەچێت یان لە خۆی ناچێت؟». هەموو سەرمان لەقاند و گووتمان «بەڵێ لە خۆی دەچێت». منیش سەرم لەقاند و بە ساردی و دوودڵییەوە گووتم «ئا ... وایە، تۆزێک لە وێنەکە دەچێت». گەرچی درۆمدەکرد، بەڵام بوێری ئەوەم نەبوو دژی هەمووان بوەستمەوە، من دوودڵ بووم، بەڵام دەمویست زوو ئیشەکەمان تەواو بێت و بگەڕێینەوە بۆماڵەوە ... نەمدەویست شتێک بکەم ببمە لاقرتی و گاڵتەجاڕی کوڕەکان. بە فەرمانی بۆقبۆقیلە گەمارۆی پیاوەکەمان دا و دەستمان بەست و دەممان بەست و خستمانە ناو پاسەکەوە . ئەوە یەکەمین کەس بوو، بیگرین، یەکەمین دەستکەوتی بچوکی تیپەکەی ئێمە بوو. کە پیاوەکەیان خستە ناو پاسەکەوە، ئیتر دڵنیابووم دەگەڕێینەوە بۆ ماڵێ، دەچینەوە بۆ لای دایکمان، من خۆش حاڵ بووم کە بە گرتنی ئەو پیاوە، هەموو هەستیانکرد ڕۆژێکی گرنگ و پڕکاریان تەیکردوە. گەر کەسمان نەگرتبایە نائومێدی دەیکوشتین، هەموو هەستمانکرد گرتنی یەکێک چ سەرگەرمییەکی زۆری تێدایە، چۆن دەتوانێت ڕۆژەکەمان پڕ مانا و ئیشەکەمان خۆشبکات... لە ناکاو هەستێکی قووڵی ئاسوودەیی و سوودبەخشی کەوتە سەر ڕوخساری هەموو جەنگاوەرەکان. هەموو ئاسوودەبووین... کامەرانییەکی نهێنی کەوتبووە سەر ڕوومان.

دەمانزانی شتێکی گرنگمان کردوە، شتێکمان کردوە کە دوێنێ نەماندەتوانی بیکەین... یەکەمجار بوو هەستمان بە بوونی ڕاستەقینەی خۆمان دەکرد، خۆمان دەناسی ... «باغەوانەکانی دێلاوار».

بۆقبۆقیلە دوای دە دەقیقە فەرمانیدا بگەڕێینەوە، هەموو خێرا سوار پاسەکە بووین و خۆشحاڵ بووین کە یەکەم ڕۆژمان تێپەڕاندوە. بەڵێ باغەوانەکانی دێلاوار وەها دروستبوو. من ئەو کاتیش هەر حەزمدەکرد بگەڕێمەوە بۆ ڕۆژانی ڕابوردوو و نیشانە لە باڵندەکان بگرم، بەڵام چیتر جەنگ دەستی پێکردبوو... لە جەنگیشدا مرۆڤ دەبێت تەنیا نیشانە لە مرۆڤ بگرێتەوە.

# ٢٧

گەرچی من لەوانە نیم عاشقی هیچ جێگایەک بم، بەڵام شکۆی ئەو شوێنە، ئەو تیشکە تایبەتیانەی لە هیچ شوێنێکی تردا نایبینم. ئەو ستوونە گەورە و ئەستوورانەی بنمیچە نەخشدارەکانی ڕاگرتووە، ئەو کاشییە ڕەش و سپییانەی شکۆیەکی کلاسیکیان بە هەموو جێگاکە بەخشیوە ... پێکڕا، گێژمدەکەن. شەبەنگی جوانییەک دەبینم، کە نازانم سەر بە چ سەردەمێکە، دەمەوێت تەنیا بوەستم و لەزەت لەم گێژییە ببینم. دەنگی مۆسیقایەکی ئارام لە جێگایەکەوە دێت، مۆسیقایەک پێشتر گوێم لێ نەبووە، بەڵام ئێجگار هێمن و ئاسوودەبەخشە، بە جۆرێک خواستی ملکەچییەکی قووڵم تێدا دروستدەکات. دەزانم لێرەدا پیاوێک هەیە کتێبەکان دەبات بیانخاتە بەر ڕوناکی، بیانخاتە بەردەم با تا نەخنکێن. پێ دەنێمە ناو نیشتەجێکەی ئەو، خۆی بەرەو پیرم دێت، دەزانێت ئەمجارە زۆر ورد لە هەر شتێکم ڕوانیوە، دەزانێت تووشی شۆکێکی نهێنی بووم، دەزانێت ئەو مۆسیقایە لاوازتریکردوم. دەزانم لە ناخی دڵدا وەک گەنجێکی ساویلکە و گیرۆدە دەمبینێت کە دڵ و دەروونێکی خراپم نییە، بەڵام دەزانێت ناتوانێت ڕزگارمبکات. دەیەوێت ئەو چاوەڕوانییە لە مندا دروست نەبێت، وەک فریادڕەس سەیریبکەم... بەڵکو تەنیا پیرێکە لە ناو مۆزەخانەیەکدا... پیرێکە دەزانێت دیلاوار لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێت. بە کتێبەکەی دەستییەوە کە وەک هەمیشە بە سنگەوە گرتویتی، بە

دەنگی بەرز پێمدەڵێت «فەرموو ... فەرموو. دەبینیت، دەبینیت. من سێ ڕۆژە چاوەڕوانی تۆم. بڕوانە دونیا چۆنە، ئێستا من دوو جۆر ژیان دەبەمەڕێوە، ژیانی شەوم شتێکە و ژیانی ڕۆژم شتێکی تر، کێ دەیگووت بەهنامی پیر وای بەسەردێت». من هەستدەکەم پرۆفیسۆر دەزانێت من چ سەرگەردانم، دەزانێت بێهێز و لاوازم، سەردادەنەوێنم و وەک قەرزدارێک بە دەنگێکی کز دەڵێم «جەنابی پرۆفیسۆر، هاتووم پێتان بڵێم، کەسێکم بدەنێ لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ئەو جێگایەی کاری لێ دەکەم تا بیکەم بە هاوکاری خۆم... چەند ڕۆژە بیردەکەمەوە، من هیچ جێگا و ڕێگایەکم نییە، تەنیا ئەو ڕێگایە شک دەبەم بتوانم کۆمەک بە قوربانییەکان بکەم، کەسێک لەگەڵ خۆمدا و لە شوێن کارەکەمدا حەشاربدەم، هەر ئەوەم بۆ دەکرێت». پرۆفیسۆر دەڵێت «هەڵهاتووەکان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبن... تۆ نایانبینیت، هەستیان پێ ناکەیت؟». مۆسیقا هێمنەکە زۆر کارم تێدەکات، دەمەوێت بێدەنگبم و گوێبگرم، بەڵام دەزانم کاری وا بێشەرمییە، دەزانم پرۆفیسۆر مۆسیقاکە وەک ئاهەنگێک دەبینێت کە ڕۆحی مۆزەکە پەخشیدەکاتەوە، وەک نەغمەیەکی نهێنی کە لە کوێی ئەم تەلارەوە هەڵدەستێت. من بە ناچاریی دەڵێم «جەنابی پرۆفیسۆر ڕۆژانە خەڵکی نوێ دێن بۆ شێتخانەکەمان، ڕۆژانە دیلاوار ماندووتر دەبێت». من دەمەوێت زۆر لەگەڵ پرۆفیسۆر دابنیشم، هەستدەکەم پرسیارم زۆرە، پرۆفیسۆر لەو کەسانەیە کە سەیری چاوت دەکات، دەزانێت چ نیازێکت هەیە. دەڵێت «تۆ ئێستا دەبێت هەموو هێزی خۆت بخەیتە سەر ئەوەی کەسێک ڕزگاربکەیت. ڕزگارکردنی ئینسانێک ئاسان نییە، شەو وەرە بۆ مەیدانی ماسی فرۆشان. من دێم و لەوێ کەسێکت دەدەمێ کە چەکدارەکان بە دوایدا دەگەڕێن. دەبێت زۆر ئاگات لێی بێت... ئەوە ئەمانەتی ئێمەیە لە گەردنی تۆدا».

پرۆفیسۆر نایەوێت کات زۆر بە فیڕۆبدات. نایەوێت زۆر لە من نزیک ببێتەوە، نایەوێت لەوە زۆرتر بیناسم و بمناسێت. ئەمجارە بە ڕۆشنی

دەبینم کە شکۆی خۆی و شکۆی مۆزەخانەکە یەک شتن. هەستدەکەم سەرسامیم بە مۆزەخانەکە، سەرسامیم بەم کتێبخانە گەورەیە، سەرسامیم بەو دەیان هەزار کتێبەی کە کەس نایانخوێنێتەوە، سەرسامیم بە ئەندازە و ئەفسونی ئەم تەلارە بێوێنەیە، بەم جوانییە نهێنییەی لەم شوێنەدا هەیە، تەنیا درێژکراوەی سەرسامیمە بەم پیاوە بچکۆلەیە کە سەیرمدەکات و بە چاو پێمدەڵێت «ئێستا تۆ هەموو شتێک دەزانیت.. هەموو شتێک». نیگاکانی پڕن لە بێباکی یەکێک لە ڕاستییە گەورەکان تێگەیشتووە، وەک ئەوەیە بە چاو یەکجار و بۆ هەتا هەتایە دەرمبکات، وەک ئەوەی بڵێ بڕۆ بە ناو دۆزەخدا سەفەربکە و بسووتێ و وەرەوە. من هەست بە بەتاڵی و ترس دەکەم، هەست بە بێمانایی دەکەم. نامەوێت بە پرۆفیسۆر بڵێم «هەست بە گوناهـ دەکەم»، بەڵام هەست بە گوناهـ دەکەم، نە لە بەرئەوەی کە نیگارکێشەکانم دۆزییەوە، بەڵکو لە بەرئەوەی لە نهێنی لاوازی خۆم تێناگەم، هەموو شتێک دەمبات و منیش جگە لەوەی لەگەڵیدا بڕۆم چارەی ترم نییە. من خۆم لە بەردەم یەک ڕێگادا دەبینم، یەک ڕێگا و هیچی تر... هەست بە گوناهـ دەکەم، چونکە دڵنیام دەبێت بەو تەنیا ڕێگایەدا بڕۆم.

پرۆفیسۆر دەزانێت، من هەرچییەک دەکەم لە ترسنۆکیمەوە دەیکەم، دەزانێت وەک هەموو خەڵکی تر جگە لە باوەشی بنەماڵەکەم جێگایەکی ترم نییە خۆمی تێدا بشارمەوە، دەزانێت ڕقم لە خێزانەکەمە، ئاسان ئەوە لە چاو و هەناسە و دەنگمدا دەخوێنێتەوە، دەزانێت من حەرفێکم لە چیرۆکی دانیال بۆ مامە سیام نەگێڕاوەتەوە، چونکە دەزانم تێی ناگات، دەزانم لووتبەرزییەکی زانستی تێدایە گاڵتەی بەو چیرۆکە بێت، نامەوێت بە من و پرۆفیسۆر و دانیال و مێژوو پێبکەنێت. بەڵام پرۆفیسۆر دەشزانێت کە من ناتوانم جگە لە ملکەچی و ملکەچی زیاتر هیچی تر پێشکەش بە دونیا بکەم ... دەزانێت لەگەڵ هەموو ئەو ترسنۆکییەشدا، هیوایەکی بچوکم تێدایە، دەتوانم یەکێک ڕزگاربکەم. هەتا مرۆڤی ترسنۆک و کۆیلەش دەتوانێت

مرۆڤێک ڕزگاربکات ... ڕەنگە پرۆفیسۆر وا بیری لێ کردبێتەوە، ڕەنگە ئەوە بە دوا هیوا بزانێت بۆ من، یان بۆ دیلاوار، یان بۆ تەواوی ئادەمیزادانی دونیا. دڵنیایە من قارەمان نیم، دەزانێت بەشی هەرە زۆری خەڵک قارەمان نین، بە جۆرێک سەیرمدەکات وەک بڵێت «غەم مەخۆ، دیلاوار قارەمانی تێدا نییە، تا تۆ قارەمان بیت». من کە سەیری ئەم تەلارە گەورەیە دەکەم، سەیری ئەو مێژووە گەورەیە دەکەم کە پاراستویەتی، سەیری ئەو جەستە پیرەی دەکەم، بیری ئەو شەوە دەکەمەوە کە لەو ژوورە زەرد و سارد و تەماوییەدا بینیم، دەزانم قارەمانە... دەزانم دەکرێت مرۆڤ قارەمان بێت، بەڵام من نا... من لە جنسی ئەوانەم کە ملکەچن، ئەو ملکەچانەی کۆیلەیەتی و بێدەنگییان ڕزگاریان ناکات، بەڵام لە قووڵایی ناخمدا دڵنیام کە کۆیلەکان چارەنوسێکی باشتریان لەوانە نییە کە ڕاستەوخۆ لە ڕێگای سەرکێشییەکی شێتانەوە ڕووبەڕووی بەدبەختی خۆیان دەبنەوە. بەڵێ کۆیلەکان لە قارەمانەکان تراژیدیترن، غەمگینترن، زۆرجار ڕەسەنتریشن ... منیش ڕێنواری زەریاواری، مستەر گرینۆک، گەورەترین بەڵگەی ئەو ڕاستییە بووم. ئەسڵی مرۆڤ دەچێتەوە سەر کۆیلەکان، نەوەک سەر قارەمانەکان. یانی من، ژیانی ڕێنواری زەریاواری... شاهیدە.

***

بازاڕی ماسی فرۆشەکان لە شەودا، لە بەشی شارێکی چۆڵکراو و خاپوور دەچێت، بۆنی وێرانەی لێ دێت، بۆنی جێگایەک کە شەو تەنیا تارماییەکان پیا دەگەڕێن. مەسەلەکە تەنیا تارمایی ئەو ماسیفرۆشە خنکاوانە نییە کە خەڵکانێک بە شەو دەیانبینن و دەگەڕێنەوە بۆ ئێرە، بەڵکو ئەو هەموو کوچە تاریک و پڕ نهێنییە کە هەر هەموویان دەمیان ژەنیوەتەوە ئەم گۆڕەپانە ... ئەوە دەمترسێنێت. سەیری چواردەوری مەیدانە خاڵییەکە دەکەم و نازانم دەمی چەند کوچە بەسەر ئەم گۆڕەپانەدا کراوەتەوە،

ئەژماردنی ئەستەمە. من بۆنی ماسی ڕزیو دەکەم، هەستدەکەم تەواوی زەوی گۆڕەپانەکە پولەکە گرتویتی، هەستدەکەم بەسەر جەستەی ماسییەکی گەورەدا دەڕۆم. بەڵام ئەوەی خەریکە دەمخنکێنێت بۆنی لیخنی گۆمێکە کە هەستدەکەم یەکێک ماسی ڕزیوی لێ دەردەهێنێت. من تارمایی هەندێ کەس دەبینم بە تۆڕی گەورەوە، تۆڕێک دەتوانێت هەموو مەیدانەکە داپۆشێت، لە کوچەیەکەوە دێن و لە کوچەیەکی دیدا ونده‌بن، من هێز دەدەمە بەر خۆم تا نەترسم و هەڵنەیەم... هەموو خەڵکی دێلاوار دەزانن کە تارماییەکانی شەو لە مەیدانی ماسی فرۆشاندا ترسناک نین. بەڵام کەم کەس بە شەو دەوێرێت بێتە ئەم مەیدانە، هەتا پۆلیسەکان لە تارمایی و بۆن و ورتە ورتە نهێنییەکانی ئەم جێگایە دەترسن. مەیدانەکە بە شەو پڕە لە دەنگی نهێنی، دەنگەکان جارێک لە خوڕەی ئاو و جارێک لە چرپەی مردویەک دەچن، چرپەیەک بانگی کەسێکی نادیاربکات. من پشیلەکان دەبینم بە هێمنی و ترس و دوودڵییەوە گۆڕەپانەکە دەبڕن، گەرچی بەرمیلە گەورەکانی زبڵ، پڕن لە ئێسک و ناوزگ و پێستی ماسی ڕزیو، بەڵام پشیلەکان نزیک ناکەونەوە، وەک لە شتێک بترسن یان گومان لەم شوێنە بکەن. یەکێک هەیە دەڵێت ماسییەکان هیچ کات خەون نابینن، بەڵام هەموو ئەم مەیدانە فەزای خەونێکی سامناکی هەیە. من هەستدەکەم خەون دەبینم، هەستدەکەم لەسەرمدا شتێک شکاوە... ئایا لە ناوەڕاستی خەوندام و ئەم مەیدانە دەبینم، یان لە ناوەڕاستی ئەم مەیدانەدام و خەون دەبینم... بەجۆرێک گێژ و مەست و بێچارەم کە لە چاو تروکانێکدا تێدەگەم لە دێلاوار چی دەگوزەرێت. ئەمە لەو جێگایانەیە کە مرۆڤ هیچ کات بەرچاوی ڕوون نابێتەوە، تەمێکی هەمیشە نیشتوو لەسەر شتەکانە، هێندەی دەتەوێت ڕوون ببینیت، سپێتییەک وەک سپیبوونی دیدەی نابیناکان بەرچاوت دەگرێت، لەسەر عەرەبانەی ماسی فرۆشەکان کە ئەڵقاوئەڵق بە دەوری مەیدانەکەدا دانراون، کۆمەڵێک باڵندەی بچوک دەبینم کە هەموو لە پەلەوەری خەستەی ژێر باران دەچن،

پێدەچێت هێندە ماسی ڕزیویان خواردبێت پێکڕا نەخۆشبن، هەر شتێکی نامۆ لەمەیدانەکەدا دەربکەوێت ئەوان بە خاوی و سەنگینی و پێکەوە ملیان بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەجوڵێنن... هەندێ جار هەموو سەیری من دەکەن کە لەوەتەی گەیشتوومەتە ئەم مەیدانە لە جێگایەکدا وەستاوم و ترسێکی نادیار دایگرتووم. ناتوانم بزانم چەندەیە لێرەم، هەستم بە تێپەڕینی کات نەماوە، کات وەک زەمانی ناو خەون دەڕوات، هەستدەکەم پێوانەکردنی ئەستەمە. من چەندەیە لەوێم، چەندەیە وەستاوم نازانم. بەڵام لە ناکاو پرۆفیسۆر لەسەری کوچەیەکدا دەردەکەوێت، چاودەکەمەوە و واهەستدەکەم ئەو لە مێژە لەوێیە و سەیرمدەکات، لە بەیانی زیتەڵ و سەرزیندووتر دیارە، کتێبێک و جانتایەکی بچوکی شانی پێیە، وەک ئەوەیە لە جێگایەکی دوورەوە هاتبێت. ئێستا دەزانێت من دەیبینم، دەزانێت وڕی و گێژی مەیدانەکە خەریکە بەرمدەدات، بە هێمنی بەرەو ڕووم دێت. هەنگاوەکانی بە جۆرێک خاو و لەسەرەخۆن، من وادەزانم دەمرم و ئەو ناگاتە لام، وادەزانم تا دێت لێم دووردەکەوێتەوە، بەڵام زۆرنابات کە دێتە بەردەمم، دەرکەوتنی لە نزیکمەوە کتوپڕ و ترسناکە، وەک ئەوەی لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا ونبووبێت و لە ناکاو لە بەردەمی مندا دەرکەوتبێتەوە، نیگام پڕە لە ترس. پرۆفیسۆر دەزانێت، ئەم ترسە ترسی ئێستا نییە، ترسی ئەم مەیدانە نییە، ترسی ئەم ساتە وەختە تەماوییەی ناو ئەم مەیدانە نییە، بەڵکو ترسێکی کۆنە، ترسێکی قووڵە، لە بنی دڵدایە و دەرنایەت. پرۆفیسۆر دەڵێت «مەیدانی ماسیفرۆشەکان لە بناغەی دروستبوونی دیلاوارەوە هەیە، مێژوونوسان دەڵێن بەر لە دیلاواریش دەمێک تەنیا زیندانێک لێرە بووە مەیدانەکە بوونی هەبووە، بەڵێ ماسیفرۆشەکان لە کۆنەوە لێرەدا ماسیان فرۆشتووە». دەستم بە دەستی پرۆفیسۆرەوەیە، هەستدەکەم بازووم بە نەرمی دەگوشێت تا ناچارمبکات بڕۆم... من خۆشحاڵم کە دەستی ئەو ڕێنماییمدەکات، ئێستا دەتوانم چاو لێکبنێم و بڕۆم، ئەم جێگایە لە هۆشی خۆم بتارێنم و دەرچم. هەستدەکەم

پرۆفیسۆر هەر قسەدەکات، بەلام ئەمجارە تێناگەم دەڵێت چی، وشەکان پچڕ پچڕ دەگەنە گوێم، وەک هێڵێکی تەلەفون بپچرێت و بێتەوە... بپچرێت و بێتەوە. پرۆفیسۆر ئاگای لەوە نییە کە من چاوم لێکناوە و دەڕۆم، دەڵێت «بڕۆ ... بڕۆ... ئێرە ... شوێنە ... لە قەدیمەوە ... نهێنی ... نهێنی ... بەڵێ... کەسێکی بووبێت ... ئەمینە... گومانی لەسەر». بە کوچەیەکی درێژدا دەڕۆین، کوچەیەکی زۆر درێژ، لە جێگایەکدا هەستدەکەم دەبێت چاوم بکەمەوە، گوێم لە دەنگی ترە، تا ئەو کاتە پرۆفیسۆر وەک کوێر ڕامدەکێشێت. دەمەوێت بزانێت کە من دەترسم، لە تاریکی دەترسم، لە تەلیسم دەترسم، لە شوێنی پڕ نهێنی دەترسم، لە ڕوخساری ئاڵۆزی مرۆڤ لە شەودا، لە دەنگی بوونەوەرگەلێک کە نابینرێن، لە دەنگی پێ، لە بوونی دەنگی نامۆ، لە نەبوونی دەنگ، لە خودی بێدەنگی، لە خودی هاوار کە دەیبیستم و دڵنیانیم لەوەی کە هەیە. پرۆفیسۆر وەک لە خەو بە ئاگام بهێنێتەوە ڕامدەوەشێنێت، من ماوەیەکم دەوێت تا دەوێرم چاوبکەمەوە. پرۆفیسۆر دەڵێت «خۆت مەبوورێنەوە، چاوت بکەرەوە، منداڵ بازاڕی دەرمەهێنە، ئەمە ئەو کەسەیە کە دەبێت بیپارێزێت، لەم ساتەوە ژیانی کەسێک لە ملتە، بەرپرسیارێتی ڕۆحێک». ساتێکی قورسە بۆ من، تا ئەو ساتەوەختە خۆم بە هەرزەکارێک دەزانی کە دەتوانم بێ هیچ بەرپرسیارێتییەک بەرامبەر هیچ بوونەوەرێک بژیم. خۆشحاڵ بووم کە ئازادم و کەس لە گەردنمدا نییە، ئێستا لە ناکاو، لەم شەوەدا، لەم کوچەیەدا، لە جێگایەکدا کە هێشتا کەپووم پڕێتی لە بۆنی ماسی ڕزیو، کە سەرم لە جۆرە تەمێکی نا دیاردا نوقمە، دەبێت ببم بە کەسێک کە باری ژیانی مرۆڤێک دەکەوێتە ملی. گوێم لێیە پرۆفیسۆر دەڵێت «لە سەردەمێکی ئاساییدا ناژین، گەر لە سەردەمێکی ئاساییدا بووینایە کێشەمان چی بوو؟ بەم شەوە لە ماڵی خۆماندا بووین... بەلام ئێستا لە دۆخێکی نائاساییداین». دەنگی دکتۆر لە دەنگی پیاوێک دەچێت لە پاڵ ڕووبارێکی خوڕدا قسەبکات، ژاوەژاوەکانی ناو سەری من وەک هاژەی

چەمێکی گەورەن. سەیری ئاسمان دەکەم نە ئەستێرەی تێدایە، نە مانگ، نە تیشک... دڵنیا نیم لەوەی ئاسمان هەیە، ئەوە یەکەمجارە گومان لە بوونی ئاسمان دەکەم، گومانەکەم وەک گومانی کەسێکە بە ڕێگادا بڕوات و لە ناکاو هەستبکات زەوی ونکردوە، وەک هەستی کەسێکە وایزانیبێت کڵاوێکی لەسەردایە و بەڵام لە ناکاو دەبینیت، نا هەر هیچ شتێک بە سەرییەوە نییە. پرۆفیسۆر دەڵێت « زەریاواری، گوێبگرە ئەمە زەهاو سۆفی عەبدییە. هەندێ بە زەهۆ بانگیدەکەن، خۆی چیرۆکی خۆیت بۆ دەگێڕێتەوە، هەوڵبدە جوان بیپارێزیت... خۆشی ئاگای لە خۆی دەبێت، بۆ هەر جێگایەک چوویت بیبە لەگەڵ خۆت، هونەری خۆت بەکاربهێنە زیندوو و سەلامەت بمێنێتەوە». لە تاریکی کوچەکەدا تارمایی پیاوێکی گەنج و باریک هاتەپێشێ، نەمتوانی شێوە و روخساری بە ڕوونی ببینم... نەمزانی کێیە و لە کێ دەچێت، بەڵام بۆنی غەمگینییەکی قووڵم کرد کە دڵنیابووم غەمگینی شەو نییە، غەمگینی ئەم کوچەیە نییە، بەڵکو غەمگینی مرۆڤە. بۆنی غەمەکانی وەها بەهێز و توندبوو، بۆنی گوڵێکی دڕ چۆن پەلاماری مرۆڤ دەدات، ئاوا پەلاماری دام. بۆنێک بوو گەرچی دڕ و دڵشکێن بوو، بەڵام ڕایدەکێشایت... لێواری خەرەند، چۆن مرۆڤ بۆ مردن بانگهێشتدەکات، بۆنی ئەم گەنجە بەرەو خۆی دەیکێشام. بۆنی شتێکی سەیری لێدەهات، بۆنی شێیەکی زۆر، بۆنی بارانێک کە دەزانم نەباریوە. لە تاریکی کوچەکەدا ئەو دەستی من دەگرێت و دەمبات، چاو دەکەمەوە و بۆ یەکەمجار بە ڕوونی هەموو شتێک دەبینم، وەک ئەوەی ڕۆشناییەکی نهێنی لە دیدەمدا جیهانی بۆ ڕۆشنکردبێتمەوە. پرۆفیسۆر دەبینم کە بە غەمگینی سەیرماندەکات، زەهاو دەبینم کە دەستی منی گرتووە و دەڕوات، بە ڕۆشنی سێ پشیلەی ڕەش دەبینم کە لە قووڵایی تاریکیدا لە تەنیشتمانەوە دەڕۆن... شەو چیتر ترسناک نییە... شەو، شەوێکی ئاساییە ... شەوێکە دەتوانین بە دیدەی خۆمان ببینین و ڕوناکی بکەینەوە.

# ٢٨

ئەوەتەی دکتۆر جاهدار هاتووە، ئیش لە سەنتەرەکەدا لە سەرەتا زۆرترە. لە پشتی سەنتەرەکەوە زەوییەکی بەرین و فراوان هەیە، ڕۆژانە دەبێت نەخۆشەکان بە نۆبەت ئیشی تێدا بکەن. بردنی نەخۆشەکان بۆ ئیش تەنیا پەیوەندی بە تێگەیشتنی مامە سیا و دکتۆر جاهدارەوە نییە بۆ چارەسەریی دەروونی، بەڵکو گرێدراوی سیاسەتی مەحمود قەرەقازانیشە کە لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی تردا کاریان ئەوەیە خەڵکی دێلاوار بگۆڕن، بۆ کەسانێکی ئامادە و تەیار بۆ جەنگ. هەموو کەس ئێستا دەیزانی کە دەبێت دەستەیەک لە بیمارەکان ببرێن بۆ کامپێکی کار لە باکوور، بۆ ناوچە شاخاوییەکانی سەر سنوور. بەڵام نە ئامادەگی کرابوو، نە کاتی سەفەرەکە دیاربوو، نە ناوی ئەوانەی دەبوو لە بەتالیۆنەکەدا بن ئاشکرابوو. من هەر زوو ڕەزامەندی خۆمم بە مامە سیام ڕاگەیاند، مامم مەبەستی بوو من کەمێک لە سەنتەرەکە دووربخاتەوە و منیش مەبەستم بوو لەگەڵ زەهاو بچم بۆ ناو چیاکان و لەوێ خۆمان ونبکەین. بۆ من هەم سەرگەرمی و هەم سەرکێشی و هەم خۆونکردنیش بوو، سەرەتا دەترسام زۆر زوو شتەکان بەڕێوەبچن و نەتوانم زەهاو لەگەڵ خۆم ببەم، بەڵام لە ڕاستیدا زۆربەی شتەکان لە دێلاوار بە خاوی دەڕۆن، عەشق بە خاوی دێت، کینەش بە خاوی دەڕوات، جەنگ بە خاوی هەڵدەگیرسێت و ئاشتیش بە

خاوی دەچەسپێت، شێتی بە خاوی دەردەکەوێت و عاقڵیش لەو خاوتر دەگەڕێتەوە. ئەو خاوییە هەندێ جار باشە و هەندێ جار ترسناک.

لەو ماوەیەدا من زەهاو سۆفی عەبدیم وەک یاریدەدەری خۆم لە سەنتەرەکە دامەزراند و لە ژووره بچوکەکەی خۆمدا جێگایەکم بۆ چاککرد و ئیدی پێکەوە دەژیاین.

یەکەم ڕۆژ کە زەهاوم برد بۆ ناونوسین، مامم چەند جارێک بە گومانەوە سەیریکرد و گووتی «حە ... ئەمە چییە، ئەم تەیرەت لە کوێ ڕاوکردوە؟». ترسام کێشەم بۆ بنێتەوە و بمخاتە دۆخێکەوە نەتوانم زەهاو بە خۆم بگرم، گووتم «نا تەیر نییە و هیچ نییە، ناسیاوی هاوڕێیەکمە کە بۆ کار دەگەڕێت، منیش یەکێکم پێویستە کۆمەکمبکات و لەگەڵمدا بچێتە بن باڵی نەخۆشەکان، چەند وەختە لەم و ئەو دەپاڕێمەوە ئەو کارەم بۆ بکەن، دەمەوێت پێویستیم بە کەس نەبێت... زەهاو هەم گەنجە و هەم هێمنە، باش بە کەڵکی ئەو ئیشەی من دێت». مامم وەک بەتەمای ئەسپێکی باڵداربووبێت و من هێستریکی شەلم بۆ کردبێتە دیاری، بە وردی و بە گومانەوە سەیری زەهاوی کرد و بێئەوەی هەستێکی خۆشی هەبێت گووتی «نازانم بۆ عەقڵم نایبڕێت». لەگەڵ ئەوەشدا سەیرێکی نوسراوەکەی بەردەمی خۆی کردەوە و دووجار پەڕەکەی ئەم دیوە و دیو کرد و لەبەر خۆیەوە گووتی «وای لە داخی ئەم وەرەقانە، هەر شتێک دەنوسیت، مەرەکەبەکەی دەچۆڕێتە سەر دیوی ئەودیویشی»، هەندێ بۆڵە بۆڵی تری کرد و دەستی برد مۆرەکەی دەرهێنا و توند لەسەر کاغەزەکە چەسپاندی، وەک بڵێ «دە بڕۆ ، ئەوەش لە بەر خاتری تۆ»، ئینجا ئیمزای خۆی لە بن دانا، بەڵام بە دەم سەربادانەوە گووتی «ئەسڵەن نازانم، بۆ گومانی شتێکی خراپ دەکەم. عەفومکە ماوەیەکە دەرهەق بە تۆ دڵگرمێ بووم، ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت عاتیفە و بەزەییەکی زۆر پیشاندەدەیت، پێم ناخۆشە پێتدەڵێن

مستەر گرینۆک ... جا نازانم، ئەم کابرایە لە گریان و شیوەنیشدا یارمەتیت دەدات یان هەر دەچێتە بن باڵی نەخۆشان؟». من بە خەندەیەکی تاڵەوە گووتم «نا بۆ گریان مستەر گرینۆک خۆی بەسە، ئەو بەشی هەمووان دەگری و لێشی زیادە». مامم وەک لە ژوورەکەی بمکاتە دەرەوە، دەستی ڕاوەشاند و گووتی «یاسا و مەرجەکانی بۆ ڕوونبکەوە، بابزانێت ئێمە لێرە موچەی خۆڕایی نادەین بە کەس، ئەو کاتانەی تۆ ئیشت نییە بینێرە با جار جار گەراجی ئوتومبێلەکان یان پشتی چێشتخانەکە پاکبکاتەوە، لەوێ زبڵ و پیسی زۆر کۆدەبنەوە». من لە خودام بوو نوسراوەکە وەربگرم و خێرا لەو ناوە نەمێنم، وەک فەرمانبەرێکی عاقڵ گووتم «بەڵێ مامە» و نوسراوەکەم ڕفاند و لەگەڵ زەهاو خێرا چووینە دەرێ.

لە بەر دەرگا دەستی زەهاوم گرت و گووتم «گوێبگرە زەهاو، هەر کاتێک لێیان پرسیت، دەتەوێت لەگەڵ نەخۆشەکان بچیت بۆ کەمپی باکوور، بۆ ناوشاخان، بڵێ بەڵێ دەمەوێت بچم... هیچ کات قسەیەکی پێچەوانەی ئەوە نەیەت بە زارتدا. ئەم جێگایە شوێنێکی باش نییە بۆ تۆ، گەر بماننێرن بۆ چیاکان ئەوێ حەشارێکی باشە، خۆت دەزانی بمانگرن بە گوون هەڵماندەواسن ... لە ئێستادا گەر بەخت بهێنین و لەگەڵ من بتخەنە کەمپی ناوشاخان، ئەوە شانسێکی باشمان هێناوە».

هێشتا تەدارەکی ناردنی هێزەکەمان بۆ چیا هەر لە بینە و بەردەدا بوو. من لە منداڵییەوە ئاواتم بوو لە دێلاوار دووربکەومەوە، ئاواتم بوو چەندین ساڵ لە چیاکان بژیم، هەوای پاک هەڵمژم، بە پۆستاڵی درێژەوە بە ناو بەفری زستاناندا بڕۆم، ملپێچی خوری بئاڵێنم و پاڵتۆی ئەستوور لەبەربکەم و بە کڵاوی توکداری ڕەشەوە سەربکەومە سەر ترۆپکان، بەڵام ئاواتی وەها نەدەهاتەدی، من هەمیشە بە خوێندن و کار و دەسەڵاتی خێزانەوە بەسترابووم، هەرجارێک شتێکی وەهام بوروژاندایە باوکم دەیگووت «

کوڕی خۆم، تۆ کەری وەحشیت، بزنە کێویت، هێستری قاچاغبەریت، تۆ چیت ئاخر؟ کارت بەو شاخ و کێوە چییە؟ گەر حەزت لە شوانییە، کۆمەڵێک قاز و قەلەمونت بۆ دەکڕم لە حەوشی پشتەوە بەرەڵایان بکە و بە دیاریانەوە دانیشە، ئەو کاسبییە سەد جار لە ئاوارەیی شاخ و کێوان باشترە. گەر مەجنونیشیت و دەتەوێت بدەیتە دەشت و دەر، شەرم مەکە، قسەبکە با خیرقە و عەسایەکت بۆ پەیدابکەم و شلێپێکی تەڕ بدەم بە قنگتدا و خواحافیزییەکی جوانت لێبکەم». کە باوکم وایدەگووت، خوشک و براکانم وەها کەیفیاندەکرد و دەتریقانەوە، من لە جێگای خۆم شەرم دەیگرتم و بێدەنگ دەبووم.

بە کورتی حەزمدەکرد لە دێلاوار دووربکەومەوە، دەمویست بۆ دوورتر لەو چیایانەش بمنێرن، بۆ هەر جێگایەک شتێکی نوێی تێدا تاقیبکەمەوە. من شتێکی ئەوتۆم لە دونیای دەرەوەی ئەم شارە نەدەزانی، زۆربەی خەڵکی دێلاواریش شتێکی گرنگیان لەسەر ئەو دیو سنوورەکانی ئەم هەرێمە نەدەزانی. زۆربەی خوێندنەوە و زانیارییەکانمان دەربارەی شوێنە دوورەکان بوون، لە کتێبەکاندا شتگەلێکی زۆرمان لەسەر ئەورووپی و ئەمریکی و چینییەکان خوێندبووەوە، دەمانزانی کەی لویسی شازدە کوژراوە، چۆن ماری ئەنتوانێت گووتویێتی «گەر نان نییە با کێک بخۆن»، دەمانزانی کرۆبسکایای ژنی لینین لە یاداشتەکانیدا چی نوسیوە، ترۆتسکی لە مەکسیک چەند جار لەگەڵ فریدا خالۆدا خەوتووە، دەمانزانی ماو تسی تۆنگ لە ساڵی ١٩٣٤ کە بەرەو هەرێمی کیانگشی دەکشێتەوە چۆن ڕووبەڕووی سەد فەیلەقی گەورەی کۆمینتانگ دەوەستێت و دەست بە ڕێپێوانێکی ئەفسانەیی دەکات، دەمانزانی تشەرشل لە کاتی جەنگدا چ جۆرە توتنێکی کێشاوە، شارلی شاپلن چ مێبازێکی مەلعون بووە، ئۆزوالد لە کوێوە تەقەی لە جۆن کێنیدی کردوە. بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆمان لەسەر دراوسێکانی ئەودیو سنووری دێلاوار نەدەزانی، تەنیا شتێک کە

لێی دڵنیابووین ئەوەیە کە دوژمنن، دڕندەن، گەر بتوانن وەک مەغۆلە کۆنەکان دیلاوار کاولدەکەن. هەمیشە یەک شت لە خەیاڵماندایە ئەوەیە کە دیلاوار لە باوەشی گەمارۆیەکی شەیتانیدایە، دڵنیاین لە چواردەوری ئێمە تەنیا دوژمن دەژی، لە منداڵییەوە فێربووم کە لە هەر ئاراستەیەکەوە دیلاوار جێبهێڵم، ئەوا بەرەو خاکی دوژمن دەڕۆم. هەڵبەت من لە سەردەمی مێردمنداڵی و هەرزەکاریمدا خولیایەکی شێتانەی فێربوونی زمانە خۆرهەڵاتییەکان کەوتبووە سەرم، بە کتێب و کاسێتی دەنگ و فەرهەنگ، دوو زمان فێربووبووم، شتێکی کەمیش لە زمانێکی سێهەم حاڵی دەبووم. لە قوتابخانە پێیان دەگووتم «بلیمەتی زمانە خۆرهەڵاتییەکان» بەڵام لە ڕاستیدا لە بازاڕ و کتێبخانەکانی دیلاواردا سەرچاوەگەلی وەها نەبوون، تا ورد و درشتی مێژووی دوژمنان بخوێنمەوە، جگە لەوەی لە منداڵییەوە لەسەر قیزێکی قووڵ و ناوەکی دەرهەق بە دوژمن گەورەبووبووم و نەمدەتوانی لەو وێنەیە دووربکەومەوە. دەبێت ڕاستی بڵێم من دیلاواریشم خۆش نەدەویست، بەڵام نە تا ئەو ئەندازەیەی خیانەتی لێ بکەم یان ئاوات بخوازم وێران بێت، یاخود بەرگری لێ نەکەم. خۆم لەو بوونەوەرانە بووم کە تەنیا مرۆڤ دەیبزواندم، نە شار، نە شوێن، نە کوچە، نە هیچ شتێک، دەمێکیش دەمویست بچم بۆ ناو چیاکان، مەبەستم بوو بە کڵاوێکی توکنەوە بە ناو بەفردا بڕۆم و لەسەر لوتکەیەکی دوورەوە بە دووربین سەیری دوژمن بکەم، تا بزانم لە مرۆڤ دەچن یان لە دەعبا و دەعجان و ڕموزنان.

ڕۆژێک ئەفسەرێکی سێ ئەستێرە هات، ناوی نەقیب نەجات یوکسەل بوو، کووتی «من ژەنراڵ مەحمودی قەرەقازانی ناردومی، دەبێت ئەم ماوەیە لێرە بەتالیۆنی کار هەڵبژێرم و سەرپەرشتی بکەم». ئەو ماوەیە حاکمانی دیلاوار چووبوونە ناو نەزم و تەدارەکی تازەوە، دەستیان لە هەموو شتێک وەردەدا و فێری ئەوە بووبوون کە کار لەسەر هەموو

جێگایەک و هەموو ژیانێک بکەن. کە نەجات یوکسەل گەیشت، من توڕەبووم لەوەی دەوڵەت بە ڕێگای ئەفسەر و پلەداری سوپاوە دەست لە سەنتەرەکە وەردەدات، گەر کار بە نەخۆشەکان دەکەن با بەرپرسەکانیان خەڵکێک نەبن کە تەنیا تەقە و تفەنگ دەزانن. ئەو جارە خۆم نەگرت و بە مامە سیام گووت «گەر دەوڵەت هەر لووت دەژەنێتە کاروباری ئەم نەخۆشانە، با بە پسپۆڕ و شارەزاکان ئیشبکات، ئاخر ئەفسەرێکی گەمژە چوزانێت لەگەڵ ئەم نەخۆشانەدا هەڵسوکەوت بکات». ئەو بە گومانەوە گووتی «تۆ دەڵێیت چی، دیلاوار فەیلەسوفی لێ نییە، پزیشکی دەروونی لێ نییە... ئاخر پسپۆڕ لە گۆڕی بابیان دەربهێنن، پسپۆڕیان لە کوێ بوو... بۆ جەنابت پسپۆڕی تەواویت کە لێرە ئیشدەکەیت، یان لە بەر ئەوەی برازای دکتۆر سیامەندیت لێرە دامەزراویت. دیلاوار هەر شاری زیندان بووە، شارەکە لە هیچ شتێکدا نەزم و پلانی نەبووە، ئێستا کە دەوڵەت خەریکە نەزم و پلانێک دادەنێت، تۆ دەتەوێت تێکیبدەیت. لێگەڕێ فەرمانڕەوایان بجوڵێن، گەر حاکم جوان جڵەومان نەکات و لغاو نەکاتە دەممان، شاری ڕێک و پێک چۆن دروستدەبێت؟». ئەو ماوەیە مامم هەرچییەکی لە زار دەهاتەدەر، دەهری و شێتی دەکردم، گووتم «بەڵێ باش... گەر وابێت لە دیلاوار ماوەیەکی تر ئەم چەکدار و پلەدارانەی سوپا کە هیچ کات پلەداری ڕاستیش نین، هەموو وەزیفەکان داگیردەکەن، دوور نییە بەیانی بچین بۆ نەخۆشخانە و لە بری دکتۆرەکان پۆلیسێک دەست بنێتە ژێر گوونمان و فتقمان بۆ نەشتەرگەری بکات». وامدەزانی توڕە دەبێت، بەڵام دایە قاقای پێکەنین و گووتی «هاهاها... هاهاها... بە شەرەفم دەبێت ئەم نوکتەیە بۆ حاکمی عەسکەری بگێڕمەوە، زۆر حەزی لە قسەی وایە». من لە ڕاستیدا غەمگین بووم بەڵام نەمدەزانی چی بکەم. هەستمدەکرد فەرمانڕەوایان بێ ویست و ئاگای خۆمان ئاراستەمان دەکەن، هەموومان ئەو شتە دەکەین کە ئەوان دەیانەوێت، ئەوە دەماری ساردی بۆ

نەدەهێشتمەوە و لە غەم و حەسرەتدا لە ناوەوە گڕم دەگرت. وردە وردە هەموو ژیانی دیلاوار دەکەوتە ژێر فەرمانی حاکمی عەسکەری و چەکدارە سوپایی و مەدەنییەکانی، منیش جگە لەوەی بە دیار ئەم نەخۆشانەوە بگریم هیچ دەسەلاتێکم نەبوو. سەنتەرەکە وردە وردە وای لێدەهات لە مۆلگایەکی سەربازی بچێت. مامیشم بڕوای وابوو کە گۆڕینی دیلاوار بۆ سوپاخانەیەکی گەورە کۆمەکی نەخۆش و وێڵ خولق و ترسنۆکەکان دەکات بەسەر دڵەلەرزە و سامی دەروونندا سەربکەون. مامم و دکتۆر جاهدار بە تەواوی بڕوایان وابوو ترسێک کە بڵاوبۆتەوە، شەڕانگێزییەک کە کڵپەی سەندوە تەنیا بەوە چاکدەبێت، هەموو بنە مرۆڤی مەشقدیدە و جەنگاوەر، لە بەرئەوە هاتنی نەقیب یوکسەلیان وەک جەژن سەیردەکرد و بە بۆنەیەکیان دەزانی، هەموو ئاهەنگی بۆ بگێڕین.

لەو ڕۆژەوە ئیتر نەقیب نەجات بەیانیان سەعات پێنج لە جیبێکی سەربازیدا دەگەیشتە سەنتەر و تا درەنگ دەمایەوە. نەخۆشەکان دەبوو بخرێنە ژێر باری هەلومەرجێکی سەختی کارکردنەوە، دەبوو لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە هەستن و بچنە مەیدانی ڕیزبەست و ئامادەگی، تاکە بەدەر لەم یاسایە شیزۆفیرنی و هیستیرییەکان بوون، ئەوانەی پاسەوانەکان نەیاندەتوانی جڵەوگیریان بن و ئاسان لێیانخوڕن. نەقیب نەجات لە کاتی ئیشدا پیاوێکی سەختگیر بوو، بەڵام دوای کار گەرچی هەر لە غروری پلەدار و ئەفسەران سەرشاربوو، بەڵام گەر زۆری لە خۆی بکردایە ئەوا خەندەیەکی بۆ دەهات و ڕوناکییەک دەکەوتە سەر سیمای، شتێک کە هیچ کات لە گەرمەی کاردا لێی نەبینرابوو. پیاوێکی موو زەردی باریک ئەندام بوو بە جووتێک چاوەوە وەکو کوژەکەی شین، تا ئەوکات پیاوێکم نەدیبوو برژانگی وەها درێژی بێت، گەر چی لە ساتی ئاساییدا چاوە شینەکانی ئارام و خانمانەبوون، بەڵام لە کاتی ئیشدا بز و جیدی و ترسناک دەردەکەوتن . بە گشتی لەو ئەفسەرانە بوو کە هێندەی

ئەستێرەی یەکەم دەخەنە سەر شانیان، کەپوو بە سەر تەواوی مەخلوقاتی خودادا بەرزدەکەنەوە و بەلای چاو سەیری تەواوی ئادەمیزادەکانی تر دەکەن. هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە کە هات، ویستی بە زەبری باق و بریقی سێ ئەستێرەکەی سەرشانی، هەمووان بخاتە ژێر فەرمان و ئاماژەی پەنجەکانی خۆیەوە. وەک بەردەست و کۆیلە سەیری هەموومانی دەکرد، ئەو ڕەفتارەشی منی وەڕز و نائارام کردبوو. دوای دوو ڕۆژ لە هاتنی خۆی، شەوێک چەند شۆفێرێک لە چەند گەلابەیەکی گەورەدا، چەند بارێک بەردی گەورە و بچوکیان بۆ مەشقگاکەمان هێنا و لە مەیدانی پشتەوەی بیمارستاندا ڕۆیانکرد. من تا ئەو کاتە نەمدەزانی لە دێلاوار ئەفسەری وا سەختگیر بوونی هەیە، بەیانیان خۆی سەرپەرشتی دابەشکردنی ئیشەکانی دەکرد، نەخۆشەکانی دەستە دەستە ڕیزدەکرد و هەر تاقمەی کارێکی پێ دەسپاردن، بە هەندێکیان خەندەکی لێدەدا و بە هەندێکیان گۆڕی هەڵدەکەن، بە دەستەیەک بەردی نەقارپی دەکرد و دەستەیەکیشی دەخستە سەر کاری هەڵچنینی دیوار و گەچکاریی و ئیشی بینا دروستکردن . هەموو ڕۆژێک پێش دەستکردن بە کار قسەی بۆ هەموومان دەکرد، دەیگووت دێلاوار بچوکە، هەموو هاوڵاتییەک دەبێت سێ هێندەی هاوڵاتی وڵاتانی دوژمن ئیشبکات، ئەوسا دەتوانین هەمان هێزی ئەوانمان هەبێت. دەیگووت لە شەڕدا ئازا و ترسنۆک نییە، بەڵکو جیدی و کەمتەرخەم هەیە. هەمووانی دەخستە ژێر گوشارێکی توندەوە، دەبوو هەموو ئەوپەڕی هێزی خۆیان دەربخەن، دەیگووت بەتالیۆنی کار وەک هێستری سوپا وەهایە، خەڵکانێکی دەوێت وەک بارگیر وەهابن، سینە و کەفەڵی ئەستووریان بێت، هەموو کارێکیان بۆ بکرێت و بەرگەی سەرما و گەرما بگرن.

هەموو پێکەوە پاچیان لە زەوی دەدا، هەموو پێکەوە دەیاننرکاند، بەردی گەورەیان دەخستە سەر نوێلی گەورە گەورە و بە دەستووری فیرعەونییە کۆنەکان دەیانگواستەوە بۆ ئەوسەری گۆڕەپانەکە و لەوسەرەوە

دەیانهێنایەوە بۆ ئەمسەر. بەیانیان گەر لە دوورەوە لە مەیدانەکەت بڕوانیبایە، لە گۆڕەپانێک دەچوو سەر بە هەزارسال لەمەوبەر، جێگایەک لە بابل کرێکارانی زەمانی زوو باغچە هەڵواسراوەکانیان تێدا دروستکردوە یان شوێنێکی ڕووتەن کە هەرەمەکانیان تێدا بەرزکردۆتەوە. ئیشەکان سەعات بە سەعات دەچوونە ڕێوە و بەردەوام پشووی کورتی بیست خولەکی دەکەوتە نێوان بەشەکانییەوە، هەر بیمارێک خاو و خلیچکی بنواندایە چاودێرەکان ئازاریان دەدا. هەندێ جار مامم و دکتۆر جاهدار کاتیان هەبووایە لەپاڵ نەقیب نەجات یوکسەلدا لە سەربانی سەنتەرەکەدا دەردەکەوتن و پێکەوە سەیری ئیشکەرەکانیان دەکرد و دەکەوتنە ناو نوسین و تێبینی تۆمارکردن. مامم منی وەک یاوەری پزیشکی و سەرپەرشتیاریی دەروونی هێزەکە بە نەقیب نەجات ناساند. ئەو بێئەوەی بایەخم پێبدات، هەر سەرپێی نیگایەکی تێگرتم و هیچی نەگووت. لە ڕاستیدا من ئەو ماوەیە کەوتبوومە خوێندنەوەیەکی زۆرەوە، دەمویست شتی زۆرتر لەسەر دەروون بزانم، بەلام تا دەهات تێدەگەیشتم کە زانست تەنیا بۆئەوە دروستبووە مرۆڤ سنووری نەزانینی خۆی بناسێت. خوێندنەوەکانم بەشی ئەوە نەبوون خۆم وەک پسپۆڕی دەروونی بناسێنم، بەلام من کەسێکی پێویست بووم، من تەنیا کەسێکی میهرەبانی ناو بیمارستانەکە بووم. دەمزانی هێزەکە جگە لە پزیشکێکی دەروونی پێویستییەکی زۆری بە غەمخۆرێک هەیە، کەسێک باوەش بە نەخۆشەکاندا بکات و وەک برا دڵنەواییان بداتەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە گرنگی خۆم بۆ ئەم کارە تێدەگەیشتم، ڕاستە نەخۆشەکان بۆ کەیف و خەندەیەکی کورت ئامادەبوون من بدەنە بەر کلکان و لاقرتی، بەلام لە ڕاستیدا پێویستیان بە من بوو. زستان تا دەهات نزیکدەبووەوە و پێشبینی ئەوەم دەکرد، کاروباری سەختی بەتالیۆنەکە بکەوێتە چلە ساردەکەوە و ئیشمان لە ناو بەفر و لە ناو گڤەی زریان و هەرەشەی هەرەس و فەلاکەتی با و وەیشومەدا بێت.

نەقیب نەجات هەمیشە بە نیگایەكی سووک و بێبایەخەوە سەیری منی دەكرد، ئەو چەند جارەی ڕێكەوتی یەكمان كردبوو وا ڕەفتاری نەدەكرد، وەک من هاوشانی بم و سبەی لە گەشتێكی درێژدا پێكەوە بچین بۆ باكوور. من دوای هەفتەیەک هەستم بە ڕقێكی بێسنوور كرد بەرامبەری. بۆئەوەی سنوورێک بۆ ئەو فەرامۆشی و بە هیچگرتنەی دابنێم، ڕۆژێک بە مەبەست چوومە بەردەمی و سڵاوێكی هێمنم لێ كرد و گووتم «جەنابی نەقیب هیوادارم بزانیت و بە ڕوونی پێیان ڕاگەیاندبیت كە من بەرپرسی دەروونی و سەرپشكی بارودۆخی ڕۆحی ئەم هێزەم كە ئێوە هەڵیاندەبژێرن. شتێک كە ئێوە لە سەرەتاوە دەبێت بیزانن ئەوەیە كە ئەم بیمارانە سەرباز نین و تەنیا هێزێكی یاریدەدەرن، بەشدارییان لەم پرۆگرامەدا لەسەر ڕۆشنایی پلانێكی تەندروستیدایە بۆ چاككردنەوە و باشكردنی دۆخی دەروونییان. بۆیە بەر لەوەی بەڕێزتان لێرە تەواو قەراربگرن چاكترە بزانن كە كاتێک پێكەوە دەچین بۆ چیا ئەم بیمارانە بەر لە هەر شت لە ژێر دەستی بیمارستاندان و بڕیاری یەكەم و كۆتایی لە دۆخیان دەگەڕێتەوە بۆ سەنتەر و بۆ ڕاوێژكارەكەی لەوێ، كە ئەویش دەكاتە شەخسی من، ئەمانە تەنیا كارەكەیان بۆ خزمەتی سوپای دیلاوارە، لەوە بترازێت وەک مرۆڤ و بوونەوەری زیندوو، حوكمدان بەسەر باشی و خراپیاندا لە ژێر سایەی سەنتەر و بیمارستاندا دەمێنێتەوە». گەرچی قسەكانم هەڵە و حوكمەكەم نادروست بوو، بەڵام توند بە گژمدا نەهات و نەیگووت وانییە. پێدەچوو تا ئێستا هیچ كەس بەو جۆرە قسەی لەگەڵ نەكردبێت، كۆكەیەكی تووڕە و نارەحەتی كرد و بە چاوە پەستەكانی سەیریكردم و گووتی «ڕێنواری زەریاواری... مستەر گرینۆک، وا بانگت ناكەن لێرە؟». بەڵێ بەشی زۆری نەخۆشەكان ئێستا منیان بە «مستەر گرینۆک» بانگدەكرد، زۆر لە نەخۆشە تازەكان ناوی منیان هەر نەدەزانی و جگە لە مستەر گرینۆک ناوێكی تریان بەكارنەدەهێنا. من بۆئەوەی خۆم لاواز نیشان نەدەم، وا خۆم دەرنەخەم

کە ناوی مستەر گرینۆک جۆرە توانج و تانەیەکی ناخۆشە، بە بێباکی گووتم «بەڵێ جەنابی نەقیب، من مستەر گرینۆکم، ئێشم لێرە ئارامکردنەوە و داوای لێبووردنە لە بیمارەکان». گووتی «خەمت نەبێت جەنابی مستەر، من هەر زۆر دڵڕەق بم ناگەمە وەستا سەلاحەدین، پێویست ناکات لە من بترسی، من تەنیا کارم لە ئێوە دەوێت، لای من نەخۆشەکان تەنیا مەکینەیەکن بۆ ئیش. ئەوەی نەتوانێت کاربکات یان نەیەوێت من دەیگۆڕم بە کەسێکی دی. هەموویان لای من هێزی کارن و هیچی تر، شوێنی حەوانەوە و بارخستنی سوپایان پێ دروستدەکەم، ئێشیان پێدەکەم، خەندەکیان پێ لێدەدەم، سەر سنووریان پێ ئاوەدان دەکەمەوە، کیسە خۆڵیان پێ پڕدەکەم، تونێلیان پێ دەکێشم ... لە بەهاری داهاتوودا دوژمن هێرش دەهێنێت، من تا ئێستا دەجار زیاتر چوومەتە سەر سنوور، گەر زستان لە پێشمان نەبایە پێدەچوو دوژمن زووتر پەلاماری بدایە، بەڵام هەوای ئەمساڵ سەختە، تاکە شتێک لێی دەترسن ئەوەیە بەفری چیاکان ڕێگریان بێت، دەبێت تا ئەوکاتە ئامادەبین ... بەڵێ باش، کاکی مستەر، ڕۆح و دەروونیان بۆ تۆ، بەڵام هێز و ماسولکەیان بۆ من، هەر کەس ئێشی خۆی تەواوکرد با خۆی بخاتە باوەشی تۆ و چەند دەتوانیت دڵنەوایی بدەرەوە ... ئێشەکەی تۆ بایەخێکی زۆری لای من هەیە، تۆ دەبێت شەوانە ڕۆحییەتیان والێبکەیت، بەیانیان ئامادەبن بۆ کار». ئینجا بە جۆرێک بەو چاوە شینانەی سەیریکردم، هەستم بە ترس و پاشەکشەیەکی زۆر کرد. لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتم کە ئەمە کەسێکە، هەم دەبێت لێی نزیک بیت و هەم لێی بترسیت. ئەفسەرێکی دڕ و بەرچاو ڕوون بوو، لەوانەی هەمیشە لە هەقی خۆیان زیاتر دەبەن، بێئەوەی بهێڵن زۆر هەستیان پێبکەیت.

ئەوەتەی ئیش دەستی پێکردبوو، ژمارەی ئەوانەی دەکەوتنە بەشی پەروەردە و تەمێکردن تا دەهات زۆرتردەبوون. هەندێ لە نەخۆشەکان بە خۆشحاڵییەوە خۆیان لە ئێشدا سەرگەرم دەکرد، شەکەتی و ماندووبوونی

جەستە وەهای لێدەکردن، خەیاڵ و بیرکردنەوەیان بمرێت، دوای کار هیلاک و لە عارەقدا شەلاڵ دەخەوتن و خەوێکی وەها دەیبردنەوە، نەوەک دیلاوار و دوژمنانی، نەوەک پیاوکوژی ناو خەونەکانیان لە یاددەکرد، بەڵکو دەچوونە ڕیزی مردووان. بەلام هەندێکی تر، هێزی کاریان نەبوو، هیلاکییەکی کتوپڕ دایدەگرتن، تینوێتی زەفەری لێدەهێنان، ماسولکەکانیان کرژ دەهاتەوە یەک و لە ناوەڕاستی پاچ وەشاندن و بەرد شکاندندا گرمۆلەدەبوون و دەکەوتن... هەندێ جار مامم و نەجات یوکسەل ڕەحمیان بە پیرەکان دەکرد و فەرمانیان دەدا بگەڕێنەوە جێگای خۆیان و پشووبدەن. بەلام جاهدار وەها دڵڕەق بوو، هەر کەس بکەوتایە بەر حوکمی ئەو دەینارد بۆ بەشی پەروەردە و تەمێکردن.

لەگەڵ زەهاودا ئێستا پێکەوە لە ژوورەکەدا دەماینەوە. هەر لە شەوی یەکەمەوە هەستمکرد گەنجێکە بۆنی بارانی لێدێت... بۆنی تەڕییەک کە نەمدەزانی چۆن دەگاتە گیانی، زوو زوو عارەقێکی بێهۆ دایدەپۆشی، زوو زوو هەموو گیانی دەنیشتە سەر ئاو. شەوێک کە لەگەڵ مندا هات بۆ ئەم سەنتەرە، تا دەمەوبەیان ترس و دوودڵی لە چاویدا بوو، هەفتەیەک بوو پیاوانی سەی ئەسلان وەک دوژمن ناساندبوویان. هەموو غەوارەیەک، هەموو غەریبەیەک، هەر کەسێک زمانی لە خەڵکی دیلاوار نەچووبایە، مەزهەبی جیابووایە، پیاوانی سەی ئەسلان وەک دوژمن سەیریاندەکرد. ڕۆژێک بە تۆمەتی ئەوەی زەهاو لە دوژمنی ناو خەون و زیندەخەونەکان دەچێت، چەکدارەکان دەیگرن. ئەوان بێهۆ خەڵک دەگرن، سەردەپەڕێنن، تەقەدەکەن، خەڵک وندەکەن، ئاهەنگی بەردباران و ڕەجم سازدەکەن، هەندێ جار لەسەر دەنگی مۆسیقا و بۆنی بوغرد و گووتنی سروودی «دیلاوار، ئەی سەر زەمینی شێران» ئاهەنگی گەورە دەگێڕن و کچ و کوڕان بە جۆش و گەرمی مەستدەکەن، داوا لە گەنجان دەکەن پۆل پۆل بچنە «سوپای باغەوانەکانی دیلاوار» ـەوە. زەهاو ساتێک دەگیرێت دەزانێت

یان دەیکوژن یان تا مردن لە جێگایەکی نهێنی زیندانیدەکەن. چارەی نییە جگە لەوەی لە دەست چەکدارەکان هەڵبێت، هەڵهاتن هەمیشە ئەگەرێکی بچوکی زیندویێتی و مانا بەخشینی بە مەرگ تێدایە. ئەو سوود لە ساتێکی غافڵبوون دەبینێت و وەک ئاهووی ترساو رادەکات. بەڵام دیلاوار پڕبووە لە چاوی نهێنی، لە کەسانێک کار بۆ چەکدارەکان دەکەن، هەمان ڕۆژ لە ئێوارەدا باغەوانەکان دەدەن بە سەر ماڵی زەهاودا، خۆشبەختانە خۆی لەوێ نابێت، دواتر بۆ شاردنەوە و حەشاردانی، ناسیاوێکی دەیداتە دەست پرۆفیسۆر.

کاری چەکدارەکانی سەی ئەسلان تا دەهات دەنگی زۆرتری دەدایەوە، هێزەکەی ڕۆژ دوای ڕۆژ سروشتێکی یاسایی وەردەگرت، هەندێ دەیانگووت حاکم و بنەماڵەکان سوود لە ئەفسون و کاریزمای ئەم مامۆستایە وەردەگرن تا کاری خۆیان بکەن، بێئەوەی ڕاستەوخۆ سوپا یان هێزی ڕێکخراوی بنەماڵە دەست لەو ئیشانە وەردەن، بەڵام دەرکەوتنەکانی سەی ئەسلان تا دەهات زۆتر دەبوو، زۆر شەو لە سەر خوانی تایبەتی فەرماندار یان حاکمی عەسکەری دەبینرا، زۆربەی جار جلی مامۆستایەکی بە ویقاری لەبەردەکرد، هەندێ جاریش جلی جەنگاوەرە کۆنەکانی دیلاوار. دەنگۆیەکی زۆر هەبوو بکرێت بە سەرۆکی هێزێک بە ناوی سوپای بەرگریی میللی کە باغەوانەکانی دیلاواریش لە خۆی بگرێت. هەندێ لە نوسراوەکانی ئەو، شەو لە تەلەفزیۆنەکاندا دەخوێنرانەوە. تا کاری باغەوانەکان خوێناویتر بایە، خەڵکی سەی ئەسلانیان خۆشتر دەویست، دەیانگووت ئەوەتەی ڕۆژانە دەنگی گوللەی ئەم سوپایە دەبیسترێت، هەست بە ئەمان و دڵنیایی دەکەن، کەمتر خەون دەبینن، کەمتر چەقۆی نادیار سەریاندەبڕێت، جۆرە دڵنیاییەک و بڕوایەک گەڕاوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە دوو مانگ لەوەوبەر ترس و سام تووشی هیستیریا و شەڕانگێزی لە ناکاوی کردبوون. گەر ڕۆژانی یەکەم بینینی گەنجە چەکدارەکان خەڵکی ترساندبوو، ئێستا شار

نیوەی بووبوو بە هەوادار و چاوساغ و یاریدەدەریان. خەڵکی دڵسۆزانە و لە ڕووی نیشتمانپەروەرییەوە کۆمەکیاندەکردن، تا وردتر بۆ دوژمن بگەڕێن... هەموو دڵنیابوون، دوژمنان لێرەن و دەبێت بدۆزرێنەوە. هەموو کوچەیەک، هەموو گەڕەکێک، دەبوو بەشی خۆیان لە ناسین و دۆزینەوەی دوژمندا بەشداربن. ئێستا هەموو دێلاوارم وەک شارێک دەبینی کە لە خۆ ئامادەکردنێکی بەردەوامدایە بۆ جەنگی گەورە. کاتێک پاسەوانەکانی دێلاوار لە کوچەکاندا دەردەکەوتن، خەڵکی بە هەلهەلە و شادییەوە دەچوون بۆ پێشوازییان. لەگەڵ دەرکەوتنی چەکدارەکاندا هەوای شوێنەکان دەگۆڕا و ژیانی تێدەگەڕا، ڕۆژانە بنکەی ناونوسین دەکرانەوە و گەنجی خۆبەخش دەچوونە ڕیزی پاسەوانەکانەوە. جەنابی حاکمی عەسکەری لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ڕەسمی دێلاواردا گووتبووی «باغەوانەکان لە ئێمەن و بۆ ئێمەن». ئەوە بووە دروشمێکی نوسراو لەسەر دیوار و لە پێشی دەزگا و دایەرەکاندا. فەرمانداریش لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ مامۆستای مزگەوت و کەنیسە و پەرستگاکاندا هەمان ڕستەی وەک خۆی دووبارەکردبووەوە.

لەم کاتەدا نیگارکێشەکانی منیش بەشێک بوون لەو کارخانەیە، ئێستا ڕۆژانە گەر سەیری تەلەفزیۆنم بکردبا، یان ڕۆژنامەکانم بخوێندایەتەوە، هەواڵێکم لەسەریان دەبینی. زۆر ڕۆژ قاسم وەلید یان ئاسەف بورهان لە تەلەفزیۆنەکان دەردەکەوتن و باسی ئەوەیان دەکرد، چەندە گرنگە هاوڵاتیان لە ڕێگای نیگارکێشانەوە بە نهێنییەکانی ناخی خۆیان شارەزابن. قاسم وەلید لە هەمووان زمانبازتربوو، بەڵام کاتێک لەسەر تەلەفزیۆنەکان دەردەکەوت، هێندەی بە دەست و بە چاو و بە جوڵە سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشا، قسەکانی هەمان توانا و کاریگەرییان نەبوو. دەیگووت پێویستە مرۆڤ بەردەوام هەوڵبدات خەونەکانی ناو سەری خۆی بگوازێتەوە، نیگاریانبکات، گەر خۆی نەیتوانی کۆمەک لە نیگارکێشان وەربگرێت. کە

قسەیدەکرد دەستی دەبرد بۆ سەری، بۆ پشت سەری، بۆ سەردڵی، بۆ ئاسمان، بۆ شتەکانی دەوروبەری. جۆش و خرۆشی قاسم وەها نمایشی بوو، دەیتوانی هەزاران خەڵک بخەڵەتێنێت، کەچی نمایشەکەی هیچ کەسی دڵگران و تورە نەدەکرد، دیلاوار هەمووی لە نمایشدا بوو، ئەوانەی خەونیان دەبینی نمایشیاندەکرد، ئەوانەی نەیاندەبینی هەر نمایشیاندەکرد، من بە گریانەکانم نمایشم دەکرد، مامم بەدەرکەوتنەکانی، سەی ئەسڵان بە سوپاکانی، ژەنراڵەکان بە جەنگەکانیان... هەموو نمایشماندەکرد، زەهاو نەبێت، مەسەلەی زەهاو گاڵتە نەبوو، ئەو ئەگەر بگیرایە بە ڕاستی دەکوژرا. نمایشەکانی قاسم وەلید پێیدەگووتم لەم ماوەیەدا دیلاوار چ مەودایەکی ترسناکی بڕیوە، هەموو چ ڕەوت و ڕێگایەکمان لە پشت سەری خۆمانەوە جێهێشتووە. ئێستا هەر سێ هونەرمەندەکە پاڵەوانی گەورەی دیلاواربوون. هەتا شەوێکیان تەلەفزیۆنی ڕەسمی فیلمێکی کورتی لەسەر ژیانی ڕۆژانەی ئاسەف بورهان بەرهەمهێنابوو، پیشانیدەدا چۆن خەڵک لە بەردەم دەرگای ماڵەکەیدا ڕیزیان بەستووە، ئەو وەک میرزادەیەکی عوسمانی سمێڵی بۆ سەرەوە بادابوو، ڕیشێکی سوڵتانی درێژی هێشتبووەوە، ڕەفتەیەکی سووری خستبووە ملی، کاسکێتێکی لاری کردبووە سەری و لەبەردەم ستاندێکی دارگوێزدا نیگاری دەکرد و پایپی دەکێشا، کامێراکەش پیشانی دەدا خەڵک لە سەرەدا بوون تا بە دەست و قلچەی ئەو خەونەکانی خۆیان ڕەسمبکەن، ناوی ڕیپۆرتاژەکە گەلێک جوان بوو «وەرە و خەونی خۆت لای من ببینە».

من و زەهاوە لە سەنتەریش ئارامماں نەبوو، بە فەرمانی حاکمی عەسکەری دیلاوار هەر کەس لە باغەوانەکان هەڵبهاتایە، هەر کەس داڵدەی یەکێک لە گومان لێکراوانی بدایە، سزاکەی مەرگ بوو. هەردووکمان زۆر دەترساین، من تا ئەو کات زۆر بەر ڕۆحە شەڕانگێز و دەموچاوە تاریکەکەی دیلاوار نەکەوتبووم. تا ئەوکات زیاتر دیوە پاکەکەی دیلاوارم دەناسی،

هیچ کات ئەوەم نەدەهات بە خەیاڵدا ڕۆژێک لە یەکێک لە شەقامەکانی ئەم شارەدا کە من تیا گەورەبووم مرۆڤ سەرببڕن. بەڵام ئێستا دەزانم هەموو شارەکانی دونیا وەهان. هیچ کەس باوەڕناکات ڕۆژێک لە ڕۆژان دیمەنی وەها لەسەر شۆستە و شەقامی شاری خۆی ببینێت. بەڵام هەمیشەش ڕوودەدات، هەمیشە دووبارەدەبێتەوە، هەمیشە ئەوەی تۆ وادەزانیت هیچ کات ناقەومێت و ڕوونادات، دێت و بە دڕندانەترین شێوە بەردەرکی ماڵت پێدەگرێت. گەر خۆشبەخت بیت و لە سەردەمی تۆدا ڕوونەدات، ئەوا لە سەردەمی باپیرانتدا ڕوویداوە، گەر نا، ئەوا ڕۆژێک لە سەردەمی منداڵ و نەوەکانتدا ڕوودەدات.

من لە دێلاواردا وەک بێگانە ژیابووم، ئێستا وەک ماسییەکم لێهاتبوو کە لە ناو تۆڕێکدا لە دایکبووبێت و پێی نەزانی بێت.

# ٢٩

زەهاو لە چیاکان لەدایکبووبوو، کوڕی خێلێکی سەر ئەو سنوورانە بوو. خێڵەکەی بەشێکیان دەکەوتە ناو سەرزەمینی دیلاوار و بەشێکی تریان دەکەوتە خاکی دوژمن... بەدرێژایی سەدان ساڵ هەمیشە لە ناو جەرگەی جەنگدا بووبوون، باپیرە گەورەکانی بۆئەوەی ژیانی خێڵە بچوکەکەیان بپارێزن و دەست بە زەوی و ئاژەڵ و کانیاوەکانیانەوە بگرن، هەندێکیان خۆیان بە لای دوژمندا ساغکردبووەوە. چل ساڵ لەوەوبەر هێزەکانی دیلاوار ئەو خێڵانەیان وەک چلکاوخۆری دوژمن ناساندبوو، چووبوونە شەڕەوە لەگەڵیان، سەرەک خێڵەکانیان کوشتبوون، هەندێ لە گەنجان و پیرانیان خستبوونە زیندان. لە ساڵانی ڕابوردوودا کە پەلامارەکانی دوژمن لەودیو سنوورەوە زیادیکردبوو، بەشێکی زۆری ئەو خێزان و خەڵکەی لەو سەر سنوورەبوون، بۆئەوەی خۆیان لە هەر تەرەفدارییەک بپارێزن، بۆ ئەوەی نەکەونەوە نێو ئاگری هیچ جەنگێک، تا ژیانی خۆیان و منداڵەکانیان لە بەلا بە دووربگرن، بەرەو دیلاوار کشابوون. زەهاو لە دوای هەموو ئەو ڕووداوە تاڵانە لەدایک بووبوو، وەک من کە هیچم لەو مێژووە نەدەزانی، ئەویش هیچی نەدەزانی و تێنەدەگەیشت بۆ خەڵکی لە دیلاوار وەک دوژمن سەیریاندەکەن. تەمەنی بیست ساڵ دەبێت کە دێن بۆ شار، لەوێ لە گوندەکەی خۆیان فێری کەمێک خوێندەواری بووبوو، بەڵام ڕوخسارێکی

گوندیانە و نیگایەکی وەها ترساوی هەبوو، جگە لە ڕەنجبەری و کاری کرێکاری هیچی دی چنگ نەدەکەوت. کە من بینیم، بۆنی بارانی لێدەهات... ڕەشتاڵەیەکی باریک بوو، بە جووتێک چاوی ئاهووئاسای ترساوەوە، چاکەتێکی چەرمی کەستانەیی لە بەردابوو، پانتۆڵێکی زۆر کۆن، لەو پانتۆڵە مەلعونانەی زەمان هەزار دەردی بەسەردا دەهێنێت و هەر نادڕێت. کەسێکی گرنگ نەبوو، تەنیا کرێکارێکی نەخوێندەواری دێلاواری بوو کە دایکێکی پیر و دوو برای لە خۆی بچوکتری گەورەدەکرد. لە دوازدە ساڵییەوە لەگەڵ هێستری خزمێکیاندا دەکەوێتە چیاکان، لەو دیو مەرزەکان بار دەهێنن و ئاودیوی سنووری دەکەن، ئیشی ئەو تەنیا پاراستنی بار و هێسترەکەیە، وەزیفەیەتی نەهێڵێت هێسترەکە بگلێت و وێڵ بێت و بارەکەی بخات. ئیشی ئەوەیە قاچاغچییەکان چییان پێگووت بڵێ بەڵێ. شەو و تاریکی و وریایی و گوێ هەڵخستن و چاو لە زوڵمەت بڕین، توانایەکی بێوێنەی دەدەنێ دەنگی دوور ببیستێت و سێبەری ناو تاریکی ببینێت. چەند ساڵ بە چیاکانەوە دەبێت، کۆیلەی قاچاغچییەکانە، هەر کارێکیان بوێت دەیکات، هەر بارێکیان بوێت لە هێسترەکەی دەنێت، هەر ڕێگایەکیان بوێت دەڕوات. بە جۆرێک زەهۆ و هێسترەکەی لەسەر سنوورەکان ناوبانگ دەردەکەن. زەهۆ بۆ هەر پرس و بۆ هەر کارێک، یەک وەڵامی هەیە «بەڵێ گەورەم». ساڵێک بەر لە هاتنی بۆ دێلاوار، شەوێک بارانێکی چڕ لە خەونەکانیدا دەبارێت، ئەوە یەکەم جارە تۆفانێکی وەها لە خەونیدا هەڵبکات، لەشی سەرتاپا تەڕدەبێت، جەستە باریک و لاواز و ئەسمەرەکەی نوقمی ئاوێکی زۆر دەبێت کە دواتر نازانێت عارەقی ترسەکانێتی یان هەر بە ڕاست بارانێکە و بە سەریدا باریوە. ئەو شەوە هەموو ولاغدارەکان دەکەونە بۆسەیەکی گەورەوە، ئەو تەنیا کەسە لەو بۆسەیە دەردەچێت، چاوی تیژ و بیستنی کۆمەکی پێدەکەن پێش هەمووان خۆی فڕێبداتە کەندێکی قووڵەوە. لەو شەوەدا هێزێکی سەربازی، کە پێدەچێت هێزێکی تایبەت بن و لە «مەمەدحەسار»

ـەوە هاتبن. هەموو کۆڵبەر و هێسترەکان دەکوژن... دەیان کەس و سەدان ئاژەڵی بەستەزمان کە زۆریان بە بارەکانیانەوە لە باریکە ڕێیەکەوە بەرەو بنی خەرەندێکی هەزار بە هەزار بەردەبنەوە. ئەو تەنیا دەرچووی ناو کارەساتێکی گەورەیە کە ئێستاش ترسەکەی لە چاویدایە. دوای ئەوە ئیدی ناگەڕێتەوە بۆ چیا و لەگەڵ دایکی و دوو براکەیدا دادەبەزێت بۆ دیلاوار. لە دیلاوار جگە لە کرێکاری هیچ ئیشێکی تری چنگ نایەت، لە دروستکردنی ماڵە نوێکاندا، لە لێدانی زێرابدا، لە کانە بەردەکانی دەرەوەی شاردا، لە کارخانەکانی بلۆکدا ئیشدەکات... وەستاکانی هەر کەسێک بن، ئەم تەنیا یەک شت دەزانێت «بەڵێ گەورەم». دەزانێت زۆربەی خەڵک لە دیلاوار ڕقیان لەو ئێل و تایەفانەیە کە لە سنوورەوە شۆڕدەبنەوە و دێنە ناو شار، هەموو وەک دوژمن و خۆفرۆش لێیان دەڕوانن، وەک جنسێکی لە خۆیان نزمتر، بەڵام ئەو هۆیەک و بەهانەیەک بۆ ئەو کینەیە نادۆزێتەوە. لە زۆربەی جێگاکان وەک لادێیەکی چەپەڵ سەیریدەکەن، گوندییەک کە لە ئەژدادیانەوە بەکرێ گیراو و چڵکاوخۆری دوژمن بوون. هەقدەستی ڕۆژانەی هەمیشە لە کرێکارەکانی تر کەمترە، قورسترین کارەکان لە بەشی ئەوە، بەڵام جگە لەوەی بڵێ «بەڵێ گەورەم» هیچی تر ناڵێت. کە دێت بۆ لای من، هەمان ترس و دوودڵیشی بەرامبەر من هەیە. من دەستی دەگرم و پێیدەڵێم «گوێبگرە، ئیشی من ئەوەیە کە ژیانی تۆ بپارێزم، ئەوە وەزیفەی منە. ئەم شارە هەندێ پیاوچاکی وەک پرۆفیسۆر بەهنامی تێدایە، بەڵام کەمن زۆر کەمن... لێت تێک نەچێت، تۆ هەمیشە ژیانت لە مەترسیدایە، خەڵکی ئێرە دایمە لە بۆسەدان داوێکت بۆ بنێنەوە. نابێت بێ پرسی من زۆر بچیتە دەرەوە، نابێت لێرە سەربەست بگەڕێیت، نابێت وەڵامی زۆر پرسیار بدەیتەوە، نابێت بچیتە گفتوگۆی درێژەوە لەگەڵ کەسدا. یەک هەڵەی بچوک لەوانەیە ژیانی هەردووکمان بخاتە مەترسییەوە، ئێستا دۆخێکە وەک حوکمی عورفی، تێدەگەیت حوکمی عورفی چییە، ها؟

یەعنی هەر کەسێکمان بگیرێین تیاچووین». ئەو بە هەمان شێوە لە منیش دەترسێت، چەند شەوێکی دەوێت تا لە من دڵنیادەبێت، زۆر کەم قسەدەکات، بەڵام زۆر سەیری من دەکات، بەردەوام بەچاو لێم دەڕوانێت، زۆرجار کە نوقمی خوێندنەوەم و سەرهەڵدەبڕم دەبینم چاوی تێبڕیوم. هەموو کارەکانی خۆی بە باشی دەکات، هەرچییەکی پێدەڵێم دەڵێت «بەڵێ گەورەم». من هەندێ جار توڕەدەبم و دەستی دەگرم و دەڵێم «وامەڵێ... من وەزیفەیەکم لەسەرە ژیانی تۆ بپارێزم، نازانم ئەوەم بۆ ئەنجام دەدرێت یاخود نا، پێویستە تۆ بەهێزبێت، وریا بیت، چاوت بکەیتەوە. ڕۆژێک منیش نەبووم بتوانیت خۆت بپارێزیت. ئێستا یەکەم شت بیکەیت ئەوەیە دەبێت قژت درێژبکەیت. تێدەگەیت؟ ئەو پیاوەی لە وێنەکەدایە قژی کورتە، هەوڵبدە زۆر قژت درێژ بێت، بە جۆرێک نیوەی دەموچاوت داپۆشێت. دەمەوێت کە پێکەوە چووین بۆ شاخەکان تۆ یاریدەدەری خۆم بیت، نامەوێت ئێشت پێبکەن، دەتکەم بە بەرپرسی کاروباری تایبەتی خۆم، بەڵام تۆ کارێک بکە هیچ کات لە من دوور نەکەویتەوە». هەمیشە خەمی ئەوەی بوو کە دەبێت دایک و براکانی لە چ بارودۆخێکدا بن. من دڵیم دەدایەوە و دەمگووت «دڵنیابە باشن، تۆ پرۆفیسۆر ناناسیت، پرۆفیسۆر پیاوێکی میهرەبانە، ئەو غەم لە دایکت و براکانت دەخوات، دڵنیام». گەنجێکی لاواز نەبوو، ئەوەی بەردەوام فێربووبوو بڵێ «بەڵێ گەورەم» لە لاوازییەوە نەبوو، بەڵکو لە منداڵییەوە بەوە فێربووبوو کە ئەو لە ڕەگەزێکی نزمترە، لەوانەیە کە هەمیشە وەک بەردەست و ئیشکەر دەمێننەوە، ئەوە وەک هەستێکی فیتری چووبووە خوێنییەوە. تا قسەم لەگەڵ نەکردبایە قسەی نەدەکرد، شەوان وەک من بە دیار تەلەفزیۆنەکەوە دادەنیشت و بە هەمان بایەخ و گرنگییەوە کە من بەرنامەکانم گوێدەگرت، ئەویش گوێیدەگرت. لەو کاتانەدا نەبێت کە من بیمارەکانم دەهێنا و بۆیان دەگریام و دەپاڕامەوە بمانبورن، هەموو کاتەکانی تر لەگەڵ مندا بوو. بەڵام نەمدەویست لە کاتی ئەوجۆرە

هەڵچوون و هەستکردنانەدا بمبینێت.

من سەرەتا ئیشەکەی خۆمم وەک شێوەنگێڕێک کە بۆ نەخۆشەکان دەگری، بە ئیشێکی بێسوود و ناچیز تەماشادەکرد. ڕاستە مامە سیام منی هێنابوو کە دوای تەمێکردن بیمارەکان هێوربکەمەوە، بەڵام وردە وردە ئیشەکەی من بوو بە ئیشی شێوەنگێڕ، بە کەسێک هێندەی لە بەردەم یەکێک لە نەخۆشەکاندا دەوەستێت، هەموو ئازارەکانی مرۆڤی بیردەکەوێتەوە و دەگری. سەرەنجمدا کە زۆر لە بیمارەکان لەزەت لەو گریانەی من دەبینن و پێی ئارامدەبنەوە. بوونی کەسێک کە وەک گوناهبار سەیریان ناکات، کەسێک کە خۆی بە تاوانبار دەزانێت نەوەک ئەوان، کەسێک کە لە ناخی دڵەوە داوای لێبوردن لە ئازارەکانی ئەوان دەکات، هەستێکی نوێ بوو کە پێشتر تاقیان نەکردبووەوە. زۆریان کە لای من دەچوونە دەرێ، بە شانازی پیاوێکی بێگوناهەوە دەڕۆیشتن، وەک کەسێک لە خۆڕا ئازارێکی زۆری دیبێت و ئێستا بە یەک جار بۆ دنیا ڕوشن بووبێتەوە کە هەرچییەکی چەشتوە ناهەق بووە. نا... نەمدەهێشت زەهاو لەو ساتانەدا بمبینێت. ئەو دەیزانی من بە «مستەر گرینوک» بانگدەکەن، بەڵام دەبوو بڕوای بەوە بێت کە من کەسێکی لاواز نیم و دەتوانم بیپارێزم، گەر بهاتبایە و منی لە کاتی ئەو شیوەن و فوغانەدا بدیبایە، بڕوای بە من نەدەما.

بۆ ئەوەی وادەرنەکەوین کە خۆمان لە سەنتەرەکەدا لە شتێک شاردۆتەوە، هەفتەی ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ دەمبردەوە بۆ ماڵی خۆمان و شەو پێکەوە لە ژوورەکەی خۆمدا دەخەوتین. ئەو دوو ڕۆژە نەدەهاتینە دەرێ، من کتێبم دەخوێندەوە و ئەویش لە تەلەفزیۆنەکەدا گوێی لە گۆرانی دەگرت و سەیری کلیپە بیانییەکانی دەکرد. ڕەوش و خووی خەوتنی سەرسامیدەکردم، هەر کاتێک بیویستبایە دەخەوت، لە جێگایەکدا درێژدەبوو و بێئەوەی دەنگێک یان مشەیەکی لێوەبێت، دەچووە خەوێکی قووڵەوە ...

لە کاتی خەوتندا لە مردوو دەچوو، بەرد بجولابایە ئەو نە دەجولا، ئەوە نەبوو هەتا جاریکیش ئەم دیوە و دیو بکات، لەسەر پشت پالدەکەوت و وەک مردوویەک لە دارەمەیتدا بێت لێی دەکەوت. لە خەو هەستانیشی بە پێچەوانەوە خێرا و کتوپڕ بوو، ئاگاداربوونەوە و ڕاپەڕینی یەک شت بوون، هەمیشە بە ترسێکی زۆرەوە دادەچلەکی، بە خێرایی هەلدەستایە سەر پێ و سەیرێکی چواردەوەری خۆی دەکرد، وەک نەزانێت لە کوێیە، وەک بیری چووبێتەوە بۆ لەم جێگایەدا خەوتووە.

هەر دووکمان بەیانیان کە نەخۆشەکانیان بۆ سەرژمێر و دابەشکردن و ئیش ڕیزدەکرد، لە جێگایەکدا دەوەستاین و سەیرماندەکردن. من بە مامە سیام گووتبوو کە چووم بۆ چیاکان، زەهاو وەک یاریدەدەر و بەردەستی خۆم لەگەلمدا دەبێت. دەمویست هەموو هێزی خۆم بەکاربهێنم تا سەربەخۆییم لە نەقیب مسۆگەربکەم ... نەمدەویست ئەو هەستەم تیا سەوز بێت کە وەک سەربازێک بۆ چیاکان دەڕۆم. من هاودەمی کۆمەلێک بیماری دەروونی بووم کە لە هەر کوێیەک بوونایە، پێویستیان بە غەمخۆرێک هەبوو. دلنیابووم ژیانمان لە چیاکان ئاسان نابێت. ڕاستە ئێمە وەک بیمارەکان ئیش ناکەین، بەلام کاری جلەوکردن و ئارامکردنەوەی ئەوان لە شاخەکان سەختتر دەبێت. لەوێ وەستا سەلاحەدینێکی لێ نییە بترسن و هیچ بەشێکی تەمیکردنمان نابێت، کەس سزابدەین. ڕۆژانە کە سەرنجی مەیدانی کارەکەم دەدا، دەمبینی میرئەودال خۆی زۆر ماندوودەکات تا لەو لیستەدا جێبگرێت کە دەبرێن بۆ ئیشی شاخەکان، دلنیابووم میریش وەک من لە خۆی هەلدێت. بۆ کەسانی وەکو من و میر، چیاکان وەک دواهەمین ڕێگا بوو تا لەم دۆزەخەی ئێستا دەربازبین. مرۆڤ هەندێ جار تەنیا داوای گۆڕان دەکات و هیچی تر، هەتا گەر بەرەو دۆزەخیش بێت، منیش و میرئەودالیش لە جۆرە دۆخێکی وەهادا بووین. دەمانەویست شتێک لە ژیانماندا ڕوبدات ... هەر شتێک ... هەر شتێک... هەتا ئەگەر تەقینەوەیەکیش

بووە و نیوەی سەرمانی لەگەڵ خۆیدا بردوە. زۆر دڵم بەو دەسووتا، لە کاتی ئیشدا هەموو گیانی دەنیشتە سەر عارەق، قژی درێژیی یەک پارچە دەکەوتە سەر دەموچاوی، ئەو بە قەوارە لە هەموو زیندانییەکان زلتربوو، لە هەر جێگایەکەوە سەیرتبکردایە بە چاکەتێکی سوورەوە دەتبینی، ئەو قەد و قەڵافەتەی وایکردبوو زۆر ئیش هەیە تەنیا بەو بکرێت، گەرچی دیاربوو میر لە ژیانیدا ئیشی سەختی نەکردوە، بەڵام هێزێکی جەستەیی شاردراوە و گەورە لە ماسولکەکانیدا بوو، گەورەترین بەرد تەنیا ئەو دەیتوانی هەڵیبگرێت، سەختترین بار تەنیا ئەو دەیتوانی ڕایبکێشێت، هێزێکی بێهاوتای هەبوو، بەڵام ڕۆیشتن و ئەمسەرە و سەری زۆر ماندوویاندەکرد، من دەترسام جارێک بە هۆی قەڵەوی و ماندووبوونەوە تووشی گرفتێک بێت و دەردێکی خراپ بگرێت. جارێک تکام لێکرد هێندە خۆی ماندوو نەکات، هێندە خۆی نەڕەتێنێت. گووتی «نا تۆ دەڵێیت چی، هەرچییەکم کردوە دەبێت کارێکبکەم لەو کەسانەدا بم کە دەچن بۆ شاخ، خوا گەورەیە ئینشەڵا خۆمی تێدادەبم».

منیش پڕ بە دڵ حەزمدەکرد، لە چیاکان میرئەودالمان لەگەڵ بێت.

# ٣٠

ئاڵ موراد بۆی گێڕامەوە:

بۆقبۆقیلە ڕۆژانی سەرەتا نەیدەتوانی زۆر دڕبێت. هەفتەکانی یەکەم کەسمان نەکوشت، دوو کەس لە دەستمان هەڵهاتن، بەڵام بۆقبۆقیلە هەردوو جارەکە کڵاوەکەی داکەند و لە پشتەوە سەیرێکی هەڵاتووەکانی کرد و گووتی «گووم تێکرد، گووم تێکرد... وازی لێبهێنن ملی بشکێنێت». دەمانبیست کە گروپەکانی تر خەڵکیان کوشتووە، بەڵام بەکرە درێژی درۆزن نەبێت، هیچ کەس لە تاقمی ئێمە حەزی بە کوشتن نەبوو. گەر یەکێک بە ڕاستی حەزی لە کوشتن بێت، دەتوانیت لە چاوی و لە ڕەفتاریدا بیخوێنیتەوە. دەکرا ئێمە کەس نەکوژین، دەکرا هەر بسوڕێینەوە و خەڵک بترسێنین. بەڵام دواجار سەی ئەسڵان کۆبوونەوەیەکی گەورەی پێکردین و لەو خەیاڵە خۆشانە بە ئاگای هێنایینەوە. هەموانیان لە یاریگایەکی داخراودا کۆکردەوە، پێیان گووتین بە ڕیز لەسەر زەوییەکە دانیشین. سەرزەمینی یاریگاکە جمەی دەهات، ژمارەی گەنجە تۆمارکراوەکان لە سوپای باغەوانانی دیلاواردا تادەهات بەرەو بەرزی دەچوو. هەر یەکەمان چەکی تایبەتی خۆمانمان پێ بوو، بەر لەوەی بچینە یاریگاکەوە، یەکی پەڕۆیەکی وەنەوشەییان داینێ بیبەستین بە ناوچاوانمانەوە، لەسەری نوسرابوو «باغەوانەکانی دیلاوار»، تیشێرتێکیان داینێ لە پشتەکەی نوسرابوو «ئامادەین بە خوێنی

خۆمـان باغـی ئـازادی ئاوبدەیـن». مـن لـە تەنیشـت کوڕێکـەوە دانیشـتبووم جەهـور سـابونچیمان پێدەگـووت، باوکـی لەوانەبـوو هێشـتا خـۆی سـابوونی دروسـتدەکرد، ئێمـە هـەر جەهـورە خـڕە بانگماندەکـرد، کاتێـک لـە «ناوەنـدی غەفاریـی» بـووم ئـەو دوو ڕیـز لـە پێـش منـەوە دادەنیشـت. لەوانەبـوو کـە زۆر بەدبەختـن، لـە پۆلـدا بـەردەوام دەنگـی سـەیر و نائاسـایی دەردەکـرد، دەپژمـی، دەکۆکـی، چڵمـی هەڵدەلوشـی، فینگیدەکـرد، مشـەی دەهـات... خـوای گـەورە، هیـچ دەنگێکـی عەجایـەب و ناخـۆش نەبـوو لـەم کـوڕە بەدبەختـە دەرنەچێـت. جەهـور لـە منداڵییـەوە خـۆی دڵپـڕ و مەیلـە گریـان بـوو، هـەر کات مامۆسـتا بیگووتبایـە جەهـور ئەوەنـدە مشـە و فینگـەت نەیـەت، چـاوی پڕدەبـوو لـە ئـاو. لـەو کاتـەوەی هاتبوویـن حەسـرەتێک لـە دڵیـدا بـوو و دەگریـا، چاوانـی سـوور سـووربووبوون. کـە دانیشـتین مـن پرسـیم «هێـی جەهـور چییتـە، چ دەردتـە، دیسـان دەڵێـی باوکـت مـردوە، ئێرەش مەکـە بـە بەزمـی مەکتـەب، ئێرە سـوپایە باوکمـان لـە گـۆڕ دەردەهێنـن». ئێسـتا فێربووبـووم تـەواو وەکـو کوڕەکانـی تـر قسـەمدەکرد. ئـەو گووتـی «نـا، باوکـم نەمـردوە، بـەڵام پێری شـەو براکـەم ژنـی هێنـا، کـە چـووە پـەردەوە دەرکـەوت براژنـم هێـن نییـە ... دەزانیـت چـی». مـن دامـە قاقـای پێکەنیـن و گووتـم «یەعنـی پێشـتر فتیـان کـردوە». گووتـی «براکـەم زۆر شـێتە، لـە هەمـوو ئەمانـە شـێتترە، بـەو شـەوە پەلـی کچەکـەی گـرت و بردییـەوە بـۆ ماڵـی خۆیـان. کچەکـە دوایـی دیـار نەمـا، مـن دەزانـم کەسـوکاری کوشـتوویانە، ئێسـتا دەڵێـن برای مـن کوشـتویتی... تێدەگەیـت... ئێسـتا وادەڵێـن». مـن بەسـەرسـامییەوە سـەیرمکرد و گووتـم «دەی تـۆ بـۆ دەگریـت؟». «لەبەرئـەوەی لـە نیـوەڕۆوە گیـراوە، کەسـوکاری براژنەکـەی مـن خزمـی مەسـئولیان هەیـە، حاکمیـش خزمیانـە، هەمـوو دەڵێـن ئیتـر قـەت بەرنابێـت. گـەر نەگیرایـە دەبـوو ئێسـتا لەگەڵمـان بێـت... بـۆ ئـەوە دەگریـم». لـەو قسـانەدا بوویـن کـە سـەی ئەسـلان هاتـە نـاو هۆڵەکـەوە. ئـەوەی پێشـتر ئەسـلانی دیبایـە دەیزانـی چ گەنـج بۆتـەوە، چ هێـز و تاقەتێکـی تێگەڕاوە. لاجانە

درێژەکانی کەمێک کورتکردبووەوە، قژێکی چڕی هەڵدابووەوە بۆ دواوە و بەردەوام لە بەردەم خۆیەوە دەیگووت «ڕۆژێکی مێژووییە... ڕۆژێکی مێژووییە». جەهور کە گوێی لێ بوو سەی ئەسلان دەڵێت «ڕۆژێکی مێژووییە» زیاتر جۆشی هاتێ و فرمێسک لە چاوی داباریێن و بەدەم هەنسکەوە گووتی «براکەم زۆر حەزی لە ڕۆژی وا مێژوویی بوو». سەی ئەسلان نەچووە سەر بڵندگۆکە قسەبکات، هاتە ناومان و ڕیز ڕیز بە سەر یەک بە یەکی باغەوانەکاندا گەڕا، نەیدەهێشت کەس لەجێگای خۆی هەستێت، گووتی «تفەنگە پیرۆزەکانتان بخەنە باوەشتان و دانیشن» بە سەر ڕیزەکاندا دەگەڕا و دەیگووت «ماشەڵا، ماشەڵا... لەم هەموو گەنجە جوانە، ئاوەدان دیلاوار... ماشەڵا ماشەڵا. بارەکەڵا ... بەهـ بەهـ لە دیلاوار بۆ خۆی و بۆ ڕۆڵەی». کە گەیشتە بەردەم جەهورە خڕە و بینی جەهور چاوی ئاوساوە و دڵی پڕبووە و خەریکە دەداتە پرمەی گریان، گووتی «هەستە بابە بزانم چییتە؟». من دەمزانی دەیەوێت ڕۆڵی سەرۆکێکی باش ببینێت کە غەمی ورد و درشت دەخوات، بەڵام لە دڵی خۆمدا گووتم «خودای گەورە، ساحێبی ئەرز و ئاسمان، خاوەنی هەر حەوت تەبەقەکە، نەکات جەهور خۆی کەربکات و حیکایەتی ئەو براژنەی بگێڕێتەوە». جەهور لە ترس و پەشۆکاندا باش قسەی بۆ نەدەکرا، کە قسەیکرد دەنگی هێند سەیر و مشن بوو خەریک بوو هەموو بدەینە قاقای پێکەنین، فرمێسک و چڵم و هەنسک و تەنگەنەفسی و ترسی دابوو لە یەک، مۆسیقایەکی عەجایەبی لێ دەرچووبوو. بە ماندووبوونێکی زۆر سەی ئەسلان تێگەیشت کە لە شەوی تێچووندا حاڵی براژنەکەی باش نەبووە و ئێستا لە بەر هەر هۆیەک بێت براکەی لە زیندانە. سەی ئەسلان کە گوێی لە چیرۆکەکە بوو کەمێک سووربووەوە، تێناگەم سەی ئەسلان ئەوەی بە سووکایەتی زانی یان هەر خۆی زیرەکانە کردی بە بۆنەیەک، شتێک لە توندیی و توڕەیی خۆی نیشانبدات. ئێستا ئەو مامۆستاکەی جاران نەبوو،

خەریکبوو دەبوو بە کەسێک خاوەن لەشکر و سوپای خۆی. من نزیکترین کەس بووم لێوەی و ڕێک چاوم تێ بڕیبوو، سەیرمدەکرد و هەناسەم نەدەدا، هیچ کات پێشتر هێندە لە سەی ئەسلان نزیک نەبووبووم. لە نزیکەوە نیشانەی میهرەبانی تێدا نەبوو، جووتێ چاوی هێمنی بوو، بەلام کۆی دەموچاوی بەسەریەکەوە ئالۆز و ترسێن بوو، وەک مەتەلێک هاتە بەرچاوم، وەک ڕەسمێکی گەورە ڕۆحی کرابێت بە بەردا. چەندین جار لە دوورەوە دیبووم، کەچی قالبی لە خەیالمدا بەو جۆرە نەبوو، ئێستا وەک ئەوەبوو یەکەم جارم بێت ببینم. دایکم هەمیشە دەیگووت «پیاوی گەورە لە نزیکەوە جۆرێکی ترن»، بەلام چەند دەمپرسی «دایە، چ جۆرێکن؟» ئەو هیچی نەدەگووت.

سەی ئەسلان زۆر تێکچوو، هەستمکرد دەیەوێت جەهورە خڕە هەلگرێت و بە شەق بیکاتە دەرەوە. بەلام بێئەوەی خەندەکەی یەکەمجار لەسەر لێوێ بێت، گەڕانی خۆی بەسەر ڕیزەکاندا تەواوکرد. دواتر قسەیکرد ... زۆر قسەیکرد ... زۆر زۆر قسەیکرد. دەربارەی جەنگێکی گەورە کە مان و نەمانی لەسەرە، باسی لە جەنگاوەرێک کرد کە نابێت بلەرزێت یان بگری، باسی لە دەستەبژێرێک لە جەنگاوەران کرد کە دەتوانن بچن بۆ دۆزەخ و بگەڕێنەوە بۆ دیلاوار. لە کاتی قسەکانیدا جارجار بە ڕوویەکی گرژەوە سەیری جەهوری دەکرد. دەنگی لە مایکرۆفۆن و بلندگۆکانەوە زۆر بەرز و گوێ کەڕکەر دەگەیشتە ئێمە، ئێستا گڕییەک لە گەرویدا بوو کە لە دەنگی سروشتی خۆیدا نەبوو. بینیم ئەندازیارێکی دەنگ، لەسەر کۆمەلێک ئامێری سەیر کە تا ئەوکات چاوم بە کەرەستە و تفاقی وا نەکەوتبوو، سەرقالی ڕێکخستن و سافکردنی دەنگەکە بوون. بە کۆمەکی بلندگۆکان سروشتی ئەو دەنگەی دەگەیشتە گوێی ئێمە لە جاران ئەفسوناویی و کاریگەرتر بوو. دیار بوو سەی ئەسلان زۆر بۆی گرنگە دەنگی نێرانە دەربکەوێت. قسەکانی وەک هەمیشە کۆتاییەکی ئاگرینیان بوو، گەنجەکان وەک مەست

بووبن لە ناوبەیندا هوتافیان دەکێشا. بەکرە درێژی درۆزن بە دەنگە منگن و ناخۆشەکەی زیاد لە هەمووان سەی ئەسلانی دەپچڕان تا دروشم بدات و خرۆش بجولێنێت. بەر لەوەی هەموو شت کۆتایی بێت، سەی ئەسلان چاویلکەکەی داگرت و دەستێکی بەرزکردەوە و گووتی «شێرانی دیلاوار، گوێبگرن ... شێرانی دیلاوار، بوەستن و گوێ لە من بگرن. ئێوە قەبوولتانە مرۆڤی لاواز و گرینۆک لە ناوتاندا بێت؟». بێئەوەی کەس بیربکاتەوە هەموو بە یەک دەنگ هاوارمانکرد «نا سەرۆک قەبوولمان نییە». دەنگمان هێندە بلند و بەهێزبوو خەریکبوو بنمیچی هۆڵەکەی دەبرد بە ئاسماندا، چینکۆی جەمەلۆنەکان جیرە جیریان پێکەوتبوو. پرسی «قەبوولتانە جەنگاوەرەکانی دیلاوار، کە ناموس و شەرەفی ئەم نیشتیمانەیان بە ئەمانەت دەدەینە دەست لاواز بن؟». هەموو بە یەک دەنگ گووتمان «نا سەرۆک قەبوولمان نییە». «قەبوولتانە جەنگاوەرێکی دیلاواری کە سبەی دەبێت لە سەنگەرەکانی پێشەوە بەرەو ڕووی تۆپ و هاوەن و دۆشکا بوەستێتەوە. دڵێکی لاوازی پێوە بێت؟». هەموو بە یەک دەنگ گووتمان «نا نا سەرۆک قەبوولمان نییە». «قەبوولتانە کە چوونە سەنگەرەوە، هاوڕێکانتان لەرزۆک و گرینۆک بن؟»، ئەو جارە قیژەمان لە هەموو جارەکان بەرزتر بوو «نا.. نا... نا قەبوولمان نییە». «بۆیە چۆن سوارچاک و ئازا و بەجەرگەکان دەبێت پاداشت بکرێن، دەبێت لاواز و بێ دڵەکان سزا بدرێن، تا هەر کەسێکی لاوازمان تێدا بوو هەوڵبدات وەک ئێوە، کوڕە دڵسۆزەکانی من ئازا و بە جەرگ بێت». ئێمەش بە یەک دەنگ هاوارمانکرد «بەڵێ گەورەم. بەڵێ سەرۆک، بەڵێ ڕابەر». ئیتر ئەو سەییە کافرە فەرمانی بە جەهور کرد هەستێت، جەهور لە ترس و شەرمدا زەوی قووتی بدایە مەمنونی خودا دەبوو. حاڵێکی بوو هەموومان قاقا پێدەکەنین، دەگریا و موچڕکەشی پێدادەهات، نەدەیتوانی بەری فرمێسکی بگرێت، نە ترس و شەرمیش لە کۆڵی دەبوونەوە... ئێمە هەموو دەتریقاینەوە، من

کە لە تەنیشت جەهورەوە دانیشتبووم، نەبا یەکێک بڵێت ئەمە هاوڕێیەتی یاخود نزیکییەکی لەگەڵدا هەیە، لە هەمووان زیاتر قاقام لێدەدا. سەی ئەسلان فەرمانیدا جەهور بچێتە پێشەوە تا هەموو ببینین، من لە دڵەوە دەپاڕامەوە جەهور هیچ نەڵێت و بەزمەکەی تەواوبێت، لە قوتابخانەش بەزەیم بە جەهوردا دەهاتەوە، هەر کات تووشی ئەمجۆرە کێشانە دەبوو لە دڵی خۆمدا دەمگووت خودایە وابکە سووکی لێ بگوزەرێت. بەڵام هێشتا لە جێگاکەی خۆی نەجولابوو کە بەدەنگێکی گریاو گووتی «من بۆ براکەم دەگریم». جەهور هەرچی بگووتبایە هەموو دەماندایە قاقای پێکەنین. سەی ئەسلان بە دەنگێکی بەرز داوای لە جەهور کرد بێدەنگ بێت، کەمێک وەستا و لە پشت چاویلەکەکانییەوە سەیری هەموومانی کرد، هەستمکرد بەو سەیرکردنەی دەیەوێت بمانترسێنێت یان زیاتر بمانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بە قەڵەمەکەی دوو سێ جار کێشای بە تەختەکی بەردەمیدا، ئینجا وەک بیەوێت کەشوهەوای شوێنەکە بە چەند وشەیەک بگۆڕێت، گووتی «بوەستن، هێمن ببنەوە، ئێمە نامانەوێت سووکایەتی بە هیچ گەنجێکی دیلاوار بکەین، بەتایبەت گەر غیرەت و خواستی پاڵیان پێوەنابێت ببێت بە پاسەوانی ئەم خاکە پیرۆزە ... جەهوری سابونچی، تۆ جەنگاوەریت یان جەنگاوەر نیت؟ ». جەهور وەڵامێکی دایەوە کە نە من، نە سەی ئەسلان، نە هیچ کەس تێنەگەیشت، بەڵام سەیی بۆ ئەوەی درێژەی نەداتێ گووتی «باشە کە جەنگاوەری، بۆ وەها لاوازی؟». جەهور وەڵامێکی درێژیدایەوە کە من تەنیا لە دوو وشەی حاڵی بووم «براژنەکەم... زیندان». لەگەڵ ئەوەشدا سەی ئەسلان بە ڕووی خۆیدا نەهێنا و گووتی «کوڕم، دەبێت بزانیت کە مرۆڤی عاتیفی و لاواز لە ناو ئێمەدا جێگای نابێتەوە. من ناچارم تۆ لە جەنگاوەرەکان جیابکەمەوە. لەمڕۆوە جەنگاوەرە لاواز و عاتیفییەکان دەخرێنە ناو مەشقی تایبەتییەوە تا ئەوانیش وەک پۆلایان لێدێت... من ئاسنم دەوێت ئاسن، پۆلام دەوێت پۆلا... پاراستنی دیلاوار بە

گرینۆک و پیاوی فینگەفینگکەر ناکرێت». بێئەوەی بە خۆمان بزانین، وەک یەکێک قورمیشیکردبین، هەموو چەپڵەمان لێدا. سەی ئەسڵان ڕوویکردە دوو یاوەری نزیکی و گووتی «جەهور بەرن بۆ زیندان، تا شوێنێک بۆ مەشق و پەروەردە دەکەینەوە... بەس ئازاری نەدەن. دەبێت مشوری ئەوە بخۆن، جێگایەک بۆ مەشقی سەربازە لاواز و عاتیفییەکان بکرێتەوە. عاتیفە نەخۆشییە، وەک هەر نەخۆشییەکی تریش چارەی خۆی هەیە».

تا ئەوکاتە کەس نەیدەزانی باغەوانەکان زیندانی خۆیان هەیە. ئەرسەلانی موفتی جارێک بەدزییەوە بە منی گووت «ئاڵ موراد من خەبەرم هەیە، باغەوانەکان کاری بە سەی ئەسڵانەوە نییە، سەی ئەسڵان هەر قەرەقوزە، هیچ نییە، بوکەشوشەیەکی حیزە هێناویانە، ئەسڵی کار حاکمی عەسکەرییە، ئەسڵی کار حاکم یاسینە، ئەم هێزە هی ئەوە... سبەینێ دەبینیت چیمان پێ دەکەن». من بە پەلە دەستم خستە سەردەمی و گووتم «تۆ چی دەکەیت، هەر کەسێک گوێی لێمان بێت تیا دەچین... تۆ دەڵێیت چی». ئەو گووتی «من باوەڕم بە تۆیە، دەزانم تۆ قسەناکەیت، بەس لە منی وەرگرە، ئەو گەوادە، مامۆستایەکی حیزی مێژوو بووە، باوەڕبکە لە قەرەقوزێک زیاتر هیچی تر نییە». من بە چرپەوە پرسیم «بەڵام بۆ؟ بۆ؟ سەی ئەسڵان بەکاردەهێنن، بۆ؟ خۆیان سەربازیان نییە؟». ئەرسەلانیش بە چپەوە گووتی «تۆ بۆئەوەندە گێلی، ئەم پیاوە دەتوانێت کار لە مێشکی ئێمە بکات، دەزانێت بمانجوڵێنێت. دەزانێت ئەو ئاڵفە بخاتە بەردەممان کە پێی دەزەڕین. بەڵام حاکمی عەسکەری ئەو توانایەی نییە... حاکمی عەسکەریت بینیوە، دەڵێی پشیلەی نەخۆشە، هەر ناشزانێت قسەبکات. ئەم هیچ نییە، چی پێ بڵێن ئەوە دەکات... هەموو شتێکیان خستۆتە بەردەست تا ئەم گەنجانە ڕابهێنێت، بیانکات بە سەرباز، بەس ئەم دەتوانێت ئەوە بکات، نابینیت چ زمانبازێکە، چۆن خۆی خۆشەویست دەکات، کەسی تر ئەوەی بۆ ناکرێت. تۆزێک مێشکت بخەرە کار و گێل مەبە». من بەگومان بووم

لە ئەرسەلان، بە ترسەوە پرسیم «ها ... گەر وایە تۆ چی دەکەیت لێرە، تۆ بۆ هاتوویت». گووتی «تۆ من بە چی دەزانیت، وادەزانی بلیمەتم؟ . من وامدەزانی سەربەخۆ ئیشدەکات، وامدەزانی پیاوێکی ئازادە. کە چەکم هەڵگرت بڕوام پێی بوو. ئێستاش ناتوانم بچمە دەرێ. تازە قاچم کەوتۆتە گووەکەوە، ئاسان نییە بچمەدەرێ، خۆ گێل نیت، خۆت ئەو شتانە باش دەزانیت». ئەرسەلان وابوو، هەر شتێکی بۆ باس بکردیتایە، لە قسەکانیدا چەند جار لێی دەپرسیت «خۆ گێل نیت؟»، تۆش دەبوو بەجۆرێک وەلامبدەیتەوە و سەربلەقێنیت تا بیسەلمێنیت گێل نیت. لەوەدا لەسەر هەق بوو، ئەوەی لە ڕیزی باغەوانەکانی دیلاواردا بایە، تەنیا دوای پشکنینێکی وردی هەموو لەشی و دوای ڕاپۆرتێکی درێژ کە دەبوو چەندین دکتۆری جۆرا و جۆر لە دکتۆری لووتەوە تا دەگاتە دکتۆری تووکەبەر مۆرییکەن، ئەوسا دەیتوانی بە بەهانەی نەخۆشی ڕیزی باغەوانەکان جێبهێڵێت. کارێک وەها ئاڵۆزیان کردبوو هیچ کەس نەیدەتوانی توخنی بکەویت. لەو ڕۆژەشەوە کە «بنکەی مەشقی جەنگاوەرە لاواز و عاتیفییەکان»ی دانا، کە دواتر وەک زیندانێکی ترسناک و جێگایەکی دۆزەخ ئاسا باسیاندەکرد، هیچ کەس نەیدەوێرا باس لە دەستکێشانەوە بکات. بیانزانیبایە یەکێک شتێکی وەها بە دڵیدا ختورەیکردوە، دۆسییەیەکیان بۆ دەکردەوە و دەیاننارد بۆ ئەو بنکەیە، کە لە جێگایەکی دوور بوو لە نزیکی دەریاچەکان. ئەو کاتەی ئەرسەلان ئەو قسانەی بۆ کردم، سەی ئەسلان لەو پەڕی هێزیدا بوو، باغەوانەکان وەک لەشکرێکی سەربەخۆ کاریاندەکرد. هەموو دەمانزانی، هیچ کەسێک بێ پشتێکی گەورە ناتوانێت هێزی وا لە ماوەیەکی کەمدا دروستبکات، ئێستا ئێمە کوڕانی سەرەتا، گەنجەکانی غەفاریی وردە وردە لە ناو هێزێکی گەورەدا دەتواینەوە و وندەبووین. بەڵام بۆ مێژوو دەبێت بڵێم، ئەوەی دواتر منی لە مردن ڕزگارکرد، ئەو گفتوگۆ کورتەم بوو لەگەل ئەرسەلانی موفتی.

ئەوی ڕۆژ کە چووین بۆ پاریگای باسکەکە و جەهوریان زیندانکرد، دوای کۆبوونەوە گشتییەکە، دوای ئەوەی ئێمە جەنگاوەرە سادەکان گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان، سەی ئەسلان کۆبوونەوەیەکی تایبەتی بە سەرلقەکان کرد، ئەوانەی بەرپرسی شانە چەکدارەکان بوون. کە ئێمە ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵێ، بۆقبۆقیلەمان بینی پەشۆکاو و نارەحەت چاوەڕوانی دەست پێکردنی کۆبوونەوە تایبەتەکەی دەکرد. گەر بۆقبۆقیلە خەیاڵی لای خۆی نەبایە، قسەی دونیات بۆ بکردایە نەیدەبیست و گوێی لێ نەدەبوو. من لە بەردەرگاکە لێم پرسی «هێی بۆقبۆقیلە، سبەینێ سەعات چەند دەردەچین. کاتمان هەیە پێشدەرچوون، هێلەکێک نانمان لای نانکەرە بیهێنمەوە بۆ دایکم؟». مێشکی وەها پەرت و پەشێو بوو هەر گوێی لە من نەبوو. بۆقبۆقیلە دڵی خەبەری دابوو کە سەی ئەسلان پشکۆ سوورەی بۆ داغکردوە.

لە ناو هەموو گروپەکاندا کە بیست ڕۆژ بوو لە کوچە و شەقامی دیلاواردا ڕاوی دوژمنیان دەکرد، شانەی ئێمە هەم کەسی لە دوژمن نەکوشتبوو، هەم کەمترین ژمارە گومان لێ کراویشی گرتبوو. سەی ئەسلان کە ژمارەکانی هێزی ئێمەی بینیبوو، گڕی گرتبوو، لە هێمنی و ویقاری کۆنی دەرچووبوو، قژی خۆی ڕاکێشابوو، گووتبووی «تو فەخری عالەم، دیلاوار سەروبنی بە ناحەز و دوژمن تەنراوە. تۆ بۆقبۆقیلە کە بە حساب لە هەرە دڵسۆزەکانی خۆمیت، کە دوو ساڵ پێش ئێستە بێئەوەی کەس پێت بڵێت، هۆردویە نانت گرتە کۆڵ و تێشوویەکی بچوکت دا بە شانتدا و چوویت بۆ سەر ئەو سنوورانە تا ببینیت دوژمنان لە کوێوە دێن. بە چاوی خۆت هەموو شتێکت دیوە، هەر من دەزانم چەند خاکی دیلاوارت خۆشدەوێت، چەند سووری سەروەت و سامانی بپارێزرێت، چەند سووریت زمانە موبارەکەکەمان بە وشە و لەفزی پڕوپوچی هەندێ خێڵی خۆفرۆش و وەتەن فرۆش پیس نەبێت... پێمبڵێ ئا ئەمە چییە؟ ...

ئەم ژمارانە چیین جگە لە ئابڕوچوون. تۆ فەخری عالەم قسەبکە، ئەوە نزیکی مانگێکە شەو و ڕۆژ ئەو گەنجانە دینێت و دەبەیت، نانی دێلاواریان دەرخوارد دەدەیت، لە ئاوی زوڵاڵی دێلاوار دەخۆنەوە، لە هەوای پاکی ئەم وەتەنە هەڵدەمژن کە هەموو ئەم جیهانە هەوای وا پاکی تێدا نییە... بەس سێ کەستان بینیوە، گومانی دوژمنی لێبکەن. وای خاک بەسەر دێلاوار بۆ ڕۆڵەکانی... وای خاک بەسەر من بۆ خۆم و لەشکرم».

دواتر کە بۆقبۆقیلە بۆی دەگێڕاینەوە، هەموو دەماندایە قاقای پێبکەنین. ئەو بە تورەییەوە دەیگووت «دەمتان داخەن، هەمووی گۆبەندی کونی و قوونبدەی وەک ئێوەیە چۆتە ملی منیش». بۆقبۆقیلە بە ڕاستی نیگەران بوو. ئەرسەلانی موفتی گووتی «هێی بۆقبۆقیلە، تۆ سەیریت، کابرایەکی عەجایەبیت، خۆ گێل نیت. بتگووتبایە دوژمنمان نەبینیوە. خۆ کەس لەسەر پشتملی نەنوسراوە دوژمن. با گەر دەتوانێت خۆی دەزگایەک دروستبکات، دوژمن و کوڕی باشمان بۆ جیابکاتەوە». هەموو بە ترسەوە سەیری ئەرسەلانیان کرد، تا ئەوکات کەس بەو شێوەیە دەربارەی سەی ئەسڵان قسەی نەکردبوو. خۆی هەستیکرد خەتێکی سووری بڕیوە و کارێکی نەشیاوی کردوە. کەمێک سەری دانەواند و گووتی «ببورن برادەران، خۆ گێل نین، هەموو دەزانن من چەند سەرۆکم خۆشدەوێت. بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم نازانم چۆن بزانم کێ دوژمنە». بۆقبۆقیلە بۆئەوەی هەمووان هێوربکاتەوە و ئەرسەلان بپارێزێت، گووتی «لەمڕۆوە من بە هەر کەسێکم گووت ئەمە دوژمنە. تەواو، یەعنی دوژمنە، ئەوەشی ڕایکرد لە دەستمان دەم و دەست تەقەی لێدەکەن، ئەوەشی ڕابکات و بگیرێتەوە، بێ هیچ قسەیەک سەربڕین، ئەوەیان لەسەر خۆم. هیچ چارمان نییە، سەی ئەسڵان لەسەر هەقە، ئیشی لێمان دەوێت. لە مانگی داهاتووەوە هەموو موچە وەردەگرین. خۆ دەبێت خێرێکمان بۆ مەملەکەتەکە هەبێت».

لە ڕۆژی دوای کۆبوونەوەکەی سەی ئەسلاندا، وەک دەستێکی شەیتانی پیلانی بۆ هەموو شتێک کێشا بێت، باغەوانەکانی دیلاوار یەکەمین کوشتەی خۆیان دا. ڕووداوەکە بەوجۆرە بوو، لە گەڕەکێک لە خۆرهەڵاتی باشوور، چەند چەکدارێکی ئێمە کە لە بەردەم دوکانێکی بچوکدا شەربەت دەخۆنەوە، یەکێک لە ناکاو بە دەمانچەیەکەوە دەردەکەوێت و چەند فیشەکێک دەتەقێنێتە ناویان و سەرلقی هێزە چەکدارەکە کە ناوی ئەسیل گوڵنار بوو، دەکوژێت و خۆی دەربازدەبێت. دەم و دەست تەلەفزیۆن و ڕادیۆکانی دیلاوار هەموو بەرنامە ئاساییەکانیان وەستاند، بۆئەوەی هەواڵی کوشتنی سەرکردەیەکی سەربازیی گرنگ ڕابگەێنن. ئەو ڕۆژە بوو بە مەحشەر، ڕاڤەکار و توێژەر و پسپۆڕی سەربازی یەک بەدوای یەک دەهاتن و دەردەکەوتن، قسەیاندەکرد و دەڕۆیشتن، هەموو لەسەر یەک شت تەبابوون کە دوژمن لە ناو دیلاواردایە، دەستیان گەیشتۆتە ناخی شارەکە و بە ئاسانی سەرکردەکانمان دەکوژن. هەر هەمان شەو چەند نەناسراوێک تەقەیان لە ماشینێکی لیوا سەیف یوسفی کرد، جێگری یەکەمی حاکمی عەسکەری و شۆفێرەکەیان پێکا... ئیتر مەحشەری تەواو هەستا.

بەیانی بۆ ناشتنی تەرمی هەر دوو شەهیدەکە، ئێمە بە جلی تایبەتی پاسەوانەکانەوە، بە پەڕۆ وەنەوشەییەکەی خۆمانەوە کە دەبوو بە ناوچاوانەوە بیبەستین، چووین بۆ بە خاکسپاردنەکە. ناشتنی تەرمەکان ڕێپێوانێکی گەورەبوو، پێشتر لە ژیانمدا ئەوەندە خەڵکم پێکەوە نەبینیبوو، هەر نەشمدەزانی دیلاوار ئەو هەموو خەڵکەی تێدایە. زۆر کەس وێنەی پیاوکوژی ناو خەونەکەیان هەڵگرتبوو و نوسیبوویان « بیگرن و بە سزای خۆی بگەێنن» . ئێستا سەرنجم دەدا، خەڵک هەمووی بیریان چووبووەوە کە ئەوە وێنەی کەسێکە لە خەوندا بینیویانە... وێنەکان و ترسەکان بەجۆرێک دووبارەبووبوونەوە، سەرجەمی خەڵک وایاندەزانی ئەو پیاوە بە ڕاستی بوونی هەیە، وێنەی سەردەستەی تاقمێک چەتەیە یاخود سەرۆکی

مەمەدحەساره. ڕووداوەکان هەلیکی زێڕین بوون بۆ سەی ئەسلان تا ڕەوتی شتەکان بۆ ئەوپەڕی ڕابکێشێت و بیسەلمێنێت کە دوژمنانی دیلاوار زادەی خەون و خەیاڵ نین. لەسەر گۆڕی هەر دوو کوژراوەکە تێر گریا، پاڕایەوە لە خودا لە ڕێگای دیلاواردا شەهیدیبکات. گەرچی ژمارەیەکی زۆر لە پاسەوان گەمارۆیان دابوو، بەڵام زوو زوو دەیگووت خوایە نیعمەتی ئەوەمان بدەرێ لە پێناوی نیشتیماندا بمرین. لە قسەکانیدا خۆی وەک نوێنەری فەخامەتی فەرمانداری دیلاوار و حاکمی عەسکەری پیشاندا، بە قسەکانی هەموو خەڵکی هێنایە جۆش و خرۆش، بەر لە کۆتایی، خۆی دانەواند و چنگێک لە خۆڵی سەر گۆڕەکانی هەڵگرت و هاواریکرد «ژیانی ئێمە نرخی چییە، لە چاو نرخی ئەم خاکە موبارەکەدا ... ها، نرخی چییە». بە ئێمەیان گووت، دەمێک سەی ئەسلان لەسەر گۆڕەکان قسەی تەواوکرد، هوتاف بکێشین «درود بۆ تۆ ئەی سەرۆک، درود بۆ تۆ ئەی ڕابەر»، ئێمەش کە بینیمان سەی ئەسلان دەگری، هەموو لەوپەڕی جۆش و هەڵچوونی عاتیفیدا هاوارمانکرد «درود بۆ تۆ سەی ئەسلان. درود بۆ تۆ گەورەمان. درود بۆ تۆ ئەی ڕابەر. ئەی چراکەی دیلاوار. ئەی مامۆستای نەوەی نوێ» .

لە ڕۆژانی دواتردا، دۆزەخی ڕاستەقینە لە ژیانی ئێمەدا دەستی پێکرد. ڕۆژانە سێ هێندەی جاران گێچەڵمان بە خەڵک دەکرد، هەموو دەبایە چالاک بین، دەبایە خەڵک ڕابگرین، دەبایە وریابین، پشکنینی ورد بۆ ماشێن و پاس و بارهەڵگرەکان بکەین. زوو زوو خۆمان دەکرد بە کۆڵانەکاندا و بێ هیچ بڕیارێکی پێشوەخت هەر ماڵێک خەیاڵمان بیگرتبایە خۆمان پێدادەکرد و دەکەوتینە پشکنین. هەر کەسێک شێوەیمان بەدڵ نەبایە، قۆڵ بەستمان دەکرد و دەمانخستە پاسەکەوە. دانیشتووانی کوچە و گوزەری دیلاواری ڕەش ئیدی زۆر لێمان دەترسان. لە هێزەکەی ئێمەدا، بەکرە درێژی درۆزن نەبێت، هیچ کەسمان لەو باوەڕەدا نەبووین گەر یەکێک بکوژین ئیدی

ئارامتـر دەخەویـن. ڕۆژی یەکەمیـن کوشـتار، لەجێگایەکدا بوویـن پێیدەڵێـن فولکـەی دووەمـی باشـوور، نزیکـی مەخفەرێکـی کۆنـی پۆلیس، لەوێـدا پاشـماوەی زیندانێکـی زۆر کـۆن هەیـە، پێیدەڵێـن زیندانـی حەمەدپاشـای جافـەری. گەنجێکمـان گـرت خـۆی لـە نەخـۆش دەچـوو، لاوازێـک بـوو لەوانـەی خواردنـی خـراپ و ئاوهـەوای پیسـی ئـەم گەڕەکانـە دەیانپوکێنێتەوە و شـێوەی دەردەدارێکیـان پێدەبەخشـێت. پێسـتێکی داقرچـاو و چاوێکـی بـە قوڵاچـووی هەبـوو. هـەر «فازیڵـی سـەلە ئەفغانـی» دەسـتی بـۆ بـرد و ویسـتی بیپشـکنێت، وەک شـتێکی شـاردراوەی پێبێـت خـۆی ڕاپسـکان و بـەدەم قیژەیەکـی بەرزەوە کـە دڵـی سـەگیشـی دەتۆقانـد، ڕایکـرد. لەوانـە نەبـوو هێـز و تینێکـی زۆریـان هەبێت، لاواز و کـەم نەفـەس بـوو، بـەڵام لـە نـاکاو ترسـێکی بـۆ هـات و کردییـە قـاو و قیژێـک دەتگـووت کەروێشـکێکە و بـۆ سـەر بڕینـی دەبـەن. لـە نێـوان کوڕەکانـی ئێمـەدا وەرزشـەوان و لۆقنـی باشـمان بـوو. بەکـرە درێـژی درۆزن، هـەر لۆقێکـی بەقـەد ملـی زەرافەیـەک دەبـوو، لـە فرسـەتێکی ئاسـانیش دەگـەڕا خـۆی بکاتـە قارەمـان. گەنجەکـە نێچیرێکـی ئاسـان بـوو، بۆقبۆقیلـە و حەسـیبی پورخاتـوون و فازیڵـی سـەلە ئەفغانـی کـە هـەر سـێکیان بەشـی خۆیـان بـە هەڵمـەت بـوون، دوایکەوتـن. زۆری نەبـرد، چـۆن تـاژی پشـتملی کەروێشـکی برینـدار دەگرێـت، ئاوهـا لـە نـاو داروپـەردووی زیندانەکـەی حەمەدپاشـادا دەریانهێنـا. وەک پشـیلەی دووگیـان دەنگـی سـەیروسـەمەرەی لێدەهـات... سـاتێکی سـەخت بـوو بـۆ هەمووومـان، فەرمانمـان پێبـوو هەرچـی بـە تۆمەتـی سـەرپێچی و دوژمنکاری بگیرێـت دەبێـت سـەری لێبکرێتـەوە.

کوڕەکـە نـاوی ئـادەم بـوو، دوای دوو سـەعات لـە گرتنەکـەی. خەڵکێکـی زۆرمـان بـە زۆر لـە فولکەکەدا کۆکـردەوە. دەمزانـی بۆقبۆقیلە تووش بـووە و چارەی نییـە و دەبێت بـەو کـارە هەسـتێت. بۆقـی دەترسـا، بـەڵام چمـا چـاری هەبـوو، هـەر دەبـوو ئـەو ترسـە لـە خـۆی دەربـکات و نـاوی خـودای لێبهێنێت و ئیشـی خـۆی بـکات. چـۆن دایکـم قەلەموونـی جەژنـی سـەردەبڕی، بۆقیـل

قاچی خستە سەر باڵە بەستراوەکانی ئادەم، مەجیدی مریەمیش کە لە هەمووومان قەڵەو و کێشدارتر بوو لەسەر قاچەکانی دانیشت. دڵنیابووم بۆقبۆقیلە زۆر نارەحەتە، سەیری دەموچاویم کرد، خەریکبوو دەگریا. بۆ بەدبەختی لەو کاتەدا، هەتاویش وەک سوژنی ئاگر دەهات و دەیدا لە ناوچاوی، ئەوە هێندەی تر تورە و نارەحەتی دەکرد. بەکرە درێژی درۆزن زوو زوو دەیگووت «بۆقی گیان.. بۆقی گیان. گەر تۆ ناتوانیت بیدە بە من، بیدە بە من». بەلام سەی ئەسلان پێیگووتبوو « جەنگاوەر دەبێت چاو لە دوژمن غافڵ نەکات، دوژمن وەک سەگ پەتبکات و بیخاتە ژێر پێی و سەری خۆی و ئەژدادی پانبکاتەوە. گەر بۆت ناکرێت مۆرە و تەختەی خۆت کۆبکەرەوە و با بەکری هاورێت بکەمە سەردەستە». ئەو قسانە زۆر ئازاریان دەدا، ئەویش هەر یەکێک بوو لە ئێمە، نەیدەویست کارێکی لەوجۆرە بکات، حەزی لەوە نەبوو، کەس وەک بزن راخات و چەقۆ بخاتە ملی... بەلام ئێستا کار لە کار ترزابوو، گەر دەستی بەردایە و کێردەکەی بخستایە مستی بەکرە درێژ، لە ناو باغەواناندا ئابرووی دەچوو، قەترەیەک ناموسی بۆ نەدەمایەوە و سەی ئەسلانیش لە سەردەستەیی دەخست و خوا دەزانێت چی تری بەسەر دەهێنا و بە چ شێوەیەکی تریش ترۆیدەکرد.

ئەو چرکەساتەم بۆ هەتاهەتایە لەسەری خۆمدا تۆمارکرد. بۆنی فولکەکە، رەنگەکان، روخساری ئەوانەی لەوێ بوون، نیگای ترساو و شپرزەی خەڵکی ئەو گەرەکە، بۆنی هەندێ عەتری هەرزان کە چەند ژن و کچێک دابوویان لە خۆیان، بۆی گەنیوی هەندێ قاشە شووتی ترشاو لە دەوری تەنەکەیەکی زبڵ، رەنگی ئاسمان کە ئەگەرچی هەور نەبوو، بەلام لەبەرچاوی من خۆڵەمێشی دەینواند، گەرچی هەتاو بوو، بەلام لای من مات و خەفە دەردەکەوت، هەندێ باڵندەی سەرسام کە هەر یەکەیان لە گۆشەیەکەوە سەیریاندەکردین، چەند منداڵێکی پیس و جل دراو کە بێئەوەی لە هیچ تێبگەن لە ریزی پێشەوە وەستابوون و وەک ئێمە ئامادەی

بەڕێوەچوونی دیمەنەکە بوون. کە بۆقبۆقیلە چەقۆکەی خستە سەر ملی نێچیرەکە، دەنگێکی کپ و خنکاوی لێوەهات، هەستمکرد هاوارکردن لەو جۆرە ساتانەدا تۆزێک یارمەتی کوژراوەکە بدات ترس و ئازاری خۆی لە بیربچێتەوە. من چاوم بڕیبووە دەستی بۆقبۆقیلە و ملی ئادەم، هەستمدەکرد دەمارەکانی ملی بەجۆرێکی سەیر لێدەدەن، هێندە خێرا و بەهێز کە پاڵ بە دەستی بۆقبۆقیلەوە دەنێن بۆ دواوە. بە عینادێکی بێوێنەوە چاوی کردبووەوە، نەمدەزانی ئاخۆ هیچ دەبینێت یان نا، لەو ساتەدا ئارەزوویەکی سەیرم لە خۆمدا هەست پێدەکرد، لە نزیکەوە بڕوانم ... زۆر لە نزیکەوە ... زۆر زۆر، بەجۆرێک گەر هاتوو چەقۆکەی دەستی بۆقیل گۆشتی گەردنی ئەوی بڕی و خوێنپژا، تنۆکەکانی بەر چاویلکەکەم بکەون. هەستێکی سەیر و تاریک بوو بۆ ماوەیەکی کورت دایگرتم. هەر زوو موچڕکێکم پێداهات و ترسێکی نهێنی کەوتە جەستەم، بینیم بۆقبۆقیلە بە هەموو هێزی خۆی نیشتە سەر باڵی نێچیرەکە و چاوی نوقاند و لە ژێر لێوییەوە شتێکی گووت و بە زەبرێکی خێرا و یەک کەڕەتە کێردەکەی بە ملی گەنجەکەدا هێنا کە قرغەیەکی نەرم و خنکاو نەبێت دەنگێکی تری لێوە نەهات. خوێن بەجۆرێکی دڕندانە فوارەیکرد، بازنەی پێشەوەی بینەران هەموو هەنگاوێک کشانە دواوە تا پریشکی خوێن پیسیان نەکات. دیمەنی خوێنەکە وایکرد موچڕکە لە دوای موچڕکە بە لەشمدا بێت، خوێنێک بوو تا دەهات خەستتر و خەستتر لە قوڕگی نێچیرەکەوە دەهاتەدەرێ. بۆئەوەی سەیری خەڵکەکە بکەم، چاوم لە بکوژ و کوژراوەکە وەرگێڕا و کەوتمە سەیری حەشاماتەکە. کەس وەک من نەپەشۆکابوو، هەموو وەک ئەوەی دیمەنێکی دووبارە ببینن کە هیچی سەیر و سەرنجڕاکێشی تێدا نییە دەیانڕوانی، چاویان ئەو ترس و سەرسامییەی تێدا نەبوو کە لە چاوی مندا بوو. هەتا ژن و منداڵەکان ساردتر و بێترستر لە من نیگایاندەکرد. من لەخۆم دەپرسی ئاڵ موراد تۆ لە کوێدا ژیاویت، بە ڕاست ئەمە هەر ئەو شارەی خۆتە، هەر ئەو

شـوێنەی جارانـە، خەڵـک هـەر هەمـان خەڵکن؟ ئـەوەی ئـەو ڕۆژە منـی ترساند ئەو ساردی و بێباکی و بێ خەیاڵییە بوو کە لە سەر ڕوخساری خەڵک بوو... ساردی و بێباکی و بێ خەیاڵییەک کە هەر زوو لە ڕۆحی منیشدا سەوزبوون.

مەجییە قەڵەو، وەها جوڵەی لە نێچیرەکە بڕیبوو تا دوا گوژمی خوێن لەقەفرتییەکی ڕاحەتی نەکرد. من زۆر دەترسام، بەڵام دەمزانی ترس بە ڕوخسارمەوە دەربکەوێت، بەکرە درێژی درۆزن کارێکدەکات بمبەن بۆ ئۆردوگای لاوازەکان. من ئامادەبووم بمکوژن و نەچمەوە بۆ هیچ مەکتەبێکی مەشق و پەروەردە. گەرچی ماسولکەکانم کرژ و دەماری جەستەم هەمووی ڕەق بووبوو، بەڵام هەوڵمدەدا پێمەوە دیار نەبێت کە چ قێز و ترسێک نیشتوتە سەر دڵم.

کشانەوەیەکی ئاسایی لە مەیدانەکە کشامەوە، خۆشحاڵ بووم کە کەس پێی نەگووتم لاشەی کوژراوەکە هەڵگرم و بیپێچمەوە. تەمێکی سپی لەسەرچاوم نیشتبوو، هەستمکرد فشاری خوێنم دابەزیوە و ناتوانم بە ڕوونی ببینم، بەڵام خۆم گرت و لە ناو ئەو بینەرانەدا کە بێدەنگ مەیدانەکەیان چۆڵدەکرد، خۆم لە چاوی هاوڕێکانم شاردەوە. نەمدەویست کەس لە نزیکەوە ڕەنگی زەرد و زمانی وشک و چاوی لە گلێنە پەڕیووم ببینێت، لە دڵی خۆمدا گووتم «ئەی خوای گەورە کە من و دیلاوار و ئەم هەموو بەشەرانەی ترت دروستکردوە، کەس من لەم حاڵەدا نەبینێت». وام هەستدەکرد ئێستا ڕەنگی من وەک پێستی زەردی کوژراوەکەیە، چاوم وەک چاوی سەرسام و دەرپەڕیوی ئەوە. ئێمە هەموومان گەنج بووین، هەموومان یەکەم جار بوو ئاوا لە نزیکەوە لاشە ببینین. هەموو وەک خۆ فریودانێک دەمانەویست وادەرنەکەوین کە کاری وا لە ئێمە ناوەشێتەوە و کوشتن نامۆیە پێمان. هەندێ لە کوڕەکان بۆ ئەوەی بەهێز و نەترس

دەرکەون چوونە سەر لاشەکە. بۆقبۆقیلە هێشتا چەقۆ خوێناوییەکەی بەدەستەوە بوو، هێشتا چاوی نوقاندبوو، هێشتا عارەقی لێ دەتکا... من بینیم کە بیئەوەی هەتا یەکجاریش سەیری لاشەکە بکات پشتی تێکرد و بە کوڕەکانی گووت «بیپێچنەوە و بیخەنە پاسەکەوە». دڵنیابووم دەیەوێت بداتە پرمەی گریان... بەڵام لە بری ئەو پرمەیە، چاوی نوقاند و بە فشارێکی زۆرەوە لێوی خۆی گەست. ویستم باوەشی پێدا بکەم و بڵێم «بۆقبۆقیلە گیان، خەتای تۆ نییە». بەڵام نەموێرا کاری وابکەم... نەمتوانی، سەرم گێژی دەخوارد و هەموو مەیدانەکە لە پێشچاوم دەخولایەوە و لە دڵەوە هێڵنجی توندم دەهاتێ.

جەستە و سەرە براوەکەیان بە جیا خستە ناو پاسەکەوە. بوونی لاشەیەکی بێسەر لە پاسەکەدا وایدەکرد موچڕک بە لەشمدا بێت، یەکەم جارم بوو لەگەڵ لاشەیەکی بێسەردا لە پاسێکدا بە دێلاواردا بگەڕێم. ناو پاسەکە کش و مات بوو، هیچ کەسێکمان قسەمان نەکرد، بۆقبۆقیلە لە هەموومان غەمگینتر بوو. ئێستا دڵنیابووین هەرچییەک پێشتر بینیومانە و تیا ژیاوین هەمووی یاری بووە، ژیانی ڕاستەقینە و سەخت لە ئێستاوە دەست پێدەکات. دەبوو لاشەکە ببەین و تەسلیمی پیاوێکی بکەین کە پێیان دەگووت «مردوشۆری لەشکر». پیاوێک بوو قۆنتەراتی لەگەڵ باغەوانەکاندا بەستبوو، لاشەکان لە گۆڕستانێکی تایبەتیدا بشارێتەوە. مردوشۆرێکی پیر بوو، لەوانەی کەس ناتوانێت تەمەنیان بە ڕوونی بزانێت، زۆر پیر دیاربوو، هەستمدەکرد لە زەمانی قابیل و هابیلەوە تا ئەمڕۆ هەر مردوشۆر بووە.

من کە گەیشتمەوە ماڵێ بیئەوەی هیچ شتێک بە دایکم بڵێم چوومە توالێتەکەوە و ڕشامەوە، لە نیوەڕۆ وە هەر چیم خواردبوو بە یەکجار هەموویم هێنایەوە، بەڵام جگە لەوە هەم تام بوو هەم سەرئێشە و هەم قێزێکی بێسنوور لە خۆم و لەو مەملەکەتە.

# ٣١

حەمامەکانی سەنتەرەکە زۆر بێدەنگن، بەجۆرێک کاتێک من و زەهاو بە نەعلەکانمانەوە دەڕۆین، دەنگی پێمان بە جۆرێکی سەیر لە فەزای شوێنەکەدا دەنگدەداتەوە. شەوێکی درەنگە، هەموو شت خامۆشە، سەعاتێک لەوەوبەر گڵۆپی قاوشەکانم کوژاندەوە و نەخۆشەکان خەوتن، تەنیا گڵۆپی بەشی دەرمان و بەشی پەروەردە و تەمیکردن دەسووتێن. من و زەهاو دوای ڕۆژێکی جەنجاڵ دەچین بۆ دوشگرتن. تەنیا شەو درەنگان خۆمان دەشۆین. بە ڕۆژ ئێرە زۆر جەنجاڵە، ژوورە گەرمەکان بەرناکەون و نەخۆشەکان لەسەر سەرەی خۆشتن بەشەڕ دێن. من هەفتەی سێ جار لە حەمامەکانی سەنتەرەکەدا خۆم دەشۆم. تاکە جێگایەکی زۆر باش و پاک لە هەموو سەنتەرەکەدا حەمامەکانە، مامە سیام زۆر جەختدەکات بەردەوام پاک بن. من بەردەوام بە ئاوی سارد دوش دەگرم، هەموو گیانم دێتە لەرز و دانەچۆقە دەمگرێت، بەڵام دەستبەردار نیم، ئەو وریایی و هێز و زیندوێتییەی دواتر دەگەڕێتە لەشم، وادەکەن بەرگەی ساردیی ئاوەکە بگرم. تەنیا کاتێک زەهاو تێیدا پێدەکەنێت ئەو کاتەیە، دەمێک لە ژووری خۆیەوە گوێی لێیە من لە ژێر دوشەکەدا دەلەرزم و هاواردەکەم. دوای خۆشتن لە کاتی خۆوشککردنەوە و خۆ گۆڕیندا لە زەهاو دەپرسم «دەی بڵێ،

بۆ وا پێدەکەنیت، دەمێک من لە سەرمادا دەلەرزم، تۆ شەرمت نییە پێم پێدەکەنیت؟». بە ڕوویەکی گەشەوە کە کەمجار دەیبینم دەڵێت «منیش دەزانم چۆنە، ئەو سەرمایەم بینیوە». من دەڵێم «ئەها. ئەو کاتەی لە چیا قاچاغبەر بوویت. لەوانەیە ئەوکات بە بەفریش خۆت شت بێت». سەری بادەدا و دەڵێت «نا، بە بەفر ناتوانم خۆم بشۆم. جارجار خەوێک دەبینم، بارانێکی سارد دەبارێت، کە هەڵدەستم هەموو بەیەنم دەلەرزێت، وەک ئەوەیە بە ئاوی سارد خۆم شتبێت». لێی دەپرسم «بارانی چی...؟». «بارانێکە پێش ئەوکاتە دەبارێت کە شتێکم لێ دەقەومێت». من پانتۆڵەکەم هەڵدەکێشم و قایشەکەم دەبەستم و جارێکی تر توند خاولییەکە بە سەرمدا دەهێنمەوە و دەڵێم «باوەڕ بە خورافات مەکە». ئەو وەستاوە و سەیرمدەکات، دەنگی دەگۆڕێت و ڕوخساری وەک خۆی لێدێتەوە «خورافات نییە... وایە». بێئەوەی خۆم دەربخەم کە قسەکانی سەیر و گرنگن بۆم، دەستدەبەم بۆ بلوسەکەم، دەیتەکێنم، لە بەر ئاوێنەکەدا سەیری ڕیشم دەکەم، بزانم پێویستی بەتاشینە یاخود نا، بەبێباکی دەڵێم «یەعنی چی وایە؟». «پێش ئەوەی شتێک بێت من ئەو هەورانە دەبینم». پێدەکەنم، بلوسەکەم دەپۆشم و دەڵێم «وای یائەڵا. شتی وا هەر نابێت». دەڵێت «دەبێت، پێش ئەوەی شتێکی ناخۆش ڕوبدات ئەو هەورانە دێنە خەوم. هەورێکە دایم لە خەومدایە، بەڵام پێش ئەوەی شتێک بقەومێت دەبارێت». ئێستا ترسێک لە دەنگی زەهاودایە، من لێی دەپرسم «شتی وەک چۆن؟ چی بقەومێت؟ ... پێش ئەوەی چی بقەومێت؟». زەهاو سەری دادەنەوێنێت و دەڵێت «شتی خراپ، شتی زۆر خراپ، وەک مردن، وەک کۆچ، وەک ونبوون، وەک سەرلێشێوان یان وەک یەکێک بیەوێت بتکوژێت». من سەیریدەکەم و هیچ ناڵێم ... دڵنیام شتێک ئەم کوڕە بە بارانەوە دەبەستێتەوە.

کاتـی خـەو لەسـەر جێگاکـەی خـۆم درێژدەبـم، زەهاویـش لەسـەر دۆشـەکێک لـە پاڵ دیوارەکـەدا. مـن چـاو دەنوقێنـم و وردە وردە خـەو لەگەڵ خۆیدا دەمبات... چەندیـن مانگـە خەونـی سـەیر سـەیر دەبینـم، هەندێکیـان لـە دەفتـەری خەونەکانـدا تۆماردەکـەم و هەندێکـم بیردەچنـەوە، زۆربەیـان خەونـی بێسـەروبەرەن. بـەردەوام خەیاڵـم لای ئـەو ڕۆژانەیـە کـە دەمتوانـی خەونـی ئەوانـی تـر ببینـم... بیـری ئـەو ڕۆژانـە دەکـەم، دەمەوێـت ئـەو توانایـەم بـۆ بێتـەوە، دەمەوێـت چـاو لێـک بنێـم و بتوانـم ئـەو خەونانـە ببینـم کـە دێـلاوار دەهەژێنێـت، دەمەوێـت بچمـە سـەری نەخۆشـەکانەوە و بزانـم چ جـۆرە خەونێـک دەبینـن، بـەڵام ناتوانـم... هێنـدە چاوەڕوانـی ئـەو خەونانـەم کـردوە، ئیتـر وەڕز بـووم. بـەر لـەوەی خـەو بمباتـەوە، سـەیری حەوشـی سـەنتەرەکە دەکـەم، جگـە لـە بەشـی دەرمـان، هەمـوو بەشـەکانی دی چرایـان خامۆشـە... چـاو لێکدەنێـم و دەیکەمـەوە، تەنیـا شـتێک لـە خەیاڵمـدا بێـت هەورەکانـن، هەورەکانـی ئـەو. ئـاوڕی لێدەدەمـەوە و دەیبینـم ئـارام خەوتـووە... دەمەوێـت بـۆی بگریـم، دەترسـم نەتوانـم بیپارێـزم، دەترسـم ڕۆژێـک مەترسـییەکان وەها گەورەببـن، ئیـدی لـە دەسـتی بـدەم و تـا مـردن وەک شـەرمەزارێک بژیـم.

ئێستاش بە گومانم لە خۆم... من کێم بتوانم یەکێکی تر بپارێزم.

ئـەو شـەوەش لـە سـاتێکدا چوومـە قوولایـی خـەوەوە. هێنـدەم ئاگا لێیـە کـە خـۆم لـە نـاو کێڵگەیەکـی زەرددا دەبینمـەوە، دەزانـم پێشـتر خەونـم بـە کێڵگـەی وەهـا زەردەوە نەبینیـوە. لـە خەونەکەمـدا دەڵێـم «ئەمـە خەونـی مـن نییـە». بـەڵام بێئـەوەی قسـەکانم کاریگەرییەکیـان بێـت، بـەردەوام زەمینێکـی بەریـن و فـراوان و زەرد دەبینـم. زەوی وەک لـە دەسـتکردی شـەیتان بێـت بێڕەحمانـە درێژدەبێتـەوە، هەمیشـە کێڵگـەی زەرد و پێدەشـتی زەرد دووبارەدەبنـەوە، هەسـت بـە بایەکـی گـەرم دەکـەم. لەخەوەکەمـدا زەهـاو دەبینـم، بـە ڕێگایەکـی

درێژدا دەڕوات... خۆر بەسەر سەریەوەیەتی، هیچ کات ئاوڕ ناداتەوە ببینم کێیە، بەڵام دەزانم خۆیەتی، تا خۆر ئاوا دەبێت دەڕوات. هەمیشە بە تەنیایە، بە تەنیایە و هیچی دی. خەونەکەی تەنیا ڕۆیشتنێکی درێژ و ناکۆتایە، بە زەمینێکدا نە ئادەمیزادی تێدایە نە باڵندە ... کێڵگەیەک تەنیا درێژدەبێتەوە، نەدەگاتە جێگایەک و نەدەگاتە مردنیش.

من چاودەکەمەوە و نیگام بەر تاریکییەکی ئەستوور دەکەوێت، هەستدەکەم بەسەختی هەناسەم بۆ دەدرێت. ڕادەبم و سەرم بە جۆرێکی سەیر ژاندەکات، هەر کاتێک خەونی یەکێکی تر ببینم، تووشی ئەوجۆرە سەرئێشەیە دەبم. سەیری حەوشی گەوری سەنتەرەکە دەکەم، هەموو چراکان خامۆشن، نازانم کاتژمێر چەندە... دڵنیام خەونی یەکێکی ترم بینیوە... دڵنیام لە خەونێکی زەهاودا بووم... هەستدەکەم هەموو لەشم نیشتۆتە سەر عارەق. گەرچی چەند وەختە تکا لە خودا دەکەم ئەو توانایەم بداتەوە، ئێستا کە دووبارە ئەو هێزە لەخۆمدا دەبینم، دەترسم... دەمەوێت زەهاو هەستێنم و خەونەکەی بۆ بگێڕمەوە، بەڵام ناتوانم... زۆر ماندووم، ڕادەکشێم و چاوان لێک دەنێم و دووبارە دەخەومەوە، ئەمجارە جگە لە شەوەزەنگ و زوڵمەت هیچی دی نییە ببینم.

# ٣٢

سەعات نۆی بەیانییە، ژەنراڵ مەحمودی قەرەقازانی بە ژمارەیەکی زۆر لە پاسەوانەوە لە مەیدانی گەورەدا وەستاوە، لە لای ڕاستییەوەیە مامە سیام و جاهدار چاوەڕێدەکەن، لە لای چەپیشەوە نەقیب نەجات. لە پشتی ئەوانەوە بێدەنگ وەستاوم و لە تەواوی مەیدانەکە دەڕوانم. گوێم لێیە ژەنراڵ بە دەنگە ناخۆشەکەی خۆی دەڵێت «دوێنێ دوو هێزی گەورەمان لە زیندانەکانەوە ڕەوانەی چیا کردوە، شوێنی ئیشکردنی زیندانەکان لە جێگای عاسیدایە، تا نەتوانن هەڵبێن، هێزێکی پاسەوانی گەورەشم خستۆتە تەکیان». مامە سیام و دکتۆر جاهدار دوو خەندەی گەورەی بۆ دەگرن و بە هەمان ڕووی خۆشەوە ئاوڕ لە دواوە دەدەنەوە. چاودێرەکان پۆل پۆل و بە پێی نەزمێکی دیاریکراو نەخۆشەکان ڕیزدەکەن. ژەنراڵ زۆر زووتر لە وادەی خۆی گەیشتووە، دەبوو کاتژمێری یازدە لێرەبایە، هەموو بێئاگا بووین کە ژەنراڵ و هێزەکەی دوو سەعات زووتر لە مەیدانەکەدا دابەزین. ئێستا بە فەرمانی مامە سیام، هەموو خەریکی ڕیزگرتن و خۆئامادەکردنن. یەکێک لە بڵندگۆکانەوە دووبارە «دیلاوار ئەی سەر زەمینی شێران» لێدەدات. زۆری دەوێت تا هەموو ڕیزەکان ڕێکدەبن.

لەو ماوەیەدا نەقیب یوکسەل و مامم و ژەنراڵ قەرەقازانی سەیری لیستەکان دەکەن، لە ناکاو مامم بانگ لە من دەکات و دەڵێت «بەڵێ

جەنابی ژەنراڵ، پێتان دەناسێنم، ڕێنواری زەریاواری، نوێنەری پزیشکی و بەرپرسی باری دەروونی ئیشکەرەکان. ئەم نوێنەری سەنتەری ئێمەیە، هەموو زستانیش لەگەڵ هێزەکەدا دەمێنێتەوە». ژەنراڵ سەیرمدەکات و زەردەخەنەیەک دەگرێت و دەڵێت «زۆر باشە، کەسێکی واپێویستە، نەقیب نەجات و هێزێکی بچوکیش ، نزیکی هەشت سەرباز، لەوێدەبن. حسابی ئەوەمان کردوە کە هەمیشە دووانیان دەچنە مەرەخەسی، بەو پێیە بە نەقیبەوە هێشتا حەوت چەکدار لەگەڵ هێزەکەدا دەمێننەوە، جگە لەوان، لە چەندین جێگادا هێزێکی سەربازیمان بڵاوەپێکردوە کە تەواوی شوێنە گرنگەکانیان گرتووە. دەبێت هەموو پاییز و زستان لە ئیشدا بن. دەبێت بەر لە کۆتایی زستان جێگای حەوانەوەی هێزێکی چەند هەزار کەسی لە بەردەستماندا بێت، کات لە قازانجی ئێمە نییە». دکتۆر جاهدار بە فزولی کەسێکەوە کە سەری لە پلان و نەخشەی سەربازیدا سپیکردوە، سەری بەسەر نەخشەکاندا شۆڕکردبووەوە. مامە سیام گووتی «جەنابی ژەنراڵ، من دەڵێم با تا دوو مانگ ئەمانە ئیشبکەن، دواتر گەر زانیمان کارەکە لە کاتی خۆیدا تەواو نابێت، ئەوە هەموو ئامادەین بێین و کاربکەین، من خۆشم ئامادەم، کەس و کاریشمان دەهێنین. بەڵام ئەمانە باشترین کەسانێکن کە هەمانن، نەقیب خۆی دوای چاودێرییەکی ورد و ڕۆژانە هەڵیبژاردون». ژەنراڵ بە خەندەیەکەوە بە مامە سیامی گووت «نا جەنابی دکتۆر، ئێوەمان لێرە پێویستە، ئەو شوێنە مەترسی خۆی هەیە، لە ژێر حوکمی قەناس و تۆپخانەی دوژمندایە، یەکەیەکی تۆپهاوێژی بچوکمان لەو نزیکانە داناوە بۆ پاراستنیان. بەڵام دڵنیام ژەنراڵ ماهیر هەموو هەوڵێک دەدات نەهێڵێت بە ئاسانی لەو ناوچانەدا هێڵی بەرگری و پەرژینی سەربازیی باش دروستبکەین، ژەنراڵ ماهیر سەرسەختترین ئەفسەری دوژمنە، لەو لێزان و شارەزاتریان نییە، لە بەر گرنگی ناوچەکە کاری پاراستنی هەموو ئەو هەرێمە بەو سپێردراوە». ئینجا سەری بەرزکردەوە

و بە منی گووت «پاراستنی هێزی مەعنەوی ئەم ئیشکەرانە بەشێکە لە واجباتی ئێوە، هیوادارم بزانیت لەوێ هەمووتان سەربازن، گەر بگیرێن دوژمن وەکو یەک ڕەفتار لەگەڵ تۆ و نەقیب نەجاتدا دەکات».

ڕیزبەستنی نەخۆشەکان وردە وردە تەواو دەبێت. لە ناکاو هەست بە رقێکی گەورە دەکەم بەرامبەر مامم، رقێک هیچ کات پێشتر بەمجۆرە هەستم پێ نەکردوە. لە ناکاو هەستدەکەم هەر یەک لە دکتۆر جاهدار و مامم زیادن، هەردووکیان زیادن، دیلاوار لەم سەرباز و لەم پیاوە نەخۆشانە دروستبووە، کەسانی وەک مامم و دکتۆر جاهدار چیین و وەزیفەیان چییە؟ . بەلام هاوکات هەستێکی دژیش دێتە دەروونمەوە. بە بێزارییەوە بە خۆم دەڵێم «ڕێنواری زەریاواری، ئەوەتەی هەیت رقت لە هەموو کەسێکی بنەماڵەکەی خۆتە، بەردەوام بۆ بەهانەی پوچ دەگەڕێیت، ئەم رقەی خۆت خاڵیبکەیتەوە ... مامە سیا دەتوانێت چی بکات، گەر ئەو ئەم نەخۆشانەی لێرە کۆنەکردبایەتەوە، دوور نەبوو ئێستا کارەساتی گەورەتر بقەومایە». بەلام ئەو هەستی کینەیەم هێور نابێتەوە، دەنگێک لە دەروونمدا دەیگووت، مامت نیازێتی بتنێرێت بۆ چیاکان تا هەرگیز نەگەڕێیتەوە. وەک پلانێک وایە لە ناو خێزانەکەتدا کێشاویانە، وەک تۆڕێکە کە باوک و مام و برا و خوشکەکانت چنیویانە تا لە شاخەکان بمریت و نەگەڕێیتەوە. هەستێکی بێمانا، بەلام قووڵ و تۆفانئاسا دامدەگرێت «غەریبی دیلاوار»... هێشتا لە جێگای خۆمم، هێشتا سەنتەری چارەسەرییەکەم جێ نەهێشتووە، کەچی بیری دیلاوار دەکەم.

نەقیب نەجات بە چاوە شینەکانی سەیری مەیدانەکە دەکات، بە دەست بە چاودێرەکان دەڵێت هەندێ لە ڕیزە نارێک و خوارەکان ڕاستبکەنەوە. نەخۆشەکان دوای ماوەیەک لە کارکردنی سەخت، هەندێکیان تێکشکاو و لێکەوتە دەردەکەون، هەندێکیشیان بە پێچەوانەوە لە باڵا و بۆدییەکی تازەدا،

چاپوک و زیت دەنوێنن. مامم و جاهدار هەستدەکەن تیورەکەیان سەبارەت بە «چاککردنەوە بە شۆکی دوژمن» خەریکە جێگای خۆی دەگرێت. ئیش و چاوەڕوانکردنی دوژمن کاریگەرییەکی پۆزەتیڤیان لەسەر زۆربەی نەخۆشەکان جێهێشتووە. دەمەوێت لە مامم بپرسم «بۆ ئەو نەخۆشانە بەرەو باش بوون چوون و ڕۆحیان ئارام بۆتەوە، ڕەوانەی ماڵەوە ناکرێن؟». زۆرینەی ئەوانەی ڕۆژێک بە هۆی ترسێکەوە هاتوونەتە ئێرە، ئێستا کەمتر خەون دەبینن و هێور و دڵارامتر دیارن. بەڵام هەموو قسەکانی ئەوم دەکەوێتەوە یاد؛ ئێرە بیمارستان نییە، ئێرە جێگای چارەسەری نییە، ئێرە شوێنی هەڵگرتنی جەستەکانە بۆ ڕۆژێک بە کەڵک بێن، بۆ جەنگێک، بۆ ئیشێک، بۆ تاقیکردنەوەیەک... هەمووومان لێرە تەنیا کەرەستەی خاوین... ئێمە لەم شێتخانەیەدا، دیلەکان لە زینداندا، کەم ئەندامەکان لە سەنتەری کەم ئەندامان ... هەمووومان دەبێت چاوەڕوانی ڕۆژێک و ساتێک و جێگایەک بین، جەستەمان بە جۆرێک لە جۆرەکان، سوودێکی بۆ دێلاوار هەبێت و بە کەڵکی وەزیفەیەک بێت.

نەقیب یوکسەل زۆر بە وردی بەسەر ناوەکاندا دەچێتەوە، بە ئاماژەیەکی دەستی من بانگدەکاتە تەنیشت خۆیەوە. کۆپییەکی ئەو لیستەی کە بەدەست خۆیەوەیەتی دەیداتە منیش، لیستێکی تێکەڵ و ناڕێک و پڕ لە کوژاندنەوە و بۆ زیادکردنە. لە زۆر شوێندا ناوێک سڕاوەتەوە و ناوێکی تر زیادکراوە، لە هەندێ جێگادا ناوێک نیشانەی پرسیاری خراوەتە سەر و هێڵێکی خوار کێشراوە بۆ سوچێکی دیکەی پەڕەکە و لەوێدا دوو ناوی تر نوسراون. لەسەر هەندێ ناو دوو ئەستێرە دانراوە، هەندێ ناو خراونەتە ناو بازنەیەکی سوورەوە، هەندێ ناوی تریش نیشانەی سەیر سەیریان لەسەر بوو، وەک دوو نیشانەی سەرسوڕمان، خاچێک کە دەخرێتە پاڵ ناوی مردووەکان، خۆرێک بە دەموچاوێکەوە پێدەکەنێت، خۆرێک بە دەموچاوێکەوە دەگری، وێنەی شێرێکی زولفەقار، کەڵلەسەرێک، فەرمانی

کەشتییە کۆنەکان، چەقۆیەک . وەک ئەوە بوو خۆشی سەری لە هەموو شتەکان دەرنەچێت، گووتی «لەگەڵ دکتۆر سیادا زۆربەی ناوەکانمان جیاکردۆتەوە، دوو تا سێ ناو ماون کە دەبێت من بڕیاریان لێبدەم. وەرە لەگەڵمدا با بەسەر ڕیزەکاندا بگەڕێین. دەمەوێت ڕای تۆش وەربگرم». یەکێک لەو ناوانەی جێگای گومانی نەقیب بوو، میرئەوداڵ بوو. ناوەکەی میر چەقۆیەکی تیژی لە پاڵدا وێنەکرابوو، کە نەمزانی نەقیب بە چ نیازێک بەکاریهێناوە. میر لەو ڕووەوە کە زۆر توانادار و بەهێز بوو، یەکێک بوو لە کەسە زۆر پێویستەکان، بەڵام بە سەرێکی دیش زلی و تەنگەنەفەسی و کێشی زۆری، بووبوون بە گرفت. نەقیب دەیگووت «ئەوەندە زلە، لە مەمەد حەسارەوە زیخ هەڵدەن بەریدەکەوێت». من گەرچی دەمزانی میر ئەو هەموو ڕەنجەی داوە تا لەم بەتالیۆنەدا بێت، گەرچی زۆر حەزمدەکرد هەمیشە لەگەڵمدا بێت، بەڵام پڕ بە دڵ ئاواتم دەخواست کە نەیەت، پەشیمان بێتەوە و بچێتەوە بۆ ماڵێ بۆ لای مراوری خانی ژنی و وەک جاران قاتە جوانەکانی لەبەربکات و لەزەت لە ژیان ببینێت. من بە نەقیبم گووت «میر پیاوێکی زۆر باشە، ئەسڵەن شایەنی ئەم دۆخە نییە، گەر ڕێگام بدەیت من هەندێ قسەی لەگەڵدا بکەم، بزانم خۆی دەڵێت چی». بۆ یەکەمجار نەقیب یوکسەل بە هێمنی سەیریکردم و بە ڕێزەوە گووتی «فەرموو قسەی لەگەڵدا بکە». لەو ڕۆژەوە پەیوەندی من و نەقیب بوو بە پەیوەندییەکی دۆستانە کە پتر ڕۆحی هاریکاری و غەمخۆری باڵی بەسەردا کێشا تا دوژمنایەتی و ناکۆکی، گەرچی ئەو هەمیشە لە ناوەوە سەربازێکی دڕ و بێرەحم بوو، منیش گرینۆکێکی ئایدیالیست، بەڵام پنتێکمان دۆزیبووەوە پەیوەندیمان ڕابگرێت.

چاودێرەکان هەرچییان دەکرد، ڕیزەکانیان تەواو بۆ ڕێک نەدەخرا. کە من چووم تا میرئەوداڵ بانگبکەم. یەکێک دووبارە گووتی «چاو چاو کێ لێرەیە... چاوچاو ... مستەر گرینۆک». ئەو قسەیە دەنگە دەنگ و

پێکەنینێکی خەفەکراوی خستەوە هەموو ڕیزەکان، چاودێرەکان بۆئەوەی بێدەنگی بسەپێنن، بە گۆپاڵەکانی دەستیان، تا هێزیان بوو سمت و کەفەڵی هەندێکیان کوتا. من بێئەوەی خۆم تێکبدەم، ڕێک بەرەو میرئەودال چووم کە بینینی من نارەحەتیکرد و ترسا هەواڵێکی خراپم پێبێت بۆی. من میرم هێنایە دەرێ و تۆزێک دوورم خستەوە و گووتم «جەنابی میر، تکات لێ دەکەم. نەقیب نەجات دوودڵە لەوەی تۆ ببات یاخود نا. ناوت لە لیستەکەدا هەیە، بەڵام دەکرێت کەسێکی تریش جێگات بگرێتەوە. من دەمەوێت پێت بڵێم، تکایە جەنابی میر ئەو جێگایەی ئێمە بۆی دەچین زۆر شاخاوییە، ترسناکە، لە حوکمی قەناسی دوژمندایە، ژیانمان زۆر مەترسی لەسەر دەبێت، دەبێت هەموو زستان لە ژێر بەفر و باراندا ئیشبکەین. من کاری وا بۆ تۆ بە شیاو نازانم. ئەم سەفەرە بۆ تەندروستی تۆ باش نییە. من لە دڵەوە تۆم خۆشدەوێت و لە دڵەوە بۆت دەگریم، تکایە بهێڵە کارێکبکەم تۆ لێرە بمێنیتەوە، گەر ناچیتەوە بۆ ماڵ، ئێرە بۆ تۆ باشترە». میر ئەودال چاوانی پڕبوون لە ئاو و گووتی «تۆ دەڵێیت چی. تۆ باسی چی دەکەیت. ئەمە دوا ئومێدمە ... من دەمەوێت لەمڕۆ وە دەستبکەم بە ژیان». سەرم لە میر سوڕما. بۆ وادەزانێت ژیان وا لەو چیا سەختانە. هەستمکرد وەختە بە دەنگی بەرز بگری، گەرچی من زۆر لەو بچوکتر و بێهێزتر بووم، باوەشم پێدا کرد و گووتم «جەنابی میر، خۆت دەزانی من پێم دەڵێن مستەر گرینۆک، نامەوێت ئێستا لێرەدا بگریم. من غەمی تۆمە، دڵنیام ژیانی ناو شاخان ئاسان نییە». توند گرتمی و گووتی «تۆ کارت نەبێت، کارت نەبێت، من بەرگەی دەگرم. من بەرگەی ژیانی ئێرە ناگرم. لەمڕۆوە تا ڕۆژی قیامەت بمخەرە ناو شەڕەوە ناڵێم نا. بەس نامەوێت ئەم ژیانە گووە لە دیلاوار درێژە پێبدەم. گەر نەمبەن تەواو شێت دەبم مەگەر تا ڕۆژی قیامەت لە زنجیردا بمبەستنەوە». نەمویست کارێک بکەم سەرنجی هەموو مەیدانەکە ڕابکێشم، بە خێرایی میرم ناردەوە ناو ڕیزەکە و گەڕامەوە بۆ لای

نەقیب یوکسەل کە بە گەرمی لەگەڵ یەکێک لە چاودێرەکاندا قسەیدەکرد. بە گوێی نەقیبدا چرپاندم، میر دەیەوێت بێت، لە دڵەوە حەزدەکات لەگەڵ هێزەکەدا بێت، تکایە مەیسرەوە. نەقیب هەر لەگەڵ چاودێرەکەدا بەردەوام بوو، بەڵام بەدەم قسەوە لەسەر لیستەکەی خەتێکی دا لە ناوەکەی میر و لە جێگایەکی تری لیستەکەدا ناوێکی کوژاندەوە.

ژەنراڵ قەرەقازانی نیوسەعات بوو وەستابوو، ڕۆژێکی هەتاوبوو، بەڵام کزەیەکی ساردی هەبوو، ئەو وەک هەر ئەفسەرێکی تری دونیا فێرە چاوەڕوانی و سەبر بوو. هەندێ لە نەخۆشەکان سەرسەختییەکی زۆریان پیشاندەدا، بەڵام کە لە نزیکەوە سەیری دەموچاو و شێوەی سەیرکردنی ژەنراڵم دەکرد، هەستمدەکرد بەختەوەرە کە ژیان فرسەتێکی وەهای داوەتێ، ئەم هەموو شێتە لە یەک جێگادا و بە یەکجار ببینێت. ژەنراڵ خۆی پیاوێکی گەمژە دیاربوو، لەزەتێکی تایبەتی لە تەماشاکردنی نەخۆشەکان دەبینی. من لە مێژە سەرنجمداوە کە گەمژەکان کاتێک سەیری شێتێک دەکەن لەزەتێکی بێوێنە دەبینن، خۆشحاڵی و ئاسوودەگیان بە جۆرێکی بەرچاو زیاددەکات، پێکەنینیان دزێو و پڕ مەبەستی خراپە، هیچ سۆز و بەزەییەکی ڕاستیان بەرامبەر ئەم مرۆڤە بەستەزمانانە نییە، کە لێیان دەڕوانن هەست بە سەرکەوتن و نیعمەتێکی گەورە دەکەن، هەستدەکەن بەوەدا ئەوان گەمژەن و شێت نین، خودا چاکەیەکی گەورەی دەرهەق کردون و ژیان منەتێکی گەورەی ناونەتە مل . هەستمکرد ژەنراڵ ئەمجارە بە چاوێکی جیاوازتر و بە دیدی پیاوێک کە هاتووە تۆزێک دڵی خۆی بە دیمەنی ئەم نەخۆشانە خۆشبکات، تەماشادەکات. لیستەکە وردە وردە ئامادەدەبوو. نەقیب هاتە بەردەمی ژەنراڵ و سڵاوێکی سەربازیی مەحکەمی بۆ کێشا و گووتی «گەورەم هەر سەد ناوەکە دیاریکراون. ئێستا گەر فەرمان بفەرموون، جیایان دەکەینەوە و دەکەوینە ڕێ». ژەنراڵ بێئەوەی سڵاوی بستێنێتەوە، بە لالووتێکەوە گووتی «دەی پەلە بکە و جیایان

بکەرەوە». هەستمکرد ژەنرال حورمەتی شیتەکانی زۆرتر لایە تا ئەم نەقیبەی بەردەستی... وەهابوو وەک لە ڕیزبەندی پلەوپایەکاندا، شورەیی بێت ئەفسەرێکی باڵا بە شتێک لە ڕیزەوە لەگەڵ بندەستەکانیدا بدوێت. نەقیب بە گورجی و ملکەچییەکەوە کە جیاوازبوو لە دەنگ و ڕوخساری پێشینەی کاتێک لێرە لەگەڵ نەخۆش و چاودێر و فەرمانبەراندا دەدوا، بە زەلیلییەوە گووتی «هەر ئێستا گەورەم».

لە کاتی خوێندنەوەی ناوەکاندا بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەر هەموو مەیدانەکەدا کێشا. ئەوانەی ناویان دەخوێنرایەوە دەهاتنە دەرەوە بۆ سەر ڕیزێکی نوێ کە من و زەهاو و دوو چاودێر پێکەوە ڕێکمان دەخستن. هەر سەد ناوەکە خوێنرایەوە، میرئەودال نەوەدویەکەمین ناوبوو، بەپەلە لە جێگای خۆی هاتە دەرەوە و خۆی خستە ناو ڕیزەکەوە، زل و گوپ سوور و پڕ لە جوڵە بە نیگای منداڵێکەوە بە گەورەیی لە دایک بووبێت، سەیرێکی خۆشحاڵانەی منی کرد و بە دەستەسرێک عارەقەی نێوچاوانی سڕی و بۆم پێکەنی ... زۆر لە مێژبوو نەمدیبوو وا گەش پێبکەنێت. نەقیب وردەکارییەکی زۆری لە هەڵبژاردنی بەتالیۆنەکەدا بە خەرج دابوو، بە بڕوای من باشترین و بەتواناترین کەسەکانی هەڵبژاردبوو، زۆربەیان لە ڕووی تەندروستییەوە ساغ و لە ڕووی دەروونییەوە لەوانی تر جێگیرتر بوون. هێزەکەمان بەشێک بوو لە هێزێکی گەورەتر کە بەتالیۆنی شەشەمی ئێشیان پێدەگووت، ئێمە فەسیلی سێهەم بووین. وەک دواتر زانیم سەرجەمی بەتالیۆنەکە لە هەزار کەس پێکدەهات، لە دە فەسیلی جیاواز کە کاریان ئەوەبوو بەدرێژایی پاییز و زستان خەندەک لێبدەن، حەشاردروستبکەن، تونێلی نهێنی بکێشن، بنکەی سەربازی دابمەزرێنن، ژێرزەمینی قایم بۆ هەڵگرتنی تەقەمەنی چێبکەن. نەقیب نەجات دواتر بە منی گووت «ئەم جێگایانەی دروستدەکرێن، دەبێت دوو سیفەتی گەورەیان تێدابێت، یەکەم وەک خەتێکی سەرەکی بەرگری تەماشابکرێن، دیواری یەکەمی هێزێکی

ئاسنین کە دیلاوار دەپارێزێت، چونکە هێڵی دووەم تەنیا دواتر و بە دووری پەنجا کیلۆمەتر بەرقەراردەبێت. بەلام ئەم جێگایە دەبێت وەک بنکەیەکی گەورەش وابێت بۆ پەلاماردان، دەبێت هەموو پێداویستییەکانی هێرشێکی سەرکەوتوو لە خۆ بگرێت. ئایا سەرکردەکانمان بڕیاری چی دەدەن، کەس نازانێت، کێ سەرەتا هێرشدەکات کەس نازانێت، ئێمە لێرە هەموو سەربازین، ئێستا ئێوە فەسیلێکی سوپان، ڕاستە تۆ موچەکەت هەر لەسەر وەزارەتی تەندروستییە، بەلام کۆی هێزەکە بە ئەرکێکی سەربازیی دەردەچێت. ئەم شوێنەی ئێمە دروستیدەکەین دەبێت بۆ هەموو مەبەستێک دەستبدات، بۆ بەرگری، بۆ هێرش، بۆ ڕۆژانی ئاشتیش».

ئێشکەرەکانمان یەک لە دوای یەک لە پێنج ڕیزی درێژدا ڕێکخست. لە ڕۆژانی پێشوودا نەقیب شتێک لە نەزم و دیسپلینی سەربازی فێری هەمووان کردبوو. ئەفسەرکان بەو جۆرەن، بۆ هەر کوێیەک بچن یاسا و ڕێورەسمی خۆیان دەبەن. کە بانگهێشتی ناوەکان تەواو بوو، کەم کەم چاودێرەکان ئەوانی دیکەیان گێڕایەوە بۆ قاوشەکان. دەبوو دوای ئەوان ئەم سەد کەسەش بگەڕێنەوە بۆ ژووری و جانتاکانیان لە ماوەی کاتژمێرێکدا ئامادەبکەن، لە بەشی کەرەستە و کەلوپەل هەموو فلچە و دەرمانی دان و سابونی خۆشتن و کەرەستەی ڕیشتاشینیان وەرگرت. من و زەهاو لە مێژبوو جانتایەکی گەورەمان پێچابووەوە کە زۆر شتی گرنگی تێدا بوو. لە ناکاو یەکێک لە ناو ڕیزەکانەوە کە خەریکی گەڕانەوەیەکی نارێک بوون بۆ ژوورەوە هاواریکرد «هێی مستەر گرینۆک، هێی... زۆرم پێ ناخۆشە دەڕۆیت. لێرە زۆر بیرتدەکەین». من سەرم بەرزکردەوە و بینیم هەموو گۆڕەپانەکە پێکەوە ئاوڕیان داوەتەوە و سەیری من دەکەن. یەکێکی تر لە جێگایەکی ترەوە هاواریکرد «ئا بەڕاستی، زۆرت بیردەکەین، مستەر گرینۆک، قەت لە بیرت ناکەین». من چاوم پڕ بوو لە ئاو، نەخۆشەکان لەگەڵ هەموو لاقرتی و گاڵتەجاڕییەکدا دەیانزانی من غەمخۆریانم. یەکێک لە

کۆچبەرانی چیا بێ پرس و مۆڵەتێک، دەنگی بەرزکردەوە و گووتی «ئێمە زیاتر پێویستمانە، ئێمە زیاتر... واز لە مستەر گرینۆک بهێنن، تازە لەگەڵ ئێمەیە». نەقیب یوکسەل زەردەخەنەیەکی گرت و گووتی «تۆ خۆشبەختی ... تۆ پیاوێکی بەختەوەری». من چاوم پڕ بووبوو لە فرمێسک و بە ئەسپایی گووتم «منیش زۆر بیریاندەکەم».

مامم بە خۆی و چاویلکە و دەستکێشە سپییەکەیەوە وەستابوو، قیافەتی پسپۆڕێکی بەرزی دابووە خۆی و سەیریدەکردین، هیچ هەستێک یان نیشانەیەکی تایبەتیم لە ڕوخساریدا نەخوێندەوە. دەیزانی ئێستا پاسەکان دێن و بۆ چەندین مانگ دەچین بۆ چیاکان، بەڵام وادەرنەدەکەوت کە بینین و نەبینینی من شتێکی گرنگ بێت، بە پێچەوانەوە نیگای غەریبەیەکم تێدا بینی کە سەیری تاقمێک غەریب دەکات کە دەچن بۆ گەشتێکی دوور. نە خۆی و نە دکتۆر جاهدار وەک دوو سەرپەرشتی ئەم نەخۆشانە، مالاواییەکی ڕاستەقینەیان لێ نەکردن، هیچ جۆرە پرد و پەیوەندییەکی زیندووم لە نێوان ئەم دوو پیاوە و ئەم مرۆڤە بەدبەختانەدا نەبینی، کە قەدەر فڕێیدابوونە ئەم نەخۆشخانەیەوە. من دەبوو بەر لەوەی بەتالیۆن خۆی ئامادەبکات و پاسەکان پڕببن، لیستی هەموو ناوەکان و نوسراوەکان ئامادەبکەم و هەندێ کاری ئیداری و یاسایی جێبەجێبکەم و دواتر هەموو بەڵگەنامە و نوسراوە ڕەسمییەکان بۆ دواهەمین ئیمزا بخەمە بەر دەستی مامم . دوای نزیکی سەعاتێک تەواوی نوسراوەکانم لە بەرپرسی بەشی ناوخۆی خەستەخانەکە وەرگرت و خستمنە دوو توێی فایلێکی تایبەتییەوە، لە سەر زۆربەی نوسراوەکان بە پیتێکی ئەستوور نوسرابوو «بابەت: ناردنی نەخۆشەکان بۆ پشوویەکی چەند مانگە لە ناو سروشتدا». ناونیشانەکە درۆ و شێواندنێکی گەورە بوو، گەرچی مرۆڤی تورەدەکرد، بەڵام من هەر ئارام و لەسەرەخۆ بووم و هیچم نەگووت. هەموو کاغەزکانم بە سەفتەکراوی خستە بەر دەمی مامم کە ئێستا خۆی و جاهدار و ژەنراڵ

قەرەقازانـی لـە نوسـینگەی سـەرەکی دانیشـتبوون و بـە گەرمـی چیرۆکیـان دەگێڕایـەوە و پێدەکەنیـن. مـن بـە نەزاکەتێکـی زۆرەوە لـە دەرگامـدا و نوسـراوەکانم خسـتە بەردەسـتی و بێئەوەی بوەسـتم گووتم «مامە، زەحمەت بکێشـە و بـە یەکێـک لـە ماڵـی ئێمـە بڵـێ، پاڵتۆیەکـی رەشـی چەرمـم هەیـە بیهێنـن بۆ ئێرە تـا لەگەڵ پۆسـتی هەفتانـەدا بینێرن بۆم، بەڵکو بگاتە دەسـتم، باوەڕدەکـەم ماوەیەکـی تـر سـەرما دەسـت پێبکات». ئـەو وەڵامـی نەدامـەوە. بە وردی سـەیری نوسـراوەکانی کرد و لـە چوار تـا پێنـج جێگادا ئیمزایکرد و دایەوە دەسـتم و بـە ئەسـپایی گووتـی «ئـاگات لـە خۆت و نەخۆشـەکان بێت». منیـش بـە ئەسـپایی سـەرم لەقانـد و گووتـم «ئـاگام لێیـان دەبێـت». ئینجـا زۆر بـە ئەسـپایی چرپانـدی «دڵنیـام تـۆ کەسـێکی گونجـاو و شایسـتەیت بـۆ ئـەم ئیشـە». منیش بـە ئەسـپایی گووتـم «بەڵـێ مامـە، منیـش واهەسـتدەکەم... هەسـتدەکەم ئـەم بەسـتەزمانانە پێویسـتیان بـە منـە». لـە شـوێنی خـۆی هەسـتا و دەسـتێکی سـووکی خسـتە سـەرشـانم و گووتـی «دڵنیـام کـە دەگەڕێیتـەوە بوویت بـە کەسـێکی تـر، بوویت بـە پیاوێکـی تـەواو». مـن قـووڵ سـەیرمکرد و گووتـم «بەڵـێ مامـە». دەنگـی خـۆم وەک دەنگـی زەهـاو هاتـە بەر گـوێ کاتێک بـە مـن دەڵێـت «بەڵـێ گـەورەم». بـە ملـی کـەچ و سـەری نـەوی و نیـگای شـۆڕەوە گووتـم «مامـە، ویسـتم بـەر لـەوەی بڕۆم شـتێکی ترت پێبڵێم». بـە هێمنییـەوە ڕوانـی و گووتـی «بیڵـێ ڕێنـوار، بیڵـێ، قسـەبکە». گووتـم « ئێسـتا دەتوانـم وەک جـاران خەونـی ئەوانـی تر ببینم». سـەیرێکی کورتـی کـردم و سـەیرێکی ئەوانـی دی کـرد و گووتـی «لـە کەیـەوە؟» «دووشـەوە مامـە، تەنیـا دوو شـەوە». دەسـتێکی خسـتە سـەر شـانم و گووتـی «بڕۆ با دوا نەکەویت... با دوا نەکەویت». نەمزانـی هەواڵەکـەم چـی شـتێکی تێـدا دروسـتکرد، کاتـی تـەواوم نەبـوو لێـی بڕوانـم و شـتێکی دی لـێ بپرسـم، تەنیـا گووتـم «تکایـە مامـە ، تکایـە جەنابـی دکتـۆر جاهـدار، هـەم ئاگاتـان لـە خۆتـان و هـەم ئاگاتـان لـە نەخۆشـەکان بێـت». جاهـدار لـە ژێـر چاویلکەکەیـەوە تەماشـایکرد و جگـە

لە زەردەخەنەیەکی بیمانا هیچی نەگووت. بەڵام ژەنراڵ بە پێچەوانەوە هەستا و هاتە پێشێ و گووتی «کوڕم پێویستیت بە باوەشێکی گەرمە، پێش ئەوەی بڕۆیت دڵنیام پێویستت بە باوەشێکی گەرمە». باوەشی پێداکردم و گووتی «بیرت نەچێت خۆت و هاوڕێکانت لە هەر جێگایەکدا ماندووبوون، سروودی دیلاوار ئەی سەرزەمینی شێران بخوێنن، هێز و تینتان تێدەگەڕێتەوە دڵنیابە، دڵنیابە. من خۆم بەسەرمدا هاتووە و دەزانم چ کاریگەرییەکی ڕۆحی هەیە. ئومێدی سەرکەوتنێکی گەورە بۆ تۆ و بۆ هەموو هێزەکە دەخوازم و سەربەرز بێت دیلاوار بە ئێوەوە». ویستم بڵێم جەنابی ژەنراڵ من حەز بەو سروودە ناکەم، بەڵام هەستمکرد لەوە غەمگین و لاوازترم بتوانم هیچ بڵێم. سوپاسێکی ئەسپاییم کرد و ماڵاواییم لێکردن و هاتمەدەرێ. تاکە شتێک لەو ساتەدا لە هۆش و خەیاڵمدا نەبوو ئەوە بوو، ئەوە دواجار بێت من مامە سیام ببینم.

لەویادا هەستم بە سەرمایەکی زۆرکرد، هەستمکرد ژیانی پێشووی من لێرەدا تەواو دەبێت و جارێکی تر ناگەڕێمە سەر دۆخی جاران و زیندەگی دێرینم. چیتر مامە سیام تەنیا غەریبەیەک بوو بۆ من، کەسێک بوو کە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا هێند لە یەک ترازابووین، وێرانبوونی دونیاش نەیدەتوانی بمانلکێنێتەوە بەیەکەوە.

لە یادم نییە چۆن سواری پاسەکە بووم، هێندە دەزانم من دواکەس بووم و لە پێشی پێشەوە، نزیکی شۆفێرەکە جێگایەکم بۆ دیاریکرابوو. زەهاو جانتا و تورەکەی کتێبەکانی منی لەگەڵ شتەکانی تردا بارکردبوو. نەقیب و پاسەوانەکان لە دوو جیپی سەربازیدا لە پێشمانەوە دەرچوون و ئێمەش لە دوو پاسی گەورەدا دوایان کەوتین. تا ئەو کاتە هەموو ژیانم تەنیا لە دیلاواردا بردبووە سەر. یەک دوو جار لەگەڵ سەیرانی قوتابخانەدا هەندێ لە گوندەکانی دەوروبەرم بینیبوو، بەڵام ئاواتی ژیانی ڕاستەقینەم لە

ئامێزی چیاکاندا، لەو شوێنە عاسی و سەختانەدا کە لە منداڵییەوە چیرۆک و ئەفسانەم دەربارەیان دەبیست، تا ئەمڕۆ ئەستەم و بێئاکام بوو. ئێستا کە دەبوو بچم بۆ چیاکان لە بارودۆخێکی باشدا نەبووم. دەمزانی ئەمە سەفەرێک نییە بڕۆم و وەک خۆم بگەڕێمەوە، سەفەرێکی سەختە، هەستم بە بەرپرسیارێتییەکی گەورە دەکرد بەرامبەر بەم مرۆڤانە. ئێشکەرەکانمان لە تەمەنی جیاوازدا بوون. هەڵبەت هیچ یەکێکیان زۆر بە تەمەن نەبوون، نەقیب کەسانێکی هەڵبژاردبوو زۆرینەیان بە توانا و بەهێز و سەرەحاڵ بوون. پاڵمدایەوە و هەستم بە ماندووبوونێکی گەورەکرد، بە ئێشێکی توند لە هەموو جومگەکانمدا، پاسەکە هێشتا لە دێلاواردا بوو کە هەستمکرد زۆر نائومێدم. ئەوە سەرەتای سەرەتا بوو. دڵنیابووم لەم شەوەوە تا کاتێکی تری دیاری نەکراو، پشوو لە ژیانمدا وەک ئاواتێکی دووری لێدێت.

## ٣٣

دەزانم ماوەیەکی درێژە بە چیاکاندا دەڕۆین، ڕێگاکان زۆر خراپن، شەقامی داڕوخاوی گڵ کە باران و تۆفانی سالانی پێشوو کەناڵ و کەندڕی تیا هەڵکەندون ... هەورازی بێکۆتایی ... لۆفەی ترسناک کە پاسە درێژەکان بە سەختی و هێورییەکی زۆر دەتوانن بیانبڕن ... لێژبوونەوەی کتوپڕ و بەربەستی پەیتاپەیتا. لێرەدا بە ئاسانی دەتوانم ئەو ڕاستییە ببینم، کە سروشت تا جوانتر بێت دڕتر دەبێت. لە نیگای یەکەمدا جوانی چیا و ملە و کێوە بەردینەکان سەرسامدەکەن، بەلام ترسێکی نهێنی لە دلمدایە کە ژیان لە ئامێزی ئەم سەختی و بەردەلانە ناکۆتایەدا ئاسان نییە. کە مرۆڤ بە ڕێگاوە بێت بۆ کارێکی لەم جۆرە ناتوانێت چێژ لە جوانی ببینێت. بە پێچەوانەوە لەو کاتانەدا من ڕقم لە جوانییە، هەستدەکەم وەک ئامێرێکی قورسی ئەشکەنجە وەهایە، جۆرە شیرینییەکە کە پێش گیانکێشان دەرخواردی مردووان دەدرێت.

بە درێژایی سەفەرەکە، هەمووان بێدەنگ و خامۆشن. هیچ شتێک یان نیشانەیەک هەست پێ ناکەم پێم بلێ ئێمە لە پاسێکی پڕ لە خەڵکی نەخۆشداین. چەند جار هەڵدەستم و بەسەریاندا دەگەڕێم، دەسڕی کاغەز دەدەم بە هەندێکیان، لە دۆخی دەروونی و تەندروستی هەندێکیان دەپرسم، هەموو هێمن و تا ئەندازەیەک خەوالوون. هەندێ دەرمانی ئارامکەرەوە و

خەولێخەرم پێیە، تا لە کاتی پێویستدا بەکاریانبهێنم، بەلام پێناچێت کەس پێویستی بە دارِوی وەها هەبێت. هەندێکیان دەپرسن «مستەر گرینۆک چەند لەوێ دەمێنینەوە؟». من توند دەستیان دەگرم و خەندەیەک دەگرم و دەڵێم «نازانم، بەلام هەر چەند بێت پێکەوەین، ئاگامان لە یەک دەبێت». هەندێکیان لەو کاتەوەی سواربووین خەوتوون، هەندێکیان تەنیا سەیری دەرەوە دەکەن و چاو ناتروکێنن، یەکێکیان جار جار توند دەکێشێت بە پشتی کوشنەکەی بەردەمیدا وەک ئەوەی داخی شتێکی لە دەستچوو بخوات، یەکێک لە پشتی پشتەوەی پاسەکەدا تەنیا دانیشتووە و بەبێدەنگی دەگری، بەلام من دەترسم بپرسم بۆ دەگریت، یەکێکیان دەیەوێت بڕشێتەوە و من زەرفێکی تایبەتی دەدەمێ تا بتوانێت لە ناویدا بڕشێتەوە. یەکێکیان کە لەش و لارێکی وەرزشی جوانی هەیە، هەموو بە «عیمادۆک» بانگیدەکەن دەپرسێت «مستەر لەو باوەڕەدایت، ئەمڕۆ دوژمن ببینین؟». من دەڵێم «نا ... نا ... دوژمنی چی. دوژمن دوورە لە ئێمە». نامەوێت کەس بترسێت، بەلام دەزانم هێمنی و بێدەنگی ناو پاسەکە بەشێکی پەیوەندی بەو ترس و چاوەڕوانییەوە هەیە کە هەمووان تێیدا دەژین. بەشی زۆریان ئەم سەفەرە وەک جۆرێک لە ڕاکردن لە ژیانی پێشوویان تەماشادەکەن، هەستدەکەم هەندێکیان تەنیا لە بیمارستانە دەروونییەکە و دڕندەیی چاودێرەکان و شێوەی دۆزەخئاسای ژیان لەوێ هەڵهاتوون. دڵنیام ڕۆژانی داهاتوو باشتر و نزیکتر هەموویان دەناسم. سەرجەمی پاسەکە وەک کەشتییەک دێتە بەرچاوم لە ئاوێکی بەرین و بێسنووردا بەرەو دورگەیەکی دوور بڕوات کە ژیانێکی تەلیسماوی و جیاوازی لەسەرە.

سەعات چواری ئێوارە دەگەینە شوێنی کۆتایی، تەختانییەکی تەلبەندکراوە لە قەدپاڵی چەندەها چیا و بەرزایی بەردین و عاسیدا. لە ناو تەلبەندەکەدا تەنیا خانوویەکی گەورە هەیە کە پێدەچێت کۆشکی پارەدارێک بووبێت و سوپا کری بێتی یان دەستی بە سەردا گرتبێت. کۆشکەکە

دیکۆرێکی دەرەکی قەشەنگی هەیە، زیاتر لە ماڵ دەچێت تا وەکو لە بنکەیەکی سەربازیی، دواتر دەزانم کە ئەوێ جێگای حەوانەوەی ئەفسەرە گەورەکانە دەمێک لە شارەوە دێن یان لە چیاکانەوە دادەبەزن. لە پشت و لە لای ڕاستی کۆشکەکە دەیان چادری خاکی هەڵدراون و سەریان بە تۆڕی گەورە داپۆشراوە و زۆربەیان هەندێ لق و گەڵای بە سەردا پەخشکراوەتەوە. نەقیب یوکسەل دێتە بەردەرگای پاسەکە و لە کاتی دابەزیندا یەک یەک فەسیلەکە بەسەردەکاتەوە. دەستدەخاتە سەر شانی من و بۆ یەکەمجار بەزمانێکی دۆستانە دەڵێت «ئێرە نیشتەجێیەکی کاتییە بۆ ئەمشەو، سبەی دەبێت چادرەکان بگوازینەوە بۆ کامپی تایبەتی خۆمان».

نازانم کێ چادرەکانی هەڵداوە، بەڵام هەر کەسێکە کارێکی جوانی کردوە. ناو چادرەکان بە جۆرێکی گونجاو ڕاخراون، هەر چادرێک و بۆ خەوتن و پشووی دە کەسێک دەست دەدات. نەقیب دەڵێت «چەندەها فەسیل لە پێش ئێمەوەن، زۆر لە پێش ئێمەوەن. هەندێکیان دوو ساڵە لە چیاکان ئێشدەکەن، ئەم چادرانە حەوانگای کاتین، ئەوەی دێت یان دەگەڕێتەوە دەتوانێت لێرەدا پشوویەک بدات». هێزەکەمان هەم برسییەتی و هەم شەکەتی ڕێگایە، لەسەعاتێکدا هەم نان دەخۆن و هەم پشوودەدەن. من و زەهاو بەتەنیا لە چادرێکی بچوکدا دەمێنینەوە. نەقیب یوکسەل هەر زوو خۆی لە کۆشکەکەدا وندەبێت و تا سبەی دەرناکەوێتەوە، لەوێ مولازم جهانگیر و چەند سەربازێک دەردەکەون. جهانگیر بەرپرس و ئەفسەری چاودێری ئەم شوێنەیە. لەو کاتەوەی ئێمە هاتووین، خۆی و بەردەستەکانی هەمیشە لە هاتوچۆدان، ئیشی ئەوانە پێشوازی لە ئێمە بکەن و پشووی ئەم شەومان بۆ دابینبکەن. من تا کەوتنی تاریکی دووجار بەسەر چادرەکاندا دەگەڕێم و دڵنیادەبم کە هەر کەس شوێنی خۆی هەیە، تکا دەکەم ئارامی و هێمنی بپارێزن. هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان سەرسام و چاوەڕوانن. پێشتر کەسیان ژیانی ژێر چادری نەبینیوە، هەندێکیان خۆشبینن و هەندێکیان

بەدبین، من خۆم هەستدەکەم پێویستیم بە پشووە. دوای نەمانی ڕوناکی و داگیرسانی دینەمۆیەکی بچوک، هەندێ گڵۆپی کز و زەرد لە ژێر چادرەکاندا ڕۆشندەبنەوە، زۆر نابات کە بێدەنگییەکی گەورە باڵ بەسەر جێگاکەدا دەکێشێت و جگە لە دەنگێکی زۆر خەفە و خنکاوی دینەمۆکە، کە پێدەچێت لە جێگایەکی دوور لێرەوە ئیشبکات هیچی دیکە نابیستم. هەندێ جار بە جۆرێکی دوور لەیەک و پچڕ پچڕ حەپەی هەندێ سەگی دوور دێنە گوێم. بێدەنگی پادشای ئەم جێگایەیە. من گەرچی پێویستم بە پشوویەکی درێژە، بەڵام دەمەوێت ماوەیەک لە تاریکاییەکەدا بمێنمەوە. دەزانم هێشتا زووە بەتەنیا بکەومە ڕێگا بۆ چیاکان، بەڵام هەستێکی سەیرم بە باڵ سووکی و ئارامی هەیە. ئێستا سەنتەرەکە و دیلاوار زۆر دوور دێنە پێش چاوم. مانگ دەبینم بە هێمنی لە گۆشەیەکی ئاسمانەوە دیارە، مانگێکی هێمن و غەمگین و خەواڵوو کە هەست ناکەم هیچ پەیامێکی دیاریکراوی پێ بێت، مانگێک کە زیاتر لە جۆرە جانەوەرێکی بێباک و گێژ دەچێت کە بارێکی قورسی لەسەرە، کە دەبێت هەموو ڕۆژێک لەم سەری ئاسمانەوە بیبات بۆ ئەو سەر ... پێدەکەنم، سەیرێکی ژێر چادرەکە دەکەم و دەبینم زەهاو لە ئێستاوە خەوتووە. دەورێکی تر بە دەوری کامپەکەدا دەسوڕێمەوە، گوێم لە دەنگی ڕادیۆیەکە کە جۆرە مۆزیکێکی هیندی پەخشدەکاتەوە، دەنگەکە لە یەکێک لە پەنجەرەکانی کۆشکەکەوە دێت. بیردەکەمەوە کە دەبوو پێش ئەوەی بەرەو چیاکان بێم سەرێک لە پرۆفیسۆر بەهنام بدەم. بەڵام بیرمدەکەوێتەوە کە ئەو ڕۆژانەی دوایی چەند سەرقاڵ بووم، بە جۆرێک نەمتوانیوە جارێکیش چییە دابەزمە ناو دیلاوار. نزیکی مانگێکە، جگە لەو شەوە سەیرەی مەیدانی ماسی فرۆشەکان، سەنتەری دیلاوارم نەبینیوە... ئێستاش دەست پێکردنی ژیانێکی تازە لەم جێگا دوورەدا، بێئەوەی کەس چاوەڕوانمبکات یان من چاوەڕوانی کەس بم. بیر لە سابات دەکەمەوە، بیر لە گریانەکەی دەکەمەوە کاتێک ئەو ڕاستییەی بۆ درکاندم کە منی خۆش

ناویت. خەندەیەکی گەورە دەپەرێتە سەر ڕووم، لە دڵی خۆمدا دەڵێم «چ خۆشبەختی و بارسووکییەکە کەس خۆشی نەوییت، چ نیعمەتێکی گەورەیە هەمووان فەرامۆشتبکەن». لە خۆم دەپرسم «ئاخۆ شوویکردبێت، ئاخۆ بەختەوەر بێت، ئاخۆ جار جار من بە خەیاڵیدا تێبپەڕم؟». هەناسەیەک هەڵدەکێشم و دەڵێم «ئێستا من لەم شەوەدا و لەم جێگایەدا ببینێت، ئاخۆ چی بڵێت؟». کەمێک بە دەنگی بەرز پێدەکەنم و دەڵێم «هیچ... هیچ. بێگومان هیچ ناڵێت. دەڵێت لە بەر ئەم عەقڵەت عاشقت نەبووم». پڕ بە سینەم هەوایەکی ساف هەڵدەمژم و دەڵێم «مستەر گرینۆک، ئەمە ژیانێکی تازەیە، زۆر تازەیە». لەگەڵ هەموو شتێکدا خۆشحاڵم، نائومێدم و خۆشحاڵم. دەزانم ڕۆژانی زۆر سەختمان لە پێشە، بەڵام ئەوەی شتێک لە بوونمدا دەجوڵێت، ئەوەی دەتوانم یارمەتییەکی بچوکی ئەم مرۆڤانە بدەم، بەختەوەرمدەکات.

بۆ ڕۆژی دوایی سواردەبین و بەرەو جێگایەکی دوورتر لە دێلاوار و نزیکتر لە سنوور دەڕۆین، ماشێنێکی بارهەڵگری سەربازیی گەورە لە پێشمانەوە دەڕوات. ڕوو لە هەرێمێک دەکەین گەلێک شاخاوی و سەخت دەنوێنێت، لە جێگایەکدا کە نیو سەعات لە شوێنی یەکەممان دوورە دەوەستین، دەبێت هەموو ڕۆژەکە خەریکی تەختکردنی زەوی و جێگا خۆشکردن بین بۆ هەڵدانی چادرەکانمان. یوکسەل ڕووە تورە و جیدییەکی خۆی وەردەگرێتەوە، ئیشکەرەکان بە هیمەت و ئازایەتییەکی زۆرەوە کاردەکەن، من و زەهاو لەسەر بەردێکی گەورە لە ناو یاتاغەکاندا دادەنیشین و سەیردەکەین. دەمەوێت بچین و کۆمەکی فەسیلەکە بکەین، بەڵام دەترسم دواتر ئەوە وەک شتێکی هەمیشەیی وەربگیرێت و بەردەوام چاوەڕوانی یارمەتی ئێمە بن. ئێمە وەک تیمێکی تایبەت بە ئارامی دەڕوونی لێرەین.

نامەویت ئەو سیفەتە لە دەستبدەم و هیچ کەس جۆرە وەزیفەیەکی دیکەمان بداتێ. من کتێبێکم دەرهێناوە تا لەسەر بەردەکان پاڵبکەوم و بیخوێنمەوە، خەریکی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانم کە زەهاو لە تەنیشتمەوە دادەنیشێت و دەڵێت «هەموو ئەم چیایانەم بینیوە». بە گومانێکەوە سەیریدەکەم و هیچ ناڵێم، ئەو دەڵێت «زۆر ڕێگا دەزانم کە کەس نایانزانێت». دواجار دەپرسم «هەستدەکەیت هیچ سوودێکی هەبێت؟ ئەو ڕێگایانەی تۆ دەیانزانیت.. هیچ سوودێکیان هەیە؟». زەهاو خەندەیەکی گەورە دەگرێت و دەڵێت «نا ... چوزانم، گەر ویستت ڕۆژێک دەتبەم». من دەپرسم «بۆ کوێ؟». بە هەمان زەردەخەنەوە «بۆ مەمەد حەسار؟». بە سەرسامییەوە سەیریدەکەم و بە گومانەوە دەڵێم «چۆن بۆ مەمەد حەسار؟». زەهاو دەڵێت «لە لاپاڵی ئەم چیایەوە ڕێگایەک هەیە تا ناو مەمەدحەسار دەڕوات». رووی تێدەکەم و دەنگم نزمدەکەمەوە و بە ترس و سەرسامییەوە دەپرسم «دەڵێیت چی؟ مەمەدحەسار شاری دوژمنە، گرنگترین جێگایانە. تۆ قەت چوویت بۆ ئەوێ». سەیرمدەکات و دەڵێت «چووم». «خودای گەورە چۆن؟. کەی چوویت؟ بۆ؟». سەر دادەنەوێنێت و دەڵێت «گەورەم ، ڕێگایەکی نهێنی هەیە، لێرەوە تا ناو مەمەدحەسار دەچێت. زۆر نهێنییە، تەنیا هەندێ قاچاغبەر دەیزانن، بە کێو و دۆڵی وەها سەختدا تێدەپەڕێت، مەگەر خوا بزانێت. هیچ کەس نایزانێت و ناتوانێت پیا بڕوات، دەبێت هەموو ڕێگاکە بزانێت، ئەگینا وندەبێت، ئیتر خوا نەبێت کەس ناتدۆزێتەوە. لەوێوە باری قاچاغم هێناوە، هەندێ جاریش لێرەوە بارم بردوە، ئەوە قانونی قاچاغبەرییە». دەپرسم «کەواتە تۆ دژمنت بینیوە. پێم بڵێ لە چی دەچن... وەک ئێمە وان، یان چۆنن؟». زەهاو کە زۆر کەمدووە کەمێک بە سەرسامی سەیرمدەکات و دەڵێت «وەک ئێمە وان، وەک هەر بەشەرێکی ترن کە خوا دروستیکردبێت». «دەزانم، مەبەستم ئەوە نییە، دەڵێم زۆر ڕقیان لە خەڵکی دیلاوارە؟». زەهاو شانی بەرزدەکاتەوە و دەڵێت «نازانم.

لەوانەیە. پرسیاری وام لێ نەکردون». دەستدەخەمە ژێر سەرم و دەڵێم «ترسایت کە چوویت؟». سەیریکمدەکات و سەر ڕادەوەشێنێ و دەڵێت «لە قاچاغبەریدا هەموو ڕێگایەک ترسی خۆی هەیە». «ئەی پێمبڵێ، دەزانیت بە زمانەکەیان قسەبکەیت. دەزانیت؟». «بەڵێ گەورەم. چۆن نازانم. ئینسان لەسەر سنوورەکان هەموو شتێک فێردەبێت، هەموو زمانێک». دووبارە سەرسام دەبمەوە پێی و بە دەنگێکی زۆر جیدی دەڵێم «لای هیچ کەس، هیچ بەشەرێک، هیچ ڕۆحلەبەرێک باسی ئەوە نەکەیت. یەک کەس لێرە بزانێت کە جارێک چوویت بۆ مەمەدحەسار، تەواو، دڵنیابە لێ دەبێتەوە». «بەڵێ گەورەم، لای کەس باسی ناکەم. بەڵام هەستمکرد خۆش نییە لە تۆی بشارمەوە ». «باشتکرد، دەستخۆش، منیش زمانی ئەوێ دەزانم. بەڵام گەر قسەبکەم خەڵکی یەکسەر دەزانن لە کتێبەوە فێربووم، من هەرچی زمانە لە کتێبەوە فێربووم... نە مامۆستام بووە، نە کەس هەبووە قسەم لەگەڵدا بکات، ناخۆشە وانییە؟». ئەو نازانێت من باسی چی دەکەم، زەردەخەنەیەکی گەورە دەگرێت و دەڵێت «بەڵێ گەورەم».

ئەوەی لە دیلاوار دوورکەوتبووینەوە، کەمە ئارامی و دڵنیاییەکی زۆرتری پێ بەخشیبوو، ئەوەی ئێستا ئەم چیایانەی دەبینی کە پێیان ئاشنایە، دڵخۆشی کردبوو. من دووبارە پەڕەکانی کتێبەکەم هەڵدەدەمەوە و دەمەوێت لە بەر خۆری ئەو بەیانییەدا لە ناو یاتاغ و بارە جانتای بەتالیۆنەکەدا کەمێک بخوێنمەوە. ماوەیەکی کورت دەڕوات و ئەو بەردەوام سەیری ئیشکەرەکان دەکات، هەموو خەریکی تەختکردن و پاککردنەوەی جێگای چادرەکانن لە وردە بەرد. لە ناکاو دەپرسێت «گەورەم، دەتوانم پرسیارێک بکەم؟». بێئەوەی چاو لە کتێبەکەم بتروکێنم دەڵێم «بپرسە زەهاو، بپرسە، چیت دەوێت بپرسە». بە دەنگێکی کەمێک دوودڵەوە دەڵێت «بۆ بە تۆ دەڵێن مستەر گرینۆک؟». «لەبەرئەوەی من زۆر دەگریم». «تۆ کوا دەگریت. تۆ نابینم بگریت». «نا، من زۆر دەگریم، بەس تۆ نامبینیت،

کاتێک دەگریم کە تۆ لەوێ نیت». «بەڵام گەورەم بۆچی دەگریت؟ من حەزناکەم بگریت». «ئاه زەهاو زۆر تورەمدەکات کە بەردەوام بە گەورەم بانگمدەکەیت، زۆر ئازارم دەدات». «ئاخر من لە منداڵییەوە وا فێربووم، وافێربووم بە هەموو کەس بڵێم گەورەم، بۆم تەرک ناکرێت». «ئاخر وازی لێبهێنیت باشە، تەرکی بکەیت باشە، زۆر من تورەدەکات». زەهاو بە غەمگینی سەیرمدەکات و دەڵێت «چەندجار خەڵک بووە گووتوویانە پێمان مەڵێ گەورەم، بەڵام هەر وەک گەورە لەگەڵمدا جوڵاونەتەوە. بۆیە دەمەوێت بە هەموو کەس بڵێم گەورەم». من تۆزێک وەڕز و تورە، وەک کەسێک ناعەدالەتیم بەرامبەربکات دەڵێم «من وام زەهاو، من وام... من وەک گەورە لەگەڵ تۆ دەجوڵێمەوە؟».ئەو ڕوودەکاتە ئەولاوە و دەڵێت «تۆ وایت گەورەم تۆ وایت». دەمەوێت هەستم، دەمەوێت تورەبم، بەڵام هەستدەکەم هەرچییەک بکەم هەمووی نیشانەی خۆ بە گەورە زانییەکی شاردراوەیە کە پێدەچێت تا ئێستا لەخۆمدا نەمبینێت. هیچ ناڵێم، بۆ ساتێک دەکەومە گومانێکی تەواوەوە لە خۆم، ئێستا هەستدەکەم وەک هەموو دێلاوارییەکی ڕەسەن خەریکە پڕدەبم لە کینە بەرامبەر هەر شتێک خۆمم بیربخاتەوە، وەک هەر دێلاوارییەک پڕدەبم لە توانای وێرانکردن، بەڵام خۆم دەگرم، دان بە خۆمدا دەگرم و چاوانم پڕدەبن لە ئاو... بە دەنگێکی گریاوەوە سەیری زەهاو دەکەم و پێیدەڵێم «سەیرمکە ... سەیرمکە ... لە بەرئەمەیە پێمدەڵێن مستەر گرینۆک». ئەو چاوە گریاوەکانم دەبینێت و بە ساردییەکەوە دەڵێت «بەڵێ گەورەم». «نابینیت من لەوە لاوازترم، بتوانم ناعەدالەتی بەرامبەر کەس بکەم». بە گومانەوە سەیری فرمێسکەکانم دەکات و دەڵێت «کەس نییە ئەوەندە لاواز بێت، نەتوانێت ناعەدالەتی بکات».

دواتر هیچ قسەناکەین، هیچ هیچ. من کتێبەکەم دەخەمە سەر سنگم و لە ژێر خورەکەدا دەخەوم و زەهاو بە بێدەنگ سەیری ئێشکەرەکان دەکات.

تا ئێوارە هەموو کەمپەکە جێگیر دەبێت. هەموو ئیشکەرەکان پێکەوە پازدە چادر هەڵدەدەن، ڕاخەری دەخەنە ناو، ژمارە دەدەن لە چادرەکان، ئیشکەرەکان بەسەر جێگاکاندا دابەشدەکرێن، یاتاغەکان دەبرێنە ژێر چادرەکانەوە، نەقیب یوکسەل چادرێکی بچوکی خۆی هەیە بۆ خۆی و هاوکارەکەی. هاوکاری یوکسەل کوڕێکی گەنجی چاوشینە ناوی نەواسە، جگە لە ناوی یەکەمی هیچی دیکەی لێ نازانین، بەڵام کەسمان تا ئێستا گەنجێکی لە نەواس جوانترمان نەدیوە. من لەگەڵ نەقیب یوکسەلدا سێ کەس هەڵدەبژێرین بۆئەوەی ببن بە بەرپرسی هەمیشەیی چێشت لێنان، یەکێکیان خۆی پێشتر کاری لە چێشتخانەدا بووە و دووانەکەی تریان لەوانەن، وەک خۆیان دەڵێن، بە هێزی نەوسنی بوون بە چێشتکەری بلیمەت. یەکەم شت بیکەین ئەوەیە دەبێت جێگایەکی باش بۆ چێشتخانە و تەنوورێکی نانکردن دروستبکەین. نەقیب سەیری دەفتەری پلانەکەی دەکات و دەڵێت «بەڵێ، سبەی دەبێت چێشتخانەیەک دروستبکەین، ڕەنگە وەرزی باران بارین بەم زوانە دەست پێبکات، سەرەتا شوێنێکی قایم و وشکمان دەوێت بۆ نانکردن و هەڵگرتنی ئازوقەکان». چێشتکەرەکان ئیشێکی زۆر گەورەیان لەسەر شانە، بەڵام بەختەوەرن، ئیشەکەیان گەرچی زۆرترە بەڵام سادەتر و ئاسانتریشە. سبەی فەسیلەکە دەبێت بە دوو بەشەوە، بە شێکیان لەسەر دروستکردنی چێشتخانەکە ئیشدەکات، بەشەکەی تریان دەچێت بۆ چیاکان. نەقیب تکا لە من دەکات سبەی لەگەڵیان سەرکەوم بۆ بەرزایی، دەڵێت پەیوەندی بە کاری ئێوەوە هەیە، دەبێت ئێوە لە نزیکەوە کرێکارەکان ببینن لە کوێدا ئیشدەکەن، دەبێت بزانن سەختی کارەکە تا چەندە. نەقیب پێی وایە ئەم هەرێمە مرۆڤی ساغیش شێتدەکات. ئەو دەزانێت هەموومان جارێ شیفتەی جوانی ئەم سروشتە پاک و بە شکۆیەین، بەڵام دەڵێت «فریو مەخۆ، ئەم جوانییە لە هەزار دوژمن دڕندەترە».

دەمەو ئێوارە بەر لەوەی تاریک دابێت، من و نەقیب پیاسەیەکی درێژ

دەکەین. تەنیایی و ماندویتی و دیمەنی ئەم بەردەلانە سەختە کەمێک لە لووتبەرزی ئەوی بەرامبەر من دابەزاندوە. وەک هەمیشە چاوێکی جیدی و تیژ و ئازاردەری هەیە، برژانگە درێژەکانی دەتوانێت هەموو کەسێک دوودڵ و دردۆنگ بکات. بە جۆرێک لە کەپووبڵندی و بالانواری دەست دەخاتە ژێر نیتاقە سەربازییەکەی و سەیری ئاسمان دەکات و دەڵێت «هەموو رۆژێک بەم چیایەدا سەردەکەوین و دێینەوە خوارێ. ئێمە زۆر لە دوای دوژمنەوەین، دەڵێن ئەوان چەند ساڵێکە بە نهێنی ئامادەکاریدەکەن، لە کاتێکدا دیلاوار نوقمی خەوە، ئێستاش دەبێت سوپاسی ئەم ترسە بکەین، ئەم خەونەی کە هەموومانی ئاگادارکردەوە». لەسەر لا لێم دەڕوانێت و دەپرسێت «ئێوە ئەو خەونەتان بینیوە؟». من دەڵێم «نا جەنابی نەقیب، نا من ئەو خەونەم نەبینیوە». ئینجا بە چاوە شینەکانی ڕاستەوخۆ سەیرمدەکات و دەڵێت «منیش نەمدیوە، بەڵام هەستم بە ترسی خەونەکە کردوە، دەمێک باسیدەکەن، دەزانم باسی چی دەکەن. زۆرجار هەستدەکەم کەس ئەو خەونەی نەبینیوە، بەڵکو تەنیا وەک من هەستیان بە ترسەکەی کردوە». سەیرم لێدێت کە نەقیب بەو جۆرە بیردەکاتەوە، بە هەندێ هەنگاوی درێژ پێشم دەکەوێت و بەدەست هەندێ جێگام لە ناو چیاکاندا بۆ دیاریدەکات و دەڵێت «لە هەموو ئەو جێگایانەدا بەتالیۆنی ئێمە، فەسیلی ئیشی هەیە. تا ماوەیەکی تر بڕیارە هێزەکەمان گەورەتر بێت، دەبێت لایەنی کەم دوو بەتالیۆن یان سیانی تر بخرێنە کار. پێویستە هێزێکی مەدەنی گەورە، بەڵام بە سەرپەرشتی ئیدارەیەکی سەربازیی بێتە ئێرە، لە ماوەی داهاتوودا دەبێت سەدان مامۆستا، سەدان فەرمانبەر، سەدان کرێکار، سەدان کاسب بێن و لەم چیایانە ئیشبکەن، تا سەرەتای بەهار پێویستمان بە خەندەکێکی درێژە، پێویستیمان بە هەزارن فەردە خۆڵە، جگە لەوەی دەبێت زۆر شوێنی سنوور بە چەند چینێکی یەک لە دوای یەکی تەلی دڕکاوی بپۆشین، ناو بەینەکانیشی بکەین بە کێڵگەی مین. لێرەوە

تا خودا حەزبکات، تا چاو برکات ... ». من دەپرسم «بەڵام دیلاوار ئەو هێزەی هەیە ئەم ڕووبەرە درێژ و گەورەیە پڕبکاتەوە». نەقیب دەڵێت «شەڕ بە زۆر و کەمی نییە، شەڕ بە ئیرادەی جەنگاوەرە. هێزێکی بچوک کە مەشقی تەواوی هەبێت و ئیرادەی شەڕی هەبێت باشترە لە هێزێکی گەورەی نارێک. زۆرجار هێز بە هۆی گەورەییەکەیەوە تێکدەشکێت. جگە لە مەشق و ئیرادە، دوو گرنگترین شت لە جەنگدا زانیاری ورد و ناسینی دوژمنە». بە حەسرەتێکەوە سەیردەکات و منیش دەڵێم «ئێمە ئەوەمان نییە، زانیاریمان کەمە، دوژمنیش ناناسین. لەم هەرێمەدا کەس کەس ناناسێت، ئەم میللەت و دیانەت و زمان و مەزهەبانە هەزاران ساڵە بە یەکەوە دەژین، بەڵام هەر غەریبین بە یەک». دەوەستێت، سەیرێکی چیاکان دەکات و دەڵێت «من قەت باوەڕم بە ئاشتی نەبووە. نە لە بەرئەوەی ئەفسەرم، ڕوتبە و مەقامی سوپا بخەرە لاوە، بەڵام بەوەدا دوژمن هەیە، ئاشتی بۆ هەبێت. دەبوو سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر کە دیلاوار ئازادکرا، جەنگ بەردەوام بووایە. سبەینێ لە سەرەوە کە چووینە ترۆپکی چیا بە دووربین سەیربکە، لەوێوە بەشێک لە چیاکانی ئەوبەر دەبینیت کە دوژمن تێیدا سەنگەریان لێداوە. دوژمن کێیە؟ کۆمەڵێک تارمایین، کۆمەڵێک خێوی بچوکن لە ناو دووربینەکەدا دێن و دەچن. شتێکن تا مردن نایانبینیت، هەمیشە ئەوان لەمبەر و ئێمە لەمبەرین، هیچ کات ناگەینە یەک، هیچ کات وەک دوو کەسی ئاسایی ناتوانین قسەبکەین. ئەوە دیوارێکە خودا دروستیکردوە، فاسیلەیەکە دەبێت بیپارێزین. نە من و نە تۆ دروستمان نەکردوە. خودا هەر میللەتێکی خۆشبوێت دوژمنی زۆری دەداتێ، بۆئەوەی زیندوو بمێنێتەوە، بۆئەوەی توانای بەرگری لە خۆیدا دروستبکات. بە خۆڕا نییە کە خودا ئێمەی لێرەدا دروستکردوە، سەیرکە، وامەزانە دوژمنەکانمان هەر لە مەمەدحەسارەوە دێن، هەر چواردەورمان دوژمنە لە ئەلائاباوە دێن، لە سوئاباده وە دێن، لە شارەکانی باشوورەوە لە کەربول، کوفیان، نەسریان، جودیان. مرۆڤ

دەبێت بزانێت ئەم هەموو دوژمنە بۆ ئەوەیە ئێمە تاقی ببینەوە». تا ئەو کاتە کەسێکم نەبینیبوو وابیربکاتەوە، یان لە ڕاستیدا لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسەم لەو ڕووەوە نەکردبوو تا بزانم خەڵک چۆن بیردەکەنەوە. نەقیب گووتی « منِ ڕقم لەوانەیە دوژمن وەک شتێکی کاتی سەیردەکەن، وەک کێشەیەکی سیاسی، دوژمن شتێکە هەر هەبووە، وەک چۆن هەور هەیە، باران هەیە، بومەلەرزە و لافاو هەیە، دوژمنیش هەیە. هەمیشە لەوێن، هەر کات چوویتە سەر ئەو ترۆپکانە و بە دووربین سەیرتکرد دەیانبینی».
هەندێ بەردی هەڵگرت و هاویشتی بۆ دوور، بازوویەکی بەهێزی هەبوو، بەردەکان بۆ دوور دەڕۆیشتن، خەندەیەکی گرت و گووتی «شەڕ بۆ خەڵکی لاواز نەکراوە، هەر کات شەڕ دەستی پێکرد تۆ ئیشێکی تر بدۆزەوە، شەڕ ترسناکە، خەڵکانی بەهێز بەرگەی ناگرن، جا بگاتە کەسانی وەک تۆ». تێگەیشتم مەبەستی چییە، گووتم «بەشی زۆری خەڵک بە خۆشی خۆیان ناچن بۆ جەنگ». بەردێکی تری بۆ دوور نارد و گووتی «من نا، من لەوانەم کە بە خۆشی خۆم دەچم. شەڕی بچوک نا، شەڕی دوو کەس، دوو خێزان، دوو بنەماڵە، ئەوانە ئیشی خەڵکی گرگنن. من قێزم لە شەڕی بچوک دێتەوە، شەڕ لەگەڵ بوغز و کینەدا جیاوازی هەیە، بوغز و کینە هەستی مرۆڤە گرگنەکانە، شەڕ ڕۆحێکی بەرزی دەوێت. من عاشقی ئەو شەڕە دێرینانەم، شەڕی گەورە کە بە یەک فەرمان هەزاران خەڵک دەجوڵێنێت. شەڕێک ئەفسەرێک بتوانێت بلیمەتی خۆی تیا دەربخات». من گەڕامەوە بۆ سەر بابەتەکەی پێشووی و بە گومانەوە گووتم «خودا کاری چییە، ئێمە کەسانی وەک دکتۆر سیامەندی زەریاواری، ژەنراڵ مەحمودی قەرەقازانی ناردویانین بۆ ئێرە. کەسیان خودا نین». «نا، تۆ هەڵەیت. ئێمە دوژمن هێناوینی بۆ ئێرە. دوژمنێک هیچ کات لە ناو ناچێت. جەنگ خۆی دیارییەکی خودایە. ئایا ئێمە شایستەی مانین یان نەمان، ئەوە تەنیا لە جەنگدا تاقیدەبێتەوە، دوژمن نەبێت من نازانم تۆ کێیت، ئەو کێیە، من کێم

... خودا تەنیا مرۆڤی دروست نەکردوە، بەڵکو ئەو ئاوێنەیەش کە خۆمانی تێدا دەبینین هەر لە دەستکردی خۆیەتی، جەنگ ئاوێنەی میللەتانە ... ها ... یان تۆ لەو باوەڕەدایت کە ئێمە خودا دروستیکردوین، بەڵام ئاوێنەکە خۆمان دروستمانکردوە؟». نازانم چی وەڵامی نەقیب بدەمەوە.

وردە وردە دونیا تاریک دەبوو، ئەو بەردەوام بەرد بۆ دوور دەهاوێت، بەجۆرێک ئیدی دیار نەبوو بەردەکان تا کوێ دەگەن. من وردە وردە خۆم بە سەیرکردنی هەندێ گیای سەر ڕێگاکەوە سەرقاڵکرد و بە هێمنی لێی دوورکەوتمەوە، بە جۆرێک بتوانم بگەڕێمەوە بۆ کامپەکە، لە دوورەوە بانگی لێ کردم «ڕێنواری زەریاواری». وەستام و ئاوڕمدایەوە و گووتم «بەڵێ جەنابی نەقیب». هاواریکرد «دەزانی گەر ناوی تۆ لە لیستەکەدا بووایە، چ نیشانەیەکم لەسەر دادەنا؟ ... ». من وەستام و هیچم نەگووت. هاواریکردەوە « چاوێک کە تنۆکێک ئەسرینی پێدا هاتۆتە خوار». دوای ئەوە بێدەنگ بوو، هەر وەستام و نیازم بوو شتێکی تر بڵێت، زۆری نەبرد گووتی «هاوڕێم، خۆت ئامادەبکە بۆ جەنگ، ماوەیەکی تر شەڕێک هەڵدەگیرسێت، هەموو فرمێسکی دونیا بەشی ناکات، تۆش لەو شەڕدا دەبیت، هەموومان لەو شەڕەدا دەبین». دەنگی زۆر بەرز بوو، لە ناو چیاکاندا دەنگیدایەوە، سەدای وشەکانی لەو بەرەوە هاتنەوە.... هاوووورڕڕێێێم ... خخخۆۆۆتتتت ...ئااااامممماااادەههه ... بببببکککەەەە .

بای شەو سەداکەی لەگەڵ خۆیدا برد و خنکاندی.

... هیچ دەنگێکی تری لێوە نەهات.

من گەڕامەوە ناو کەمپەکە، ماندوویتی و ئیشی زۆر ئیشکەرەکانی تەواو شەکەت کردبوو، زۆریان هەر بە جلی ئیشەکانیانەوە خۆیان دابوو بەسەر جێگەکەدا. میرئەوداڵم لە کونجێکدا دۆزییەوە لە شەکەتی و ماندوبووندا

خەوی پێدا کەوتبوو. یەکێکم ڕاسپارد ببێت بە سەرپەرشتی پاکوخاوێنی ناو چادرەکان. بە پێچەوانەی چاوەڕوانی منەوە، ئیشکەرەکان زۆر هێمن و لە سەرەخۆ بوون. شەو بەخێراییەکی بێمانا دەکشا. کە چوومە دەرەوە لای چادرەکەی خۆمان، زەهاوم بینی لەگەڵ نەواسدا قسەیدەکرد، هەر دووکیان قاقا پێدەکەنین. من بێئەوەی ئارەزوویەکم هەبێت بزانم باس لە چی دەکەن چوومە ژێر چادرەکەوە، لەسەر ڕاخەرێکی پلاستیکی هەر دوو یاتاغەکەمان دوور لە یەک ڕاخرابوون... دڵتەنگییەکی کتوپڕ دایگرتبووم، بۆ ئەوەی کەمێک پشووبدەم چوومە ناو جێگاکەم و سەری خۆم بە پەتوویەکی ئەستوور داپۆشی و بە هێمنی دەستمکرد بە گریان.

# ٣٤

لـه مـاوەی مانگێکدا سـەی ئەسـڵان ماڵەکـەی غەفاریـی چۆڵکـرد و دایـە دەسـت دەڵاڵـەکان بیفرۆشـن، بـەڵام دەسـتی لـە ماڵەکـەی دەرەوەی شـار نەدا. گواستنەوەی سـەی ئەسـڵان لە ماڵەکەی غەفاریی بە نـاوی هـۆکاری ئەمنییـەوە بـوو، بـەڵام دواتـر بـۆی دەرکـەوت هەڵەیـەک بـووە لـە هەڵـە گەورەکانـی ژیانـی. لەگـەڵ وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی ڕەسـمی دامەزراندنـی باغەوانەکانـی دیـلاواردا، دەسـتەیەک لـە گەنجـەکان بـوون بـە پاسـەوانی تایبەتـی خـۆی. فەراسـە ڕەش سەردەسـتەی پاسـەوانەکان بـوو. بوونـی بـە سـەردەسـتەی پاسـەوانەکانی سـەرۆک، فەراسـی بـەرەو دۆخێکـی نـوێ برد، ئیدی نە کاتی بۆ قورئـان خوێندن هەبـوو، نـە بۆ سـەیرکردنی فیلمـە ڕووتـەکان و کەناڵەکانـی سـاتەلایت. هـەر لـە یەکـەم ڕۆژەوە هەسـتیکرد ئەرکێکـی وەرگرتـووە کـە هەمـوو ژیانـی دەگۆڕێـت، لەوانـە بـوو کـە هاویـن مەشـقێکی سـەربازیی تایبەتـی بینـی بـوو. خـۆی دڵنیابـوو کـە سـەی ئەسـڵان لـە بـەر سـێ شـت هەڵیبـژاردوە، یەکـەم: ناوەکـەی. دووەم: ناشـیرینییەکەی. سێهەم: سمێڵی. تـا جلی سـەربازیی لە بەرنەکـرد و لـە ئاوێنەدا خـۆی نەبینی، نەیزانـی چ ڕوخسـارێکی ترسـناکی هەیـە. کاتێـک بـۆ یەکـەم جـار لـە جلـی سـەردەسـتەی پاسـەواناندا چـووە بـەر ئاوێنـەی کانتـۆرە کۆنەکـەی ماڵـەوە، لـە بـەر خۆیـەوە گووتـی «وای دایـە گیـان، بەرازیـش بمبینێـت دەتۆقێـت».

لەوەدا لەسەر حەق بوو، بەڵام ئەی نابێت سەردەستەی پاسەوانەکان پیاوێکی ترسناک بێت. خۆی سەیری لێدەهات کە چۆن وا بەخێرایی لە عاشقێکی دین و فیلمە ڕووتەکانەوە، بوو بە پاسەوانێکی بە هەیبەت کە خۆشی ناوێرێت سەیری ناوچاوی خۆی بکات. پێشتر لە پەشۆکانێکی ڕۆحی و جەستەیی قووڵدا دەژیا. هەر کات بۆ ماوەیەک لە سەیری فیلمەکانی پۆرنۆدا نوقمبایە، دەبوو خێرا بە خوێندنەوەی ئایەتی قورئان و وسڵدەرکردنی پەیتا پەیتا خۆی خاوێنبکاتەوە. ئێستا لە ناکاو دونیا گۆڕانکارییەکی گەورەی بەسەردا هات، چیتر نە ئایەتەکان کاریان تێ دەکرد، نە جەستەی ژنە ڕووتەکان، بە جۆرێکی توند و کتوپڕ عاشقی سەی ئەسڵان بووبوو. لە قووڵایی ناخیدا هەستیدەکرد هەم پەیوەندییەکی دینی، هەم جەستەیی بەم پیاوەوە هەیە. هەر بیرکردنەوە لە گەورەیی ئەم زاتە ئاسوودەیدەکرد. کاتێک زانی سەی ئەسڵان لە ناو هەموو کوڕەکانی غەفارییدا ئەوی بۆ سەرۆکی پاسەوانەکانی خۆی هەڵبژاردوە، لە دڵی خۆیدا سوێندی خوارد سەرۆک بە ڕۆح و گیانی خۆی بپارێزێت. لە ناکاو هەموو ژیانی لە دەوری ئەم پیاوە دەسوڕایەوە، ئیدی هیچ شتێک لە سەی ئەسڵان لە ژیانیدا گرنگتر نەبوو.

ئەو ڕۆژەی کە ماڵەکەی سەی ئەسڵانیان گواستەوە، خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێکی کرد. سەیی زۆربەی کەلوپەلی ماڵە کۆنەکەی بەخشی بە دراوسێکان، هەندێ دیکۆراتی تایبەتی و ناوازە نەبێت، شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ خۆیدا نەبرد، بەڵام گواستنەوەی کەلوپەلی ناو گەنجینە و ژێرزەمینەکان کاتێک و هیلاکییەکی زۆریان برد. هەر شتێک کە پەیوەندی بە دیلاوار و مێژووی دیلاوارەوە هەبوو، سەی ئەسڵان هەڵیگرتبوو. ژێر زەمینی ماڵەکەی مۆزەخانەیەکی بچوک بوو، زۆر کەلوپەل و وێنەی مێژوویی بنەماڵە ناودارەکانی پاراستبوو، وێنەکانیان، درەختی بنەچە و ڕەچەڵەکیان، چەکە کۆنەکانیان، تفەنگگەلێک هەندێ لە قارەمانان ڕۆژانی

شەڕی ڕزگاریی بەکاریان هێنابوو، خەنجەری بەر کەمەری هەندێ لە سەرعەشرەت و ئاغاکانی دیلاوار، تەزبێحی هەندێ لە پیاوە ناودارەکان، سەعاتی بن باخەڵیان، کل و کلدانی چاویان، قوتوی جگەرەکانیان، سەبیلەکانیان، دەسڕ و قەڵەمبڕی ناو گیرفانیان، کەوا و سەڵتەکانیان، ئەو ڕادیۆ و گرامافونە کۆنانەی لە ماڵە ئاغاکاندا بووە، ئەو سەرینە نایابانەی لە پەڕی مراوی دروستیانکردون، فیشەکلەقەکانیان، قاوغی ئەو گولـلانەی لە برنەوەکانیانەوە تەقیون، قەفەزی کەوەکانیان، پێستی ئەو پڵنگ و ورچ و دەڵەکانەی لە کێوان ڕاویانکردون. بەر لەوەی بیر لە دامەزراندنی هێزێکی چەکداربکاتەوە، خەیاڵی لای دروستکردنی مۆزەخانەیەک بوو بۆ میرزادەکانی دیلاوار، دەیویست ناوی بنێت «مۆزەی میران» بەڵام دواجار خەیاڵی خستە سەر ئەوەی جەنگاوەرێکی ڕاستەقینە بێت و فیکر و هۆشی خۆی نەخاتە سەر شکۆی بەباچووی ڕابوردوو. هەڵبەت دروستکردنی مۆزەی میران هەر لە خەیاڵیدا بوو، بەڵام هەستیدەکرد ئێستا کاری گرنگتری لەسەر شانە و پرۆژەی گەورەتری لە بەردەمدایە. جارێک لە نوسینێکیدا هێرشێکی بێڕەحمانەی کردبووە سەر پرۆفیسۆر بەهنام، بەو پێیەی مێژووی دیلاوار دەشێوێنێت. ئەو مێژووەی سەی ئەسلان بۆ دیلاواری دروستدەکرد، ئەو مێژووە نەبوو کە پرۆفیسۆر بەهنام دەینوسییەوە. ئەسلان ئەوەی ڕەتدەکردەوە کە دیلاوار نەتەوەیەک تێیدا بژی لە تێکەڵبوونی چەندەها نەژاد و عیرقی تر دروستبووبێت. چیرۆکی دروست بوونی دیلاوار، لەسەر بنەمای زیندانێک کە گوایە شارەکە بە دەوریدا دامەزراوە، لای ئەو ئەفسانەی ڕەشی دوژمنان بوو، کە بە مەبەستی شێواندنی دیلاوار دایانڕشتوە. ئەو پێی وابوو دیلاوار سەرزەمینێکی پیرۆز بووە، لە هەموو جێگایەکی دونیاوە خەڵک ڕوویان تێکردوە تا ئارامی و ئاسایشی دەروونی بەدەستبهێنن. بەپێی چیرۆکی ئەو، دیلەکانی زەمانی زوو لە هەموو جێگایەکی دونیاوە، پارەیەکیان داوەتە

حاکمەکانیان تا دەرفەتبدەن سالانی زیندان لە دیلاوار ببەنەسەر، چونکە دیلاوار زەمینی ئازادی بووە، هەستی زیندانبوون، دیلبوون، کۆیلەبوون بە پێچەوانەی تەواوی دونیاوە بوونی نەبووە. لە نوسینەوەیدا بۆ مێژووی دیلاوار، دانیال وەک نەخۆشێک و سیحربازێکی شەڕانی ناودەبات کە توانای تێکدانی ئاسوودەگی مەملەکەتی هەبووە. دانیال لای سەی ئەسلان کەسێک بووە سێ شتی لە دیلاوارییەکاندا چاندوە، ترس لە دوژمن، ترس لە داهاتوو، هەستی دیلبوون، کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە هەر سێکیان لە بنەوە بسڕینەوە. سەردەمی شکستی دیلاوار لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە دیلاوار شکۆی ئەو ڕۆژانە وندەکات کە تێیدا لە دوژمن و داهاتوو نەدەترسا و هەستی دیلبوونی تێدا نەبوو. پرۆفیسۆر بەهنامی وەک خائینێک سەیردەکرد کە مێژووی دیلاوار دەشێوێنێت. لە سالانی ڕابوردوودا کە هێشتا وەک ئێستا سیاسییەکی بەرجەستە نەبوو، چەندجار لە کۆڕ و کۆبوونەوەدا سووکایەتی بە پرۆفیسۆر کردبوو، بەلام لەگەل ئەوەشدا ناوبانگی پرۆفیسۆر وەک مێژوونوس زۆر لەو لە پێشتر بوو. وەک دواتر زانیم، پرۆفیسۆر زۆر دەرگیری وەلامدانەوەی کەسانی وەک سەی ئەسلان نەدەبوو، گەر ناچار نەبایە و نەخرایەتە جوغزێکی تەسکەوە کەیفی بە شەڕی ئەمجۆرە کەسانە نەدەهات. بەلام وەک لە نادین خانمی کچی پرۆفیسۆر بەهنامم بیست، سەی ئەسلان پێشتر کەسانێکی هان دابوو سووکایەتی بە پرۆفیسۆر بکەن، کاریکاتێری دزێوی لەسەر بلاوبکەنەوە، لە ڕێگادا بچنە بەردەمی و تفی تێبکەن، بەجۆرێک کار گەیشتبووە ئەوەی خەلکیان دەترسان تا سەردانی مۆزەخانەکەی نەکەن.

فەراس ئەو ڕۆژە کە مالی سەی ئەسلانی گواستەوە، خۆی بە بەختەوەرترین کەسێک دەزانی کە شەرەفی ئەوەی پێبڕاوە خزمەتی ئەو پیاوە بکات، هەموو هەولێکی دەدا، شتە شوشەکان و کەرەستە ناسکەکان بە سەلامەتی بگەنە مالی نوێ. کۆشکە تازەکەی سەی ئەسلان بە

گردێکەوە بوو لە جێگایەک بە گەڕەکی جیلوەدار ناسرابوو. هەر بە هۆی ئەوەی، لە دێر زەمانەوە جێگا پشووی بەرپرس و سیاسەتمەدارەکانی دیلاوار بووە، فەسیلێک لە پاسەوانانی تایبەت پارێزگارییان لێدەکرد. دەمێک یەکەم لۆری کەلوپەلیان برد و فەراس ماڵ و گەڕەکە نوێکەی بینی سەری لە ئیشی خودا سوڕما، ئەو پێشتر جێگایەکی وا جوان و سەوزی لە دیلاوار نەبینیبوو. کۆشکەکە وەک دەیانگووت، ماڵی کوڕێکی میر سەلیمی قەرەقازانی بووە. میر خۆی لە مێژە لوتف و هۆگرییەکی زۆری لەگەڵ سەی ئەسڵان هەیە. کوڕەکەی میر سەلیم، کە خانووەکەی سەی ئەسڵان دەیکردە موڵکی ئەو، یاخی ناو بنەماڵە و کایە تێکدەری عەشرەتی قەرەقازانی بوو، بە هۆی نەگونجانییەوە لەگەڵ باوکیدا « کە هەڵبەت حاکمی عەسکەری حاکم یاسین دەکاتە برا بچوکی میر سەلیم» هەوار و گەڕەکی خۆی جێهشتبوو تا لە جێگایەکی دیکەدا ماڵێکی سادە بگرێت و تیا نیشتەجێ ببێت. میر کە لەو ماوەیەدا زۆر هاتوچۆی سەی ئەسڵانی دەکرد، سەرسامییەکی بێسنووری بە زانین و بیرکردنەوە و نیشتیمانپەروەری سەیی هەبوو، هەر خۆی فەرماندار و حاکم یاسینیشی «کە برا بچوکێکی هۆگر و گوێ لە مستی خۆی بوو» خستبووە ژێر گوشارێکی وەهاوە، هەر شتێک سەی ئەسڵان دەیەوێت، دەم و دەست بۆی جێبەجێبکرێت.

ئەوەی میر سەلیمی قەرەقازانی کۆشکی کوڕە یاخییەکەی خۆی دایە سەی ئەسڵان نیشانەیەک بوو بۆ ئەو جێگا گەورەیەی سەید لای میرانی قەرەقازان هەیەتی. کۆشکەکە چوار نهۆمی زۆر گەورە بوو، نهۆمی خوارەوەی تەرخان بوو بۆ فەراس و چەکدارەکانی، نهۆمی دووەمیش کرابوو بە جێگای کۆبوونەوە و شوێنی میوانداریەکانی سەی ئەسڵان، نهۆمی سێهەمیش ماڵ و شوێنی خواردن و خەو و حەوانەوەی سەید بوو، هەرچی ئەرشیف و کتێبخانەکەشیتی لە نهۆمی سەروتر بوو. فەراس

نەوەک لە بەشە عاجباتی و ڕازاوەکانی سەرەوە سەری سوڕما، بەڵکو بە نهۆمی یەکەمیش، کە دەبووە جێگا پشووی خۆی و پاسەوانەکان سەرسام بوو. پێشتر نە لە جێگای وادا ژیابوو، نە شوێنی وای بە چاوانی خۆی دیبوو.

قەرەقازانییەکان بە هەموو هێزی خۆیان لە پشتی سەی ئەسڵانەوە وەستان، تەنیا مەرجیشیان ئەوە بوو کە ڕەزمئارای قەرەقازانی کە هەرزەکارێکی سەرە ڕۆ و بێجڵەو بوو ببێت بە جێگری سەی ئەسڵان و بە یەکێک لە فەرماندە بەرزەکانی ناو سوپای باغەوانەکانی دیلاوار، مەرجێک سەی ئەسڵان بۆ پاراستنی پشت و پەنای خۆی نەوەک هەر قەبووڵیکرد، بەڵکو برایەکی بچوکی ڕەزمئاراشی کرد بە بەرپرسی مالیات و مەسرەف و کاروباری دارایی هەموو سوپاکەی. قەرەقازانییەکان بەوجۆرە هەنگاوێکی گەورە و کوشندەیان دەنا تەواوی دەسەڵات بخەنە بندەستی خۆیان. ئێستا لە پاڵ دەسەڵاتی زۆریاندا وەک فەرماندارانی سوپا، هێزێکی چەکداری نوێیان دروستدەکرد لە ژێر چنگی خۆیاندا بێت. قەرەقازانییەکان دەیانزانی بنەماڵەی ماروفی کە نزیکی سەدەیەکە حاکمی دیلاوارن، بە قۆناغێکی هەرەس و لاوازیدا دەڕۆن. براکانی فەرماندار و کەسە نزیکەکانی کەسایەتییەکی ئەوتۆ گرنگیان تێدا نەبوو بتوانن کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر ژیانی سیاسی هەبێت. سێ ساڵ لە مەوبەر یەکێک لە مامەکانی فەرماندار لە دوای سەفەرێکی خۆرئاوا، کە گەڕایەوە بە نەخۆشییەکی نادیار کۆچیکرد، ئەوە تاکە کەسایەتییەکی گرنگی ماروفییەکان بوو بتوانێت ڕۆڵی سەرۆک و فەرماندار بگێڕێت. مردنی ئەو کێشەی ماروفییەکانی زیاتر قووڵکردەوە و زامی سەختتر کردن. بەرزبوونەوەی خۆری سەی ئەسڵان هەڕەشەیەکی گەورەی بۆ سەر ماروفییەکان دروستدەکرد، بەڵام عەبدولسەلامی ماروفی کە خۆی بە کەسێکی پاک و سادە دەزانی، بێئەوەی گوێبداتە ئاگادارکردنەوەی بەردەوامی خزمەکان و ڕاوێژکارەکانی،

ئەو ماوەیە ئێواران بەو پەڕی دڵسافی و سادەییەوە دەچوو بۆ لای میر سەلیمی قەرەقازانی و لەوێ زۆربەی ڕۆژ سەی ئەسلانی دەبینی، شەترەنجی لەگەڵ دەکرد، پێکەوە لەسەر خوانی فراوان و سفرەی ڕەنگینی میر نانیان دەخوارد و دەیانخواردەوە و هەندێ جار گۆرانی سەردەمی کۆنیشیان دەگووت، ئاوازگەلێک کە ڕۆژانی گەنجی لە بەریان کردبوو.

سێ مانگ بوو باغەوانەکان دامەزرابوو، ترسێکی گەورەیان خستبووە دڵی هەمووانەوە. لە پیاوانی دەوڵەتەوە بیگرە تا خەڵکانی سادەی سەرشەقامەکان، هەموو ترسیان لەم هێزە دڵڕەقە هەبوو کە سڵ لە هیچ ناکاتەوە. هەر ئەو ترسە کارێکی کردبوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ ژمارەی باغەوانەکان زیاتر بن و خەڵک لە ستایش و پیاهەڵدانیاندا زیادەڕەویبکەن. شەوان سەی ئەسلان کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ دەچووە بەر پەنجەرەکە، دوای چەند هەفتە لە کوشتنی بەردەوامی باڵندەکان، ئێستا تاک تاک و پۆل پۆل باڵندەی سەیر و ناوازە لە ئاسمانی دیلاواردا دەردەکەوتنەوە، بەلام ئەو لەم کۆشکە نوێیەدا کەمتر لە باڵندەکان دەترسا، ژیانی ئێستای لەگەڵ غەفارییدا جیاواز بوو. هەموو ژیانی ئیشێکردبوو بگاتە ئەم ڕۆژە، بەلام ئێستا نادڵنیاییەکی قووڵ دایگرتبوو. لەم دواییەدا دوو ڕێگای لە بەردەمدا بوو، یان بێت بۆ ئەم گردە و تەواو تێکەڵ بە جیهانی فەرمانڕەواکانی دیلاوار بێت ، یان بە پێچەوانەوە، بچێتە بۆ ماڵە هاوینەکەی دەرەوەی شار و ببێت بە ئۆپۆزسیۆن. ئەوە لەو بڕیارانەبوو کە دەبوو تەنیا خۆی بیدات، زۆربەی لایەنگرانی گەنجی منداڵکاربوون کە دووبارەبوونەوەی وشەی وەک «دیلاواری مەزن» «سەرزەمینی ئەفسانەکان» «لانکەی مێژوو» لە قسە و نوسینی سەیدا سەرسامیدەکردن. گەرچی لە ناو سیاسەتمەدار و ئەکادیمیست و پارێزەر و حاکم و پزیشکەکاندا هەواداری خۆی هەبوو، بەلام بیری نەکردبووەوە هیچ یەکێکیان وەک ڕاوێژکار وەربگرێت. خۆی لە ناخی دڵەوە ڕقی لە حوکمی بنەماڵەکانی دیلاوار بوو، پێشتر لە

هەندێ نوسینیدا توند ڕەخنەی کردبوون، بەڵام گەر ببووایەتە ئۆپۆزسیۆن، فەرماندار و حاکمی عەسکەری هەر زوو بە تۆمەتی کودیتا و ئاژاوەگێڕی دەیانگرت. باشترین و ئاسانترن ڕێگا ئەوە بوو بچێتە بنباڵی بنەماڵە حاکمەکانەوە تا لە سایەی ئەواندا بتوانێت لەشکرێکی دڕ دروستبکات، تا خۆی و دیلاواریش بپارێزێت. بەڵام ئێستا گەرچی لە پاڵ قەرەقازانییەکاندا دەژیا، گەرچی دەستەیەک گەنجی دڵسۆز و چەکدار لە پاڵیدا بوون، هەستی بە ترسێکی زۆر دەکرد. ئەوەتەی بووبوو بە خاوەنی سوپای باغەوانەکان، زیاتر دەترسا، تا زیاتریش بترسایە فەرمانی بە چەکدارە گەنجەکانی دەکرد دلڕەقتر بن، تا دەهات بازنەی دوژمنەکانی گەورەتر دەبوون، نادیارتر و تێکەڵتر و فرە ڕووتریش. چوار مانگ لەوەوبەر کە بیرۆکەی دامەزراندنی باغەوانەکانی دیلاواری لەگەڵ میر سەلیمی قەرەقازانیدا باسکرد، دەم و دەست دوای هەفتەیەک کەمپێکی تایبەتی مەشقیان بە خۆی و مامۆستا و ئەفسەرەکانییەوە خستە بەردەست. خۆی هیچ کات چاوەڕوانی ئەوە نەبوو، هەستیکرد قەرەقازانییەکان ئیشێکیان پێیەتی و بۆ شتێک پەروەردەیدەکەن، بەڵام قاچی خستبووە یارییەکی مەترسیدارەوە کە گەڕانەوەی تێدا نەبوو، ئێستا جگە لەوەی لەگەڵیدا بڕوات، هێزێکی تایبەتی و وەفادار بۆ خۆی دروستبکات چارێکی تری نەبوو. نەدەبوو جێگرەکەی، کە دەیکردە ڕەزمئارای قەرەقازانی بە هەموو شتێک بزانێت. ڕەزمئارا لەو گەنجە لووتبەرز و لە خۆباییانەبوو کە بەردەوام قژی بە چینێکی ئەستوور لە جێلی بریقەدار دادەهێنێت، هەمیشە و لە هەموو بۆنەیەکدا، زستان بێت یان هاوین لە کراس و پانتۆڵێکی شینی کاڵدا دەسوڕێتەوە، کە هەر کەس لە بەری بکردایە دەبووە گاڵتەجاڕی دونیا، بەڵام لەگەڵ شێوە و جەستە و نیگا ئەرستۆکراتییەکەی ئەودا زۆر دەگونجا و ڕوخساری کەسێکی بە زەبر و نائاسایی پێبەخشیبوو. سەرەتا گەنجێکی گەمژەی فێزن هاتە بەرچاوی کە دەکرێت ئاسان لغاو بکرێت، بەڵام زوو تێگەیشت

کە شەیتانۆکێکی بنەوەبڕ و فێڵزانە و تەواوی ئەو فەرمان و ڕێنماییانە ڕەچاودەکات کە کەسانێکی لە خۆی زیرەکتر لە سەروو یان لە خوار خۆی پێیدەدەن. هەندێ جار وا ڕەفتاریدەکرد وەک ئەوەی سەی ئەسلان تەنیا فەرمانبەرێک بێت، ئیشی خوێندنەوەی وتار و جۆشدانی خەڵک و زیادکردنی خرۆش بێت. زۆری نەبرد کە سەی ئەسلان زانی هاتنی بۆ ناو ئەم کۆشکە جۆرێکە لە تەڵە و گەمارۆدانی هەتاهەتایی، بە جۆرێک ئێستا جیا لەوەی بێ هیچ ئەمسەرە وسەرێک ملکەچی قازانییەکان بێت، چارەیەکی تری نییە. چەند بیریدەکردەوە، لە کتێبخانەکەی خۆیدا ئەمسەرە و سەری دەکرد، سەیری باڵندەکانی دەکرد و جنێوی پێدەدان، تەنیا ڕێگایەک بیگرتایەتە بەر، ئەوەبوو لەگەڵ قەرەقازانییەکان تەبا بێت و بە زورنای ئەوان سەمابکات، بەڵام لە پاڵیدا خەریکی بەهێزکردن و جیاکردنەوەی پێگەی خۆی بێت لە سوپای باغەوانەکاندا و هەموو شتێک بکات جەنگاوەرانی سوپا وابەستە و گوێڕادێری ئەوبن. بۆ ئەوەی خۆی لە چاودێری بەردەوامی قەرەقازانییەکان بشارێتەوە، ڕۆژانە کۆبوونەوەی گەورەی سازدەکرد، هەوڵی ئەوەبوو یەک یەک لە باغەوانەکان نزیک ببێتەوە و بیانبەستێتەوە بە خۆیەوە. دەبوو کاریزمای گەورەی خۆی بەکاربهێنێت تا خۆی وەک تاکە سەرۆک دەربخات. نەدەبوو ئەو کارە لە کە ناڵێکی زانراو و ئاشکراوە بەڕێوەبەرێت. ڕۆژێک فەراسە ڕەش و حامید سوڵتانی ڕاسپارد هەموو زانیارییەکی پێویست لەسەر نەجمی ئایشەگوڵ کۆبکەنەوە. ئایا مرۆڤێکی ڕاستگۆیە؟ فێڵباز و بلۆف چییە؟ دڵسۆزە یان درۆزنە؟ . ماوەیەک دواتر کە هەموو ئەو زانیارییانەی لەسەر نەجمە دەستکەوت، ڕۆژێک بانگیکرد بۆ ماڵی خۆی لە جیلوەدار .

نەجم لەوانە نەبوو توانای چەک هەڵگرتنی هەبێت، بەڵام دەمێک سەی ئەسلان، قسەکانی ئەو ڕۆژەی ماڵە هاوینەکەی خۆی بیرکەوتەوە، واهاتە فیکری کە ئەو لە هەر کەسێکی تر باشتر بێت تا بیکاتە جۆشسێن و

خرۆشێنەری سوپاکەی. چما سوپایەکی وا گەورە پێویستی بە کەسێک نەبوو ئیشی تەنیا گەرمکردن و جۆشدانی سەربازان بێت؟ نەجم گەر چاپوک بایە، بۆ کارێکی واباش بوو، ئەو ئیشە کەسێکی دەویست نە رۆشنفیکر بێت و نە گەمژە، بەڵکو شەیدای دڵگەرمی و حەماسەت بێت. ئەو بە ئاشکرا بۆ هەستێکی قووڵی توانەوە و یەککرتن و گەرمبوونەوە دەگەڕا. بەیانییەک لەگەڵ فەراسدا هەردووکیان هاتن بۆ کتێبخانەکەی سەی ئەسڵان. جامانەیەکی رەشی لە ملییەوە ئاڵاندبوو، کەمە ریشێکی هێشتبووەوە و وەک هەمیشە قژێکی شپرزەی بوو، نارێکی خۆی و جلەکانی لەگەڵ فەزای رازاوەی کۆشکی سەی ئەسڵاندا نەدەگونجان، بەڵام پاسەوانەکان بۆئەوەی بریندای نەکەن و نەیخەنە بەر ترس و دوودڵی هیچ تێبینییەکی تایبەتییان نەدایە. سەی ئەسڵان دوای بەخێرهاتن و تەوقەی گەرم، بەرامبەر خۆی داینا و بێئەوەی هیچ پێچ و پەنایەکی لەگەڵ بکات، دەستی گرت و گووتی «نەجم، یەک قسە، تکایە پێمبڵێ، دەتەوێت لەگەڵ باغەوانەکانی دیلاوار ئیشبکەیت یان نا؟». نەجم گەنجێکی قسە لە روو بوو، بێئەوەی ترسێکی لە سەی ئەسڵان هەبێت گووتی «من ئەهلی تەقە و تفەنگ نیم، هەندێ بەشەر بۆ چەک دروست نەکراون، من لەوانەم. گەر دەتەوێت منیش چەک هەڵبگرم و لەگەڵ مەفرەزەکاندا دەرچم، کاری وا بە من مەسپێرە، من کەسێکی نەخۆشم دەبێت بەردەوام لە جێگای گەرمدا بم، نابێت زۆر لە دەرەوە بمێنمەوە، نابێت سەرما زۆر لێمبدات». سەی ئەسڵان سەری لەقاند و گووتی «قسەم لەوە نییە، تۆ لەوانە نیت بمەوێت بتخمە مەفرەزە چەکدارەکانەوە، من دەزانم تۆ نەخۆشیت، بەڵام دەزانم تۆ حەزیشت لە ئاگرە، ئاگرێک دەروونی ئینسان گەرمبکاتەوە، من دەمەوێت تۆ ئەو ئاگرە بیت، پشکۆی سوپاکەم بیت». نەجم بێئەوەی بزانێت سەی ئەسڵان مەبەستی چییە گووتی «بەڵێ من پێویستیم بە جۆش و گەرمییەکی زۆرە. کە هاتمەوە بۆ دیلاوار بەدوای ئەوەدا هاتم،

من نیوەی ژیانم زیاتر لە دەرەوەی دیلاوار ژیاوم، بەلام لای ئێوە هەر کەسێک نەتوانێت تفەنگ هەڵبگرێت و تەقەبکات، بە کەمئەندام و هیچ لە باردا نەبوو حیسابدەکرێت. بەلام دیلاوار تەنیا بە تفەنگ ناپارێزرێت». سەیی بێئەوەی هیچ لە ویقاری خۆی تێکبدات گووتی «من تۆم بۆ ئەوە بانگکردوە. باغەوانەکانی دیلاوار پێویستیان بە حەماسەتە، پێویستیان بە خرۆشێکی گەورەیە، یەکێک بزانێت چۆن دەروونیان داغدەکات و هۆشیان گەرمدەکاتەوە، من تۆم بۆئەوە دەوێت». نەجم، چاو لە ناو چاو سەیری سەی ئەسلانی کرد و گووتی «ئیشەکەی من چی دەبێت؟ بێ ئەمسەرە و سەر و پێچ و پەنا پێمبڵێ». سەی ئەسلان سەیریکرد و گووتی «ئیشەکەت ئەوە دەبێت، بیخەیتە مێشکی هەموو باغەوانەکانەوە کە ئەم سوپایە تەنیا یەک سەرۆکی هەیە، کارێک بکەیت باغەوانەکان عاشقی سەرۆکەکەیان بن، بە پشت و پەنای خۆیانی بزانن، بە ڕابەری خۆیانی بزانن. گەر ئەوە نەبێت، ئەوا هەر کەس دێت و دەست دەخاتە کاروباری ئێمەوە. گەر هەمووتان لە دەوری من کونەبنەوە، تەمەنی باغەوانەکان زۆر کورت دەبێت. تەنیا شتێک ئەم هێزە بۆ هەتاهەتایە بە یەکەوە گرێبدات عەشقی سەرۆک و عەشقی دیلاوارە. ئەوە کوڕم ئەو تین و ئاگرەشە کە تۆ بۆی دەگەڕێیت، پشکۆی ئەو جۆش و خرۆشەشە کە هەموومان دەکات بە یەک دڵ و یەک دەست. سەیرمکە نەجم... مەڕوانە ئەم کۆشکە کە ئێستا تیا نیشتەجێ بووم، من وەک دەستبەسەر وام، دەزانیت کەسێکیان بە سەردا سەپاندووین کە ناوی ڕەزمئارا قەرەقازانییە، یەکێکی شەیتان سیفەت و بە فیترەت سیخوڕە. ئیشی ڕەزمئارا ئەوەیە باغەوانەکان بخاتە خزمەتی بنەماڵەی قەرەقازانییەوە... تێدەگەیت؟ . لە کاتێکدا ئیشی ئەم سوپا مەزنە شەڕکردنە لەگەڵ دوژمنانی دیلاواردا، پاککردنەوەی دیلاوارە لەو عەشرەت و خێڵە خۆفرۆش و نیشتیمانفرۆشانەی دزەیان کردۆتە شارەکەوە، ئامادەکردنی گەنجەکانە بۆ شەڕی داهاتوو... خۆت دەزانیت شەڕی

داهاتوو سەختترین شەڕی ئێمە دەبێت، شەڕێک دەبێت مێژوو بەخۆیەوە نەبینیوە. ئێمە سوپاسی قەرەقازانییەکان دەکەین، کۆمەکماندەکەن، پارەمان دەدەنێ، ئازوقەمان دەدەنێ. بەڵام دەبێت باغەوانەکان سەرۆکی خۆیان بناسن، خۆشیان بوێت... ئیشی تۆ ئەوەیە ئەو ئاگر باوەشێنبکەیت».

کە قسەکانی تەواوکرد سەیری چاوانی نەجمی کرد، دڵنیابوو ئەرکێکی زۆر گەورەی پێسپاردوە، نهێنییەکی گەورەشی خستۆتە بەر دەست، بەڵام بڕوای بە توانای خۆی لە ناسین و خوێندنەوەی مرۆڤدا هەبوو. نەجم کەمێک وەستا و پاش ئیستێکی زۆر کورت گووتی «جەنابی سەی ئەسڵان، ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاستە، ئاگر بێ وەفاداری لە دڵدا داناگیرسێت. من کە هاتوومەوە بۆ دێلاوار بۆ ئەوە هاتووم لەگەڵ خەڵکی ئەم شارەدا تێکەڵ بم، ببم بە بەشێک لە میللەتەکەی، هەم دەروون و هەم جەستەم چاوەڕوانی ئەو تێکەڵبوونەن. من نەخۆشم و چاوەڕوانی شتێکم گەرمم بکاتەوە. بەڵام گەر ئێستا دەم و دەست بە ئێوە بڵێم بەڵێ جەنابی سەرۆک بەم کارە هەڵدەستم، وەک کەسێکی درۆزن و هەڵپەرست دەردەکەوم. ئەوەی ئێوە داوایدەکەن ئارەزووی گەورەی منە. من دەزانم عەشقی سەرۆک چ ئاگرێک لە دڵی خەڵکی نائومێد و ترساودا دەکاتەوە، بەڵام کارێکە بەرنامەی دەوێت، ئیشی دەوێت، دەبێت بزانم لەگەڵ توانای مندا دەگونجێت. ماوەیەکی کورتم بدەرێ بیربکەمەوە». سەی ئەسڵان، گەرچی ئێستا داوای کۆمەکی لەم گەنجە کردبوو، بە ویقاری سەرۆکێکەوە کە پێویستی بە هیچ کەسێک نییە تا سەرۆک بوونی خۆی بسەلمێنێت گووتی «تۆ لەوەدا ئازادیت خۆت دەردەخەیت یان نا، خۆت دێیتە مەیدان یان هەر کار بە کادێرەکانی تر دەکەیت، لەوەدا بڕیار بە دەست خۆتە». نەجم کەمێک جامانەکەی ملی توندکردەوە و وەک کەسێک لە ناکاو هەست بە سەرما بکات گووتی «گرنگترین شت بۆ من باری ڕۆحییە، من پێویستم بە شتێکە جۆش و خرۆشی بگاتە سەر ئێسقانم. ژیان خۆی

سارده، دەبێت بە حەماسی شتی گەورە گەرمیبکەینەوە، لای من ڕاست و درۆ نرخی نییە، بەڵکو خرۆش و گەرمی، تێکەڵکردنی عەشق و سیاسەت، فیداکاری و ئیمان، ئەوانە گرنگن. من بۆئەوە هاتمەوە بۆ دیلاوار، لێرە مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێت شتێک بدۆزێتەوە بۆی بژی... هەر شتێک بێت گرنگ نییە، عەشق بێت، دوژمنایەتی بێت، ئاشتی بێت یان جەنگ... هەر شتێک وابمهەژێنێت هەستبکەم هێشتا نەمردوم، هەستبکەم لەشم لەو سەرمایە دوورکەوتۆتەوە... من دەردێکی پیسم هەیە، سەرمایەکی سەیر بەردەوام لە ئێسقانمدایە». وایگووت و خۆی لە شوێنی خۆی هەستا، وەک بەوە بزانێت قسەکان کۆتایی هاتوون. حەزی لەدانیشتنی وا کورت و ڕوون و خێرا بوو، نەیدەویست ماوەیەکی زۆرتر بمێنێتەوە و قسەیەکی دی بکات. پیاوێک بوو ئارەزووی لە قسەی پەراوێز و زۆر گووتنی لابەلا نەبوو، شتەکان چی بوونایە وەریدەگرت و چی هەبایە دەیبەخشی و هەڵدەستا و ئەو جێگایەی بەجێدەهێشت. کەسێک بوو پێچەوانەی سەی ئەسلان کە پەراوێزی لە جەوهەر لا گرنگتر بوو.

خواستی سەی ئەسلان ئەوە بوو بە جۆرێک خۆی بگرێت، قەرەقازانییەکان نەتوانن هەر کاتێک ویستیان لە شوێنی خۆی وەک سەرۆک و دامەزرێنەری باغەوانەکان دووریبخەنەوە. دەیزانی قەرەقازانییەکان دەیانەوێت وەک فەرمانبەرێکی پلە باڵای خۆیان سەیریبکەن، ئێستاش خستبوویانە بازنەی گەمارۆیەکی گەورەوە، هەرچییەکی کردوە دەبێت هێزی خۆی جیابکاتەوە و وەک سەرۆکێکی ڕاستەقینە و بێ ڕکابەر دەربکەوێت، گەر نا کەم کەم دەموچاوێکی تری دەخەنە جێ و لە دەرفەتێکی گونجاویشدا دوور نییە لە ناوی بەرن. ئەو ترسە سەی ئەسلانی دەخوارد... وایدەکرد گومان لە هەموو شتێک و هەموو کەسێک و هەموو شوێنێک بکات. لە قووڵایی دڵدا زۆر ڕقی لە قەرەقازانییەکان بوو، دەیزانی دیلاوار لای ئەوان تەنیا سەرزەمینی دەسەڵات و فەرمانڕەواییە،

نەوەک نیشتیمان. دەیزانی ئێستا هەموو خەیاڵی ئەوان تەنیا لای ئەوەیە چۆن ئەم بەکاربهێنن، هەموو خەیاڵی ئەمیش نیشتۆتە سەر ئەوەی، چۆن قەرەقازانییەکان بەکاربهێنن.

لەو ڕۆژەوە کە نەجم بوو بە سەرۆکی تیمێکی نهێنی پڕوپاگەندە، دەرکەوتن و درەوشانەوەی سەی ئەسلان چەند پلەیەکی دی بەرزبووەوە. بەیانییەک دێلاوارییەکان لە خەو هەستا و بینیان دار و دیواری دێلاوار بە دروشم و ستایشی خەباتگێڕی گەورە سەی ئەسلان ڕازاوەتەوە. دیاربوو شەو چەندین تیمی نهێنی ئاوابوونی مانگیان بە هەل زانیوە و لە ژێر باڵی تاریکیدا وەک کارێکی نهێنی بکەن ئەو دروشمانەیان نوسیوە، لە هەمان ماوەدا، ناو بە ناو، هەر جارەش لە گەڕەکێکەوە گەنجان و منداڵان وەک ڕووداوێکی خۆڕسک و سروشتی دەڕژانە سەر شەقامەکان و پەڕۆی وەنەوشەیی باغەوانەکانیان دەبەست و هاواریاندەکرد «بژی سەرۆک، بژی ڕابەر، بژی ئەسلان».

هیچ کات میر سەلیمی قەرەقازانی خۆی وا پیشان نەدەدا کە بڵندبوونەوەی خۆری درەوشاوەی سەی ئەسلان شتێک بێت دڵی قەرەقازانییەکان ناخۆشبکات، شەوان وەک هەمیشە و بە دەستووری خۆی، خوان دەڕازایەوە، هەم سەی ئەسلان و هەم سەرکردەکانی تری دێلاوار ئامادەدەبوون، شەرابیان دەخواردەوە، گۆرانیان دەگووت، گوێیان لە مۆسیقای ڕەسەنی ناوچە جیاوازەکانی دێلاوار دەگرت.

ئەو ڕۆژگارانە بەوجۆرە بوو... لە گردی جیلوەدار هەم شەراب، هەم سوفرە، هەم ترس حوکمیاندەکرد. سەی ئەسلانیش لە مامۆستایەکی بچوکی مێژووەوە، ئێستا یەکێک بوو لەوانەی لەگەڵ حاکمە دێرین و بنەماڵە گەورەکاندا ململانێی دەکرد.

## خەونێك لەدەفتەری خەونەکانمەوە

وادەبینم وەک شاخەکان لە ئاسن بن، ئاسنی رەش. چیایەک لە ئاسن کە گوڵی ئاسک و قەشەنگی لەسەر رواوە. گوێم لە دەنگی پێڵاوەکانی خۆمە، کە بەر ئاسنی سەخت و پڕ زرینگەی زەوی دەکەوێت، دەنگی پێڵاوەکانم هێند بەرزە، وەک دەنگی پێی دێوێک وەهایە بە هێمنی بە ناو دۆڵێکی کپدا بگەڕێتەوە بۆ ماڵ. ئەو هەستە سەیرەم هەیە کە من هەم دێوم و هەم ئەو کەسەم کە لە دەست دێو هەڵهاتووە. لە چرکەیەکدا دێوم و زەوی لە ژێر قاچمدا دەلەرێتەوە و لە چرکەکەی دیکەدا بەترسەوە ئاوڕدەدەمەوە و هەستدەکەم من مەخلوقێکی بچوکم و جانەوەرێکی گەورە خەریکە پێم پێدادەنێت... من دێوم و دێو نیم... دێوم و دێو نیم. دواجار خۆم لە تونێلێکی تاریکدا دەبینمەوە کە هەزاران چەکوش دەکێشن بە دیوارەکانیدا. ماوەیەکی درێژ دەڕۆم و جگە لە چەکوشەکان کە سەربەخۆ و بێ هیچ دەستێک، بێ هیچ شان و بازوویەک دەکێشن بە دیوارەکاندا هیچ نابینیم، لە ناکاو دەموچاوی سەیر سەیر، عارەقاوی، ماندوو، لە تاریکیدا دەردەکەون... هەندێکیان پێدەکەنن، هەندێکیان دەڵێن «وای»، هەندێکیان دەگرین، هەندێکیان بێباک سەیردەکەن ... دەنگێک دەڵێت «تماشا تماشا کێ لێرەیە، تماشا تماشا کێ لێرەیە، تماشا تماشا کێ لێرەیە». وەک یەکێکی نەبینراو پەلم رابکێشێت، هێزێکی بارەشئاسای توند لەگەڵ خۆیدا دەمبات، لە بەردەم ئاوێکی شیندا دەوەستم، مامە سیام لەسەر بەردێکی رەش لە ناوەراستی ئاوەکەدا دانیشتووە و دەڵێت «مستەر گرینۆک وەرە دەموچاوت بشۆ، ئەم ئاوە زۆر پاک و زولالە». باوکم لە پشتمەوە وەستاوە و دەڵێت «گوێت لێ نەبوو مامە سیات چی گووت، کەرێت، گێژێت، کەرێت، گێژێت، کەرێت، گێژێت، گوێت لێ نییە؟». دەمەوێت بەرەو لای مامم بڕۆم، بەڵام

دەیبینم دەکەویتە ناو ئاوە شینەکەوە و دەخنکیت. من سەیریدەکەم دەخنکیت ... دەتوانم دەستی بۆ دریژبکەم و دەریبهینمەوە، بەلام بە خەندەیەکی دزیو و رەشەوە سەیریدەکەم و دەستی نادەمی. دەنگیک لە پشتمەوە دەلیت «هەتا تۆش ئەی مستەر گرینۆک... هەتا تۆش...». بەلام ئەمجارە نازانم دەنگی کییە، دەنگیکی ناسیاوە، دەنگیکە بیستوومە، بەلام لە خەو رادەچەنم و هیشتا تەواو تینەگەیشتووم کە دەنگی کییە.

# ٣٥

بۆ ڕۆژی دوایی سەردەکەوینە سەر ترۆپکەکان، سەر لوتکەیەکی سەرکەش کە بەسەر زەمینێکی سەیر و ئاڵۆز و بەریندا دەڕوانێت. پێدەچێت نەقیب نەجات پێشتر چەند جارێک ئەم جێگایەی بینیبێت. کە سەرکەوتین نزیکی پەنجا کەس بووین، ئیشکەرەکان هەموو تێشوو و پاچ و بێڵ و خاکەنازیان پێ بوو. لە بانی ترۆپک لە پشت زنجیرە بەردێکی تیژەوە، تەختانییەکی گەورە هەیە، دەبێت لەوێدا بنکەیەکی چاودێری گەورە و مەحکەم دروست بکرێت، بنکەیەک هەم چەند یەکەیەکی جەنگاوەر بتوانن وەک خاڵێکی بەرگری بەکاریبهێنن، هەم شوێنی دامەزراندنی ڕوانگەیەک بێت بۆ چاودێری جوڵەی دوژمن. کە گەیشتینە سەر لوتکە و لە بان ئەو تەختانییە پشوویەکمان دا، هەوا ساف و ئاسمان ڕوون و خۆر بە تین بوو، دوای چا خواردنەوەیەکی کورت من و نەقیب نەجات چووینە پشت بەردێکی گەورە و نەقیب دووربینەکەی خۆی دایە دەست من و گووتی «بڕوانە، لێرەوە بەشێکی زۆری خاکی دوژمن لە بەردەممانداییە». دەستی درێژکرد و بە ئاماژە پیشانیدام « لێرەوە جوڵەی زۆربەی هێزەکەیان دەبینین، سەیری ترۆپکی ئەوبەر بکە، دوژمن لەوێدا بنکەیەکی گەورەی دامەزراندوە، زۆرجار پاسەوانەکانیان دیارن کە دێنە خوارتر و بەسەر دامێنی دۆڵدا دەڕوانن. گەر شەڕبکەین یەکەم جێگایەک دەبێت بیگرین ئەو لووتکەیەیە. وا مەزانە

ئەوە کارێکی ئاسان دەبێت، گەر جەنگ هەڵبگیرسێت، ئەم دۆڵەی نێوانمان پڕدەبێت لە لاشە، دوور نییە یەکێک لەو لاشانەش من بم یان تۆ بێت یان هەر کەسێکی تر لە ئێمە. دوژمن ماوەیەکی زۆرە و بە جۆرێکی ڕۆژانە و بە نهێنی و بێ ڕاکێشانی سەرنجی ئێمە هێز بۆ پشتی چیا دەهێنێت. گەر شەڕ بێت ئەم زەویەی نێوانمان هەمووی خوێناوی دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من ئارەزووی جەنگ دەکەم، چاوەڕوانیدەکەم. وای جەنابی مستەر تۆ نازانیت چەند بە خۆزگەوە بۆی دەژیم. دەبێت لێرە بنکەیەکی مەحکەممان هەبێت تا چاودێری بەسەر ناوچەکەدا وننەکەین، لەم شوێنەدا دەبێت ئیشێکی زۆر بکەین، دەبێت پەناگایەکی کۆنکرێتیمان هەبێت تا هێزێکی کۆماندۆی مەشقکراو خۆی بشارێتەوە، کرێکارەکان دەبێت لە بایەخ و نرخی ئەم ئیشەی خۆیان بزانن. ئیشێکی سەخت دەبێت، دەبێت تۆ تێیان بگەیێنیت، دەبێت بزانن، لەمڕۆوە دەبێت دەستبکەن بە هەڵکەندن و قووڵکردنەوە، سەعاتێکی تر ئەندازیارەکان دەگەنە بەرەوە، ئەم لوتکەیە ساردترین لوتکەی ناوچەکەیە، لەوانەیە لە مانگێک یان چل شەوی ترەوە بەفر دەست بە بارین بکات. تا خێرا ئیشبکەین لە قازانجی خۆمانە. سەیرکە لەم ترۆپکەوە تا ئەوسەر، لە هەموو لوتکەکاندا تا چاو بڕبکات. لە هەموو جێگایەکدا فەسیلێکی وەک ئێمە ئیشدەکات، لە هەرجێگایەکەوە دوژمن دزەبکات بۆ ناو دێلاوار دەبێت ڕێگای لێبگرین... دەبێت سەنگەر لێبدەین».

من زۆرسەرم لەو شتە سەربازییانە دەرنەدەچوو، سەیرێکی فەسیلەکەم کرد و لە ناخەوە هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا. دڵنیابووم ڕۆژانێکی سەخت لە بەردەمماندایە، بەڵام ڕاگرتنی ئارامی دەروونی فەسیلەکەش کارێکی ئاسان نەبوو. ئەوەی سەخت بوو ئەوە بوو هیچ ئیشکەرێک تا کۆتایی زستان و تەواوبوونی بەشی زۆری کارەکان نەیدەتوانی ئەم هەرێمە بەجێبهێڵێت، ئەوانەی سەرپێچیان بکردایە دەبران بۆ زیندانێکی سەربازیی کە بە قسەی نەقیب لە ناو چیاکاندا بوو، ئیشکردن لەوێ هەلومەرجێکی سەختتری

هەبوو. من دەبوو بەر لەوەی فەسیلەکە دەستبکات بە ئیش هەموو شتێکیان پێبڵێم. هەر لە سەرەتاوە ترسێک و دوودڵییەکی زۆر لە چاوی هەمواندا بوو. ساتێکی سەخت و ناخۆشی ژیانی من بوو، ساتێک کە ئیتر تەواو وەک هەر یەکێکی دی لە دیلاوار ڕادەستی ئەو شەپۆلە گەورەیە دەبووم کە هاتبوو، یان دەبوو لێگەڕێم ئەم ئیشکەرانە بێ هیچ پشت و پەنایەک لەم شاخەدا کاربکەن یان بە قسە فریویانبدەم و مانایەک بە کارەکەیان ببەخشم. دووربینەکەم لە نەقیب وەرگرت و یەک بە یەک کرێکارەکانم بردە پشتی بەردەکە و پێمگووتن «سەیربکە، ئەو تارماییانە دەبینیت کە لەوبەر لە نێو بەردەکاندا هاتوچۆدەکەن، ئەوانە دوژمنن، تێدەگەیت، دوژمن کە چەند وەختە دێتە خەونمان، هەڕەشە لە شارەکەمان دەکات، هەڕەشە لە ژیانمان دەکات، ئێمە بۆیە لێرەین تا کاربکەین. گەر کارنەکەین دەمانبەن بۆ زیندان، زیندانی ئیشکەرەکان نزیکی دوو سەعات لێرەوە دوورە، لە ناو چیاکانی باکووردایە، لەوێ ئیش هەروا ئاسان نییە، سەختتر و ناجۆرترە، چاودێرەکان دڵڕەقترن، بە شەویش پشوو نییە. هەر چییەکمان کردوە دەبێت بەرگە بگرین، هەر چییەکت کردوە دەبێت هێز بدەیتە خۆت و نەکەویت و نەڕوخێیت. شتەکە تایبەتە بە دوژمن... بڕوانە ئەوەتان، دەیانبینی لە دووربینەکەتدا ...ئەوەتان، زۆر نزیکن. دەبێت بزانین کە لە جەنگداین، لە شەڕی مان و نەماندایـن... هەر پاچێک دەیدەیت لە زەوی وابزانە کە گورزێکە و دەیدەیت لە دوژمن، هەر بستەخاکێک هەڵیدەکەنی وابزانە گۆڕێکە و بۆ دوژمنی هەڵدەکەنی، بزانە تۆ لێرە جەنگاوەریت و دژ بەوە شەڕدەکەیت کە مایەی بەدبەختی و نەهامەتی ئێمەیە».

دەبوو ئەوە یەکە بە یەکە بۆ هەموو فەسیلەکە دووبارەبکەمەوە، تاکە شتێک ورە و هێزی دەخستنە بەر ئەوە بوو باسی دوژمنیان بۆ بکەیت، باسی ئەو جەلادەیان بۆ بکەیت کە دێتە خەونەکانیان و سەریان دەبڕێت، جەلادێک کە ئێستا بە خۆی و هەموو تفاقی کوشتن و سەربڕینەوە

بەرامبەریان بوو، لە دووربینەکەوە دەیانبینی. هەموو ئەو ڕۆژەم بەو جۆرە بردەسەر، لە ڕۆژانی داهاتووشدا دەبێت ئەوە دووبارەبکەمەوە. لە ناخی دڵەوە بێزاربووم لە خۆم ... دەمزانی دەبێت ئەو شتانە بڵێم کە بڕوام پێیان نییە، ئەو ترسانەیان بیربخەمەوە کە دەمویست لە یادیبکەن. هەستمدەکرد پلانەکانی مامە سیا و دکتۆر جاهدار، سەبارەت بە چارەسەری بە شۆکی دوژمن، بەجۆرێکی سەیر لەگەڵ ڕۆحییەت و خەیاڵی هەموو ئەم خەڵکەدا دەگونجێت. منیش بووبووم بە بەشێک لە ئامێرەکە، ئێستا وا قسەمدەکرد و ڕەفتارمدەکرد وەک ئەوان دەیانەوێت، ئیتر هیچ بەهانەیەکم نەبوو خۆم لە مامە سیام یان دکتۆر جاهدار یان هەر کەسێکی تر بە باشتر بزانم. منیش ڕۆحێک بووم جگە لەوەی بەو ڕێگایەدا بڕۆم کە بۆم کێشراوە، ڕێگای ترم نەدەبینی. بەڵام من تەنیا مامۆستای ئەو کارە نەبووم، هەر من نەبووم کە بەردەوام دەربارەی دوژمن قسەمدەکرد. دە ڕۆژ جارێک ئەو دوو گەنجەی کە گوایە پسپۆڕی دوژمنناسی بوون، لە شارەوە دەهاتن و قسەیان بۆ کرێکارەکان دەکرد. من هیچ کات نەچووم گوێبگرم بزانم چی دەڵێن و چۆن دوژمن دەناسێنن. هەر دووکیان سەروقاتی جوانیان دەپۆشی، کراسێکی خاکی و بۆینباخێکی سووری ئاوریشمیان لەبەردەکرد، شێوەیان لە دوو گەنج دەچوو بۆ زەماوەند هاتبن، هەردەم ئەو خەندە ساف و منداڵانەیە لەسەر ڕوخساریان بوو، پێکەنینێکی گەش کە لەگەڵ وەزیفەکەیاندا وەک کینەچێن و پروپاگەندەکار نەدەگونجا. لای من سەمبولی ئەو دەموچاوە ناکۆکەی جەنگ بوون، کە هەمیشە خۆ لە ژێر خەندە و دەمامکێکی پاک و دڵسۆزانەدا دەشارێتەوە. کاتێک دەهاتن و من بەو کرێکارە بەدبەختانە بەراوردمدەکردن، تووڕەیی و دڵتەنگییەکی زۆر دایدەگرتم... بینینی ئەو دوو گەنجە ڕوخۆشە، ڕووپاکە کە بە خەندەیەکی منداڵانەوە سڵاویان لێ دەکردم و دەچوون بۆ باسی دوژمن، لە هەر شت زیاتر تووڕە و بێحاڵی دەکردم.

دەبوو لە چەند ڕۆژی یەکەمدا پەناگایەکی کۆنکرێتی لە لوتکەکەدا دروست

بکرێت، خودی بنکەکە سەرەتا دەبوو بە نیشتەجێی تیپێکی پسپۆری تایبەت بە دەزگای هەواڵگری سەربازی، بەلام بەر لەوە دەبوو بە ماڵێکی قایم بۆ خودی ئیشکەرەکان. لە خواریشەوە ئیشکردن بە جۆرێکی شێتانە بۆ دروستکردنی کۆمەڵێک بینا و خەندەک و پەناگا دەستی پێکرد. بە فەرمانی نەقیب و تیمێک لە ئەندازیارانی تایبەت، نەخشە و شوێنی سەربازگا نوێکە دیاریکرا، شوێنی عەمبارێکی گەورە لە بنی چیادا، حەشارگای خۆشاردنەوە لە کاتی تۆپباراندا، جێگای خەندەکێکی درێژ کە دەبوو لە کاتی پەلاماردا وەک دوا سەنگەری بەرگری بەکاربێت . سەرەتا دەبوو قاوشە گەورەکان تەواوبن. بەردەوام هێزەکەمان لە دوو دەستەی گەورەدا ئیشیاندەکرد، دەستەیەک چەند سەعاتێک کاریاندەکرد و ئەوانی تر پشوویاندەدا. ئیشەکە ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕەوتێکی سەختتری وەردەگرت. سەرەتا هەموو هەر بە ئیقاعی ڕۆژانی مەشق کاریاندەکرد، بەلام لە ژێر فشاری کات و سەختگیری سەرکردە سەربازییەکاندا، هەم سەعاتەکانی کار زیادیانکرد و هەم جۆرێتییەکەی. گەرچی کارەکان سەختبوون، بەلام بە جۆرێکی ناسروشتی خێرا و بێگری دەڕۆیشتن. ئەو هەستەی کە لە داهاتوویەکی نزیکدا پەلاماری دوژمن دەدەین، ئیشکەرەکانی خستبووە سەر هەوای خۆ ماندووکردن و کاری بێپشوو. هەستمدەکرد خواستی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن هێند گەورەیە، بەسەر هەر سەختی و ئارەزوویەکی تردا سەردەکەوت. ئەوەی لای من سەیر بوو جگە لە هەندێ وردە دەمەبۆڵە و لەیەکدی گیربوونی ئاسایی، زۆربەی ئیشکەرەکان وەک بیماری دەروونی ڕەفتاریان نەدەکرد. دیارە غەمۆکی و هەڵچوونی لە ناکاو و پەشۆکانی کتوپڕ و تووڕەبوون و گریان هەبوون، بەلام من هەر زوو خۆم دەخستە نێو بەین و شتەکانم ئارامدەکردەوە. ئەوانەی بیری منداڵەکانیان دەکرد، یان حەسرەتی کەسێک یان عەشقێک تووشی پەشۆکانی کردبوون، لەوانی دی پتر کاریاندەکرد تا ماندوێتی بەردەوام یاد و تێفکرین و سۆزیان بکوژێت. دووان لەو پیاوانەی

کە زۆر پەرێشانی عەشقەکانیان بوون، بە شەویش پشوویان نەدەدا، لە کاتی پشووەکانیشدا کەمترین کات دەوەستان... ئیشی بەردەوام تاکە ڕێگایان بوو لە دۆزەخی ڕۆح هەڵبێن. زۆر شەو بە فەرمانی نەقیب نەبایە نەدەوەستان، دەیانویست لەشیان بخەنە ژێر بەرداشی ماندووبوون، تا لەگەڵ لەشیاندا هۆشیشیان وردبێت. دەیانویست بەجۆرێک بچنە ژێر باری هیلاکی کە یادەوەریشیان لەگەڵ جەستەیاندا ویران بێت.

چەند شەوی یەکەم، من جەستە و ڕۆح و خەیاڵم لەگەڵ ئەم جێگایەدا ناتەبا و نەگونجاو بوو، من وەک جانەوەرێکی شارنشین و کەسێک کە لەدایکبوونەوە پەروەردەی شارستان بووم، ئەم کێو و چادر و بەردەڵان و ترۆپکانەم زۆر پێ سەخت بوو. بۆ مرۆڤی شارنشین، سروشت بۆتە جێگایەکی ناسروشتی، بۆتە جێگایەک کە تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت و بە مەبەستی گۆڕینێکی کەمی ژیانی ڕۆژانەمان بەرگەی دەگرین. هەر لە دوو ڕۆژی یەکەمەوە هەستم بە بێباکی ترسناکی سروشت کرد، کە کرێکارەکانم دەبینی لە لوتکەکەدا بە پاچ و پیک و درێلی زەویلێدەر شاخەکە کوندەکەن، هەستم بە بێباکی چیاکان دەکرد، ئەم زرمە و چەکوش و کۆهکەنییە چی بوو لە چاو گەورەیی و مەزنی بەردە خەوتوو و مۆن و بێدەنگەکانی ئەم چیایەدا. ئێستا بووبوو بە مەراقێکی گەورەم کە دووربین لە سەربازانی چاودێر یان لەخودی نەقیب وەربگرم و سەیری دوژمن بکەم کە وەک تارمایی ورد و بچوک لە لوتکەکانی ئەوبەرەوە سەیری ئێمەیان دەکرد. هێدی هێدی وام لێهات ڕۆژانە باسی دوژمنم دەکرد، بۆئەوەی مەنتیق بە قسەکانم ببەخشم و وابکەم کاریگەربن بەردەوام لە مەترسی دوژمن دەدوام. زۆرجار هەستمدەکرد ئەو قسانەم چەندە بەخشینی تین و تاوە بە ئیشکەرەکان، خۆفریودانێکی پێویستیشە بۆ ڕۆحی شپرزە و لاواز و بێئاراستەی خۆم کە هیچ کات نەیتوانیوە بۆ هیچ شتێک جەنگاوەرێکی وەفادار بێت.

زۆری نەبرد تووشی پەشۆکانێکی سەیربووم، هێدی هێدی کەوتمە بەر هێرشی خەونە نامۆکان، بووم بە سەرێکی جەنجاڵ کە خەون هەراسانیدەکات. شەوان حاڵەتی سەیر دەیگرتم، خەونم دەبینی و وەک شێت وریادەبوومەوە، هەڵدەستام خێرا خەونەکانم لە دەفتەرێکدا دەنوسییەوە و بە پەلە چراکەم خامۆشدەکرد و دەخەوتمەوە... شەوی چەندین جار ئەوە دووبارەدەبووەوە ـ دەخەوتم، خەونم دەبینی، هەڵدەستام، چرام هەڵدەکرد، خەونەکانم دەنوسییەوە، چراکەم خامۆشدەکرد، دەخەوتم، خەونم دەبینی، هەڵدەستام، چراکەم هەڵدەکرد، خەونەکانم دەنوسییەوە، چراکەم خامۆشدەکرد. دەخەوتم، خەونم دەبینی ... دەخەوتم، خەونم دەبینی .... دەخەوتم.

ئیش هەم سەخت و هەم زۆر بوو، لەگەڵ هەموو چاپوکی و چالاکیدا هەندێ لە کرێکارەکان دەبووارانەوە، هەندێ تووشی نۆبەتی تورەیی و گرژی دەبوون و دەبوو من ئارامیانبکەمەوە. سەیربوو، ماندویتی زۆر هەندێکیانی ئارامدەکردەوە، من بۆ ئەوەی لە هەموانەوە نزیک بم هەر ئێوارەیەک لە ژێر چادرێکدا نانم دەخوارد. هەندێ جار کرێکارەکان پێیان دەگووتم «مستەر گرینۆک تۆزێک بۆمان بگری... توخودا تۆزێک بۆمان بگری». من بێئەوەی بزانم بۆ، بێئەوەی بمەوێت، بێئەوەی مەبەستم بێت، چاوانم پڕدەبوون لە ئاو. هەندێ لە کرێکارەکان کە دەیانبینی من بە ڕاستی دەگریم، وەک من چاویان پڕدەبوو لە ئاو و هەندێکیان پێدەکەنین. من هەوڵمدەدا تا دەتوانم بیانخەمە پێکەنین. زۆربەی شەوان کرێکارەکان سەربورد و چیرۆکی ژیانی خۆیان دەگێڕایەوە، من لە ناویاندا دادەنیشتم و گوێمدەگرت. هەندێ جار هەستمدەکرد لە کۆڕی ژمارەیەک پیاوی عاقڵ و فامیدەدام، هەندێ جاریش هەستم بە پەریشانی و پەرتەهۆشی ئەم پیاوانە دەکرد، هەندێ جار هەستمدەکرد من تاکە شێتی ناویانم و هەندێ جاریش هەستمدەکرد من تەنیا عاقڵی ئەم ئۆردوگایەم. شێتی و عاقڵی لە مرۆڤدا شتێکی هەمیشەیی نییە، شێتی و عاقڵی دوو پێتن لەسەر یەک

هێڵ، مرۆڤ هیچ کات لە پنتی موتڵەقی شێتی یان عاقڵیدا نییە، بەڵکو لە هاتووچۆیەکی هەمیشەییدایە، لێرەوەیە دەکرێت بەیانیان شێت بین و شەو عاقڵ، نیوەڕوان هێمن و فامیدە بین و ئێواران شێت و هەڵچوو. هەموو پیاوانی کەمپەکە بەوجورە بوون، تووشی نۆبەتی کتوپڕی شێتی دەبوون و نۆبەتی حیکمەت و عاقڵیشیان هەبوو. دادەنیشتن و بە هێوری باسی ژیانیان دەکرد، لە ناکاویش هەڵدەچوون، کەفیان دەردەدا، دەیاندا بەسەری خۆیاندا، کوفریاندەکرد، ئاسمانیان دەدایە بەر تف. ئێستا هیچ کەس باسی خەونەکەی نەدەکرد، بەڵام زۆر باسی دوژمنیان دەکرد. ئەوەتەی دوژمن بووبوو بە شتێکی کۆنکرێت و بەرجستە، لەو کاتەوەی لە دووربینەکەوە تارمایی بچوک و لێڵی خودی دوژمنیان بینیبوو، چیتر دوژمن تەنیا وەک خەون و خەیاڵێک دەرنەدەکەوت، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ و تا دەهات زیاتر دەبوو بە حەقیقەت، تا زیاتریش لە ڕاستی نزیک ببایەتەوە، کەمتر خەونمان پێوە دەبینی. نەقیب نەجاتیش هەستی بەو ڕاستییە کردبوو، جار جار نەقیب بواری دەدایە کرێکاران تا سەربکەون و لە بن بەرد و تاوێرانی سەر ترۆپکدا سەیرێکی دوژمن بکەن، دووربینەکەی دەدایە دەست ئیشکەرەکان و ڕێگای دەدا نیگایەکی تر لە دوژمن بگرن. بینینی بەردەوامی ئەو تارماییانە هەستی جیاوازی دروستدەکرد ... ئەو مەترسیانەی جاران تەنیا لە خەودا بینیبوویان ئێستا بەزەقی و لە شوشەی دووربینەکەوە دەیانبینی. پەرچەکردارەکان جیاوازبوون، هەندێکیان هێندەی دوژمنیان دەبینی دەمودەست جنێویان دەدا، سەرسام وەک شتێکی عەجایەب و جۆرە مەخلوقاتێکی نازەمینییان ببینیێت تووشی گێژ و ورییەکی کتوپڕ دەبوون، هەندێکیان بارێکی هیستیریی و هەڵچوون و خرۆشانێکی نەخواستراو دەیگرتن و دەیانویست تفەنگ هەڵبگرن و دەم و دەست لەویادا پەلاماری چیاکانی ئەو بەر بدەن. من زۆرجار دەبوو هێمنیان بکەمەوە و داوایان لێبکەم کە تورەیی تەواوی خۆیان هەڵگرن بۆ ساتەکانی جەنگ و ڕۆژانی ڕووبەڕووبوونەوە.

گەر نەقیب نەجات قسەی بۆ کرێکارەکان بکردایە، بەردەوام یەک ڕستەی دووبارەدەکردەوە «سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، لەم چەکوشانەی دەستی ئێوەوە دەست پێدەکات». نەقیب قسەکەرێکی باش نەبوو، بەلام کە دەیبینی ئیشکەرەکان خۆیان ماندوودەکەن ئەویش حەماسەت دەیگرت و حەزی قسەکردنی گوڵی دەگرت، هەستمدەکرد توانای کرێکارەکان و بەردەوامی و خۆگریان هۆیەک بوون نەقیب ئارام و سەنگین بنوێنێت. ئیشی فەسیلەکە لەوە باشتر و خێراتر بوو، بوار بە نەقیب بدات غەریزە بەد و جیدیەتە دڕندانەکەی خۆی دەربخات، بەلام هەمیشە لەگەڵ بانگی بەیانیدا هەڵدەستا و بە چاوە شینە جیدی و گورگ ئاساکانییەوە بە سەر ئیشکەرەکاندا دەگەڕا، کاتێک کە تەختەبەستەکان بۆ تێکردنی سەقفەکان هاتن، زۆر غەمخۆر بەدیار هەموو ورد و درشتێکەوە بوو. ئەو ماوەیە خۆمم زۆر لێ لادەدا، هەستمدەکرد شتێکی تایبەتی من و ئەم پیاوە کۆناکاتەوە، نیگا و شێوەی وەستان و جۆری سەیرکردنی بۆ چیاکان، بۆ کرێکارەکان، بۆ سەنگەر و بیناکان توڕەیدەکرم. هەندێ کەس هەن هەتا کاتێک سەیری ئەستێرەش دەکەن، چاویان پڕە لە غرورێکی گەورە، ئەو لەوانە بوو، هەندێ کەس هەن گەرچی زۆر بەهێزنین، لەسەر هیچ عەرشێک نەوەستاون، کەچی فیز و هەوایەکیان هەیە، ڕەنگە ئەوانەی لە ئاسمانیشن نەیانبێت. ئەوەی لای من سەیربوو ئەوە بوو، هەستم بە غروری نەقیب تەنیا لەو کاتانەدا بوو کە پێکەوە قسەمان نەدەکرد و لە دوورەوە سەیری چۆنێتی وەستان و ڕۆیشتن و نیگاکردنیم دەکرد، کاتێک پێکەوە دەدواین ئەو هەستەم وندەکرد و نەقیبم وەک کەسێکی ئاسایی دەبینی. ئەو هیچ هۆیەکی نەبوو لە دەست من یان لە دەستی فەسیلەکە گلەییبکات. ڕۆژانە بەرنامەکان هەرچییەک بووایە ئیشکەرەکان زیاتر کاریاندەکرد و ئیشێکی فرەتریان ئەنجامدەدا، هەمیشە بەرنامەکە چەند هەنگاوێک لە پێش پلانی دیاریکراوەوە بوو، هەتا جارێکیش کە مەحمودی قەرەقازانی لەگەڵ کۆمەڵە ئەفسەرێکی پایەبەرزی

دیکەدا هاتن بۆ پشکنین، سەرسامبوون لەوەی فەسیلەکەمان بە چ هیمەت و خێراییەکەوە کاردەکات. من هەموو شتێکم دەکرد کە دۆخی دەروونیان باش بێت، خۆم بۆ دەکردنە لیبوک، شەوان لە ژێر خەیمەکاندا ئاهەنگی بچوکی گۆرانی گووتنم بۆ سازدەکردن، پێشبڕکێی هەندێ گەمەم بۆ ڕێکدەخستن... دانیشتنی تایبەت و خسوسیم بۆ دەسازاندن تا لەگەڵمدا ژان و ناسۆری دەروون دەرببڕن. ئیتر بووبوو بە شتێکی ئاسایی شەوان هەر لە دوای داگیرساندنی ماتۆڕی کارەباکەوە، من لە ژێر چادرێکدا دەربکەوم و داواشبکەم کێ حەزی لە بەزم و ڕەزمە بێتە لامان.

من هەر ئەو ماوەیە شەوانە خەونگەلێکم دەبینی کە خەونی خۆم نەبوون. لە هەندێ لە خەونەکاندا دەمزانی خەونی کێ دەبینم، لە هەندێکی دیشدا دیاریکردنی خەونبینەکە سەخت بوو. جارێک خەونم بینی یەکێک خۆی بە بەندۆلی سەعاتێکی مەزندا هەڵواسیوە، بەندۆلێکی زۆر گەورە، پیاوەکە بە هەموو توانای خۆی هەوڵیدەدا بەندۆلی کاتژمێرەکە بوەستێنێت کە بە بورجێکی مەزندا هاتبووە خوار. هێشتا لە خەودا بووم دەمزانی ئەوە خەونی «کیسرا» یە، گەنجێکی منداڵکار، کە نەوەک لە ماڵ بەڵکو لە گەڕەک و قوتابخانەش بە شێت ناوبانگی دەرکردبوو. ماوەیەکی زۆر لە ماڵ زیندان کرابوو، مامۆستایەکی تایبەت بووبوو بە سەرپەرشتی، هەموو شتێکی بە کات و چرکە و خشتە بۆ دیاریکرابوو. ئێستا ڕقێکی تایبەتی بەرامبەر بە سەعات هەبوو، هەر جۆرە سەعاتێکی بدیبایە دەیدزی و دەیشکاند و فڕێیدەدا، هاوڕێکانی لە ترسی ئەو دەبوو کاتژمێرەکانی دەستیان بشارنەوە یاخود بە جۆرێک قایمیبکەن، ئەو دەستی نەگاتێ. لە خەونەکەدا بەندۆلە شێتەکە کیسرای دەهێنا و دەبرد، ئەویش بێسوود هەر کارێکی لە دەست بهاتبایە دەیکرد تا جوڵەی ئەو ئامێرە گەورەیە ڕابگرێت... خەونەکە چەندەها شەو و بە چەندەها جۆر دووبارەدەبووەوە، لە شوێنی جیاوازدا، لە سەر سەعاتی جیاواز، لە کاتی جیاوازدا، بەڵام ئەو لە خەونەکەدا هەمیشە یەک

خولیای هەبوو، جوڵەی بەندۆڵە گەورەکان بوەستێنێت، جوڵەی سەعاتەکان، چرکەکان ... زەمان بە گشتی.

لە خەونێکی تردا «محەمەد سدیق خاوەر»م بینی بەدەستێک جلی ژنانەوە لەگەڵ پیرێژنێکدا دانیشتووە و لەسەر پنەیەکی سپی زۆر گەورە نانەدەکات، زوو زوو بە ژنەکە دەڵێت «دایە مەهێڵە نانەکەت بسووتێت ... دایە مەهێڵە نانەکەت بسووتێت». نەمدەزانی سەرچاوەی ئەو خەونە لە کوێوە هاتووە. محەمەد سدیق خاوەر وەک نەقیب دەیگووت، لە پیاوە هەرە ئێشکەرەکانی بەتالیۆنەکە بوو، کەسێکی هێمن بوو، لەسەر ئەوەی بەردەوام و بێ هیچ هۆیەک پەلاماری یەکێک لە دراوسێکانی دابوو هاتبووە بیمارستان، وەک خۆی دەیگووت تەنها هۆی کینەکانی ئەوەبوو ئەو پیاوە بەردەوام لە خەونەکانیدا بە دەنگێکی ناخۆش بانگی لە دایکی کردوە. ئەو بانگە نادیارەی ناو خەونەکانی وەک ماکێکی شێتی چوو بووە سەری و هەتا لە ناو ئەم دۆڵ و چیایانەدا وازیان لێ نەدەهێنا. لە خەونەکانیدا بەردەوام لەگەڵ دایکی بوو، لەگەڵ ئەو نانیدەکرد، سفرەی دەڕازاندەوە، ئیشی ناو ماڵی دەکرد، بەردەوامیش قسەیدەکرد، وەک «دایە مەهێڵە سفرەکەت پیس بێت» «دایە مەهێڵە ئاوەکەت بڕژێت» «دایە مەهێڵە گۆشتەکەت بخورێت».

خەونێکی دیم بینی «سەبور» کە لەبەر دەست بڵاوی بە «کەرەمدار» ناویاندەنا، لە ژێر درەختێکدا وەستاوە و هەوڵدەدات بە دارێکی درێژ هەندێ سێو بخاتەخوار. سەبور چەندی دەکرد سێوەکانی بۆ نەدەخرا، هەر دەیویست دارەکەی درێژبکات و لقی درەختەکە بتەکێنێت، پۆلە باڵدارێکی تورە ڕێگایان لێ دەگرت، هەر دەستی بجوڵاندایە، ژمارەیەک باڵندە دەهاتن و پەلاماریاندەدا. باڵندەکان شێت بوون، خۆیان دەکێشا بە سنگیدا، دەنوکیان لەسەری دەدا، بە چنگ ڕوخساریان بریندارەدەکرد، خەونێکی بێئەنجام و پوچ بوو کە وەک بازنەیەکی داخراو دووبارەدەبووەوە .

خەونێکی دیم بینی، کەسێک ڕوخساری دیارنەبوو، تەنیا لە پشتەوە دەردەکەوت، بە تفەنگێکی درێژی کۆنەوە نیشانەی لە شتێکی نادیار دەگرتەوە، نیشانەکەی لە تەمدا ونبوو، جێگاکەی هەڵم و سپییانییەکی چڕ بوو کە هیچی لە نێودا نەدەبینرا، ئەو کەسەی لە خەونەکەدا تفەنگەکەی پێ بوو، وەک ئەوەبوو دانیشتبێت تا ئامانجەکەی ڕووندەبێتەوە، دەیویست تەم نەمێنێت و هەوا ڕوونببێتەوە و ڕۆشنایی بگەوێت تا ئەو تەقەی خۆی بکات، بەڵام پێدەچوو بۆ هەتاهەتایە مژ نەنیشێت و بولێڵ ڕۆشن نەبێتەوە. نەمدەزانی ئەوە خەونی کێیە. هیچ نیشانەیەکم تێدا نەبینی خەونبینەکەی بناسمەوە.

ئیتر خەونم زۆر دەبینی... زۆر زۆر ... شەو دوای شەویش زۆتر و زۆرتر.

لەو شەوانەدا بۆ یەکەمجار ئەو خەونەشم بینی کە چەند مانگ بوو چاوەڕوانی بووم، ئەو خەونەی دونیای دیلاواری هێنابووە لەرزە.

چەند وەخت بوو دەمویست ئەو خەونە ببینم و نەمدەبینی، دەمویست بە نهێنی ئەو وێنەیە بگەم و نەدەگەیشتم، خولیام بوو ئەو پیاوکوژە ببینم کە دەچووە خەونەکان و سەری مرۆڤەکانی دەپەڕاند، بەڵام دواجار خەونەکەم لە شێوەیەکی سەیردا بینی.. لە هیچ یەکێک لەو خەونانە نەدەچوو کە پێشتر بیستبووم، لە جێگایەکی سەیردا بوو کە پتر لە بیمارستان دەچوو. خەونێکی بەرگدرووی ناوداری دیلاوار «داودی داود ئاغا» بوو، کە بە هۆی نەخۆشی و بەدبەختییەوە کەوتبووە بەتالیۆنەکەی ئێمەوە. لە خەونەکەدا داود ئاغا بە خۆی و ئەسپێکی بەرزەوە بە ڕیواقێکی درێژ و سپیدا دەڕۆیشت کە زەوییەکەی لە کاشی سپی و دیوارەکانی لە مەرمەڕ بوون. ئەسپەکە بە سەختی دەیتوانی لەسەر کاشییەکان هەنگاو هەڵهێنێت. لەملاولای ڕێگای ئەسپەکەدا، لەسەر سەدان قەرەوێڵەی تایبەت بیمارانێکی بێ سەر

پاڵکەوتبوون، هەموو جلی سپییان لەبەردابوو، جەستەکان بەبێ سەر ڕۆحدار بوون و دەجوڵان، لەسەر قەرەوێڵەکان ئەمدیوە و دیویان دەکرد، بێئەوەی هەستن یان دابەزن. ئەو هەستەیان دەدا بە من کە ئەگەرچی سەریان نییە، بەڵام دەتوانن ببینن. داودی داود ئاغا کە خۆی بەرگدروویەکی ناوداری جلی پیاوان بوو، وەک لە بەفرێکی چڕدا جڵەوی ئەسپەکەی ڕابکێشێت لە ناو ئەو ڕیواقە درێژەدا، ئەو ئاژەڵە بەرزەی کێشدەکرد و هەوڵی دەدا جڵەوی لە دەست نەدات. لە ناکاو ناو داڵانەکە پڕ دەبوو لە تارمایی، لە خێوگەلی ئارام کە بە قات و جل و بەرگی جوانەوە بەرەو ڕووی داود دەهاتن و سڵاویان لێدەکرد و دەیانگووت «سڵاو ئەی بەرگدرووی مەزن» «سڵاو ئەی باشترین بەرگدرووی خۆرهەڵات» «سڵاو ئەی خاوەنی تەقەڵی تەلا و دەرزی زێڕین» «سڵاو ئەی هەڵگری مەقەستی ئاڵتونین». داود هەمیشە بە خۆی و ئەسپەکەیەوە هێمن دەڕۆیشت و بەڕێزەوە کڵاوەکەی بەرزدەکردەوە و بە حورمەتەوە وەڵامی سڵاوەکانی دەدایەوە. لە ناکاو ئەسپەکە دەکەوتە حیلە و سمکۆڵانی توند، وەها بەرزدەبووەوە و دەخزی، وەها توند بەلادا داهات و دەخلیسکا من لەرز دەیگرتم و سامم لێ دەنیشت، ئەسپەکە لە کەوتن و هەستانەوەدا بوو، لە تەپاوتل و لوق هاویشتندا، لە حیلە و پرمە و خیزەدا بوو کە لە ناکاو جەستەیەکی باڵابەرزی بێسەر لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا دەردەکەوت و پێشی بە ئاغا دەگرت. جەستەکە شمشێرێکی درێژی بەدەستەوە بوو، سەری نەبوو، تەنیا لەشێکی درندە و بێهەست و بزۆک بوو. جەستە ڕووت و هارەکە بە جوڵەیەکی دەست ئەسپەکەی هەڵدەستان و وەک ئەفسوونی کردبێت چۆکی پێدەدایە زەوی. داودی داود ئاغا وەک لە دوورەوە بۆ لای ئەم جەستەیە هاتبێت، سەری حورمەتی دادەنەواند و دەیگووت «گەورەم ، من ئەمشەویش ئامادەم بۆ مردن، شمشێری پیرۆزی ئێوە گەردنی پیسی ئێمە موبارەک دەکات و بەرەکەتێکی ئیلاهیمان پێدەبەخشێت، فەرموون ئەمە گەردنی چەپەڵی

ئێمە و ئەوەش شمشێری پیرۆزی ئێوە، بەڵام تکایە ئاگاداربن کە ملوانی قاتەکەمان خوێناوی نەبێت، چونکە هونەرێکی زۆرمان لە دروونیدا بە خەرج داوە، کارەکەتان وەک شەوانی تر بە وردی ئەنجامبدەن، بێئەوەی ئەم ناوە پیسبکەن، چونکە دوای من کەس نییە ئێرە پاکبکاتەوە». داودی داود ئاغا لە پاڵ ئەسپەکەیدا دەوەستا و چۆکی دادەدا و سەری دادەنەواند، بەجۆرێک بکوژە بێسەرەکە بتوانێت ئاسان سەری ببڕێت. جەستەکە بێ هیچ دوودڵییەک، داودی ڕادەکێشایە سەر بەستێکی بچوک و سەری دەنایە سەر بەستە بەردینێک و بە شمشێرێکی تیژ دەیدا لە گەردنی ئاغا. سەری داود وەک سەری بوکڵەیەکی پلاستیک دەپەڕی. هیچ خوێنێکی لێ نەدەهات، وەک تۆپێک تل دەبووەوە و چاوانی کراوە و ڕەزامەند وەک خۆی دەیانڕوانی. لە ناکاو هەوا دەگۆڕا، وشکە بەفرێکی توند بە پۆخی گەورەوە دایدەکرد. با و گێژەن بە خێراییەکی سەیر سەرما و سپێتییەکی زۆریان دەهێنا... هێدی هێدی هەموو شتێک سپی دەبوو، هەموو شتێک، هەتا سەری داود ئاغاش کە بەفر دەیبرد و لە خۆیدا دەیشاردەوە .

من ئەو شەوە لەگەڵ ڕاچڵەکان و وریابوونەوەمدا، وەک شێت هەڵدەستام و بە ناو تاریکیدا بەرەو چادرەکەی داودی داود ئاغا ڕامدەکرد، شەو سارد و من عارەقاوی و شپرزە بووم، دووجار لە بەرد و کوسپی سەر ڕێگا هەڵدەنوتام، دەکەوتم و هەڵدەستامەوە، پاسەوانی شەو دەیناسیمەوە و بە سەرسامی سەیری ئەو تێکچوون و شپرزەبوونە کتوپڕەی دەکردم و لێدەگەڕا بڕۆم، لێدەگەڕا بگەمە چادرەکەی داود. دەگەیشتمە سەر جێگای ئەو و بە لایتێکی دەستەوە سەری پەتووەکەیم لادەدا. داود هەموو گیانی نیشتبووە سەر عارەق، باوەشم پێدادەکرد و دەمچرپاند «داود... داود ... داود». سەرسام و ترساو ڕادەچڵەکی و لە ترس و پەشۆکاندا باوەشیدەکرد بە مندا. من کەمێک ڕامدەوەشاند و بە چرپەوە دەمگووت «من بینیم، بینیم، ئەوەی تۆ بینیت منیش بینیم». داود هەڵدەستا و دەیگووت «مستەر تۆیت؟

تۆیت؟ چی بووە... چی بووە؟». هەستمکرد داود زەندەقی چووە، چاوانی دەرپۆقی بوون، دڵنیانەبوو هێشتا هەر خەون دەبینێت یان هوشیارە. گووتی «مەعز بۆ خوا مستەر، مەعز بۆ خوا مستەر، چی بووە؟». گووتم «ئەو خەونەم بینی كە تۆ بینیت». سەرسام بوو، پێشتر لە ژیانیدا شتی وای نەبیستبوو. سەری خۆی توند ڕاوەشاند و گووتی «مستەر دانیشە، وای مستەر، خەوێكی ناخۆش بوو ... ئەرێ تۆ بەم شەوە چیتە؟». من دەستم خستە سەر دەمی و بۆ ئەوەی ئەوانی تر هەڵنەستن پرسیم «خەوت بە چییەوە دی؟». خۆی پەشۆكابوو، ڕاچەنینی خێرا و بینینی من وەها دەستەپاچەیان كردبوو، نەیدەتوانی هۆشی كۆبكاتەوە و بزانێت چی خەونێكی بینیوە. بە شپرزەیی و بە چپەوە پرسیم «ئێستا خەونت بینی یان نا؟ خەونت بینی یان نا؟». دەستی گرتم و گووتی «كاك مستەر، كاك مستەر... خەونم بینی، دڵنیام... خەونم بینی، ئەسپێكی سپی تێدابوو». من گووتم «بوەستە، بوەستە من بۆت تەواوبكەم، ڕیواقێكی سپی درێژ بوو، پڕبوو لە قەرەوێڵەی نەخۆشان، خەڵكێك هەموویان بێسەر بوون، تۆ ئەسپێكی بەرزت پێ بوو بەسەر كاشیدا دەڕۆیشت... سمكۆڵانی دەكرد، هار بوو، ئینجا ئەو پیاوانە هاتن...». لە ناكاو داود ڕۆشن و سەرەحاڵ و هوشیار بووەوە، چاوانی كرانەوە و بە دەنگێكی هێمن و سەرسام بۆی تەواوكردم «ئینجا ئەو پیاوانە هاتن كە سلاویان لە من كرد، ئەو خێوانە هەموو شەوێك دەیانبینم، هەر خەو لە چاوی ئەم داودە بكەوێت، لە پێش چاوم قیت دەبنەوە... دوایی ئەو پیاوە دەركەوت، ئەوی سەری نییە، دەموچاوی نییە، هیچی نییە، ئەوەش زوو زوو دەبینم. بەڵام مستەر گیان... مستەر بۆ وایە ... مستەر گیان... ئەو پیاوە بۆ لای من هیچی نییە. سەگبابێكی بێ سەرە و هیچ. ئەسڵەن لە هیچ ناچێت، نە لە دۆست... نە لە دوژمن... نە لە بەشەر... تو خودا مستەر تۆ دەزانیت، تۆ تێدەگەیت بۆچی ئەوی من سەری نییە؟ ». من لە قەراغ نوێنەكەی داود دانیشتم و هەموو ڕستەكانی ناو

خەونەکەی خۆیم بۆ دووبارەکردەوە. چاوانی کرانەوە و بەسەرسامییەوە شانی گرتم و گووتی «مەردی خوابە پێم بڵێ، تۆ چۆن ئەو خەونەی من دەزانی. مستەر گرینۆک، تۆ جنۆکەیت، شەیتانیت، تۆ چیت؟». من دەمیم گرت و بە بێزارییەوە وەک کەسێکی نائومێد لە هەموو شتێک، بەقینەوە گووتم «کاک داود، من نەخۆشییەکی پیسم هەیە، من نەخۆشییەکی پیسم هەیە، من خەوی خەڵکی تر دەبینم. ئەمشەو ئەو خەونەی تۆم بینی، چەند وەختە چاوەڕێ بووم خەونی ئەو سەربڕینە ببینم، دواجار بەمشێوەیە بینیم ... من لە دەست خۆم بێزارم، بێزارم».

داودی داود ئاغا بەرگدروویەکی قسەخۆش بوو، بەڵام بینینی بەردەوامی ئەو خەونە هاوسەنگی تێکدابوو، ژیانی لە بنەوە هەڵتەکاندبوو. بەر لەوەی بیهێنن بۆ بیمارستان تووشی غەمۆکییەکی کتوپڕ بووبوو، دوکانی خەیاتییەکەی داخستبوو، لە هەموو کەسێک و لە هەموو شتێک کەوتبووە گومانەوە ، هەر کەس قسەی لەگەڵ دەکرد وەک شێت سەیریدەکرد و دەیگووت «ئەوەی من سەری نییە... ئەوەی من سەری نییە». ڕۆژانێک تەواو هاوسەنگی دەروونی خۆی لە دەست دەدات و بە کوچەکاندا ڕادەکات و هاواردەکات «ئەوی من سەری نییە». هەڵبەت کەسانی بێزی و بەدجنس تەفسیرێکی تەواو خراپ بۆ قسەکەی داودی داود ئاغا دەکەن و بە گاڵتەوە دەچنە سەر ڕێگای و دەڵێن « داود ئاغا، ئەوە کەی قسەیە تۆ دەیکەیت، هی هەموو کەس سەری هەیە، ئێستا بۆ بەس ئەوەی تۆ لە ناو عەوام و عالەمدا سەری نییە».

ئەو شەوە سەرلێشێواو و دەستەپاچە بووم. چیرۆکی وێنەی نیگارکێشەکانم دەهاتەوە یاد و لە دەست خۆم بێزاربووم. ئەوەی من ئێستا دەمبینی جەلادێکی بێسەر بوو، داود ئاغا دوژمنێکی دەبینی کە هیچ ڕوخسارێکی نەبوو، وەک ئەوانی تر نەیدەتوانی دوژمن لە کەسێک

یان شێوەیەکدا کۆبکاتەوە... بینینی ئەو خەونە و لەو کاتەدا ترسناک بوو، وەک ئەوەی یەکێک پیمبڵێ دروستکردنی نیگارێک بۆ دوژمن ئەفسانەیە، مەحاڵ و بێهودەیە. ویستم پرسیاری زۆر لە داود بکەم، بەڵام تووشی جۆرە هەڵچوونێکی دەروونی وەها بووبووم، نەمدەتوانی دانیشم و دوو قسەی عاقڵانە لە زارم بێتەدەر. ویستم بگەڕێمەوە ژێر چادری خۆم، بەڵام داود ئاغا بۆ میزکردن هەستا و گووتی منیش دێمە دەرێ. لە ڕێگادا هەردووکمان تووشی نۆبەتێکی هەڵچوون و ژانی هاوبەشبووین و لە بڕگەیەکی قسەکانماندا دەستمانکردە ملی یەک و پێکەوە گریاین. داود ئاغا بەدەم سڕینی فرمێسکەوە گووتی «بە فەخری عالەم، ئەم ماوەیە ئەوەندەی بە دەست هەتیو مەتیوی لای خۆمانەوە ئەزێتم دیوە، نیو ئەوەندە مەراقی دوژمنم نەبووە ... دەزانی چ دەردێکیان بەسەر هێناوم، دەزانی چ نامەردی و سووکایەتییەکیان پێکردوم؟»، دەنگی داود ئاغا پڕ بوو لە ئازار، منیش هەستم بەو ژانە شاردراوەیەی ناو دڵی دەکرد. ئەو شەوە تا درەنگ قسەمانکرد، تا درەنگ باسی ئەوەی کرد کە هیچ کات جەلادی ناو خەونەکانی ئەو سەری نەبووە، دەنگی نەبووە، ئەویش هێندەی بۆ سەری ئەو گەڕاوە، مەراقی هەڵگرتنەوەی سەری بڕاوی خۆی نەبووە، هێندەی بەدوای دەموچاوی نادیاری دوژمندا گەڕاوە، بەدوای عەقڵی لە دەستچووی خۆیدا نەگەڕاوە. گەرچی هەوا ساردبوو، بەڵام ڕۆشنایی مانگ شتێک لە جوانی و ئولفەتی بە ئێمە بەخشی بوو. دەمەوبەیان هەستمکرد، کە خەو زۆری بۆ هێناوم و توانای قسەکردنم نەماوە، بە گێژی گەڕامەوە ناو جێگاکەی خۆم. زەهاو تەخت لە جێگاکەی خۆیدا نوستبوو، بێئەوەی کارێک بکەم هەستێت، چوومە ناو جێگا و وەک نیوە مردو منیش خەوم لێکەوت.

# ٣٦

ئاڵ موراد بۆی گێڕامەوە :

ڕۆژێک بۆقبۆقیلە بانگیکردم و گووتی ئاڵ موراد فەرمانێکی تایبەتیم بۆ هاتووە، تۆ دەبێت بەجێمان بهێڵیت و بگوازیتەوە بۆ یەکەیەکی تایبەت، ئیشی ئێوە چییە و دەبنە چ کارە من هیچ نازانم، بەڵام ئەوەی بە من گەیشتووە، ئێوە ڕاستەوخۆ لە ژێر سەرپەرشتی ڕەزمئارای قەرەقازانیدا دەبن، ئەو جێگری ڕەسمی سەی ئەسلانە و ڕاستەوخو فەرمان لەوەوە وەردەگرن. کە وایگووت خەریکبوو دڵم لە دەممەوە بێتەدەری. زانیم ئەمە بەزمێکە هەموو ژیانی من دەگۆڕێت. هەر ئەو ڕۆژە بۆقبۆقیلە و ئەندامانی تری هێزەکەمان یەک بە یەک ماچیانکردم و باوەشمان بە یەکدا کرد و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە خوداحافیزیمان لە یەکتر کرد. گەرچی من لە ناخی دڵەوە ڕقم لە باغەوانەکان بوو، بەڵام وەک گیرۆدەبووبووم و بەدبەختییەکەم دەکێشا، حەزمدەکرد هەر لەگەڵ ئەم هاوڕێ کونانەدابم و نەچمە هێزێکی ترەوە کە نایانناسم. من لەوانە بووم کە گۆڕینی کتوپڕی دەوروبەر و تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەڵکی نوێدا دەیترساندم و نائاسوودەی دەکردم، ئەوەتەی لەدایکبووم حەزم لە شوێنی دووبارە وخەڵکی دووبارە و ژیانی دووبارەیە... لە هەر جێگایەک ڕاهاتم و ڕەوتێکم وەرگرت، حەزم

لە تێکدانی نییە.

ئەو ڕۆژە بۆقبۆقیلە پێیگووتم کە پێویست ناکات من هیچ بکەم، شەو جیپێک دێت بە دوامدا و دەمبات بۆ شوێنێ مەبەست. کە شەو هات و لە دەرگایان دا، لە بری جیپ پیکابێکی سەر بە تاڵ لە بەر دەرگای ماڵەوەدا وەستا. هەر ئەو شەوە من لە پشتی پیکابێکی تایبەتدا، لەگەڵ چوار کەسی دیکەدا کە هەر چوارمان لە پشتی پیکابەکەدا لە بەر سەرما و بای توندی ڕێگا و بان هەڵدەلەرزین، چووین بۆ دەرەوەی شار. ئێمەیان لە شوێنێکی دوور دەستدا داگرت، شوێنێک وەها چەپەک و لاکەوتەبوو، مەگەر هەر بۆ ئەوە باش بێت، شەیتان هێلکەی لێ بکات. من لە بەر تاریکی نەمدەتوانی بە ڕوونی بەرپێی خۆم ببینم. سەربازێکی منداڵکار پێشوازی لێکردین و بردینی بۆ جێگایەک کە ناوی دەنا «پشووخانە». هەر پێنجمان سەرو کۆڵەپشتی قورسمان بە شانەوە بوو، بای توندی پشت پیکاب وەها منی کوتابوو، سەرتاپام ژانیدەکرد، خۆڵ و تەپوتۆزی ڕێگا سەر و ڕوخساری شاردبووینەوە، بێدەنگی شەو و هەڵتەک هەڵتەکی ماشێن گێژیکردبووین. بەلام جێگاکە لە شوێنێکی تایبەت و پڕ خزمەت دەچوو. سەربازەکە پێیگووتین کە ئەم جێگایە، شوێنێکی تایبەتە بە مەشقی «پێکەران». ئەها، من تا ئەوکاتە وشەی وەهام نەبیستبوو. یەکێکمان پرسی «دەی یائەڵا، ئەمەیان چییە و پێکەران چیین و کاریان چییە؟». هاودەمەکەمان بۆی ڕوونکردینەوە کە ئێمە دەبین بە قەناس. گوایە هەر پێنجمان لە دەست ڕاسترین تفەنگچییانی وڵاتین و بە فەرمانی سەرکردەکانی سوپای دێلاوار، دەبێت بۆ ماوەیەک مەشقی باش بکەین و ببین بە پسپۆڕی تایبەتی تفەنگی دووربیندار.

هەموو شتێکی شوێنەکە پاک و ئامادە دەردەکەوت، حەمامەکان، تەوالێتەکان، ژوورەکانی نوستن، چێشتخانە بچوکەکە، پێکڕا بە ئەساسێکی

تـا بلێـی جـوان و گرانبەهـا ڕازابوونـەوە. هـەر یەکەمـان ژوورێکـی تایبەتـی خۆمـان هەبـوو، خواردنمـان لـە خۆشـترین و باشـترین جـۆر بـوون. شـەوی یەکـەم تـا بەیانـی لـە جێگـای نـەرم و گەرمـدا خەوتیـن، بەیانـی کـە هەسـتام دەرکمکـرد کـە ئـەم جێگایـە تایبـەت و نهێنـی و لاتەریکـە، شـوێنێکە نـە ڕێگای بەشـەری لەسـەرە و نـە باڵنـدە ڕێـی تێدەکەوێـت. ئـەوە لـە جیاتـی خۆشـحاڵم بـکات ترسـێکی نهێنـی خسـتە دڵمـەوە. یەکـەم پرسـیارم ئـەوە بـوو: ئێمـە چیین و کێیـن و بـۆ هاتووینـە ئـەم جێگایـە؟ بـەڵام وەڵامێکـی وەهـام چنـگ نەکـەوت. لـە نـاو هاوڕێکانمـدا، مـن بچوکتریـن و لاوازترینیـان بـووم، چوارەکـەی تـر زل و بەخـۆوە بـوون. سـەیربوو بەلامـەوە، کـە جێگاکـە جگـە لـە سـێ کـەس کـە هـەم پاسـەوانیان دەکـرد و هـەم سەرپەرشـتی پـاک و خاوێنـی و ڕێکخسـتن بـوون، کەسـی تـری تێـدا نەبـوو. لـە چێشـتخانەکە و لـە کاتـی بەرچاییـدا هیـچ خزمەتکارێـم نەبینـی، وەک دەسـتێکی نهێنـی هەمـوو شـتێکی لەسـەر مێزەکان دانابێـت و خـۆی کڵاوێکـی ئەفسـوناویی لەسـەر کردبێـت و غەیـب بووبێـت. بەیانـی هـەر پێنجمـان لـەو چێشـتخانە پـاک و تەمیزەدا بەرچاییمـان خـوارد. هێشـتا یەکترمـان نەدەناسـی، هەمـوو لـە ژێـرەوە سـەیری یەکمـان دەکـرد و هیچمـان نەدەگـووت. یەکێکیـان سـەرنجی ڕاکێشـام، بـەردەوام لـە کاتـی بەرچاییـدا سـەیری منـی دەکـرد و لـە ژێرەوە زەردەخەنـەی دەگـرت. کوڕێکـی مـووزەردی دەموچـاو بچکۆلـە بـوو، سـەری لـە چـاو لەشـیدا گچکەتـر دەینوانـد، تـا بەرچاییمـان تەواوکـرد، ئـەو هـەر لـە بنـەوە سـەیریدەکرد و وەک منداڵان پێدەکەنـی، ئێسـتا کـە بیـری ئـەو چەنـد ڕۆژە دەکەمـەوە، جوانتریـن شـت لـەلام ئـەو خەنـدە و نیـگا نهێنـی و ژێرەوانکێیـەی ئـەوە کـە زیاتـر لـە هـەر شـت دێتـەوە بەرچـاوم. دوای بەرچایـی دەبـوو بگەڕێینـەوە ژوورەکانـی خۆمـان، مـن چونکـە کارێکـم نەبـوو هـەر دەبـوو یـان سـەیری تەلەفزیۆنـی دیلاوار بکەم یـان گـوێ لـە رادیـۆ بگـرم، بـەڵام هیـچ کات لـە ژیانمـدا نەمتوانیـوە لـە چارەکێک زیاتـر هۆشـی خـۆم بـەو دوو ئامێـرە بسـپێرم، ڕقـم لـە هـەر ئامێرێکـە مـرۆڤ

نەتوانێت وەڵامیبداتەوە. هەر زوو تەلەفزیۆن و ڕادیۆکەم بێدەنگکرد و لە بەر پەنچەرەکەدا دانیشتم و سەیری بەردەرگای ئەم جێگا چەپەک و نهێنییەم دەکرد. لە نزیکی نیوەڕۆدا لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە بینیم ماشێنێکی نوێ هات و دووان لە جلی سەربازیدا دابەزین و دوو هاودەم بە چەکەوە پێشیان کەوتن. دوای سەعاتێک دەبوو هەر پێنجمان لە ژوورێکی تایبەتدا کە پتر لە پۆلی وانە خوێندنی قوتابخانە دەچوو کۆببینەوە. گەرچی من شتێکی ئەوتۆم لە پلە و پایەی سەربازی نەدەزانی، بەڵام ئەم دووانە هیچ ڕوتبە و نشانەیەکی سەربازییان پێوە نەبوو تا بزانین بە ڕاستی پلەداری سوپان یان هەر شارەزای مەدەنین و جلی سەربازییان پۆشیوە. دوو کەس بوون بە دوو چاویلکەی ڕەشەوە، بە دوو کاسکێتی سەربازییەوە کە پڕاوپڕ سەریانی داپۆشیبوو. هیچ کات چاویلکەکانی چاویان دانەگرت، بە جۆرە دەنگێک کە پێشتر کەسێکم لە دیلاوار نەبینیبوو واقسەبکات دەدوان، دەنگێکی منگن، وەک ئەوەی لە بن ئاوەوە بێتەدەرێ. خۆیان وەک مامۆستای مەشق بە ئێمە ناساند، گووتیان کە پسپۆری تایبەتی قەناسن و ئیشیان ئەوەیە فێری ئەو چەکەمان بکەن. زوو زوو دەیانگووت «ئێوە پێنج دەست ڕاستترین گەنجی دیلاوارن». پێیان گووتین کە غەمی هیچ نەخۆین و دڵمان لای کەس نەبێت، ئەوان هەموو شتێکیان بۆ ڕێکخستووین و هەر شتێک خێزانەکانمان پێویستیان پێ بێت دابینیانکردوە. مامۆستاکانمان هیچ کات ناوی خۆیان ئاشکرانەکرد، هەتا کە من پرسیم ئایا ڕاستە کە جەنابی ڕەزمئارای قەرەقازانی بەرپرسی ئێمەیە؟ بە مۆنی و گرژییەوە وەڵامم وەرگرت کە نەخێر، هیچ کەس نییە و گەر بەرپرسێکیش هەبێت، ئەوا ئێمە وەک سەرباز کارمان تەنیا جێبەجێکردنی فەرمانی سەرکردەکانمانە و بۆمان نییە لە ناو و شوناسی کەس بپرسین.

دەبوو لە هەمان ڕۆژەوە مەشق دەست پێبکەین.

مەشقەکانمان لە حەوشی پشتەوەی بنکە کە دەستی پێکرد، بەڵام لەویادا دوایی نەهات... وەک مامۆستاکانمان دەیانگووت هەموو هونەر و فەلسەفەی ئیشەکە لەوەدابوو، هەمیشە بە یەکەم فیشەک نیشانەکەمان بپێکین. لە کاری قەناسدا ئەگەری تەقاندنی فیشەکی دووەم زۆر کەمە، مرۆڤ یان بە فیشەکی یەکەم کاری خۆی جێبەجێدەکات یان نایکات. مامۆستاکەمان کە هەر زوو ناومانا «گڤ لووت»، چونکە وەها بوو وەک هەمیشە لە لووتییەوە با گڤەی بێت. دەیگووت «قەناسی ڕاستەقینە هەمیشە یەک فیشەکی بەسە». ئەو بە دەست ڕاستی و نیشانەشکێنی ئێمە سەرسام بوو، بەڵام شەیدای من بوو، هەر ئێوارەی یەکەم کە بردیانین و سەرو قەناسیان داینێ، من بریسکەی ئاسن و بریقەی تەختە و دووربینی سەر تفەنگەکان شێتیانکردم. چەندەها جۆری قەناسمان بۆ دانرابوو، هەر یەکەمان جۆرێک تفەنگمان وەرگرت کە دەبوو لە کاتی مەشق و لەسەر ڕێنمایی و بە داوای مامۆستا، جار جار بیگۆڕینەوە. من سەرەتا تفەنگێکی نوێی جۆری پی ئێس جی ١ ی ئەڵمانیم پێ بوو، بە قسەی مامۆستا، جۆرێکی کۆنی قەناس بوو کە ئەو بە چەکێکی زۆر باشی دەزانی. ئەوانی تر تفەنگەکانیان نوێتر و باشتر بوو، یەکێک ئێم سی جی ٩٠ یەکی تازە تازەی بەرکەوت، یەکێک ئێم ٢٤ ێکی ئەمریکی، یەکێکی تر ئێم ٤٠ ێک، یەکێکی ترمان والتەر دەبلیو ئەی ٢٠٠٠ کورتە قەناسێکی عاجەیەب کە ئارەزووم بوو، بەر من بکەوێت.

ڕۆژی یەکەم سەلماندم کە چ دەست ڕاستێکی عەجایەبم. هیچ نیشانەیەکم بە خەسار نەدەدا. کابرا هەر شتێکی بۆ دابنابام، چاوم دەنا بە لوولەی دووربینەکەوە و تراق هەر هێندەی بڵێیت یەک و دوو دەمپێکا. کوڕانی تریش دەستڕاست بوون، بەڵام کەسیان نەدەگەیشتنە ئاستی من. مامۆستا هەر یەکەم ئێوار بە منی گووت «بچکۆل، بەم هەموو زیپکە قێزەونەی سەر لووتتەوە ئەم هونەرە لە کوێ فێربوویت. من دەست ڕاستی وەک تۆم لە ژیانمدا نەبینیوە». زۆرم پێ ناخۆش بوو کە بە

بچکۆل بانگیکردم، بەڵام ئەوە حەقیقەت بوو، من باڵام بە ئاستەم لە تفەنگەکە درێژتر بوو، کە دەمکردە شانم دیمەنێکی سەیر و پێکەنیناویم هەبوو، بەوەدا سەروڕوخساریشم منداڵانە بوو کەسێک منی نەناسیبایە هەر باوەڕی نەدەکرد بتوانم فیشەک بتەقێنم. بە شانازییەوە گووتم «هێی مامۆستا، خەبەرداربە، ڕەحمەتی خوات لێ بێت، یەکەم فیشەک لە تفەنگی باغەوانەکانەوە من تەقاندومە، تۆش ئێستا پێم دەڵێیت بچکۆل». دەبێت بڵێم چوارەکەی تر هیچ کەیفیان بەو دەست ڕاستییەی من نەدەهات. سەرەتا کە نۆبەتی تەقە دەهاتە سەرەی من، هەموو کۆدەبوونەوە و چاوەڕوان بوون، من نیشانەیەک وێڵبکەم و نەیپێکم، بەڵام دوو مامۆستاکەمان هەر نیشانەیەکیان دابنایە، من دەمدا لە تەختی و زرمەم لێ هەڵدەستان. تا نیشانەکە بچوکتر بایە و دوورتر بایە و لە چاوی دووربیندا لێڵ و نەبینراو بایە و زیاتر بجوڵایە، هاوڕێکانم کێشەیان زۆرتر دەبوو، بەڵام منی بێڕەحم چارم نەبوو، گاڵتەم لەگەڵ نەدەکرا، ئەوەی تفەنگی شەیتانیش نەیپێکایە، بە ترپەیەک تەختیم کوناودەر دەکرد.

زۆر درەنگ بۆم دەرکەوت کە ئەو هەموو زرنگی نواندنەم هیچ نەبووە جگە لە گەمژەییەکی تەواو. چوار کوڕەکەی تر «ئەحمەد سورەت، ئەحمەد کوفیان، محەمەد پاشا و نیاز گچکەڵ» یان ناوبوو. ئەحمەد کوفیان زۆر زل بوو، لەسەرەوە پان و پۆڕ و گەورە، بەڵام قاچەکانی باریک و درێژ، بە جۆرێک هەموو سەرسام بووین چۆن قاچی لە ژێر ئەو بارە قورسەدا ناچەمێتەوە. من هەر سەر و ڕووم لەگەڵیدا کرایەوە، پێمگووت «ماڵوێران، تێم ناگەیێنیت ئەو قوولە باریک و تیرۆکیانەت، چۆن ئەو لەشە زل و سەرە قورسەتی بۆ هەڵدەگیرێت؟». ئەحمەد قسەی لە نەخۆشییەکی خراپی منداڵان دەکرد کە لەسەر بێشکەوە تووشی بووە و تەنیا موعجیزەی خودایی لە دەست ئیفلیجییەکی هەمیشەیی ڕزگاریکردوە. پێی وابوو ئەوەی دەتوانێت بە پێوە بوەستێت، تەنیا بەرەکەت و کۆمەکێکی

یەزدانییە و لە قەرەبووی ئەوەدا دەبێت بەردەوام سوپاسگوزاری خودای گەورە بێت. ئەحمەد تاکە کەس بوو کە هەموو نوێژەکانی دەخوێند و بەر لەوەی پەنجە لە پەلەپیتکەی تفەنگەکە ڕاکێشێت ناوی خودای دەهێنا. نیاز گچکەڵیش ئەو گەنجە موو زەردە سەر بچکۆلەیە بوو کە قەناسی والتەر دەبلیوەکەی پێ بوو، بەردەوام لە کاتی نان خواردندا لە ژێرەوە سەیری منی دەکرد و پێدەکەنی، کوڕێکی منداڵ بوو، دەستی لەوانی تر ڕاستتر بوو، بەڵام لەو کەسانە بوو کە هەموو شتێک بە فشەدەگرن و بە بینینی لووتی خۆشیان دەکەونە تریقە، لەبەرئەوە مامۆستا زوو زوو هەڕەشەی سزای قورسی لێدەکرد، هەتا جارێک فۆرمیان پێ پڕکردەوە بینێرن بۆ بنکەی جەنگاوەرە لاوازەکان و لەوێ پەروەردەیبکەن، بەڵام لە دوا چرکەدا پەشیمان بوونەوە. ئەحمەد سورەت و محەمەد پاشا، هەمیشە پێکەوە بوون، زۆرتر لەگەڵ یەکدا قسەیاندەکرد، من و نیازیان وەک دوو منداڵی گێل و گەمژە دەبینی، ئەحمەد کوفیانیش هێند بێدەنگ و بەستەزمان بوو، نەدەکرا بیکەیتە هاوڕێی خۆت، لەو پیاوانە بوو کە ناتوانێت هاوڕێی هەبێت. ئەو جووتە هیچ کات قسەیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ مندا نەدەکرد، بەڵام دەمزانی محەمەد پاشا ئیرەییەکی خراپی لە دەستڕاستییەکەی من هەیە، هەتا جارێک من نیشانەیەکی گەلێک بچوک و سەختم پێکا، بەو کارەم گەلێک خۆشحاڵ بووم، ئەو گووتی «زیپکاوی ... ئەوەندە بە خۆت مەنازە، وامەزانە کە دەستت تۆزێک لە ئێمە ڕاستتر بوو، ئیتر دەتکەن بە پاشا. ئەم هەراو زەنایەت لە چییە، ئەوەندە بچوکیت، بتخەنە سەر تەختی شاهیش، سەرت هەر ناگات بە گوونم». قسەکانی زۆر بریندارکەر بوون، من وەڵامم نەدایەوە، ترسێکم هەبوو زۆر لەسەری بڕۆم بە مستێک نوقمی زەویم بکات.

ڕۆژانە چەندین سەعات مەشقمان دەکرد، هەستمدەکرد بۆ کارێکی گرنگ و خەتەرناک ئامادەماندەکەن، بەڵام جێگا و شێوەی ژیان و خەو و

خۆراكمان بەجۆرێک تایبەت بوون، حەزم نەدەكرد مەشقگاكە بەسەربچێت و بمانبەنەوە بۆ شار. لەو ماوەیەدا دەروونێكی ساردم گرتبوو، بیری كەسم نەدەكرد، هەتا دایكمم بە خەیاڵدا نەدەهات. هەڵبەت تەلەفون و پەیوەندیكردن تەواو قەدەغەبوون. نیاز گچكەڵ هەندێ جار دەیگووت دوای تەواوبوونی مەشقگاكە دەمانبێرن بۆ مەمەد حەسار، لەوێ دەبێت هەندێ چالاكی گرنگ ئەنجامبدەین. جارێک «گف لووت» پێی گووتین وامەزانن ئیشی قەناس كارێكی ئاسانە، گەر بچن بۆ شەڕ و ئەم تفەنگە دووربیندارەتان پێ بوو، بزانن خەو و خۆراكتان وەک جەنگاوەرێكی ئاسایی نییە، قەناس جەنگاوەرێكی تەنهایە، سەد لەشكری لە پشت بێت هەر تەنیایە، زۆربەی جارەكانیش گوللەیەک كە بەر تەختی ناوچاوانی دەكەوێت، كۆتایی بە ژیانی دەهێنێت.

چەندەها هەفتە لەو جێگایە ماینەوە. مامۆستاكان هیچ كات پێیان نەدەگووتین كەی مەشقمان دوایی دێت و بۆچی مەشق دەكەین، لە ڕاستیدا خۆشیان وەک ئێمە شتێكی ئەوتۆ گرنگیان نەدەزانی، زانیارییەكیان نەبوو كە بۆچی ئەم گەنجانە پەروەردە دەكەن. شەوێک نزیكی دوو هەفتە بەر لە كۆتایی پاییز، نیوەشەو لە دەنگی ماشێنێک بە ئاگاهاتمەوە. شەوان ئەو دەڤەرە چۆڵ و بێدەنگ بوو، مامۆستاكان لە سەعات چوارەوە دەگەڕانەوە بۆ شار، لەو كاتەوەی ئێمە هاتبووین بە شەو هیچ ماشێنێک نەهاتبووە ئەم ناوچەیە. من لە پەنجەرەكەوە ڕوانیم و ماشێنێكی نوێم بینی، دوو پیاوی نەناسراو لە جیپێكی سەوز دابەزین، دڵم خورپەیەكی سەیری پێداهات و ترسێكی كتوپڕ دایگرتم. بێئەوەی بزانم بۆ، هەستمكرد ئیتر ئەمە دواهەمین شەوی ژیانی منە لەم جێگایەدا ... دڵنیابووم ... بێئەوەی كەس فەرمانم پێبدات، پەتۆكەم لابرد و هەستام و دەستمكرد بە كۆكردنەوەی جلەكانم و ڕێكخستنی كۆڵەپشتەكەم.

# ٣٧

«کە هۆشم هاتەوە مستەر گرینۆک لەسەرم بوو. وەها حەپەسابووم هەر وەختبوو چاوانم لە گلێنە دەرپەڕن. گووتم خوای عالەم، تۆ چی دەکەیت بەم شەوە، تۆ سنگدان لێی داویت، گلاراوت گرتووە وا هاتوویتە سەر جێگای من و چیت لە من دەوێت، من پیاوێکی بەستەزمان ئەهلی کاری گەند نیم. ئەو فەقیرە خۆی وەک ژنی کۆستکەوتوو دەگریا. مستەر گرینۆک هەر بە ڕاستی مستەر گرینۆکە، کەسێکی تا خوا حەزکات دڵناسکە، تۆ بڵێی تۆزێک خراپ بەسەر گوێچکەی چەپمدا خەوتووم ئەو سەعاتێک بۆت دەگری. گووتی داود ئاغا قوربانی ڕۆحت بم... قوربانی ئەو دڵە پاکەت بم، تۆ ئەمشەو چ خەونێکت بینیوە، منیش هەر ئەو خەونەم بینیوە. دەی من چۆن باوەڕ بە قسەی وابکەم، کەستتان بیستووە تا ئێستا خەونی کەسی تر ببینێت، ئەوەتەی ئادەمە و حەوا حەوایە، هەر کەس خەونی خۆی دەبینێت و بڕایەوە. من گووتم بەس قسەی مفت و بەلاشم بۆ بکە، خۆ من منداڵ نیم کڵاوم لەسەر بنێیت. گووتم عەزیزم، من تا ئێستا کڵاوم بۆ هەزاران کەس دوریوە، ئێستا تۆ دەتەوێت کڵاو بخەیتە سەری من... فەقیرە لە بەر پەرێشانی زمانی گۆی نەدەکرد و لە بەر بارانی فرمێسک چاوی نەیدەبینی. بەس کە ئەو گەماڵ باوکە باسی ئەو ئەسپە سپییەی ناو خەونەکەی منی کرد، ئیتر کەس نەپرسێت حاڵی من چی بوو... لە دڵی خۆمدا گووتم کورە

خۆ ئەم سەگی سەگبابە بە ڕاستیتی. لە ئێوەی ناشارمەوە ئەو دەقەیەی ئەو ڕایچەڵەکانم من خەونم بەو ئەسپە سپییەوە دەبینی. مەگەر بەس خوا خۆی بزانێت ئەو ئەسپە سپییە چەند ساڵە لە هەموو خەوێکمدا هەیە. ئەو مەلعونە من چیم لە خەوندا بینیبوو ئەویش بینی بووی. هەموو ئەوانەشی بینی بوو کە لە خەوندا سلاوم لێدەکەن. دەی سلاوی خواتان لێ بێت ئەمە یەعنی چی... من گووتم مەردبە و مەردی خوابە پێمبڵێ تۆ چۆن دەزانیت من خەوم بە چییەوە دیوە، کەچی ئەو گەماڵ باوکە نایهێنێت و نایبات دەڵێت وای داود ئاغا گیان، وای بەقوربانی ئەو ڕۆحە پاکەت بم، ئەوە نەخۆشییە و چەند ساڵە لەگەڵمایە. من گووتم دەی نەخۆشییە گەماڵ باوک لە ناو ئەو دونیا و عالەمەدا کەس براوە خەونی من نەبێت ببینێت. ئەو دەستیکردە ملم و وەک ئێستا باوکی مردبێت دەگریا گووتی داود ئاغا تۆ ڕۆحێکی پاکت هەیە، دامێنی تۆ وەک دامێنی فریشتە خاوێنە بۆیە خەونی تۆ دەبینم ....».

داود ئاغا دەمی نانی نیوەڕۆ، بێئەوەی خەبەرداری ئەوە بێت من لە پشت چادرەکەوە وەستاوم و گوێم لە هەموو شتێکە بەوجۆرە بەسەرهاتەکەی شەوی بۆ ئەوانی تر دەگێڕایەوە. هەموو لە دەوری سفرەی نیوەڕۆ ڕۆنیشتبوون و ماق و حەپەساو گوێیان لە داود ئاغا دەگرت. یەکێک گووتی «شتی وا هەر نابێت، داودی داود ئاغا، خۆتان دنیا دیدەن، پانتۆڵ و چاکەتی زۆربەمان خۆتان درووتانە، قەت شتی وانەبووە و نابێت، من قەت نەمبیستووە کەس خەوی یەکێکی تر ببینێت». یەکێکی تر کە «ئەبو شەهاب» یان پێدەگووت، پتر لە هەموو ئەوانی تر نیشانەی بیماری و پەشۆکانی دەروونی پێوە بوو گووتی «هیچ عەجایەب نییە. عەجایەبی لە کوێدایە، عەجایەبی چی، لە خۆتەوە بۆ دەڵێیت عەجایەبە، من ئەسڵەن بە عەجایەب نایبینم، بۆ دەبێت عەجایەب بێت، لە کەیەوە شتی وەها بۆتە عەجایەب، گەر شتەکە وانەبێت عەجایەبە». زۆر لە ئیشکەرەکان تا ئاوا نەکەوتبانایەتە قسە هەستم بە هیچ نیشانەیەکی شێتی نەدەکرد، بەلام

ئەبو شەهاب کە قسەیدەکرد بەوجۆرە ونیدەکردیت، دوای چەند ڕستەیەک نەتدەزانی چیت گووتووە و لە باسی چیدا بوویت. ماوەیەک هەموویان پێکەوە قسەیانکرد، ئیدی من لە دەرەوەی چادرەکە هیچ تێنەدەگەیشتم، لە ناکاو بۆ ئەوەی تووشی سەرسامیانبکەم، قرخەیەکم کرد و یەک ڕاست خۆم کرد بە ژێر چادرەکەدا، هێندەی منیان بینی هەموو بێدەنگ بوون. من ڕوخسەتم خواست و لەگەڵیاندا دانیشتم. هەوا وردە وردە خەریکبوو ساردی دەکرد، گووتم «سوپاس کە ئیشەکان باش بەڕێوەدەچن. گەر هیمەتبکەین، تا چەند ڕۆژێکی تر گەچکاری دوو سێ هۆڵ تەواو دەبێت. بەر لەوەی باران و بەفر دەست پێ بکات دەبێت بڕۆینە شوێنێک لە جێگای بەشەر بچێت». هەموو بێدەنگ سەیریانکردم و هیچیان نەگووت. من بۆئەوەی ئاسایی دەربکەوم گووتم «ئەم بەیانییە یەکێک بەرمیلە بانزینی موەلیدەکەی کونکردوە و زۆربەی بەنزینەکە ڕژاوە، ڕەنگە ئەمشەو بێ کارەبا بین... نازانن کێ وایکردوە؟ کەستان هیچتان نەبینیوە؟». هیچ کەس قسەی نەکرد، هەموو بێدەنگ سەیریاندەکردم و هیچیان نەگووت، من سەرم داخست و گووتم «تا دوو ڕۆژی تر بانزینمان بۆ نایەت، جەنابی نەقیب زۆر تورەیە». ئینجا داود ئاغا وەک دڵنیابێت من گوێم لە هەموو قسەکان بووە، بە شەرمێکەوە گووتی «جەنابی مستەر، ئحم ... جەنابی مستەر... من پێمگووتن کە تۆ دەتوانیت خەونی خەڵکانی تر ببینیت». من سەیری داودم کرد و چاوێکم بە ڕوخساری ئەوانی تردا خشاند و گووتم «من شەوان هەندێ خەون دەبینم کە خەونی خۆم نین ... بەڵێ، داود ئاغا ڕاستدەکات، من دەتوانم هەندێ خەونی خەڵکانی تر ببینم». کەس هیچی نەگووت، هەموو پێکەوە خامۆشبوون، سەیری یەکیان کرد و بێدەنگییەکی ئاڵۆز و تەماوی نیشتە سەر ڕوخساریان. هەموو بێدەنگ نانی خۆیان خوارد، لە کاتی نانخواردندا هەندێکیان لە ژێرەوە و بە ترسەوە سەیریانکردم و هەندێکیشیان بە هیچ جۆرێک، وەک نەبم، تەماشایان نەکردم.

ئێوارەیەک بە خۆم و دەفتەری خەونەکانمەوە خۆم کرد بە چادرێکدا و ئیشکەرەکانم لە دەوری خۆم کۆکردەوە و گووتم «وەرن لە دەورم دانیشن با هەندێ لە خەونەکانی خۆتان بۆ بگێڕمەوە». نازانم بۆچی وامکرد، هەمیشە ئارەزوویەکی بێمانا لە ناخمدا بووە وا بکەم خەڵک بزانن من خەونی ئەوانی تر دەبینم، دەتوانم بچمە ناو ماڵی ئارەزوو و ترسەکانیانەوە، هەر ئەو هۆیەش بوو کاتی خۆی پاڵی پێوەنام بچمە لای مامە سیام و نهێنی خۆمی بۆ ئاشکرابکەم. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت، من بەهرەیەکی گەورەم لە هیچ شتێکی تردا نەبوو، هەتا کاتێک سەیری دەست و بازووی کرێکارەکانی فەسیلەکەشم دەکرد، دەمزانی دەست و بازووی ئەوانیشم نییە و ناتوانم نیوەی ئەو کارانەش ئەنجامبدەم کە ئەوان دەیکەن. ئێستا دەمویست خاوەنی شتێک بم و شانازی پێوە بکەم، ئەوەی دەمتوانی لە سەری خۆمدا خەونی هەموو دونیا کۆبکەمەوە، بیانپارێزم، هەڵیانبگرم مایەی شانازیم بوو... خۆم بە کەسێک دەبینی پێچەوانەی هەموو مێژووی کۆن و نوێی دیلاوار کە یان خەونی خنکاندوە، یان وەک لانکەی کارەسات سەیریکردوە. من بە پێچەوانەی هەمووانەوە هەستمدەکرد خەون بینین هونەرە و منیش توانای ئەوەم هەیە، خاوەنی ئەو هونەرەبم.

لە ناکاو من بووبووم بە ماشینێکی ترسناکی خەونبینین، سەرەتا کەس باوەڕی بەوە نەدەکرد، بەلام هێندەی کەوتمە گێڕانەوەی خەونەکان، هێندەی هەموو شتم ئاشکراکرد، هێندەی ناوەکانم هێنا و ترسەکانم بزواند و دەرگای هەموو پەنهانێکم کردەوە، ئیتر بوارێک بۆ گومان نەمایەوە. لە ڕاستیدا سەفەری شەوانەم بە خەونەکاندا تا دەهات قووڵتر و سەیرتر و خێراتر دەبوو، زۆرجار لە کاتی خەوتندا هەستمدەکرد خەونەکان لەسەر ئەوە بەشەڕدێن کامیان زووتر بگەنە لام، وەک شەمەندەفەرێک، بە خێراییەکی

شێت، بەسەر هێڵێکی ئاسنینی پڕ مەترسیدا بڕوات، بە سەر زەمینی نیگار و خەیاڵاتدا ئاوها سەرم لە گوژمی سەرکەوتن و دابەزینێکی شێتانەدا بوو، کە هەر ساتێک و مەترسی بەربوونەوەیەکی کوشندەی لێدەکرا . من ئیمپراتۆری جیهانێکی تایبەت و نهێنی بووم و لەو ڕووەوە هیچ کەس لە وێنەم نەبوو. بینینی ئەو هەموو خەونە سەیر و تێکەڵاوە، ڕۆچوون بۆ ناو ئەو هەموو جیهانە سەیر و تەماوی و تاریکە، نوقمبوونم لە ئازار و ترس و ئارەزووی نهێنی ئەوانی تردا، بە درێژایی ڕۆژیش لەگەڵمدا دەمایەوە و کاریگەرییەکی ڕیشەیی کردبووە سەر ڕەفتارم. هیچ شتێک لە بینینی خەونی ئەوانی تر سەیرتر و ترسناکتر نییە، من لە گەشتەکەمدا بە خەونەکاندا، تەنیا ئەو جەلادانەم نەدەبینی کە هەر یەکەیان ڕەنگێک و شێوەیەک و ڕوخسارێکیان هەبوو، بەڵکو دەچوومە ناو نهێنی ڕۆحی مرۆڤەکان، ناو عەشقیان، ئارەزووەکانیان، تەماحەکانیان ... حەزیاندەکرد کێ بکوژن، گومانی خراپیان لە کێ هەبوو، دەیانەویست لەگەڵ کێ بخەون، بۆ کوێ سەفەربکەن ... خەون خەزنەی هەرە نهێنی و شاردراوەی مرۆڤەکانە، بە پێچەوانەی هەندێ لە تەفسیرە دەروونییەکانیش، مرۆڤ لە پاڵ هەموو خەونێکی ئەلاجەیی و جڕنی و فڕنیدا، ژمارەیەکی زۆر خەونی ئاقڵانە و داڕێژراوی هەیە. ئەوەی سەیربوو من زۆر بە ڕوونی و سافی خەونەکانم دەهاتەوە یاد، ڕێدەکەوت هەندێ شەو چەندەها خەونی یەک کەسم دەبینی، خەونگەلێک هیچ یەک لە خاوەنەکانیان بەو سافی و بێگەردییەی من نە دەهاتەوە یادیان، من زۆربەی خەونەکانم ڕوونتر لە خاوەنەکانیان دەهاتەوە یاد. ئەوەی لە سەرەتاوە باوەڕم پێی بوو، خەون و حەقیقەت تێکەڵاو نەکەم، لە ناو ئەم چیایانەدا لە دەستمدا، بە یەکجار خەون و حەقیقەت وەها لە ژیانمدا بوون بە یەک، ئیتر جارێکی دی ترازانیان بۆ نەبوو. لەو ڕۆژەوە کە ئیشکەرەکان دەیانزانی من خەونەکانیان دەبینم، ترسێکی سەیریان لە من هەبوو، هەندێکیان خۆیان لادەدا و هەندێکیان

خۆیان نزیکدەکردەوە، هەندێکیان کە دەیانزانی من خەونەکانیان دەبینم دەهاتن و چی نهێنییەکی تریان هەبوو ئاشکرایاندەکرد، سۆزی دڵیان هەڵدەڕشت، ئارەزووە حەرامەکانی خۆیان دەردەخست، دەگریان و منیش لەگەڵیاندا دەگریام.

سەرەتا گێڕانەوەم بۆ خەونەکان ئاشکرا و کراوە بوو، شەوان وەک حیکایەتخوانێکی قسەخۆش، ناوەڕاستی مەجلیسەکانم دەگرت و دەفتەرەکەمم دەردەهێنا و دەکەوتمە گێڕانەوەی خەونەکانی شەوی پێشوو. خەونی هەر کەسێکم وەک خۆی و لە بەر چاوی هەمووان دەگێڕایەوە... دوو هەفتەی یەکەم هەمووان هەر پێدەکەنین، کاتەکانی خەون خوێندنەوە لە ساتە خۆشەکان بوو، کۆبوونەوەیەکی نائاسایی بوو. دوای ڕۆژێکی درێژی ئیش، هەموو کۆدەبووینەوە و کەمێک خەندە و خۆشیمان دروستدەکرد. بەلام خەون ئامێرێکی سامناکە نازانیت لە کوێدا و کەی و چۆن نێچیری خۆی دەپێکێت، نهێنی ڕاستەقینەی زۆر خەون تەنیا لای خاوەنەکەیەتی، من تەنیا سەرێک بووم پڕ لە دیمەن، شتێک وەک مەکینەی سینەمایەک کە لە بری فیلم تەنیا خەون پیشاندەداتەوە... لە مانای زۆربەی خەونەکان تێنەدەگەیشتم، زۆر جار سەمبول و ئاماژەکانم نەدەبینی، تێنەدەگەیشتم دەرکەوتنی ژنێکی گریاو، منداڵێکی کوژراو، درەختێکی گڕگرتوو، باڵندەیەکی بێباڵ، مەمکێکی بریندار، گوڵێکی زێڕین، ماسییەکی ئاسن... دەبێت نیشانەی چی بن. هەندێ لە خاوەن خەونەکان هیچیان لە خەونی خۆیان بیر نەدەما، قەبووڵیان نەدەکرد ئەوە خەونی ئەوان بێت، یان تەنیا پرزۆڵێک لە خەونەکەیان یاد بوو، بەشێکی کورت، وێنەیەک، ڕستەیەک... هەندێکیان گەرچی هیچیان لە خەونەکەی خۆیان یادنەمابوو، هێندەی من دەکەوتمە گێڕانەوەی دەیانزانی ئەوە خەونی خۆیانە. هەموو مرۆڤێک، هەموو شارێک، هەموو دەڤەرێک شتێک لە خەونەکانیدا هەیە کە لە جێگا و شوێنی تردا نییە. مرۆڤ گەر هەموو ئەرشیفی خەونی خۆی لەبەردەستدا بێت، ڕوونتر تێدەگات،

شتگەلێک کە لەسەر خۆی دەیانزانێت، چەند کەم و چەند نادروستن. لە ناکاو من بە هۆی خەونەکانەوە، بووبووم بە کەشتییەوانێکی ترسناکی ناو ناخ، تەنیا نهێنی مرۆڤەکانم نەدەبینی، بەڵکو هەموو ترسەکانی دیلاوار و ئاوات و پلانەکانیشم دەبینی. من بە ڕۆژ، کاتێک کرێکارەکان سەرقاڵی ئیشکردن و بازوو وەشاندن بوون، خەریکی جەبلەگرتنەوە و تێکەڵکردنی چەو و چیمەنتۆ و لم بوون، عارەقیان دەردەدا، بەردیان دەشکاند، دیواریان بەرزدەکردەوە، خەندەکیان لێدەدا ... من دادەنیشتم، گەر هەتاو بایە لە ژێر هەتاودا، گەر ساردبایە پەتوویەکم لە خۆمەوە دەپێچا و خەونەکانم دەخوێندەوە، لێیان وردبووبوومەوە، شتە هاوبەشەکانم تێدا جیادەکردنەوە، کوچە و بازاڕ و قەیسەرییەکانی دیلاوارم تێدا دەبینییەوە، باغەکان، دەریاچەکان، ماسیگرەکان، قاچاغچییە ڕەشپۆشەکان، هەزارپێچی ناو زیندانەکان، ڕیزی بێکۆتایی نەخۆشەکان، باڵندەی کوژراو و کەڵەکەبووی سەر شۆستەکان، منارەکان لە دۆخی لەرزان و لەرینەوەدا، زەنگی کڵێساکان لە حاڵەتی کپ و خامۆشیدا، باغەکان لە گەشی و باغەکان لە پەژمووردەگیدا... دەفتەری خەونەکانم وردە وردە تا دەهات گەورە دەبوون. هەستمکرد ئێستا بە ڕاستی ناو ڕۆحی دیلاوار دەبینم. دوژمنەکانم دەبینی لە خەوندا، ترسم دەبینی لە جەنگ، ئارەزووم دەبینی بۆ جەنگ، خەیاڵاتی مردن و هەلاهەلابوون، خەیاڵاتی سەرکەوتن و مارشی حەماسەتداری سوپاکان، برینداربوون، کەوتن، بەرپابوونی مەحشەر، تێکشکان.

سەدان وێنە کە هەمووی وێنەکانی دیلاواربوون، ئەرشیفی تاریکی شارەکە بوون، مێژووی هەرە خنکاو و هەرە نادیار و نەگیراوی شوێنێک بوون کە مێژوو تێیدا چین دوای چین لەسەر یەک نیشتبوو. جەلادەکان تەنیا شتێک نەبوون کە بەردەوام لە هەموو سەرێک و لە زۆر خەوندا دووبارە دەبوونەوە، جەلادەکان لە یەک خەون و لە یەک ڕوخساردا دەرنەدەکەوتن، خەونە ترسناکەکەی دیلاوار تەنیا خەون

نەبوو کە چەقۆ بەدەستێکی نەناسراو و غەریب بە خۆی و ئیرادەیەکی بێسۆز و ڕەحمەوە دەردەکەوت و بێ هیچ ترسێک لە مەرگ و خوێن قوربانییەکانی سەردەبڕی. جەلادەکان هەتا لە ناو یەک سەردا، هەندێ جار لە ناو یەک خەوندا ڕوخساری جیا، ڕەنگی جیا، چەکی جیا، ئەشکەنجە و مردنی جیایان پێ بوو. خەونەکان تەنیا سەربڕین و ترسیان تێدا نەبوو، بەڵکو دەیان خەونم بینیوە کە قوربانی غەریبەکان و جەلاد ئێمە بووین، جەلادەکان ئەم پیاوە ماندوو و دێوانە و تەنهایانە بوون کە لە بەرگی تردا، لە دەموچاوی تردا لە خەونەکانی خۆیاندا وەک سەرپەڕێن، چەقۆدار، سزابەخش دەردەکەوتن. خەڵکانیان وەک مەڕ ڕیزدەکرد و وەک قەساب سەریان لە لەشیان جیادەکردنەوە. هەموو لە یەک کاتدا جەلادێک بووین بە سەدان دەموچاوەوە، قوربانییەکیش بووین کە جەلادەکانمان سەدان دەموچاویان هەبوو. من هەندێ شەو هەڵدەستام و هەموو گیانم دەلەرزی، هەڵدەستام و سەرسام بووم، چۆن ئەم پیاوە ماندوو و بێدەنگ و بەدبەختانە دەتوانن لە خەوندا ببن بە پیاوکوژ، بە سەرپەڕێن، بە قەساب... من لە دوو هەفتەی یەکەمدا خەونەکانم تەنیا وەک گەمەیەکی منداڵانە، وەک یارییەک کە خۆشی و پێکەنینی تێدایە دەگێڕایەوە. یارییەک بوو وەک ئەوەی کەسێک ئەنگوستیلەیەکی لە ژێر یەکێک لە دە کڵاودا شاردبێتەوە و من هاتبم بێ هیچ بیرکردنەوە و سەختییەک ئەنگوستیلەکەم دۆزیبێتەوە. وەک بە خاوەن خەونەکە بڵێم «ئەها، من دەزانم تۆ ئەنگوستیلەکەت لە ژێر چ کڵاوێکدا داناوە». سەرەتا شتەکان یاریی بوون، پێکەنین بوون، پاک بوون، بێگوناهی بوون ... نە نیازێکی بەدیان لە پشت بوو، نە خواستێکی خراپ... بەڵام هیچ یارییەک نییە شەیتان دەستی تێ نەخات، بە تایبەت گەر کاری بە دونیای پڕ نهێنی و زوڵمەتی خەونەوە هەبێت.

وردە وردە و ڕۆژ دوای ڕۆژ پاکی گێڕانەوەکانم دەکەوتنە ژێر پرسیار. شەوێکیان دوای دوو سەعات گێڕانەوەی خەونی جیاواز لە ژێر یەکێک لە

چادرەکان هاتمەدەری، دەفتەرەکەمم خستبووە بن هەنگلم و بە ڕێگاوەبووم بۆ شوێنی خۆم. لە ناکاو دەستێک توند ڕایکێشام و بەرەو ناو بینای هۆڵە تازەکانی بردم، بۆ بەینی کۆڵەکەی ترنجاوی ژێر تەختەی تەختەبەستەکان، جێگایەک بۆنی چیمەنتۆ و شێی لێدەهات، ساردییەکی کپ و خنکێنەری تێدابوو، بۆنی بینایەک لە سەرەتای دروستبوونیدا، بۆنی سەقف، بۆنی کۆڵەکە، بۆنی دیوار بەر لەوەی هێشتا خۆیان گرتبێت. دەستێکی بەهێز بوو کە توند ڕایکێشام و دەستی خستە سەرچاوم و تا نەگەیشتمە نێوان کۆڵەکەی تەختەبەستەکان، ئازادی نەکردم. بەجۆرێک توند گرتبوومی و ڕایدەکێشام نەتوانیم هاواربکەم، نەتوانیم تێبگەم، نەتوانیم هەڵبێم. کە بەریدام ڕاستەوخۆ لە پایەیەکی کۆنکریتی گیرکردم، هەر بە قەوارەی لەش و ڕوخساریدا زانیم ، ئیسماعیلی خەڵکی دسکارا بوو، ئەو پیاوەی لە خەونەکانیدا بەردەوام هەزاران بولبول دەیانخوێند. ئەو شەوە من یەک خەونم لە ئیسماعیل گێڕایەوە، خەونی ژنێک بە ڕووتی لە دوکانێکی قەسابیدا وەستاوە و بە چەقۆیەکی گەورە، پارچەیەک گۆشتی گەورە لەت لەتدەکات، ناو قەسابخانەکە چەندین قەفەزی باڵندەی تێدابوو، کۆمەڵێک بولبول بە یەکەوە دەیانخوێند. لە خەونەکەدا ئیسماعیل دەهات و هەندێ قسەی لەگەڵ ژنەکەدا دەکرد، قسەکان نە دەنگیان دەبیسترا و نە دیاربوو باسی چی دەکەن، دواتر بۆ چەند دەقیقەیەک هەموو شتێک دەوەستا، دەنگی بولبولەکان بە جۆرێکی دڕندانە بەرزدەبوونەوە، بە شێوەیەک مرۆڤی شێتدەکرد… دەنگەکان گەرچی جوان بوون، بەڵام بە جۆرێک ئازاربەخش بوون مرۆڤیان نەخۆش دەخست. من هەستمکرد جەنجاڵی ئەو دەنگە جوانانە تا سنووری کوشتن و شێتی دەمبەن … لە ناکاو ئەو ژنە قەشەنگە، بە کێردەکەی دەستی دەکەوتە سندوقەکان، وەک بایەکی شێت، وەک جەنگاوەرێکی زامداری کوتەک بە دەست، قەفەزەکانی دەشکاند و باڵندەکانی دەخست و پەڕی بولبولە زامدارەکانی دونیایان پڕدەکرد…

بولبولەکان هەمیشە دەیانخوێند، ژنەکە لە ناکاو بە کێردە تیژ و بێڕەحمەکەی دەستی دەکەوتە گیانی خۆی، دەکەوتە لەت لەتکردنی دەستی خۆی، لە پەنجەکانییەوە دەستی پێدەکرد، ورد ورد دەیجنین، بازووی، قاچەکانی، مەمکی، بە جۆرێک دواجار تەنیا دەستێک و سەرێکی غەمگین و جووتێک چاوی سووری خوێنین دەمانەوە.

ئەوە ئەو خەونە بوو کە من گێڕامەوە.

من هیچ شتێکم لەسەر ژیانی ئیسماعیلی خەڵکی دسکارا نەدەزانی، ئەوە نەبێت خەڵکی گوندێکی باشووری دیلاوار بوو، وادەزانم زەمانێک کە هاتبووە دیلاوار هەر کات خۆی بە خەڵک ناساندبوو، وەک ئیسماعیلی خەڵکی دسکارا خۆی ناساندبوو، بۆیە هەر بەو جۆرە بانگیاندەکرد. کارەکەی تیمارپێچی بیمارستان بوو، هۆی بوونیشی لە بەتالیۆنی سێدا، ئەوە بوو تووشی ترسێکی بێهۆ و دەروونی لە ژنان بوو بوو. دەمێک هاتبووە سەنتەر، بە نیازی چارەسەری لەو ترسە ناوی تۆمار کرابوو، ژنەکەی و منداڵەکانی لەگەڵ هەندێ خزمدا پەلبەست هێنابوویانە بیمارستان، دواجار لە سەنتەر ئارام و ئاسوودە و هێور بووبووەوە، هاتنیشی بۆ چیاکان لەسەر ئارەزووی خۆی بوو تا بەرەو سەر زەمینێک بڕوات ژنی تێدا نەبێت . کە منی ڕاکێشایە ناو دار و شێلمانی بینا تازەکانەوە، توند دەستی خستە بینم و بە تووڕەبوونێکی نائاساییەوە گووتی «دواجارت بێت باسی ژنەکەم بکەیت... دواجارت بێت». من سەرسام و بێئاگا گووتم «من، من لە کوێ باسی ژنی تۆم کردوە، من ژنی تۆ لە کوێ دەناسم». توند ڕایوەشاندم بە جۆرێک سەرم بەر شێلمانەکە کەوت و گووتی «ئەو ژنەی ناو خەونەکە ژنی خۆمە... تێدەگەیت... ئەوە ژنی خۆمە. من نامەوێت بێتەوە یادم تێدەگەیت، من نامەوێت، من هەموو خەونێک، یادێک، شتێک پەیوەندی بەوەوە هەبێت لە مێشکی خۆم سڕیومەتەوە و

تۆ دێیت دەیخەیتەوە بیرم». شێتییەکی بێوێنە لە دەنگی ئیسماعیلدا بوو، بە هەموو هێزی خۆی دەستی خستە بینم و گووتی «تۆش مەلعونی، وای مستەر گرینۆکی مەلعون، مستەر گرینۆکی مەلعون، هەی گەنیوی بۆگەن، جانەوەری بێمەزەب». چەند جارێک توند ڕایوەشاندم، سەرم زۆر توند بەر شێلمانەکە کەوت و هەستم بە خەفەبوون و خنکان و ترسێکی گەورە کرد، دڵنیابووم بەو دەستە زل و بەهێز و زبرانەی خەفەمدەکات. لە چرکەیەکدا دەممکردەوە و بە هەموو توانایەکی خۆم قیژاندم و داوای یارمەتیمکرد، هاوارمکرد فریامکەون. ئەو بە جۆرێک وەک نیازی بێت بمخنکێنێت توند دەستی خستە سەر دەمم. هاوارەکەم گەیشتە گوێی هەندێ لە ئیشکەر و پاسەوانەکان و بەرە و ناو بیناکان پڕتاویانکرد. هەموو سەرسامبوون کە منیان خوێناوی و نیوە خنکاو لە ژێر دەستی ئیسماعیلدا بینی. ئیسماعیل کە هوروژم و هاواری ئەوانی تری بینی، دەستی کێشایەوە و گەڕایەوە دوا. من لە بەر لێڵی چاوانم و تاریکی شوێنەکە جگە لە کۆمەڵێک تارمایی هیچی دیکەم نەدەبینی، هەستم بە خوێنێکی گەرم کرد، بە سەر و پشتملمدا دێتەخوار، خوێنێکی بە خوڕ... بە دەنگێکی گریاو گووتم «یارمەتیمبدەن دەمرم، یارمەتیمبدەن خوێنم لێ دەڕوات».

شەوێک بوو لە شەوە ناخۆشەکان، پاسەوانەکان ئیسماعیلیان گرت و نەقیب بە ماشێنە تایبەتییەکەی خۆی منی نارد بۆ بیمارستانێکی سەربازیی کە نزیکی چل دەقیقە لە خێوەتگاکەمانەوە دوور بوو. من زۆر خوێنم لەبەر دەچوو، بەڵام هێشتا ئەوەندە وزەی ژیانم تێدابوو لە هۆش نەچم. هەر یەک لە زەهاو و نەواس لەگەڵمدا بوون. دوای دوورینەوەی برینەکەی سەرم، شەو لەو بیمارستانە مەیدانییە مامەوە کە تەنیا بۆ چارەسەری خێرای ڕووداوی کتوپڕ دانرابوو، بێئەوەی کەرەستە و کەلوپەلێکی پزیشکی ئەوتۆی تێدا بێت بکرێت برینی گەورە و دەردی سەخت چارەبکەن. پزیشکێکی گەنجی خەواڵوو بە دەم باوێشک و پرسیاری گێلانەوە برینەکەی تەقەڵکارکردم،

من گەرچی لە لێواری لە هۆش خۆچووندا بووم، بەڵام پزیشکەکە لە من بێحاڵتر، هێند خەواڵوو بوو، ترسم بوو لە بری جێ برینەکە شوێنێکی دیم بدوورێتەوە. واپێویستیدەکرد ئەو شەوە لەسەر تەختێک لە بیمارستانە مەیدانییەکە بمێنمەوە، من بە کاریگەری دەرزییەک و هەندێ حەب خەوێکی قووڵم لێکەوت و تەنیا بەیانی زانیم کە زەهاو و نەواس شەو گەڕاونەتەوە بۆ خێوەتگاکە و من تەنیا لەوێ بووم.

بۆ ڕۆژی دوایی کە گەڕامەوە زانیم، نەقیب هەر ئەو ڕۆژە و بۆ ماوەی دوو هەفتە ئیسماعیلی ناردوە بۆ کەمپی ئیش و تەمێکردنی قورس، کەمپەکە چەند سەعاتێک لە ئێمە دوور بوو، لە ناو بەشی هەرە سەخت و ترسناکی چیاکاندا، جێگایەک بۆ سەرپێچیکەران و ئیش نەکەران و گێرەشێوێنان تەرخان بوو. ئەو بڕیارەی نەقیب زۆر تورەیکردم، ئیسماعیل دواجار کەسێکی نەخۆش بوو لە دۆخێکی دەروونی نائاسایی و پەرێشاندا، من بێئەوەی بزانم و مەبەستم بێت برینداریکردبوو، سزای وەها دەرەنجامێکی باشی نەدەبوو. من هەستم بە گوناهێکی گەورە کرد و لە بەرچاوی هەمووان گریام بۆی. هەموو ناڕەزاییەکانی خۆمم بە نەقیب گەیاند، بەڵام نەقیب بە ڕوونی پێیگووتم کە یاساکان وەهایە هەر کەسێک بچێتە ئەوێ تا ماوەی تەمێکردنی خۆی تەواو نەکات ناگەڕێتەوە... جگە لەوەی ئەو تەمێکردنە بە پێویست دەزانێت، تا هەر کەس سنووری خۆی بزانێت و ئەندامانی تری فەسیلەکە لە جۆرە پەلاماری وەها بپارێزێت .

لەو ڕۆژەوە من گێڕانەوەی خەونەکانم وەستان، هەستمکرد بەردەوامبوون لەسەر ئەم یارییە دەرەنجامی ترسناکی دەبێت... بەڵام ئەوە تەنیا سەرەتا بوو.

# خەونێك لە دەفتەری خەونەکانەوە

من خەریکی خوێندنەوەی کتێبێکی گەورەم کە هەستدەکەم تا زیاتر دەخوێنمەوە چاوانم ئێشێکی نهێنی تێدەگەڕێت، نازانم چی دەخوێنمەوە، بەلام تا دەست لە لاپەڕەکان دەدەم، سەرپەنجەکانم دەتەزن. هەستدەکەم بەشێکی لەشم دەسووتێت و بەشێکم سەرمایەتی. بەرامبەر خۆم سێ ئاوێنەی جیاواز دەبینم، من لە هەر ئاوێنەیەدا لە شتێک دەچم، کاتێک دەجولێم هەر سێ وێنەکە دەجولێن، بەلام هەر یەکەیان بە جۆرێک و هەر یەکەیان بە ئاراستەیەک. لە هەر ئاوێنەیەکدا و دەموچاوێکم هەیە، هیچ یەک لە وێنەکان لە یەک ناچن و منیش لە هیچ یەک لە وێنەکان ناچم. کە سەیری کتێبەکە دەکەم ئاوێنەکان نامێنن، کە سەر بەرزدەکەمەوە دووبارە دەگەڕێنەوە. هەندێک لە لاپەڕەکان ناکرێنەوە و من دەبێت بە چەقۆیەکی تایبەتی هەلیانبڕم، هەستدەکەم کاتێک چەقۆکە نزیکدەکەمەوە کتێبەکە دەگری... دلنیام دەنگێک لە ناو یەکێک لە لاپەڕەکاندایە کە بە نهێنی دەگری. بە خێرایی کتێبەکە هەلدەدەمەوە و هیچ شتێک نادۆزمەوە، دەمەوێت بزانم ئەو گریانە لە چ لاپەڕەیەکدایە... بەلام دۆزینەوەی ئەستەمە. من بەردەوام سەیری کتێبەکە دەکەم، دەبینم هێندی دەسووتێت و دوکەلەکەی دەچێت بۆ ئاسمان... دەبینم دەبێتە هەور... دەبینم دەبارێت... دەبینم من لە هەموو ئاوێنەکاندا سەرم بەرزکردۆتەوە بۆ ئاسمان و سەیری ئەو بارانە دەکەم. دەبینم هەر تکەیەکی باران کە بەردەستم دەکەوێت دەبێت بە خوێن. دەبینم کتێبەکە دووبارە لە ئاسمانەوە دێتەخوارێ... هەموو حەرفەکانی بریندارن، هەموو لاپەڕەکانی خوێنیان لێ دەتکێت... دەمەوێت دووبارە بخوێنمەوە، بەلام ناتوانم.... پرۆفیسۆر بەهنام لێم نزیک دەکەوێتەوە و دەلێت «خوێن ناخوێنرێتەوە،

خوێن ناخوێنرێتەوە، خوێن ناخوێنرێتەوە». من دەڵێم «ئاه، چۆن خوێن ناخوێنرێتەوە». ئەوانەی لە ئاوێنەکەدان هەر سێکیان سەر دەلەقێنن و دەڵێن «خوێن هەر خوێنە، ناخوێنرێتەوە». پرۆفیسۆر دەڵێت «هەر کتێبێک خویناوی بوو، با لە ئاسمانیشەوە هاتبێت، دەستی لێمەدە... دەستی لێمەدە». من ترساو لە کتێبەکە دووردەکەومەوە و ڕادەچڵەکم ... بە ئاگادێمەوە بێئەوەی بە ئاگابم.

# ٣٨

ئاڵ موراد گێڕایەوە :

تفەنگی دووربیندار، وەک تفەنگی ئاسایی نییە. لەم تفەنگەدا مرۆڤ نێچیرەکەی روونتر و سافتر و نزیکتر دەبینێت. لە تفەنگی ئاساییدا هەتا کاتێک جاسوسەکەت رێک لە نیشانەکە جووتدەکەیت، نیشانەکە هەمیشە دوور و ناڕۆشنە لات، شتێک هەیە من ناوی دەنێم غەریبی نێوان تفەنگچی و نیشانەکەی، ئەو غەریبییە هەمیشە دەمێنێتەوە. دوورییەک کە لە دوورییەکی رووتەوە دەبێت بە لێکترزانێکی تەواوی نێوان تفەنگچی و نیشانەکەی، وەک ئەوەی من و نێچیرەکەم هەر لە ئەزەلەوە لەیەک دووربووبین، من بۆ ئەوە دروست بووبم لێرەدا بە دیار نێچیرەوە دانیشم و ئەویش لە دوورەوە هاتبێت تا ئێستا و لێرەدا من بیپێکم. بەڵام تفەنگی دووربیندار نێچیرەکە بە جۆرێک نزیکدەکاتەوە کە هەموو ئەو غەریبییەی پێویستە لە نێوان تفەنگچی و نیشانەکەدا بمێنێتەوە، لە نێو دەچێت. کاتێک لە چیا مەشقماندەکرد، نیشانەکان بێگیان بوون، شوشەبوون، بەردبوون، درەخت بوون، پێویستم بەوە نەبوو بیر لە دوور و نزیکی بکەمەوە، بەڵام کە دێیتە سەر ئەوەی لە شوشەی دووربینەکەتدا، لە زائدی پێکاندا ڕوخساری مرۆڤێکی زیندوو ببینیت هەموو شتێک دەگۆڕێت، دووربین وەها ڕوخسارەکان نزیکدەکاتەوە

ناتوانیت خۆشت نەوێن، من بەجۆرێک لە جۆرەکان عاشقی هەموو ئەو دەموچاوانە بووم کە لە بازنەی دووربینەکەمدا بینیمن. تا سەرزەنشتم مەکەن، من دەزانم هیچ خۆشەویستییەک وەک ئەو عەشقە ئەستەم و ئازاربەخش نییە کە لە نێوان تفەنگچی و نێچیرەکەیدا دروستدەبێت، عەشقێکە لەو ساتەدا لەدایکدەبێت کە دەست بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەتدا دەنێیت، لەو چرکەیەدا کە گوللەکەت بەڕێوەیە بەرەو پێکان، ساتێکی سەیرە، زۆربەی قوربانییەکان لەو چرکەیەدا پێدەکەنن، خەندەیەکی گەورە دەکەوێتە سەر ڕوخساریان، وەک ئەوەیە بۆ کامێرایەک، بۆ فلاشی وێنەگرێک پێبکەنن، دوا خەندە و دوا پێکەنینە، دواتر گوللەکە دێت، گوللەکە وەک بریسکەی فلاشەکە وەهایە... تراق ... لەگەڵ بریسکەی فلاشەکەدا گوللەکە دەپێکێت و بۆ هەتا هەتایە وێنەیەک لە خەیاڵتدا دەمێنێتەوە، بە جەشنێک گەر دوای مەرگیش خەیاڵت بکرێنن ڕەنگەکانی هەر ماون و نەڕۆیشتوون.

هیچ کات باوەڕم نەدەکرد بمانبەن بۆ جێگایەک لەسەر مرۆڤی ڕاستەقینە مەشقبکەین. دەمزانی دێلاوار تا دێت لە گۆمی خوێن و بێڕەحمیدا نوقمدەبێت، بەلام بگاتە ئەوەی قەناسەکان لەسەر نێچیری زیندوو مەشقبکەن، شتی وا ئەستەم بوو، گەر خۆم لەوێ نەبوومایە و یەکێک حیکایەتەکەی بگێڕابایەتەوە، باوەڕم نەدەکرد. ئەو شەوەی لە نیشتەجێی یەکەممان هەڵیانکەندین، بە ماشێن هێنایانین بۆ جێگایەکی دووری دیکە. ماڵێک بوو، وەک ماڵی پادشای ناو فیلمی منداڵان بەسەر قوتەیەکی بەرزەوە، جێگایەک بەسەر خەڕەندێکی گەورەدا دەیڕوانی، چاڵێکی قووڵ کە لە بنیدا زیندانێکی بچوک هەبوو، زیندانی خەرەندیان پێ دەگووت. لە بنکە نوێکەدا مامۆستایەکی نوێشمان هەبوو، کوڕێکی قۆزی باریک بوو، لەش و لارێکی ڕێک و مەشق دیدەی پێوە بوو کە لە بەرمبەریدا من بە خۆم و جەستەی لاواز و ڕیوەڵەیەمەوە هەستم بە شەرمەزاریدەکرد، وەک دوو مامۆستاکەی پێشوو چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاودا بوو، ئەمیش بە دەستووری ئەوانی پێشوو تەپلەکەی

سەری خۆی تا بناگوێی کێشابوو. هیچ نیشانە و ڕوتبەیەکی سەربازی پێوە نەبوو، بەڵام زمانێکی سافتر قسەیدەکرد و ئیرادەیەکی ئاسنینتری هەبوو. مامۆستاکەمان هەر ڕۆژی یەکەم بە دەست ئاماژەی بۆ زیندانی بنی خەرەند کرد و ئاگاداریکردینەوە کە ئەوە زیندانی کەسانێکی مەحکومن بە مەرگ. سەدان کەس لەوانەی دەبوو بمرن لەو زیندانە قووڵەدا بوون، جێگاکە وەها عاسیبوو، هەڵهاتن لێی کاری ڕۆحلەبەری بێ باڵ نەبوو. تا ئەو کات بوونی جۆرە زیندانێکی وەهام نەبیستبوو، دیلاوار خۆی شاری زیندانە گەورەکان بوو، ئیستا بۆ دەبێت لەم دۆڵە بێدەنگەدا، لە ناوچەیەکی سەربازیی داخراودا، لە زەوییەکدا نزیکی سەد کیلۆمەتر لە خودی دیلاوارەوە دوورە، ئەم زیندانە لە شوێنێکی وەها نهێنیدا هەبێت، دڵنیابووم دیلەکانیش بە ڕەوشێکی یاسایی دروستدا نەڕۆیشتوون و بە دزییەوە گیراون و بە دزییەوە حوکمدراون.

مامۆستا نوێکەمان کە پیاوێکی خوێندەوار و پڕ زانیاریی دیاربوو، پێیگووتین «قەناسە چەکێکی نوێیە بۆ ئێمە. چەکێکی پیسە، پێشتر تەنیا خۆرئاواییە سەگبابەکان باش بەکاریانهێناوە، بەڵام ئیتر ئێمەش دەبێت هەمان بێت. قەناسە چەکی سەردەمێکە کە بکوژ نایەوێت خۆی دەربکەوێت، چەکی ئەو کارانەیە کە دەمانەوێت بە نهێنی بمێننەوە، هیچ شتێ لەوە خۆشتر نییە یەکێک بکوژیت و تا قیامەت کەس نەزانێت کێ پەنجەی ناوە بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەدا، ئەم چەکە دەتوانێت مێژوو پربکات لە نهێنی، ئیشێکی زۆر بۆ مێژوونوسە دەبەنگەکان بدۆزێتەوە کە تاقیامەت بیهێنن و بیبەن بزانن کێ و لە کوێوە تەقەیکردوە. هێی گوێگرن، ئێوە کە وەک پێنج دەست ڕاستترین جەنگاوەری دیلاوار هەڵبژێردراون، بۆئەوە نییە نیشانە لە کەلەشێر بگرنەوە، شوشەی شروبی کۆکە یان بۆتڵە بیبسی بەتاڵ بشکێنن، لە دوورەوە ڕێوی بن بەردانمان بۆ بکوژن. ئێوە ئیشتان نیشانە گرتنەوەیە لەسەری ئینسان، ئەوە ئیشی ئێوەیە. هەر چی مەشقێک کە دەیکەن تەنیا بە یەک مەبەستە، کە نیشانەتان گرت ڕاستەوخۆ لە ناوچاوان بدەن».

گەرچی لەسەرەتاوە ئەوەمان دەزانی، بەلام قسەکانی وا ڕوون و بێ پێچ و پەنا بوو، ئازاری دڵی دەدا. مامۆستا نوێکەمان ڕەحمی نەبوو، فیشەکێکی گرت بە دەستەوە و گووتی «ئەوەی ئەم چەکەی گرت بە دەستەوە، چاوی نا بەم دووربینەوە، دەبێت کاری بەوەوە نەبێت کێ لە بازنەی ئەم شوشە بچوکەدا دەردەکەوێت... نەپرسێت ئەمە کێیە؟ ئەمە چییە؟ ئەمە بۆ؟ . ئیشی ئێوە یەک شتە، نیشانەیەکی ورد بگرنەوە و هەڵە نەکەن. هەموو هەڵەیەک لە دونیادا لە وانەیە ڕاستبکرێتەوە، بەلام هەڵەی قەناس نا، ئێوە بەم فیشەکەی دەیتەقێنن مێژوو دەگۆڕن، گەر بپێکن مێژوو بە ئاراستەیەکدا دەڕوات گەر نەپێکن بە ئاراستەیەکی تردا». فیشەکەکەی بەرزکردەوە و بە ئێمەی گووت «جوان سەیریبکەن... جوان... شتێکی وا بچوک و بێمانا هەندێ جار دەتوانێت بڕیار لە چارەنوسی سەدان هەزار کەس بدات».

کوڕەکان دەیانگووت مامۆستاکەمان بەشداری لە دەیان شەڕدا کردوە، لە هەموو جەنگەکانی خۆرهەلاتدا بەشداربووە، لە کەنارەکانی دەریای سپییەوە تا چیاکانی ئەفغانستان چ جەنگ و پێکدادانێک بووە ئەم لەوێ بووە. ئەو شتێکی لەسەر ڕابوردووی خۆی بۆ ئێمە باس نەدەکرد. لەو مامۆستا حیرفەگەرانە بوو کە هەمیشە مەودایەکی تاریک و پێویست لە نێوان خۆیان و قوتابیدا دەهێڵنەوە. ئەو دەیگووت «هەر کەسێک، هەر شتێک لە ئاوێنەی دووربینەکەدا بوو تۆ مەیبینە، مەیناسە، گوێی پێمەدە، ئیشی ئێوە پێویستی بە ئیحساسات نییە، ئێوە نیشانەیەکتان هەیە و دەبێت لێیبدەن. هەموو خەیاڵتان دەبێت لەسەر ئەوە بێت لە نیشانەکە بدەن، هەر کات بۆ چرکە ساتێکی کورتیش خەیاڵتان چووە سەر ئەوەی ئەم کەسەی دەتانەوێت تەقەی لێبکەن کێیە، پرسیتان بۆ دەبێت من ئەم کەسە بکوژم، دڵنیابن نیشانەکەتان لە دەستداوە. هونەری ئەم ئیشە ئەوەیە کە بزانیت تۆ تەنیا قەناسیت... تۆ کەس ناکوژیت، تۆ نیشانەیەک دەپێکیت».

گەرچی قەبوولکردنی ئەوە سەخت بوو، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو جگە لەوەی کە قەبوولیبکەم.

شوێنی ئێمە لەو ماڵەی لێواری خەرەندا بۆ ئەوە دیاریکرابوو بەسەر سەربانی زیندانەکە و حەوشە گەورەکەیدا بڕوانێت، زیندانەکە دوو ئەڵقەی مەحکەم پاسەوانی هەبوو، یەکێکیان لە ناو زیندانەکەدا، یەکێکی دیشیان لە دەرەوە، لە دەمی دەری خەرەندەکە و لە چوار دەوری بیناکە. ئێمە لە سەربانی ماڵەکەی خۆمانەوە تفەنگە دووربینەکانمان دادەمەزراند. بەرپرسانی زیندانەکە کە خەبەری تەواویان لە مەشقەکانی ئێمە هەبوو، مەحکومەکانیان دەهێنا، لەسەر کورسییەک دایاندەنان، دەیانخستنە ناو هەندێ نیشانەی ترەوە، فەرمانیان پێدەدان بجوڵێن. ئەوانەی مەحکوم بوون بە مردن دەبوو بەو جۆرە حوکمەکەیان جێبەجێبکرێت. ئێمە ئەو جەلادانە بووین کە هەم مەشقماندەکرد و هەم حوکممان جێبەجێدەکرد ... مامۆستا گووتی «مەشقەکان درێژ نین، تەنیا چوار ڕۆژ دەتوانین لەسەر نمونەی بەشەریی ئیشبکەین. دوای ئەم چوار ڕۆژە تەنیا یەکێکتان وەک شا قەناسی دێلاوار هەڵدەبژێردرێت و چوارەکەی تر دەگەڕێنەوە بۆ ناو فەسیلەکانی خۆتان و دەبنەوە بە جەنگاوەرێکی ئاسایی». ئەو کات نەماندەزانی بۆچی هەڵماندەبژێرن، ئەوەی دەبێت بە شا قەناس دەبێت چی بکات و چ پاداشتێکی دەستدەکەوێت.

ڕۆژی یەکەمی مەشقەکانمان، کە دەستمان پێکرد، من دواهەمین کەس بووم کە دەبوو نیشانە بگرم. نیوەڕۆیەکی پاییزی ساردبوو، نیوە هەور و نیوە هەتاو. هەر چوارمان پەڕۆیەکی تایبەتی باغەوانەکانمان بەستبووە نێوچاوانمانەوە و بە ڕیز تفەنگەکانی خۆمان لە بەردەم خۆماندا دانابوو، مامۆستاکەمان بە خۆی و چاویلکە ڕەشەکانییەوە لە پشتمانەوە ڕێنماییدەکردین و فەرمانی پێدەداین . محەمەد پاشا یەکەمین گوللەی گەلێک خراپ تەقاند،

ئەحمەد کوفیانیش نیشانەکەی نەپێکا، بەڵام نیاز گچکەڵ یەکەمین کەسی ناومان بوو نیشانەیەکی زیندوو بە جۆرێکی کوشندە بپێکێت. ئێستا دەبوو بۆ من و ئەحمەد سورەت نیشانەیەکی تر بهێنن. ئەحمەد سورەت تەقەیکرد و نەیپێکا، نیشانەکەمان کەسێک بوو لە ناو چەندین بوکڵەی تەختەدا دەجولا، پێکانی سەخت بوو، یەکێک بوو نەیدەویست بە ئاسانی بمرێت، دەیزانی گوللەکان لە کوێوە دێن. من کە چاوم نا بە دووربینەکەوە، یەکەمجار تەنیا کۆمەڵێک بوکڵەی دارینم بینی کە وەک دەیان بەربەست لە بەردەم ڕوانیندا ڕیگربوون. هەموو شوێنەکە وا چنرابوو تا بکرێت قەناسێکی باشی تێدا تاقیبکرێتەوە، ئاشکرابوو هەر مامۆستاکانی خۆمان نەخشەی ئەو جێگایەیان چنیوە و ئیدارەی زیندانیان فێرکردوە دیلەکان وەها ڕێنماییبکەن، بە سوودی تاقیکردنەوە و مەشقی ئێمە بجولێنەوە. من لە ناو بوکڵەکاندا نیشانەکەم دۆزییەوە، بە ڕوونی دەموچاویم لە ناو دووربینەکەدا بینی، زۆر دەجولا، بەڵام دەمتوانی بیبینم. گەنجێکی ئەسمەر بوو، سەریان تاس بۆ تاشی بوو، لەگەڵ لاوازییەکەشیدا دەیویست دوا شەڕی ژیانی خۆی بە باشی بکات، فانیلەیەکی سپی و پانتۆڵێکی ڕەشی لە بەردابوو، تەنیا فریاکەوتم و وێنەکەیم لە یادەوریدا گرت و بۆ ئەبەد خستمە خەیاڵمەوە، دەمزانی دواتر و تا مردن دەیهێنمەوە پێش چاوی خۆم، دەمزانی وەک هاوڕێیەک یادگاری هەڵدەگرم و دەیپارێزم. کاتم زۆر نەبوو، ئەو بە جۆرێکی خێرا و شێتانە هاتوچۆیدەکرد، نەیدەویست ئۆقرەبگرێت و ئاسان بخرێتە جوغزی پێکانەوە، نەیدەویست نێوچاوانی خۆی دەربخات و بڵێت ئەوە منم و تۆ وەرە و وەک دۆستێک بمکوژە، تا بیتوانیایە سەری خۆی لە نێوان بوکڵە دارینەکاندا وندەکرد، دەیزانی بەس بوەستێت دەیپێکم، لەبەر ئەوە بەجۆرێکی زیرەکانە لە ناو بوکڵەکاندا ڕایدەکرد. لە مەشقەکانی پێشوودا سەلماندبووم کە پێکانی نیشانەی جولاو بۆ من لە نیشانەی وەستاو سەختتر نییە، دەستێکی خێرا و ساتێکی دروستی بڕیارم هەبوو. لەو ساتەدا قسەکانی مامۆستا بە جۆرێکی

گەمژانە لەسەرمدا دەزرینگانەوە «من ناکوژم، من نیشانەیەک دەپێکم». ئەو بڕوایە وایدەکرد هەموو هۆشم لەسەر لێدانی نیشانەکە کۆبکەمەوە. ئەو دەجولا و بە هەموو لایەکدا هەڵدەهات، دەیزانی مەرگ لە پێچی داهاتوودایە و دەیویست دونیا لەو ڕاکردن و هەڵهاتنە بێسوودەدا بوەستێنێت. من چیتر منداڵە ترسنۆکەکەی دوو مانگ لە مەوپێش نەبووم کە لە فولکەیەکی دیلاواری ڕەشدا خەریکبوو خوێن بمگرێت و ببورێمەوە، لە ژێر لێومەوە گووتم «بوەستێت یان نەوەستێت دەتپێکم». خۆم وەک ئەو لە ژێر باری فشارێکی توندا دەبینی، منیش تەنیا یەک گوللەم هەبوو، تەنیا چارەم ئەوەبوو لە یەک ساتدا و بە مەودایەکی زۆر کورت گوللەکەم بتەقێنمە پێشی، بۆ ئەوەی لەگەڵ هەنگاوی داهاتووی ئەودا فیشەکەکەم دروست بدات لە شوێنی مەبەستی خۆی. لەگەڵ دەرچوونی گوللەکەدا هەناسەیەکی کورتی دەویست تا دڵنیابم نێچیرەکەمم پێکاوە، بینیم کەوت و چەند بوکڵەیەکی لە نزیک خۆیەوە خست. مامۆستاکەمان کە لە دووربینی خۆیەوە بە وردی تەماشایدەکرد، گووتی «لە سەریت دا ... ڕێک لە سەری ... قەناس یان نەبێت، کە بوو دەبێت وابێت ». من تفەنگەکەمم داگرت و خەندەیەکی ڕوونی سەرکەوتن لەسەر نیگام بوو، ئەوەی لەو ساتەدا بیرم لێ نەکردەوە ئەوە بوو کە من مرۆڤێکم کوشتوە، کەسێکم کوشتوە کە ڕەنگە بێگوناه بێت. ئەوەی دواتر ئازاریدەدام ئەوە نەبوو کە یەکێکم کوشتبوو، بەڵکو هیچ کات هەستم نەکرد کە کەسێکم کوشتبێت، تاکە هەستێک داگیریکردبووم ئەوەبوو نیشانەیەکم پێکاوە.

هەمووی بۆ ئێمە وەک یاری و پێشبڕکێ بوو، گەرچی پێشتر کەسمان پیاوکوژ نەبووین، بەڵام لە ماوەیەکی کەمدا وەک بکوژی سارد و بێباک نیشانەمان دەگرت، من هەموو کوژراوەکانم لە خەیاڵی خۆمدا وێنەدەگرت، هەموویانم خۆشدەویست. خۆشەویستییەک لە جۆرێکی تایبەتی، خۆشەویستی کوڕێک نا بۆ کچێک، خۆشەویستی دایکێک نا بۆ کوڕەکەی یان هەر شتێکی

پرووپووچی تر لەو جۆرە، بەڵکو خۆشەویستی یاریزانێک بۆ مەدالیاکانی. خۆشمدەویستن لە بەرئەوەی شتێکیان دابوو بە من. خۆشەویستیم بۆیان، خۆشەویستی دەرۆزەکەرێک بوو بۆ کەسێک لە ڕێگادا خێرێکی گەورەی پێدەکات و ئیتر نایبینێتەوە، هەستم نەدەکرد کە من سزام داون، بەڵکو دڵنیابووم ئەوان ڕۆحی خۆیان بەخشیوە بە من، ڕۆحی ڕەنگاوڕەنگیان، وەک باڵندەکان، وەک ئەو تەیرە قەشەنگ و دەگمەنانەی ژیانی خۆیان و پەڕی جوانی خۆیان و گۆشتی ناسکی خۆیان بەخشی بە من. من کاڵ موراد کە بە درێژایی ژیانم لە غەفاریی خاوەنی هیچ نەبووم، زۆر ڕۆژ بە برسێتی چوو بووم بۆ قوتابخانە، ساڵ دەهات و دەچوو من پارەی بنێشتێک لە گیرفانمدا نەبوو، دزی کتێب بووم، شەرمنی یەکەم کە هەموو گاڵتە بە زیپکەکانی سەر لووتی دەکەن، ئێستا بە یارمەتی ئەم تفەنگە، هەموو شتەکان ژیانی خۆیان بە من دەبەخشی. من کە هیچم نەبوو ئێستا لە سەرمدا ئەلبومی کەسانێکم هەڵگرتووە، کە چاکەیەکی گەورەیان دەرهەق کردبووم، ژیانی خۆیان پێ بەخشیبووم.

چوار ڕۆژ بەو جۆرە مەشقمانکرد، زۆر زیندانیمان پێکا کە دەبوو بەو جۆرە حوکمەکانیان جێبەجێبکرێت، بە قسەی مامۆستا هەر زامدارێک گوللەی ئێمە نەیکوشتبێت، پاسەوانەکان لە خوارەوە بە فیشەکی ڕەحمەت کۆتاییان پێ هێناوە... باشترین پێکان کە خاڵی زۆر لەسەر بوو پێکانی سەر بوو. من لە پێشی هەمووانەوە بووم، کەمترین گوللەم بە خەسار دابوو، زۆرترین سەرم پێکابوو، سەختترین نیشانەکانم شکاندبوو.

ئێستا نامەوێت وردەکاری ئەو ڕۆژانە بگێڕمەوە. دەستڕاستی و نیشانە پێکان شتێکە تەنیا دڵی ئەو کەسە خۆشدەکات کە تفەنگەکەی لە دەستدایە. یارییەکی دووبارەیە، بەڵام هەمیشە ئەوەی کە نیشانەیەکت پێکاوە، بۆ دەستڕاستان مایەی بەختەوەرییە، هەزار جار یەک نیشانەت بۆ دانێن،

هەر هەزارجارەکە تۆ بیپێکێت، لەزەتی هەزارەمین جار لە لەزەتی یەکەمین جار کەمتر نییە. من لەو مەشقە سەختانەدا تووشی ئەو دەردە بووم، کە هەمیشە بپێکم، هیچ کات هەڵە نەکەم، هیچ کات فیشەکم بە زایە نەچێت.

لە ئێوارەی ڕۆژی چوارەمدا هەموو شت ڕۆشن بوو، من باشترین نیشانەشکێن و قەناسی دیلاواربووم. بێ ئەوەی بزانم ئەوە بەرەو چ کارەساتێکم دەبات، خۆشحاڵ و مەست کەیفمدەکرد و بە خۆم و زیپکەکانی سەر لووتمەوە فەخرم دەفرشت، هێندە شانازیم نواند، ڕۆژی دواتر هاوڕێکانم دڵشکاو ڕۆیشتن و ماڵاواییان لێ نەکردم. بەڵێ، بەیانی ڕۆژی دواتر هەر چوار هاوڕێکەم پێکەوە سوار ماشینێک بوون و بێ خوداحافیزیی ڕۆیشتن. ئایا گەڕانەو بۆ شار؟ چوونەوە بۆ ناو فەسیلەکانیان؟ بوون بە بناغەی هێزێکی تایبەت؟ نازانم... ئیتر هیچ شتێکم دەربارەیان نەبیست. لەو ماوەیەدا کێشەکەنی خۆم هێندە گەورە بوون، کات و دەرفەتی ئەوەی نەدا لە چارەنوسیان بپرسمەوە.

من ئێوارەی هەمان ڕۆژ جیبێکی ئەمریکی سەوز هات بە دوامدا و سواریکردم و بردمی بۆ جێگایەکی دیکە، بۆ ناو ماڵێکی تایبەتی زۆر گەورە، کۆشکێکی ڕاستەقینە لە قەراغی دیلاوار. دوو پاسەوانم لەگەڵدا بوو کە بەرەو بەشێکی تایبەتی کۆشکەکە ڕێنماییانکردم، سویتێکی کەمێک جیا و سەربەخۆ، بەڵام پاک و ڕازاوە. بە حورمەتێکی زۆرەوە وەک کارمەندی ئوتێلەکان هەموو شتێکیان بۆ ڕوونکردمەوە، حەمامەکەیان پیشاندام، سارد و گەرمەکەیان تاقیکردەوە، کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکەیان دایە دەستم، لە بەفرگرەکەدا چەندین جۆری خواردنەوەی تێدابوو، چەندین جۆر خواردنی قوتو، چەرەس، میوەی جۆراوجۆر... گووتیان کە نیوەڕوان و ئێوارانیش خواردنی تایبەتیم بۆ دێت. دەبوو لەوێ چاوەڕوان بم تا فەرمانێکی نوێم بۆ دەردەچێت.

پاسەوانەکانم ڕۆیشتن و لەودیوەوە دەرگایان لەسەر داخستم، دیلێکی بەشکۆ بووم، پێشوازییەکی سەیر بوو کە لە ساتی یەکەمەوە تووشی گومانیکردم. من ئاڵ موراد، جیقنەی ناو قارەمانەکانی دیلاوار، کوڕە زیبکاوییەکەی غەفاریی، با دەستیشم ڕاست بێت، با باشترین نیشانەشکێنی دونیاش بم، بۆ دەبێت قەدری وام لێبنێن، کەی شێوە و ڕوخسارم ئەم جێگا شاهانەیە دەهێنێت... دایکم لە منداڵییەوە پێیگووتبووم «قەدری زۆر، نیشانەی داوی گەورەیە»، دەیگووت لە هەر جێگایەک دۆشەکی ئاوریشمیان بۆ ڕاخستی، سەیری ژێری بکە، لە بنیدا چاڵێکی گەورە هەیە ... خۆ من بلیمەت نەبووم، بەڵام هەر ئەم جێگایەم بینی، گومانێکی تاریکم تێدا سەوزبوو ... بۆ جیایان کردمەوە، بۆ دەرگایان لەسەر داخستم؟ چەند سەرم دەهێنا و دەبرد بە هیچ نەدەگەیشتم.

هەر یەکەمین شەو، لەسەر تەختی خەوتنەکە وەک پادشاکان پاڵکەوتبووم و سەیری تەلەفزیۆنم دەکرد، کە لە ناکاو لە دەرگا درا، پاش ئیستێکی کورت دەرگاکە کرایەوە و پیاوێکی کەتە و باڵا بەرز هاتە ژوورێ، کەسێک بینینی تورەیکردم، پیاوێک لەو مەخلوقە دووبارانەی لەم ماوەیەدا بووبوونە مامۆستام، بە خۆیان و چاویلکە ڕەش و تەپلە سەربازییە چەسپەکانیانەوە، بێ نیشانە، بێ ڕوتبە، بێ هیچ بەڵگەیەک بۆم بسەلمێنێت کێن و چین. پیاوەکە خۆی وەک بەرپرسی ڕاستەوخۆی من ناساند، گووتی « لە سەرەتاوە من بەرپرسی ڕاستەوخۆی تۆ بووم، تۆ جێگای متمانەی هەموو سەرۆک و پیاوە گەورەکانی دیلاواریت». من پرسیم «مەبەستتان سەی ئەسلان و جەنابی جێگرەکەیان ڕەزمئارای قەرەقازانییە؟». گووتی «دەبێت باوەڕت بە من بێت، من ناتوانم هیچ ناوێکت پێ بڵێم، من دەڵێم هەموو سیاسەتمەدارە دڵسۆزەکان، هەموو ڕۆڵە بە شەرەفەکانی دیلاوار، هەموو ئەوانەی دەیانەوێت دیلاوار لە شەڕی داهاتوودا نەبەزێت، سەرشۆڕ نەبێت. هەموو ئەوانەی دەزانن دیلاوار پێویستی بە هێزێکی ڕاستەقینە و نوێیە...

تۆ جێگای متمانەی هەموویانیت». من سەری لووتم خوراند و گووتم «مەمنونی هەموو بە شەرەفەکانی دیلاوارم، بەلام جەنابی بەرپرسی من ئێوە بە تەمان چی لە من بکەن وا بە جیا داتان ناوم و لەم جێگایە توندتانکردوم؟». گووتی «تۆ دەست راستی یەکەمی، لە دیلاوار لە تۆ باشترمان نییە، من پێنج راپۆرتی تایبەت و نهێنیم لەسەر تۆ خوێندۆتەوە، مامۆستا و مەشقدەران وەک موعجیزە باستدەکەن، وەک دیاری خودا بۆ خەڵکی دیلاوار. ئیتر رۆژی ئەوەیە بەم توانا و بەهرەیەت کارێک بۆ دیلاوار بکەیت، کارێکی گەورە کە مێژوو بیری نەچێتەوە». من بیسەبر گووتم «دەی گەورەم، مێژوو هەرقل و ناپلیۆنی بیرچۆتەوە، ئێستا منی بەدبەخت چی بکەم تا لە بیر نەچمەوە. کاری چی، پێم بڵێ بزانم دەتوانم». خەندەیەکی گرت و سەری دانەواند، زۆر حەزمدەکرد یەکێک لەم چاویلکە لە چاوانە جارێک چاویلکەکەی دابگرێت و بە روونی سەیریبکەم، بەلام هەموو دنیات پێ بدانایە، وازیان لەو چاویلکەیە نەدەهێنا. کابرا کلاوەکەی لەسەری توندتر کرد و گووتی «لەم رۆژانەدا کارێکی گەورەمان هەیە... کارێکی گەورە. هەر کاتێک لە هەموو شت دڵنیابووین خۆم دێم بە دواتدا. بیرت بێت، تۆ فەرمان بەس لە من وەردەگریت، هەر نیشانەیەکم نیشاندایت تۆ تەقە لەوە دەکەیت ... ئەی چۆن، بەوە دەچیتە مێژووەوە». من هیچم نەگووت... دوودڵ بووم... دەبوو تەقە لە کێ بکەم؟ . زانی گومانم خراپ کردوە و کەوتوومەتە سەر گێنگڵ و دوودڵی. گووتی «دەبێت دەستت نەلەرزێت، نەترسیت، تا ئێستا چۆن هەموو نیشانەیەکت پێکاوە ئەمەش بپێکیت، دڵنیابە ئاسانتر دەبێت لەو نیشانە سەختانەی لە مەشقدا پێکاوتن، بەلام لە رووی رۆحی و دەروونییەوە خۆت ئامادەبکە. ئەو فیشەکەی ئەمجارە دەیتەقێنیت هەموو مێژووی دیلاوار دەگۆڕێت».

ئاە... چ مەراقێکی گەورە بوو ... دەبوو تەقە لە چ کەللە زلێک بکەم... خودایە؟.

# ٣٩

سەرم بە شاشێکی سپی بەستووە و لەسەر بەردێکی گەورە بەرامبەر چادرەکان دانیشتووم، سەعاتێک دەبێت ئیشکەرەکان دەستیان هەڵگرتووە، ئەوانەی نوێژدەکەن پێکەوە چوونە سەر بەرماڵەکانیان، ئەوانەی خۆیان دەشۆن، لە پشت پەردەکانەوە مەنجەڵێکی گەورەیان خستۆتە سەر ئاگر و ئاو گەرمدەکەن، دووان لەسەر بەردێکی گەورە دانیشتوون و دامە دەکەن. دیمەنی زنجیرەیەک هۆڵی درێژ کە دەبێت بە جێگای سەربازگە و جبەخانەیەکی گەورە، وەک هەندێ دێوی دزێو و خۆڵەمێشی بەرامبەرم نوستون. هەوا تا دێت سارد دەبێت، هەندێ سەعات هەور تەواوی ئاسمان دەگرێت. دەبینم لە سەر ڕێگای سەرەکی ماشێنە قورس و گەورەکان بەردەوام لە هات و چۆدان. میرئەودال دەبینم لە بەردەم چادرەکەدا چەند فانیلە و دەرپێیەکی شۆراوی خۆی هەڵدەخات، سەیریدەکەم و پێدەکەنم، سێ شەو لەوەوبەر لە خەونەکانمدا بەلەمە مۆرەکان و کەشتییە شینەکان و ڕیواقە ئەرخەوانی و چەقۆ وەنەوشەییەکانی ئەوم بینی، هیچ خەونێک وەک خەونەکانی ئەم پیاوە زلە ڕەنگاوڕەنگ نییە، خەونەکانی یەک پارچە ڕەنگن. لە خەوندا هەر بکەوتبامایەتە جیهانێکی ڕەنگاو ڕەنگەوە، دەمزانی ئەوە یەکێکە لە خەونەکانی میرئەودال. ئێستا دەبینم جلەکانی ژێرەوەشی بەجۆرێکی سەیر، بەلام جوان ڕەنگدارن، میر هەر منداڵێکە و گەورە بووە،

خۆشحاڵم دەبینم ئارام و دڵخۆشە، هەندێ جار کە دەبینم بانگمدەکات «هێی برازاکەی دکتۆر، مامە سیات هیچ نازانێت، هیچ ... هەر هیچ. لە ئینسان تێناگات»، وادەڵێت و بە دەنگی بەرز پێدەکەنێت. من ئێستا تەماشایدەکەم و خاڵخاڵۆکە ڕەنگینەکانی ناو خەونەکانیم بیردەکەوێتەوە و پێدەکەنم. لە نیوەڕۆوە زەهاو چووە بۆ سەر چیاو نەهاتۆتەوە، ئەوێی زۆر پێخۆشە، زۆر دەجوڵێت، دەچێتە بان لوتکەی چیا و بەرامبەر جەنگاوەرەکانی مەمەد حەسار دەوەستێت و سەیریاندەکات، دەزانم بینینی ئەو سروشتە گەورە و بەرینە ئارەزووی گەشتێکی دووری تێدا دروستدەکات، لە خەونەکانیدا زۆر دەگەڕێت، هەمیشە دەڕوات، بەڵام هەمیشەش سەیری هەور دەکات، هیچ کەسم نەدیوە وەک ئەو کوڕە عاشقی هەور بێت، هەم لە خەوندا و هەم بە وریایی. من بە درێژایی ڕۆژ هەستم بەسەر ئێشە و لاوازی دەکرد، ئارەزوویەکم نەبوو نان بخۆم و شتێک بخەمە بەر دڵم. بیری دێلاوار دەکەم، هەستدەکەم پێویستم بە سەفەرێک و پشوویەک و گەڕانەوەیەک هەیە، بەڵام نامەوێت لە کرێکارەکان دووربکەومەوە ... ئاه دێلاوار، دەبێت ئێستا چۆن بێت؟ ئەوەتەی هاتووم هیچم دەربارەی نەبیستووە، نازانم شتەکان چۆن دەچنە پێشێ، ئەم جێگایە نە ڕۆژنامەی بۆ دێت و نە تەلەفزیۆن وەردەگیرێت. زۆرجار هەستدەکەم نەقیب شتمان لێ دەشارێتەوە، هەندێ جار دەپرسم «جەنابی نەقیب، دەنگوباسی دێلاوار چییە؟ خەبەر چییە؟ دونیا چی بەسەر هاتووە؟». بە دوودڵییەوە سەیرمدەکات و بە چاوە شینە پڕ غرورەکانییەوە دەڵێت «چی بێت، دێلاوار چی بێت... ئێمە هەموو سەربازی ئەوین، سەربازی قەرەقازانییەکانین، گیانفیدای نیشتمانین... ئیتر چی بێت». دوێنێ کە لە بیمارستان گەڕامەوە زۆر لە ئێشکەرەکان لە پشووی خۆیاندا هاتن بۆ لام، من زۆر گریام، وا هەستدەکەم هیچ ڕۆژێک لە ژیانمدا هێندە نەگریابم... ئێستا بۆتە شتێکی ئاسایی هەموو من ببینن دەگریم، هیچ کەس ناپرسێت بۆ دەگریت ... ئەوە

پرسیارێکی پوچە کەسێک لە مستەر گرینۆک بپرسێت بۆ دەگریت. هەموو دەزانن هەمیشە بەهانەیەکی پوچم بۆ گریان هەیە... خواستێکی نەخۆشانە بۆ لێبوردن و خۆپاککردنەوە.

من وانەبووم، ناتوانم بڵێم هەموو ژیانم گرینۆک بووم. ئارەزووی من بۆ گریان تەنیا پابەندی ئەوە نەبوو داوای لێبوردن لە مرۆڤە بەدبەختەکان بکەم، بەڵکو بێدەسەڵاتی ڕەهای من بوو لە گۆڕینی هیچ شتێکدا لە دونیا. ئەو ئێوارەیە کە لەسەر ئەو بەردە گەورەیە دانیشتم، دەمزانی گریانی من هەمیشە سەرچاوەی لە ترسەوە بووە ... ترس لە شتێکی گەورە. کاتێک لە بیمارستان دەگریام هۆکەی ترسم بوو لە شێتی، لەو خواستەی کە هەموومانی دەهاڕی. ڕاستە من لە بەردەم بیمارەکاندا دەگریام، ئەوانەی لە بەشی پەروەردە و تەمێکردن دەمهێنانەوە، بەڵام ئەوەی منی والێدەکرد تا ئاستی مردن هاواربکەم و بگریم، گەورەیی ئەو ئامێرە ترسناکەی شێتی بوو کە هەموومانی بەرەو ناو خۆی کێشدەکرد. شێتی ... شێتی ... شێتی لە هەموو شوێنێکدا بوو، لە هەموو کەسێکدا بوو، لە هەموو شتێکدا بوو ... ئەو شێتییە کە بە هەموو جێگایەکدا دەکشا وەها بەهێزبوو جگە لە گریان هیچ شتێکی ترم نەبوو جەنگی بەرامبەر بکەم. گریان لای من هەزارجار لە نوسینی درۆ، لە سیاسەتی درۆ، لە چاکسازیی چاکسازە درۆزنەکان، لە شۆڕشی شۆڕشگێڕە درۆزنەکان ڕاستگۆتر بوو ... من، مستەر گرینۆک، بە فرمێسکەکانم تەنیا چیرۆکی ئازارەکانی خۆم نەدەگێڕایەوە، بەڵکو تاکە ڕێگای ڕاستگۆیانەشم دەگرتە بەر، کە لەگەڵ خۆمدا، لەگەڵ ڕۆحمدا دەگونجا، بۆ دوورکەوتنەوە لە هەر درۆ و ڕیایەک کە بە ئومێدی درۆ ئازارەکانیان سووکدەکردین.

هەموومان کەسانی لاوازبووین، بەڵام من لە هەر کەسێکی دی زیاتر هەستم بەو لاوازییە دەکرد، ئەوە دەیگریاندم کە دەمبینی هێزێکی تاریک

هەیە کە هیچ کەس ناتوانێت ڕێگای لێبگرێت. دەمبینی ئەو شێتییە دەمکات بە بەشێک لە خۆی، دەمبات، دەمخاتە ناو هەزار پێچی خۆیەوە. لەو کاتەوەی هاتم بۆ ناو چیاکان بچوکی و ناچیزی ئێمە بەرامبەر ئەم هێزە گەورانە دەیانترساندم، بچوکیم بەرامبەر چیاکان، بەرامبەر تاوێرە ڕەقەکان، بەرامبەر ئەو تاریکییە بێسنوور و قورسەی شەو لەم دۆڵانەدا دەنیشێت، بەرامبەر ڕەقی خاک کە دەبێت هەزاران مرۆڤ، هەزاران سەعات لە تەمەنی خۆیان ببەخشن تا خەندەکی تێدا دروستبکەن، بەرامبەر ڕەنجی بێهودەی ئەم هەموو پیاوە کە لە چاوەڕوانی شەڕێکی نادیاردا دەبێت بەردەوام پاچ بهاون، گڵ دەردەن، بەردبشکێنن، بلۆک بگوازنەوە، چیمەنتۆ بگرنەوە، عارەق برێژن، بێئەوەی دیار بێت ئاخۆ ماندووبوونیان هیچ مانایەکی هەیە. هەموو شتەکان بچوکی خۆمیان بیردەخستمەوە... گریانم گریانی بێدەسەڵاتیم بوو بەرامبەر ئەم هەموو هێزە تاریکەی لە ناوەوە و دەرەوە گەمارۆیاندابووم .

ئەو ئێوارەیە لەسەر بەردەکان دانیشتبووم کە نەواس، کوڕە بەردەستەکەی نەقیب نەجات هات بە دوامدا و گووتی «جەنابی نەقیب، دەفەرموێت، شەو گەر کاتتان هەبوو، گەر بەسەر پێشەوە بووە، سەرێکی لێبدەن». پێم گووت «باشە، بە جەنابی نەقیب بڵێ، شەو دەبمە میوانیان». شەو دوای ئەوەی شتێکم خوارد، چووم بۆ ژێر چادرەکەی نەقیب. ئەوەتەی پێکەوە لە ناو ئەم چیایانەدا کاردەکەین شەو سەردانی نەقیبم نەکردوە. نەقیب شەوان کەم تێکەڵی ئێمە دەبێت، هەندێ شەو بە جێبەکەی دەڕوات و دەچێت بۆ جێگایەک ئەفسەرەکان لێی کۆدەبنەوە. هەندێ جار بۆ کاروباری سەربازی و هەندێ جار بۆ خواردنەوە و کەیفکردن لەوێ ئەڵقە دەبەستن. جگە لە نەقیب، هەموو ئەفسەر و پلەدارە بەرزەکانی ناو چیا، لەوێ یەکدیان دەبینی. کۆبوونەوەکان لە جێگایەک بوون کە یانەی ئەفسەرانیان پێ دەگووت. گەر شەوێک نەقیب نەچووبایە بۆ ئەوێ لە

چادرەکەی خۆیدا دەمایەوە و گوێی لە ڕادیۆ دەگرت، حەزی زۆر بە گۆرانی و ئاوازی کۆن، دەنگخۆشانی سەردەمی گرامافۆن دەکرد. ئەو شەوە نەقیب بە دەستێک تراکسوتی ڕەشەوە لەسەر تەختێکی گەورە پاڵکەوتبوو، بالیفێکی سووری گەورە لە ژێر سەریدا بوو، لێفەیەکی بریقەداری پەمەیی خاوێنی دابوو بە خۆیدا. ناو چادرەکەی نەقیب هیچی لە ناو چادرەکانی ئێمە نەدەچوو، بۆنێکی خۆشی لێدەهات، ڕێکوپێکییەکی سەیری تێدابوو، کە لەبری ئەوەی دیسپلینی سەربازیم بیربخاتەوە، سەلیقەی دیکۆرسازێکی پسپۆڕی بەیادا دەهێنامەوە. چادرەکە لە ناوەوە گەورەتربوو لەوەی لە دەرەوە دەینواند. ڕەنگی کەلوپەلەکان و چۆنێتی دانانی ئەساسەکەش وەها بوون، وەک نەقیب نەیەوێت هەستی ژیانی ناو ماڵ ونبکات. چادرەکەی تەواو وەک ژوورێک لە ماڵی شارێکی ئارامدا ڕێکخرابوو، چەندەها گوڵدانی جوان، پارچە فەرشی ڕەنگین لە چادرەکەدا بوو. دوو قەنەفەی گەورە و مێزێکی شوشەش هەبوون کە من و نەقیب یوکسەل بەرامبەر یەک لەسەری دانیشتین.

نەقیب کە منی بینی لە جێگاکەی هەستا و هەواڵی تەندروستیمی پرسی و فەرمووی لێکردم تا دابنیشم. پێشتر لەسەر ئیسماعیل کەمێک توند لەگەڵ یەکدا قسەمانکردبوو، بەڵام ئاسایی بوو، لەو ماوەیەدا فێربووبووین هەندێ شتی ڕەق بە یەکتری بڵێین بێئەوەی لە یەک زویر بین. من گووتم «ببورە جەنابی نەقیب، بەڵام لە چادرەکەی ئێوەدا مرۆڤ هەست ناکات لەم شاخ و کێو و ڕەقەنەدا گیریخواردوە. هەستێکم هەیە وەک ئەوەی لە ماڵێکی خۆش بم لە شار». نەقیب بەرامبەرم دانیشت و گووتی «بە ئەگەری زیاد لەم جەنگەدا کە دێت تیا دەچین... نامەوێت دوا مانگ و هەفتەکانی ژیانم زۆر ناڕەحەت بم». وەڵامەکەی غەمگین بوو بۆ من. بێئەوەی هیچ بزانم یان بەڵگەم هەبێت، گووتم «نا جەنابی نەقیب، باوەڕ ناکەم جەنگ ڕوبدات»... قسەکەم تەنیا بۆ ئەوە بوو شتێک بڵێم. نەقیب قاچی خستە سەر قاچی و

بەو چاوانەیەوە کە لە گورگ دەچوون، سەیرێکی قووڵی کردم و گووتی «جەنگ دەبێت ڕوبدات، ڕودانی جەنگ شتێک نییە لە ئەگەر و نەگەردا بێت. مانەوەی دیلاوار بە جەنگەوە بەستراوە، گەر لەگەڵ مەمەدحەسار یان جێگایەکی تردا نەچینە جەنگەوە، دیلاوار لە ناوەوە وێراندەبێت. ئەم ڕۆحەی تۆ دەیبینیت، ئەم هێزانەی تۆ دەیانبینیت کە وا ئازا ئیشدەکەن، بەرهەمی جەنگن. جەنگ نەبێت ئەم میللەتانەی ئێمە دەڕزێن، بۆگەندەکەن. ساڵەهایە دیلاوار لە ناوەوە بۆگەنیکردوە، مەگەر ئەم جەنگە ڕزگاربیکات». من بە هێمنی و بە خەندەیەکەوە پرسیم «لەو باوەڕەدایت بۆنی جەنگ لە بۆنی ئێستای دیلاوار خۆشتر بێت؟». جەنابی نەقیب کە پێدەچوو هەموو دوای نیوەڕۆ خەوتبێت، گووتی «بۆنی جەنگ و بۆنی ڕۆحی ڕزیو دوو بۆنی جیاوازن. وەک جیاوازی گۆشتێک تازە لە قەسابخانە هاتبێتە دەری لەگەڵ گۆشتێک بۆگەنیکردبێت. لە جەنگدا بۆنی خوێن و گۆشتی تازە لەتکراو دەچێت بەسەرماندا، من ئەوەم لە ڕزینی ڕۆح و لە بۆگەنکردنی ئیمانی ئینسان پێباشترە ». من هیچم نەگووت، نەمدەزانی بڵێم چی و نەشمدەویست بچمە گفتوگۆیەکی ڕەق و توندەوە لەگەڵ نەقیبدا. خۆی پاش ئێستێک گووتی «بۆ ئەوە ناردم بە دواتدا تا لەسەر چیرۆکی ئەم خەونانە قسەبکەین. ئەوەی من بیستوومە شتێکی سەیرە، شتێکی زۆر سەیرە. حەزدەکەم بپرسم بە ڕاستی وایە، شتی وادەبێت؟». ویستم وەڵام نەدەمەوە، بڵێم جەنابی نەقیب فەرامۆشیبکە، ئەوەی بووە و ڕوویداوە تەنیا یارییەک و سەرگەرمییەک بووە و هیچی تر، بەڵام کتوپڕ ئارەزوویەکی نهێنیم تێدا خولقا، شانازییەک بە خۆمەوە بکەم و فەخرێک بفرۆشم، گووتم «بەڵێ جەنابی نەقیب، من هەستدەکەم لەو ڕووەوە کەمێک نەخۆشم، حاڵەتەکەم شتێکی نائاساییە. بینینی خەونی ئەوانی تر نەخۆشییە. دەردێکی ئازاربەخشە». نەقیب، نەواسی بانگکرد و پێیگووت «دوو پەرداخ ئاوی پرتەقاڵمان بۆ بگرە، لە پرتەقاڵە تازەکان». کەمێک خۆی ڕاستکردەوە و

بە چاوە شینەکانی سەیریکردم و گووتی « من دێلاوارییەکی ڕەسەنم، پشتاوپشتم لە دێلاواردا ژیاون، من گەر خەونیش ببینم نایەتەوە یادم. یەکێک لە پرسیارە سەیرەکانی ژیانم ئەوە بووە، لە خەونەکانمدا ئاخۆ چی بگوزەرێت». چاوەکانی هەمیشە شتێکی ترسناکیان تێدابوو، هیچ چاوێک لای من وەک چاوی شین جێگای گومان نییە، بە پێچەوانەی خەڵکی ئاسایی دێلاوارەوە کە زۆریان عاشقی چاوی شینن، چاوی شین بۆ من هەمیشە شتێکی ترسناکی تێدابووە کە نائومێدیی و دوودڵیم تێدا دروستدەکات. ئەو ڕوانین و غرورە قووڵەی لەو جۆرە چاوانەدا هەیە تورەمدەکەن. دەڵێم «جەنابی عەقید. باشتر کە خەونەکان نایەتەوە یادت، لەوەش باشتر ئەوەیە مرۆڤ هەر خەون نەبینێت. من لەو بڕوایە دام وەسوەسەیەک هەیە لە خەوندا دروستدەبێت، دواتر مرۆڤ بێئەوەی بە خۆی بزانێت سەیردەکات هەموو ژیان و هوشیاریی بۆتە دیلی ئەو وسوەسەیە». عەقید گووتی «نا، نا ئەوە ڕاست نییە. ئینسانێک لەخەونەکانی پچڕابێت، لە نیوەی ژیانی پچڕاوە. خەو سەرزەمینی ئیلهامە، من خوێندومەتەوە، زۆر لە سەرکردە سەربازییەکان لە خەودا ئیلهامی نەخشە گرنگەکانیان بۆ هاتووە. بەشێکی ئێمە لە خەونەکانماندایە، ئێمە ئەو بەشەمان ونکردوە. ڕەنگە ئاسوودەبین، بەلام نوقسانین، نیوە ژیان دەژین». سەیرم لێهات کە نەقیب نرخێکی وەها زۆر دەخاتە سەر خەون. گووتم «کێشە ئەوەیە، مرۆڤ چەند هەوڵبدات خەون و حەقیقەت تێکەڵ نەبن، ڕەنجی بە هەدەر دەڕوات. من لەم چەند مانگەی دواییدا سەرم لە دێلاوار سوڕماوە، سەرم لەوە سوڕماوە چۆن خەڵکی بەوجۆرە ڕاستی و خەونەکان تێکەڵدەکەن. خەون بە بڕوای من یارییە، گەمەیەکی هۆشە. هەستدەکەم جەنگ لە بنەڕەتدا تێکەڵبوونی ئەو دووانەیە، تێکەڵبوونی خەونە لەگەڵ حەقیقەتدا». نەقیب پێکەنی و گووتی «بە جۆرێک لە جۆرەکان هەق بە تۆیە. بەڵێ هەق بە تۆیە. جەنگ بە بێ خەون ناکرێت. لە مێژ جەنگ بەشێکە لە خەیالاتی ڕۆژانەم. جەنگ

لە پێشدا لە خەیاڵی ئەفسەرەکاندایە، دواتر دەبێت بە ڕاست. ڕەنگە زۆر لەوانەی دەچنە کۆلیژی سەربازیی بەو ئومێدە بچن کە هیچ کات و هیچ ڕۆژێک جەنگ ڕوونەدات، ڕوتبەکانیان بخەنە سەر شانیان و لە نێوان سەربازگە و ماڵەوەدا هاتوچۆبکەن، زۆربەی ئەفسەرەکان بەو خەیاڵە دەچنە کۆلیژی سەربازیی کە جەنگ ئەستەمە، بەڵام من پێم گووتی، من وانیم... من عاشقی جەنگم. خەیاڵم پڕە لە باروت و بۆنی جەنگ، دەمەوێت بزانم لە خەونەکانمدا چی ڕوودەدات، دەمەوێت تۆ خەونەکانم ببینیت».

ئەوە سەیرترین داوابوو لێم بکرێت، یەکێک تکا بکات خەونەکانی بۆ ببینم.

من ئیرادەیەکم بەسەر خەونەکانمدا نەبوو، بەڵام سەرنجم دابوو کە من خەونی ئەو کەسانە زیاتر دەبینم کە لێمەوە نزیکن، کەسانێک کە لە جێگایەک دەخەون کە دوور نین لە منەوە. تا نزیکتر بن، ڕوونتر و زیاتر خەونیان دەبینم، کەسانێکیش زۆر بیرم لێ کردبانایەتەوە، خۆم بمویستایە خەونیان ببینم، خەیاڵ و هۆشم بخستبانایەتە سەر، هەتا گەر دووریش بانایە لێم، وەک ئەوەی لە ڕێگای ڕادارێکی نهێنییەوە شەپۆلەکانیان بدۆزمەوە و لە لای خۆم تۆماریبکەم، دەمتوانی خەونیان بدۆزمەوە. لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو توانایەدا بەوجۆرە خەونەکانی سابات، خەونی کچە مامەکانم، خەونی هەندێ هاوڕێی کۆنی خۆمم دەبینی، دەچوومە ناو نهێنییەکانیان، حەزەکان و ترسەکانیانم دەدۆزییەوە. هەندێ جار هەستمدەکرد لە کاتی خەوتندا بە مەبەست خەیاڵم بۆ خەونی کەسێکی دیاریکراو دەگەڕێت و دەیپێکێت. زۆرجار هەستم بە شانازیدەکرد کە دەمتوانی لە ناو لێشاوی سەدان خەوندا، ئەو خەونە بدۆزمەوە کە بۆی دەگەڕێم، بەڵام هەندێ جار گەرچی هەوڵمدەدا و خەیاڵم کۆدەکردەوە، نەدەگەیشتمە هیچ. ئەوەتەی هاتووینە ناو چیاکان و ئەو ئامێرە دڕندەیە لە سەرمدا کەوتۆتەوە کار، خەونی زۆر دەبینم، زۆر جار زیاتر لەوەی بتوانم هەموویان بناسمەوە، زۆرجار

دەیان خەون دەبینم کە نازانم هی کێن، هەستدەکەم خەونی هەمووان دەبینم، خەونی غەریبەکان، خەونی خێوەتگاکانی تر، خەونی ئەو پاسەوان و سەربازانەش کە لە لووتکەی ئەم چیایانەدا ئێشکدەگرن. ڕەنگە هەندێ خەونی نەقیبیشم بینیبێت و نەمزانیبێت.

نەقیب گووتی «بەڵێ، جەنابی کاک ڕێنوار، من زۆر بەم توانایەی تۆ سەرسامم، ئەو توانایەی تۆ لەوە گرنگترە کە خۆت هەڵیدەسەنگێنیت. من دوێنێ لەگەڵ چەندین لە کرێکارانی فەسیلەکەدا قسەمکرد، هەموو دڵنیایانکردمەوە کە تۆ خەونی ئەوانت بینیوە، شتەکە گومان هەڵناگرێت، جێگای دوودڵی نییە. تۆ توانایەکی سەیرت هەیە کە پێشتر کەسی تر نەیبووە».

بۆئەوەی خۆم لە هەر گفتوگۆیەکی جیدی دووربخەمەوە گووتم «وای جەنابی نەقیب، شتەکە چ نرخێکی هەیە. هەندێ جار من وەک یاری و بۆ خۆشی باسیدەکەم. توانای چی ... من تەنیا بۆ خۆشی شتەکان دەگێڕمەوە، دەمەوێت خەڵک تەنیا بە مستەر گرینۆک ناوم نەبەن، بەڵکو کاتێک منیان بیرکەوتەوە، پێبکەنن، دڵیان خۆش بێت». نەواس شەربەتەکانی هێنا و نەقیب دەم و دەست، دەمی نا بە پەرداخەکەی خۆیەوە «نا، مەسەلەکە گەمە نییە، تۆ پتر وەک دکتۆرێک وەهایت. چۆن پزیشکەکان لە کاتی بێهۆشیدا ناوزگمان دەدڕن و سەیری لەشمان دەکەن و پارچەی لێدەردەهێنن، تۆش لە کاتی بێهۆشیدا، کاتێک لە خۆمان بێخەبەرین، دێیت و چی لە سەرماندا دەقەومێت دەیبینیت... ئەوە کەم نییە. تۆ لە من تێبگە، دەمەوێت داوەتتبکەم بێیت و خەونەکانم ببینیت». ساتێکی بچوکبوونەوە و دابەزین بوو لە ئەفسەرێکی مەغرورەوە ... هەستمکرد بۆ یەکەمجار لەبەردەممدا هەست بە بێهێزی دەکات.

سەرەتا نەمزانی چی بڵێم، سارد و بێرۆح سەیری نەقیب یوکسەلم

کرد، نیگام وەک نیگای کەسێک بوو لە بۆشاییەک رامابێت. بۆ ئێستێک شتەکان سەرسوڕهێنەر بوون، لەم چیا سەختانەدا کە هێدی هێدی سەرەتاکانی وەرزی سارد خەریکبوو دەردەکەوت، من لەگەڵ نەقیبێکدا، لە ژێر چادرێکدا، وەک چادری جادوگەران باسمان لە خەونبینین دەکرد... نەمدەزانی نەقیب ئەو خەونانەی بۆ چییە. بە ساردییەوە گووتم «خەون یان شتی بێمانا و بێ پەیوەندی و شڵەوبڵەیە یان ئازارێکی نهێنی تێدایە کە باشترە هەر دەرنەکەوێت . خەونت بۆچییە جەنابی عەقید، خەونت بۆچییە؟ گەر خودا لە ئەزەلەوە ئەو دەرگایەی لێ داخستوویت مەیکەرەوە، تۆ وەک خۆت دەڵێیت دیلاوارییەکی ڕەسەنیت، دیلاواریی ڕەسەنیش خەون نابینێت». بە گومانەوە سەیریکردم و گووتی«وانییە ... لەو باوەڕەدام خەون نەبینین نیشانەیەکی بێهێزی بێت. دیلاواری کۆن ویستوێتی ئاسوودە بژی، بەڵام دونیای ئێستا ئاسوودەیی تێدا نییە، هەمووان خەون دەبینن، میللەتە گەورەکان، بچوکەکان، بەهێزەکان، لاوازەکان، زیندووەکان، مردووەکان... هەموو خەون دەبینن، هەموو خۆیان دەدەنە دەست خواست و ویستی ناو ناخی خۆیان. نا لە نرخی خەون کەممەکەرەوە. پێم بڵێ وەحی چییە کە بۆ پێغەمبەرەکان هاتۆتە خوار، جۆرێکە لە خەون. ئیلهام چییە کە شاعیرەکان پێیان نوسیوە، ئەویش هەر جۆرێکە لە خەون. من کە ئەم کرێکارانە دەبینم لێرە بەم جۆرە ئیشدەکەن، لە بەرئەوەیە خەونێکیان بینیوە... من جەنگاوەرم، جەنگاوەریش یەک مانای هەیە و بەس. مرۆڤ لە جەنگدا خۆی بداتە دەست خواست و ئارەزووەکانی ناخی خۆی. دیلاوار دەبێت خۆی بداتە دەست تاریکییەکانی ڕۆحی خۆی... خۆی بداتە دەست ئەو خێو و دێو و درنجانەی لە ناخیدا خەوتوون. هەموو دونیا وادەکات. میللەتێک بۆ ئەوەی بتوانێت بژی، دەبێت خۆی بداتە دەست ئەو تاریکییە. بەیانی لە جەنگدا پێویستمان بە کەسانێکە خۆیان بتەقێننەوە، منداڵان سەربڕن، بەسەر میندا بڕۆن، دوژمن بە زیندووی بسووتێنن.

پێویستیمان بە کرێکارە شەو و ڕۆژ ئیشبکات، پێویستیمان بە جەنگاوەرە شەو و ڕۆژ لە سەنگەردا بێت، پێویستیمان بە ژنە قاچی هەڵبڕێت و ئەفسەر و سەربازەکانمان خۆیان لە ناویدا خاڵیبکەنەوە. پێت وایە ئەمانە بە مرۆڤی هوشیار دەکرێن؟ ... ها.. پێت وایە پیاو و ژنی دانا دەچنە ژێر باری وەهاوە؟ هەر کەسێک لە ژێر کاریگەری ئەو بەشە تاریکەی گیانی خۆیدا نەبێت، ناتوانێت ئەوە بکات. تۆ وادەزانی من لە خەوندا بۆچی دەگەڕێم... با پێت بڵێم، من دەزانم ئەم تاریکییەی ئێستا لە ناخمدایە بەشم ناکات. سوپای دیلاوار لەوە لاوازترە بتوانێت ئەم جەنگە بەرێتەوە، جەنگ بە ئیرادە دەبرێتەوە، هەموو ئیرادەیەک نا، بەڵکو ئیرادەیەکی بێڕەحم. من پێویستیم بە جەنگاوەرێکە کاتێک سەردەپەڕێنێت، هەست نەکات سەر دەپەڕێنێت، کە خۆی دەتەقێنێتەوە هەست نەکات دەمرێت. دیلاوارییەک هەیە هێشتا ماوێتی، هێشتا لاوازە، هێشتا زۆری ماوە بتوانێت شەڕی گەورە بباتەوە. دیلاوار پێویستی بە شەڕکەرێکە تاوانبار و بێتاوان نەناسێت... بەڵێ دەبێت شەڕکەری وا پەروەردەبکات، ئەوەش بە یەکێک ناکرێت نەزانێت لە ناخی خۆیدا چی هەیە. کێ درتر بێت ئەوە جەنگ دەباتەوە».

من سەرسام گوێم دەگرت و نەمدەویست باوەڕبکەم. گووتم «لەوە زیاتر چیت دەوێت جەنابی نەقیب. هەر کەسێک بڕوانێت دەبینێت کە دیلاوار ئەم ماوەیە زۆر گۆڕاوە، خەڵک شەوق و ئارەزوویەکی زۆریان بۆ جەنگ هەیە، بەردەوام سەربڕین و کوشتن هەیە». نەقیب یوکسەل زریزەی چاکەتی تراکسوتە ڕەشەکەی کەمێک کردەوە و سەیرێکیکردم و بە گومانەوە گووتی «من باس لە خۆم دەکەم، هەستدەکەم خەڵکی دیلاوار دەتوانن ئیلهام لە خەونەکانی خۆیان وەربگرن. ئەم کرێکارانە ئیلهامیان وەرگرتووە، دیلاوار لاوازە. زۆر لاوازە. پێویستیمان بە هەموو شتێک هەیە هێزی خۆمانی پێ ڕاپەڕێنین. ئەمە جەنگە، لە جەنگدا دەبێت هەموو کەرەستەیەک بەکاربهێنین». بۆ ئەوەی زۆر لەسەری نەڕوات و

تورەم نەکات گووتم «من دەبێت چی بکەم... داوای ئێوە چییە لە من؟».
بە نیگای ئەفسەرێکەوە کە هەم دەیەوێت وەک دۆست بنوێنێت و هەم نایەوێت غروری خۆیشی لە دەستبدات، گووتی «داوای من لە تۆ داوایەکی دۆستانەیە، تکایەکە، ئومێدێکە خەونەکانی خۆمم پێبڵێیت. دەمەوێت بزانم خەونی چی دەبینم. وەک ئەفسەرێک کە خۆم بۆ جەنگێکی گەورە ئامادەدەکەم پێویستم بەوەیە». من گووتم «جەنابی نەقیب. خۆت دەزانی ئەوە بەدەست من نییە، من وەک بێهۆشم، وەک ئێوە لە خەودام، منیش دەمەوێت تەنیا خەونی خۆم ببینم، حەزم لەوە نییە سەرم وەک گەنجینەی لێی بێت، باوەڕت بێت حەزم لەوە نییە. بەڵام جەنابی نەقیب... دڵنیابە، گومان لە هەر خەونێک بکەم بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە».

دوای هەفتەیەک هەوڵدانی بەردەوام، دەمتوانی خەونەکانی نەقیب نەجات یوکسەل ببینم ... وەک دەستێکی نهێنی خەونەکانی ئەو ڕێنماییبکەن، بە پۆل دەفڕینە لای من، وەک خۆیشی بە نهێنی کەناڵێکی دۆزیبێتەوە و خەونەکانی خۆی بەرەو لای من ڕەوانەبکات، دەمتوانی خەونی ئەو ببینم.

نمونە لە خەونەکانی نەقیب

*«نەقیب لە جلی سواڵکەرێکدا دەبینم، لە شەقامێکی جەنجاڵدا دەڕوات، شەقامێک هەزاران کەسی لەسەرە. لە ناو ئەو شەقامە جەنجاڵەدا، ژنێکی پیر، بەڵام ڕێکپۆش و خۆش نوێن دەستی نەقیب دەگرێت و دەیبات. ژنەکە زۆر لە نەقیب تورەیە، بەسەریدا دەقیژێنێت، ئەو تەنیا ملکەچ وەستاوە و سەیریدەکات، دواجار نەقیب دەڵێت « وازم لێبهێنە،وازم لێبهێنە، دەمەوێت بچم بۆ دوکانی ئاسنگەرەکان و چەقۆ بهێنم » . ژنەکە زۆر شت دەڵێت من تێناگەم. نەقیب دەڕوات و بە چەقۆیەکی تیژەوە دەگەڕێتەوە. ئەمجارە*

گوێم لە دەنگی ژنەکەیە دەڵێت « تۆ ناتوانیت چەقۆ بەکاربهێنیت، خۆت دەبڕیت، بچۆ بۆ لای یەکێک فێرت بکات ». نەقیب دەڵێت « من دەزانم... من دەتوانم فێربم ... دەتوانم فێربم». ژنەکە دەڵێت» تۆ قەت فێری چەقۆ نابیت، فێرنابیت، من لە منداڵییەوە پێم گوتوویت». نەقیب لە خەونەکەدا پارچەیەک لە گۆشتی مەچەکی دەکاتەوە و دەیخاتە بەر دەمی ژنەکە و دەڵێت» ببینە، ببینە، دەتوانم». ژنەکە وەک مەست بێت، گۆشتەکە هەڵدەگرێت و بە سەرسامییەوە سەیریدەکات و دەیخاتە ناو دەفرێکی قووڵ و سەری دادەخات و دەڕوات».

«نەقیب جلی جەنگی لەبەردایە، لە مەیدانێکی دوکەڵاویی و تاریکدا وەستاوە. چواردەوری سەرباز و ئەفسەر و پلەدارە، دووربینێکی بچوکی بە دەستەوەیە و سەیری دوور دەکات. دەڵێت پێویستە لە ئاوی گەورەوە کەناڵێکی گەورە لێبدەین تا دوژمن نەتوانێت ئاسان بپەڕێتەوە. دواتر لەگەڵ سەدان سەربازدا کە هەموویان کەڵاو گیا و وردە چڵیان لە خۆیان داوە، بە چیایەکی بەرزدا سەردەکەون. یەکێک لەو سەربازانەی لەگەڵ نەقیبدا سەردەکەوێت میرئەوداڵە، میرئەوداڵ شان بە شانی نەقیب دەڕوات و ئاڵایەکی دڕاوی دیلاواری بەدەستەوەیە و بەدەنگی بەرز سروودی ـ دیلاوار ئەی سەرزەمینی شێران ـ دەڵێتەوە. لە ناوەڕاستی چیاکەدا پیرێژنێک دەبینن لەسەر بەردێک دانیشتووە. ژنەکە دەڵێت « پێمگوتی لە بەرزاییەوە مەڕۆ. مەمەد حەسار لێرەوە زۆر دوورە. بڕۆ خوارێ و لە ڕێی دارستانەکانەوە بڕۆ». پیرێژنەکە ڕەنگ و ڕووی شەیتانی هەیە، بەڵام بەردەوام دەڵێت «مەمەدحەسار لێرەوە نییە، گەر دەتەوێت بچیت بۆ مەمەد حەسار بڕۆ خوار و بە ناو دارەکاندا بڕۆ». دواتر وەک ئەوەیە نەقیب لە ناو درەختەکاندا تووشی داوێکی گەورە بووبێت، لەشکرەکەی خنکابن و بەدرەختەکاندا هەڵواسرابن، لاشەی میرئەوداڵ لە ناو لاشەکاندا دەناسمەوە. نەقیب لە خەونەکەیدا یەک یەک بانگی سەربازە مردووەکانی دەکات و دەڵێت

« هەستن، هەستن بۆ خۆتان کردوە بە خەوتوو، بەر لەوەی زستان بێت دەبێت خەندەکەکەمان تەواو بکەین» بەلام کەس وەلام ناداتەوە... پیرێژنەکە دەردەکەوێت و دەڵێت» پێم گووتی لێرەوە مەچۆ بۆ مەمەد حەسار، لێرەوە مەچۆ». نەقیب هەڵدەستێ و بە تەنیا لەگەل پیرێژنەکەدا لە ئاوێک دەپەڕنەوە. پیرێژنەکە بە دەست ئاماژە بۆ ناو تەمتومانێک دەکات و دەڵێت» ئەوەیە مەمەدحەسار ... بڕۆ، ئەوەیە مەمەد حەسار» ».

«شەوێکی پڕ ئەستێرەیە، نەقیب لەگەل پێنج سەربازی نەناسراودا کە هەر پێنجیان کلاوی ئاسنینی سەربازییان لەسەردایە، لەسەر تروپکی چیایەکی بەرز دانیشتوون. دەنگی تەقینەوە دێت، بەلام عەقید و سەربازەکان بێباک لەسەر ئەو بەردە سەیری مانگ دەکەن، گیزەی گوللە، شریخەی پارچەی خومپارە، هارەی تێکشکانی بەرد و هەرەسی شاخ دێت. لە ناکاو یەکێک لە سەربازەکان دەڵێت، جەنابی نەقیب سەیری ئەو فیشەکە بکە. نەقیب سەیری دوور دەکات و دەڵێت وایە ئەوە فیشەکێکە بۆ لای ئێمە دێت. هەموو سەیری بریسکەی ئەو گوللەیە دەکەن کە بەرەو ڕوویان دێت. نەقیب سەیری سەربازێک دەکات و دەڵێت بەر سەری تۆ دەکەوێت. سەربازەکە دەڵێت دەمێکە چاوەڕوانیەکەم، دەترسم بەرم نەکەوێت. هەموو پێدەکەنن و ڕێک ڕادەوەستن و چاوەڕوانن گوللەکە بگاتە بەرەوە. گوللەکە دێت و دەدات لە سەری سەربازەکە. نەقیب دەڵێت. من گووتم ئەوە فیشەکی تۆیە، هەر کەسەو فیشەکی خۆی هەیە. سەربازەکە دەڵێت ڕاستدەکەیت، جەنابی نەقیب یوکسەل، خۆم هەر لە منداڵییەوە دەزانم شەوێکی مانگەشەو دەمرم، ئێستا زۆر دڵخۆشم کە شەوێکی وەها دەمرم. عەقید دەستدەکاتە ملی و دەڵێت چەندم پێخۆشە کە تۆ لە شەوێکدا دەمریت کە خۆت حەزت لێیە، منیش حەزدەکەم لە شەوێکدا بمرم خۆم حەزم لێی بێت. سەربازە

*کوژراوەکە کە هێشتا قسەدەکات دەڵێت .کە جەنگتان بردەوە، منتان لە بیر بێت . . نەقیب و هەموو سەربازەکان پێدەکەنن و دەڵێن . بەڵام کەس نازانێت تۆ ناوت چییە، تۆ ناوت تەنیا سەربازە، سەرباز و هیچی تر، ئیتر چۆن تۆمان لە بیر بێت . سەربازەکە دەڵێت .ئا ڕاستدەکەن بڵێن ئەو سەربازەی لەسەر بەرزیکی بەرز کوژرا . یەکێک لە سەربازەکان دەڵێت .باشە کە جەنگ تەواو بوو، هەموو دەڵێین درود بۆ ئەو سەربازەی لە سەر بەرزیکی بڵند کوژرا . سەربازەکە وادەڵێت و هەمووان پێدەکەنن، هەتا خودی سەربازە مردووەکەش زاری بە گەورەیی دەکاتەوە و پێدەکەنێت».*

نەقیب دەیەها خەونی سەیر و بێمانا و کورتی لەو جۆرە دەبینێت، کە لای من وەک زنجیرە خەونی پیاوێکی شپرزە و شڵەژاو دەردەکەون. دیمەنێک هەموو شەوێک لە خەونەکانی نەقیبدا دووبارەدەبێتەوە، دیمەنی ڕێڕۆیشتنی تەنیای نەقیبە بە سەوزاییەکی پان و بەریندا، دەنگێکی ژنانە لە دوورەوە بانگیدەکات « نەجات نەڕۆی، نەڕۆی، ئەوە ڕێگاکە نییە، نەڕۆی». بەڵام نەقیب بە خۆی و گۆچانیکەوە هەر دەڕوات، تا دەگاتە ناوەڕاستی ئەو کێلگە زۆر گەورەیە، لەوێدا ئاوڕدەداتەوە و وەک ماڵاوایی لە کەسێک بکات دەست بەرزدەکاتەوە و چەند جارێک دەستی رادەوەشێنێت. هەنگاوێک دەنێت بۆ دواوە و خەندەیەکی گەورە دەگرێت، خەندەیەکی گەش و پڕ ئومێد، وەک یەکێک دەست بە سەفەرێکی نوێ بکات، من هیچ کات خەندەی وەهام لەسەر ڕوخساری خۆی نەدیوە. هەنگاوێکی تر دەڕواتە دواوە و لە ناکاو ڕوخساری دەگۆڕێت، شتێک لە ژێر پێیدا بەرزدەبێتەوە و ناڵەیەکی سامناک دونیا دەهەژێنێت، عەقید پارچە پارچە دەبێت و پارچەکانی بە هەوا و ئاسماندا بڵاودەنەوە... لە جێگای ئەو تەنیا دوکەڵێکی ڕەش بەرزدەبێتەوە، ڕەشتر لە هەر دوکەڵێک من لە ژیانمدا بینیبێتم.

عەقید هەموو شەوێک ئەو خەونە دەبینێت... هیچ شەوێک نییە ئەو خەونە دووبارە نەبێتەوە.

عەقید دەیان خەوی سەیر دەبینێت کە یەک یەک هەموویانی بۆ دەنوسمەوە. خۆشی ئەواس ڕادەسپێرێت هەموو خەونەکان لە دەفتەرێکی جیادا بۆ بنوسێتەوە. زۆرجار لە سەرساميدا دەمدەکاتەوە و زۆرجاریش بێدەنگییەکی قورس دایدەگرێت و چاوە شینە دڕەکانی کز و ماندوو دەڕوانن. من جار دوای جار تکادەکەم کە واز لە گێڕانەوەی خەونەکان بهێنم، بەڵام ئەو دەست بەردار نییە.

من ماندوودەبم، بە ڕۆژ هەموو کاتم لەگەڵ کرێکارەکان و کێشەکانیان دەبەمەسەر، بە شەویش ئەم خەونانە ئازارمدەدەن. ڕۆژێک هۆڵەکانی خەوتن تەواودەبن و هەموو چادرەکان کۆدەکەینەوە و لە ژوورەکاندا جێگا دەگرین. زۆر نابات یەکەم بارانی توندی پاییز و یەکەم بای شێتانەی ناو چیاکان هەڵدەکات. ئیشکردن لە ژێر باراندا سەخت و نالەبارە، کرێکارەکان زیاتر نەخۆشدەکەون و ماندوودەبن. ڕۆژێک ئیسماعیلی خەڵکی دسکارا دەگەڕێتەوە و زۆر تورەیە لە من، ژیانی لە تەمیخانەی ناو چیاکان دۆزەخ بووە. من بانگیدەکەم و لە بەردەمیدا دەگریم. بانگیدەکەم و تێیدا دەپاڕێمەوە بمبورێت. ئەو سارد و بێهەست سەیری گریانەکانم دەکات و دەچێتە دەرەوە و نامبورێت، هیچ هەستێکی بە نارەحەتی و پەشیمانی من نییە، تاکە شتێک لە ناخیایەتی ڕقێکی گەورەیە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت من لێرەبم و پارێزگاری لە باری ڕۆحی ئیشکەرەکان بکەم. لەو کاتەوە کە هۆڵەکانی بنار تەواودەبن، ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی فەسیلەکە دەچن بۆ سەر چیا و لەوێش بنکە نهێنییەکان دەبێت تەواو ببن. تا ئەو کاتە هیچ نیشانەیەکی جەنگ دیار نییە، هەمیشە دوژمن لە دوورەوە سەیرماندەکات و ئێمەش لە دوورەوە سەیری ئەوان دەکەین. ئێستا بە دامێنی چیادا و بۆ

مەودایەکی نادیار دەبێت لەسەر خەندەکێکی درێژ ئیشبکەین. من لەگەڵ زەهاو ژوورێکی بچکۆلەمان جیاکردۆتەوە و لەوێ دەخەوین. لەو کاتەوەی من خەونەکان دەگێڕمەوە نەقیب بۆتە پیاوێکی غەمگین، زۆر ڕێز لە من دەگرێت. ئێستا شەوان بەردەوام بەجێمان دەهێڵێت و دەچێت بۆ یانەی ئەفسەرەکان، هەمیشە بە غەمگینی دەگەڕێتەوە. نەواس باس لەوەدەکات کە ڕەفتار و ڕوانینی تەواو گۆڕاون، لەجاران بێدەنگتر و غەمگینترە. دڵنیام لە ناو خەونەکاندا بەر هەندێ نهێنی کەوتووە کە تەنیا خۆی دەیانزانێت. دڵنیابووم خەونەکانی پڕن لە ئاماژەی نهێنی و سەیر بۆ شتگەلێک کە تەنیا خۆی تێیاندەگات. من بەیانیان دەفتەری خەونەکان دەبەم و لەسەر مێزەکەی دایدەنێم و ئەو بێدەنگ دەستدەکات بە خوێندنەوەیان، دواتر نەواس خەونەکە لە دەفتەرێکی تردا دەنوسێتەوە. زۆر کەم پرسیار لەسەر خەونەکان دەکات، وەک ئەوەیە بۆ شتێک گەڕابێت و دۆزیبێتییەوە. هەندێ شەو، هەندێ لە کرێکارەکان دێن و داوادەکەن من خەونیان بۆ بگێڕمەوە، بەڵام بڕیارمداوە هیچ نەدرکێنم، دەستدەخەمە سەر شانیان و دەڵێم «نا، شتێک بەدبەختی لە دواوە بێت، دەبێت زوو کۆتایی پێ بهێنین. وازبهێنن ئەوە هەر بۆ خۆشی بوو».

لەو ڕۆژەوەی هاتووین هەواڵێکی ئەوتۆم لە دیلاوار نییە. هەندێ لە کرێکارەکان نامە و پۆستیان لە خێزانەکانیانەوە بۆ دێت، بەڵام من هیچ. سەرەتا چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد، مامە سیام هەندێ جار نامەیەک یان هەواڵپرسییەک بکات، بەڵام نەبوو هەتا بە سڵاوێکیش منی یاد بێت ... هەر جارێک کە پۆست دەهات، من چاوەڕوانی ئەوە بووم بانگمبکەن، بەڵام هەتا جارێکیش نەبوو نامەیەکی منی تێدا بێت. تاکە کەسێک حەزمدەکرد بیبینمەوە پرۆفیسۆر بەهنام بوو، ئەویش نەیدەتوانی نامە بنێرێت.

ئێستا بەردەوام باران دەبارێت، بارانێکی بە خوڕ و شێتانە، کرێکارەکان

هەموو بە موشەمای بارانەوە ئیشدەکەن، ماشینەکان خەندەکەکان هەڵدەکەنن و کرێکارەکان دەبێت خێرا فەردە خۆڵ و لم پڕبکەن. لە ناوچەکانی سەروو ئێمە زۆر لە کارەکان هاتوونە کۆتایی، وردە وردە ڕۆژانە دەبینین هێزی سوپا دێت و دەچێتە بنکە تازەکان، فەسیلەکانی دی بە خێرایی لە بارهەڵگر و پاسی گەورەدا دەگوازرێنەوە بۆ شوێنی تر. نەقیب دەڵێت «کاری ئێمە تا دوایی زستان بەردەوام دەبێت». لەگەڵ هاتنی سەرمادا حاڵی ئێمە زۆر بەرەو خراپی دەڕوات، کرێکارەکان زوو زوو توشی نەخۆشی دەبن، باری دەروونیان چیتر وەک جاران هێمن نییە، ئیشێکی زۆر و دووروودرێژ هێدی هێدیی لاوازیاندەکات. من پێشنیار دەدەم بە نەقیب کە هەفتانە دەستەیەک لە کرێکارەکان پشوودەن تا تین و هێزیان تێدەگەڕێتەوە، بەڵام نەقیب قەبووڵی ناکات، کارەکان زۆرن، نەقیبیش لەگەڵ هیلاکی و پەککەوتنی جەستەیی فەسیلەکەدا زیاتر تووڕە و گرژ دەبێت.

دوای دوو هەفتە سەرما و باران ئێستا کرێکارەکان زیاتر لە جاران تووشی باری ڕۆحی دژواردەبن. لە یەکێک لە ئێوارەکاندا موحسنی عەرەبانچی، کە بە درێژایی ڕۆژ فەردە خوڵی پڕ کردبوو، لە بەردەم سەنگەرەکاندا لە هۆش خۆی چوو، لە جێگای کارەکەی و لە ناو قوڕاوی ئیشکەیدا بووڕایەوە. کە هێنایانەوە بۆ ناو قاوشی خەوتنەکە سەراپای لیتە و تەڕیی و پیسی بوو، بە دەستی خۆم مشەما قوڕاپییەکەم لە بەر داماڵی و کەوتمە هەوڵی هۆشهێنانەوەی بە هەموو ئەو ڕێگایانەی لە فریاکەوتنی سەرەتایی دەمزانی، دوای ماندووبوونێکی زۆر هاتەوە هۆش خۆی، بێئەوەی بتوانێت بە ڕوونی قسەبکات و باس لە دەردی خۆی بکات، بەجۆرێکی خراپ نەخۆش بوو، بەشێوەیەک گەیشتە ئەوەی من چەندجار بەسەریدا بگریم. هەموو کاتەکە من و زەهاو بەسەریەوە بووین و ئاگاداریمان لێدەکرد.

ئێوارە دوای تەواو بوونی کارەکان، نەقیب یوکسەل بە خۆی و پاڵتۆیەکی زستانەی درێژ و کاسکێتێکی سەوزەوە کە پێشتر لەسەریدا نەمدیبوو، هات بۆ لای نەخۆشەکە. من خۆشحاڵ بووم ببینم نەقیب دۆخی کرێکارەکانی بۆ گرنگە، بە گرتنی پلەی گەرما و فشاری خوێن و ترپەی دل حاڵی خراپی دۆخی موحسینم زیاتر بۆ ڕوونکردەوە. هەر ئەو شەوە ناردمان بۆ بیمارستانە مەیدانییەکە، ئەو لە ڕێگا دووبارە تووشی لە هۆش خۆچوون هاتبووەوە و دکتۆرەکان بە ئەمبولانسێکی تایبەت ناردبوویانەوە بۆ شار. موحسن یەکەمین دۆخی دژوار نەبوو، کرێکارەکان تا دەهات غەمگینتر دەبوون، زۆریان نیشانەکانی غەمۆکی و بێدەنگی و داکەوتنی ڕۆحیان پێوەدیار بوو. هەندێکیان بەردەوام ئاژاوەیان دەنایەوە، سیاسەتی نەقیب لە نێوان نەرمی و ڕەقیدا هاتوچۆیدەکرد. نەدەیتوانی زۆر نەرم بێت، دەترسا شیرازەی فەسیلەکە لە یەک بترازێت، نەشدەیتوانی زۆر ڕەق بێت، دەترسا کرێکارەکان بخزێنە جوغزێکی تەنگەوە و یاخیببن و کارەکان دوا بکەوێت. لەو ڕۆژانەدا چەندەها جار شتی وا هاتە پێش، هەندێ لە کرێکارەکان لە هۆش خۆ دەچوون، هەندێ توند دەکەوتنە گیانی یەک ... هەموو شتەکان نیشانەی کارەسات بوون... کارەساتێک دەمانزانی لە ڕێدایە و هیچمان نەدەکرد بۆ ئەوەی خۆمان و دونیای لێ بپارێزین.

# ٤٠

ئاڵ موراد بۆی گێڕامەوە

دڵنیابووم منیان بۆ یەکجار دەوێت، هەرچەند سەیری سەر و بیچمی خۆمم دەکرد، لەو باوەڕەدا نەبووم، وەک کەسێکی زێڕین هەڵمبگرن و بمخەنە کۆشی سەفا و عەیش و نۆش، تا گەر جارێکی دی کارێکی نوێیان بوو بڵێن «ئاغای ئاڵ موراد، توخودا کاتتان هەیە، گەر بە ئەرکی نازانن، دەی بەساقە، قوربانی جووتە گوونە ئاڵتوونییەکەت بین، بفەرموون کەسێکی ترمان هەیە بۆمان بکوژە». نا ... هێندە گێل نەبووم، بکەومە داوی وەهاوە. هەمیشە ئەو قسەیەی دایکمم لە یاد بوو، لە هەر شوێنێک زۆر حورمەتیان گرتی، لە پێشدا و بەر لەوەی دڵخۆشکەیت، ژێر قوونی خۆت بۆ چاڵێکی ڕەش بگەڕێ . هەموو ئەو ڕۆژانەی لە ژوورە تەنیا و داخراو و ڕازاوەکەدا بردمنە سەر، بیرم لە یەک شت دەکردەوە، چۆن دوای جێبەجێکردنی ئەو ئیشەی پێم دەسپێرن، دەرچم و و نەگەڕێمەوە... ڕاستبم یاخود هەڵە، دەنگێک لە ناخمدا پێیدەگووتم من وەک ئەو چەقۆیانەم کە یەک جار بەکاردێن، دوای تەواوبوونی زەماوەندەکە بێ هیچ دوودڵی و نیگەرانییەک دەمخەنە تەنەکەی زبڵەوە. ڕاسترین شتێک لە ژیانمدا بیستبێتم ئەو ڕستەیەیە کە دەڵێت «قەناس تەنیا یەک گوللەی هەیە»، منیش یەک گوللەم هەبوو، فیشەکێکی تاک و تاقانە و هیچی تر. دڵنیابووم

هەر نیشانەیەکم بۆ دابنێن دەبێت لێیبدەم. گەر لە نیشانەکە نەدەم، لەویادا دەستوبرد گوللـەیەک دەنێن بە سەرمەوە و کۆتایی بە هەموو شتێک دەهێنن ... تۆ چیت؟ هیچ نیت؟ تەنیا فیشەکێکی هەڵەیت و تەواو.

بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستام، لە ناو جێگاکەدا چاوم دەنوقاند و بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت شتەکان چۆن بەڕێوەبچن. ئەوەی پێشبینی وردی ڕەوتی هەموو شتەکان بکەم، وەک جۆرە خولیا و یارییەکی لێهاربوو. لەو کاتەوە دەمهێنایە بەرچاوی خۆم کە دەرگای ئەم ژوورە دەکەنەوە تا ئەو کاتەی ئیدی من نیشانەکەمم پێکاوە و ئەوان بە دوو کەس ئەملاولام دەگرن و دەمخەنە جیبێکی بچوکی جام ڕەشەوە و دەمبەن تا بمکوژن و بە نهێنی لە چاڵێکی نەبینراو و نەزانراودا بمنێژن. هەموو ئەو ڕەوتەم دەیان جار دەهێنایەوە پێشچاوی خۆم، هەر ڕێگایەکی دیلاوارم لە خەیاڵدا بایە، ماشینەکەم دەبردە ئەوێ، هەر مەیدانێکی دیلاوارم بزانیبایە، کاری خۆم دەبردە نزیکی، دەموچاوی ئەوانەم دەهێنایە خەیاڵم کە دەشێت لەگەڵمدا بێن و ڕێنماییمبکەن و نیشانەکەم پیشانبدەن، شێوەی قسەکردنیان، شێوەی ڕۆیشتنیان، شێوەی سلاو و ماڵاواییکردنیان. لە هەموو ئەو وێنانەدا بۆ یەک شت دەگەڕام، کاتێک نیشانەکە دەپێکم، دواتر چۆن لە دەست ئەو پاوەرانە ڕابکەم و خۆمیان لێ ونبکەم. شتێک لە دڵمدا پێی دەگووتم گەر هەڵنەیەم دەمکوژن. ئەوەی ئەو ماوەیە لە دیلاوار بینیبووم بەس بوو باوەڕ بەوە بهێنم ئەوانەی لە پشت ئەم کارەوەن دەست لە کەس ناپارێزن، بەتایبەت مێروچەیەکی مل باریکی وەک من. دەبوو بیربکەمەوە دوای ئەوە چی بکەم و چۆن نزیکترین دەرفەت بەکاربهێنم تا خۆم ونبکەم. ئەی گەر خۆم ونکرد بۆ کوێ بچم؟ . تەنیا جێگایەک لە خەیاڵمدا بوو، ماڵی ئامۆزایەکی دایکم بوو، پیاوێکی بە تەمەن کە هەندێ جار ماڵەکەیم بۆ پاکدەکردەوە و لەسەر خواستی دایکم خواردن و میوەم بۆ دەبرد، پیرەمێردێکی لە خواترس و بێئاگا لە دونیا کە ژیانی زاهیدێکی لە دونیا

دابڕاو دەژیا، من لە منداڵییەوە «مامەی دایە»م پێدەگووت. ئەوە خولیای سەرەکیم بوو، دەمویست هەموو وێنەکان بهێنمە پێش چاوی خۆم، تا لەو ساتەدا کە دادەبەزم، بتوانم ڕاستترین بڕیاربدەم.

دوو ڕۆژ دواتر، من لە خەودا بووم کە دەرگاکەیان کردەوە. کەسێکی درێژ کە لووتێکی نیوە خەرتومی هەبوو هاتە ژوورەکەمەوە، وەک ئەوانی تر چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاودا بوو، بەڵام لە بری بەرگی سەربازی، قاتێکی خۆڵەمێشی توخی پۆشیبوو، ڕەنگێکی بۆری هەبوو، جلە جوانەکانی لەگەڵ قیافەیدا نەدەگونجان، سمێڵێکی نارێکی بوو کە دیاربوو خۆی نەزانانە مەقەستپاچی کردوە. کاسکێتێکی تەپاندبووە سەری، کە دیاربوو کەللەیەکی ساف و بێموو و پوچی لە ژێردا شاردۆتەوە. خاڵێکی گەورە لە ژێر لووتیدا بوو کە ناشیرینییەکی بێوێنەی پێبەخشی بوو، لەگەڵ ئەو سیفەتانەدا دەنگی لە ڕوخساری بەدتر بوو، کە قسەیکرد دەنگی وەها ناخۆش بوو، گەر بەو دەنگە سرودی پەریانی بەهەشتیشی بخوێندبایە دەتگووت خالق ڕێگای جەهەنەم کوا و قاپی دۆزەخ لە کوێیە. کە هاتە ژووری، یەکەم شت سەیرێکی وردی ناو ژوورەکەی کرد، چاوی بە هەموو لایەکدا گێڕا، ئینجا چووە توالێتەکەوە و مێزێکی درێژی کرد، کە هاتەدەری سەر لە نوێ بە چاو ژوورەکەی پشکنی و دواجار بێئەوەی سڵاوبکات گووتی «ئەمڕۆ کارێکی گرنگت هەیە، هەستە». ڕەفتاری لای من قێزەون بوو. پرسیم «تۆ کێیت... دایک و باوکت فێری ئەدەب و سڵاویان نەکردویت، نازانیت چوویتە هەر جێگایەک چاوت بە کەسێک کەوت یەکەمجار دەبێت سڵاوبکەیت؟». کابرا بێئەوەی سەیرمبکات یان بۆی گرنگ بێت چی دەڵێم گووتی «من دایک و باوکم نییە. پێم گووتی هەستە، ئەمڕۆ کارێکی گرنگت هەیە». بێئەوەی لە جێگای خۆم بجوڵێم گووتم «ئەوەی سەرپەرشتی ئەمجۆرە کارانە دەکەن. هەقە خەڵکێک بدۆزنەوە، لە تۆ نەچن». کابرا گووتی «هەستە بڕۆ خۆت بشۆ، حەمامێک بکە، با هۆشت لای خۆت بێت

و چاوت ڕوون ببینێت». من بە بێزارییەوە هەستام و گووتم «تۆ خەمی چاوی خۆتت بێت... کارت بە چاوی منەوە نەبێت». توڕەییم کەمتر بە هۆی بێ نەزاکەتی و کەم ڕەوشتی کابراوە بوو، بەڵکو زیاتر لەوە بوو کە پێشتر چی شێوە و چی ئەگەرێکم هێنابووە بەرچاوی خۆم هیچیان بەوجۆرە دەرنەچوون کە پێشبینیمکردبوو. لووت زلی وەها هەر نەهاتبووە خەیاڵم. کابرا بێئەوەی توڕە بێت گووتی «پەلەبکە، خەڵکێکی بە پایە و مەقام، لە خوارەوە چاوەڕوانن». من لە حەمامەکەوە بانگمکرد «هێی تۆش قسەت خۆشە. خەڵکی بە پایە و مەقام کاریان بە من چییە؟» . کە خۆم شت و هاتمە دەرەوە، لە ئاوێنەکەدا سەیری خۆمم کرد، دوودڵ بووم ئاخۆ ئەمڕۆ دوا ڕۆژی ژیانمە یاخود نا؟ . هەستم بە بێباکییەکی شیرین دەکرد. دەزانیت بێباکی شیرین چییە، ئەوەیە نە بۆت گرنگ بێت کێ دەکوژێت و نە بۆت گرنگ بێت کێ دەتکوژێت، بەوە دەڵێن بێباکی شیرین. ئەو هەستە بەرهەمی ژیانی ئەم چەند مانگەی ڕابوردوو بوو، بەرهەمی ئەو ئێوارەیەم بوو کە لە مەیدانەکەی باشووری شار، سەیری بۆقبۆقیلەم کرد کەسێک سەردەبڕێت و هیچم نەکرد. ئێستا ئەو بێباکییە شیرینە هەموو بوون و ژیانمی داگیرکردبوو. کابرا لە سەر کورسییەک دانیشتبوو و چاوەڕوانی منی دەکرد. من بە دەرپێیەکی کورتەوە لە ژوورەکەدا ماوەیەک هات و چۆمکرد. دەمویست کابرا بزانێت من هەست بە بوونی ناکەم. دواتر بە کاوەخۆ خۆم گۆڕی و قژم داهێنا. کابرا تەنیا سەیریدەکردم و هیچی نەدەگووت. دوای ئەوەی تەواوبووم، بۆئەوەی بێزاریبکەمَ پرسیم «هێی کابرا ... تۆ خەڵکی دێلاوارییت یان چی؟ بەسەروچاوتدا لەوە دەچێت خەڵکی شاری قژقاژان بێت». هەڵبەت من دەمزانی ئەسڵەن هیچ ناوچەیەک یان شارێک لە دونیادا بوونی نییە ناوی قژقاژان بێت، تەنیا بۆ توڕەکردنی ئەو پرسیارێکی وەهام کرد. کابرا پرسی «قژقاژان کوێیە؟ تۆ دەڵێیت چی ؟». من گووتم «قژقاژان کوێیە؟ ئەو شوێنەیە کە خەڵکی وەک تۆ

لێی لە دایک دەبن. دڵنیام تۆ سەرەتا لە قژقاژان لەدایک بوویت و دوایی هێناویانیت بۆ ئێرە». کابرا پێدەچوو لەوە گێلتر بێت لە گاڵتە تێبگات، هەر لە جێگای خۆی قنج دانیشتبوو و گووتی «نا بابە، من خەڵکی قژقاژان نیم».

نیو سەعات دوای ئەوە لە خوارەوە بووین، لەبەردەم تەلارە کەدا. ئیتر دەبوو دڵنیابم شتەکان گاڵتەنین. سوار ئۆتومبێلێکی نوێیان کردم، ئەم پیاوە خۆی دەرگای پێشەوەی بۆ کردمەوە و سواریکردم، دوو کەسی تر، کە هەردووکیان قاتی خۆڵەمێشی تێریان لە بەردابوو، چاویلکەی ڕەشیان دانابوو، کاسکێتیان لە سەر کردبوو، لە دواوە دانیشتبوون. ئەو پیاوە مۆنەی لە ماڵەوە لەگەڵمدا بوو، سوار ماشێنەکە نەبوو، سڵاوێکی کۆیلانەی بۆ نیشتەجێکانی دواوە کرد و یەکێکی تر لە تەلارەکە هاتە دەرەوە و بۆ شۆفێری لە تەنیشتمەوە سواربوو. من جێگاکەم وابوو نەتوانم باش ئاوڕبدەمەوە و بە وردی لەسەرو سیمای ئەوانی دی وردببمەوە. کەس هیچی نەگووت. باش ئێستێک یەکێکیان پرسی «کاک موراد خۆ خۆت دەزانیت چی دەکەیت؟». من بێئەوەی هیچ بزانم گووتم «بەڵێ ... بەڵێ، ئەی چۆن، حەیفت نەکرد». واهات بە دڵمدا ئەوەی لە دواوە دانیشتووە و پرسیاردەکات، ڕەزمئارای قەرەقازانی خۆیەتی. دەی ڕەزمئارای قەرەقازانی کێ بوو؟ من هەر نەمدەزانی، لە ژیانمدا نەمبینیبوو، هیچ وێنەیەکیشی بەرچاوم نەکەوتبوو. بەڵام لەو ماوەیەی دواییدا کوڕانی باغەوان ناویان زۆر دەهێنا. بۆچی هەستێکی وام تێدا دروستبوو کە ئەوە ڕەزمئارای قەرەقازانییە، نازانم؟ . هەستمکرد شتێکی زۆر گەورە بەڕێوەیە و من قارەمانی یەکەمی ئەو شتە گەورەیەم و ڕەزمئارا وەک کەسێکی نهێنی و ئەفسانەیی دەشێت لە پشتی هەموو شتە گەورەکانەوە بێت، بۆیە دوور نییە خۆی بە دەستی خۆی پاڵەوانی یەکەم بەرەو جێگای ئەو ڕووداوە گەورەیە بەرێت، کە هەڵبەت لەکۆتاییدا قارەمانی یەکەم، وەک هەمیشە، بە

هۆی خەنجەرێکی نامەردانە لە پشتەوە شەهید دەکرێت و وەک پاڵەوانی ناو ئەفسانەکان بەر لەوەی بمرێت دەست بەرزدەکاتەوە و دەڵێت «ئەی ئاسمان...ئەی ئەستێرەکان ... شاهید بن، من بە چ غەدرێک کوژرام». من بیرم لەو شتانە دەکردەوە و دەمویست قاقا پێبکەنم. جار جاریش دەوستام و بە خۆم دەگووت «بەڵێ ئاڵ موراد ئەوە خۆیەتی، ئەوە بێباکی شیرینە، کە دەڵێن بێباکی شیرین هەیە ئەمەی تۆیە، ئێستا دەتبەن یەکێک بکوژێت و دوایی خۆشت وەک توتکە سەگ دەتۆپێنن، کەچی تۆ خەیاڵت لای ئەم شتە پڕوپوچانەیە، بۆ خۆت هەر پێبکەنە، تۆزێکی تر حاڵی گەل و گیپاڵی خۆت دەبینیتەوە». هەڵبەت ئەو کاتەی لە ماشینەکەدا بووم تەنیا بیرم لای ئەوە بوو کە دواتر چۆن دەربازبم و ڕابکەم. ماشینەکە بە هیچ یەکێک لەو ڕێگا و شەقامانەدا نەڕۆیشت کە من پێشبینیمکردبوو، من چەند ڕۆژ بوو هەموو جۆرە ڕێگایەکم هێنابووە خەیاڵی خۆم، کە چی ئێستا ئەم ماشینە مەلعونە بە لارێگایەکدا دەچوو بۆ دێلاواری باکوور، بۆ نزیک ماڵی خۆمان لە غەفاریی، بۆ جێگایەک من هەر لە فیکر و خەیاڵمدا نەبووە. هەر لە ڕێگا بوو بە پرسیارێکی گەورە بۆم: بۆ دەبێت بچین بۆ نزیکی غەفاریی، دەبێت کوێی لێ بێت، دەبێت کێی لێ بێت؟ . خەیاڵم بۆ هیچ نەدەچوو. تەنیا ترسم ئەوە بوو کە ئیشەکە لە چۆڵەوانیدا بێت. بۆ نمونە من بخەنە سەر بانی بینایەک یان قوتابخانەیەکی چۆڵ و لەوێوە نیشانەیەکم بدەنێ بیپێکم، ئەوکات دەربازبوونم مەحاڵ بوو، چونکە دەم و دەست لەویادا کۆتایی بە منیش دەهێنن و ماڵاوایی هەتاهەتاییم لێ دەکەن. لە پێچێکدا ماشینەکە بەرەو ناو بازاڕی غەفاریی دابەزیی. ئەوە نیشانەیەکی ئومێدبەخش بوو بۆ من. تا جێگاکە جەنجاڵ و پڕ جوڵە بێت، ئومێدی دەرچوونم زۆرتر دەبێت. بازاڕی غەفاریی جێگایەکی جەنجاڵە، سەدان دەستگێڕ و وردەواڵە فرۆش لەم ناوەدان، سەدان دوکانی بچوک و کوچە و لا گوزەری تێکەڵاو، خۆشم شارەزاییەکم لەو شوێنە هەیە.

ماشێنەکە لە ناو جەرگەی بازاڕدا دەوەستێت، یەکێک لەوانەی دواوە لەگەڵ مندا لە ماشێنەکە دادەبەزێت، شۆفێرەکە و ئەویدی دانابەزن. من و ڕابەرەکەم لە دەروازەیەکی بچوکەوە دەچینە ژوورێ کە لەسەری نوسراوە «ئوتێلی ئومێد». ناوێکی سەیر و پێکەنیناوی، کە لەگەڵ باری دەروونی مندا نەدەگونجا. من لەو ساتەدا لەو پەڕی نائومێدیی و شکاویدا بووم. هاودەمەکەم زەلامێکی کەتە و بەقیافەتە، پێیگوتم «دوامکەوە». چوار قات بە پلەکەیەکی تەنگ و بۆداردا سەردەکەوین، سەر پلەکەکان بەجۆرێک چڵکن و بۆگرتوون خەریکە دەڕشێمەوە، لە ناوەڕاستی پلەکاندا هەستێکی توندی هێڵنج دامدەگرێت، بەڵام زۆر لە خۆم دەکەم سەربکەوم. سەرپلەکان تەواو بێدەنگن، پێناچێت کەس لە ئوتێلەکەدا بێت. من پێشتر نەمزانیوە ئوتێلی وەها لە غەفاریی هەیە، من یەک یەک دەست لە دەرگای ژوورەکان دەدەم بزانم دەکرێنەوە. تا دەگەینە قاتی چوار هیچ کەس نابینم، دڵم بە خێرایی لێ دەدات، سەیری هەموو کونج و دیوار و دەرگایەک دەکەم، هەوڵدەدەم بە خێرایی لە خەیاڵمدا وێنەیەکی گشتی بۆ هەموو ئوتێلەکە و دەوروبەری بکێشم. لە ژیانمدا سەدان جار لێرەوە تێپەڕیووم و ئەم ئوتێلەم نەبینیوە. ئێستا لە گێلێتی خۆم تووڕەم. تاکە ڕێگای ڕزگاریم ئەوەیە هەوڵبدەم بزانم دەتوانم لە دیوی ئەو دیوەوە دەرباز بم. بە پەلە سێ پلان لەسەری خۆمدا دادەنێم، یەکێکیان : لە کاتی دابەزیندا هەرایەک بنێمەوە و گۆلمەزێک سازبکەم و شانسێک دروستبکەم تا بەتەنیا تێیبتەقێنم و دەرچم. دووەم : سەیربکەم بزانم دەرگای هیچ ژوورێک کراوەیە تا لە کاتی دابەزیندا، بەخێرایی خۆم لە ژورێک توندبکەم و لە پەنجەرەوە خۆم بگەێنمە یەکێک لە شەقامەکانی ئەودیو. سێهەم وریابم و هەر دەرفەتێکی گونجاو بۆ فێڵکردن لەم پیاوە هاتەپێشێ، گێلێتی نەنوێنم و بەکاریبهێنم، تا چەند دەقیقەیەکم دەستبکەوێت و خۆم لێرە دووربخەمەوە. کە گەیشتینە قاتی چوار، هاودەمەکەم دەرگای ژووری چوارسەد و شەشی کردەوە و پێکەوە

چووینە ژووری. ژوورەکە بۆی جگەرە، زبڵی کۆن، تەوالێتی گیراو، فەرشی شێ گرتوو، چەرچەفی چڵکن، تەختەی رزیوی لێدەهات. پێدەچوو بەر لە هاتنی ئێمە کۆمەڵێک خەڵک بۆگەنی پاشەڵی خۆیان لێرەدا بەردابێتەوە و بە دەرکەوتنی ئێمە، هێندەی بلێی یەک و دوو ئەم ناوەیان چۆڵکردبێت. ژوورەکە ژوور نەبوو، بۆ پاشەڕۆیەکی پیسی لێدەهات، وەک هەموو پیسی دیلاوار ڕژابێتە ئەم چەند مەتر چوارگۆشەیەوە. کابرای یاوەرم، کوڕێکی دەموچاو خڕی سپیکەلە بوو، گووتی «دوو قاتی ئوتێلەکەمان بۆ ئەم ئیشە بە کرێ گرتووە». دەستی برد و پەردەکانی لادا و پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوە و هەوایەکی پاک هاتە ژووری. گووتی «وەرە لێرەوە سەیربکە... لێرەوە». کە چوومە بەر پەنجەرەکە سەرەنجی شتێکی تایبەتیم نەدا، سەقفی سەدان سەربان بەرامبەرم بوو. دیمەنەکە جێگای دڵخۆشی نەبوو، دیمەنی بەرمیلە کۆن و کورسیە شکاو و تایەی بێکەڵک چاوی تووشی ڕێشکە و پێشکە دەکرد. خوار پەنجەرەکە بەسەر لا کوچەیەکی تەسک و داخراودا دەیڕوانی کە پێدەچوو شوێنی کۆکردنەوەی زبڵ و پیسی بێت. جێگاکە لەوە بەرزتر بوو بتوانم بازبدەم، نزیکترین سەربان لە ژێرمدا هەشت مەترێک دەبوو. یاوەرەکەم دەستی بۆ خاڵێک ڕاکێشا و گووتی ئەو حەوشەیە دەبینیت، ئەو حەوشەیە کە لە پشتەوە نوسراوە «قوتابخانەی سورەیای سەرەتایی کچان». گووتم «بەڵێ دەیبینم، چۆن نایبینیم ... جا دەبێت تەقە لە چی بکەم، لە قوتابخانەکە یان لە کچانەکە». کابرا زۆر بە خوێن ساردی گووتی «هیچیان... هیچیان... تەقە لە نوسینەکە ناکەیت، تەقە لە زەلام دەکەیت. ئێستا کۆمەڵێکی زۆر دێنە دەرەوە، لە ناو ئەوانەدا یەکێکت پیشاندەدەم، تۆ تەقە لەوە دەکەیت». لە ژوورەکەدا دۆلابێکی کۆن هەبوو، دەرگاکەی کردەوە و تفەنگێکی دووربینداری گەورەی دەرهێنا، تفەنگێکی جوان، جۆرێکی تابڵێی نایاب و ناوازە. تفەنگەکە هێند جوان بوو حەزمدەکرد موڵکی من بێت، تفەنگی ئەوە بوو تەنیا دەستڕاستێکی بلیمەتی وەک من

بیگرێت بە دەستییەوە. من ئەم ماوەیە کە لەگەڵ تفەنگی پێکان و دووربینداردا ئاشناییم پەیداکردبوو، بووبووم بە عاشقی تفەنگی جوان، زۆر حەزم لە گرتن و دەست لێدان و سەیرکردنیان دەکرد. کە تفەنگەکەی دایە دەستم گووتم «وای چ پارچەیەکە، وای چ بووکێکە... ئەمە چییە؟ دەتوانم ئەم تفەنگە بۆ من بێت». دەمزانی پرسیارێکی بێمانا دەکەم، بەڵام ویستم تۆزێک هۆشی پەرتبکەم و کاتم هەبێت دوای نیشانەکە، بەقسەی پوچ کەمێک کات بدزم و هۆشی بەلایەکی دیکەدا بەرم. کابرا یەک فیشەکی لە گیرفانی دەرهێنا و دایە دەستم، گووتی «تەنیا ئەم فیشەکەت هەیە، گەر نیشانەکەت پێکا، ئەوا تفەنگەکە و کۆمەڵێک شتی تریش هی خۆتە. گەر نەتپێکا ...». دەستیکرد بە گیرفانیدا و یەک فیشەکی تری دەرهێنا و خستییە ناو دەمانچەیەکەوە و خستییە سەر سەرم و گووتی «بەمە مێشکت دەتەقێنم». «مێشکت دەتەقێنم» ... ئەو ڕستەیە بوو کە زۆرجار لە کوڕانی باغەوانم بیستبوو. من ئەو دیمەنەم وەک خۆی لە خەیاڵمدا هێنابووە پێش چاوم، بێباکانە دەستیم لادا و بە ناڕەحەتییەوە گووتم «دەستت لابە و کەر مەبە، گەر تۆ وا هەڕەشەم لێ بکەیت، چۆن دەتوانم باش نیشانە بگرمەوە. ئێوە بۆ ئەوەندە سەیرن هیچ حساب بۆ باری دەروونی من ناکەن، لە گیای چ کێوێکتان خواردوە و بە ئاڵفی چ ئاخوورێک گەورە بوون؟ دەی تا تۆ ئەو فیشەکە لەو دەمانچەیە دەرنەهێنیت، قەسەم بە چل و چوار هەزار پێغەمبەر تەقە لە تفەنگی منەوە نایەت». لە ڕاستیدا دەمویست منداڵبازاڕی دەربهێنم و کارێکبکەم کابرا تووشی پەشۆکان بێت و لە ڕووی دەروونییەوە ئاسان بڕیاری بۆ نەدرێت. کابرا بە ناچاری فیشەکەکەی دەرهێنا و خستییەوە گیرفانی. من گووتم «نا عەزیزم، ئەوەندەش گێل نیم، بێنە فیشەکەکەم بدەرێ، کێ دەڵێت ئێستا ناچیتە توالێتەکە و دەمانچەکەت پڕ ناکایتەوە... کێ دەڵێت. دەتەوێت تۆ دەمانچە بخەیتە سەر سەرم و من نیشانەت بۆ بپێکم، بۆ؟ ها بۆ؟ چی بووە؟ کەری کێ تۆپیوە تۆ ئەم

حورمەت و ئیمتیازەت داوەتە خۆت. من ئاڵ موراد باشترین قەناسی دیلاوار دەبێت من نازبکەم یان تۆ ... کابرا، کە هەر نەمدیوی و نازانم کێیت». کابرا چاوەڕوانی ئەوە نەبوو تووشی قسە زلی وەک من بێت. دوایی زانیم هەموو ئەم هێزەی لە سەرەتاوە من سەروکارم لەگەڵیاندا بووە، گروپێکی تایبەتی بنەماڵەی قەرەقازانین کە چەندین ساڵ بۆ ئەم جۆرە کارانە پەروەردەکراون. لەوە دەچوو لەسەر هەموو شتێک مەشقیانکردبێت، ئەوە نەبێت چۆن لەگەڵ کەسانی وەک منیدا ڕەفتاربکەن ... کەسێکی قیرچیسمە کە دەزانێت چۆن تووشی پەشۆکان و سەرلێشێوانیان بکات. دوای هەندێ گفتوگۆ و دەمەقاڵە کابرام ناچارکرد فیشەکەکەم بداتێ. گەرچی دڵنیابووم کابرا فیشەکی تری پێیە، بەڵام هەستمکرد بە جۆرێک لە جۆرەکان متمانەم لێ سەندۆتەوە و ئێستا بە دوودڵییەوە ڕەفتاردەکات. من تفەنگەکەمم لە لێواری پەنجەرەکەدا دامەزراند و نیشانەم لە ناو دەرگای قوتابخانەکە گرتەوە. کابرا لە تەنیشتمەوە بە وردی چاوی بڕیبووە ناو حەوشی قوتابخانەکە. من پرسیم «ئەوەی تەقەی لێدەکەم، ژنە یاخود پیاوە؟». گووتی «هەڵبەت پیاوە... پیاوە. لێت تێکنەچێت». «ئەی بۆ وێنەکەیم پیشان نادەیت، تا بیناسم». کابرا خەریکبوو حەوسەڵەی لەسەردا نەدەما، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت و گووتی «دیارە هۆیەک هەیە کە وێنەکەت پیشان نادەم، هۆیەک هەیە. ئیتر ئەوەندە قسەمەکە». گووتم «باشە ... باش. بەس یەک پرسیاری تر. ئەو کەسەی دەیکوژم پیاوێکی زۆر گرنگە یان نا؟». «گرنگە ... بەڵێ ... بەشی خۆی گرنگە؟». «پیاوێکی خراپە؟ ئەگەر پیاوێکی خراپ نییە، بۆ بیکوژین؟». «بەڵێ پیاوی خراپە. دەیکوژین چونکە پیاوێکی خراپە». من هەناسەیەکم هەڵکێشا و گووتم «شتێکی باش نییە، پیاوێکی وا خراپ خۆی کردوە بە خوێندنگای کچاندا. بۆ هێشتتان بچێت؟ دەبوو بەر لەوەی بڕواتە ژووری بیکوژین. تازە سوودی چییە؟». «ئەهههههها. تۆ چیت، بێدەنگ بە، چاو بنێ بە دووربینەکەوە، دڵنیام

تۆزێکی تر دێنە دەرێ». من گووتم «باشە باش. بەس ڕاستت دەوێت، تا ئێستا نەمبیستوە کەس لە دیلاوار بە گوللەی قەناسە بکوژرێت. گەر خەلکی فێری ئەم ئیشەش ببن باش نییە. ئەوسا کەس بۆ میزکردنیش ناتوانێت سەر لە ژوورَ بێنێتەدەرێ، ئیشەکە دەبێت بە گالتە بازاڕ. پێم خۆش نییە ئەم تفەنگە جوانە بۆ ئەم کارانە بەکاربهێنم. من بوومایە لە جیاتی ئێوە کاری وام نەدەکرد». کابرا کە تەواو سەغلەت بووبوو، گووتی «تۆ ڕاستدەکەیت. منیش کەسێکم وەک تۆ. بەس تۆ ئاگات لە تفەنگەکەت بێت». من گووتم «هێی باشە باش. بەلام پێم بلێ تۆش سەر بە باغەوانەکانیت، تۆش وەک من لە باغەوانەکاندا بوویت؟». ئەو بەدرۆوە گووتی «ئا.. کاکە .. ئا. منیش لە باغەوانەکانم». «دەی کەوایە، دەبێت بزانیت کێ یەکەم فیشەکی باغەوانەکانی تەقاند، دەی پێم بلێ، گەر زیرەک بیت دەزانیت ...». کابرای گوپدار گووتی «نازانم، لە کوێ بزانم. ئاگات لە ئیشەکەت بێت و ئەوەندە قسەی پڕوپوچ مەکە». «من بووم، من یەکەم کەس بووم کە یەکەم فیشەکی باغەوانەکانم تەقاند. هەموو دەزانن، سەی ئەسلان خۆشی دەزانێت». کابرا جگەرەیەکی داگیرساند و گووتی «باشە، دەستخۆش بێت، دەستخۆش بێت. خێرت بنوسێت». من تۆزێک لووتم خوراند و گووتم «دەزانیت، ئەم ماوەیە هێندە کورت و کەمە ئەسلەن قەناسی ناوێت. من بە دەمانچەی ئاسایی هەر شتێکم بوێت لێیدەدەم». کابرا گووتی «وایە، ڕاستە، بەلام چەکی دووربیندار وردترە، قەناسە باشترە. نامانەوێت هەلەی تێدا بکرێت. ئێمە ئیشی خۆمان دەزانین. ئیتر تکایە بێدەنگ بە». من بۆ ماوەی چەند هەناسەیەک بێدەنگ بووم و دواتر پرسیم «تۆ مامۆستا سمکۆ سوهەیب دەناسیت؟». «مامۆستا سمکۆ سوهەیب چ گەوادێکە؟». «نا، مامۆستا سمکۆ سوهەیب زۆر پیاوی چاکە، ئەسلەن گەواد نییە، ڕاستە ژنەکەی زۆر جوانە، ئەویش زۆر دلی پیسە و حەزیش ناکات کەس بچێتە مالیان، بەلام ئەسلەن گەواد نییە. پیاوێکە

دەزانیت زۆر حەزی لە چییە؟». کابرا بە توڕەییەوە شەقێکی لە دیوارەکەی بەردەمی هەڵدا و گووتی «نا... نا، لە کوێوە بزانم مامۆستا گوو، حەزی لە چییە؟». من بە ساردی گووتم «زانیم نازانیت... بە خودا زانیم نازانیت. مامۆستا زۆر حەزی لە پەڕی باڵندە بوو، دەیەوێت باڵندەیەکی گەورە گەورە دروستبکات، پەڕی هەر چی جۆرە تەیری دونیایە کۆیکردۆتەوە، چی تەیرێک لەسەر زەوی هەیە، مامۆستا لە هەر یەکەیان تاقە پەڕێک بە کاردەهێنێت، لە هەموو پەرەکان دواجار باڵندەیەک دروستدەکات، بە ئەندازەی بورجێکی زۆر بەرز ... ».

لەو قسانەدابووین کە بەر دەرکی قوتابخانەکە جموجۆڵێکی تێکەوت. من چاوم نا بە دووربینەکەوە و نیشانەم لە ناو دەرگاکە گرتەوە. کابراکەی تەنیشتم هەناسەبڕکێی پێکەوت، بە پەلە گووتی «پیاوێکی قات لە بەرە، قاتێکی قاوەیی کاڵی لە بەردایە، سمێڵێکی گەورەی زەردی هەیە، قژی بۆ دواوە هەڵداوەتەوە». لەگەڵ قسەکانی ئەودا خەڵکانێکی زۆر پێکەوە لە دەرگای قوتابخانەکە هاتنە دەرێ. قوتابخانەکە دوو دەرگای هەبوو، دەرگایەک لەسەر حەوشی قوتابخانەکە و دەرگایەکیش لەسەر دەرەوە، مەودای نێوان ئەو دوو دەرگایە نزیکی بیست مەتر دەبوو، من دەبوو لە مەودای ئەو بیست مەترەدا بیپێکم. باشتر بوو لە دە مەتری یەکەمدا، گونجاوترین دەرفەت هەڵبژێرم و بیپێکم. لە ناو دووربینەکەمدا دۆزیمەوە، پیاوێک نەبوو کەس نەیناسێت، هەموو دیلاوار لە منداڵییەوە دەیانناسی. بەڵام من لەو ساتەدا وەها خەیاڵم لەسەر دەست و هەناسەی خۆم بوو، ئەوەی بیرم لێ نەدەکردەوە، ئەوەیە ئەو پیاوە بناسمەوە و بزانم کێیە. لە ناو دووربینەکەمدا وەک پیاوێکی سوور و سپی و جوان هاتە پێش چاوم، پێکەنینێکی گەشی هەبوو، چواردەوری بە مامۆستای قوتابخانەکە گیرابوو. ئەو لە ناو دووربینەکەدا پێدەکەنی و منیش لەگەڵیدا پێدەکەنیم، بەجۆرێک نزیک بوو لێمەوە هەستم بە دۆستایەتی دەکرد. ئێستا دوو

هاوڕێ بووین، من ئەوم دەبینی و ئەو منی نەدەبینی ... ئەو ساتەی کە دەستم نادا بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەدا، دەمزانی گوللەیەک ڕەوانەدەکەم کە هەرگیز ناگەڕێتەوە، دڵنیاش نەبووم دەپێکێت یان نا، نەشمدەزانی ئایا بە زیندوویی دەمێنم تا بزانم کاریگەریی گوللەکەم لە سەر مێژووی دیلاوار چییە یان نا... تەقاندم و تەواو ... تەقاندم و بێئەوەی بزانم بۆ؟ بە سەلیقەی دەستڕاستێکی لێزانەوە نا، بەڵکو بە بێباکی یەکێکەوە کە هیچ شتێکی بۆ گرنگ نییە.

# ٤١

لە دەرەوە باران بە توندی دەباریت. من لەسەر جێگاکەم گینگڵ دەدەم و دەمەویت بخەوم. زەهاو لە مێژە خەوتووە و من دەنگی بارانەکە ناهێڵێت بخەوم، چاو دادەخەم و گوێ لە دەنگی باران دەگرم. لە کورتەساتێکدا ئەو مەودا ئەفسانەییەی لە نێوان خەون و ڕاستیدا هەیە تێکەڵ دەبێت. هەم لە دەرەوەی ژوورەکەم باران دەباریت و هەم لە خەومدا، بە جۆرێک نازانم ئەو دەنگەی دیتە گوێم، دەنگی بارانی ناو خەونەکەیە یان دەنگی بارانی ڕاستییە... هەردوو دەنگەکە وەک یەک وان، هەر دوو دەنگەکە یەک ئاواز و یەک خێراییان هەیە. من چاو لێکدەنێم و هێدی هێدی دەڕۆمە ژێر ترسناکترین بارانێک لە ژیانمدا بینیومە. کۆمەڵە هەورێکی زۆر تووڕە دەبینم، هەورەکان وەک هەوری ئاسایی نین، لەو هەورانەن کە بە نیازی پەلامار دەردەکەون، لە سەرەتاوە شێت و ڕقاویی و هێرشبەرن. تەنیا کە ئەو جۆرە هەورانە دەبینم لە بوونی هێزێکی هوشیار و تاریکیِ ناو سروشت دڵنیادەبمەوە، جۆرە هەورێکن کە لە ئاسۆکانەوە دەردەکەون دیارە بە نیازی ترساندن و هەڕەشە دەرکەوتوون، دیارە دەیانەوێت شارێک یان نەتەوەیەک یان دەفەرێکی گەورە بترسێنن، من دەیانبینم دێن، دەیانبینم وەک دڕندەیەک بە سەرماندا دەکشێن، وەک هەوری تر نم نم داناکەن... وەک هەوری تر لە چەند دڵۆپێکەوە دەست پێ ناکەن، بەڵکو وەک ئەوەی

غەزەبێکی خودایی دەربخەن ناڵەیەک دەکەن و بەجۆرێکی یەکسەرە دەگەنە ئەوپەڕی توندی و خێرایی، بە شێوەیەک ئادەمیزادەکان ناتوانن جارێکی تر سەر بەرزبکەنەوە و ببینن بە چ هوروژمێک، بە چ گوژمێکی شەیتانی دەدەن بە زەویدا. من هەورەکان دەبینم... هەوری ناو خەونەکان... هەورێک یەکەمجارە دەپەڕێتە خەونمەوە، هەورێک کە نازانم هەوری ناو خەونی منە یان خەونی کەسێکی ترە... لە ساتێکدا هەستدەکەم لە خەونی خۆم دەرچووم، لە ساتێکدا دەپەڕیمە ناو خەونی زەهاو، دەزانم ئیتر ئەوە من نیم کە سەیری ئەو هەورە شێتانە دەکات، هەورەکان لەسەری ئەودا شێتتر و توندتر و دڕندەترن، وەک جانەوەری تووڕە، وەک دڕندەیەکی نەڕەداری خوارفی، هەموو بە جۆرێکی ترسناک دەنرکێنن، دەنگیان لە دەنگی جانەوەرێک دەچێت خۆی بۆ پەلامار ئامادەبکات، هەورن کە هاتوون زەمین وێرانبکەن، دارستانەکان هەڵکەنن، شارەکان بخنکێنن، هەستدەکەم کە زەهاو کەوتۆتە ژێر ئەو بارانە، هەستدەکەم وردە وردە دەلەرزێت، گوێم لە هەناسەیەتی بەرزدەبێتەوە، لە خەونەکەدا دەنگی دڵی زەهاو دەبیستم، ترسی هەست پێدەکەم، لەرزی لەشی دەگوازرێتەوە بۆ ناو لەشم... لە ناکاو هەورەکان ڕەنگیان دەگۆڕێت، وەک ئەوەی لە پشتەوە، لە چینە باڵاکانی ئاسمانەوە، لە شوێنە دوورەکانی گەردونەوە قەسابخانەیەکی نهێنی بەرپابێت، وەک ئەوەی خوێنێکی نهێنی لە سەقفی مەلەکوتەوە بتکێت و دونیا سوور بکات، هێدی هێدی هەورەکان سووردەبن، بە جۆرێک سووردەبن من تووشی ترس و هەراس و هاوار دەبم، هەموو گیانم دەنیشێتە سەر ئاو، ئاگادار دەبمەوە و لە بەر خۆمەوە وەک فیگرتوو دەڵێم «هەورەکانی دانیال .. هەورەکانی دانیال ... هەورەکانی دانیال». سەراپای جەستەم ئاوە، وەک تەواوی ئەو بارانە مەلعونە لێیدابم، هەموو لەشم وەک یەکێک لەرزوتایەکی کوشندەی گرتبێت دەلەرزێت، دەست بە دەموچاومدا دەهێنم و گوێم لە تەپەی سینەی خۆمە، وەک یەکێکی شێت،

هەندێ قالۆنچەی قیزەون بە جەستەیدا هەڵبگەڕێت چەند هاواری خنكاو لە گەروم دێتەدەرێ... چاو دەكەمەوە و لە تاریكییەكەدا زەهاو دەبینم كە لە جێگای خۆی هەستاوە و وەک منداڵێكی ترساو لە شوێنی خۆی بە دەنگێكی كپ و خەفە دەگری. من خۆم دەخشێنم و دەگەمە لای و باوەشی پیادەكەم و هاواردەكەم «زەهاو، زەهاو، زەهاو». بە دەنگێكی ترساو و گڕ و كپەوە دەڵێت «مستەر هەورەكانم بینییەوە، هەورەكان، بابڕۆین شتی ناخۆش بەڕێوەیە... بابڕۆین». من باوەشی پیادەكەم و دەڵێم «منیش بینیم، هەورە سوورەكان، هەورەكانی دانیال... هەورەكانی ئەو». وەک ئەوەیە گوێی لێ نەبووبێت من گووتم چی، بە دەم ئازار و هەنسكێكەوە كە پڕە لە نیشانەی ترس دەڵێت «بابڕۆین، گەورەم با لێرە بڕۆین. هەر وەختێک ئەو خەونە دەبینم شتی زۆر ناخۆش ڕوودەدات، زۆر ترسناک». من باوەشی پیادەكەم و دەڵێم «بۆ كوێ بڕۆین، بۆ كوێ... شوێنێک نییە بۆی بچین...». دەكشێتەوە دواوە و خۆی دەنووسێنێت بە دیوارەكەوە و هەموو گیانی دەلەرزێت .

ئەوە یەكەمین جار بوو، هەورەكانی دانیال ببینم... هەورەكانی كارەسات ... نیشانەكانی ترسێک كە لە مێژە چۆتە ڕۆحمانەوە. زۆری نەبرد دوای ئەو شەوە سەرەتای كارەساتەكان دەركەوت .

جەنگ لەگەڵ سەرەتای زستاندا دەستی پێكرد، جەنگی ڕاستەقینە. سوپای مەمەد حەسار كە ئاگاداری خۆئامادەكردنی گەورەی ئێمەبوو، بۆئەوەی ڕێگا لە ئامادەكارییەكان بگرێت و پلانی ژەنراڵەكانی دێلاوار هەڵبوەشێنێتەوە، دەستیدایە هێرشێكی پێشوەخت. تەواوی سەركردە سەربازییەكانی دێلاوار لەو بڕوایەدا نەبوون كە دوژمن لە سەرەتای زستاندا پەلاماربدات، هێرشەكان غافڵگیرییەكی تەواو بوون. لەو كاتەوەی ئێمە هاتبووین، بە

دەگمەن و لە دوورەوە نەبێت گوێمان لە دەنگی گوللە نەبووبوو. شەوی پەلامار، سەرەتا دەنگی تەقینەوە و دەستڕێژەکان لە دوورەوە دەهاتن. دەنگەکان گەورەبوون، زرمەی گوللە تۆپ کە لە سەنگەرەکانی سەرووی ئێمەوە دەیدا بە زەویدا، ترسێکی سەرەتایی خستە دڵمانەوە. لە دەستپێکدا دەنگەکان کپ و نەرم دەهاتن، دواتر هێند نزیکبوونەوە دەیانتوانی هەموو خەوتووەکان بە ئاگا بهێننەوە. نزیکی سەعات یەکی شەو بوو کە دەنگی تەقینەوەکان تەواو لە ئێمە نزیک بووەوە، کە من هاتمە دەری نەقیب خۆی گۆڕیبوو و پاڵتۆیەکی بارانیی درێژی لەبەرکردبوو. لەگەڵ سەربازی بێتەلەکەدا قسەیدەکرد، پێدەچوو هەوڵی دروستکردنی پەیوەندی بدەن و بۆیان نەکرێت، نەقیب تورەبوو لەوەی نەیدەزانی چی بووە و لە سەروو خۆشییەوە دەنگێک نییە ڕاستییەکانی بۆ ڕوونبکاتەوە، چەند هەوڵیاندەدا لەگەڵ بنکەکانی تری سوپادا پەیوەندی بگرن، بەڵام هەموو هێڵەکان پچڕابوون و کەس نەدەهاتە سەر خەت. نەقیب منی بانگکرد و گووتی «تکایە ئاگاداری کرێکارەکان بە، من دەبێت بچم بۆ سەر چیا». ئێمە لەسەر شاخ، پێنج کرێکارمان هەبوو، لەگەڵ حەوت سەرباز کە تازە هاتبوون و ئیشیان کاری هەواڵگری بوو. باران بە توندی دەباری، دەنگی تەقە و تەقینەوەکان وچانیان نەدەدا. نەقیب خۆی بە تەواوی چەکەوە و لەگەڵ دوو سەربازدا بەرەو ترۆپکی چیا سەرکەوت. من لە خوارەوە هەموو ئیشکەرەکانم هەستان و ڕێنماییم پێدان تا کەلوپەلی زۆر سووک و پێویستیان کۆبکەنەوە و ئامادە بن. لەرزێک پەڕیبووە گیانمان، هەم ترس و هەم سەرما پێکەوە یارییان بە جەستەمان دەکرد. زۆربەی ئیشکەرەکان دەلەرزین، من بەسەریانەوە دەگەڕام و پەتۆکانم تێوە دەپێچان و د اوام لێدەکردن ئارام بن. هەمووی چەند دەقیقەیەک بوو کە نەقیب بەڕێکەوتبوو کە یەکەمین ناڵەمان لە سەرو خۆمانەوە بیست. شوێنی هۆڵەکان کەنار و بن چیا کەوتبوو، لەوێوە نەماندەتوانی ببینین چی لە سەرەوە ڕوودەدات،

من و زەهاو تکامان لە ئیشکەرەکان کرد دابنیشن و ئارام بگرن و نەچنە دەرێ، تا بڕۆین و هەواڵێک بزانین. هەر دووکمان دوو جلی باشی ژێر بارانمان لەبەرکرد و چووینە گۆشەیەکەوە تا شتێک لە لوتکە و ڕێگاکانی دەوروبەر ببینین. تەقینەوەی یەکەم، چەندەها تەقینەوەی تری بە دوادا هات. شریخەی تۆپ کە دەیدا بە بەرد و تاوێرەکانی چیای سەروماندا لە تەواوی دۆڵ و بنارەکەدا بە جۆرێکی تۆقێنەر دەنگیدەدایەوە. دوای هەر تەقینەوەیەک گوێمان لە چەندین دەستڕێژ دەبوو، وەک ئەوەی یەکێک بە چەکێکی سووک بیەوێت وەلامی ئەو ناڵە و گرمانە بداتەوە کە گوللە تۆپەکان دروستیاندەکرد. زەهاو گووتی « دڵنیام لە مەمەد حەسارەوە پەلاماردەدەن». منیش گووتم «دیارە... شەڕ زووتر لەوە دەستیپێکرد کە نەقیب یوکسەل چاوەڕوانیدەکرد». باران نەیدەهێشت بە ڕوونی دەنگی هەموو ئەو گوللە و تەقینەوانە ببیستین کە شەویان دەهەژاند، لە وچانێکدا هەستمانکرد کە لە سەرەوە و لە ترۆپکدا پێکدادان و شەڕی ڕوو بە ڕوو هەبێت، دەنگی دەستڕێژ لە شوێنی جیا و لە تفەنگی جۆراوجۆرەوە دەهات. من ترسێکی گەورە لە دڵم نیشتبوو. تاکە پرسیارم ئەوە بوو، گەر دوژمن لە چیا بێتەخوارێ، ئێمە چیمان بە سەردێت.

نیوسەعاتی نەبرد کە نەقیب و دوو سەربازەکە بە پەلە هاتنە خوارەوە. تاریکی و باران نەیاندەهێشت بە ڕوونی ڕوخساری نەقیب ببینم، بەلام بە هەناسە و پەشێویی دەنگیدا هەستم بە شلەژانێکی دەروونی گەورە کرد. گووتی «سەربازەکانی مەمەد حەسار گەیشتوونەتە سەر چیا. پەیوەندیمان بە سەرەوە بۆ ناکرێت. چەند هەوڵدەدەین پەیوەندی بگرین و هەواڵێکمان دەستبکەوێت یان فەرمانێک لە سەرکردایەتی سوپاوە وەربگرین، شتێکمان دەستگیرنابێت. تکایە بە پەلە پاسەکان ئامادەبکەن، مەهێڵن هیچ ڕوناکییەک ببینرێت، چرا دەستی و لایت دامەگیرسێن، کەمترین دەنگتان لێوە بێت، دەبێت هەوڵبدەین کرێکارەکان تا خوارەوە بەرین و جێگایەکی ئەمینیان

بۆ بدۆزینەوە. گەر ئێستا کرێکارەکان دوورنەخەینەوە سبەی کە ڕوناک بووەوە ناتوانین و خودا دەزانێت دواتریش چی ڕوودەدات».

دڵنیابووم کە نەقیب خۆشی بە دروستی نازانێت چی دەکات. شتێکی دیاریکراوی لە پلاندا نەبوو، هێند هەبوو ئێستا ئێمە هێزێکی دابڕاوی گەورە بووین کە نەماندەزانی چی لە چوار دەورمان ڕوویداوە. من لە ناو دەنگی ڕێژنەی تەقە و ڕەهێڵەی باراندا بە نەقیبم گووت «گەر ئەمشەو سەری چیایان گرتبێت، لەوانەیە بێنە خوار، بەلام ئەی کرێکار و سەربازەکانمان لەسەر چیا چییان بەسەرهاتووە؟ چۆن ئەوان جێبهێڵین؟». نەقیب گووتی «ئێمە تا نزیکی لوتکە سەرکەوتین. دوو جار وەخت بوو پارچە تۆپ بمانپێکێت. لووتکەکەیان گرتووە و هێزێکی زۆریان لێ بلاوکردۆتەوە. ئێستا بە هەموو جۆرە چەکێک دەوروبەری خۆیان بۆردومان دەکەن، دەترسن هێزێک هەبێت سەربکەوێت و پەلاماریان بداتەوە، دڵنیام کەمێکی دی دەکەونە کوتانی ئەم بنارە. تا زووتر لێرە دووربکەوینەوە درەنگە. لە کەمتر لە چارەکێکی تردا بۆردومانی کەمپەکەش دەست پێدەکات. تەنیا شتی گرنگ ڕزگارکردنی ئەم ئیشکەرانەیە، ئەمانە حیسابی هێزی جەنگاوەریان بۆ ناکرێت، دەبێت تا زووە لێرە دووریان بخەینەوە».

من بێئەوەی بیربکەمەوە گەڕامەوە بۆ ناو ئیشکەرەکان، هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان ئامادەبوون، چراکان خامۆشکران و لەسەر ڕۆشنایی هەندێ لایتی دەستی و مۆمدا هەرچییەک هەبوو کۆمانکردەوە، من لە ژوورەکەی خۆمدا بەستەی دەفتەری خەونەکانم خستە کۆڵە پشتێکی بچوک و دەستی زەهاوم گرت و گووتم «زەهاو گوێبگرە، من بەرپرسم لە تۆ، بەرپرسم لە ژیانت، هەرچییەک بووە دەبێت پێکەوە بین، تکایە لە من دوورمەکەوە». زەهاو سەیرێکی کردم و گووتی «گەورەم من ڕێگا دەزانم، بابڕۆین، من ڕێگا دەزانم. دڵنیام شتی خراپ ڕوودەدات، شتی زۆر خراپ».

هەر دووکمان گومانێکی زۆرمان هەبوو، من بتوانم نە خۆم و نە ئەو لە هیچ مەترسییەک و لە هیچ دوژمنێک بپارێزم، بەلاّم دەبوو باوەڕمان بە یەک بێت. دەستم خستە سەر شانی و گووتم «چۆن دەتوانم لە شەوێکی وەها بێڕەحمدا واز لەم بەدبەختانە بهێنم. چۆن دەتوانم؟ ها بۆ وادەزانی من هێندە نامەردم». زەهاو بە دەنگێکی گریاوە وە گووتی «دەزانم هیچت بۆ ناکرێت، چیت بۆ دەکرێت، هیچ کەس هیچی بۆ ناکرێت». توند دەستیم گرت، نەمدەویست کات بە فیڕۆ بدەم گووتم «گوێبگرە زەهاو دەبێت هەوڵی خۆمان بدەین، دەبێت هەموو هەوڵی خۆمان بدەین، هەستە و خۆت کۆبکەرەوە». لەو ساتەدا خەیاڵم لای هیچ نەبوو هەڵهاتن و دوورکەوتنەوە نەبێت لەم جێگایە کە سێ مانگ بوو بەردەوام ئێشمان تێدادەکرد. زەهاو ویستی کەللەڕەقی پیشانبدات، کاریکەری خەونەکان و ترسی تەقینەوەکان و وێنە تاریکەکانی ناو یادەوەریی خۆی تەواو ترساندبوویان، گووتی «ئەو بارانەی ئەم شەو دەبارێت، هەمان بارانی ناو خەونەکانمە». من توند دەستم گرت و لەگەڵ خۆمدا بردمە دەرێ، بێئەوەی بوارێک بۆ قسە و نارەزایی بهێڵمەوە. بە پەلە و بێدەنگ، لە ناو باران و ڕەهێڵەیەکی بێوێنەدا کە هەمووومانی تا سەر ئێسقان تەڕکردبوو، چووینە ناو پاسەکان، نەقیب بڕیاریدا خۆی لە پێشمانەوە بڕوات. ترس، لەرزی خستبووە جەستەی زۆبەمان، میرئەوداڵ نەبێت کە کپ و بێباک دەردەکەوت، پێدەچوو درێژەدان بە خەوی لە هەڵهاتن لە مەرگ بۆ گرنگتر بێت. مام دەروێشی شۆفێر لە گشتمان زیاتر دەلەرزی. یەک دووانێک لە ئێشکەرەکان بەر لەوەی سوار پاسەکە ببن، سەرسەختیان دەنواند و داوای چەکیان دەکرد تا شەڕی دوژمن بکەن، بە دەنگی بەرز ئازایەتیان دەردەخست و جوامێریان دەردەهێنا و دەیانگووت «لێگەڕێن بابکوژرێین و دوژمن بزانێت دێلاوار جەنگاوەری هەیە». من کەمێک تووڕە و نائارام گووتم «هەڵبەت گەر چەک هەبووایە شەڕماندەکرد. بەلاّم ئەمە هێرشێکی کتوپڕە، نە چەکمان هەیە، نە دەزانین

چی ڕوویداوە. پەیوەندی بێتەلەکانمان لەگەڵ سەرکردایەتیدا پچڕاوە. ئەمە کارێکی خۆپاراستنە تا تێدەگەین چی ڕوویداوە و دەبێت چی بکەین».
هەموو لە پاسەکەدا دانیشتبووین کە یەکەم گوللە هاوەن لە شوێنی کۆنی خێوەتگاکەماندا تەقییەوە. ناڵەکەی وەها گەورە بوو پاسەکەی لەراندەوە. هەموو دڵمان بە جۆرێکی نائاسایی و خێرا لێیدەدا، ناو پاسەکە تاریک بوو، هیچ جۆرە سەرچاوەیەکی ڕوناکی نەبوو، بەڵام هەستمدەکرد دەتوانم لە فەزای گشتی پاسەکەدا، لەو بێدەنگییە قورسەی کە باڵی بەسەرماندا کێشاوە، قووڵایی ترسەکان بخوێنمەوە، ترس تەنیا لە ناو چاو و لەسەر ڕوخسار و لە ڕوانیندا ناخوێنرێتەوە، بەڵکو لە هەناسە و بێدەنگی و جوڵەی جەستەی مرۆڤەکانیشدا دەردەکەوێتەوە. بەر لەوەی پاسەکە بکەوێتە جوڵە، دوو هاوەنی تر لە بەردەلانەکانی بان ئەو جێگایەی خەندەکمان لێدەدا کەوت و ڕوناکی تەقینەوەکانیان شەوی ڕووناککردەوە. پاسەکان بە خێرایی کەوتنە ڕێ، ئێمە دوای خێرایی جیپەکەی نەقیب کەوتبووین، من لە پێشەوە نزیکی مام دەروێشی شۆفێر دانیشتبووم، دەمبینی کە خێرایی ئێمە پابەندی خێرایی جیپەکەی نەقیبە کە لە هەندێ شوێندا خێرا و لە هەندێ شوێنی تردا بە کاوە خۆ دەڕۆیشت. زۆر نەبوو کەوتبووینە ڕێ کە لە ناکاو جیپەکە وەستا، من لە شوشەی باراناوی پاسەکەوە تارمایی نەقیبم بینی دابەزیی، لە تاریکیدا هەستم بە نزیکبوونەوەی تارماییەکی تر کرد. وەک ئەوە بوو ڕێگاکە کۆمەڵێک کەس و سەربازی تری لەسەر بێت. بۆ ئێستێک دوودڵ بووم، بەڵام دواجار بڕیارمدا دابەزم. دابەزیم و بەرەو لای جیپەکەی نەقیب ڕۆیشتم، باران دڕندانەتر لە پێشوو دەباری، لە بەر خوڕەی ئاو نەمدەتوانی باش گوێم لە هیچ بێت. تارمایی نەقیبم بینی لەگەڵ دوو سەربازی پاسەواندا بەرەو ناو تاریکی دەڕۆن و منیش بێئەوەی بزانم بۆ، دوایانکەوتم. گوێم لێ بوو یەکێک بە نەقیبی گووت «بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە. سوپای مەمەد حەسار پەرپوتەوە و سەرجادەی دیلاواریان

گرتووه». دڵم بە جۆرێكی توند لێدەدا، فشاری خوێنم تا دێت دەچێتە باڵا، بەڵام بۆ ئەوەی بزانم چییە، بەرەو لای نەقیب و دەنگەكە چووم و پرسیم «خەبەر چییە؟ بۆ وەستاوین، كەی ئێرە جێگای وەستانە؟».
نەقیب قسەی لەگەڵ چەند سەربازێكدا دەكرد كە هەموو گیانیان لە ئاو هەڵكشابوو، پۆستەڵەكانیان هەمووی قوڕ و لیتە بوو، لە سەرمادا دەلەرزین. گووتیان «ئێمە سەربازی پەرتەوازەی فەسیلی هەژدەین، شەش ڕۆژە بۆ پاسەوانیكردن هاتووینە ئەم ناوچەیە، شارەزایمان لەم ناوەدا هەر نییە. چوار سەعات لە مەوبەر هێزێكی گەورە پەلاماریان داین، هێزێكی زۆر گەورەیە كە لە پشتی ئێمەوە پەڕیونەتەوە و هەم شەقامی گشتیان گرتووە و لەو دیویشەوە پێچیانكردۆتەوە و پشتیان لە تەواوی هێزەكەمان گرتووە». سەربازەكان لەوانە بوون كە شانسیان هێنابوو و بە هۆی باران و تاریكییەوە توانیبوویان دەرچن و نەكەونە دیلی سوپای مەمەد حەسار كە یەكێكیان دەیگووت بە چاوی خۆی بینیوییەتی، دەم و دەست، هەر لە جێدا هەموو دیلەكانیان سەربڕیوە. بە قسەی سەربازەكان و بە پێی دوا قسەیەک كە لە ئەفسەری هێزەكەی خۆیان بیستبوویان، یەكەمین بنكەی سەركردایەتی سوپا، واتە دوورترین خاڵێک كە دەبوو دوژمن دەستی پێدا بگات، لەوێوە دەستیان پێكردبوو، هەم بۆ ئەوەی شەقامی سەرەكی بپچڕن و هەم بۆئەوەی هێزەكانی خۆیان بە خێرایی و ئاسانی بپەڕێننەوە. نەقیب دەستەپاچە و بێچارە دەینواند، گووتی «ئێستا دەزانم چییان كردوە، دەزانم چییان كردوە. هەر دوو بنكەی سەرەكی سەركردایەتیان لە باشوور و باكوور گرتووە، ناوەندی پەیوەندی و سەنتەری سەرەكیان خستۆتە ژێر دەستی خۆیان تا پەیوەندی نێوان هەموو هێزەكان بپچڕێنن، دوو هێزی كۆماندووی لێزانیان بە خێرایی لە ڕاست و چەپەوە جوڵاندوە بۆ ئەوەی گەمارۆی تەواوی ئەم ناوچەیە بدەن و لەو بەینەدا بە كۆمەڵێک هێرشی ورد و كورت، سەربازەكانی ئێمەیان بە درێژایی چیا دەركردوە و ئێستا

ئێمە لە گەمارۆیەکی تەواو داین». قسەکانی نەقیب ترسناک بوون، بەڵام پێدەچوو ڕاست بن. من سەیرێکی نەقیبم کرد و گووتم «ئەی ئێستا چی بکەین؟». نەقیب لەو سەربازانە نەبوو، بیەوێت لە یەکەم شەوی جەنگدا تیابچێت، ساڵەهای ساڵ بوو، خەونی بە مەیدانی کوشتار و گۆڕەپانی جەنگەوە بینیبوو، ئێستا کەوتبووە دۆخێکەوە هەم ژیانی خۆی و هەم ژیانی فەسیلەکی لە مەترسیدا بوون. ئەو لەوانە بوو کە ئاسان خۆیان نادەنە دەست دوژمن، دڵنیابووم گەر بزانێت دەکەوێتە دەست ئەوان، خۆکوشتن هەڵدەبژێرێت تا دیلی. بۆ چرکەیەک سەیرمکرد و زۆر دڵم بۆی سووتا، ئەفسەرێکی جەنگاوەر، بەڵام بێهێز، بێچەک، لەگەڵ کۆمەڵێک کرێکاردا کە هیچیان ئەزموونی شەڕیان نییە. ئاخۆ دەبێت لە مێژوودا چەندجار و چەند ئەفسەری کارامە، بە هۆی هەلومەرجی وا نادادپەروەر و سەختەوە شکستیان خواردبێت و دونیا لە بیریکردبن. نەقیب لە بەر بارانەکە وەستا بوو، هەموو هۆش و خەیاڵی خۆی کۆکردبووەوە، چی بکات. پیاوێکی بێچارە کە بوو بوو بە داوێکی چنراوەوە... دواجار گووتی «لێرەوە بۆ بنکەی باشوور نزیکی پێنج کیلۆمەترە، دەتوانین تا سێ کیلۆمەتری دیکە سوود لە پاسەکان ببینین، ڕێگایەکی باریک هەیە، دەکەوێتە پشتی بنکەی سەرەکییەوە، باوەڕناکەم هێزەکانی مەمەد حەسار ئەو تولە ڕێگایەیان کۆنترۆڵکردبێت، ئەوان ئێستا سەرقاڵی خۆجێگیرکردن و خۆپاراستنن، ئێمە ناتوانین بچینەوە دوا، تا بۆ دواوە بڕۆین ئەگەری ئەوەی بکەوینە تەپکەی ئەوانەوە زۆرترە. هەر گەڕانەوەیەک بۆ دواوە مەترسیدارە... تەنیا شانسێک مابێت ئەوەیە لە درزێکەوە گەمارۆکە ببڕین. تا شەوە و تا بارانە و تا هێزەکانی ئەوان خۆیان نەگرتووە، دەتوانین ئەوە بکەین، ئەوە نزیکترین درزێکە بکرێت بەکاربیهێنین. گەر لێرەوە بەم چیایانەی بەردەمماندا سەرکەوین هەم کاتێکی زۆرمان دەڕوات، هەم نازانم تا ڕۆژ دەبێتەوە دەگەینە کوێ، ئەو درزە تاکە شانسی ئێمەیە، لە بەر

بەیانەوە ئیتر هیوامان نامێنێت، یان کوژراوین یاخود دیلین، بەڵام گەر ئەمشەو دەست و برد بکەین دەتوانین دەرچین... بە کیلۆمەترێک بچینە پشت بنکەی سەرەکی، ئیدی لەوێوە بە ئاسانی دەگەینەوە بە هێزەکانمان».

لە ڕاستیدا من شتێکم لەسەر جوگرافیای شوێنەکە نەدەزانی، گەر بشمزانیایە نەمدەتوانی زۆر قسەی تێدابکەم، مەسەلەکە پەیوەندی بە چارەنوسی زیاتر لە سەد و پازدە کەسەوە هەبوو. پێدەچوو نەقیب لەسەر هەق بێت، ئێمە شانسێکی ئەوتۆمان بۆ نەجات نەبوو، هەورەکانیش وەک هەوری ناو خەونەکە تا دەهات تاریک و دڕندە و خوڕ دەبارین. من هێندەی لە فیکری پەیوەندی نێوان خەون و حەقیقەتی ئەم شەوەدا بووم، لە فیکری ڕزگاریدا نەبووم، بە جۆرێک لە جۆرەکان هەستمدەکرد چارەنووسی هەمووومان پێکەوە گرێدراوە، گەر بمرین هەموو پێکەوە دەمرین و گەر بگیرێین هەموو پێکەوە دەگیرێین. لە ناخمدا هەستێکی نهێنی و شاردراوە هەبوو کە دەبێت متمانەم بە نەقیب بێت. گەرچی دۆخەکە زۆر سەخت بوو، بەڵام نەقیب دەیتوانی هێمن و ورد بیربکاتەوە. ئێستا هەستمکرد بارانەکە لە قازانجی ئێمەیە، دەنگ و خوڕەی باران بەسەر هەموو دەنگێکی تری شەودا زاڵ بوو، پاسەکان دەیانتوانی تا ماوەیەک بە ناخی شەودا بڕۆن و دەنگیان نەگاتە دوور، دەبوو دۆعابکەین کە تا دەگەینە شوێنی خۆمان باران هەر توند بێت و خۆش نەکاتەوە.

چارەکێکی دی بە پاسەکان دەڕۆین، ترسناکترین چارەکە سەعاتێکە لە ژیانمدا، دڵنیایین سەربازەکانی مەمەدحەسار لە هەموو لایەکەوە، لە چواردەوری ئەم ڕێگایە لە خۆ ڕێکخستنێکی گەورەدان بۆ گەمارۆدان و خنکاندنی هەر دیلاوارییەک لەم حەوزەدا بێت. خۆشبەختین کە لە زۆر جێگادا شەقامەکە بە جۆرێک شاخاوییە، بە زەحمەت هیچ هێزێک بتوانێت لە بەرزاییەوە هەموو بەشەکانی ببینێت و بیخاتە بن ڕکێفییەوە.

پێناچێت هێزەکانی دوژمن توانیبێتیان تەواوی ئەو بازنەیە دروستبکەن کە مەبەستیان بووە، بە هێمنی و سەلامەتی لە دوورییەکی دیاریکراوەوە هەموو دادەبەزین. نەقیب تا نزیکییەکی بەرچاو لە کەمپی یەکەم نزیکدەبێتەوە. یەک یەک فەسیلەکە ئاگاداردەکەمەوە کە دەبێت تەواو بێدەنگ بن. نەقیب خۆی لە پێشەوە دەڕوات، ئەو تەنیا کەسە کە دەزانێت بە کوێدا بمانبات، بە من دەڵێت، دەبێت من لە کلکی کاروانەکەدا بم، دوا کەس بم، دەبێت هەر کەسە و بە فاسیلەی دە هەنگاو لە دوای ئەویترەوە بجوڵێت. بە کرێکارەکان دەڵێم، هەر کەسێکمان هەڵەبکات ژیانی هەموومان دەکەوێتە مەترسییەوە، لە هیچ حاڵەتێکدا نابێت، هیچ کەس، هیچ جۆرە دەنگێکی لێوە بێت. هەموو ترساو و دوودڵ و پەریشانن، هەندێکیان دەلەرزن، نازانم بە کاریگەری سەرمایە یاخود ترس، هەموو باران بە گیانماندا دەچۆڕێت، موشەماکانی بەرمان ناتوانن دەموچاومان بپارێزن، تا دێت باران توندتر و قامچی ئاساتر لێمان دەدات. نەقیب خۆی سەری کاروانەکە دەگرێت و سەربازەکانی لە دواوە دێن، نەقیب هێزەکە وا ڕێکدەخات هەر چەند کرێکارێک و سەربازێک بکەوێتە نێوانیان، هەم بۆ پاراستن و هەم بۆ دابەشبوون و هەم بۆ کۆمەک گەیاندن لە کاتی پێویستدا. هەندێکیان بە ئەندازەیەک دەترسن، گومانم هەیە هەموو شتێک ڕاست و ڕێک و ڕەوان بڕوات. گوێمان لە دەنگی سەربازەکانی دوژمنە لە ناو باران و تاریکیدا بانگی یەکتری دەکەن، لە پاڵ کەمپەکەدا کەندرێکی کەمێک قووڵ هەیە کە پردێکی دارینی لەسەرە، سەربازەکانی مەمەد حەسار دەبینین کە هەندێکیان بێترس لایتی دەستی بەکاردەهێنن، ئێمە دەبێت بە تولە ڕێگایەکدا تێپەڕین کە پەنجا مەترێک لە پردەکەوە دوورە. ڕێگاکە لاڕێییەکی فەرامۆشکراوە کە پێدەچێت کۆن گوندنشینەکان بۆ مەبەستی سەرکەوتن بەرەو ڕەزەکانی دامێنی چیا بەکاریانهێنابێت. پەڕینەوە دەبێت بە جۆرێک بێت سەربازەکانی دوژمن هیچ نەبیستن. من و زەهاو لە دوای دواوە

دەڕۆین. ڕێگاکە زۆر باریکە، بارانیش زەوییەکەی وەها خزکردوە کە هەر چەند هەنگاوێک دەڕۆین و دەکەوین، گەر باران بوەستێت بە دڵنیاییەوە گوێیان لە دەنگی پێ و خشەی موشەماکانمان دەبێت. بەڵام دەنگی باران و دەنگی تۆپبارانی بەردەوام کەشێکی وایان ڕەخساندوە بتوانین لە پشتی هێزەکانی دوژمنەوە بپەڕینەوە. نزیکی دە دەقیقە بە ڕێگادا دەڕۆین و لە ناکاو فەسیلەکە لە پێشەنگەوە دەوەستێت، هەستدەکەم ئیتر گەیشتوینەتە جێگای خەتەر، لێرەوە دەبێت هەمووان ئارام بن، لێرەدا ژیانی هەر کەسێک ئیدی وەک ئەڵقە لە ژیانی ئەوانی تر هەڵکێشراوە... لەسەرەخۆ کاروانەکە دەکەوێتەوە جوڵە، دڵنیام ئێستا یەک یەک لە پێشەوە دەپەڕنەوە. من لە جێگای خۆمەوە تارمایی هەموو کامپەکە دەبینم، لە دوو ژووردا ڕۆشناییەکی کەم دەبینم، پێدەچێت ژووری ئەفسەرەکان بێت، هاتوچۆیەکی کەم لە ژوورەکاندا دیارە. بەڵام دەرەوە زۆر تاریکە، دڵنیام ئەو هێزانەی شەو پەڕیوونەتەوە سەرجەمی پیادەن، پێ ناچێت هێشتا توانیبێتیان کەلوپەلی قورس بگوازنەوە. تۆپەکانیان لە دوورەوە ئەم ناوە دەکوتێ و سەرپۆشێکی ئاگر بۆ جەنگاوەران دابیندەکات. لەگەڵ دەنگی بارانەکەشدا هەندێ جار دەنگی هاوارێکی کپ و خنکاو لە دوورەوە دێت، وەک یەکێک هاواربکات، یان دەنگێکی دوور بە نائومێدی شەو شەقبکات. وردە وردە و بەخاوی دەچینە پێشێ. لە ناو تاریکیدا پتر تارمایی پردەکەم لە بەرچاو ڕوون دەبێتەوە. زەهاو لە پێش منەوە دەڕوات، هەموو دڵ و نیگام لەلایەتی، تا دێت ئێمە زیاتر لە پردەکە نزیک دەبینەوە. دڵنیام ئێستا بەشێکی زۆری کرێکارەکان پەڕیونەتەوە. بۆ چەند چرکەیەکی کورت، خۆشباوەڕ و گەمژە هەستەکەم هەموو شتێک بە ئاسانی و سەلامەتی دەڕوات، ئێمە تەواو لە تێپەڕاندنی پردەکە و گوزەر بۆ پشتی هێزەکانی دوژمن نزیک بووینەتەوە، نازانم چەند کەس لە پێشدەممدا ماون، بەڵام دڵنیام لە سێ تا چوار کەس زیاتر نین. هەموو هەستەوەرەکانم کۆدەکەمەوە تا وریایانە لەم

جێگا ترسناکە بگوزەرێین، هێشتا پەنجا مەترێکمان بۆ ئاستی پردەکە ماوە. لەویادا بۆ یەکەم جار دەستڕێژێکی ڕەق و درێژ و ترسناک ڕامدەچڵەکێنێت، گوێم لە پێکراوێکە پڕ بە شەو هاواردەکات. لەگەڵ دەنگی تەقەکاندا هاوار لەوانەی پێشەوە دەکەم بگەڕێنەوە، لە سەر پردەکەوە تارمایی سەرباز دەبینم کە تەقەدەکەن و بە ڕاکردن بەرەو لای ئێمە دێن. من بە هەموو هێزم جلەکانی زەهاو لە دواوە دەگرم و ڕایدەکێشم، هەر دووکمان خۆمان دەدەین بە زەویدا و گوللە وەک باران بەرەو ڕوومان دێت. چاوم لێیە ئەوانی پێشەوە بە پرتاو باز بەسەر بریندارەکاندا دەدەن و بۆ پێشەوە دەڕۆن، گوێم لە ناڵەی پێکانە، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە خۆم و زەهاو بە خێرایی بەرەو خوار تلدەبینەوە، تەنیشت ڕێگاکە کەندرێکی پڕ بەردە، لەگەڵ تلەکانمدا بەردە تیژەکان دەچن بە لەشمدا و توند ئازارم دەدەن، سەرم لە چوکلی هەندێ بەردی تیژ دەدات. گوێم لە دەنگی زەهاوە کە لەگەڵ مندا بۆ ناو بنی کەندرەکە تلدەبێتەوە، گوێم لە دەنگی گوللە و دەستڕێژە کە تەواوی لاپاڵ و ناو کەندرەکە دەبێژێت. دەیەها تفەنگ کوێرانە تەقەدەکەن و دۆڵەکە دەبێژن. تاوی بارانەکە بە هێزتر دەبێت، زەهاو لەگەڵ تلەکانیدا دەڵێت «من گووتم.. من گووتم ... من گووتم». کە دەگەمە بنی کەندرەکە لە بەر لێزمەی باران ناتوانم باش چاوم بکەمەوە، بەڵام زەهاو دەستم دەگرێت و بە هەموو توانای خۆی ڕامدەکێشێت، گوێم لە هەناسە ترساوەکانێتی، بە توندی دەستم دەگرێت و هەڵمدەستێنێ، دەکەومە سەر ئەژنۆ، هەر دووکمان بە دەست و لەسەر ئەژنۆ وەک دوو ئاژەڵی ترساو بەرەو دواوە هەڵدێین، بێوچاو و بە خێرایی و بە هەناسەبڕکێ هەڵدێین. گوێم لە هەندێ دەستڕێژی بەرامبەرە، دڵنیام سەربازەکانی خۆمان بۆ ترساندن و دورخستنەوەی حەسارییەکان بە چڕی تەقە لەسەر پردەکە دەکەن. ئاوڕدەدەمەوە و ئاگربارانی یەکدی دەبینم، لە هەموو فەسیلەکەدا بەس من و زەهاو بەرەو دوا کشاوینەتەوە و ناتوانین جارێکی تر لە بەردەم

ئەو پردەوە برۆین. دەزانم گەڕانەوە و یەکگرتنەوە لەگەڵ فەسیلەکەدا کاری نەکردەیە. زەهاو وەک پشیلەیەکی ترساو وایە، لەشسوک و بازدار لە پێشمەوە، وەک کەرویشکێک لە تانژی هەڵبێت ڕادەکات، هەر دووکمان وەک شێت لەسەر چوار چنگۆڵە بە ناو لیتە و بەرد و ئاوەڕۆی ساردی باراندا بێئەوەی بزانین دەچین بۆ کوێ، بەرەو دوا دەگەڕێینەوە. گوێمان لە تەقەیە... گوێمان لە هاوارە ... گوێمان لە بارانە ... گوێمان لە هەورە ... گوێمان لە دەنگی بەریەککەوتنی ئێسکی خۆمانە لەگەڵ بەردەکاندا ... دواجاریش گوێم لە گریانە، گریانی خۆم کە وەک ئاژەڵێکی ترساو لەسەر چنگۆڵان هەڵدێم و لە ژێر باراندا دەگریم.

# ٤٢

ئاڵ موراد بۆی گێڕامەوە

لەگەڵ تەقاندنی فیشەکەکەدا، یەکسەر تفەنگەکەم فڕێدا و بەپڕتاو وەک شێت، بە دوا خێراییەک کە خودا ببیەخشێت بە لەشێکی سووک و بچوکی وەک لەشی من، وەک باڵندەیەکی چکۆلەی فڕیو تا هێزم تێدا بوو ڕامکرد و بەسەر پلەکاندا وەک با بەرەو خوار گڤەمکرد. ڕاکردنم وەها خێرابوو، نە پاسەوانەکەی یاوەرم، نە دوو سەرنشینی ماشێنەکەی خوارەوە کە ئێستا ڕووی ماشێنەکەیان وەرگێڕابوو و لەبەری ئەوبەری شەقامەکە چاوەڕوان بوون، جوڵەیان بۆ کرا... هیچ یەک لەوان پێشبینی ڕاکردنی منیان نەکردبوو، عەقڵیان بۆ ئەوە نەچووبوو من وەها بیژیی و دووربین بم. دیاربوو بێخەیاڵ دانیشتوون و ئامادەگییان بۆ کردارێکی وەک ئەوەی من نەکردوە. من بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ماشێنەکەوە، وەک با خۆم کرد بە ناو ڕێبوارانداو لە دووری دووسەد مەتر، بە پلەکەیەکی کەمێک درێژدا چوومە ناو قەیسەرییەکانی غەفارییەوە کە سەدان کەس تێیدا بەیەکدا دەچوون و سەودا و مامەڵەیان دەکرد. من لە جێگایەکدا کە دڵنیابووم کەسم بەدواوە نییە، خاومکردەوە و کەوتمە سەر ڕۆیشتنێکی ئاسایی، لە یەکێک لە دەروازەکانی قەیسەرییەکەوە چوومەدەرێ و خۆمکرد بە گوزەری قەساب و سەروپێ فرۆشەکاندا. سەد مەترێکم دەویست بۆ

ئەوەی بگەمە مەیدانێکی بچوک کە تێیدا تاکسییەکان دەوەستان. لەو سەد مەترەدا هەستم بە شڵەژانێکی زۆری ناو بازارکرد، گوێم لە دەنگی هەندێ تەقە بوو، بینیم ماشێنەکان بە خێراییەکی شێتانە لێدەخوڕن، خەڵک زۆری بە پرتاو سوار تاکسی دەبن. دەبوو منیش دەست و برد بکەم ... بە ڕاکردن خۆم گەیاندە مەیدانەکە، لەوێدا ژمارەیەک لە باغەوانەکانم بینی بە خۆیان و پەرۆ وەنەوشەییەکانی ناوچاوانیانەوە ڕادەکەن و خەریکن بە سەر چوار ڕێگاکەدا دابەشدەبن. من گەیشتمە تاکسییەک و خۆم تێ فڕێدا و بە کابرام گووت، خێرا بە دەوری مەیدانەکەدا بسوڕێوە و بە ئاڕاستەی باشوور لێخوڕە. شۆفێرەکەم پیاوێکی خێزانداری بێوەی بوو لە هیچی نەپرسی و پارەیەکی زۆریشی نەسەند. من لە دووری دووسەد مەتر، لە ماڵی «مامەی دایە» دابەزیم و سەرم داخست و بێئەوەی بهێڵم هیچ کەس لە ڕوخسارم وردببێتەوە، خۆم کرد بە لای «سەی فەتحولا» دا کە وەک هەمیشە لەسەر بەرماڵەکەی نوێژی دەخوێند. سەعاتێک دوای ئەوە لە ڕێگای ڕادیۆکەی مامەی دایەوە زانیم کە ئەمڕۆ دەستێکی چەپەڵ و دوژمنکار، مرۆڤێکی خوێنمژ و لە ئینسانییەت بەدەر، بە گوللەیەکی بێڕەحم کۆتایی بە ژیانی فەرمانداری دیلاوار «عەبدولسەلامی ماروفی» هێناوە، دوای ئەوەی بە مەبەستی بەسەرکردنەوە و هاندانی قوتابییان، بۆ ئاگاداری لە پێداویستی هاوڵاتیان، لەسەردانێکی ڕەسمیدا بووە بۆ قوتابخانەی سورەیای کچان لە گەڕەکی غەفاریی. بە پێی ڕادیۆکە کۆنفدراسیۆنی بنەماڵەکانی دیلاوار لە کۆبوونەوەیەکی پەلەدا بوون، بۆ دانانی ڕێوشوێنی پێویست بۆ پاراستنی ئارامی و ئاسایش و ڕێگرتن لە هەڵهاتنی تاوانباران. بۆ ئەو مەبەستەش حاکمی عەسکەری یاسینی قەرەقازانی فەرمانی بە سوپای دیلاوار و باغەوانەکانی دیلاوار دابوو تەواوی شارەکە بخەنە ژێر چاودێری وردەوە و هەموو ڕێگایەکی هاتن و چوون ببەستن. لەویادا زانیم کە گوللەکەم پێکاوێتی... دواتریش بۆم دەرکەوت کە فیشەکەکەم ڕێک دابووی لە تەختی

ناوچاوانی فەرماندار. دەبێت بڵێم کە پێکانم بۆ ئەو پیاوە تەنیا خواستێکی میکانیکی و ئارەزوویەکی نەخۆشانە بوو لە لایەن دەست ڕاستێکەوە تا هیچ گوللەیەکی بە هەدەر نەچێت و هیچ نیشانەیەک لە تیری دەرباز نەبێت. من هیچ شتێکم بەرامبەر فەرماندار نەبوو، بەڵام نیشانەشکێنێک بووم کە دەبوو نیشانەم لە هەر چییەک گرتەوە لێیدەم، هەتا گەر ئەو نیشانەیە سەری فەرمانداریش بێت... من ئاڵ موراد، کە چەند مانگ لە مەوپێش لە کەمپی پەروەردە و مەشق گاڵتەجاڕی هاوڕێکانم بووم ، ئێستا بکوژی فەرماندار‌بووم، ترسناکترین پیاوکوژی دیلاوار بووم، ئەوە بووم کە تەواوی شار بە دوامدا دەگەڕا. منیش لای مامەی دایە، لەسەر کورسییەکی نایلۆن دانیشتبووم و جامێکم خستبووە سەر کۆشم و غەمگین و پەشیمان نۆک و مێووژم دەخوارد.

تەنیا کەسێک بە خەیاڵمدا هات داوای کۆمەکی لێبکەم «ئەرسەلانی موفتی» بوو. گەر ئەو یارمەتی نەدامایە هیچ کەسم نەبوو لە دونیادا یارمەتیم بدات. بەلام «ئەرسەلانی موفتی» نە هاوڕێم بوو، نە کەسم بوو، نە دۆستێکی نزیکم بوو... تەنیا شتێک دەمزانی ئەوەیە کە ڕقی لە سەی ئەسلانە، ڕقی لە باغەوانەکانە. گەر هەموو شتێکم بە وردی بۆ باسبکردایە ئومێدێکی لاوازم هەبوو یارمەتیم بدات، گەر یارمەتیشی نەدابام، دڵنیابووم بە گرتی نەدەدام، لەوە دڵنیابووم. دەبوو لە دیلاوار کەسێک هەبێت، تاقمێک هەبێت کۆمەک بە کەسانی وەک من بکەن. ئەو شەوە و سێ شەوی دواتریش نەموێرا بچمەدەرێ و هیچ پەیوەندییەکم بە دەرەوە نەکرد. لە هەواڵەکانەوە بیستم کە قەرەقازانییەکان بە کۆمەکی سوپای باغەوانەکان دەستیانگرتووە بەسەر هەموو پۆستە مەدەنییەکاندا، بەڕێوەبەری پۆلیس تاهیری وزیری و کوڕەکەی گیراون، سەی ئەسلان وەک بەڕیوەبەری ئیدارەیەکی کاتی دەسەلاتێکی زۆری وەرگرتووە تا دیلاوار بۆ قۆناغێکی نوێ ئامادەبکات. باغەوانەکان بە سەدان لە هەموو کوچە و شەقامێکدا بلاوبووبوونەوە، لە

وتاریكی ئاگراویشدا سەی ئەسلان ئەوەی ڕاگەیاند كە شەهید عەبدولسەلامی ماروفی بە دەست بەكریگیراوەكانی مەمەد حەسار كوژراوە و بكوژەكە كەسێكی ناسراوە و دوو مانگە بە دزییەوە خۆی گەیاندۆتە مەمەد حەسار و لەوێ مەشقی لەسەر چەك كردوە و نێردراوەتەوە بۆ دێلاوار تا ئاسایشی ناوخۆ تێكبدات، لەم قۆناغە هەستیارەشدا لە مێژووی دێلاوار هەموو دەبێت لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا بن و بیری تەسكی بنەماڵەچێتی واز لێبهێنن و بیر لە قازانجی بەرزی دێلاوار بكەنەوە كە وا پێویست دەكات تەواوی دەسەلاتەكان بدرێت بە گەنجانی خوێنگەرم و جەنگاوەر لە سوپای باغەوانەكان و بە حاكمی سەربازی، تا بتوانین دوور لە ڕۆحی تەسكی خۆویستی و عەشرەتبازی دێلاوار لەم میحنەتە دەربهێنین. لە ڕاستیدا سەی ئەسلان بە جۆرێكی هێند بڕواهێن قسەیدەكرد، گەر من خۆم ئاڵ موراد نەبوومایەوە و خۆم فەرماندارم نەكوشتبایە، باوەڕم بە هەموو چیرۆكەكەی دەكرد. من لای خۆمەوە ئێستا تێدەگەیشتم كە قەرەقازانییەكان و سەی ئەسلان بەڕاستی لە پشت هەموو مەشق و ئامادەكارییەكانی منەوە بوون، دڵنیاشبووم گەر هەڵنەهاتبام دەیانكوشتم. من بەش بە حاڵی خۆم ئێستاش لە هەندێ شت دەپرسم و وەڵامێكی ڕوونم نییە بۆیان. ئەو ساتەی كە لە دووربینەكەدا فەرماندارم بینی ناسیمەوە؟ زانیم ئەوە فەرماندارە... ئەوە عەبدولسەلامی ماروفییە؟ نازانم. بیركردنەوەی قەناس لەو كاتانەدا بیركردنەوەیەكی ئاسایی و مەنتیقی نییە. مرۆڤ تەنیا چەند چركەیەكی هەیە، ئەو چەند چركەیە بە جۆرێك تێكەڵ و ئاڵۆزە دواتر بەشەكانی پێكەوە نالكێنرێنەوە، مرۆڤ لەو چەند چركە كورتەدا كاتی ئەوەی نییە بیربكاتەوە ئەوە كێیە لە بازنی ئاگری دووربینەكەیدا و ئایا بیكوژێت یان نا. غەریزەی قەناس لەوێدا بە پلەی یەك لەسەر خواستی لێدان دەوەستێت. من دەمویست بۆ دونیای بسەلمێنم كە بەڵێ من دەستڕاستترینی دێلاوارم، بۆ كێی بسەلمێنم؟ ... بۆ مامۆستاكانم... بۆ هاوڕێكانم ... بۆ ئەو سەركردە

نادیارانەی کە لەسەرو منەوە بوون... بۆ خودا ... بۆ دراوسێکانمان ... بۆ باغەوانەکان ... بۆ هەموو خەڵکی دیلاوار و مەمەدحەساریش؟ نازانم. منێک هەموو ژیانم گاڵتەیان پێکردبووم و ترسابووم، دەمێک تفەنگێک کەوتبووە بەردەستم، جگە لەوەی بۆ سڕینەوەی بچوکی و لاوازیی خۆم بەکاریبهێنم، دەکرا چی لێ بکەم؟ . قەناس وەک پزیشک وایە، چۆن پزیشک دەبێت هەموو نەخۆشێک تیماربکات، هەتا گەر دوژمنی هەرە گەورەشی بووە، قەناسیش بە پێچەوانەوە، دەبێت هەموو نیشانەیەک بپێکێت هەتا گەر دۆستی هەرە نزیکیشی بووە، ئەوە فەلسەفەی ئیشەکەیەتی.

دوای سێ ڕۆژ، شار کەمێک هێور بووبووەوە، هەموو دیلاوار بە دوای خائینێکدا دەگەڕا کە ناوی ئال موراد کەنعانە، بۆچی لە بری ناوی باوکم ناوی باپیرە گەورەمیان بەکاردەهێنا نازانم؟ . من کارێکم کرد، مامەی دایە نەزانێت، بەڵام ناوی من هێندە لە دەنگوباسدا دووبارەدەبووەوە ئاشکرابوونم نزیک بوو، بۆئەوەی پێم نەزانێت تا نەخەوتبایە گوێم لە دەنگ و باس نەدەگرت. ئەو چەند شەوە من و مامەی دایە وەک دوو ئاژەڵی جیاواز کە هەر یەکەمان سەر بە جنسێک بین، بێدەنگ و بێپەیوەندی دەژیاین، مامەی دایە نوێژەکانی خۆی دەکرد و خواردنێکی کەمی ئامادەدەکرد و دەخەوت، منیش بێئەوەی هیچ بڵێم یان هیچ ڕوونکردنەوەیەک بدەم دەچوومە سوچێکەوە و بێدەنگ دادەنیشتم. من و ئەو وەک قەل و کەروێشکێک وەهابووین، کرابێتینە ناو قەفەزێکەوە، نە یەکمان خۆشدەویست و نە ڕقمان لە یەک بوو، هەر یەکەمان سوچێکی قەفەزەکەی بۆ خۆی گرتبوو و بێئەوەی هەستێکی زۆرمان بۆ بەرامبەرەکەمان هەبێت، لێدەگەڕاین ئەویدی خەڵوەتی خۆی بژی. شەوی چوارەم دەبوو بچمە دەرێ، هێدی هێدی مانەوەم لێرە دەبوو بە کارێکی بێسوود، دەبوو هەرچییەکم کردوە هەوڵبدەم لە دیلاوار دەرچم. دەمزانی قاچاغچییەکان بە چیاکاندا خەڵک دەبەن بۆ شارانی تر. بەڵام من نە پارەیەکی زۆرم بەدەستەوە بوو و نە کەسم دەناسی. شەو سەری خۆم

خسته بن کڵاوێکی گەورە، کە زستانی پار لای مامەی دایە بیرم چووبوو و هاتمە دەرەوە. پەڕۆیەکی باغەوانەکانیش لە گیرفانمدا بوو، ئەویشم بەست بە ناوچاوانمەوە و لە دەرگای ماڵی ئەرسەلانم دا. لە شانسی زێڕینی مندا ئەرسەلان خۆی کردییەوە، هەر منی بینی دەمی بە ئەندازەی نەهەنگێکی حەپەساو داچەقی، بە جۆرێک ترسا خەریکبوو دەم و دەست دەرگاکە بە دەموچاومدا دابخات و ڕابکاتەوە ژووری، بەڵام تۆزێک بیریکردەوە و زانی کە ئەوە کارێکی گەمژانەیە، خێرا یەخەی چاکەتەکەی ڕاکێشام و بردمییە ژووری و بە سەرسامی و ترسەوە گووتی «وای کوڕی ئاسمان، خۆ گێل نیت، تۆ چی دەکەیت، بۆ هاتوویت بۆ لای من، نزیکی ٥ هەزار کەس بەدواتەوەن... گێلیت یان تەواویت، دەتەوێت بە کوشتم بدەیت؟»، من بەدەنگێکەوە کە خاڵی نەبوو لە ڕاستگۆیی گووتم «ئەرسەلان، نامەوێت ئازار ببینیت، نامەوێت بە هۆی منەوە تووشی هیچ ببیت، بەڵام من گەر ئەو کەسە ترسناکە بم کە ئەوان باسیدەکەن، پشت و پەنایەکم دەبوو، گەر خائین بوومایە کونێکم دەستدەکەوت خۆمی تیا بشارمەوە. هەر چی شتێک کە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا لەسەر من دەیڵێن درۆیە. خۆت دەزانی من تاقە کوڕی ژنێکی بەستەزمانم، نە حەزم لە شەڕە و نە ویستوومە ببم بە قارەمان، بەڵام منیش وەک تۆ، وەک زۆرینەی ئەوانەی لە سوپادان یان لە باغەوانەکانی دیلاواردان تووش بووم، من نە خائینم نە هیچ... لە ژیانمدا مەمەد حەساریشم نەبینیوە. دوو مانگە مەشقم پێدەکەن، تیپێکی تایبەتی سەر بە ڕەزمئارای قەرەقازانی مەشقم پێدەکەن، هەر من نەبووم پێنج کەس بووین، ناوەکانیانت دەدەمێ تا بچیت بپرسیت و دڵنیابیت. من یەک ڕۆژیش لە دیلاوار نەچوومەتە دەرەوە، هەرچییەک لەسەر من دەیڵێن درۆدەکەن. دواتر خۆیان تفەنگیان دامێ و فەرمانیان پێدام تەقەبکەم، پلانی خۆیان بوو فەرماندار بکوژن و بچنە جێگای. ئێستاش من تەنیا شاهیدم کە دەتوانم هەموو شتێک ئاشکرابکەم. تکایە من هیچ کەس ناناسم، چوار

ڕۆژە لە ژوورێکی بچکۆلەدا خۆم شاردۆتەوە، گەر تۆ یارمەتیم نەدەیت دەکوژرێم و هەموو شت لەگەڵ مندا دەچێتە گۆڕەوە، بەس تۆم هەیە ئەرسەلان، دەزانم تۆ دەیانناسیت... دەزانم تۆ وەک ئەوانی تر کەڕ و کوێر نیت... بۆیە لە هەموو دونیادا هاتووم بۆ لای تۆ. تکایە ئەرسەلان یارمەتیم بدە؟».

ئەرسەلان حەپەسابوو، چاوانی ترسێکی زۆریان تێدا بوو، دەیزانی ڕاستی دەڵێم، بەڵام ڕاستی و درۆ لە کاتی وادا جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، کێشەی ئەرسەلان ئەوە نەبوو من ڕاست دەڵێم یان درۆ، کێشەکەی ئەوە بوو ئێستا چی لە من بکات. هەڵبەت دەیتوانی بڵێت ئەم بەردەرگایە چۆڵبکە و لەم ناوە مەمێنە، بەڵام دوودڵ بوو، هەستمکرد بۆ ساتێک وابیریکردەوە گەر یارمەتیم بدات بۆ خۆشی سەلامەتترە، هەر دەرکەوتنم لە بەر دەرگایماڵەکەیدا مەترسییەکی گەورە بوو لەسەر ژیانی. هەر شتێک خوار ڕۆیشتبا، هەر بیانزانیبایە من ئەم نهێنییەم بەو گووتووە، ژیانی ئەویش دەکەوتە مەترسییەوە. بە دوودڵییەوە گووتی «باوەڕت پێدەکەم. باوەڕت پێدەکەم. بەڵام باوەڕکردن و نەکردنی من هیچ لە هیچ ناگۆڕێت. من باوەڕم بەو قسانە نەکردوە کە لەسەر تۆ کردیان. بەس تکایە پێم بڵێ، من نازانم چۆن یارمەتیت بدەم، چی بکەم... خۆ گێل نیت، خۆت دەزانیت من هیچم پێ ناکرێت». زۆر غەمگین و دەستەپاچە دیاربوو. گووتم «پێم بڵێ، دەتوانیت سەرەتا بۆ چەند ڕۆژێک جێگایەکم بۆ پەیدابکەیت. دەمەوێت دواتر قاچاغچییەک بدۆزمەوە لە دیلاوار دەرمبکات. ئەوە تەنیا شانسی منە، لەوە دەرچێت کوشتنم مسۆگەرە، گیرانم مەسەلەی ڕۆژ و سەعاتە». گووتی «بەم شەوە ناتوانم هیچ بکەم، هەر شتێک بکەین مەترسی خۆی هەیە. بیرت نەچێت براکانم لایەنگری سەرسەختی سەی ئەسلانن. خۆ گێل نیت، خۆت خەڵکی دیلاوار دەناسی چ عاتیفی و گەمژەن، لەم ڕۆژانەدا هەموو وەک پێغەمبەر سەیری سەی ئەسلان دەکەن. هەر نابێت لێرە

بتبینن. بەلام پێم بڵێ، تۆ دەتوانیت تا دوو شەوی تر لەو جێگایە بمێنیتەوە کە ئێستا لەوێیت... دەتوانیت یان نا؟». بە نابەدڵییەوە گووتم «بەڵێ دەتوانم. گەرچی مەترسی خۆی هەیە، بەلام هەموو شتێک دەکەم دوو شەوی تریش لەوێ خۆم بشارمەوە». گووتی «یەک تۆز بوەستە، یەک تۆز بوەستە. خۆم دەگۆڕم و دێم لەگەڵتدا، تا تۆ جارێکی تر خۆت نەخەیتە بەر ئەو مەترسییە. با من جێگای تۆ بزانم». من گووتم «نا ... نا ئەرسەلان. من ناونیشانەکەت دەدەمێ. سێ شەویتر سەعات ٩ ی شەو وەرە بۆ بەردەمی فرۆشگای سەفا، بەرامبەر ماڵی جیهادی دەلاک، دەزانیت کوێ دەڵێم، نزیک ماڵی کچە جوانەکانی لوتفی خان. کوڕێک نییە لە غەفاریی ماڵی کچە جوانەکانی لوتفی خان نەزانێت. وانییە؟ خۆ گێل نیت ... ئەم ڕێگایە لەگەڵ مندا مەبڕە... ڕێگاکە بەشی خۆی ترسی هەیە». کە پێم گووت «خۆ گێل نیت» هەردووکمان پێکەوە پێکەنین، ئەرسەلان چاوانی پڕبوون لە ئاو و گووتی «کاڵ موراد گوێبگرە... گەر نەمتوانی شتێک بکەم، لە بەرئەوە نییە کە ناتوانم یان دەترسم، بەڵکو تەنیا لەبەرئەوەیە هەموو دیلاواریان تەنیوە. دار و دونیایان پڕکردوە لە جاسوس و پاسەوان». من خەندەیەکم بۆ گرت و گووتم «دڵنیام، دڵنیام ئەرسەلان».

ئەو شەوە کە لە ماڵی ئەرسەلان دوورکەوتمەوە، بۆ یەکەمجار هەستم بە گوناهێکی زۆر کرد. بە درێژایی ئەو ماوەیە خۆم بێگوناهـ هاتبووە پێش چاو. تاوانبار ئەوانی تر بوون کە بە زۆر منیان خستۆتە دۆخێکی دژوارەوە، بەلام ئەو شەوە لە ڕێگای گەڕانەوەمدا بایەکی سارد هەڵیکردبوو، کۆلان و شەقامەکان بە جۆرێکی بەرچاو چۆڵ بوون، دنیا بۆ ترسێکی سەیری لێ هەڵدەستا، هەستمدەکرد با و ئەستێرە و درەختەکان سوسەی کارەساتێکی گەورەیان کردوە. من لە ناو ئەو سەرما و ترسەدا هەستم بە گوناهی گەورەی خۆم کرد. من تاوانباربووم، لەو ماوەیەدا چەندین کەسم کوشتبوو. وێنەکانی ئەو قەسابخانەیەی لە سەربانی زیندانە نهێنییەکە سازمانکرد لە

بەرچاوم بوون. چیتر نەمدەتوانی بە گوناهبارکردنی ئەوانی تر بژیم. هەموو کەسێک دەبێت بەشە گوناهی خۆی بگرێتە ئەستۆ. سزای کەسانی وەک من چییە و دەبێت چۆن بێت؟ ئەوە نازانم؟ بەڵام سووربووم لەسەر ئەوەی کە دەبێت سزایەک بێت لە دەستی تاوانبارەکانەوە نەبێت... هەر سزایەک تاوانبار بۆ تاوانباری دابنێت، سزا نییە، بەڵکو تاوانێکی نوێیە. نە دەبوو بهێڵم بگیرێم، کە گەڕامەوە بۆ ماڵی مامەی دایە، مامە خەوتبوو. ئەو شەوە خەوتم و بۆ یەکەمجار کۆمەڵێک هەورم بینی لەسەرمدا دەبارین... بە یەک جار ناو سەرم پڕ بووبوو لە هەور... وەک ئەوەی هەموو هەوری سەر زەمین هێرشێکی نهێنییان بۆ هێنابێتم، ئاسمان وەک دڕندەیەکی توڕە دەباری، دەنگی هەورە گرمە و ڕەنگی بروسکە و لێزمەی بە خوڕ خەریکبوو شێتیاندەکردم، نیوە شەو بە ئاگا هاتمەوە، بە دەم هەژین و عارەق و ترسەوە لەسەر چنگۆلان بەرەو لای سوراحی ئاوەکە چووم، کە شەوان مامەی دایە دەیخستە نزیکی خۆیەوە، بە جۆرێک تینووبووم خەریکبوو دەخنکام. وەک فێ هاتوو لە بەردەم خۆمەوە دەمگووت «هەورەکان ... هەورەکان ... هاتوون بۆ ناو سەرم». بۆ وام دەگووت نازانم. لەشم نوقمی ئاو بوو، دەلەرزیم، سەرمامبوو، دەنگی چۆقەی ددانم لە دەرگای دەرەوە دەبیسترا. ئەوە شەوی یەکەمم بوو لەگەڵ هەورەکاندا، لەگەڵ باراندا، لەگەڵ ئەو چەخماخانەی سەرمدا کە خوێن و دەمار و ئێسکیان ڕوناکدەکردمەوە، بەڵام دوا شەوم نەبوو، هەورەکان ئیدی لەو شەوەوە بەردەوام لە سەرمدا بوون.

سێ شەو دوای ئەوە بە ترسێکی زۆرەوە چووم بۆ نزیکی فرۆشگەی سەفا، سەعات و نیوێک پێش وادەی خۆم لەو ناوە بووم، بۆئەوەی گەر جوڵەیەکی ناسروشتیم بینی دەربازبم و خۆم لە قەرەی ئەرسەلان نەدەم. بەڵام ئەرسەلان لە کاتی خۆیدا و ئەویش بە ترس و لەرزێکی بەرچاوەوە هات. کە منی بینی بە هێمنی خۆی کرد بە یەکێک لە کۆڵانە تاریکەکاندا

و منیش لەسەرەخۆ دوایکەوتم. لە جێگایەکی گونجاودا لەسەرم وەستا و بێئەوەی سڵاو بکات، پەشۆکاو و نائارام لە منی پرسی« تۆ پرۆفیسۆر بەهنام دەناسیت... دەیناسیت؟». من گووتم «نا، پرۆفیسۆری چی... هیچ کەس ناناسم پرۆفیسۆر بێت، بەدبەختی وەک من و ناسینی پرۆفیسۆر، تۆ بڵێ بۆقبۆقیلە، بڵێ بەرازە ڕەش، بڵێ فازیڵی سەلە ئەفغانی... من ئەوانە دەناسم، بەڵام پرۆفیسۆر نا». خەندەیەکی گرت و گووتی «ڕاستدەکەیت. هەق بە تویە»، بەڵام دەستی و دەنگی وەک دەست و دەنگی من دەلەرزێن. گووتی «باشە، گوێبگرە. شتەکە بە مجۆرەیە. من ئێستا لە بەشی زیندان ئیشدەکەم، تێدەگەیت، ماوەیەکە منیان گواستۆتەوە بۆ بەشی زیندان. پێری شەو لەگەڵ باغەوانەکانی دیلاواردا چووین بۆ گواستنەوەی پیاوێک، ناوی پرۆفیسۆر بەهنامە. پیاوێکە واتێدەگەم نەیاری سەی ئەسلانە. یەکەمین شتێک ئەو کردی کە بووە جێگری حاکم ئەوەبوو مۆزەخانەکەی ئەوی داخست. تێدەگەیت. منیش وەک تۆ تا پێری شەو ناوی ئەم پیاوەم نەبیستبوو، نەشمدەزانی دیلاوار مۆزەخانەیەکی وا گەورەی تێدایە. ئێمە ئەرکی ئەوەمان لەسەر بوو پرۆفیسۆر بگرین و بیبەین بۆ زیندانێکی تایبەت. من هەر بینیم زانیم پرۆفیسۆر پیاوێکی بەڕێزە، ئینسان خۆ گێل نییە، مرۆڤ خۆی دیارە، زانیم هیچ گوناهێکی نەکردوە تا بگیرێت. هەموو دوێنێ من پاسەوانی تایبەتی ئەو بووم. لە فرسەتێکدا لێم پرسی دکتۆر چی کارێکی تایبەتت هەیە، چی ڕاسپاردەیەکت هەیە پێم بڵێ، من دەزانم تۆ کەسێکی خراپ نیت. من هەوڵدەدەم بەپێی توانا جێبەجێیبکەم....». من دوودڵ و ناڕەحەت پرسیم «گوێبگرە ئەرسەلان، من ژیانم لە مەترسیدایە، چ کارم بەم پرۆفیسۆرەوە هەیە ... تۆ باسی چی دەکەیت، ئەم وڕێنە قۆڕانە چییە، بۆ نایبڕیتەوە و بێیتە سەر ئەسڵی شتەکە؟». گووتی «دەزانم، دەزانم، بوەستە، پەیوەندی هەیە، زۆر پەیوەندی هەیە... خۆ گێل نیت، بوەستە با تێتبگەیێنم». گووتم «ئادەی، بەس خێرابکە، وەستانی لەم جۆرە و لێرەدا مەترسی خۆی هەیە».

گووتی «پرۆفیسۆر گووتی بچۆ هەموو کلیلی مۆزەخانەکە لە کچەکەم وەربگرە، ڕەمزێکی نهێنی دامێ و من چووم کلیلەکانی مۆزەکەم لە کچەکەی وەرگرت. ڕەمزکە شتێک بوو لە بابەت هەورەکانی دانیال و نازانم چی ... شتێکی بێمەعنا بوو. گووتی لە ژێر زەمینەکەدا لە دەرگایەکی ئاسنینی لای چەپەوە بڕۆ ژووریێ و لە فلانە جێگادا کتێبێکی زۆر کۆن هەیە، هەڵیگرە و بیبەرە لای خۆت و دواتر بیدە بە دکتۆر سوعاد. من دوێنێ شەو بە خۆم و کتێبە کۆنەکەوە چووم بۆ لای دکتۆر سوعاد، پیاوێکی سەر چرچی تا خوا حەزبکات ناشیرینە، بەڵام زۆر میهرەبانە. ئینسان کە دەیبینێت سەرەتا لێی دەترسێت، بەس دوایی دەردەکەوێت کەسێکی بە ڕەحم و دڵپاکە. من هەموو دوێنێ شەو لەگەڵ ئەو بووم، باسی تۆم بۆ کرد، هەموو چیرۆکی تۆم لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە، ئەو نامەیەک و ناونیشانێکی داومەتێ دەبێت ئێستا بچین بۆ ئەوێ... تۆ لەوێ دەبێت تا دکتۆر کەسێک دەدۆزێتەوە بتنێرێت بۆ دەرەوەی دێلاوار. لە بەرامبەر ئەوەدا من پەیوەندییان لەگەڵ پرۆفیسۆردا بۆ ڕێکدەخەم، ئەوان زۆر پێویستییان بە پرۆفیسۆرە. دوعام بۆ بکە تا تۆ دەردەچێت من هەر پاسەوانی پرۆفیسۆر بم». کە وایگووت من تۆزێک کرامەوە و باوەشم پیاکرد و گووتم «دەی گەر وایە، هەزارجار سوپاس بۆ تۆ هاوڕێم. تا مردن ئەمەم بیرناچێتەوە. هەر چییەکە و هەر جێگایەک هەیە، بابڕۆین. تا شەو درەنگتربێت هاتوچۆ مەترسی زۆرترە».

ئەرسەلان بە تاکسییەک، منی بردەماڵێک لە باشووری دێلاوار، لەو گەڕەکانەی لەگەڵ باغەوانەکان ڕاوی دوژمنمان تێداکردبوو. ماڵێکی هەژار کە ژوورێکی بچوک و تاریکیان لە پشتەوە هەبوو، چەند شەوێک لەو ژوورەدا مامەوە، نە من قسەیەکی ئەوتۆم کرد و نە خاوەنماڵەکان وشەیەکیان لەگەڵدا گۆڕیمەوە، هەردووکمان ئاگادارکرابووینەوە کە هیچ نەڵێین و هیچ نەپرسین. لەوێ هەموو شەوێک خەونم بە هەورەکانەوە دەبینی دەبارین، شەو تا بەیانی نوقمی ئاو و عارەق دەبووم، هەموو شەوێک تا بەیانی هەرچییەکم

بکردایە هەر هەور و باران بوو، هەر هەور و باران و هیچی تر. شەوێک بەر لە دەرچوونم بەرەو مەمەدحەسار دکتۆر سوعاد لەگەڵ ئەرسەلانی موفتیدا هاتن بۆ لام، کتێبێکی کۆنیان پێ بوو، لە چەندەها شتەوە پێچابوویان، خستبوویانە قووتوویەکەوە. دەبوو لەسەر ڕاسپاردەی پرۆفیسۆر، ئەو کتێبە بگات بە دەستی کەسێکی تر لە مەمەدحەسار. کتێبێکی زۆر دێرین کە بەرگێکی نوێی تێگیرابوو و یەکێک بە خەتێکی جوان لەسەری نوسیبوو «چیرۆکی ڕاستەقینەی هەورەکانی دانیال». من لە دکتۆرم پرسی «ئەمە کتێبی چییە، کە هێندە گرنگە کە دەبێت من ئاوا بە هەموو چیادا بیبەم؟ من زۆر سوپاسی ئێوە دەکەم و تا مردن قەرزاربار و شەرمەندەتانم، بەڵام خۆتان دەزانن ڕێگاکە چەند نالەبار و درێژە، دەترسم ئەم ئەمانەتەم بۆ هەڵنەگیرێت ». گووتی «بەبێ ئەم کتێبە ئەو کەسەی دەبێت لە مەمەدحەسار بتگرێتە خۆی و بتپارێزێت و کۆمەکتبکات، پێشوازیت لێ ناکات، ئەم کتێبە کلیلی ژیانی تۆیە، بەبێ ئەم کلیلە هیچت پێ ناکرێت و هیچ دەرگایەکت بۆ ناکرێتەوە. من نازانم، ئەم کتێبەم نەخوێندۆتەوە، کتێبێکە دەبێت بینێرین بۆ جێگایەک نەفەوتێت. هەورەکانی دانیال ناوێکە بۆ کارەساتێک کە هەمیشە لە خەیاڵی دیلاواردا بووە ... کارەساتێک هەمیشە بەڕێوەیە و دووبارەدەبێتەوە ... تۆفانێک هەمیشە بە شاردراوەیی لە سەرماندا بووە ... وادەڵێن ... وادەڵێن، بەڵام من هیچ نازانم. گرنگ ئەوەیە کتێبەکە وەک ژیانی خۆت بپارێزیت. ئەم کتێبە نەبێت تۆش نیت» . گەیاندنی ئەو ئەمانەتە تاکە ڕاسپاردەی دکتۆر سوعاد بوو. هەر ئەو شەوە ناونیشانی چاپخانەی «ئیعتیماد»م وەرگرت، دەبوو لەوێ کتێبی دانیال بدەمە دەست پیاوێک بە ناوی پرۆفیسۆر «قاسم شابەندەر». جگە لە کتێبەکە نامەیەکی داخراوی پرۆفیسۆر بەهنامم بۆ شابەندەر خستە گیرفانم و خۆم بۆ سەفەر تەیار و ئامادەکرد. شەوی دواتر لەگەڵ قاچاغچییەکی بستەباڵادا، دێلاوارم بە ڕێگای چیاکاندا، ڕووە و شاری دوژمن، بەرەو مەمەدحەسار بەجێهێشت.

# ٤٣

بە چنگۆلان و بەدەم گریانەوە بە ناو کەندرێکی درێژدا دەڕۆم، زەهاو لە دوامەوەیە، چەندین سەعاتە بێوچان سەردەکەوم، سەراپای دەست و ئەژنۆم خوێنە، بەلام بە جۆرێک سڕم، بەجۆرێک بێهەستم، هەست بە ئازاری برینەکانم ناکەم. شەو درێژدەبێتەوە، گوێم لە بارانە، گوێم لە تەقەیە، گوێم لە هیچیش نییە... هەموو دەنگێک دەبیستم، بەلام نازانم دەنگی ڕاستەقینەن یان ژاوەژاوی ناو سەری خۆمن، جیاکردنەوەی ئەو دەنگانەی کە هیلاکی و وڕبوون و گریان لە ناومدا دروستیانکردوە لە دەنگەکانی دەرەوە، سەختە. هێدی هێدی دونیا خەریکە ڕوناک دەبێتەوە. زەهاو لە من توانا و تینی زۆرترە. ئەویش سەرتاپای لیتە و تەڕی و برینە. لە ئاسکێک دەچێت لە دەمی گەلە گورگێک بەربووبێت. بەر لەوەی دونیا تەواو ڕوناکبێتەوە، زەهاو ڕامدەکێشێتە ناو چاڵێکەوە و دەڵێت دەبێت تا شتێکمان لێ ڕوون دەبێتەوە لێرەدا خۆمان بشارینەوە. من چاوم سوور بووە، دەنگم نوساوە، تا خودا حەزبکات بێتینم. لەگەڵ دەمەو بەیاندا باران بە هەمان گوڕی شەوەوە بەردەوامە، چیتر لەشم هەست بە تەڕی ناکات، ئێسکەکانم یان دەبێت بەرگەبگرن یاخود بمرن. بە جۆرێک تینومە دەم دەکەمەوە ئاسمان ئاوم بداتێ. من لەو چاڵەدا بێهۆش دەکەوم، هەردووکمان ماوەیەکی درێژ بێجوڵە لە جێگای خۆمان دەمێنینەوە. من هەستدەکەم

خەوێکی قووڵ و درێژم لێکەوتووە، هەستدەکەم لەشم پێویستی بەوەیە ماوەیەکی درێژ بچێتە سورێکەوە نزیک لە مردن، هیچ شتێکم یادنامێنێت، هیچ شتێک بە ئاگام ناهێنێتەوە، چەندین سەعات بێهۆش یان خەوتوو بەدەمدا لە ناو کەندرێکدا دەمێنمەوە و نە هیچ دەبیستم و نە هەست بە هیچ شتێک دەکەم. سەعاتێک کە نازانم کەیە، زەهاو هەڵمدەستێنێت، ئەویش تێکشکاو و نیوەگیانە، بەڵام لە من وریاترە، هۆشی کۆتر و هەستەکانی بە هەموو تیژی و زیرەکی خۆیانەوە ئیشدەکەن. دەڵێت «هەستە. دەبێت بجوڵێین، دەبێت تا شەو دانەهاتووە هەوڵبدەین رێگا بدۆزینەوە». من هەڵدەستم، تەواوی لەشم کوتراوە، ماسولکەکانم بە جۆرێک کرژ و رەقن، هەموو جوڵەیەکم ئازارهێن و سەختە، بەڵام زۆر لە خۆم دەکەم. زەهاو کوڕی ئەم شاخانەبووە، لێیدەپرسم «دەزانیت لە کوێین؟». دەڵێت «نازانم، شەو وەک تۆ، هەر لە خەیاڵی ڕاکردندا بووم، نازانم گەیشتووینەتە کوێ، بەڵام لە دێلاوار دەرچووین». دەپرسم «مەبەستت چییە لە دێلاوار دەرچووین؟». « هەموو شەو ڕامانکردوە، هەشت سەعات زیاتر، باوەڕدەکەم ئێستا لە قوولایی خاکی مەمەدحەساردا بین». من ترسێک دامدەگرێت، هەست بە پەشۆکان دەکەم «ئێستا دەبێت چی بکەین، چۆن بگەڕێینەوە بۆ دێلاوار؟». «دەبێت چاوێک بەو دەوروبەرەدا بگێڕم، بزانم ئەو سەر قووتانە هیچیان لێیە. گەر سنوورەکەیان گرتبێت، ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ دواوە. ئیشی ئەو حەسارییانە دەزانم، داخیان وا لە دڵی مندا. هەر ئێستا خەریکی مین ڕێژکردنن، یەکەم شت ڕقیان لێیە، ئەم لاڕێ و شتانەیە... بەڵام دەبێت سەیربکەم». بە دەنگێکی گریاوەوە دەڵێم «یەعنی چی نەگەڕێینەوە بۆ دێلاوار... یەعنی چی؟ دەبێت ڕێگایەک هەر هەبێت». زەهاو دەڵێت «گەورەم، گەر ئەڵقاو ئەڵق گەمارۆی ئێمەیان دابێت، دوو ڕێگامان لە بەردەمدایە، یان دەبێت ئەو ڕێگایە بدۆزینەوە کە قاچاغچییەکان بە کاریدەهێنن، یان دەبێت لێرەوە بە ناو خاکی مەمەدحەساردا نزیکی

سەد کیلۆمەتر بەپێ بڕۆین. تا بتوانین لە کونجێک یان کەلەبەرێکەوە خۆمان بکەینەوە بەودیودا، بەڵام من شارەزا نیم، ئەوەیان حوکمی مردنە، ئەم ڕێگا درێژە بە خاکی حەسارییەکاندا لە کاتی شەڕدا گاڵتە نییە». من دەڵێم «دەبا ئەو ڕێگایە بدۆزینەوە کە جاران پیا هاتوویت، بابیدۆزینەوە». من ترسێکی گەورەم هەیە. من و زەهاو پێکەوە لە کەندڕەکە دێینە دەرێ و بەسەر بەرزاییەکدا سەردەکەوین، لە نزیکی لووتکەکەوە دەنیشینە سەر زەوی و زەهاو بە خشکان تا تروپکی گردەکە دەچێت. چیتر لەوەدا نەماوین شەرم لە قوڕ بکەین. زەهاو لە نزیکی لوتکەکە بە ئەسپایی و بێدەنگ بانگمدەکات، من بە هێمنی خۆ دەخشێنم و دەچمە لای. لەوێوە تەختانییەکی گەورە دەبینم کە سەدان سەربازی مەمەد حەسار لە ژێر باراندا خەریکی هەڵدانی چادرن، ژمارەیەکی زۆر ماشینی سەربازی دەبینم کە هێزێکی پیادەی گەورە بەرەو سەرووتر دەگوێزنەوە. بە چپەوە دەڵێم «چ هێزێکی گەورەیە». زەهاو بە ترسەوە سەیرمدەکات و دەڵێت «گەورەم، شەڕ دەستی پێکردوە. شەڕ بە تەواوی دەستی پێکردوە». منیش سەیری هێزەکە دەکەم و دەڵێم «ئەمە هێزی هێرشە، خوای گەورە دڵنیام ئەمڕۆ یان سبەی پەلاماری گەورە بۆ سەر دێلاوار دەست پێدەکات ... خودای گەورە دێلاوار تیاچوو... دێلاوار لە دەستچوو». زەهاو دەستم دەگرێت و دەڵێت «ئیتر ناتوانین بەرەو خوار بڕۆین، گەورەم، ئەوەی بتوانین بە ناو ئەم هێزەدا بڕۆین و نەماندۆزنەوە، بێ عەقڵییە ... یەک ڕێگامان لە بەرە بچین بۆ سەرەوە. گەر ڕێگای قاچاغچییەکان بدۆزینەوە، من شارەزام، کونج و کەلەبەری دەزانم، بە مەرجێک مین ڕێژ نەکرابێت... گەر مین ڕێژکرابێت و گیرا بێت، ئیتر دەبێت بە پێچەوانەوە بڕۆین». من سەیریدەکەم و دەڵێم «مەبەستت چییە بە پێچەوانەوە بڕۆین؟»، «یەعنی بچین بۆ مەمەدحەسار». نە گوێم باوەڕدەکات، نە باوەڕ بە گوێم دەکەم. بە تووڕەییەوە دەپرسم «بچین بۆ کوێ؟ شێت بوویت». «شێتبم یان عاقڵ، گەر ڕێگاکە مین

ڕێژکرابێت یان گیرابێت، ڕێگای ترمان نییە. گەورەم، من دەتوانم تا ناو مەمەدحەسار بە سەلامەت بتبەم». وەک شێتم لێهات «تۆ دەڵێیت چی؟ ... زەهاو... لە مەمەدحەسار چی بکەین... چی؟ لەوێش دەمانگرن». «نازانم. دووماڵی قاچاغبەری حەساری دەناسم، لەوە زیاتر هیچ. لە ناو مەمەدحەساردا بمانگرن و بڵێن قاچاغبەرن، باشترە لەوەی لێرە بمانگرن و بڵێن جاسوسی سوپان یان سەربازن». من دەڵێم «بابکەوینە ڕێ بەرەو باکوور، تا زووتر بگەین شانسی دەرچوونمان زیاترە، تا زۆر بڵاونەبوونەتەوە، با خێرابکەین». گەرچی جەستەم نایکات، گەرچی ماسولکەکانم هەموو لاوازن، گەرچی برسیمە و هیچ شتێکمان پێ نییە بیخۆین، بەڵام جگە لەوەی چی وزەمان تێدایە تا ئەوپەڕ بەکاریبهێنین چارێکی ترمان نییە. دەچینەوە خوارێ، دوای کەمتر لە کیلۆمەترێک دەبێت سەرکەوینەوە، من بە لای ڕاست و ئەو بە لای چەپدا، دەبێت بە جۆرێک بڕۆین ئاگاداری هەر دوو دیوی دۆڵەکە بین. لە جێگایەکدا دەگەینە هەرێمێکی ئاودار، دەتوانین ماوەیەک لە ناو چڕستانێکی پڕ درەختدا خۆمان بشارینەوە و بڕۆین، درەختەکان ڕووت و بێگەڵان، بەڵام بواری ئەوە دەدەن بە ناویاندا بڕۆین و خۆمان لە ڕووتەن بپارێزین. کە لە ناو درەختەکان دەردەچین، دەکەوینە بەرامبەر کۆمەڵێک گرد. زەهاو لە من چاوتیژترە و دەڵێت «گەورەم سەیربکە، دەبینیت، لە سەری گردەکە وردبەرەوە، دەبینیت». من ورددەبمەوە و سەربازەکان دەبینم دەجوڵێن، سەیری لوتکەی هەموو گردەکان دەکەم و لە سەر زۆربەیان سەربازێک یان دووان دەبینم. دەپرسم «ئێستا دەبێت چی بکەین؟». «گەورەم هیچ، هیچ. دەبێت چاوەڕێبکەین تا تاریک دادێت، من لێرەوە شارەزام. کە خۆرئاوابوو دەبێت بە نێوان گردەکاندا بڕۆین، دوای ئەم گردانە، تەختانییەکی گەورە دێت، دەبێت ئەم شەو ئەو تەختانییە ببڕین، چونکە گەر ڕۆژبێتەوە دەمانبینن، گەر نەشمان بینن لە برسا دەمرین. دەبێت ئەمشەو تا بناری چیای

بۆخرسان برۆین، لەوێ چڕ و دارستانە، دەتوانین بە ڕۆژ بگەینە سەر لوتکەکەی، کە لەوێ دابەزین دەچینە سەر ڕێی قاچاغچییان. بۆخرسان چیایەکی زەبەلاحە گەر هێزیشیان لێ دانابێت، پڕە لە ڕێگای دێو و درنج و جنۆکان کە من هەموویان دەزانم. لەویوە دەبێت دابەزین و ببینین چ باسە». لەناو دارەکاندا دانیشتین و هیچ کارێکمان نەبوو جگە لەوەی باران لێمان بدات. هەندێ جار لە ژیاندا دەبێت چاوەڕێی ڕۆژ بکەین و ڕۆژ نایەت، هەندێ جاریش دەبێت چاوەڕێی شەو بکەین و شەو نایەت ... ژیان هەمیشە شتێکە کە نایەت. زەهاو بە ناو درەختەکاندا بۆ شتێک گەڕا بیخۆین، هیچی دەست نەکەوت. هەردووکمان دەلەرزین... لە بن دارێکدا دادەنیشین و کات ناڕوات، هاتنی شەو درێژدەبێتەوە. باران کەمێک خۆشی کردۆتەوە، ئەو ماوەیە بەکاردەهێنین تا بە نۆرە کەمێک بخەوین، هێندەی تاریکی دەکەوێت بەڕێدەکەوین، جگە لە ئازاری برینەکانمان، بە هۆی ئەو پشووەوە شتێک لە تینمان تێزاوەتەوە. لە گوژمی یەکەمدا نێو گردەکان دەبڕین و دەگەینە تەختانی، سەربازەکانی مەمەدحەسار لەم ناوەدا بێخەیاڵن و پاسەوانییەکی وەها ئەنجام نادەن. زەهاو لە ڕۆیشتنی تەختانیدا ئێجگار بە گوڕ بوو، کەمبوونەوەی بارانیش کۆمەکی پێکردین خێرا بڕۆین. هەموو شەو بێدەنگ ڕۆیشتین، کەسمان شتێکی ئەوتۆمان نەگووت، من هەندێ جار شەکەتی دەیپڕوکاندم و دەوەستام، بەڵام زەهاو زۆریدەکرد نەوەستین. بەر لەوەی خۆرهەڵبێت گەیشتینە دامێنی بۆخرسان. ئاە بۆخرسان چ چیایەکی سەیرە، پڕ نوک و چوکڵ و ددانی بەردینە، وەک پەیکەرێک وەهایە لە بەردی زل زل چنرابێت، تاشە بەردەکان و لەتە تیژەکانی پێدەچێت یەکێک بە دەست بە چیاکەوەی نووساندبێت. بینینی ئەم جۆرە شاخانە هەمیشە مایەی ترس و دوودڵیم بووە، زەهاو دەڵێت «سەرکەوتن بەسەر ئەم چیایانەدا، وەها قورس نییە وەک بەچاو دیارە». لەگەڵ بەیاندا، دوو بەردی ساف و گەورە دەدۆزینەوە و لەسەری دەخەوین، شوێنی

خەوەکەمان نە با دەیگرێتەوە نە باران و نە تیشک، بەڵام لەگەڵ بەیاندا گوێمان لە ناڵەی بۆمب و هاوەنە لە دوورەوە دێن. بە درێژایی شەو گوێمان لە هیچ دەنگێک نەبوو، بەڵام ئێستا زۆرجار دەنگی نامۆ و نزیکمان گوێ لێیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەخەوین. برسێتی بە جۆرێک برستی لێ بڕیوم دەمەوێت خەو لە بیرم بەرێتەوە. دوای خەو هەڵدەستم و لەشم لەگەڵم نایەت، ماسولکەکانم بە جەمام کەوتوون، دەمارم کرژ و ڕۆحم گرژییەکی سەیری تێدایە. دوای دوو شەو ئێستا بە ڕوونی دەبینم لە چ دۆخێکی دژواردایین کە لەوانەیە لێی دەرنەچین. لەگەڵ زەهاو لە کونجەکە دێینە دەرێ، بۆ ئەوەی بەسەر چیادا سەربکەوین، لە ناوقەدی بۆخرساناین کە هەستدەکەین دەنگێکی زۆر لە ترۆپکی چیاوە دێت. زەهاو دەڵێت دەبێت بوەستین تا شەو دادێت، دووبارە لە بن بەردەکاندا خۆمان دەشارینەوە. لە جێگای خۆمانەوە ڕووبەرێکی بەرفراوان لە سنووری نێوان دیلاوار و مەمەدحەسار دەبینین، تەواوی سنوورەکە بە هێز تەنراوە، بە ڕوونی تۆپبارانێکی پچڕ پچڕ دەبینین، شەقامە سەرەکییەکانمان لێ دیارە. بەردەوام لە مەمەد حەسارەوە هێز دێت و لەو پێدەشتانەدا جێگیر دەکرێن. گەرچی بە ڕوونی لە زۆر شت تێناگەم، بەڵام هەستدەکەم هێزەکانی دیلاوار جۆرە بەرگرییەک پیشاندەدەن، جارجار دوکەڵی تەقینەوە دەبینم لە خاکی مەمەدحەساردا بەرزدەبێتەوە. لەگەڵ کەوتنی تاریکیدا زەهاو دەڵێت «گەورەم دوام بکەوە». زەهاو بست بە بست بۆخرسان شارەزایە. لە لاڕێیەکەوە بەرەو ئەودیو دەمبات. هێندەی چاومان ئاوقای تارماییەکانی ئەودیو چیا دەبێت، دەزانین هێزێکی زۆر گەورە لە دەربەندی بۆخرسان کۆکراوەتەوە. گوێمان لە دەنگی گروپێکە سرود و ئاوازی دینی دەخوێنن، قافڵەیەکی سەربازیی دەبینین لەسەر ئەو شەقامەی کە بە ناو دەربەندەکەدا گوزەردەکات، دەیان نەفەرهەڵگری سەربازیی کە زۆریان چرای ماشێنەکانیان هەڵکردوە و سەربازەکانی لە چاوەڕوانیدا دابەزیون و لە

کەنار ڕێ دانیشتوون. ئێمە کەمێک دەوەستین، لە ناکاو گوێمان لە دەسترێژی نزیکە، گوێمان لێیە هێزەکە دەشڵەژێن و هەموو بە ئاراستەی جێگایەکی دیاریکراو لە چیا تەقەدەکەن، چاومان لە ڕێژنەی گوللەکانە کە کەمتر لە کیلۆمەترێک لەولا ئێمەوە بە ئاراستەی چیا دێن. زەهاو دەڵێت «ببێت و نەبێت، کەسانێکی تر هەن، وەک ئێمە، وان بە بۆخرسانەوە» . دوور نییە خەڵکانێکی تر، ئیشکەری فەسیلەکانی تر وەک ئێمە پەرتەوازە بووبن و کەوتبێتنە چیا. من بە زەهاو دەڵێم «دەترسم بە هۆی ئەم غەریبانەوە ئێمەش ئاشکرابین». زەهاو دەڵێت «نا، پەڕینەوە بۆ ئەمبەری چیا ئاسان نییە، گەر بشمانبینن مەگەر هەر دووراودوور تەقەبکەن». دوای دە دەقیقە تەقەکان ئارامدەبنەوە. من و زەهاو بە قەدپاڵی چیادا بەرەو خوار دادەگەڕێین. زەهاو دەڵێت ئەشکەوتێکی بچوک و نهێنی هەیە کە دەبێت بگەینە ئەوێ، بڕیار نییە لە ئەشکەوتەکەدا بمێنینەوە، بەڵام جێگایەکە بەسەر ڕێگای قاچاغچییاندا دەڕوانێت، گەر ڕێگاکە مەترسی لەسەر بێت لەوێوە دیارە، دەبێت تا دەمەو بەیان لەوێ بمێنینەوە، تا بتوانین بەشێک لە ڕێگاکە ببینین. زەهاو گەشبین نییە، ئەو هێزە گەورەیەی لە دەربەندەکەدایە، بڕوایەک بۆ ئەوە ناهێڵێتەوە کە هێزەکانی مەمەدحەسار ڕێگای قاچاغچییەکانیان هەروا ئازاد جێهێشتبێت. بە کزی و بێدەنگییەکی زۆرەوە، لە ناو تاریکی ئەنگوستەچاوی شەوێکی هەوریندا بە ڕێگایەکی بەردیندا، بە جووتێک پێڵاوەوە کە هێدی هێدی خەریکە دەدڕێن و کوندەبن، بە ترسەوە بە قەدپاڵی بۆخرساندا دادەبەزین. بەر لەوەی بگەینە ئەشکەوتەکە گوێمان لە دەنگی ترە، گوێمان لەتەقەی نزیکترە، هاوار و خشە و دەنگی خنکاو دەبیستین، جارێکی تر من و زەهاو لە ناو بەردەکاندا خۆمان دەشارینەوە. تەقەکان ئێستا بە ئاراستەی جێگاکەی ئێمەن، بەڵام دڵنیانین ئاخۆ تەقە لە ئێمە دەکرێت یاخود نا. نیوسەعات لە ناو بەردەکاندا خۆمان حەشاردەدەین، هیچ دەنگێک نامێنێت، خامۆشییەکی ترسناک باڵ بەسەر چیادا دەکێشێت.

بەهێمنی لە بن بەردەکان دێینەدەرێ و بەرەو ئەشکەوتەکە دەکشێین. لە دەمی ئەشکەوتەکەدا گوێمان لە دەنگی کەسێکە قسەدەکات، زمانەکەی دێلاوارییە، گوێم لە وشەگەلی وەک «نامریت، خۆت بگرە، پاڵکەوە»یە، دەنگەکە دەنگێکی ماندوو و بریندارە، تێناگەم دەڵێت چی، بەڵام دڵنیام کەسێکی دێلاوارییە و وەک ئێمە لە چیاکاندا ونبووە. دەزانم پێویستی بە یارمەتییە، دڵنیام پێویستی بە کۆمەکە، بێ هیچ دوودڵییەک خۆم دەکەم بە ئەشکەوتەکەدا... بەڵام لە بەر تاریکی هیچ نابینم.

هەوای ئەشکەوتەکە خنکاو و پڕ شێیە. بە زەهاو دەڵێم گەر شتێک بوو، هەڵبێت و دوای من نەکەوێت. دەچمە ژووری و ترسێکی نهێنی لە دڵمدایە، بە زمانێکی ساف و ڕوونی دێلاواری دەڵێم «کێ لێرەیە... من گوێم لێت بوو ... من خەڵکی دێلاوارم، کێ لێرەیە». تەنیا دەنگی نەفەسێکی قورس دەبیستم، یەکێک بە سەختی دەتوانێت هەناسە بدات، بەڵام لە بەر تاریکی هیچ نابینم. جارێکی تر دەڵێم «گوێم لێت بوو بە دێلاواری قسەتکرد، تۆ لە کوێیت، گوێم لێت بوو... تۆ کێیت؟». هیچ وەڵامێک نابیستم. کەمێک زیاتر دەچمە ناوەوە، بەردەوام دەڕۆم و دەڵێم «تۆ کوایت؟». هێند نزیکدەبمەوە گوێم لە هەناسەیەتی، دڵنیام دوو کەسن، یەکێکیان خیزەی سنگی بەرزە، ئەویتریان بە خێرایی هەناسەدەدات. دوو هەنگاو زیاتر دەڕۆم و بەسەر یەکێکیاندا دەکەوم، هەردووکمان لە ترسدا هاواردەکەین. دەنگێکی ماندووی هەیە، من دوو تل دەدەم و کەمێک دەکشێمەوە دواوە و بە توندی دەڵێم «تۆ کێیت بۆ قسە ناکەیت؟». پاش ئێستێک دەڵێت «شتێکت پێیە برینی پێ بپێچم، پێویستیم بە شتێکە برینی پێ بپێچم، هاوڕێکەم دەمرێت». لەسەر چنگ بەرەو لای دەنگەکە دەڕۆم، خۆی تیشکی لایتێکی گەورەم تێدەگرێت، تیشکی لایتەکە دەدات لە چاوم، ناتوانم هیچ ببینم. بە ترسەوە دەپرسێت «تۆ کێیت، تۆ کێیت؟». من دەڵێم «ئەو ڕوناکییە لابە لەسەر چاوم، ئەو ڕوناکییە لابە، هیچ نابینم». ئەو دەڵێت «شتێک بهێنە هاوڕێکەم دەمرێت،

ئەو کوڕی قەحبانە پێکاین... شتێک بهێنە تکایە». لایتەکە لادەبات و من بۆ یەکەمجار دەیبینم، دەموچاوێکی قوپاو و باریک و ترساوی هەیە کە شەوقی لایتەکە لاونیو ڕۆشنیکردۆتەوە. ئەوە یەکەمین بینینی منە بۆ ئال موراد، خۆی لەسەر دەست بەرەو ڕووم دێت و دەڵێت « خراپ پێکراوە... خراپ پێکراوە». هاوڕێکەی بستەبالایەکی بچکۆلانەیە، لایتەکەی لێ وەردەگرم و سەیریدەکەم، لە گیانەلاودایە، لێوەکانی شین بوونەتەوە، چاوانی هەڵناوەن، خیزەی سنگی تا دێت کەم دەبێتەوە، گوللەیەک لە قەراغەوە پێکاویتی و لە جێگایەکی نادیاری ناوسکیدا گیرساوەتەوە. برینەکەی لە جێگایەکدایە کە ناپێچرێت، من دەڵێم « ئەمە کێتە، ئەمە چییتە؟». دەترسم هاوڕێیەک یان برایەکی بێت. بە دەنگێکی گریاو دەڵێت «کەسم نییە، ئەو قاچاغچییەیە کە دەبوو دەرمبکات، کە دەبوو بمبات». من لایتەکە دەبەم و دەڵێم «دەقەیەک سەبربکە، دەقەیەک سەبربکە، ئێستا دێم». بە پەلە دێمەدەرێ و زەهاو بانگدەکەمە ناو ئەشکەوتەکە. پێکەوە دەچینە سەر بریندارەکە کە لە دوا هەناسەکانیدایە. زەهاو بە سەرسامییەوە دەڵێت «خوای عالەم، ئیلاهی، ئەمە یاقوبی قەموورە. یاقووبە، زیرەکترین قاچاغچییەکانی چیایە، بە گوربەی شاخ بەناوبانگ بوو». من دەڵێم «زۆر خراپ پێکراوە، گوللەکە لە شوێنێکی کاریگەری داوە». بریندارەکە هێدی هێدی خیزەی نامێنێت، لە ناکاو تەواو بێدەنگ دەبێت، بەردەوام خوێنیشی لێ دەڕوات. ئال موراد بەدبەخت و بێچارە سەری خستۆتە ناو دەستی و دەگری و دەڵێت «مرد ... مرد». من ترپەی دەستی دەپێوم، چیتر خوێن بە شادەماراندا نایەت، سەر دەنێمە سەر سنگی و دڵیشی بێ ترپەیە، بە دەست بە هەموو توانای خۆم فشار دەخەمە سەر سینەی بەڵکو لێدانی دڵی بگەڕێتەوە، دەستەکانی توند دەجوڵێنم، بەرزیدەکەمەوە و ڕایدەوەشێنم، بەلام بێسوودە. منیش دەستدەکەم بە گریان و دەڵێم مرد.

# ٤٤

ژیان بەوجۆرەیە، من لە شوێنێکی وەهادا، لە شەوێکی بەو جۆرەدا ئاڵ موورادم ناسی. من بە ڕێگاوەبووم بگەڕێمەوە بۆ دیلاوار و ئەو بە ڕێگاوە بوو بچێت بۆ مەمەدحەسار، لە دەمی ئەوەوە یەکەمجار چیرۆکی کوشتنی فەرماندارم بیست. ئەو بە منی گووت «لە دیلاوار، سەی ئەسڵان و قەرەقازانییەکان هەموو شتێکیان گرتوتە دەست». هەواڵەکان بۆ من سەیر و دڵتەزێن بوون. من گەرچی فەرماندارم خۆش نەدەویست، بەڵام هەواڵی کوشتنی کارەساتێک بوو بۆ دیلاوار. ئێستا ژیان و چارەنوسی هەمووان لە ژێر پرسیاردا بوو. هەر ئاڵ موراد بە ئێمەی ڕاگەیاند کە ڕێگای قاچاغچییەکان بە تەواوی گیراوە و گەڕانەوە بە سەلامەتی بۆ دیلاوار لە ئەگەردا نییە. قسەی لە بینینی لاشەی چەندین قاچاغبەر کرد کە لە ڕێگای هاتن و پەڕینەوەدا تا بۆخرسان بینیونی و گووتی هەمووان بە دەستی هێزەکانی مەمەدحەسار تیاچوون. بە قسەی ئەو هێزەکانی مەمەدحەسار مرۆڤ ناکوژن، بەڵکو چاوانی دەردەهێنن و زگی دەدڕن و زەکەری دەبڕن و زۆرجاریش سەری لێدەکەنەوە. دوو شەو لە دوای دەرچوونی ئەو لە دیلاوار، هێرشی گەورەی مەمەدحەسارییەکان دەستی پێکردبوو، ئەو کەوتبووە ناو بازنەی هێرشەکەوە و وریایی و زیرەکی یاقووبی قەموور تا ئێرەی هێنابوو، گەر قەموور نەبایە هەر شەوی یەکەم دەکوژرا. ئاڵ موراد قسەی لە گرتن

و کوشتنی سەدان سەربازی دیلاواری دەکرد. قسەکانی وەک دوا تەقەڵی کفن بوون، بۆ هیوای گەڕانەوەی من. لە ڕاستیدا ترسی گەورەم لە خۆم نەبوو، ترسی گەورەم لە زەهاو بوو، کە بە هیچ جۆرێک نەمدەویست بیخەمە بەر مەترسی وەها گەورە، ئەو هەستەی کە ژیانی ئەو هێشتا ئەمانەتێکی گەورەیە لە ملمدا هەمیشە لە ناومدا زیندووبوو، بەڵام ئێستا هەموو شت پێچەوانە بوو، ئێستا هەستمدەکرد پرۆفیسۆر گەمەیەکی ئاڵۆز و سەیری لەگەڵ کردوین، ئەوە زەهاوە کە ڕاسپێردراوە ژیانی من بپارێزێت و ڕزگارمبکات، هەستێکی قووڵ و ئەفسانەییم هەبوو کە دکتۆر پێشبینی هەموو ئەم ڕێگایەی کردوە کە ئێمە پیا دەڕۆین و ژیانی منی داوەتە دەست زەهاو بیپارێزێت. ئێستا زەهاویش دڵنیابوو کە گەڕانەوە بە ڕێگای قاچاغچییەکاندا کاری نەکردەیە، لەبەرئەوە جگە لە ڕێگای مەمەدحەسار ڕێگای ترمان نەبوو، تاکە ئاراستەیەک بتوانین بیگرینە بەر ئاراستەی مەمەدحەسار بوو. هیچ شتێکمان پێ نەبوو بتوانین لە ناو ئەشکەوتەکەدا گۆڕێکی لایەق بۆ یاقووب هەڵبکەنین، بەڵام بە دزییەوە و بە بێدەنگ کۆمەڵێک بەردمان هێناو بە دەوری لاشەکەدا هەڵمانچنی. ئەوە تاکە کارێک بوو بتوانین بیکەین تا حورمەت لە لاشەی کوژراوەکە بنێین. لەگەڵ ڕوناکبوونەوەدا، هێزەکانی مەمەدحەسارمان بینی لەو نزار و بەرچیایەدا بڵاوبوونەتەوە و تەواوی ناوچەکانی ئەوبەریان گرتووە. لەدەمی ئەشکەوتەکەوە دەمانتوانی هەندێ لە جوڵەی هێزەکانیان ببینین. بەڵام دەبوو تەواو لە بۆسەدابین و ئاگاداربین. دوای تەقەکانی دوێنێ شەو دڵنیابووم چاوێکی بەردەوامیان لەسەر بۆخرسانە، تەنیا ترسم ئەوەبوو قاچاغبەرانی تر پەڕیبێتنەوە ئەمبەری چیا و کارێک بکەن مەمەدحەسارییەکان بۆ گرتنیان، هێز بنێنە سەر چیا و بێنە ئەمبەر. دەبوو هەموو ڕۆژ لە دەمی ئەشکەوتەکەدا چاوەڕوانی تاریکی بین. تاریکی گەورەترین پەردی خەڵکانی بێچارە و هەڵهاتووە، گەر تاریکی نەبایە ئێستا هەزاران مرۆڤی ئازاد لە زیندان و هەزاران کەسانی زیندوو لە گۆڕدا بوون. مرۆڤ دەبێت

حەشارخواز و هەڵهاتوو بێت تا لە نرخی تاریکی تێبگات، لەم خاکە تاریکانەدا ڕۆژ و ڕوناکی دۆزەخی ئازادیخوازانە. دەبوو شەو بەرەو قووڵایی ناوچە هێمنەکانی مەمەد حەسار بە ڕێگاوە بین، تا بتوانین بە ڕۆژ لە ڕێگایەکی کەمێک هێمن و ئەمانەوە بچینە ناو شار. زەهاو تەنیا چاوساغمان بوو، ئەو ژیانبەخش و ڕزگارکەری هەردووکمان بوو. ئاڵ موراد بەردەوام دەیگووت «ئێوە دیاری خودان بۆ من، ئەوە نیشانەیە کە خودا نایەوێت من بمرم». ئەو لەو ماوەیەدا لە زۆر تەڵەی مەرگ ڕزگاری بووبوو، دەرکەوتنی ئێمەشی لە ئەشکەوتەکەدا بە موعجیزەیەکی خودایی دەزانی. پێی وابوو ئێمە فریشتەی نەجاتین و لە ئاسمان دابەزیووین، بەڵام بۆ من پێچەوانەکەی ڕاست بوو، دەرکەوتنی ئاڵ موراد، فریشتەی فریادڕەسی ئێمە بوو. ئەو کۆمەکی بە ئێمە کرد لە برسا نەمرین. ڕێگای ئێمە ڕێگایەکی درێژ و ناخۆش بوو، بەڵام سوودمان لە هەندێ خواردنی کۆڵەپشتەکەی ئاڵ موراد و یاقوب بینی، تا بەسەر برسێتی دوو ڕۆژی پێشوودا زاڵ بین، بۆ یەکەمجار دوای زیاد لە دوو ڕۆژ شتێکمان دەخوارد و تینی ئەوەمان تێدەگەڕا بتوانین بەرەو شارێکی نەناس و دوژمن بە ڕێ بکەوین.

من خۆم وەک مستر گرینۆک بە ئاڵ موراد نەناساند. لەبری ناوی خۆم گووتم من «زەریاوارییەکی خەونبین» ـم، کەسێکم توانایەکی شەیتانیم هەیە خەونی ئەوانی تر ببینم، گەر خەونی مرۆڤەکانیش نەبێت، خەونی شتەکان، خەونی بەرد، گیا، زەوی، ئاو. بە خەندەیەکی تاڵەوە گووتم «تۆ کەسێکی شانسدار نیت، گەر کەمێک بەختت هەبایە لێرەدا، لەم ئەشکەوتە خنکاو و تاریکەی سەر سنووری جەهەنەمدا بە من، بە پادشای خەونە جڕنی و فڕنییەکان نەدەگەیشتیت». هەستمکرد نە دەزانێت باسی چی دەکەم، نە تێدەگات مەبەستم لە بینینی خەونی ئەوانی تر چییە. ئەو گووتی «من هیچ نیم، جگە لە دەستڕاستێکی گەمژە، کە وەسواسی ئەوەم هەیە هەر نیشانەیەکم بۆ دابنێن بیشکێنم، هەتا گەر سەری مرۆڤێکی گەورەش بێت».

هەڵبەت سەرەتا نەیگووت کە ئەو بکوژی فەرماندار ماروفییە. ئەو گووتی بۆ ئەوەی بزانیت من کێم دەبێت لە سەرەتاوە قسەت بۆ بکەم، لە ڕۆژێکەوە کە بەرازە ڕەش و هاوڕێیەکی چوون بۆ لای سەی ئەسلان. منیش گووتم، زۆر چاکە، گەر وا بێت منیش دەبێت لە سەرەتاوە بۆت بگێڕمەوە، لەوی ڕۆژەوە کە میرئەودال هات بۆ عیادەکەی مامم و دەستی بە گێڕانەوەی خەونی خۆی کرد.

شەو بەر لەوەی بکەوینە ڕێگا بەرەو مەمەدحەسار، ئاڵ موراد کۆڵەپشتەکەی کردەوە و قووتوویەکی دەرهێنا. گووتی «ئەم ڕێگایەی ئێمە پیادەڕۆین وەک ڕێگای هات و نەهاتە، لە مەمەدحەسار کەسێک هەیە دەتوانێت یارمەتیمان بدات ناوی پرۆفیسۆر قاسمی شابەندەرە، لە چیدا پرۆفیسۆرە؟ نازانم. بەڵام گەر من لە ڕێگا کوژرام، تیاچووم، گیرام یان بەر گوللە کەوتم، هەر یەکێک لە ئێوە دەتوانێت بچێت بۆ ئەم ناونیشانە «چاپخانەی ئیعتیماد، شەقامی حەبیبوڵا داغستانی، ژمارە ١٩، گەڕەکی هاجەری خوارو» و ئەم کتێبە بە دەستی بداتە پرۆفیسۆر، تەنیا پرۆفیسۆر خۆی و هیچ کەسێکی تر نا. لەگەڵ ئەم نامەیەدا، جوان سەیریبکەن، ئەمە نامەی پیاوێکە ناوی پرۆفیسۆر بەهنامە، ئەم کتێب و نامەیە کلیلی ئێمەیە تا لە مەمەدحەسار بۆ ماوەیەکیش بووە جێ خەوێکی ئەمینمان دەستبکەوێت، وشەیەکی نهێنی هەیە دەبێت بە پرۆفیسۆر قاسمی بڵێن ئەوسا دەتانبینێت «هەورەکانی دانیال». بەبێ ئەو وشە نهێنییە بینینی شابەندەر ئاسان نییە. گەر بە یەکەوە گەیشتینە ئەو شارە، پێکەوە دەچین بۆ لای پرۆفیسۆر، گەر منیش کوژرام ئێوە بیبەن، گەر ئێوەش کوژران من خۆم دەیبەم... هەر کەسێک لە ئێمە گەیشتە مەمەدحەسار دەبێت ئەو کارەبکات، هەم لە بەر خۆی، هەم لە بەر ئەم کتێبە کە دەبێت بگاتە شوێنێکی باش».

ناوی پرۆفیسۆر بەهنام، دڵی منی تووشی خورپەیەکی کتوپڕکرد. لە

ئاڵ مورادم پرسی «پێم بڵێ، تۆ چۆن پرۆفیسۆر بەهنام دەناسیت، ئەم کتێبە چییە پێتە و کێ تۆی خستۆتە سەر ئەم ڕێگایە. پرۆفیسۆر هاوڕێی من و زەهاویشە، ئەو ئێمەی بە یەک ناساند، هەر ئەو ئەمانەتی پاراستنی ژیانی ئەم کوڕەی خستە گەردنی من». ئاڵ موراد وەڵامیدایەوە «نا برای زەریاواری ... نا». ئیتر بەردەوام وا بانگمدەکات «برای زەریاواری». «نا، من پرۆفیسۆر ناناسم، پرۆفیسۆرم نەبینیوە، کوڕێکی هاوڕێی ئەم کتێبەی بۆ هێنام، ئێستا مۆزەخانەکەی پرۆفیسۆر لە بندەستی سەی ئەسڵاندایە، لەسەرچی سەی ئەسڵان ڕقی لە پرۆفیسۆر بەهنامە؟ نازانم، بەڵام هەر ڕۆژی دووەمی دەستبکاربوونی وەک جێگری حاکم یاسین، هێزێکی نارد دەرگای مۆزەخانەکە دابخەن و پرۆفیسۆر بگرن. کەسێک کە خۆی ئەندامی باغەوانەکانە، یاری بە ژیانی خۆی کردوە و چووە ئەم کتێبەی دەرهێناوە و ڕزگاریکردوە. سەی ئەسڵان مۆزەخانەکەی بۆچییە؟ کەس نازانێت. ئاخۆ دەیەوێت بیسووتێنێت، دەیەوێت وێرانیبکات، دەیەوێت دەستی بەسەردا بگرێت، من هیچی لێ نازانم. تاکە شتێک لە مۆزەخانەکە هاتۆتەدەرێ ئەم کتێبەیە، بەوەدا جەنابی پرۆفیسۆر خۆی لە زیندانە ڕایسپاردوە کتێبەکە بگاتە دەست هاوڕێیەکی کە نرخی کتێبەکەی لایە... لەوانەیە ئەمە بە نرخترین شتی مۆزەخانەکەی بێت، لەوانەشە وانەبێت، کێ چوزانێت؟ . پرۆفیسۆر دڵنیایە، دیلاوار کەسی وای تێدا نەماوە ئەمانەتی وەها هەڵبگرێت... تا دوای خۆی کتێبەکە نەفەوتێت، داویەتە دەست من... من هەر ئەوەندە دەزانم».

«من دەزانم، دەزانم، ئەوە کتێبی دانیالە... دڵنیام کتێبی دانیالە، خۆیەتی»

ئاڵ موراد بە بێباکی سەیریکردم و گووتی «دەی کەواتە تۆ لە من باشتر دەزانیت. تۆ لە من زانیاریت لەسەر نرخی کتێبەکە زیاتر لایە». هەستمکرد سەرسام نەبوونی دەگەڕایەوە بۆ گەمژەیی. یەکەمین نیشانەی گەمژەیی نەمانی توانای سەرسامییە. من گووتم «نا، نا زانیاریم نییە، هێند هەیە من

چەندین شەوە، ئەو هەورانە لە خەوندا دەبینم، چەند شەوە لە خەونمدا هەر باران دەبارێت». خۆشم نەمزانی پەیوەندی ئەوە چییە بەوەی کە من ناوی ئەو کتێبە دەزانم. سەیری چاوی دەکەم، دڵنیام ئەویش ئەو خەونەی بینیوە، بەڵام هیچ ناڵێت، سەیری زەهاو دەکەم و ئەویش سەرسام سەیرمدەکات، دڵنیایە دەزانم کە ئەو لە مێژە خەونی هەورەکان دەبینێت... هەورەکانی کارەسات، هەورەکانی دۆزەخ، کە بەر لەوەی بە سەر ئەم چیایانەدا ببارێن، بە سەر ئەم شارانەدا ببارێن، لە ناخی ئێمەدا باریون. من لە دەروازەی ئەشکەوتەکەوە دەڕوانم و هەورەکان دەبینم، ئەوە یەکەمجارە کاتم هەبێت و هۆشم لای خۆم بێت و بە مەبەست سەر بۆ ئاسمان بەرزبکەمەوە تا هەورەکان ببینم. هەستێکی سەیر دامدەگرێت کە ئەو هەورانەی لە ئاسماندا دەیانبینم، هەر هەوری ناو خەونەکانی خۆمن و بە ئاسماندا دەفڕن. ئێستا کە سەیری ئەو هەورانە دەکەم، و لە دەمی ئەم ئەشکەوتدا لە خۆم دەڕوانم ، تێدەگەم هەرچی ئومێد و خەیاڵاتێک لە دیلاوار هەمبوو تەواوبوون، من و سەدان هەزار خەڵکی تر ئێستا لە ناو جەرگەی جەنگداین، سەدان هەزار کەس کە ساڵەهایە بۆ ئەم جەنگە ئیشدەکەن. هەورەکان بە خێرایی دەڕۆن و من بەردەوام سەیریاندەکەم، لەوە خێراترن، بتوانم ڕایانبگرم، هەستدەکەم بە جۆرێکی شێتانە ڕووەو دیلاوار دەکشێن، ڕەنگێکی خوێنین و سەیریان هەیە، تا دێت لە بەرچاوم سوورتر دەبن. چیتر لەوە درەنگترە کەس بتوانێت هیچ چەقۆیەک ڕابگرێت، هیچ گوللەیەک بگێڕێتەوە، هیچ هەورێک لە ئاسماندا بوەستێنێت، هەموو کارەساتەکان کەوتوونەتە سەر هێڵی خۆیان، ئەوەی جارێک بە خەونێک، بەترسێک دەست پێدەکات، ئێستا لە نێوان ئەم دوو دەفەرەدا وەک جەنگێکی هەتاهەتایی، وەک سەربڕین و سووتانێکی بێکۆتا و تا ئەبەد دەرکەوتۆتەوە. هەموو کارەساتەکان چوونەتە سەر ڕێگای خۆیان. دەپرسم ئایا لە هیچ جێگایەکدا، لە هیچ ڕۆژێکدا دەکرا ئەم جەنگە بوەستێنرێت. کە بیر لە خۆم دەکەمەوە، کە بیر لە مامە سیام دەکەمەوە،

کە بیر لە نەخۆشەکانی عیادەکە دەکەمەوە، کە بیر لە فەرماندار و حاکم یاسین دەکەمەوە، کە بیر لە نیگارکێشەکان دەکەمەوە، دەڵێم نا... نەدەکرا. بەڵام کە بیر لە پرۆفیسۆر دەکەمەوە، بیر لە دکتۆر سوعاد دەکەمەوە، بیر لەو دەموچاوە غەمگینانە دەکەمەوە کە لە شەوێکی تاریکدا لە دێلاواری ڕەش بینیمن، دەڵێم بەڵێ ... بەڵێ دەکرا. لە دەمی ئەشکەوتەکەوە دەڕوانم و سەربازە دڕ و تووڕە و ڕیشهاتووەکانی مەمەدحەسار دەبینم، لە خەیاڵی خۆمدا دەڵێم «سەدان ساڵ لە مەوبەر، دانیال لەمجۆرە هەورانەی بینیوە». وەک شتێکی دووبارە بڵێمەوە، وەک ڕاستییەک بدرکێنم کە لە مێژە دەیزانم و خۆمی لێ غافڵدەکەم، دەڵێم «مرۆڤ بۆ ئەوەی کارەسات ببینێت، پێویست ناکات سەیری مێژوو بکات، سەیری ئاسمان بکات، سەیری زەوی بکات، تەنیا بەسە لە ناخی خۆی بڕوانێت». غەمگین سەیرێکی هەورەکان دەکەمەوە، دڵنیام ئەوە هەوری خەونەکانی منە دەڕوات و دەبارێت ... هەوری خەونەکانی زەهاوە، هەوری خەونەکانی پرۆفیسۆرە ... لە خۆم دەپرسم، دەبێت مامە سیام ئەم هەورانەی دیبێت، دەبێت ئەمجۆرە بارانە لە خەونەکانیدا باریبن؟ دەبێت ژەنراڵ مەحمودی قەرەقازانی چیرۆکی ئەم هەورانە بزانێت؟ . هێندەی من لە مامە سیام تێگەیشتبم، پیاوێک بوو لەم دواییەدا پەیوەندی بە دەروونی خۆیەوە پچڕابوو، چیتر نەیدەزانی چی لە ناخی خۆیدا دەگوزەرێت.

ئێستا ئاوڕ لە ڕابوردووم دەدەمەوە و دەزانم، جێگایەک بتوانم ڕزگاری خۆمی تێدا بە دەست بهێنم و لەم جەنگەدا نەخنکێم، دێلاوار نییە ... من چیتر سەر بە هیچ شارێک، نەتەوەیەک، زمانێک نیم، بەڵکو تەنیا ترسێکم و بەزەویدا دەگەڕێم. لەگەڵ زەهاو و ئاڵ موراد دا کوڵەپشتەکەی یاقووبی قەموور هەڵدەگرم و دوا نیگای تەرمەکەی دەکەم و بەرەو مەمەدحەسار دەکەومە ڕێ. بە خەندەیەکی بێزار و تاڵەوە بە خۆم دەڵێم «مستەر... بۆئەوەی خۆت بناسیت، بڕۆ و کەمێک لە شاری دوژمنانیشدا بژی».

# ٤٥

مەمەدحەسار شارێکی گەورەیە، کە لە ترۆپکی «یائیمام»ـەوە ڕوانیمان، هەموو شار لە بەردەممماندا بوو، بەڵام کۆتاییەکانی لە هیچ جێگایەکەوە دیارنەبوون، دەریایەکی گەورەی تیشک بوو، ملیۆنەها گڵۆپ پێکەوە دەسووتان. هێندەی لە سەری یائیمامەوە، چاومان بەو تیشکستانە بەرینە کەوت، ئاڵ موراد گووتی «وای، سەیرکەن، سەیرکەن، چ شارێکی گەورەیە، چ شارێکی عەجایەبە، ڕەنگە ئەمە گەورەترین شاری دونیا بێت». ئەو کات نەمدەزانی دوژمن خاوەنی شارێکی وەها گەورەیە، دیلاواری ئێمە بە هەموو گەورەیی خۆی، پێدەچوو سێ یەکی ئەم شارە نەبێت. من بە سەرسامی گووتم «گەر گەورەترین شاری دونیا نەبێت، ئەی گەورەترین شاری دونیا دەبێت چۆن بێت؟». لە شوێنی خۆمانەوە لە ترۆپکی یائیمام، نەماندەتوانی ئەوسەری ئەم زەریای تیشکە ببینین، ملیۆنەها تیشک کە هەر یەکەیان دەستی ئادەمیزادێک دایگیرساندون، هەر یەکەیان مرۆڤێک لە بەر ڕوناکییەکەیدا دانیشتووە، هەر یەکەیان جۆرە دەستێک دەناسێت و جۆرە ژیانێک لە ژێر تیشکەکانیدا هەناسەدەدات. شارەکە بە جۆرێکی سامناک گەورەبوو، بە جانەوەرێک دەچوو هەر گەشەی کردبێت و گەشەی کردبێت و هیچ هێزێک نەیتوانی بێت بیوەستێنێت. سەیرم لێهات و لە خۆم پرسی، بۆ دەبێت خەڵکانێک کە خۆیان شارێکی وەها گەورەیان هەیە، بیر لە

جەنگی شاری تر بکەنەوە. شارەکە بەو گەورەییە ترسناکەی، بەو هەموو تیشکەی کە لێی هەڵدەستا، بۆ من غەریب و شەڕانگێز دەهاتە بەرچاو. گەورەییەکەی ئاماژەبوو بۆ برسێتییەکی جانەوەرئاسا، وەک ئەوەی لە ناکاو سەدان جێگا و شار و شارۆچکەی هەڵلوشی بێت، وەک ئەوەی بیەوێت بەردەوام بکشێت، نەوەستێت و جێگای تر بخاتە سەر جەستەی خۆی. من کە لەسەر بەرزاییەکانی یائیمامەوە ڕوانیم، هەستمکرد شەپۆلێکی دڕ و بێڕەحمی تیشک لە شارەکەوە بەرەو ڕوومان دێت. هەستمکرد بارانی چەند ڕۆژە خۆشبۆتەوە تا ئێمە لێرەدا شەڕانگێزیی ئەم شارە ببینین، تێبگەین کە ئەوەی بەرەو ناوی دەڕۆین، دەتوانێت لە خۆیدا بمانخنکێنێت و نەتوانین ئاسان جارێکی تر بێینە دەرەوە. ئاڵ مورادیش هەمان هەستی هەبوو، سەیری ئەو ئۆقیانۆسە ڕوناکەی بەردەممانی کرد و گووتی «پێدەچێت بە ئاسانی بڕۆینە ئەم شارەوە، بەڵام پێ ناچێت، ئەوەی کەوتە ئەم بەحرەوە ئاسان بێتەدەرێ». منیش وام هەستکرد، وەک ئەوەی مەمەدحەسار بە مەبەست، بە فریو، وەک تەڵە و فاقەیەکی ڕەش، دەرگاکانی خۆی بۆ ئێمە کردبێتەوە. تاکە کەسێک کە ڕای جیاوازی بوو، زەهاو بوو، کە بە هۆی ئەزموونی خۆیەوە، وەک پشیلەیەکی سەر ڕێگاوبان، دەیتوانی لە شوێنە داخراوەکان دەرچێت و بچێتەوە ناویان، ئەو گووتی «وەک هەر شارێکی تر دەرگای خۆی هەیە».

مەمەدحەسار بە جۆرێک گەورەیە، پاراستنی هەموو دەروازە و دەلاقەکانی کاری نەکردەیە، کە دەگەیتە بەرزاییەکانی یائیمام دەتوانیت لەوێوە بە ئاسانی لە ژێر باڵی شەودا و لە هەندێک لاڕێی تایبەتەوە بگەیتە ناو شار. من و دوو هاوڕێکەم لە شەوێکی ئارامدا، دوای چەندین ڕۆژ ڕۆیشتن و بارانی بەردەوام، پێمان خستە یەکەمین کوچەکانی مەمەدحەسارەوە، سەیربوو، شارەکە لە بانەوەڕا، چەندە ڕوناک بوو، لە ناوەوەڕا هێند تاریک بوو، وەک ئەوەبوو تیشکی چرا بێشومارەکانی باڵا

هەمووی خەیالات بوویێت، یان هەر ڕوناکییە و موڵکی تایبەتی کەسێک یان شوێنێک بێت کە هەرگیز تیشکی نادات بە ناو کوچە و جێگاکانی دی. کۆڵانەکانی مەمەدحەسار تاریک بوون، ئەوە سەرنجی کتوپڕی ئەو شەوە سەیرەی ژیانم نەبوو، بەڵکو لە دوو ساڵی دواتریشدا کە لەو شارەدا ژیام، بەردەوام کوچەکانم تاریک دەبینی، وەک ئەوەی تیشک بە ئاسانی نەتوانێت شەوی ئەم زەمینە ڕوناکبکاتەوە، نەتوانێت قەوارەی زوڵمەتێک بشکێنێت کە بە نهێنی وەک هالاو لە زەوییەوە هەڵدەستا. لەگەڵ گەیشتنماندا بە یەکەم شەقامی گەورە، یەکەم ئاسەوارەکانی شەڕم بینی، گەرچی ئێمە زۆر دوور لە کەنارەکانی شاردا بووین، بەڵام چەندین لافیتەی جەنگم بینی، دروشمی گەورە، وێنەی سەرانێک کە نەمدەناسین. شەو ڕووی لە درەنگی بوو، بە قسەی زەهاو نەدەبوو بکەوینە نیوەشەو. تا کات درەنگتر بایە، ڕێبواران و گەڕیدەکان و غەریبان پتر دەبوونە جێگای گومان، کاتمان نەبوو وردبینەوە، کاتمان نەبوو لە تاریکیدا سەیری ئەم سەر زەمینە جیاوازە بکەین، لە باڵەخانە و تەلاری شار بنوارین. تاکە شتێک مەراقمان بوو، ئەوەبوو جیاوازی خۆمان دەرنەخەین و سەرنجی کەس ڕانەکێشین. سێ کەسی شەکەت و بێبڕست و چڵکن بووین، دەبوو بە زووترین کات بگەینە ئەو ناونیشانەی کە بەس خودا خۆی دەیزانی لە ناو دەریای ئەم شارەدا کەوتۆتە سەر چ شەقامێک یان ناو چ کوچەیەک. دەمانزانی شێوە و ڕوخسار و زمانمان جێگای گومانە، بەڵام چ چارێکمان هەبوو. دوای چاوەڕوانییەکی کەمێک درێژ تاکسییەکمان چنگ کەوت و زەهاو بەو زمانەی کە دەیزانی ناونیشانی چاپخانەکەی پرۆفیسۆر شابەندەری دا بە شۆفێرەکە. ئاڵ موراد هەندێک پارەی مەمەدحەساری پێ بوو، کە نەماندەزانی چەندە و نەماندەزانی چی دەکات، بەڵام زەهاو دەیگووت چەند ڕۆژێک کۆمەکماندەکات و چەند نانێکی پێ دەخورێت. خاوەن تاکسییەکە شوێنەکەی بە دوور دەزانی، بەڵام وەک هەموو شۆفێرە سەرسەختەکان کە

سوورن لە کۆتایی شەودا پارەیەکیان دەستبکەویت، ملی ڕێگای گرتە بەر. پیاوێکی بێدەنگ بوو، هەندێک پرسیاری کەمی لە زەهاوکرد کە بە ئارامی وەڵامی دایەوە. زەهاو لە ساڵانی قاچاغبەریدا هێندە لەگەڵ قاچاغچییەکانی مەمەدحەساردا سەروکاری بووبوو، دەیتوانی ئەو وشانەی دەیانزانێت بە دروستی و لە شوێنی خۆیاندا بەکاریانبهێنێت. بە پێچەوانەی منەوە کە لەسەر ڕووی کتێب زمانەکان فێربووبووم و ئەگەری بەکارهێنانی هەڵەم بۆ ڕستەکان گەورەبوو. دوای سەفەرێکی درێژ کە نزیکی سەعاتێکی خەیاند گەیشتینە شەقامی حەبیبوڵای داغستانی. شەقامەکە لەمسەر بۆ ئەوسەر داخرابوو، دەرابەکان زۆریان قفڵیان لێ درابوو، بەڵام پێدەچوو ئەم جێگایە بە ڕۆژ مەیدانی جموجوڵێکی گەورە بێت. چاپخانەی ئیعتیماد لەسەری فولکەیەکی گەورەدا بوو، مەیدانێکی بەرین و کراوە بەرامبەری بوو، پێیاندەگووت «دەروازەی فیردەوس». چاپخانەکە باڵاخانەیەکی سێ قات بوو، تاکە جێگایەک بوو لە سەری مەیدانەکەدا دەرگای کرابووەوە، من و ئاڵ موراد پێکەوە چووینە ژووری و زەهاومان لە بەردەرگاکە دانا. گەر تووشی کێشە و ڕاکردنێک بهاتباین، زەهاو دوا هیوامان بوو جارێکی تر لەم شارە دەرمانبکات، ئێمە بڕیارمان دابوو گەر ژیانمان لە مەمەدحەسار بکەوێتە مەترسییەوە، هەندێک کەلوپەل و نەخشەیەک بکڕین و هەندێک کەس ڕووتبکەینەوە و دیسان بەرەو شارێک و جێگایەکی دیکە بکەوینە ڕێگا. گەر زەهاومان لەدەستبدایە، هەموو هیوایەکیشمان لە دەستدەدا، ئەو هەر شارەزا و گورگی ڕاستەقینەی ڕێگاوبان نەبوو، بەڵکو لە هەردووکمان وریاتر و بە گورتریش بوو.

دەمی دەرگای چاپخانەکە ئۆفیسێکی گەورە بوو، دەرگایەک لە ئۆفیسەکەوە دەچووە سەر هۆڵێکی گەورە کە تێیدا ئامێرە گەورەکانی چاپ وەک شێت دەنگیان دەهات و چاپیاندەکرد. مێزێکی دارگوێزی زۆر کۆن و پتەو لە ناوەڕاستی ئۆفیسەکەدا بوو، تاقمێک قەنەفەی سەوزی تێر،

دۆلابێکی پڕ کتێب، چەندین تەپلەک کە هەر هەموویان چەندەها جۆری ڕۆژنامەیان لەسەربوو، شوشەی سەر مێزە گەورەکە خاوێن و پاک دەبریسکایەوە، وەک بەر لە هاتنی ئێمە دەستێک شتەکانی ڕێکخستبێت، تەنیا پیاڵەیەک چای نیوەخوراوەی لەسەر بوو، لەگەڵ کلۆیەک شەکردا، سۆبایەکی نەوتیش لە سوچێکدا دەسووتا. دوای نزیکی سێ مانگ یەکەم جارم بوو پێ بخەمە شوێنێکەوە لە ژوور بچێت، هەوای گەرم و ئارامی ئۆفیسەکە هێندە بە لەشم دۆست بوو، گیانم وەها غەریبی شوێنێکی وەهای کردبوو، دەمویست بێ هیچ مۆڵەتێک خۆم بدەم بەسەر قەنەفەکاندا و دانیشم. بۆنێکی تایبەتی لە ئۆفیسەکەدا بوو، کە بۆ من جادویی و هەژێن بوو، بۆنی عەتر نەبوو، بۆنی دەرمانی خاوێنکردنەوەش نەبوو، بەڵکو بۆنی شتێک بوو کە بیرمدەکرد، بۆنی تازەی کتێب، بۆنی لاپەڕەی نوێ کە تازە لە ژێر میلی چاپ دێتەدەرێ، بۆنی حەرف کە تازە وەک بێچووی بولبول لەدایکبوون و خۆیان بۆ ژیان ئامادەدەکەن. پێم سەیر بوو کە بۆنی تیژی چاپخانەکە، بۆنی ئامێرەکان، بۆنی مەرەکەبی چاپ، بۆنی کاغەز، لەم ماندوویێتی و ترسەدا وەها ئارامدەکەنەوە. بۆ ساتێک هەستم نەکرد لە مەمەدحەسارم، بەڵکو هەستمکرد لەسەر زەمینێکی جاویدام، لە جێگایەکدام کە لە سەرەتای ژیانمەوە بۆی گەڕاوم، شوێنێک کە بێئەوەی بە خۆم بزانم ژیانم بەردەوام ڕووی تێکردوە. بۆ چرکەیەکی کورت ئەژنۆکانم شل بوون، دەبوو لەسەر زەوییەکە دانیشم، نەمدەزانی چی بکەم، هەستێکی بێمانام هەبوو کە لەو کاتەوەی لە دیلاوار دەرچووم، بە نیازی ئێرە هاتووم و بەرەو ئەم جێگایە بەڕێکاوەبووم ... من و ئاڵ موراد هەردووکمان سەیری شتەکانمان دەکرد، بۆنی شوێنەکەمان دەکرد، هەر دووکمان چلکن و ڕیش هاتووبووین، گەرچی بەر لە هاتنە ناو شار، لەسەر کانییەک خۆمان خاوێن کردبووەوە، بەڵام هەر کەسێکی زیرەک سەیریبکردبایە، دەیبینی لە ڕێگای دوورەوە هاتووین و شەکەتین. لەو کاتەدا پیاوێکی زۆر زلی سەر

ڕووتاوە کە جووتێک گوپی خێپش و شۆڕی هەبوو، بە لەفەیەکەوە هاتە ژووری. کە ئێمەی بینی لە بری ئەوەی بحەپەسێت قاقا پێکەنی و گووتی «ئەوە ئێوە کێن؟ براکانم... فەرموون... فەرموون. چیتان دەوێت؟». من بەو زمانەی لەسەر ڕووی کتێب فێری بووبووم سلاومکرد و بە دەنگێکی لەرزۆک گووتم «ئێمە هاوڕێی دکتۆر شابەندەرین، ئەمانەتێکی تایبەتیمان بۆ جەنابی پرۆفیسۆر هێناوە، لەگەڵ نامەیەکی خسوسی، دەمانەوێت دەم و دەست چاومان بە جەنابیان بکەوێت». دیاربوو شێوە و قەیافەتمان بە هیچ یەک لە هاوڕێکانی پرۆفیسۆری نەدەکرد. کابرا فەرمووی لێکردین، دانیشین و بەسەرسامییەوە سەیریکردین و گووتی «ئەها ... ئەها ... ئێوە هاوڕێی دکتۆر شابەندەرن، هاوڕێی تایبەتین. دەتانەوێت بە شەخسی خۆی ببینن، ئەها... دەتانەوێت دەم و دەست خۆی ببینن». نەمزانی کابرا گاڵتەی بە قسەکانمان دێت یان بە ڕاستی دەیەوێت تێبگات. من سەرم لەقاند و گووتم «بەڵێ، وایە، دەمانەوێت خۆی ببینین، دەمودەست، شتێکی زۆر گرنگمان بۆ هێناوە». پیاوەکە لەفەکەی دانا و دەستی برد بۆ تەلەفونێکی سەوز کە لەسەر مێزەکە دانرابوو و ژمارەیەکی لێدا و وەک یەکێک دوودڵ بێت لە وەرگرتنی ژمارەکە بە چاوێکی کەمێک حەپەساوەوە کەوتە چاوەڕوانکردن. گوێم لە دەنگی کەسێک بوو لەوسەر، پیاوەکە بە ڕێزەوە سلاویکرد و بە خێرایی هەندێک قسەیکرد کە من لە زۆری تێنەگەیشتم، دواجار گووتی «بەڵێ ئەمانەتیان پێیە، یەکێک ئەمانەتێکی داونەتێ بیهێنن بۆ جەنابت». پاش هەندێک قسە، پیاوە قەڵەوە سەر ڕووتاوەکە سەیری منیَ کرد و پرسی «کێ ئێوەی ناردوە؟». من گووتم «پرۆفیسۆر بەهنام بریکان، پرۆفیسۆری مێژوو و ئاسەوارە دێرینەکان. ئێمە نامەیەکی تایبەتیشمان لە جەنابی پرۆفیسۆرەوە بۆ ئەوان پێیە، پێی بڵێ هەورەکانی دانیال، ئیتر جەنابیان دەزانێت کێین». کابرا ناوەکەی پرۆفیسۆر بەهنامی بۆ ئەوی سەر خەت دووبارەکردەوە و شفرەی هەورەکانی دانیالی پێگووت، کە قسەیدەکرد

جار جار بە گومانێکیشەوە سەیری ئێمەی دەکرد و بە چاوێکی سەیر و سەرسامەوە لێی دەڕوانین. دوایی تەلەفونەکەی دانا و گووتی «خۆی بوو، جەنابی دکتۆر بوو، شەخسی خۆی بوو». وەک ئەوەی بیەوێت ئێمە بخاتە گومانەوە دووجار سەیریکردین و گووتی «زۆر شەکەت دیارن، وانییە، زۆر شەکەت دیارن... لە کوێوە هاتوون؟ بە زمانتاندا دیارە خەڵکی ئێرە نین». من گووتم «ئەگەر جەنابتان کەرەم بفەرموون و ڕێگا بە ئێمە بدەن، شەخسی دکتۆر خۆی ببینین، ئەوسا لەگەڵ جەنابیان هەموو شتێک باسدەکەین». سەرێکی ڕاوەشاند و گووتی «تەبیعی، تەبیعی. دکتۆر لە سەرەوە چاوەڕوانتانە، گەر لەگەڵمدا بێن، من تا لای ئەو دەتانبەم. لە خۆشبەختی هەموومانددا ئەوە ساڵێکە دکتۆر ماڵەکەشی هێناوەتە ئێرە، ئەوە کارێکی باش بوو. تەبیعی دەتانبەم بۆلای جەنابی دکتۆر، تەبیعی، خودی دکتۆر لە قاتی سەرەوەیە». من و ئاڵ موراد دوای کابرا کەوتین، ئاڵ موراد ڕەنگی سپی بووبوو، هەردووکمان بە ڕاستی دەترساین، ئەم ساتانە گرنگترین ساتی ژیانمان بوو، بە زەهاومان گووتبوو هەر بینیت ماشێنی پۆلیس لێرە نزیکدەبێتەوە، دووربکەوە و هەوڵبدە نەگیرێیت.

بێئەوەی پێویست بێت بە ناو هۆڵی چاپخانە گەورەکەدا بڕۆین، بە ڕاڕەوێکی باریکدا ڕۆیشتین، بە پلەکەیەکی تەنگەبەردا دوو قات سەرکەوتین، نەمانزانی قاتی دووەم چی تێدایە، بەڵام لە قاتی سێهەمدا پلەکەکان لە پێش دەرگایەکی دارینی قەشەنگدا تەواوبوون. پیاوە قەڵەوەکە لە زەنگی دەرگاکەی دا و بە جۆرێکی سەیر هەموو هۆشی کۆکردەوە بزانێت دەتوانێت خشپەیەک یان جوڵەیەک ببیستێت، گوێ شلکردنی وەک گوێ شلکردنی کەسێکی ترساو بوو، کەسێک خۆی ئامادەبکات تا لەگەڵ یەکەم جوڵەی پشت دەرگاکەدا هەڵبێت. من لە پێش دەرگاکەدا وەستابووم و تەنیا سەیری ڕوخساری ئەوم دەکرد. بێئەوەی هیچ دەنگێک بێت، لە ناکاو دەرگاکە کرایەوە. پیاوەکە کتوپڕ دەموچاوی گۆڕا و خەندەیەکی

مندالانە کەوتە سەر سیمای و بە دەنگێک شتێک لە ڕیایی تێدا بوو گووتی «هۆی جەنابی دکتۆر، خۆتانن؟ خۆتانن؟ . عەجایەب ئەی مەسعود لە مال نییە، یان ئەو تەپۆیە لە ئێستاوە خەوتووە». دکتۆر دەرگاکەی بە تەواوی کردەوە و من و ئال موورادیش بینیمان، پیاوێکی کەمێک ورگن و سەرخڕ بوو، ڕیش و سمێلێکی چڕی هێشتبووەوە، جووتێک بڕۆی زۆر گەورەی هەبوو، چاوانی ڕەش و گەورە بوون، ڕیشی ماش و برنجی بوو، بەلام قژ و بڕۆی وەها قەترانی کە هیچ پێکەوە نەدەگونجان، ئەو دوو ڕەنگە ناکۆکییەکی جوان و سەرنجڕاکێشی بەخشیبوو بە ڕوخساری. دەستێک بیجامەی سپی لە بەردابوو، چاویلکەیەکی بە دەستەوە بوو و بە سەرسامییەوە سەیری من و ئال مورادی کرد و بێئەوەی وەلامی کابرا بداتەوە، گووتی «بەهنام بریکان؟ بەهنام بریکان؟ ئەو ئێوەی ناردوە بۆ لای من... ئەو؟». دەنگی پڕبوو لە پرسیار و سەرسامی. من تفێکم قووت دا و گووتم «بەلێ، پرۆفیسۆر بەهنام، مێژوو... نوس». بە پەنجە ئاماژەی بۆ کردین و گووتی «خێرا وەرنە ژووری، وەرنە ژووری». ڕوویکردە پیاوە قەلەوەکە و گووتی «بەلێ خەوتووە... بەلێ. تا بەیانی پلاکاتەکان دەبێت ئامادەبێت... تا بەیانی، ئەمشەو فتوانی باوەحیز سێ جار تەلەفونیکردوە. گەر تا بەیانی کارتان کردوە، دەبێت ئامادەیبکەن». قەلەوەکە پێکەنی و گووتی «ئەی چۆن، ئەی چۆن، تەبیعی. ئێوە ئارام بخەون و کارتان بە هیچەوە نەبێت، پێش سەعات هەشت هەموو شت ئامادەیە ... هەموو ئامێرەکان ئیشدەکەن، مەکینە گەورەکەشمان داگیرساندوە». ئێمە چووینە ژووری، کابرا دەرگاکەی توند داخست و بە زمانێکی دێلاواری ساف گووتی «بە ڕاست، بە ڕاست ئێوە لە دێلاوارەوە هاتوون؟ بە ڕاست پرۆفیسۆر بەهنام بریکان ئێوەی ناردوە؟». ئێمە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستاین، مالەکەی پرۆفیسۆر قاسم، بە مالی پیاوێکی زەنگین و پارەدار دەچوو. فەرشەکانی لە گرانترین جۆری بەن بوون، کورسییەکانی لە قەشەنگترین

جۆری تەختە، ڕوناکی و چلچراکانی تەلایی و بە شکۆ. من و ئاڵ موراد دوو چڵکن بووین، دوو ماندوو، دوو ترساو، دوو سەرسام، کە بەترسەوە پێمان دەخستە سەر فەرشە گرانبەهاکان نەبا پیسبن. هەر دووکمان سەیرمان لەو دیلاوارییە سافەی پرۆفیسۆر هات. ئاڵ موراد گووتی «بەڵێ، بەڵێ جەنابی پرۆفیسۆر لە دیلاوارەوە هاتووین، من هەڵگری نامەیەک و ڕاسپاردەیەکم بۆ ئێوە». ئەو بەرامبەرمان وەستا و بەوردی سەیرێکی کردین و وەک هەڕەشەبکات، پەنجەی ڕاوەشاند و گووتی «چەند ڕۆژە بە ڕێگاوەن، کەوتوونەتە ناو گەرمەی جەنگ، ناخۆشی زۆرتان بینیوە ... ڕوخسارتان دیارە. وەک لە شەڕ ڕاتانکردبێت». من بە دەنگێکی کز گووتم «بەڵێ». گووتی «دوامکەون». جارێکی تر ئێمەی بە ناو ساڵۆنێکی جواندا برد بۆ ژوورێکی ڕازاوە و فەرمووی لێکردین دانیشین. ئاڵ موراد بە پەلە نامەکەی پرۆفیسۆر بەهنامی دەرهێنا و دایە دەستی و گووتی «ئەم ئەمانەتەشی لەگەڵدایە، ئەم ئەمانەتە». ئاڵ مورادیش دەستی دەلەرزی، منیش دەستم دەلەرزی. بۆ ئەوەی ئەمانەتەکە نەکەوێت، ئاڵ موراد قوتوە پێچراوەکەی بە هەردوو دەست گرت و خستییە بەردەستی پرۆفیسۆر. هەستمکرد پرۆفیسۆر لە دۆخێکی وروژان و نائاسایی دایە، بە پەلە نامەکەی کردەوە، سەری لەقاند و گووتی «دەستوخەتە جوانەکەی خۆیەتی، بەهنام ... بەهنام بریکان». نامەکە دوو لاپەڕەی درێژبوو، بە خەتێکی ورد نوسرابوو. پرۆفیسۆر بێئەوەی هەتا یەکجاریش سەر بەرزبکاتەوە، دووجار نامەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە. بە دەستێکی ترساوەوە دەستی برد بۆ قوتوی کتێبەکە و لە سەرەخۆ کردییەوە، من کتێبی دانیالم ناسییەوە. هەمان ئەو کتێبە بوو کە جارێک لە جاران گرتبووم بە دەستمەوە. هەستمکرد پرۆفیسۆریش دەستی دەلەرزێت، هەموو گیانی خرۆشان و سەرسامی بوو، لەبەر خۆیەوە دووجار گووتی «لەم شەوەدا ... لەم شەوەدا و ئەم هەموو شتە سەیر و عەجایەبە ... ئاە لە دەست شەو». ڕوویکردە ئێمە و گووتی

«کتێبەکە هەیبەتی هەیە، دوا نوسخەیە لە دونیادا، هیچ نوسخەیەکی تر لەم کتێبە بوونی نییە، گەر بفەوتێت بەڵگەیەکی مێژوویی لەسەر دونیای دێرین دەفەوتێت. کۆنترین کتێبێکە پێشبینی شەڕی دینەکان، مەزهەبەکان، نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینەی کردوە». سەیربوو بەلامەوە پرۆفیسۆر بەهنام بە نرخترین پارچەی ناو مۆزەخانەکەی خۆی ناردوە بۆ ئەم پیاوە. بەڵام لە دۆخێکدا نەبووم پرسیاری وەها بکەم و بچمە ناو وردەکاری لەو جۆرەوە. پرۆفیسۆر کەمێک بۆنی کتێبەکەی کرد و وەک توحفەیەکی بە نرخ کەمێک نای بە سنگییەوە و گووتی «دوای چەندین ساڵ، دوای چەندین ساڵ دەگەڕێتەوە». ئینجا سەیریکردین و گووتی «کامتان مورادن، کامتان؟ ... پرۆفیسۆر ڕایسپاردوە من کۆمەکی موراد بکەم». ئاڵ موراد گووتی «ئێمە سێ کەسین، هەر سێکمان پێویستمان بە یارمەتییە، هەر سێکمان ژیانمان لە مەترسیدایە، هەم لە دێلاوار هەڵهاتووین و هەم لە مەمەدحەساریش بێ پشت و پەناین و گەر بگیرێین نازانین چیمان بەسەر دێت. بەڵێ من کە لە دێلاوار هاتمە دەرەوە لەگەڵ قاچاغبەرێکدا بووم، بەڵام لە ڕێگا کەوتینە ناو پەلاماری سەربازەکانی مەمەدحەسار و هاوڕێکەم کوژرا. هاوڕێم ڕێنواری زەریاواری و هاوڕێکەی، هەم من و هەم کتێبەکەیان ڕزگارکرد، گەر ئەوان نەبوونایە من و کتێبەکە نەدەگەیشتینە ئێرە. ئەوەی لێرەدا سەیرە ئەوەیە کە کاکی زەریاواری خۆی دۆستێکی شەخسی پرۆفیسۆر بەهنامە، خۆی شەرەفی ئەوەی پێبڕاوە ڕوو بە ڕوو لەگەڵی دابنیشێت و قسەوباسیش بگۆڕنەوە».

پرۆفیسۆر شابەندەر سەیرێکی منی کرد و گووتی «ئەی هاوڕێکەتان کوا، ئەو لە کوێیە؟». من بە شەرمێکەوە گووتم «لە خوارەوە چاوەڕێماندەکات. ترسمان بوو هەر سێکمان بێینە سەرەوە». پرۆفیسۆر گووتی «یەکێکتان زەحمەت بکێشێت و بچێتە خوارێ، با ئەویش بێتە سەرێ. من مەبەستم ئەوە نەبوو بڵێم کە تەنیا کۆمەکی کەسێک دەکەم کە ناوی لە نامەکەی

پرۆفیسۆردا هاتبێت. بۆ ئێمە ئەوە شتێکی نوێ نییە، لە ساڵانی ڕابوردوودا پرۆفیسۆر بەهنام ژیانی چەندەها کەسی پاراستووە کە لە مەمەدحەسارەوە هەڵهاتوون، ماوەیەک ماڵی ئەو شوێنی حەشاردان و خۆشاردنەوەی ئەو کەسانە بوو کە لە دەست فەرمانڕەوایانی مەمەد حەسار هەڵدەهاتن، من لێرەوە ئەوانم دەنارد بۆ لای پرۆفیسۆر و ئەو لەوێ دەیشاردنەوە و ژیانی نوێی بۆ دابیندەکردن. من و پرۆفیسۆر هاوڕێی منداڵیین».

سەیرم لێهات دوو پیاو لە دوو شاری وەها دوژمندا بەمجۆرە دۆست بن. ئەو شەوە زەهاویشمان هێنایە سەرێ و دکتۆر بێئەوەی داوای هیچ چیرۆک و هیچ ڕوونکردنەوەیەک بکات، بێئەوەی لە ناوی تەواوەتیشمان بپرسێت، دوای ئەوەی یەکێک لە کرێکارەکانی چاپخانەکەی ڕاسپارد، هەرچییەک بۆ خواردن لەم کاتەدا دەستدەکەوێت بیخاتە بەردەممان، لە قاتی دوو، لە ژوورێکی گەورەدا لەسەر سێ تەختە خەوی پاک، شوێنێکی نوستنی تایبەتی پێبەخشین کە لە دوو ساڵی داهاتوودا دەبێت بە شوێنی مانەوە و خەوی هەمیشەیی من و زەهاو. شەو دکتۆر شابەندەر پێی گووتین کە بەیانی بە هیچ جۆرێک لەو ژوورە نەیەینە دەرەوە، دەرگای ئەپارتمانەکە دابخەین و دەرگا لە کەس نەکەینەوە.

بەیانی من بەر لە هەمووان هەستام، شەوێکی بێهۆشانە و بێخەون و مردووئاسام بردبووە سەر. توانای بیرکردنەوەم لە هیچ شتێک نەبوو، لە پەنجەرەکەوە ڕوانیمە شەقامی حەبیبوڵا داغستانی و مەیدانی دەروازەی فیردەوس، شەقام و مەیدانێکی زۆر جەنجاڵ و پڕ هاتوچۆ بوون، پێدەچوو شاری مەمەدحەسار لەم مەیدانەدا، توندتر لە هەر جێگایەکی تر بهەژێت و هەناسە بدات، هەموو شتێک لەوێدا دەجوڵا. لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدا سەکۆیەکم بینی، وەک بۆ شوێنی ئاهەنگ و کۆبوونەوە تەرخان کرابێت. پەنجەرەی ژوورەکەی ئێمە هەم بەسەر مەیدانەکەدا دەڕوانێت و هەم

بەسەر بەشێکی شەقامەکەشدا، تا پەنجەرەکان داخراون ژوورەکە کپ و خامۆشە، بەڵام هێندەی پەنجەرەیەکت کردەوە لێشاوی دەنگ و هوروژمی هاوار و زیقەی فرۆشیاران و وڕەی ماشێن بە شێوەیەکی بێڕەحم خۆیان دەکەن بە ژووردا... دەنگەکان بە جۆرێکن دەبێت خێرا پەنجەرەکە دابخەیت. من ئەو بەیانییە بۆ یەکەمجار بۆنی ڕاستەقینەی مەمەدحەسار چوو بە سەرمدا، شارەکان بە شەو بۆنیان نییە، ئەوەم لە دێلاواریش تاقیکردۆتەوە، هەر وەخت تاریکی دەکەوێت، هێدی هێدی بۆنی شەقام و کوچەکان پاشەکشەدەکەن و بێ بۆنییەکی سارد لە هەموو شوێنێک دەنیشێت، بەڵام ڕۆژ لەگەڵ هەڵهاتنیدا هەم مرۆڤ، هەم بۆن، هەم هالاوە تایبەتییەکانی شار لە خەو هەڵدەستێنێت. مەمەد حەسار دووەمین شاری ژیانی منە پێی تێبخەم، بۆنێکی سەیری هەیە، کە پلە بە پلە و جار بە جار دەگۆڕێت، هەندێ جار وەک تێکەڵەیەکی عەجایەبە لە بۆنی سیر و خەڵوز و سمڵی ژنان، هەندێ جاریش ئاوێتەیەکە لە بۆی ترشیات و زیرە و ئەدکۆڵۆنی هەرزان، هەر جارێک کە با دێت و ئەو بۆنانە دێنێت، مرۆڤ لە ناو هەستە جیاوازەکاندا نوقم دەبێت، دواتر دوو بۆی تر دەچنە سەر لیستی بۆنە سەیرەکانی من، ئەو بۆنانەی کە تا ماوم وەک بۆی مەمەدحەسار دێنەوە کەپووم و لە هەر جێگایەک بم بە ئاگام دەهێننەوە ... بۆنی خوێن و بۆنی سووتان... دوو بۆن هەندێک ڕۆژ لە مەیدانی فیردەوسەوە تا ئەو سەری شار وەک تەمێکی تەنک لە هەموو جێگاکان دەنیشێت. ڕۆژی یەکەمم تەنیا نەمتوانی لە پشت پەنجەرەکەوە سەرسامانە لەو شەقام و مەیدانە بنوارم، هەر یەک لە زەهاو و ئاڵ موراد تا درەنگ خەوتن، دەیانویست بە خەوی درێژ، شەکەتی ئەو چەند ڕۆژە لە لەشی خۆیان دەربکەن. نزیکی نیوەڕۆ کلیلێک بە هێمنی دەرگای ئاپارتمانەکەی کردەوە و جەنابی پرۆفیسۆر بە خۆی و دوو زەرفی گەورەی خۆراک و نانەوە هاتە ژوورێ. پرۆفیسۆر قژی لە شەو ڕەشتر و ڕیشی سپیتر دیاربوو، کەمێک ڕوخۆشتر بوو،

شەو هەژان و سەرسامییەک لە چاویدا بوو کە ئیستا نەمابوو، ئاسایی و خۆشڕوو دەینواند. کۆمەڵێک زانیاری داینێ لەسەر مانەوە و هاتوچۆ و خۆپاراستنمان، بەڵام گووتی «بەر لەوەی هیچ بڕیارێکی گرنگ دەربارەی چارەنوستان بدەین، دەبێت زۆر بیربکەینەوە، مەسەلەی گەڕانەوەتان بۆ دیلاوار مەحاڵە، جەنگ لە دوێنێوە بە درێژایی دوو سەد کیلۆمەتری سنوور گری سەندوە، گەڕانەوە و هاتوچۆ بە سنوورەکاندا بۆتە مەحاڵ، سەدان هەزار جەنگاوەر لە هەر دوولا لە شەڕدان». دەبوو ئێمە و پرۆفیسۆر یەک یەک دابنیشین و قسەبکەین، پرۆفیسۆر دەیویست باشترین ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات. یەکەم کەسێک کە قسەی لەگەڵ کرد من بووم، لە تەک خۆیدا چوومە ژوورێکی جوانی ئاپارتمانەکەی خۆی، دیاربوو پرۆفیسۆر بە تەنیا دەژیا. تەنیا کوڕێکی بەر دەست لە ماڵەکەدا بوو کە کاری پاککردنەوە و ڕێکخستنی ئەنجامدەدا. پرۆفیسۆر هەندێک پرسیاری لە من کرد و منیش شتێکی کەمم لە ژیانی خۆم بۆ گێڕایەوە. پرۆفیسۆر شتێکی دەربارەی ئەوە بیستبوو کە فەرمانڕەوایان لە دیلاوار خەڵک بە تۆمەتی شێتی دەخەنە قەرەنتینەکان و دوایی وەک هێزی کار دەیانبەنە سەر سنوور تا ئیشیان پێبکەن. گووتی «بەڵێ ڕۆژنامەکان لێرە بەردەوام قسە لە دوژمن دەکەن، هەواڵ زۆر بڵاودەکەنەوە، بەڵام چەندی ڕاستە و چەندی درۆ مرۆڤ هیچ کات ناتوانێت تێبگات». من گووتم «بەڵێ جەنابی پرۆفیسۆر، لە چوار مانگی ڕابوردوودا یەکەمین شێتخانە لە دیلاوار دروستکرا، بەڵام هیچ کات پێوەرێکی ڕوونمان بۆ جیاکردنەوەی شێتی و عاقڵی نەبووە، هیچ کات، زۆربەی نەخۆشەکانمان کەسانی ئاسایی بوون کە هەندێک کێشەیان هەبووە، بەڵام هیچ کات ناکرێت وەک شێت وەسفیانبکەین، ئێمە لە دیلاوار هێشتا وەها زیرەک و شارەزا نین، بتوانین شێت و کەسانی ئاسایی لە یەک جیابکەینەوە». دکتۆر گووتی «من مامۆستای مێژووبووم، بواری تایبەتمەندیم مێژووی

شارەکانی خۆرهەلاّت بووە، دیلاوار هەمیشە جێگای بایەخی من بووە. من تا حەڤدە ساڵان لە دیلاوار بووم، ئەو کات دەسەلاّت لە مەمەدحەسار سەڵتەنەتی بوو، سولتانی مەمەدحەسار خۆی بە سولتانی دیلاواریش دەزانی، باوکم پزیشکی سوپای مەمەدحەسار بوو، من لە دیلاوار لەدایکبووم، دایکم دیلاواری و باوکم مەمەدحەسارییە. پرۆفیسۆر بەهنام هاوڕێی منداڵیم بوو، لە تەمەنی پازدە ساڵیدا پێکەوە خولیای دروستکردنی زنجیرەیەک مۆزەخانەی گەورە لە دیلاوار و مەمەدحەسار و شارەکانی تر کەوتە سەرمان. بیرۆکەی مۆزەخانەی دیلاوار کە دواتر پرۆفیسۆر هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخانکرد، بیرۆکەی هەر دووکمان بوو، بەلاّم من تەمەنم شازدە ساڵان بوو کە شۆڕشگێڕانی دیلاوار توانیان سوپای ئێمە دەربکەن، من و خێزانم گەڕاینەوە بۆ مەمەدحەسار، بەلاّم بە هۆی دایکم و خزمەکانییەوە هەمیشە لە پەیوەندیدا بووین. من و پرۆفیسۆر دوای ئەوە یەکترمان نەبینییەوە، بەلاّم چەندەها ساڵە، هەتا مانگێکیش تێنەپەڕیوە بێئەوەی ئاگامان لە یەک بێت. هەر دووکمان مێژوومان خوێند، ئەوە خولیای هەردووکمان بوو، لە کاتی نوسینی دکتۆراکەمدا گەلێک سوودم لە شارەزایی و لێزانینی بەهنام وەرگرت». پرۆفیسۆر بە پێچەوانەی مامەوە کە قسەیدەکرد هیچ کات چاویلکەکەی نەدەکردە چاوی، بەردەوام بە دەستییەوە بوو، گەر چاویلکەکەشی بکردایەتە چاوی قسەی نەدەکرد، بەڵکو شتێکی دەخوێندەوە. من گوتم «من ناتوانم، بڵێم کە دۆستێکی نزیکی پرۆفیسۆرم، بەلاّم چەند جارێک یەکدیمان بینیوە. لە چوارچێوەی ئەو ئەرکەدا کە هەر مرۆڤێک بەرپرسیاری یەکێک بگرێتە ئەستۆی خۆی، هەر مرۆڤێک مرۆڤێکی تر ڕزگاربکات، من دەبوو بەشداربم، من پێشتر هەڵەیەکی کوشندەم کردبوو، پرۆفیسۆر دەیگووت، بۆئەوەی خۆم پاکبکەمەوە دەبێت مرۆڤێک ڕزگاربکەم. من لەوێدا زەهاوم ناسی، گەرچی تا ئێستا ئەو زیاتر کۆمەکی بە من کردوە، بەلاّم هەر ئەو بەرپرسیارێتییەم بەرامبەر پرۆفیسۆر

بەرەو ئێرەی هێنام». پرۆفیسۆر لە چەکمەجەکەی بەردەمیدا هەندێک گەڕا و نامەیەکی دەرهێنا، گووتی «بەڵێ تۆ لەسەر هەقی، ئەوە نامەیەکی پرۆفیسۆرە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی دوو مانگ لەوەوبەر، لەوێدا هەموو شتێکی بۆ نوسیوم، دەربارەی کوشتارەکان، دەربارەی سەربڕینەکانی ناو شار، دەربارەی سووتانی ماڵە غەوارەکان... سەیرە لە هەمان کاتدا کە لە دیلاوار سەربڕین و ترس دەستی پێکرد لە مەمەدحەساریش سوپا و هێزە تایبەتەکانی ئیمام سوبحان دەستیان بە ترساندن و کوشتن و تۆقاندن کرد. گەر ڕاستگۆ بم ئەو شتانە لێرە پێشتریش دەستیان پێکرد، زۆر پێشتر... من و دکتۆر بەهنام هەمیشە سەرمان لەوە سوڕماوە، دیلاوار و مەمەدحەسار وەک ئاوێنەی یەکن، هەر شتێک لەوێ ڕوودەدات بەجۆرێکی تر، بە شێوەیەکی پێچەوانە لێرەش ڕوودەدات. دوو شارن تەواوکەری یەکن، گەر مەمەدحەسار نەبووایە دیلاوار دروستیدەکرد، گەر دیلاواریش نەبووایە مەمەدحەسار دروستیدەکرد».

پرۆفیسۆر پێیگووتم کە لە مەولا هەر بە دکتۆر قاسم ناوی بهێنم. بەلایەوە گرنگ بوو من دەمەوێت چی بکەم. بەشەرمەوە گووتم «جەنابی دکتۆر قاسم، من و زەهاو بە ئارەزووی خۆمان نە هاتووینەتە ئێرە، هاتنی ئێمە لە بەر ئەوەیە هیچ ڕێگایەک نەبوو پێیدا بگەڕێینەوە، بە ناچار ئاڕاستەی مەمەدحەسارمان گرتە بەر. گەر بکرێت ماوەیەک خۆمان حەشاربدەین تا ڕێگاکان ئاسایی دەبنەوە، دوا ئەوە کۆمەکمانبکەن تا بڕۆینەوە دیلاوار». دکتۆر پێکەنی و گووتی «کێ چوزانێت ئەم جەنگە چەند دەخایەنێت، چیتر پەڕینەوە بە چیاکاندا بۆ دیلاوار ئاسان نییە. دەبێت حسابی ئەوە بکەین کە جەنگ درێژ دەبێتەوە، دەبێت ئەوە بخەینە بەرنامەوە کە ئێوە ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دیلاوار. ئێستا پرۆفیسۆر لای سەی ئەسڵان دیلە، سەی ئەسڵان پیاوێکی شەڕانییە، ئومێدەوارم دکتۆری هاوڕێمان سەلامەت بێت. من گەرچی ئیمانێکی زۆرم بە پاڕانەوە نییە، بەڵام دۆعای بۆ دەکەم، دڵنیام

شتێک کە زۆر دڵی خودا ڕازیدەکات، دۆعای ئەوانەیە کە ئیمانیان نییە. دۆعای بێئیمانان گەر بەڵگەش نەبێت لەسەر بوونی خودا، بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئینسان. ئێوە لای من وەک ئەمانەتی پرۆفیسۆر وان. بەهنام پیاوێکە ڕزگارکردنی مرۆڤ بە تەنیا ئیشێکی گرنگ دەزانێت کە لەسەر زەوی مابێت. من ناتوانم پێت بڵێم تۆ کەی دەتوانی بچیتەوە دیلاوار، جەنگ هێشتا لە سەرەتادایە ... جەنگێکە چەند ساڵە خۆیانی بۆ ئامادەدەکەن. بەڵێ بەداخەوە مەمەدحەسارییەکان لە پێشڕەویدان، هێرشی یەکەمیان گورزێکی کوشندەبوو لە دیلاوارییەکان کە پێدەچێت کالفامی و نارێکی کۆنیان هەر وەک خۆی مابێت».

نەگەڕانەوە بۆ دیلاوار، لای من زۆر سەخت بوو، لە ناکاو بووبووم بە عاشقی ئەو شارە. غەریبی وادەکات مرۆڤ بیری ناخۆشترین بۆن و وێرانەترین کوچە و بەدترین کەسی شاری خۆی بکات، منیش لەو یاسایە بەدەر نەبووم و ئەو هەستەی کە ئیتر ناگەڕێمەوە بۆ دیلاوار، ئازاری دەدام. هەر لەوێدا و لە بەردەم دکتۆردا چاوانم پڕبوون لە ئاو و هەڵچوونێکی عاتیفی بەرگەروی گرتم و دەستمکرد بە گریان. دکتۆر هێمنیکردمەوە و گووتی «غەم مەخۆ، من لە ڕۆژانی داهاتوودا، سێ شوناسنامەتان بۆ دەردەهێنم، خۆشبەختانە چەند ساڵێکە مەمەدحەسار پڕبووە لە کرێکاری بیانی کە لە ئەلائاباد یان کەربولەوە دێن، زۆریان زمانی ئێرە بە باشی نازانن یان بە شکاوی قسەی پێدەکەن، زۆربەی خەندەکەکانی جەنگ، کارە لۆژیستیکییەکان ئەو کرێکارە هەرزانە بیانیانە دەیکەن، لەبەرئەوە خەڵک بە بینین و دەنگ و ڕەنگیان ڕاهاتوون. لەم ڕۆژانەدا دەوڵەت کارێکی زۆری بە چاپخانەکەی من هەیە، دەتوانم لە ڕێگای پەیوەندییەکانمەوە و بە هۆی زۆربوونی کارەکانمەوە کرێکاری نوێ دابمەزرێنم. لە ساڵانی ڕابوردوودا کێشەی زۆرم لەگەڵ دەسەلاتدارانی مەمەد حەساردا بووە. چاپخانەکەم تاکە چاپخانەی مەمەدحەسار بوو کە کتێبی زانستی و فەلسەفی و ئەدەبی

چاپدەکرد، جارێک ئاگریـان لـەم باڵاخانەیـە بـەردا و خەریـک بـوو هەمـوو شتێک بسووتێت. ڕۆژێک سەرۆکی هەیئەتی کولتوور و پەروەردە بانگیکردم و گووتـی کابـرا تۆ چیت دەوێت، بـۆ سـوار گای هـار بوویت، بۆ زیـان لـە خۆت دەدەیت، بـۆ جـۆرە کتێبێک چاپدەکەیت لەگـەڵ سـەلیقە و کولتـووری ئێمـەدا ناگونجێت، لـە مەمەدحەسار لـە چاپخانـەی تۆ باشتری تێدا نییە، خۆت هەڵبژێـرە یـان چاپخانەکـەت بـۆ بسـووتێنین یـان کار و پـلاکات و کتێـب و بڵاوکراوەکانـی ئێمـە چاپبکـە، هـەم بۆ ئێمانت باشـە و هـەم بـۆ گیرفانت. بەڵێ کابـرا ئاوەهـا بێ پێچ و پەنـا بـوو لەگەڵم. هـەر ئـەو ڕۆژە چی کتێبی زانستی و ئەدەبیم لابـوو دامـەوە بـە خاوەنەکانیـان و نـاوی چاپخانەکـەم لـە چاپخانـەی ڕۆشـنگەرییەوە کـرد بـە چاپخانـەی ئیعتیمـاد و دەسـتمکرد بـە کارکـردن لەگەڵ دەوڵەتدا. سـاڵانی پێشـووتر، دەمێـک دەوڵەتـی سـەڵتەنەتی لەسـەر کار بـوو، سـێ سـاڵ زیندانـم چەشـتبوو، چیتـر بەرگـەی دیلیـم نەدەگـرت. نـا بابـە ... نـا، مـن قارەمـان نیم، پیاوێکـی ئـازا نیم، کەسێکم دەمەوێت ماڵێکی خۆشـم هەبێت و بژیـم، بـەڵام گـەر کارێکی باشـم لـە دەسـت بێـت و بزانـم گەردنـم بـۆ ژێـر چەقـۆ نابـات، دەیکـەم. نـا هیـچ کات قارەمـان نیـم، لێت تێک نەچێت، کەسـی بـاش و قارەمـان دوو شـتی جیـان، قارەمـان لـە پێنـاوی ئەوانیتـردا دەمرێـت، بـەڵام مرۆڤی بـاش، مرۆڤی وەک مـن تەنیـا چاکەیـەک دەکات کە بزانێت پێی ناسـووتێت. مـن تـا بزانـم ناسـووتێم لەگەڵتانـم، لـە پشـتتانم، کۆمەکتاندەکـەم، بـەڵام وامەزانـن مـن قارەمانـم، مـن پیاوێکـم چوومەتـە تەمەنـەوە و دەمەوێت ژیانـم لـێ تێـک نەچێت ...».

قسـەکانی پرۆفیسـۆر کەمێـک منیـان ترسـاند، بـەڵام ئەزموونـی هەفتـە و مانـگ و سـاڵم لەگـەڵ پرۆفیسـۆردا ئـەو هەسـتەی نـەدا بـە مـن کـە ئـەو کەسـێکی خـراپ یـان ترسـنۆک بێـت.

دکتـۆر هـەر بـەو جـۆرەی کـرد کـە خـۆی گووتـی، شوناسـنامەی دوو

هاولاتی خەلکی ئەلائابادی بۆ دەرهێناین کە دەمێ ساڵە بەهۆی شەڕی ناوخۆی هەرێمەکەیانەوە ڕوو لە مەمەدحەسار دەکەن.

قسەکانی ئاڵ موراد لەگەڵ پرۆفیسۆر قاسمدا جیابوو لەگەڵ ئێمە. ئاڵ موراد بڕیاریدابوو لە مەمەدحەسار نەمێنێتەوە و ملی ڕێگایەکی سەخت بگرێت و ڕوو لە بەندەرە دوورەکانی سەر ئاوی باشوور بکات، تا لەوێوە هەولبدات بەرەو خۆرئاوا بپەڕێتەوە . دەیویست دووبارە بە قاچاغ ڕووبکاتە کوفیان و لەوێ ماوەیەک ئیشبکات و پارە کۆبکاتەوە و ئینجا بەرەو «بەندەربا» یان «تەرابزۆی» بڕوات و لەوێوە بۆ هەتاهەتایە خۆی ونبکات. بڕیارەکەی ئاڵ موراد بۆ من مایەی دڵتەنگی بوو، ئەو کوڕە لووت زیپکاوییە، چاوکاڵە کە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر فەرمانداری کوشتبوو، لە هەڵگیرسانی ئاگری ئەم شەڕەدا بەشداربوو، ئەندامی تیپە بەدناوەکانی سەی ئەسلان بوو، کەچی شتێکی وەها ترسناک و نائاسایی تێدا نەبوو، جیایبکاتەوە لە کەسانی هێمن و باش کە من لە ژیانمدا ناسیومن. پیاوکوژ و فریشتە هەندێ جار تەنیا موویەکی باریک لە یەکیان جیادەکاتەوە، ئەو موووەش زۆرجار بە چاو هەر نابینرێت. ئەوەی دەمزانی دەڕوات و نایبینمەوە غەمگینی دەکردم. مانەوەی ئەو لە مەمەدحەسار ترسناک بوو. چیرۆکی هەڵهاتنی ئەو لێرەش بابەتی قسەوباسی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان بوو، ناوی ئەو سەربورد و حیکایەتی ڕۆژ بوو. پرۆفیسۆر چەندەها ڕۆژنامەی چاپی مەمەدحەساری پیشاندابوو کە بە شێوەی جیاواز ناوی ئەو و ژیانی ئەو و چارەنوسی ئەویان نوسیبووەوە، خۆشبەخت بوو لەوەدا کە وێنەیەکی ڕۆشنی وەهای نەبوو، ڕوخساری بە ڕوونی دەربخات. پۆلیسی نهێنی دیلاوار ڕایگەیاندبوو کە ئاڵ موراد دوای جێبەجێکردنی تاوانەکەی چووە بۆ مەمەدحەسار. پرۆفیسۆر دڵنیابوو، کە سیخوڕ و هەواڵدزەکانی مەمەدحەسار گرتنی ئاڵ موراد بە دەستکەوتێکی مێژوویی دەزانن تا بیهێننە سەر تەلەفزیۆنەکان و بڵێن کە ململانێ ناوخۆکانی دیلاوار وەها

خوێناوی بووە، کوشتنی فەرماندار تەنیا بەشێکە لە سافکردنی حیساب لە نێوان کۆدەتاچییەکانی بنەماڵەی قەرەقازانی و بنەماڵەی ماروفیدا. چیرۆکێک بە ڕای ئەوان هێندەی تر ئاگری دەکرد بە دووبەرەکییە ناوخۆییەکانی دێلاواردا. پرۆفیسۆر توند و سەرسەختانە پێی داگرت کە ئاڵ موراد تا لێرە بێت نابێت بچێتە دەرێ و ئەپارتمان و شوێنی خەوەکە جێبهێڵێت، بە پێچەوانەی ئێمەوە کە دەبوو زوو دابەزینە چاپخانە و وەک دوو کرێکاری خەڵکی ئەلائاباد بە ناوی «حەسەن تاج» و «ئەمین لاهور»ـەوە کاربکەین. کە ئاڵ موراد پێی ڕاگەیاندم کە پرۆفیسۆر لە ڕۆژانی داهاتوودا کەسێکی بۆ دەدۆزێتەوە و ڕەوانەی کوفیانی دەکات من دەستمکرد بە گریان. ژوورەکەمان دەفتەرێکی گەورە و هەندێک قەڵەمی تێدا بوو، بە دەم فرمێسک و هەنسکەوە، دەفتەرەکەم خستە بەر دەست و گووتم «برای باش، کە بڕیارتداوە بە جێمان بهێڵیت، ئەم ماوەیە چیرۆکی ژیانی خۆتم بۆ بنوسەوە، کێ دەڵێت من ڕۆژێک لە ڕۆژان کتێبێک لەسەر ئەم ڕۆژانە و ئەم گەشتە نانوسم. من گەمژەم هەموو کارێکی خراپم لە دەست دێت، هەتا کاری نوسینی کتێبێکیش، کە دڵنیام توانا و لیاقەتیم نییە». ئاڵ موراد بە غەمگینییەوە دەفتەرەکەی لابرد و گووتی «برای زەریاواری، من زۆر ئەهلی قەڵەم و دەفتەر نیم، ڕاستە لە چاو خەڵکی تردا عەشقێکی زۆرم بۆ کتێب هەیە، بەڵام هەرچی پەیوەندی بە ژیانمەوە هەیە ، دەتوانم تا دەڕۆم هەموو شتێکت بە وردی بۆ بگێڕمەوە و تۆش دوایی بەوجۆرە بینوسەوە کە خۆت دەتەوێت».

ئیتر لەو شەوەوە ئاڵ موراد دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی خۆی.

# ٤٦

لەدوای کوشتنی فەرماندار بە سەعاتێک، میر سەلیمی قەرەقازانی و حاکم یاسینی قەرەقازانی و ڕەزمئارا هەر سێکیان لە گردی جیلوەدار لە بەردەم ماڵی سەی ئەسڵاندا دابەزین. کورتەی هەواڵەکەیان ئەوەبوو کە بەڵێ فەرماندار کوژراوە و هەر ئێستا دەبێت هێزی باغەوانەکان لەگەڵ ئەو تیپە چەکدارەی قەرەقازانییەکان دروستیانکردوە تەواوی دێلاوار بخەنە ژێر دەستی خۆیان و دەم و دەست ماڵی هەندێک لە ماروفییەکان گەمارۆ بدرێن و تەواوی دەسەڵاتەکان بخرێنە ژێر دەستی لیژنەیەکی بەڕێوەبردن و حوکمەوە کە لەم چوار کەسە پێکهاتبێت. سەی ئەسڵان دڵنیابوو قەرەقازانییەکان لە کێشەیەکی گەورەوە گلاندویانە، یەکێکیان بۆ کوشتنی فەرماندار بەکارهێناوە کە هەموو کەس دەزانێت قوتابی و موریدی ئەو بووە. جگە لەوەی مل بۆ گەمەکەیان بدات چارێکی تری نەبوو. تا ئێواری دەبوو دوو جار پێکەوە لەگەڵ حاکم یاسیندا لە تەلەفزیۆندا دەربکەون و ئیشکردن بە هەموو یاساکان هەڵپەسێرن و خۆیان وەک فەرمانڕەوای کاتی دێلاوار ڕابگەیێنن. ئەو تیپە نهێنییەی سەی ئەسڵان بۆ جۆشدان و پروپاگەندە دروستیکردبوو، بێئەوەی بگەڕێنەوە بۆ خودی سەیی، بۆنی هەموو مەترسییەکانیان کردبوو، هەر ئەو شەوە لە چەندەها گەڕەکدا ڕێپێوانی گەورە و پەیامی پشتگیریان بۆ سەی ئەسڵان نارد... سەی

ئەسڵان لە وتاری یەکەمیدا پیاوکوژەکانی مەمەدحەسار و دوژمنانی ئەبەدی گەلی دیلاواری بە کوشتنی فەرماندار تاوانبارکرد، داوای لە خەڵکی دیلاوار کرد تێکڕا چەک هەڵبگرن و ناوی خۆیان لە سوپای باغەوانەکاندا بنوسن و تەیار و ئامادە بۆ جەنگ لە دۆخی ئامادەباشیدابن. سەیی وەک هەمیشە هەموو پەشۆکان و دوودڵییەکی خۆی لە دوژمندا خاڵیدەکردەوە. نەجمەی ئایشە گوڵ و تیپە نهێنییەکانی، شەوانە سەدان و هەزاران کەسیان دەهێنایە سەر شەقام و ناو گۆڕەپانەکان و سرودیان بە سەی ئەسڵاندا دەخوێند. نەجمە بە جۆرێک گەرمی ئەو ڕۆژانە دەژیا، سەرما لە جەستەیدا نەما بوو. قەرەقازانییەکان لە دڵەوە زۆر نیگەران بوون، بەڵام هێزی خۆیان بە جۆرێک نەدەبینی سەی ئەسڵان بتوانێت بیانخاتە کەنارەوە. ئاشکرابوو تاکە کەسێک کە دەتوانێت دیلاوار بجوڵێنێت سەی ئەسڵانە. ئەسڵان پیاوێکی دوودڵ بوو، هەم دەترسا و هەم لەزەتیشی لە دەسەڵاتی خۆی دەبینی. هەر ئەو ڕۆژەی کە دەسەڵاتە تازەکانی خۆی زانی، یەکەم جێگا ناردی دابخرێت مۆزەخانەی دیلاوار و سەنتەری کولتوری هاوچەرخ و کتێبخانەی ئەسخیلۆس بوو. تەماحێکی گەورەی هەبوو لە داهاتوودا مۆزەخانە گەورەکەی بەهنام بگۆڕێت بۆ ئەو مۆزە خورافی و پیرۆزەی لە خەیاڵیدا بوو «مۆزەی میران». ئەو جێگایانە شوێنی کۆبوونەوەی ئەو نوسەر و ڕۆشنبیرانە بوون کە بە دەنگی بەرز ڕەخنەی سەی ئەسڵانیان دەکرد و بە دەسەڵاتخوازێکی نەخۆشیان ناودەنا. هەر شەوی یەکەم زیاد لە دوازدە نوسەر و شاعیر و پرۆفیسۆر گیران و ڕەوانەی گرتووخانەی نهێنی کران. لە بەرامبەر ئەوەدا سەی ئەسڵان دەیویست کارێک بکات لە گردی جیلوەدار دووربکەوێتەوە و جێگایەک بۆ خۆی بگرێت تێیدا هەست بە دڵنیایی بکات، بەڵام لە دڵەوە دەترسا. هەفتەیەک لەوەوبەر لە هەندێ کەسی دڵسۆزەوە خەبەری بۆهات کە ڕەزمئارای قەرەقازانی تەماحێکی بێوێنەی خستۆتە بەر فەراسە ڕەش، سەرۆکی تایبەتی پاسەوانەکانی ئەو،

تا لەگەڵ قەرەقازانییەکان ئیشبکات و هەموو زانیارییەکی تایبەت بە هاتوچۆ و بیرکردنەوەی سەی ئەسڵان بداتە ئەو. فەراسە ڕەش کەسێکی دڵسۆز بوو، وەفادارییەکی بێوێنەی بۆ ئەسڵان هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی هیچی لای سەیی نەدرکاندبوو. ئەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان دڵی ئەسڵانی کرمێ کرد و لە فەراس کەوتە دوودڵییەوە. سەی ئەسڵان نەیدەتوانی وەها ئاشکرا فەراس دووربخاتەوە، بەڵام چەندین شەو بوو ئارام نەدەخەوت، بەردەوام ڕادەچڵەکی، دەرگاکانی توند دادەخست و هەوڵی دەدا زۆرترین پشوو و کاری دەرەکی بداتە دەست فەراس تا لە خۆی دوور بێت. ئێستا کە ڕۆژانە دەردەچوو، هەمیشە فەراسی لە بنکە جێدەهێشت و خەڵکانێکی تری وەک پاسەوان لەگەڵ خۆیدا دەبرد. لە دوای کوشتنی فەرماندارەوە هەموو ڕۆژێک دەبوو وتار و کۆبوونەوەی گەورە لە مەیدانە جیاوازەکاندا سازبکات، گەرچی بەو پەڕی جۆش و لە خۆ بووردەییەوە تین و تاوی دەدایە گەنجانی دێلاوار تا بچن بۆ جەنگ، بەڵام هەمیشە ترسێکی قووڵ و نادیار لە چاویدا بوو. ئێستا نەیدەزانی جگە لە ئاڵ موراد ئاخۆ دەبێت قەرەقازانییەکان چەند قەناسی دیکەیان بڵاوکردبێتەوە و جگە لە فەرماندار کێی تر لەسەر لیستەکەیان بێت. زۆر ئێواران وەک جاران دەچوو بۆ خوانەکەی میر سەلیمی قەرەقازانی، خۆی وەک پیاوێکی دڵسۆز و بێ تەماح پیشاندەدا، بەڵام هەر تیکەیەک دەیخوارد، هەر شەرابێک هەڵیدەدا، بە گومانەوە تامیدەکرد، بە دوودڵییەوە قووتی دەدا، بەردەوام پێی وابوو ئەم سفرەیە دوا سفرەیەتی و ئەم تیکەیە دوا تیکەیەتی.

هەواڵی پەلامار و هێرشی گەورەی مەمەدحەسار هەموو شتێکی لە دێلاوار گۆڕی. شەوی یەکەم کە هێرشەکان دەستیان پێکرد، هێزەکانی مەمەد حەسار دەیان کیلۆمەتر هاتنە ناوەوە و سەدان سەرباز و ئیشکەری دێلاواریان بە دیل گرت. زۆرینەی ئەوانەی گیران لە بەتالیۆنەکانی کاربوون کە ئیشیان خەندەک لێدان و پەناگا دروستکردن بوو، خودی سوپای دێلاوار

لەو هێرشەدا گورزێکی کاریگەری نەخواردبوو. بەلام هەواڵی پەلامارەکە ترسێکی بێوێنەی لە دیلاوار خستەوە، هێزەکانی مەمەدحەسار بە درندەیی و بێرەحمیان بە ناوبانگ بوون، چەندین ساڵ لەوەوبەر کە دیلاوار ژێردەستی ئەوان بوو، قەسابخانە و کۆمەڵکوژی گەورەیان ئەنجامدابوو کە تا ئەمڕۆ لە یادەوەری خەڵکدا زیندوبوون، لەگەڵ هاتنیان بۆ ئەمدیو سنوور دوو گوندیان بە ژن و پیاو و گەوە و منداڵەوە سەربڕیبوو. سەدان کەللە سەریان خستبووە سەر یەک و لە پاڵیدا وێنەیان گرتبوو. وێنەکان هەر زوو لە دیلاواریش بلاوبوونەوە. هەر بەیانی یەکەم دەیان هەزار خۆبەخش کە ناوی خۆیان لە بنکەکانی ناونوسین تۆمارکردبوو چوونە ڕیزی سوپا یان بوون بە باغەوانەکانی دیلاوار و بە خێرایی چەکیان وەرگرت و بەرەو بەرەکانی پێشەوە ڕەوانەکران. دەڵێن لەو سەردەمەدا مامە سیام تەواوی سەنتەرەکەی چۆلکردوە و جگە لە هەندێ شێتی دەستەپاچە و بێکەڵک، کەسێکی ئەوتۆ نەماوە نەینێرێت بۆ پێشەوەی شەڕ. سەی ئەسلان هەر ئەو ڕۆژە وتارێکی ئاگرین بۆ میللەتی بە شەرەفی دیلاوار لە تەلەفزیۆنەوە پێشکەشدەکات و مێژووی دێرینی دیلاوار و ترسە ڕەواکانی خەڵک و تەماحە کوشندەکانی دوژمنان دەهێنێتەوە بیر، وتارەکەی ئەسلان وەها پڕخرۆش دەبێت، زۆرینەی خەڵک دەخاتە سەر کەلکەڵەی چەک هەڵگرتن و خۆ کوتان بەرەو مردن لە پێناوی دیلاواردا، هەر ئەو ڕۆژانە ئیشی کەسانی وەک نەجمە و ئامێرەکانی تری پروپاگەندە وەها کاریگەر دەبن، شەوان کۆلان و کوچەکانی دیلاوار پڕدەبن لە ڕێڕۆیشتن و سرودخوێندن و دروشمدان، بە ڕۆژ گۆڕەپانەکان و شەقامەکان دەبن بە شوێنی لایەنگرانی شەڕ، لە زۆر جێگادا ماڵی هەندێک خەڵکی غەوارە کە گومانی دوژمنییان لێ دەکرێت دەسووتێنرێن. بە فەرمانی سەی ئەسلان و قەرەقازانییەکان هەر کەسێک دەستی چەکی گرت دەبێت پەیوەندی بە هێزەکانی پاراستنی دیلاوارەوە بکات. وەک دەڵێن لەو ڕۆژانەدا مامە سیام

بەردەوام لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکاندا قسەیکردوە، باسی لەوە کردوە کە ئێستا ئاشکرایە دوژمن نەوەک ناتوانێت بمانبەزێنێت، بەڵکو بە جۆرێکی بەرچاو هەموو توانا شاردراوەکانی ئێمەی تەقاندۆتەوە. ئێمە چیتر لە فەرمانبەر و موچەخۆری بێکار و بێبەرهەمەوە هەموو بووین بە جەنگاوەری مەزن و شەڕکەری ئەفسانەیی. وەک دەڵێن مامە سیام لەو سەردەمەدا بۆ خۆی ئامێرێکی گەورەی پروپاگەندە بووە، بە ڕۆژ لە قوتابخانە و لە سەنتەرە پیشەییەکان و لە زانکۆکان گەنجانی بۆ جەنگ ئامادەکردوە، بە شەویش لە تەلەفزیۆنەکانەوە، بەرنامە لە دوای بەرنامە و کەناڵ لە پشتی کەناڵ قسەیکردوە. هەندێ شەویش و لە هەندێ بۆنەدا لە پاڵ حاکم یاسین و سەی ئەسلاندا دەرکەوتووە و بەردەوام یەکێک بووە لەوانەی مشتی گرمۆڵەکردوە و دەستی بەرزکردۆتەوە و قۆڵی وەک نیشانەی هێز و بەرخۆدان ڕاوەشاندوە. ئەوانەی ئێستا چیرۆکی ئەو ڕۆژگارە دەگێڕنەوە، دەڵێن باغەوانەکان لە ناو دیلاواردا ڕۆژ دوای ڕۆژ بوونەتە هێزێکی بێ جڵەو کە هیچ کەس نەیتوانیوە بەر بە هەوا و هەوەسیان بگرێت. لە سالانی جەنگدا مامە سیام دوو ئیش دەگرێتە دەست، بە سەرێک دەبێتە سەرۆکی ئەو لیژنە پزیشکییەی کە کاری پشکنینی ئەو سەرباز و جەنگاوەرانەیە کە تووشی کێشەی دەروونی دەبن، بە سەرێکی دیش دەبێتە مامۆستا لە سەنتەرێکی پەروەردە و ئامادەکردندا کە بە فەرمانی سەی ئەسلان بۆ هەڵبژاردەیەکی تایبەت لە جەنگاوەران دادەمەزرێت. دەڵێن لەو ماوەیەدا کە سەرۆکی ئەو لیژنە پزیشکییە بووە کە دەبوو پشکنینی دەروونی بۆ سەرباز و جەنگاوەرە نەخۆشەکان بکات، دەیان نەخۆشی بە تۆمەتی درۆکردن و خۆشێتکردن و خۆ دزینەوە لە فەرمان داوەتە دەست تیپەکانی تیرباران.

دوای سەرکەوتنی یەکەمی هێزەکانی مەمەدحەسار، دەبوو خێرا هێزێکی زۆر لە سوپا و تیپە چەکدارەکانی دیلاوار لە دوو هێڵی نوێدا

جێگیربکرێنەوە. هەر شەوی یەکەمی پەلامار، کۆبوونەوەیەکی پەلەی ئەنجومەنی نوێی حکومەتی دیلاوار، لیوا هورمزی قەرەقازانی وەک فەرماندەی گشتی هێزەکان دەستنیشاندەکات. کۆبوونەوەکە لە کۆشکی میر سەلیمی قەرەقازانی و بە ئامادەگی سەی ئەسلان بەڕێوەدەچێت... ئێستا لیوا هورمز بە پاڵەوانی بەرگری دادەنرێت، هەر ئەو شەوە خۆی و هێزێکی دوو هەزار سەربازی لە بەرزاییەکانی ئاڤیانبەر ڕێگا لە پەلامارێکی گەورەی مەمەدحەسارییەکان دەگرن بۆ سەر دیلاوار. لیوا هورمز یەک هەفتەی ڕێک، هەموو هێرشە گەورەکانی دوژمن بۆ سەر دیلاوار تێکدەشکێنێت، هەندێک ئەوە بە بەنرخترین هەفتەی مێژووی دیلاوار دەزانن. هێزەکەی لیوا، جگە لەو بەربەستە سروشتیانەی کە بەرزاییەکانی ئاڤیانبەر پێشکەشیدەکەن شوێنێکی خۆحەشاردانی ئەوتۆیان نابێت، بەڵام زیرەکی و وریایی لیوا لە دابەشکردن و پلاندانانندا وادەکات هەوڵی مەمەدحەسارییەکان بۆ گرتنی ئەو ناوچە گرنگە نەگاتە ئەنجام. ئەو هەفتەیە بەسە تا لە دیلاوارەوە هەزاران جەنگاوەر بکەونە ڕێگا و دابمەزرێن و خەندەک لێبدەن و هێڵێکی نوێی بەرگری دروستبکەن و تۆپخانەکانی دیلاوار چالاکانە بێنە شەڕەوە. شەڕ لە ئاڤیانبەر هێند بەهێز دەبێت، هێزەکانی مەمەدحەسار هەزاران کوشتە دەدەن، گەرچی ئەوان بە تۆپخانەیەکی سەر شێت و هار کە لە چرکەیەکدا دەیان گوللە تۆپ دەتەقێنێت دەکەونە وێزەی ئەو بەرزاییە سەختانە، بەڵام بەرگری شەڕەکەرەکانی دیلاوار ئەفسانەیی دەبێت و شکستێکی گەورەیان پێدەهێنێت... شکستێک بۆ ماوەیەک گرتن و کەوتنی دیلاوار دوادەخات.

وەک دواتر بۆیان گێڕامەوە، هێزەکەی ئێمە بە سەرکردایەتی نەقیب نەجات یوکسەل، لە شەوی پەڕینەوەدا، شەوی هێرشە لە ناکاوەکەی مەمەدحەسار، دوای ونبوونی ئێمە، دوو کوشتە دەدەن، بەڵام هەموو ئەوانی دی، بە هۆی نەقیب نەجاتەوە دەگەنە جێگای ئارام و لە سنووری دوژمن دەپەڕنەوە، هێزەکە دوای شەو و ڕۆژێک ڕێ ڕۆیشتنی بەردەوام دەگەن

بە کاروانێک لە سەربازانی دیلاوار و ڕزگاریان دەبێت، ناوی من و زەهاو وەک بێسەروشوێن دەدرێت بە سوپا و ئەوانیش بە نامەیەکی تایبەت باوکم لەوە ئاگاداردەکەنەوە کە لە شەوی یەکەمین پەلاماری دوژمندا، ونبووین و هەواڵمان پچڕاوە. باوکم غەمێکی گەورە لە ونبوون و دیارنەمانی من ناخوات، هۆکەشی وەک خۆی دەڵێت ئەوە بووە کە چارەنوسی من، بە پێچەوانەی منداڵەکانی ترەوە، هیچ کات شتێک نەبووە لە دەستی ئەودا بێت، بەڵکو یان لە دەستی خۆمدا بووە یان لە دەستی قەدەردا. فەسیلی ئیشەکەمان دوای ڕزگاربوونیان، ناوی سەنتەرەکەیان لێ دەکرێتەوە و دەخرێنە سەر پێکهاتی سوپای نوێی دیلاوار و چەکیان پێدەدرێت و وەک جەنگاوەری ئاسایی دەگوازرێنەوە بۆ پێشەوەی جەنگ. هەندێکیان لە جەنگی دوو ساڵەدا لە بەرەکاندا دەکوژرێن، ئیسماعیلی خەڵکی دسکارا و داودی داود ئاغا و عیمادۆک لە ناو کوژراوەکاندا دەبن. نەقیب یوکسەل لە ناوەڕاستی جەنگدا، بە هۆی ئازایەتییەکانییەوە مەدالی تەلا وەردەگرێت، بەلام تەنیا دوای هەفتەیەک لەو خەلاتە، شەوێکی پڕ تریفە خۆی و سێ سەرباز لە سەر بەردێکی بەرز دادەنیشن، هەر یەکەیان ڕوودەکەنە جێگایەک و بە ئارامی سەیری ئەستێرەکان دەکەن، لە ناکاو نەقیب نەجات دەڵێت «ئێستا گوللەیەک لە دوور، لە دوور، لە دوور دێت و من دەکوژێت»، هەموو ئاوڕ دەدەنەوە و سەیردەکەن، هەر سێکیان پێدەکەنن، نەقیب نەجات دەڵێت «پێمەکەنن، بۆ پێدەکەنن، جەنگ ئیتر تەواو... من پێم خۆشە لە شەوێکی وەهادا دەمرم. هەموو ژیانم ویستومە لە شەوێکی پڕ ئەستێرەدا بکوژرێم، شتێک کە غەمی پێدەخۆم ئەوەیە بە قەد خواستی دڵی خۆم لەو مەمەدحەسارییە سەگانەم نەکوشتووە». هەموو پێکەوە پێدەکەنن، نەقیب نەجاتیش کە هەموو ماوەی جەنگ مۆن و ڕوو گرژ بووە پێدەکەنێت. دوای چەند چرکەیەک گوێیان لە خرچەی ئێسکی ناوچاوانی دەبێت، لەبەر مانگە شەوەکەدا ئەو خوێنە کەمە دەبینن لە برینەکەی دێت،

گوللـەکە ناوچاوانـی دەپێکێت و بـە ئارامـی دەکەوێت بـە پشـتا، چاوانـی بـە کراوەیی و شادی، بە خەندەیەکەوە کە پێشتر لـە ژیانیدا کـەم کەوتۆتە سـەر ڕووی، بـە خۆشـییەکەوە کـە هیـچ کـەس لـە هـۆ و نهێنییەکی نازانێت، دەمرێت. مەرگێک نەقیب خـۆی بـە جۆرێکی دیکـە لـە خەونـدا بینیبووی، وەک مەرگـی سـەربازێکی نادیـار، وەک مەرگـی کەسـێکی نەنـاس.

سـاڵانی جەنـگ گەلێـک کارەسـاتاوی و دڕنـدە دەبێـت، مـن دوو بـرام لـە جەنگدا لـە دەسـتدەدەم، یەکێکیـان لـە سـەنگەرەکەی خۆیدا پارچـەی نارنجـۆک بەر ملی دەکەوێت و یەکێکی دییان بە تۆمەتی ترسنۆکی و جێبەجێ نەکردنی فەرمـان لـە لایـەن هێزە تایبەتییەکانـی سـەی ئەسڵانەوە تیربارانـدەکرێت.

جەنگی نێوان دیلاوار و مەمەدحەسـار، یەکێکە لەو جەنگە کەمانەی مێژوو کە کەمترین دیلی تێدا دەگیرێت، هەر دوولا دیلەکان یان بەدەسـت بەسـتراوی لـە شـوێنی خۆیانـدا تیربارانـدەکەن و دەیانخەنـە گـۆڕی دەسـتەجەمعییەوە، یان دەیانگـرن و سـوار ماشـێنی سـەر بـە تاڵیـان دەکـەن و لـە شـار و گوندەکانـدا دەیانگێڕن و دواتـر لـە نمایشـی گـەورە و لـە گۆڕەپانـی تایبەتـدا سـەریاندەبڕن. بۆقبۆقیلـە دەبێـت بـە سـەرکردەی فەسـیلێکی تایبـەت کە ئیشـیان سـەرپەڕاندنی زیندانـی و دیلەکانـی مەمەدحەسـارە. پێدەچێـت مەمەدحەسـارییەکان پێـش لـە دیـلاوار دەسـتیان بـەو ئاهەنگـە شـێت و هیسـتیریایانەی سـەرپەڕاندن کردبێت، بـەڵام ئـەوەی جێگای سەرسـوڕمانە ئەوەیـە نـاوی بۆقبۆقیلـە وەک قەسـابی یەکەمـی دیـلاوار، وەک کەسـێک کـە بـە لێزانیـن و بـە ساردییەکی بـێ وێنـەوە سـەری قوربانییـەکان لێدەکاتـەوە، دەکەوێتـە سـەر زاری هەمـوو دونیـا. مـن پێشـتر نـاوی بۆقبۆقیلـەم لـە چیرۆکەکانـی ئـاڵ مـورادەوە بیسـتبوو، دواتـر کـە ئـاڵ مـوراد ڕۆیشـت و ئیتـر نەمانبینییـەوە، هێنـدەی نەبـرد نـاوی بۆقبۆقیلـە کەوتـە سـەر زاری هەمـوو دونیـا، بۆقبۆقیلـە وەک دەمخوێنـدەوە و دەمبیسـت، لـە هـەر زمانـەدا بـە جۆرێـک ناویـان دەنـا «زیفـدۆ، فرۆشـۆ،

فرۆگیێ، گورباگیێ»، بەلام گومان لەوەدا نەبوو کە بۆقبۆقیلە لە دونیادا زیاتر لە سەی ئەسلان یان لە سەرۆک یاسینی قەرەقازانی ناسرابوو. بەرامبەر بۆقبۆقیلە کە هێدی هێدی دەبووە قارەمانێکی جیهانی لە سەربڕین و نیگای سارد و ڕوانینی بێڕەحمانەدا، مەمەدحەسارییەکان پاڵەوانێکی تایبەت و ترسناکی خۆیان دروستکردبوو کە بە «سکینان» بانگیاندەکرد. سکینان زوو زوو لە تەلەفزیۆنەکانی مەمەدحەسارەوە دەردەکەوت، هەمیشە بەشێکی کەم لە دەموچاوی دیاربوو، دوو چەقۆی گەورەی پێبوو کە دەیانگووت کارخانەیەک بە تایبەت بۆ ئەو و بۆ سەربڕینی ئاسانی مرۆڤ دروستیانکردوە، کارخانەیەک کە نرخی چەقۆکانی بە هۆی بەکارهێنانی سکینانەوە چووبووە ئاسمان. سکینان بەردەوام ئەوەی دەگووت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆقبۆقیلە سەردەبڕێت، هێندە ئەوەی دووبارەکردبووەوە ئیدی هەندێ جار وادەردەکەوت وەک ئەوەی هەموو ئەم جەنگە، ململانێی تایبەتی نێوان سکینان و بۆقبۆقیلە بێت، نەوەک بەیەکدادانی گەورەی نێوان دێلاوار و مەمەدحەسار یان سەی ئەسلان و ئیمام سوبحان. سکینان خۆی وەک پیاوێکی ئیماندار نیشاندەدا کە فەرزی خودا جێبەجێدەکات و بە ئیشێک هەڵدەستێت کە سوودی بۆ هەموو ڕەگەزی ئادەمیزاد هەیە، دەیگووت لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە تا ئەمڕۆ کارێکی وەها موبارەک پەیدا نەبووە و ئەو شەو و ڕۆژ شوکری خودا دەکات کە نیعمەت و بەرەکەتی ئەم ئیشەی بەو بەخشیوە. پێی وابوو سەربڕینی سەگێک ئازاری زۆرتر و پەشیمانی زیاتری تێدا دروستدەکات تا سەربڕینی کەسێک لە دێلاوار... بڕوایەک من زۆرجار لای دێلاوارییەکانیش هەستم پێکردبوو، کە ژیانی قالۆنچەیەکیان لە ژیانی کەسێکی مەمەدحەسار لا گرنگتر بوو.

# ٤٧

دەبوو لەگەڵ ناوە تازەکەمدا ڕابێم. حەسەن تاج، خەڵکی ئەلائاباد. زەهاو، بە ناوە تازەکەی دڵخۆش نەبوو «ئەمین لاهور»... بەڵام شوناسنامەکانمان فەرمی و دەوڵەتی بوون و پرۆفیسۆر بە پەیوەندییە بەرزەکانی خۆی و لە ڕێگای ئاشنا و دۆستانییەوە لە بەڕێوەبەرایەتی کۆچبەران بۆی دروستکردبووین، دەبوو ڕۆژی پێشتر لە فۆتۆگرافێکی نزیک چاپخانەکەوە وێنەبگرین. من و ئەمین لاهور و ئاڵ موراد ، سێ قۆڵی لەگەڵ یەکێک لە کرێکارەکانی چاپخانەکەدا چووین بۆ وێنەگرتن، بۆ یەکەم جار شارەکەمان لە جەنجاڵیدا بۆنکرد و لە نزیکەوە هالاوی مرۆڤەکان چوو بە سەرماندا و گوێمان لە دەنگی فرۆشیارەکان و قیرەی ڕاگوزەران بوو. لە هات و چوونماندا یەک ژنیشمان بەرچاو نەکەوت. من ماوەی ئەو دوو ساڵەی لە مەمەدحەسار بردمە سەر هەتا دەموچاوی یەک ژنیشم نەبینی. دوو ساڵی ڕێک تەنیا لە دوورەوە و لە عەبای ڕەش و لە ژێر پەچەی ئەستووردا ژنانم دەبینی، بە جۆرێک ئیدی باوەڕم بە خۆم هێنا کە ئەم ئەستێرەیە تەنیا یەک جۆر لە جنسی لەسەرە و جگە لە پیاو جۆرە بوونەوەرێکی دی لەم سەر زەمینە ناژی. دونیای من بە گشتی جیهانێک بوو دوور لە خانمان، بەڵام هیچ کات لەو باوەڕەدا نەبووم بشێت دوو ساڵ لە شارێکدا بژیم و بۆ یەکجاریش ڕوخساری ژنێک نەبینم، شارێک بوو هەموو شتێکی بەو بۆنە

سەنگین و قورسەی پیاوان قاندابوو، کە وەک هەوایەکی ئالوودە لە هەموو شوێن و کوچە و کەلینێکدا ئازاد وەک هەوای تاعوون دەسوڕایەوە. دواتر زانیم کە یاساکان لە دیلاوار لەو ڕووەوە چەند سەختگیر و توندئاژۆن، سزای دەرکەوتنی ژن سەخت و سزای نیگاکردنی پیاو بۆ ژنان سەختتر بوو. ئال موراد لە شوناسنامەکەیدا ناوی «موجیب سوفیان» بوو، ئەو بە خەڵکی «بەندەر سادق» شوناسی بۆ دەرهاتبوو، چونکە ڕەنگی پێستی و شێوەی لووتی بە خەڵکی ئەلائابادی نەدەکرد، جگە لەوەش دەیتوانی لە سەفەرەکانی تریدا بەرەو باشوور کەم تا زۆر سوود لەم ناوە تازەیەی ببینێت.

پرۆفیسۆر کارێکیکرد من و زەهاو زۆر پێکەوە نەبین، چونکە گەر پێکەوەبایـن ناچاردەبووین بە دیلاواری قسەبکەین و ئەوەش هەم ئێمە و هەم پرۆفیسۆری دەخستە مەترسییەوە. من بۆ کار دابەزیمە ناو چاپخانەکە و زەهاوییش لە جێگایەکی تایبەت، کە ژمارەیەکی زۆر کرێکار کاریان لە کۆکردنەوەی وەرەق و سەفتەکردندا دەکرد، دەستبەکار بوو. جێگاکەی زۆر دوور نەبوو لە من، ژێر زەمینێکی دی بوو دەکەوتە بنی ئوتێلێکی کۆن و هەرزانەوە، کە تەنیا دە مەترێک لەولای چاپخانەکەوە بوو. بەڵام دەبوو من و زەهاو تا دەتوانین پێکەوە قسەنەکەین. دوورکەوتنەوەی زەهاو لە من زۆر نیگەرانیدەکردم، هەستێکی خراپی باوکانەم بەرامبەری هەبوو، بەڵام سەلامەتی و مانەوەمان وا پێویستیدەکرد لە ڕۆژدا لە یەکدی دووربین. ئیشی چاپخانەکەی من گەرچی زۆربوو، بەڵام سەخت نەبوو، ئەوانەی کاری سەر ئامێرەکانیان دەکرد خەڵکانی لێزان و هونەریی بوون، ئیشی من پاککردنەوەی ئامێرەکان بوو، لەگەڵ کۆکردنەوەی قەراغی بڕاوی کتێبەکان، هەڵگرتن و سەفتەکردنی بەندە چاپکراوەکان و ڕیزکردنیان لە جێگایەکی تایبەتدا بە مەبەستی گواستنەوەی بۆ ئەو کرێکارانەی کۆیدەکەنەوە و وەک کتێب دەیهێننەوە. پرۆفیسۆر ژوورەکەی بە کرێیەکی ناچیز بۆ

حیسابدەکردین و لە موچەکەمان دەیبڕی، موچەمان وەک کرێکارەکانی تر بوو، دکتۆر نەیدەویست شتێکمان بۆ بکات یاخود شتێکمان لێ بستێنێت بمانخاتە بەر گومانەوە. کارەکانی من زۆربەی ڕۆژ بەیانیان سەعات هەشت بۆ نزیکی چوار یان پێنجی ئێوارە بوو، شەفتی شەو کرێکارێکی تر دەهات و جێگای منی دەگرتەوە.

لە ڕۆژانی یەکەمی جەنگدا گۆڕانکارییەکی گرنگ لە چاپخانەکەدا ڕوویدا، زۆرینەی ئەو گەنجانەی کە لێرە بوون و دانیشتووی مەمەدحەساربوون دەبوو بچن بۆ جەنگ، هەموو ناویان بۆ خزمەتی سەربازی هاتبووەوە و دەبوو چەک هەڵبگرن. لەگەڵ دەست بەکاربوونی مندا، ستافی چاپخانەکە جگە لە سەید یەدوڵا، ئەوانی دی هەموو جێیان هێشتین. سەید یەدوڵا پیاوێکی تۆزێک بە تەمەنی سەروو پەنجا ساڵ بوو، سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی مەکینەکان بوو، ئامێری چاپەکەی دەبردەڕێوە و لەگەڵ کوڕێکی خەڵکی کوفیاندا هاریکاربوو کە ئەویش لە لێزانین و دەست ڕەنگینیدا دەستەکەمێکی لە سەید یەدوڵا نەبوو. ئەو پیاوە گوپنە قەڵەوەش کە شەوی یەکەم پێشوازی لە ئێمە کرد، ئەویش دوای هاتنی ئێمە بە دە ڕۆژ، ماڵاوایکرد و بوو بە سەرباز، ئیتر تا دوو مانگ نەمانبینییەوە، کە گەڕایەوە پیاوێکی لاوازی نیمچە شێت بوو کە دەنگی گوللە تۆپ و دیمەنی کارەساتەکانی جەنگ تووشی پەشۆکانێکی دەروونی قووڵیانکردبوو. پیاوەکە ناوی سەی موحسن بوو، چەند ساڵ بوو لێرە لە نوسینگەی پێشەوەی چاپخانەکە داواکاریی خەڵکی وەرگرتبوو، نرخی دابووە خاوەن کتێب و چاپەمەنییەکان، وەڵامی تەلەفونی دابووەوە، ڕێکەوتنی مۆر کردبوو، لەگەڵ ئەو قاچاغچیانەدا کە ئامێر و پارچە و مەرەکەبیان لە باشوورەوە بە قاچاغ دەهێنا مامەڵەیکردبوو، بۆ کاروباری ناو چاپخانەش پرۆفیسۆر دەسەلاتی تەواوی پێبەخشیبوو. ڕۆیشتنی سەی موحسن کێشەی زۆر گەورەی بۆ چاپخانەکە دروستدەکرد، چونکە لە دوو ساڵی ڕابوردوودا پرۆفیسۆر زۆربەی ئیشەکانی دابووە دەست ئەو و خۆی

تەنیا دوور بە دوور چاودێری کارەکانی دەکرد. ڕۆیشتنی ئەو لە ڕۆژێکدا بوو کە چاپخانەکە کەوتبووە ژێر گوشارێکی زۆرەوە، پێشتر پەیمانێکی لەگەڵ وەزارەتی کاروباری جەنگدا مۆرکردبوو کە بە زووترین کات چاپەمەنی و ڕیکلام و پلاکاتەکانی هاندانی جەنگ بگەیێنێتە دەست دەزگای ڕاگەیاندنی وەزارەت. ئەوەی جێگای سەی موحسنی گرتەوە مامۆستایەکی پیری زانکۆ بوو بە ناوی سەفەد، پسپۆڕێکی تایبەت لە مێژووی مەمەدحەساردا کە بە تۆمەتی شێواندن و ناشیرینکردنی مێژووی وڵات لە زانکۆ دەرکرابوو، بەوەدا هاوڕێیەکی کۆنی پرۆفیسۆر بوو، بۆئەوەی بێئیش نەبێت و خۆی و خێزانەکەی لە برسا نەمرن، هاتبووە سەر ئەم کارە. بە گشتی لەگەڵ هاتنی مندا فەزای چاپخانەکە تەواو نوێ بووەوە، زۆربەی ئیشکەر و کرێکارەکان بوون بە گەنجی بیانی کە وەک ئێمە باش زمانی خەڵکی مەمەدحەساریان نەدەزانی.

ڕۆژانە سەعاتێک پشووی نیوەڕوانمان هەبوو، لەو ماوەیەدا دەچوومەوە سەرێ و پەردەی ژوورەکەم لادەدا و شتێکی کەمم دەخوارد و چایەکم ئامادەدەکرد و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەروازەی فیردەوس و شەقامەکەم دەکرد. زۆربەی ڕۆژ لە بەر پەنجەرەکەدا دەکەوتمە بیرکردنەوە و چاوانم پڕدەبوون لە فرمێسک، لە ڕاستیدا هۆیەکی دیاریکراوم بۆ گریان نەبوو، بەڵام سەرجەمی دونیا، ژیانی خەڵک، دۆخی تاریکی دیلاوار و ژیانی خۆم دەیانگریاندم. یەک یەک بیرم لە هەموو ئەوانە دەکردەوە کە دەیانناسم، لە خوشک و براکانمەوە تا دەگەیشتە کرێکارە بەدبەختەکانی فەسیلەکەمان. زۆر خەمی پرۆفیسۆر بەهنامم بوو، هەمیشە لە بیری ئەوەدابووم ئاخۆ ئازاد بووبێت، بەڵام هیچ ڕێگا و هۆکارێکم نەبوو بتوانم هەواڵی بزانم.

لەو کاتەوەی من لە چاپخانەکە کارمدەکرد، ڕۆژ دوای ڕۆژ ژمارەی پۆستەری کوژراوەکانی مەمەدحەسار زیادیاندەکرد، هەموو ڕۆژ

چاپخانەکەمان هەزاران پۆستەری چاپدەکرد، کوژراوەکان زۆربەیان کوڕانی گەنجی ڕیش هاتووبوون کە زۆریان لە وێنەکاندا پەڕۆیەکی ڕەشیان بەستبووە ناوچاوانیانەوە. من تەنیا بە ژمارەی پۆستەرەکان و زانیاریی سەر وێنەکاندا دەمزانی شەڕ لە کوێیە و کوشتاری گەورە لە کوێ ڕوویداوە. هەر کاتێک چاوم بە وێنەی ئەو کوژراوانە دەکەوت، نەمدەتوانی بەری خۆم بگرم و فرمێسک بە چاومدا دەهاتە خوار. کەس لە چاپخانەکە بە مستەر گرینۆک بانگی نەدەکردم، بەڵام هەموو کرێکارەکان بە ئامادەگی دەروونی من بۆ گریان ئاشنابوون. من شتێکی ئەوتۆم لە ژیانی ناوەوە و لە سیاسەتی مەمەدحەسار نەدەزانی. زۆر شەو گەر پرۆفیسۆر بێتاقەت بایە دەینارد بە دوای مندا و شەو تا درەنگانێک دادەنیشتین و قسەماندەکرد. لەو شەوانەدا دکتۆر زۆر شتی لە سەر ژیانی خۆی و لەسەر خەڵکی مەمەدحەسار بۆ باسکردم. شارەکە پێنج ساڵ بوو لە ژێر دەستی دەسەڵاتێکی ئاینیدا بوو کە نان خواردن و پیساییکردن نەبێت هەموو شتێکی تری قەدەغەکردبوو. ئیمام سوبحان خۆی وەک جۆرە ڕەوانەکراوێکی نوێی خودا پیشاندەدا، جۆرە تەفسیرێکی دیکەی بۆ دین هەبوو، پەیمان و مژدەیەکی تری بە مرۆڤەکان دەدا. ئیمام پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، دەنگێکی خۆش و نەرمییەکی جوان لە گەرویدا بوو، بەڵام بەو نەرمی و هێمنییەی، بەو میهرەبانییە زارەکییەی سوپایەکی دڵڕەق لە هەوادارنی بۆ خۆی دروستکردبوو، زۆر کەم لە تەلەفزیۆنەکاندا دەردەکەوت، زۆر کەم وتاری دەدا و کەم کەسیش لە نزیکەوە دیبوویان، بە جۆرێک هەندێ کەس پێیان وابوو ئیمام خۆی بوونی نییە و دەستکردی ئامێرێکی سەربازیی دڵڕەقە، بەڵام ئەو دووری و کەم دەرکەوتنەی وایدەکرد ئەفسوناوی و خودایی دەربکەوێت. پێنج ساڵ لەوەوبەر لەشکرێکی بە ناوی پاسەوانەکانی ئیمان پێکەوە نابوو. سەرەتا ئیشیان تەنیا ڕێنماییکردن و ئامۆژگاریکردن بوو، بەڵام وەک پرۆفیسۆر دەیگێڕایەوە ساڵ دوای ساڵ و مانگ دوای مانگ وردە وردە هەموو شتێک

گۆڕابوو، لە سوپایەکەوە کە کاریان «هیدایەت» دان بوو، بووبوون بە سوپایەک کە ئیشیان سووتاندن و سەرپەڕاندن بوو.

زۆر سەرم لەوە سوڕما کە پرۆفیسۆر گووتی لە نزیکی حەوت بۆ هەشت مانگ لەوەوبەر لە مەمەدحەسار خەونێکی سەیر بڵاوبۆتەوە کە تا ئێستاش خەڵکانێکی زۆر دەیبینن. کەسێک ڕەنگ و ڕووی شەیتانێکی دزێوی هەیە دەچێتە خەونی خەڵک و دوای دەرکەوتنی، بەدبەختی و نەخۆشی سەرهەڵدەدات، خەونێک بە خێرایی لەم سەرەوە دەفڕێت بۆ ئەو سەر و لەم خەیاڵەوە بازدەدات بۆ ناو ئەو خەیاڵ. هەندێک لەوانەی خەونەکە دەبینن بە لەرزوتای توند دەمرن، فێ دەیانگرێت، تووشی دەردی گەڕبوون و داوەشان دێن، ئازاری ناوەکی نادیار لە ناوەوە دەیانخوات. ژنەکان تووشی نەزۆکی، هەوکردنی ترسناکی مەمک، ژانە سکی بەردەوام، لە بارچوونی منداڵ دێن. نەخۆشانی ئەو خەونە هەموو لە خەستەخانەی تایبەتدا جیادەکرێنەوە، باری دەروونیان تێکدەچێت، ڕەنگی پێستیان دەگۆڕێت و بە جۆرێکی گورگئاسا شەڕانگێزدەبن. شێوەشیان وەها دەگۆڕێت، مرۆڤ بە چاوی ئاسایی دەتوانێت لە شەقام و کوچەکاندا جیایانبکاتەوە. ماوەیەکی زۆر ئیمام خۆی بێدەنگ دەبێت، بەڵام لە ڕێگای هاوڕێی هەرە نزیک و جێگری دڵسۆزی خۆیەوە «سادق میرداد» کە بە خواجای گەورە بەناوبانگە و کەسانێک بە بەهێزترین پیاوی مەمەد حەساری دەزانن، ئەوە ڕادەگەیێنێت، تاکە ڕێگایەک بۆ دەرکردنی ئەو دەردە لە ڕۆح و جەستەی خەڵکی مەمەدحەسار، ڕەنجدان و گیانفیداکردنە لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئیمان و ئاڵای پاکی سەرزەمینی خوداناسان. ئەو خەڵکی مەمەدحەسار بە ئەیوب دەشوبهێنێت کە خودا بۆئەوەی ئیمانیان تاقیبکاتەوە، هەموو جۆرە بەدبەختی و دەردێکیان بۆ دەنێرێت. خواجا میرداد وەک دواتر بینیم پیاوێکی سەیر بوو، ڕۆژێک وەک پیاوانی مۆدێرن خۆی دەگۆڕی و قاتی لەبەردەکرد، ڕۆژێکیش جبەی درێژ و مێزەر و سەڵتەی پیاوانی ئایینی دەپۆشی، ڕۆژێک بە تراکسوتی یاری

و شۆرتی مەلەوە وێنەی بڵاودەکرایەوە، ڕۆژێکیش بە جلی سەربازیی و تفەنگی قەناسەوە. ئەو یەکەم کەس بوو کە بە خەڵکی مەمەدحەساری گووت «ئەوەی لەو خەونەدا دەردەکەوێت، ئیبلیسە، ئەوەشی دەیەوێت ئیبلیس لە گیانی خۆی دەربکات، دەبێت هەوڵبدات، دەبێت دانەنیشێت و تەلاشبکات، دەبێت هێزی ئەوەی تێدا بێت لەگەڵ عەزازیلدا بچێتە جەنگەوە، چەکی ئیمان هەڵگرێت و بڕوات بۆ جەنگی بێدینان کە لەو دیو سنوورەوە پیلان لە ئۆمەتی ئەم وڵاتە قارەمانە دەکەن».

خەڵکی مەمەدحەسار بە جۆرێک لەو دەرد دەترسن، ئامادەن بچن بۆ هەر جێگایەک، هەر کارێک بکەن تا باری سەنگینی ئەو مۆتەکانە لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە. هەر کەس دەردێکی هەبێت دەیبەستێتەوە بە دوژمنەوە، تەنیایی و شێتی و بێکاریی هەموو دەبنە جۆرە ئافات و تاعوونێک کە دوژمن ڕەوانەی ئەم وڵاتەی کردون. لە چ جێگایەک بەدبەختی و دەستکورتی زۆرە، لایەنگرانی ئیمام سوبحان و جەنگاوەرانی لەو جێگایە لە هەموو شوێنێک زۆرترن. ڕۆژانە ئیمامەکان، خواجاکان، جبەداران، وەعزگەران، بانگەشەچیان لە ماڵەکانی خوداوە، لە شەقامەکانەوە، لە ڕادیۆکانەوە، لە تەلەفزیۆنەکانەوە، خەڵک لەو خەونە شەیتانییە ئاگاداردەکەنەوە کە تەنیا بە جەنگێکی دەروونی و جەستەیی لەگەڵ خودی ئیبلیسدا مرۆڤ پاکدەبێتەوە. خەڵک لە ترسی ئەوەی شەیتان لێیان نزیک نەبێتەوە، زیان بە خۆیان و منداڵەکانیان نەگەیێنێت یان دەخزێنە کونجی پەرستگا و ماڵە دینییەکان یان خۆیان لە ژوورەکانی خۆیاندا دیلدەکەن یان پۆل پۆل دەچنە ڕیزی سوپای ئیماندارانەوە تا برۆن و لەگەڵ سەربازە پیس و بۆندارەکانی ئیبلیسی گەورەدا بجەنگن کە بە وتەی خواجا لەو دیو چیاکانی دێلاوارەوە قەراریانگرتووە.

دکتۆر دەیگووت «هێدی هێدی ترسی خەڵک لەو خەونەوە وەرگەڕا بۆ ترس لە تاعوون و ئافات و نەخۆشییەک کە لە دێلاوارەوە بەرەو ئەم

شـارە دێـت». لـە دێـر زەمانـەوە، لەسـەردەمێکەوە کـە دێـلاوار ژێردەسـتەی مەمەدحەسـار بـووە، کەمایەتییەکـی بچوکـی خەڵکـی دێـلاوار لـەم شـارە ژیـاون، بـازرگان بـوون، دوکانـدار بـوون، ئیشـی ئاسـاییان کـردوە، منداڵەکانیـان لـە مەمەدحەسـار گـەورە بـوون و زانکۆیـان خوێنـدوە، بەشـێکی هەمیشـەیی بـوون لـە ژیـان و لـە شـارەکە. بـەڵام لـە نـاکاو ئـەو کەمایەتییـە وەک گـەرای ئیبلیـس لـە دڵـی مەمەدحەسـاردا ناودەبرێـن، وەک وەچەیەکـی شـەیتانی کـە بـە مەبەسـتی پیسـکردنی خوێـن و تێکدانـی ئیمـان هاتوونـە ئێـرە. ڕۆژێـک دێـت هەمـوو بازرگانەکانیـان کۆدەکرێنـەوە و بـێ ئـەوەی تۆمەتێکـی ڕوون و دیاریکراویـان ئاڕاسـتەبکرێت، بـە دەیانیـان لەسـێدارە دەدەن و لاشـەکانیان دەکـەن بـە سـتوونی ئاسـنینی کارەباکانـدا، بـە درەختەکانـدا، بـە ناوەڕاسـتی مەیدانەکانـدا. هەمـوو شـەقامە سـەرەکییەکانی مەمەدحەسـار تـا چەنـد ڕۆژ پڕدەکرێـن لـەو جەسـتانە. لـە زۆربـەی گونـد و شـار و شـارۆچکەکانی مەمەدحەسـار ماڵـی دێلاوارییـەکان دەسـووتێنن، ژنەکانیـان دەڕفێنـن و دەیانبـەن بـۆ ئـەو سـەربازگە و مۆڵگە تایبەتانـەی مەشـق تـا سـەدان پیـاو لـە سـروتی دەسـتەجەمعی گەورەدا پێکـەوە لاقەیانبکـەن. لـە هەنـدێ جێگادا گـۆڕی بـە کۆمەڵیـان بـۆ هەڵدەکەنـن، لاشـەکانیان بـە سـووتاوی فڕێدەدەنـە سـەر ڕێگاکان. بـەڵام تـا تـاوان زیاتـر بێـت خەڵـک تینووتـر دەبـن و زیاتـر و زیاتریـان دەوێـت. تـا کوشـتار زۆربێـت خەڵـک درتـر دەبـن، برسـێتیان بـۆ بینینـی خوێـن و سـووتان و سـەربڕین زیاتـر جـۆش دەسـتێنێت. لـەو سـەردەمەدا پرۆفیسـۆر قاسـمی شـابەندەر بـۆ یەکەمجـار خەونـی هـەورەکان دەبینێـت... چەندیـن سـاڵە وشـەی نهێنـی لـە نێـوان ئـەو و پرۆفیسـۆر بەهنامـدا هـەورەکانی دانیـال بـووە. کتێبـی دانیـال، لـە دۆزینـەوەی پرۆفیسـۆر قاسـمی شـابەندەرە، ئـەو هەشـت سـاڵ لەمەوبـەر لـە ماڵـی یەکێـک لـە دێلاوارییەکانـدا کتێبەکـە دەدۆزێتـەوە. بـە درێژایـی مێـژوو وابـووە دێلاوارییـەکان کـە هەڵهاتـوون هاتـوون بـۆ مەمەدحەسـار، چـوون بـۆ کوفیـان، بـۆ ئـەڵا ئابـاد، بـە پێچەوانەشـەوە، مەمەدحەسارییەکان کـە لـە شـاری

خۆیان هەڵهاتوون، ڕوویانکردۆتەوە دیلاوار یان هەر جێگایەکی دی کە گۆشەیەکی ئارامیان دەست بکەوێت. پرۆفیسۆر دەمێک باسی دۆزینەوەی کتێبەکەی دەکرد چاوانی دەکرانەوە، نیگای پڕدەبوو لە سەرسامییەکی قووڵ، دەنگی دەگۆڕا و دەیگووت «من هێندەی کتێبەکەم خوێندەوە بوومە مرۆڤێکی دی. مرۆڤی ڕاستەقینە کەسێکە تەنیا مرۆڤەکان لە مەترسی ئاگاداردەکاتەوە، مرۆڤی ڕاستەقینە کەسێکە وەک نوح کە تۆفان دەبینێت و خۆی بۆ ئامادەدەکات، تۆفان دەبینێت و کەشتی خۆی دروستدەکات. ئەمڕۆ لە سەردەمێکداین کەشتی گەورە دروست ناکرێت، تۆفانەکە هەموو کەشتییەکی گەورە نوقمدەکات، ئەوەی دەکرێت بەلەمێکی بچوکە کە خۆت و هەندێک مەخلوقاتی تێبخەیت... دانیال کەشتی دروست نەکردوە، بەلام هەورەکانی بۆ ناردوین، خەبەری تۆفانی بۆ ناردوین ... لەو ڕۆژەوە من دەمەوێت دانیالییەکی ڕاستەقینەبم، کەشتییەکی بچوکم هەبێت و خۆم و سەر نشینانی بە ناو تۆفانەکەدا بپەڕێنمەوە، ئەفسوس کە کەشتییەکەم جێگای هەموو بوونەوەرانی تێدا نابێتەوە.. ئەفسوس ».

جارێکی تر لە بەردەم ئەم پیاوەدا کە وەک وێنەی ئاوێنەیی پرۆفیسۆر بەهنام دەمبینی، سەرسام و غەمگین دەوەستام. چۆن دەبێت دوو مرۆڤی وەها چونیەک و ئاوێنەیی لە دوو شاری دوژمندا بژین؟ . من بێدەنگ دەبووم و وەک یەکێک بە دوای وەلامی مەتەڵێکی وندا بگەڕێت دەمپرسی «دانیالی ڕاستەقینە کێیە، دەبێت چۆن بێت؟». چاوانی هێندەی تر دەکرانەوە، چاویلکەکەی بە هێمنی لە دەستیدا دەجولاند و دەیگووت «ئەوەیە کە کارەساتە گەورەکان دەبینێت. دەبینێت تۆفان هاتووە، دەزانێت گەورەترین دوژمنی مرۆڤ، مرۆڤ خۆیەتی. جگە لە تۆفان ناوێکی دیکە لە تۆفان نانێت. دانیالییەکان قارەمان نین، زۆرجار ترسنۆکیشین، بەلام دوو چاوی وریایان هەیە، تەنیا شتێک کە بیریان لایەتی، ئەوەیە ئەوانیتر ڕزگاربکەن، دوژمنیان زۆرە بەلام ئەوان دوژمنی کەس نین. «من تەنیا کاتێک دەبم بە دوژمن کە

ئەو وەک دوژمن دەمبینێت، وە ئەو تەنیا کاتێک دەبێتە دوژمن کە من وەک دوژمن دەیبینم... لەوە بترازێت، دوژمن لەسەر زەوی بوونی نییە» دانیال وادەڵێت. ئەوان جگە لە ڕزگارکردن باوەڕیان بە هیچ وشەیەکی تر نییە، ناتوانن دونیا بگۆڕن، بەڵام دەتوانن هەندێ ژیان ڕزگاربکەن. بەڵێ ... من ئەم کتێبەم دۆزییەوە، سەدان ساڵە دەڵێن ئەم کتێبە بوونی نییە، سەدان ساڵە هەر کەسێک بڵێت دوژمن لە خەونەکانی خۆمانەوە دێتەدەرێ، زمانی دەبڕن، بە درۆزن و نۆکەر و خیانەتکار ناویدەبەن، بەڵام کە ئەم کتێبەم دۆزییەوە، کە ئەم کتێبەم گرت بە دەستمەوە و پەڕە پەڕە هەڵمدایەوە، دڵنیابووم هەمیشە لە قووڵایی مێژوودا هاوڕێیەکم هەبووە، خەڵکانێک هەبوون کە لەودیو مانای دۆست و دوژمنەوە بیریان لە مرۆڤ کردۆتەوە، گەورەتر لە سنووری شاری خۆیان تێفکریون، دوورتر لە سنووری ڕۆژگاری خۆیان ڕوانیویانە، مرۆڤی ڕاستەقینە کە بیریکردەوە، بیر لە مرۆڤی هەموو شوێنەکان و هەموو سەردەمەکان دەکاتەوە. پرۆفیسۆر بەهنام لە سەرەتاوە، لە ڕۆژگارێکەوە کە چیرۆکی کوشتاری دانیالییەکانی لە دیلاوار خوێندبووەوە، باوەڕی بە بوونی ئەم کتێبە هەبوو، باوەڕی بە بوونی دانیال هەبوو، باوەڕی وابوو کە هەر کات هەورەکان دەرکەوتن سەرەتای کارەساتە گەورەکان دەردەکەوێت، بەڵام بەڵگەی تەواوی بە دەستەوە نەبوو. چەندین ساڵ بوو من و پرۆفیسۆر و چەندانی تر بە دوای ئەو کتێبەدا دەگەڕاین... دەمانزانی دەبێت لە جێگایەکی دونیادا هەڵگیرابێت. من دەمزانی کە ئەم کتێبە چ نرخێکی بۆ پرۆفیسۆر هەیە، بە پۆستێکی نهێنی و تایبەتدا کتێبەکەم بۆ نارد، بەو مەرجەی ڕۆژێک دڵنیابوو دەکەوێتە دەستێکی غەریب، دەستێک کە لە نرخی تێناگات، بینێرێتەوە بۆ من. کەمن ئەو کەسانەی لە مانای ئەم کتێبە تێدەگەن. ئەفسوس، یەکێک لە سیفەتە نزێوەکانی مرۆڤ ئەوەیە، کاتێک بەلای شتی مەزندا دەڕوات کوێردەبێت... من سەلماندم کە دانیال هەبووە، دەبێت لە هەموو سەردەمێکیشدا هەبێت.

من و پرۆفیسۆر پێکەوە تۆڕێکمان دروستکرد بۆ ڕزگارکردنی ژیان، وشەی نهێنیمان هەمیشە «هەورەکانی دانیال» بووە. من لێرەوە دەیان شاعیر و نوسەر و مێژونوسی هەڵهاتووم ناردوە بۆ لای ئەو، خەڵکانێک لەسەر ئیمانێکی تر بوون و لە مەمەدحەسار ژیانیان لە مەترسیدا بووە، خەڵکانێک بێ هیچ هۆیەک یان بەهانەیەکی دیاریکراو ژیانیان کەوتۆتە مەترسییەوە، پرۆفیسۆر هەمیشە لە ماڵی خۆیدا یان لە ژێرزەمینی مۆزەخانەکەدا دەیشاردنەوە تا دەرفەت دەهات و لە ڕێگای قاچاغچییەکانەوە دەیناردن بۆ خۆرئاوا، من و ئەو دەیان ژیانمان ڕزگارکردوە.... ئێستا کە ئەو چیتر ئازاد نییە، کە جەنگ دیوارەکانی نێوانمانی ئەستوورتر کردوە، هەست بە ترسێکی گەورە دەکەم. ئەم جەنگە تۆفانی ڕاستەقینەیە و هەورەکانی لە مێژە لەسەری ئێمەدا دەبارێن».

پرۆفیسۆر زۆر غەمگین بوو، هەستیدەکرد تا دێت ڕزگارکردنی مرۆڤەکان سەختتر دەبێت. شەوێک بە منی گووت «لە ئاگری جەنگدا، ڕزگارکردنی مرۆڤەکان کارێکە لە توانای کەسانی وەک مندا نییە». هەستی بە لاوازی دەکرد، خۆی و قژە پەشۆکاو و پژیاوەکەی، بە چاویلکەیەکەوە کە پتر بە دەستییەوە بوو تا لە چاویدا بێت، دەهات و دەچوو، دەیگووت «تەنیا بەختەوەری ئەم ماوەیەم ئەوەیە کە دەتوانم کۆمەک بە ئێوە بکەم. من گەر نەتوانم کۆمەک بە کەسێک بکەم دەمرم».

کاری پرۆفیسۆر تا دەهات دژواردەبوو. هاوکارەکانی ئەو زۆربەیان برابوون بۆ جەنگ، چاوی پیاوانی دەوڵەت لە جاران دڕتر دەیانڕوانی و زیاتر گومانیاندەکرد، سەر شەقام و ناو کۆڵان و کوچەکان بە سیخوڕ و چاوی نهێنی و هەواڵگرانی بێڕەحم تەنرابوون، ئەوە پرۆفیسۆر قاسمی خزاندبووەوە ناو چاپخانەکەی خۆی و کارێکی ئەوتۆ گرنگی بۆ نەدەکرا. هەندێک ڕۆژ تەواو خۆی دەگۆڕی، شەپقەیەکی ڕەشی دەکردە سەری و

پاڵتۆیەکی درێژی دەپۆشی و بە خۆی و چەترێکی گۆچانی درێژەوە بۆ چەند سەعاتێک دەچووە دەرێ. هەمیشە ئەو چەترەی پێ بوو، دەیگووت «گەر هەواش خۆش بێت، باران لە سەری مندا بەردەوام هەر دەبارێت»، چەند جار سەرنجمدا کە کاتێک باران دەبارێت ئەو خەیاڵی لای ئەوە نییە چەترەکە بکاتەوە، دەمبینی بە خێرایی لە شەقامەکەوە بەرەو مەیدانی فیردەوس دەڕوات و لەوێوە لە پشت سەکۆی سەرەکی مەیدانەکەوە وندەبێت، دەمبینی هەندێ جار بێ باران چەتری هەڵدەدا و هەندێ جاریش باران چەند توندبایە چەتری هەڵ نەدەدا، هەستمدەکرد چیتر توانای جیاکردنەوەی بارانەکانی نەماوە، نەیدەزانی کامە باران لە سەریدا دەبارێت و کامە باران لە ئاسمانەوە دێتەخوارێ.

هەموو ئەو ماوەیە ئاڵ موراد لە ژوورەوە چاوەڕوانی قاچاغبەرێکی دەکرد لە مەمەدحەسار بیباتەدەرێ. پرۆفیسۆر ڕۆژ دوای ڕۆژ و هەفتە دوای هەفتە سەفەرەکەی ئاڵ موڕادی دوا دەخست. بە قسەی پرۆفیسۆر قاچاغبەرەکان تا دەهات کەمدەبوونەوە، ڕێگاکان تا دەهات پڕدەبوون لە مەترسی، هەڵهاتووەکان تا دەهات زیاتر دەکوژران و بواری ڕزگاربوونیان تەسک دەبووەوە، مەمەدحەساریش ڕۆژ دوای ڕۆژ دەبوو بە سەر زەمینێکی خوێناوی داخراو، بە تەڵەیەکی کوشندە کە هیچ کەس بە ئاسانی نەیدەتوانی لێی دەربچێت.

دوای ماوەیەک لە پێکەوە ژیان و چیرۆک و ترس و دوودڵی، شەوێک زۆر درەنگ پرۆفیسۆر لە سەرەخۆ لە دەرگای ژوورەکەمانی دا و دوای ئیستێک هەر خۆی کردییەوە و هاتەژوورێ. من لە جێگاکەی خۆم هەستام و سەیرم لێهات کە پرۆفیسۆر شابەندەرم بە خۆی و قژە درێژ و بژەکەیەوە بینی، بە هێمنی بە ئاڵ مورادی گووت «خێرا خۆت کۆ بکەرەوە، لە خوارەوە چاوەڕوانتن، هەر ئەمشەو دەبێت دەربچیت، ڕەنگە ئەمە دوا فرسەتمان بێت.

گەر ئەمشەو دەرنەچێت، دوور نییە تا چەند مانگ و ساڵی تر لێرە گیر بخۆیت». ماڵاواییمان لە ئاڵ موراد خێرا و کتوپڕ بوو، من دەستمکرد بە گریان و بێئەوەی بتوانم هیچ ڕستەیەکی مانادار بڵێم و خوداحافیزییەکی دۆستانە بکەم، باوەشم بە ئاڵ موراد دا کرد و توند بە خۆمەوە نوساند و گریام. ئاڵ موراد پتر لەوەی غەمگین یان دڵخۆش دەربکەوێت، سەرسام و پەشۆکاو دیاربوو. بەر لەوەی لە دەرگای ژوورەکە بچێتە دەرەوە و ماڵاوایی هەمیشەییمان لێ بکات، بە دەنگێکی سادە و منداڵانە گووتی «دەبێت بڕۆم»، دەنگی پڕ لە پاکی و تەنهایی و بێگوناهی بوو. دەنگێکی ساف بوو، دەنگی ڕۆحێک دڵنیام دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە پاکژەکانی بوونی خۆی. لەو ساتەدا ئاڵ موراد ڕوخساری بێگەرد و منداڵانەی خۆی وەرگرتبووەوە، چیتر کەسێک نەبوو کە لە سوپایەکی دڕ و بێڕەحمی وەک باغەوانەکانی دیلاواردا کاریکردبێت، کەسێک نەبوو بە قەناس لە دوورەوە خەڵکانێکی کوشتبێت کە نەیناسیون، گەنجێکی سادەبوو کە بە دوای ژیانێکی سادەدا بەرەو زەمینێکی دوور دەڕۆی. زەهاو و پرۆفیسۆر هیوای سەرکەوتنیان بۆ خواست، ئەو بەتایبەت باوەشی بە مندا کرد و گووتی «برای زەریاواری ئاگات لە خۆت بێت، گەر گەڕایتەوە دیلاوار دایکم بدۆزەرەوە و پێی بڵێ کە من سەفەرمکردوە، من دەزانم چیت وەڵامدەداتەوە، بەڵام تۆ هەر بچۆ. هەر چییەکی گووت گوێبگرە و هیچ مەڵێ، کە هاتیتەدەری لە ماڵی ئێمە یەکسەر بچۆ بۆ لای مامۆستا سمکۆ سوهەیب و سەیرێکی پەیکەری باڵندەکە بکە، بزانە ئەو تەیرانە جوان بوون کە من ڕاومکردون، گەر توانیت بچۆ بۆ لای ژن و منداڵەکەی فەرماندار ماروفی و داوای لێبوردنیان لێ بکە، تکایە گەر توانیت ئەو کارانەم بۆ بکە». دەمزانی کە لەو دەرگایە چوو بەودیودا ئیتر نەدەیبینینەوە و نە لە هیچ جێگایەکی دونیاشەوە جارێکی تر هەواڵیکمان بۆ دەنێرێتەوە. کە لەدەرگاکە چوو بەودیودا ئیتر بۆ هەتاهەتایە ونبوو، ئەو لەوجۆرە کەسانە بوو کە جێگایەکیان بەجێهێشت هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆی.

# ٤٨

هەفتەیەک دوای ڕۆیشتنی ئاڵ موراد من دەستمکردەوە بە بینینی خەونەکان، خەونی ئەوانی دی، خەونی شارێکی نەناس، خەونی کەسانێک کە نازانم کێن... خەون بە لێشاو دەهاتن و شەویان پڕدەکردم لە گێنگڵ و دوودڵی. جیاوازی خەونەکانی ئێرەم لەوەدا بوو کە هەمووی خەونی نەناس بوون، خەونی شوێنی نەناس و هێمای نەناس. من دوو ساڵ خەونی مەمەد حەسارم وەک خۆیان بینی، بەڵام خەونەکان هەمیشە ئاڵۆز و تێکەڵ و نائاشنابوون، بۆ من هەمیشە نامۆ و تەماوی بوون. خەونەکان پڕبوون لە ئارەزووی کوشتن، لە خواستی سووتاندن، لە ئارەزووی دڕندانەی سێکس، لە ترسی مردن، لە وێنەی وێرانە، لە شاری نغرۆ، لە لاشەی ڕزیو. سەیربوو بەلامەوە کە بەشی زۆری خەونەکانی ئەم شارە لە دەوری کوشتن و سووتان و توندوتیژی دەسوڕانەوە، پڕبوون لە شوێنی کاولبوو، لە پردی ڕوخاو، لە شەقامی وێران، لە ئاگرگەلێک کە هەرگیز ناکوژێنەوە، لە گڕکان کە منداڵان دەکەونە ناوی، لە سەری بڕاو کە پێدەکەنێت، لە مرۆڤ کە وەک پشکۆ وان و بە وێنەی خەڵوزی گەشاوە بە شەقامەکاندا دەگەڕێن، لە چەقۆی گەرۆک کە بە هەرکەس دەگەن سەریدەبڕن، لە سەنگەری پڕ لاشە، لە قەفەزی پڕ ئێسک و پروسک، سەعات کە زەمانی مردن دەخوێنێتەوە، ڕۆژژمێر کە تەنیا وادەی سەرهەڵدانەوەی مردووەکان پیشاندەدات، کفنپۆش کە بە

شەقام و کوچەکاندا دەگەڕێن، باڵۆن کە لە ناوەڕاستی شارەکاندا گڕدەگرێت و دەسووتێت... خەونەکانی مەمەدحەسار بێ خاوەن بوون، لە هەندێ خەوندا خاوەن خەونەکانم دەبینی، بەڵام کەسانێکی نەناسراوبوون، هیچ کات ڕێکەوتی نەکرد من یەکێک لەو ڕوخسارانە ببینم یان بناسمەوە. ئەوەی بەلامەوە سەیربوو ئەو ترسە زۆرەبوو کە لە خەونی ئەم شارەدا دەمبینی، چەند جار ئەو ئەهریمەنەم بینیوە لە خەونەکاندا دەردەکەوت و بەجۆری دڕندانە ئەشکەنجەی خەوبینەکانی دەدا، زۆری خەونەکان لە ترس و تاریکی و وەحشەتیاندا لە خەونەکانی دێلاوار دەچوون. لە ڕاستیدا ڕۆژ بە ڕۆژ و خەون لە دوای خەون زیاتر لەوە تێگەیشتم کە دێلاوار و مەمەدحەسار وەک یەک بیردەکەنەوە، وەک یەک خەون دەبینن، وەک یەک دەترسن، هەم یەک دڵ و هەم یەک سەر و هەم یەک ڕۆحیان هەیە.

هەندێک ڕۆژ گەر کارمان کەمبووایە، یاخود ئیشەکانمان زوو تەواوکردبا، زووتر چاپخانەکەم بەجێدەهێشت و دەچوومە سەرێ یان لە شەقام و کوچەکانی دەوروبەردا پیاسەیەکم دەکرد. لەسەر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی پرۆفیسۆردا گرتنی هاوڕێ و نزیکبوونەوەی زۆر لە هەر کەسێکی خەڵکی مەمەدحەسار تەواو قەدەغەبوو. بەڵام جارجار دەبوو شەقامەکانی مەمەدحەسار بگەڕێم تا لە نزیکەوە ژیان و هەناسەی شارەکە بۆنبکەم. دوای دوو مانگ ژیان لە مەمەدحەسار، یەکەم ڕێڕۆیشتنی کفنپۆشەکانم بینی، کە بە مارش و لەسەر ئاوازی سرودی «ئەی خاکی نێرگس و بەهار، ئەی باغی پیرۆز و پڕ گوڵ، ئەی دەشتی مەمەدحەسار» بە ڕێگادا دەڕۆیشتن. هەزاران کەس تەماشایاندەکردن و سرودیان لەگەڵدا دەخوێندن و دەگریان. لە دوای ئەوەوە بینینی مارش و ڕێڕۆیشتن و ماڵاواییکردن و پێشوازیکردن لە سوپا بوو بە بەشێک لە ژیانی ڕۆژانەی ئەم شەقامە. ڕۆژانە، لەسەر دەنگی سرودی ئایینی و مۆسیقای سەربازیی، جەنگاوەرانی تازە بەرەو بەرەکانی جەنگ ڕەوانەدەکران. ڕۆژێک لە چاپخانەکە بوو بە

هەڵا و سەرکاری گەورەمان پێی ڕاگەیاندین کە بەرپرسانی ئاسایش و چاودێری لە ناوچەکەدا ئاگاداریانکردوینەتەوە کە دەبێت هەموو دوکاندار و فەرمانبەران و ئیشکەرانی سەر ئەم شەقامە سەعات یەکی نیوەڕۆ لە مەیدانی دەروازەی فیردەوس ئامادەبن. خەڵکی مەمەدحەسار دەیانزانی بەهانەی ئەم کۆبوونەوانە چییە. پێشتر هەواڵیان هەبوو کە ئەم نمایشە ترسناکانە وەک شانۆی گەڕۆک وان و هەموو بەشێکی خاکی مەمەدحەسار و هەموو مەیدانێکی ئەم شارە دەگەڕێن. ئەو ڕۆژە دەبوو ئێمەش ئامێری چاپەکە بکوژێنینەوە و دەرگای چاپخانەکە دابخەین و بچین بۆ گۆڕەپانی دەروازەی فیردەوس. لەوێ حەشاماتێکی گەورە کۆبووبووەوە، هەندێکیان دروشم و هەندێکیان شمشێریان هەڵگرتبوو. بەر لە دەستپێکردنی مەراسیمەکان، بانگی «فیداتم ئەی خاکی تەلا» «تا مەحشەر... تا مەحشەر... سەربازی سوبحانم» «خوێنی من، خوێنی تۆ. ئازادە خاکی من، سەربەرزە خاکی تۆ» گوێی کەڕدەکرد. هاوارەکان هێند بەرزبوون من دەنگی ئەوانەم نەدەبیست کە لە نزیکمانەوە قسەیاندەکرد. سەکۆی ناو مەیدانەکە کرابووە دوو بەشەوە، بەشێک بۆ قسەکردن و وتاردان، بەشێکیش بۆ نمایشێکی تایبەت. ئاڵای سوور و ڕەشی مەمەدحەسار بە سەدان دەشەکانەوە. لە ناکاو بێدەنگییەکی کوشندە باڵی بەسەر مەیدانەکەدا کێشا، من و زەهاو و جەنابی پرۆفیسۆر و یەدوڵا پێکەوە وەستابووین و لە جێگایەکی کەمێک بەرزەوە بەسەر تەواوی مەیدانەکەدا دەمانڕوانی. پیاوێکی باڵابەرز بە قاتێکی جوانەوە لەسەر سەحنە دەرکەوت و دەست پێکردنی مەراسیمەکانی بە هەندێک ئایەت ڕاگەیاند. لە کاتی خوێندنی ئایەتەکاندا مەیدانەکە تەواو بێدەنگ و خامۆش بوو، دواتر کە قسەکەرەکان دەرکەوتن، دووبارە هوتاف و هاوار زەمینی دەلەرزان. چەندین کەس قسەیانکرد، وتەکانیان جنێو و هەڕەشە و وەسفی نابەجێی دێلاوار بوو، بەڵام خرۆش و حەماس و خۆشییەکی بێوێنەی لە نێوان ئامادەبووندا دروستکرد. لە مەراسیمەکەدا دێلاوارییەکان بەو سەگانە وەسفکران کە

تەنیا بە پاکردنەوەی سەریان زەوی لە شەڕ و ئافەتیان ڕزگاری دەبێت، دێلاوارییان بەسەر زەمینی مەیمونە بێکلکەکان ناونا، هەموو پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە سەرکەوتنی کۆتایی سوپای مەمەدحەسار تەنیا مەسەلەی کاتە و لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا خودی شاری گەورەی دێلاوار بە ئاگری هێزە نەبەردەکانی مەمەدحەسار لەگەڵ زەویدا تەختدەکرێت. قسەکان وەها بەجۆش دەکران، دەنگەکان وەها تایبەت هەڵبژێردرابوون و وشەکان وەها کاریگەر ڕیزکرابوون، هەستمدەکرد هەتا منداڵانی بچوکی ئەم شارەش گەر دێلاوارییەک بگرن، ئامادەن لەوێدا پێستی لە جەستە داماڵن و وەک ئاژەڵ کەوڵیبکەن. لەگەرمەی هوتاف و حەماسەت و سروودا، دیلەکانی دێلاوارییان هێنایە سەر سەکۆ. ساتێک بوو تەواوی خەڵک ئامادەی بینینی سەربڕینیان بوون. سەعاتێک بوو قسەکەران، ئەو خەڵکە زۆر و حەشاماتە هارەیان بۆ بینینی ئەم دیمەنە ئامادەدەکرد. لەسەر سەکۆکە جێگایەکی تایبەتیان بۆ جەلاد و زیندانییەکان ڕێکخستبوو. یەکەم جار ئەو پیاوە بالابەرزە گەورەیە بە دوو چەقۆوە دەرکەوت، خەڵک هێندەی ناوی سکینانیان بیست وەک فێیان لێ هاتبێت، وەک ئەستێرەیەکی گەورەی نێو فیلمەکانیان بینیبێت، بەجۆش و خرۆشێکی بێوێنەوە، وەک پێکڕا خەویان لێ کەوتبێت و هێزێکی نهێنی بیانجوڵێنێت، ئاگریان گرت. سکینان دوو چەقۆی گەورە و تیژی پێ بوو، وەک زۆربەی جەلادەکانی دونیا بێدەنگ بوو، بەڵام تەواوی مەیدانەکە وەک هاوار لە شێرێک بکات، بەیەک دەنگ و یەک گەروو هاواریدەکرد «سکینان». یەکە یەکە سەر بڕینەکان دەستی پێکرد، هیچ کەس نەیدەوێرا چاوی بگرێت یان خۆی بێلایەن پیشانبدات یان بترسێت. ئێمەش دەبوو وەک ئەوان دەربکەوین، وەک ئەوان هاواربکەین، وەک ئەوان چاوەڕوان بین چۆن دیلەکانی دێلاوار دەهێنن و بە چەقۆیەکی خێرا و بێگرێ و یەکسەرە سەریان لێ دەکەنەوە. هیچ کەس نەیدەوێرا لەو ساتانەدا چاو لێک بنێت، چونکە لە سەرەوەڕا چاودێرەکان سەیریاندەکرد و دیمەنەکەیان بە کامێرای تایبەت دەگرت.

دەبوو هەموو هاولاتییەکی مەمەدحەسار گەر ئامادەگی ئەوەشی تێدا نەبێت، خۆی دیلاوارییەک بکوژێت، ئامادەگی ئەوەی تێدا بێت لەزەت لەسەربڕین و ئازاردانیان ببینێت. ئەوەی سەیر بوو، تا سکینانی جەلاد بە دوو چەقۆکەی دیلی زیاتری سەرببڕیایە، خەڵک برسیتر و بەجۆشتر و شادتر دەبوون، گەر سکینان خۆی ماندوو نەبایە، گەر خۆی کۆتایی بە ئاهەنگەکانی سەبڕین نەهێنایە، خەڵک ئامادەبوون هەموو شەو دابنیشن و سەیری خوێن و کەللەی بڕاو بکەن.

ئەو ئاهەنگە هیستیریانەی کە هەمیشە بە سەربڕین یان سووتاندنی هەندێک دیلی دیلاواری کۆتاییان دەهات، زوو زوو لە مەیدانەکاندا کۆبوونەوەیان بۆ سازدەکرا. دەبوو هەموو جارێکیش ئێمە دەست لە کار هەڵبگرین و بچین. ئەوانەی نەدەچوون بۆ ئاهەنگەکە و لە گۆڕەپانەکەدا نەدەبینران، ئەگەری ئەوە هەبوو سزابدرێن، بگیرێن، تۆمەتی ناڕەوایان بۆ دروستبکرێت. پرۆفیسۆر هەموو شەوێک بەر لەم بۆنە ترسناکانە، هەورە خوێنینەکانی دانیالی دەبینی بەسەریدا دەبارێت. هەمیشە بانگیدەکردم و بە چپە لێی دەپرسیم «هەورە خوێنینەکانت نەبینیوە؟». من هەندێک جار ئەو هەورانەم دەبینی و هەندێک جار نا، هەندێک جار سەرنجی زەهاوم دەدا کە عارەقی دەردەدا و بارانی سامناک لە خەونیدا دەباری و بەدەم لەرزەوە هەڵدەستا. پرۆفیسۆر سووربوو لەسەر ئەوەی کە هەمووومان بچین بۆ ئەو کۆبوونەوانە. دەیگووت «مرۆڤە دڕندەکان لەوێدا زیاتر دەبنە دڕندە و مرۆڤە ڕاستەقینەکانیش زیاتر دەبنە کەسانی میهرەبان و پڕ بەزەیی». پێیوابوو ئەوەی لە مەیدانی دەروازەی فیردەوس ڕوودەدات، بەشێکی گرنگی مێژووە و مرۆڤ دەبێت بیبینێت. جارێک لە کاتی سەربڕینەکاندا، لە کاتێکدا دیلێک لە ژێر چەقۆی سکیناندا دەینالاند، پرۆفیسۆر چاویلکەکەی لە دەستیدا و چەترێکیش لە بنهەنگڵیدا چپانی بە گوێمدا «ئێمە ئێستا گەورەترین شاهیدین لەسەر دڕندەیی مێژوو، لەسەر وەحشییەتێک نەوەکانی داهاتوو باوەڕی پێ

ناکەن، بەدرۆی دەخەنەوە، خەڵکانێک وەک چیرۆک سەیریدەکەن، لە کاتێکدا ئێمە دەتوانین بزانین چ ڕاستییەکی گەورەیە، چ ڕاستییەکی عەجایەب و ئازاربەخشە». من بینینی ئەو دیمەنانە تووشی غەمۆکییەکی قووڵیان دەکردم، دوای ئەوەی کە لە مەیدانەکە دەگەڕاینەوە شەو و ڕۆژێکی ڕێک دەگریام. دکتۆر قاسم دەیزانی کە چیم بەسەردێت، دەیزانی من بۆ زیاد لە بیست و چوار سەعات ناتوانم ژێر ببمەوە، هەمیشە دوای ئاهەنگەکان ڕۆژێک پشووی دەدامێ و لێدەگەڕا لە ژوورەکەی خۆم نەیەمە دەرێ و تەنیا بە بێدەنگ بگریم.

لە دووەمین زستانی جەنگدا، بەیانییەک وەک هەندێک جاری پێشووتر، پیاوان و چاودێرانی دەوڵەت لە شەقامی حەبیبوڵای داغستانی ئێمەیان ئاگادارکردەوە کە دەبێت کاتژمێری دوانزەی نیوەڕۆ بۆ ئاهەنگێکی نوێی پیشاندان و سەربڕینی دیلە دزێوەکانی دیلاوار لە گۆڕەپانەکە ئامادەبین. من ئەو ڕۆژە بێهۆ ترسێکم لێ نیشتبوو، هەستمدەکرد کارەساتێکی زۆر ناخۆش و ڕووداوێکی تایبەتی بەڕێوەیە، تکام لە زەهاو کرد کە خۆی بپارێزێت و ئەمڕۆ هەموو شتێک بە وردی و ڕێکی ڕەچاوبکات. هەستەکانم ئاڵۆز و تەمومژاوی بوون، بەڵام پێکڕا بەو ئاڕاستەیە بوون کە شتێکی ناجۆر دەقەومێت. ئەو ڕۆژە سەعات دوانزە لە پێشی پێشەوەی مەیدانەکە و تەنیا چەند مەترێک دوور لە سەکۆکەوە جێگام گرت. هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم، چیرۆکێک کە لە عیادەکەی مامە سیام دەستی پێکردبوو، ئەمڕۆ و لەم گۆڕەپانە گەورەیەدا بگاتە کۆتایی. هیچ کات جورئەتی ئەوەم نەکردبوو بەو ئەندازەیە لە سەکۆی قەسابییەکە نزیک ببمەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە پەلی زەهاوم کێشا و تا بەردەم سەکۆکە درمان بەخەڵکەکەدا و لە جێگایەکی زۆر نزیک قەرارمانگرت. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە قسەکەران، دووانی ئاگرینیان دەدا و مەیدانی دەروازەی فیردەوسیان دەهێنایە جۆش، من وەک بێهۆش بووم، ئاگام لە هیچ شتێک نەبوو، وشەکان تەنیا وەک غەڵبەغەڵب و ژاوەژاو

دەهاتنە گوێم، بە ترسێکەوە توند دەستی زەهاوم گرتبوو و نەمدەویست لێم دووربکەوێتەوە، هەستمدەکرد تا لە سەکۆکە نزیکتربین سەلامەتتر دەبین. شەوی پێشتر چەندین خەونی شڵەوبڵەم بینیبوو، ئێستا مەیدانەکە تەواو بە خەونێکی ڕەش دەچوو، بە مۆتەکەیەک کە لە ساتێکی ترسدا لە دونیای خەونەکانمانەوە بۆ ناو حەقیقەت بازیدابێت. هەموو شتێکی شوێنەکە ئێستا بە خەون دەچوو، بە خەونێکی ترسناک، بە تاریکییەکی ناو ناخ کە بازیدابێتە دەرەوە. بۆ ئێستێک وڕدەبووم، سەرم لێدەشێوا، چاوانم لێڵ دەبوون، سەرم بەرزدەکردەوە و هەورێکی سووری زۆرم لە ئاسماندا دەبینی، ئاوڕم دەدایەوە و پرۆفیسۆر شابەندەرم دەبینی لە ناو حەشاماتەکەدا، هەم کڵاوێکی گەورەی لەسەر کردوە و هەم چەترەکەشی هەڵداوە. بۆ ساتێک چاوم لێکدەنا و ئەو هەورانە لە سەرمدابوون، سەرم بەرزدەکردەوە و دیسان لە ئاسماندا دەمبینین، گوێم لێ بوو پرۆفیسۆر بانگمدەکات و دەڵێت «حەسەن تاج... حەسەن تاج، سەیری ئاسمان بکە». من توند دەستی زەهاوم دەگرت و لە ناو ئەو هەزاران کەسە توڕە و سەرسام و بەجۆشەدا جارێکی دی، سەرم بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە، چاوانم جگە لە لێڵی و سەرسامی، لە ترس، لە ماقبوون و وڕی، هیچی تریان تێدا نەبوو. سکینان بە خۆی و دوو چەقۆ تیژەکەیەوە بازیدەدایەوە پێشی سەحنە، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەودا یەکەمین تنۆکەکانی باران دەباری، بارانێکی سوور، بارانێک وەک ئەوەی خوێنی جێگا دوورەکانی هەڵگرتبێت و بەرەو ئێرە هێنابێتی. لەگەڵ سکیناندا هەشت دیلی نوێ بە زنجیرەوە دەهاتنە سەر سەحنە، هەموویان جلی سەربازانی دێلاواریان لە بەردابوو. من وەک یەکێک لە ژێر کاریگەری شۆکێکی گەورەدا بێت دەڕوانم، پێنجەمین کەس لە ڕیزەکەدا دەبینم... خۆیەتی، کەمێک لاوازترە لە جاران، بەڵام خۆیەتی میرئەوداڵە. هەردوو دەستی و هەر دوو قاچی بە زنجیر بەستراونەتەوە، ڕوومەتەکانی سوورن وەک ئەو ڕۆژەی لە عیادەکەدا هەڵچوو و پۆلیسەکان هاتن و قۆڵ بەستیانکرد، وەک ئەو

کاتانەی لە سەنتەری چارەسەرییەکە پێکەوە قسەماندەکرد، وەک ئەو سات و چرکانەی لەگەڵ کرێکارانی فەسیلەکەدا لە ناو چیاکاندا بەردی هەڵدەگرت و جەبلەی دەگواستەوە. من دەیبینم و خورپەیەکی گەورە بە دڵمدا دێت، زەهاو دەچپێنێت بە گوێمدا و دەڵێت «سەیریکە، میرئەودال». هەموو شتێک لە بەرچاوم لێڵ دەبێت، هەموو شتێک وەک خەونێک دەبینم، سەیری میر دەکەم و دەمەوێت هاواربکەم «جەنابی میر سەیرمبکە... جەنابی میر سەیرمبکە، من ڕێنواری زەریاوارییم». بەڵام دەنگم دەرنایەت. بایەکی هێمن یاری بە قژی دەکات، بەجۆرێکی سەیر و توند و بێڕەحمانە چاوانی نوقاندوە، وەک بیەوێت هەم مەرگی خۆی و هەم سیمای بکوژەکەی نەبینێت. هەستمکرد بۆنێکی زۆر ناخۆش دەچێت بە سەریدا، بۆنی دزێوی مەرگ، بۆنی چەقۆیەک کە دەیان جار لە خوێنی تر هەڵکشاوە. چەقۆیەک مەمەدحەسارییەکان بە سەمبولی خۆیانی دەزانن، چەقۆیەک دەیانەوێت دوای جەنگ بیخەنە مۆزەخانەی نیشتیمانیانەوە، چەقۆیەک ئێستا لە میرئەودال نزیکدەبێتەوە، پیاوێک کە پێشتر سەدان جار لە خەونەکانیدا سەربڕدرابوو، سەدان جار لاشەی خۆی بینیبوو، سەیری سەری بڕاوی خۆی کردبوو. ئێستا تەواو چاوی لێکدەنا، وەک من نەیدەزانی ئەمەی لێرەدا ڕوودەدات خەونێکە و دووبارەدەبێتەوە یان ڕاستییەکی ئازاربەخشە و کۆتایی بە هەموو شتێک دەهێنێت. ئەوەی سەیربوو چاوەکانی بوون کە توند نوقاندبوونی و هەڵینەدەبڕین. لەگەڵ سەربڕینی یەکەم قوربانی ڕیزەکەدا باران توند دایدەکرد، بارانێکی تووڕە و خوێنین، تاریکییەکی مەیلە و سوور باڵی بەسەر گۆڕەپانەکەدا دەکێشا، من هێندە لە ناو دەنگەدەنگی ناخ و هاژەی ترسناکی ڕۆحی خۆمدا ونبووم، گوێم لە دەنگەکانی دەرەوە نەبوو... هێند لە سەکۆکەوە نزیکبووم بۆنی خوێنی قوربانییەکان دەگەیشتنە لام، دەمبینی چۆن ئەو خوێنە خەستە لە دەمارەکانی گەردنەوە دەڕژێت و لەسەر سەکۆکە تێکەڵ بەو بارانە خوێنینە دەبێت و پێکەوە ئاوێتەیەکی شلتر و کاڵتر دروستدەکەن. بۆ یەکەمجار وەها لە نزیکەوە خوێن دەبینم

ڕاستەوخۆ لە گەرووی مرۆڤەوە فیچقەدەکات، بۆ یەکەمجار خوێن دەبینم لە ئاسمانەوە دێت، بۆ یەکەمجار بۆنی چەقۆ و لاشە دەکەم کە لە بۆنی ناو خەون کەسکونتر، تیژتر، بڕنۆکترن. سەرەکان دەبینم تلدەبنەوە، سەرەکان دەبینم یەکێک هەڵیاندەگرێت و دەیانخاتە ناو تورەکەیەکەوە، لە نزیکەوە چاوانی سکینان دەبینم دەرپۆقیون، چاوانی دەبینم کە ترسێکی وەک ترسی ناو چاوی قوربانییەکانی تێدایە، دەستی نالەرزێت، جەستەی تۆکمە و پتەو لەسەر سەکۆکەیە، بەڵام لە چاوانیدا لەرزێکی نهێنی هەیە کە من دەیبینم، ترسێکی شاردراوە هەیە کە من دەیبینم. میر ئەودال پێنجەم قوربانی ئەمڕۆیە، هەمیشە چاوانی لێکناوە، باران بەسەر سەر و گۆنایدا دێتەخوارێ، سەرتاپای تەڕە، سکینانیش سەرتاپای تەڕە، من و زەهاویش سەرتاپامان لە باراناوێکی سوورباو هەڵکشاوە. وەک هەمیشە جلەکانی میر ئەودال گەورەن بەبەرێ، کە ڕایدەکێشن توند خۆی ڕادەتەکێنێت، بەڵام دوو یاریدەدەری زل و کەتە دەیگرن و ملی دەخەنە سەر تەختی سەر بڕینەکە، سکینان وەک هەمیشە بە یەکێک لە چەقۆکانییەوە لە دواوە دێت و قژی میر دەگرێت و توند بەرەو لای خۆی دەیکێشێت، ڕەنگە ئەوە ئەستوورترین گەردن بووبێت تا ئێستا چەقۆی ئەو بڕیوێتی. گرمەیەکی گەورە لەسەری مندا دەنگدەداتەوە، نازانم گرمەی هەورەکانی باڵایە یاخود گرمەی هەوری خەونەکانە. میر وەک چاوانی توند نوقاندووە، من هەموو گیانم کردۆتە چاو، هەناسەم لە خۆم بڕیوە، توند دەستی زەهاو دەگوشم، بۆئەوەی هاوارنەکەم، بۆئەوەی دڵنیابم دۆستێک و مرۆڤێک لە نزیکمەوەیە. خوێنی میر دەبینم، یەکجار و بێبڕکە دەڕژێت، دڵنیام میر هەموو توانا و هێزی خۆی لەوەدا کۆکردۆتەوە چاوانی نەکاتەوە و هیچ شتێک نەبینێت و هەموو ئەم ساتە وەک خەونێک لە خەونەکان بژی، دڵنیابووم ئازاری ئەم ڕاستییە سەختتر نییە لە ئازاری ئەو سەربڕینە خەیاڵیانەی لە خەونەکانی میردا دووبارەبوونەتەوە. میر گەردنێکی ئەستوور و ئێسکێکی ڕەق و خوێنێکی چڕی هەیە کە سکینان ئاسان بۆی نابڕدرێت،

دەبوو بە هەموو هێزی خۆی چەندجار سەری میر ڕاکێشێت، چەندجار کێردە درندەکەی توند گیربکات، چەندجار هێزێکی ئەفسانەیی لە مەچەکی خۆیدا کۆبکاتەوە تا دەمارەکان ببڕێت. ئەوە درێژترین سەربڕینی سکینان بوو، تا سەری میر لە جەستەی بووەوە من تەماشامدەکرد، دەنگی میر دەهاتەوە گوێم کە لە کاسێتەکانی مامە سیامدا باسی سەربڕینی خۆی دەکرد، باسی ئەو ساتەی دەکرد کە جەلادێک سەری دەگرێت و بۆ دواوە دەیکێشێت، باسی جەستەی خۆی دەکرد لە حەوزێکدا. من تاکە کەسی ئەو مەیدانەبووم کە هەموو مردنەکانی میرئەودالم بینیبوو، هەم مردنە خەیاڵی و هەم مردنە ڕاستەقینەکانی. کە سەری دەکەوتە سەر تەختی سەکۆکە دەنگێکی گەورەی لێوەدەهات، دەمبینی دەستێک سەری میر لە قژەوە هەڵدەگرێت و پیشانی ئەو حەشاماتە تورەییەی دەدات کە وەک شێت بۆ بینینی ئەم سەرە منداڵانە و بێ گوناهـ و غەمگینە دروشمیان دەدا و هاواریاندەکرد. هەموو گیانم نوقمی لەرز و ترس و باران بوو، لەگەڵ ئەو بارانەشدا لەشم عارەقێکی ساردی دەردەدا، غەمگین بووم لەوەی نەمتوانی هاواربکەم «جەنابی میر، سەیرمبکە و مەترسە». زەهاویش وەک من هەموو گیانی دەلەرزی، زەهاویش لە سام و حەسرەتدا وەک من توند دەستی دەگوشیم و دەیویست دڵنیابێت کە ئەوەی لە گۆڕەپانی فیردەوسدا دەیبینێت خەون نییە. تا ئاهەنگەکە درێژتر بایەتەوە، هەورە خوێنینەکان توندتر و درتر دەبارین، بە جۆرێک لە بری ئەوەی لە باران بچێت لە لێدانی قامچی دەچوو. نەدەبوو تا ئاهەنگەکە کۆتایی دێت کەس بڕوات، کەس بجوڵێت، کەس بگری. من تا کۆتایی ئاهەنگەکە بەردەوام سەری میرئەودال لە پێش چاوم بوو، خوێنەکەی، قژە تەڕەکەی کە بە نارێکی لەسەرچاوی بوو، گوپە سووره داکەوتووەکانی کە وەک هەمیشە خڕ و پڕ ژیان بوون... کە حەشاماتەکە لە ژێر لێزمەی توندی باراندا ئەو ناوەیان جێهێشت، من تا ماوەیەک هەر دەستی زەهاوم گرتبوو و لە جێگای خۆم وەستابووم ...

***

لە ڕۆژانی دواتردا ئیدی زۆر کەم لە چاپخانەکە دەچوومە دەرێ، زۆر کەم لە پەنجەرەکەوە یان لە دەرگای چاپخانەکەوە سەیری مارشی ئەو کفنپۆشانەم دەکرد کە بە شەقامەکاندا دەگەڕان. بەشی هەرە زۆری کاتی خۆم تەنیا لە لای ئامێرەکانی چاپ و لە نزیک بۆنی لاپەڕە چاپکراوەکانەوە دەبردەسەر. تەنیا لەزەتی ژیانم ئەوەبوو کە کتێبە تازەکان لە دەستی کرێکاری سەر مەقەستەکە کارەباییەکە وەربگرم و سەفتەیانبکەم و کۆمەڵ کۆمەڵ ئامادەیانبکەم بۆ بار. زۆربەی کتێبەکان کتێبگەلێکی مەزهەبی بوون یان کتێبگەلێک کە ئاوێنەی سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەت بوون، هەندێ جار ڕێدەکەوت ڕۆمانێک یان کۆمەڵە شیعرێک دەکەوتە ناو چاپەمەنییەکان. بۆنی کتێبەکان، مەلمەسی لاپەڕەکان، بریقەی بەرگەکانیان، ڕێکی بنکەکانیان، جوانی شێوەیان پێکڕا سەرسامیاندەکردم. خۆشحاڵ بووم کە بەردەوام بۆنێکی خۆش و شتێکی قەشەنگی وەک کتێب هەیە، من سەیریبکەم. لە ساڵی یەکەمدا زمانی مەمەدحەسارییم وەها پێشکەوت ئاسان دەمتوانی هەموو جۆرە کتێبێکی پێ بخوێنمەوە. پرۆفیسۆر دەیزانی من عاشقی کتێب و خوێندنەوەم، هەندێ جار ڕێگای دەدام لە کتێبخانە تایبەتییەکەی کتێب قەرزبکەم و دواتر بیبەمەوە. شەوان گەر نەچووبامەیە بۆ لای پرۆفیسۆر، ئەوا یان زەهاوم فێری خوێندنەوە و نوسینی باشتر دەکرد یان ڕۆمانێکم دەخوێندەوە. زۆربەی شەو پرۆفیسۆر بانگیدەکردم تا زانیاریم لەسەر بەرەکانی جەنگ پێبلێت. شەڕ لە هەندێک ناوچە و لەسەر هەندێک لوتکە و لە نزیک هەندێک ئاوەدانییەوە ڕوویدەدا کە من زۆرجار بە دروستی نەمدەزانی دەکەونە کوێی خاکی دیلاوارەوە. ساڵێک بوو هێزەکانی مەمەدحەسار لە جەنگێکی دڕ و پڕ کوشتە و خوێناویدا دەیانویست بەرزاییەکانی ئاڤیانبەر بگرن و بۆیان نەدەگیرا، بەڵام لە ڕووی دەریاچەکانیشەوە جەنگی کوشندە و خوێناوی ڕوویاندەدا. دواتر زانیم کە میرئەوداڵ لە جەنگێکی خوێناویدا

لە سەر هەرێمی سەرانکۆ کەوتۆتە دەست دوژمن. من هەموو ئەو ماوەیە زۆر هەوڵمدا شتێکی تایبەت لەسەر ژیانی پرۆفیسۆر بزانم، بەڵام خۆی دەیگووت «ژیان، من ژیانم نییە. من هەر بەوجۆرە ژیاوم کە دەمبینی، ئیش. تەنهایی. کتێب. تەنهایی. نوسین. تەنهایی. سەفەر. تەنهایی. گەڕانەوە. تەنهایی. خواردن. تەنهایی. خوێندنەوە. تەنهایی. ئەوە ژیانی منە و هیچی تر». پیاوێکی تەنها بوو، جگە لە مێژووی ئەم شارە خوێناویانەی خۆرهەلات هیچ خولیایەکی تری نەبوو، لەسەرەتای گەنجیدا کتێبێکی لەسەر زیندانەکانی خۆرهەلات نوسیبوو، بە جۆرێک لە جۆرەکان گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە نەک تەنیا دیلاوار، بەڵکو هەموو شارەکانی خۆرهەلات لە بنەڕەتدا لە دەوری زیندان دروستبوون. «گەر زیندان نەبایە، ئەم میللەتە کۆچەرییانە نەدەبوون بە شارنشین». پرۆفیسۆر وایدەگووت و پیدەکەنی. زۆر شەو هیچ قسەمان نەدەکرد، تەنیا پێکەوە شەترەنج یان ئەزنیفمان دەکرد. ئەو لە شەترەنجدا دەستی باڵای هەبوو، منیش لە ئەزنیفدا، من بەدەگمەن دەستێکی شەترەنجم ببردایەتەوە و ئەویش بەدەگمەن بیتوانیبایە لە گەمەکانی تردا پێشم بکەوێت. بە دوو مانگ جارێک، تاکسییەکی دەگرت و من و زەهاوی سواردەکرد و دەیبردین بۆ ڕیستۆرانتێکی گرانبەها لەو پەڕی شار، هەر جارەی بە ڕێگایەکدا دەیبردین، بە درێژایی ڕێگا باسی مێژوی مەمەدحەسار و گەڕەکەکانی بۆ دەکردین، بڕوایەکی سەیری هەبوو کە «مێژووی ڕاستەقینە تەنیا مێژووی شارە». دەیگووت «مێژووی نەتەوە، مێژووی ولات، مێژووی دەولەت، مێژووی جیهان تەنیا وەهمە. یەک مێژوو بوونی هەیە، ئەویش مێژووی شارە». باوەڕی وابوو کە شارەکان تەنیا جەنگەڵێکن و خۆیان لێ گۆڕاوە، زۆر شەو کە لە مەمەدحەسار و بێڕەحمی ناو شارەکە بێزاردەبوو، سەری بادەدا و دەیگووت «مەمەدحەسار شار نییە، هەر جێگایەکە دڕندەکان تێیدا یەکتری دەناسن».

نزیکی دوو ساڵ بوو لە چاپخانەکەدا کارمدەکرد، زەهاوم فێری

خوێندەواری دەکرد، کتێبەکانم سەفتەدەکرد، دەگریام، خەونم دەبینی، دەمخوێندەوە، لە پوچی ڕادەمام، لە پۆستەری کوژراوەکانی جەنگ ڕادەمام ، لە وێنەکانی ئیمام سوبحانم دەڕوانی لە مەیدانی دەروازەی فیردەوسدا، گوێم لە مۆسیقای جەنگ دەگرت، گوێم لە دەنگی مەکینەی چاپەکە دەگرت کە بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر کاغەزە چاپکراوەکانی فڕێدەدایە دەرێ، خواردنی سادەم دەخوارد، هەوڵی ئەوەم دەدا زەهاو دڵخۆشبکەم، هەوڵم دەدا شەترەنجێک لە پرۆفیسۆر ببەمەوە، هەوڵم دەدا وشەی زۆرتری مەمەدحەساریی فێرببم. لە گۆڕەپانەکەدا دەچووم بۆ بینینی سەربڕینی دیلەکان، سەیری خەڵکی ئەم شارەم دەکرد کە پێکڕا بووبوون بە جەنگاوەر، گوێم لە پێکەنینی کرێکارەکان دەگرت کە هەر یەکەیان لە شارێک و لە جێگایەکەوە هاتبوون، بۆنی کتێبم دەکرد، لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەمەوە سەیری ئەو خۆبەخشە گەنجانەم دەکرد لە سەنتەرەکەی ئەوبەردا خۆیان ناونوسی جەنگ دەکرد، لە پاقلەفرۆشەکانم دەڕوانی لە بەردەم چاپخانەکەدا... ژیانم سوڕانەوەیەکی بەردەوام و دووبارە و پڕ ترس و مۆتەکە و بێباکی بوو، لە هەر شت زیاتر لێکچوونی خەونی ئینسانەکان لە نێوان دیلاوار و مەمەدحەساردا ئازاری دەدام. هەورەکان ئازاریان دەدام کە هەموو شەو دەبارین، بێدەنگی هەرچی زۆرتری زەهاو ئازاری دەدام کە تا دەهات غەمۆکی تر و ڕەنگ زەردتر دەینواند... هەموو ئومێدم ئەوەبوو کە جەنگ کۆتایی بێت... دوو ساڵ بەوجۆرە من چاوەڕوان بووم و جەنگ کۆتایی نەهات. دواجار شەوێکی زۆر درەنگ، کە هەریەک لە من و زەهاو لە شیرین خەودا بووین، پرۆفیسۆر دوو جار لە دەرگای دا و پاش ئێستێک دەرگاکەی کردەوە و گووتی «هەواڵێکی گرنگ هەیە دەبێت پێتان بڵێم، پێدەچێت ئەمشەو هێزەکانی مەمەدحەسار، بچنە ناو دیلاوارەوە. هەواڵەکان قسە لە هەرەسێکی کتوپڕی هێزەکانی دیلاوار دەکەن».

# ٤٩

دوای سێ مانگ لە دەستپێکردنی جەنگ، هێزێکی پۆلیس لە ژێرزەمینی یەکێک لە قەیسەرییەکانی دیلاواری باکووردا، مەیتی گەنیوی فەراسە ڕەشیان دۆزییەوە. سێ ڕۆژ بوو فەراس دیارنەبوو، دەستێکی نادیار کوژراوەکەی بۆ ئەو جێگا تاریکە داوەتکردبوو، دواتر بە کێردێکی تیژ چەند جارێک پێکابوویان، لاشەکە ئاسەواری بەرگرییەکی زۆی پێوەبوو، دیاربوو بەر لەوەی بیکوژن، هەوڵێکی زۆری داوە لە دەستیان دەربازبێت، بەڵام نەیتوانیوە. کوشتنی فەراس، کە سەردەستەی پاسەوانەکانی سەی ئەسڵان بوو، گەلێک پرسیار و مەتەڵی گەورەی لە دوای خۆی بەجێهێشت. زۆربەی ئاماژەکان بۆ ئەوە بوون کە یان ڕەزمئارای قەرەقازانی لە پشت تاوانەکەوەیە یان خودی سەی ئەسڵان، لەبەرئەوە پشکنینەکانی پۆلیس و گەڕانی بە دوای تاوانباراندا، لە جێگایەکدا وەستا و دۆسییەی تاوانەکە بێدەنگ خرایە ژێرەوە. ئەوەی سەیربوو دوای کوشتنی فەراس، نەجمەی ئایشەگوڵ بوو بە بەرپرسی بێرۆی سەی ئەسڵان، حامید سوڵتانیش بوو بە بەرپرسی پاسەوانەکان. بەپێی ئەو قسەوباسانە بێت کە دواتر بڵاوبوونەوە، پێدەچێت گومانی نابەجێی سەی ئەسڵان لە پشت لە ناوبردنی فەراسەوە بووبێت. کوشتنی فەراس ململانێی نێوان ڕەزمئارای قەرەقازانی و سەی ئەسڵان زۆر قووڵدەکاتەوە. هەر دووکیان لە سەرەوە خۆیان وەک دۆست نیشاندەدەن و

لە ژێرەوە دوو دوژمنی سەرسەختن، ئەو ناکۆکییە باغەوانەکانی دیلاواریش لەتدەکات و دەیانکات بە دوو بەرەی نەیار. کوشتنی فەراسە ڕەش بێدەنگ تێپەڕی، هەتا هەندێک لە هەڤاڵانی خۆشی کە ئێرەییەکی زۆریان بە پلەوپایەی دەبرد، بە مردنی دڵخۆش بوون. هیچ ژیانێک لە دیلاوار نرخی نەمابوو، تا ژیانی فەراسە ڕەش نرخی هەبێت… لەو کاتەدا دیلاوار کێشەی قووڵتری هەبوو، بەردەوامی جەنگ وای دەکرد ژمارەی کوژراوەکان ڕوو لە زیادبوون بێت. دوای چەند مانگی یەکەمی جەنگ، دەمێک ڕۆژانە لاشەی کوژراوەکان دەهاتەوە بۆ دیلاوار، بیمارستانەکان پڕدەبوون لە جەنگاوەرانی دەست و قاچ پەڕیو، چیتر وتارەکانی سەی ئەسڵان هێز و سیحری جارانی نەدەما، بەلاغەتی سەرۆک تا دەهات دەچووە کزی. ئەو ئومێد و مژدە و پەیمانانەی سەی ئەسڵان سەرەتا بە خەڵکی دیلاواری دەدا، هیچیان نایەنەدی. سوپای باغەوانەکان نەوەک ناتوانن لە بەرەکانی جەنگدا دوژمن بشکێنن و پاشەکشە بە هێزەکانی مەمەدحەسار بکەن، بە پێچەوانەوە وەک هێزێکی نارێک و بێئەزموون کە پتر لەسەر دروشم و هاوار گۆشبوون، لە هەموو جەنگێکدا کوشتە و بریندار و گیراوێکی زۆر دەدەن. شکستی سوپا و باغەوانەکان لە شکاندنی دوژمن و دوورخستنەوەیدا لە دیلاوار، تووڕەیی و نائومێدییەکی گەورە دروستدەکەن. چیتر هاوارەکانی سەی ئەسڵان، وتارە درێژەکانی، ئەو تەفسیر و لێکدانەوانەی زانا و پرۆفیسۆرەکانی وەک مامم بۆ قسەکانی ئەوی دەکەن، سوودێکی ڕاستەقینەیان نامێنێت. لە زۆر جێگا مامەسیام و هەندێک لە ئەکادیمیستەکانی دیلاوار لەگەڵ کەژاوەی دیلەکانی مەمەدحەساردا دەگەڕێن و دەیانەوێت تین و وورەی خەڵک بڵندڕابگرن، بەڵام هەوڵەکانیان شتێکی ئەوتۆ گرنگ نادەن بەدەستەوە. لە دوای ساڵێک لە جەنگ تارماییەکی ڕەش باڵ بەسەر دیلاواردا دەکێشێت، لە کاتێکدا هێزەکانی مەمەدحەسار ڕۆژ دوای ڕۆژ گوردان و تیپی نوێ دەخەنە سەر هێزە چەکدارەکانیان، سەربازەکانیان بە ئیمانێکی کوێرانەوە ڕوو لە مردن دەکەن،

بەڵام جارێک نەبوو گەشبین و پڕهیوا لە مەیدان بگەڕێتەوە، سەربازەکان و باغەوانان لە دۆخێکی دژواردا بوون، ئەوەی ڕایگرتبوون هێز نەبوو، چەک نەبوو، پلانی سەربازی نەبوو، بەڵکو خەونی جەنگاوەران بوو بۆ شکاندنی دوژمن، ئارەزوویان بوو بۆ تۆڵەوە. ئەو خەونە وایدەکرد هەندێ لە سەربازەکان تا مردن لە سەنگەرەکاندا هەڵنەستن. نەجم دەیزانی کە هێزە دڕندەکانی مەمەدحەسار تا دێت نزیکتر دەبنەوە، دەیبینی ڕۆحی بەرگری و قارەمانێتی هێندەی ژمارەی کوژراوەکانی بەرزکردۆتەوە، سوودێکی کاریگەری نەبووە. سەیری لێدەهات کە ژمارەی ئەو گەنجانەی غەفاریی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان پێکەوە چوون بۆ ماڵە هاوینییەکەی سەی ئەسلان تا دێت کەمتر دەبنەوە. زۆریان بەو جۆرە کوژرابوون وەک لە خەونەکەدا بینیبوویان، بە دیلی و بە سەربڕین ... ئێستا بووبوون بە دوو بەشەوە، یان وەک بۆقبۆقیلە جەلادی بەناوبانگ بوون، یان لاشەیەکی بێسەر بوون و لە ژێر خاکدا نێژرابوون. دوای گەڕانەوەیان لە دوا سەردانی سەنگەرەکان، دڵنیابوو کە دیلاوار دەکەوێتە دەست دوژمن، سەربازەکانی دیلاواری برسی و بێهێز و بێورە بینی بوو، سوپایەکی ماندوو کە چیتر سەردانی کەسێکی وەک سەی ئەسلان ناتوانێت ورە و خۆگری زیاتریان پێ ببەخشێت، لەشکرێک کە لە ناو قوڕ و لیتەی پێدەشت و چیاکاندا ونبووە بێئەوەی توانایەکی ڕاستەقینەی جەنگی هەبێت. سەی ئەسلان بەر لە هەمووان باوەڕی بە شکستێکی ترسناک هێنا، شەوان کە لەگەڵ قەرەقازانییەکاندا دادەنیشت، وەک جاران لە عەشقی دیلاواردا تێزی فەلسەفی و نەزمی شاعیرانەی نە دەهۆنییەوە، بێدەنگ وەک سەرۆکێکی شکستە بە دیار پەرداخێک مەیەوە کۆم هەڵدەکورما و گوێی لە نوکتە و گۆرانی و پێکەنینی قەرەقازانییەکان دەگرت، کە پێدەچوو بڕیاریاندابێت تا خاپووربوونی دیلاوار مەستبن و بخۆنەوە و پێبکەنن، سەی ئەسلان و نەجمەش هەر دووکیان هەستیاندەکرد بۆ قەرەقازانییەکان ئەوە گرنگ نییە دوژمن دیلاوار بگرێت، بەڵکو ئەوە

گرنگە هێزێکی ناوخۆ دەسەڵات لە دەستی ئەوان نەستێنێت، گەیشتبوونە پنتێک لە بێباکی، وەک ئەوەی بۆیان ڕوون بێت درەنگ یان زوو دێلاوار نوقمدەبێت و ئەوانیش لەگەڵیدا دەخنکێن. بەڵام جیا لە هەموو ئەو ڕاستییانە، مانگێک بەر لە شکستی گەورە نەجمەی ئایشەگوڵ سەرنجی ئەوەیدا کە چیتر خەون نابینێت... هەفتەیەک لەسەر یەک خەوت و هیچ خەونێکی نەبینی، ئەوە ترس و سەرمایەکی گەورەی هێنایەوە بۆ جەستەی، سەرەتا نەیوێرا ئەو ڕازە لای کەس بدرکێنێت، نەیوێرا ئەو کێشەیە لەگەڵ سەی ئەسلانیشدا باسبکات، کە ئێستا وەک باوکی خۆی خۆشیدەویست، ئەوەی وەک نهێنییەک لای خۆی شاردەوە، بێئەوەی بزانێت کە لە پشت ئەو نەمانی خەونەوە، دیسان پەتایەکی ترسناکی نوێ هەیە.

مانگێک بەر لە هەرەسی گەورەی سوپای دێلاوار، سەی ئەسلان بە کۆمەکی نەجمەی ئایشەگوڵ و حامید سوڵتان و هەندێک سەرکردەی دیکە لە هەوادارانی سەرسەختی خۆی، پلانێک بۆ پاشەکشە و خۆ قایمکردن لە چیاکانی خۆرئاوادا دادەڕێژن. تاکە شتێک سەی ئەسلان لە بیریدا بێت، ڕزگارکردنی خۆی و دەستەیەک جەنگاوەرە، تا بکرێت یان لە ڕێگای چیاکانی خۆرئاواوە بەرەو دەرەوە هەڵبێن یان لەوێدا تا ڕۆژی گەڕانەوە خۆیان حەشاربدەن.

دوای دوو ساڵ جەنگ، شەوێک هێزەکانی مەمەدحەسار بە هێرشێکی توند و گەورە، تەواوی ئەو هێڵانەیان شکاند کە دوو ساڵ بوو جەنگاوەرەکانی دێلاوار بە خوێن و عارەق بەرگریان لێدەکرد. دەڵێن شکانی سوپای دێلاوار پەیوەندی بە ترسنۆکی یان گەمژەییەوە نەبووە، بەڵکو لە ناکاو لە ناو هێزەکاندا دەردێکی ترسناک بڵاوبۆتەوە، دەڵێن تەواوی سوپای دێلاوار لەوە کەوتووە بە یەکجار خەون ببینێت، بەیانییەک سەربازەکان لە خەو هەڵدەستن و سەرنجدەدەن کە پێکڕای لەشکری گەورەی دێلاوار، لەمسەری

سنوور بۆ ئەوسەر، هیچ خەونێکیان نەبینیوە. خەون بە یەکجار لە خەیاڵ و خەوتنی جەنگاوەرانی دیلاواردا دەسڕدرێتەوە، دەڵێن ماندوێتی زۆر، شەڕی بەردەوام، بێخەوی درێژ کاریکیانکردوە، لەشکر چیتر توانای خەوبینینی نەمێنێت. لەگەڵ نەمانی خەوندا سوپای دیلاوار نە ئومێد، نە ترس، نە بەهانەیەکیان بۆ جەنگ نامێنێت. وەک هەزاران خەڵکی ئاسوودە کە باکیان بە ئازادی یان دیلی نییە، لە سەنگەرەکاندا دەوەستن و دەست بەرزدەکەنەوە و خۆیان ڕادەستی سوپای مەمەدحەسار دەکەن، ئەوانیش بێباکانە قەسابخانە و کۆمەڵکوژی گەورەیان تیا ئەنجامدەدەن. دەڵێن هەتا لاشەی سەربازەکان نائاسایی و سەیر بووە، ڕوخساریان لە کاتی مەرگدا بێباک و ئاسوودە دیاربووە، وەک خۆشحاڵ بن کە ئازارێکی دوور و درێژ کۆتایی هاتووە، وەک ئەوەی بیسەلمێنن هێزێک نەتوانێت خەون ببینێت ناتوانێت جەنگیش بکات. ئایا ئەوە ئەفسانە بووە، خورافەت بووە، درۆیەک بووە دیلاوارییەکان دروستیانکردوە تا شکستی مێژوویی خۆیانی پێ پاساوبدەن؟ نازانم. بەڵام هەندێک دەڵێن ئەوە سەرچاوەی سەرەکی شکستی دیلاوار بووە.

ئاشکرایە لە پاڵ ئەوەدا، لە پاڵ ئەو ترسەدا کە وەک تاعوون لە ناو جەنگاوەراندا بڵاودەبێتەوە، دەیان ڕاستی دی هەبووە کە کۆتاییان بە دیلاوار هێناوە. دیلاوار لەوە بچوکتر بوو بەرگەی ئەو هەموو کوشتەیە بگرێت، جەنگ هێدی هێدی بووبوو بە قەسابخانەیەکی ڕۆژانە بۆ هێزێکی ماندوو کە هەندێک لە جەنگاوەرانی شەش مانگ بوو ساتێکی پشوویان نەدیبوو. هێزەکە توانای ئەوەی لە خۆیدا نەدەبینی هێرشبکات، هەر هێزێکیش توانای هەڵمەتی نەما، ئەستەمە بتوانێ لە دۆخی بەرگریدا زۆر خۆی بگرێت. دیلاوارییەکان لە یەکەم ساڵی جەنگدا زۆر لە سەرکردەکانی خۆیان لە دەست دا، لە کۆتایی ساڵی یەکەمدا هەردوو ژەنراڵ مەحمودی قەرەقازانی و هورمزیاری قەرەقازانی لە مەیدانی جەنگدا و لە سەنگەری پێشەوەدا کوژران. دوای ئەوان هیچ سەرکردەیەکی گەورە نەبوو، بتوانێت وەک ئەوان

هیمەتی سەربازەکان بجولێنێت، چیتر لە ناو ئەو دەریای خوێنەدا کە دەڕژا، جۆش و خرۆشی کەس بە سرودی «دێلاوار ئەی سەرزەمینی شێران» گەرم نەدەبوو. سەربڕینی دیلەکان لەلایەن بۆقبۆقیلەوە کە بە فرمانێکی تایبەتی سەی ئەسلان بوو، هێندەی دڕندەیی جەنگی بیر جەنگاوەرەکان دەخستەوە، هیمەت و هەڵمەتی نەدەبزواند. شەوێک مەمەدحەسارییەکان بڕیاریاندا کۆتایی بە جەنگ بهێنن، شەوێکی سەیربوو کە هێزەکانی دێلاواریش وەک زیندانییەک چاوەڕوانی پەتی مەرگ بکات، ئامادەبوون بۆ شکست.

لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا دێلاوار هەموو شتێکی دۆڕان. سەربازەکانی دێلاوار هەر چییەکیان بکردایە دەکەوتنە بەر لێزمەی تیرهاوێژەکانی دوژمن، بەجۆرێک لە هەندێ جێگادا هەتا یەک سەربازیش بە زیندوویی نامێنێتەوە، تا سەربوردی ئەو شەوە بگێڕێتەوە. مەمەدحەسارییەکان هیچ دیلێکیان لەگەڵ خۆیان نەبرد، هەر سەربازێک یان جەنگاوەرێک گیرا دەمودەست لەوێدا تیرباران کرا، سوپای دێلاوار لەو شەوەدا بە جۆرێکی ترسناک قەتڵ و عام دەبێت و دەیان هەزار کوشتە دەدات. دەمەو بەیان و غافڵگیر هێزەکانی مەمەدحەسار گەیشتنە بەردەروازەکانی شار، بەر لەوەی پێبخەنە ناو شارەکەوە، بەر لەوەی خەڵک لەسەر ئەو ڕاستییە بە ئاگابێنەوە کە سوپاکەیان بۆ ئەبەد تێکشکاوە و هیچ هێزێک نییە بەرگریان لێ بکات، فەرماندار «موهیب جەنگی ماماد» کە فەرمانڕەوای سەربازیی هێزەکانی مەمەدحەسار بوو، فەرمانیدا چی شتێک لە دێلاواردا دەشێت بسووتێنرێت و بڕوخێنرێت، با بسووتێت و بڕوخێت. شارەکە بەرگرییەکی وەها لە خۆی ناکات، بەڵام هێزەکانی ماماد، بەر لەوەی بچنە هەر گەڕەکێکەوە، بەر لەوەی دەستبکەن بە ڕەشەکوژی، بەرلەوەی ژنەکان وەک دەستکەوتی جەنگ بخەنە لۆری و ماشێنی تایبەتەوە، چەندین سەعات بە چڕی موشەکباران دەکەن، تێئێنتی دەخەنە ژێر باڵەخانە بەرزەکان و دەیانتەقێننەوە، ئەو دەیان هەزار

سەربازەی کە دێلاواریان داگیرکردوە، بە دەیان بلدوزەر و مەکینەی گەورە دەستدەکەن بە تێکدانی زۆر لە شوێنە گرنگەکانی شارەکە، خەڵک هەندێکیان بەرەو چیاکان هەڵدێن، هەندێکیان دەبن بە ژێر داروپەردووی ڕوخاوی ماڵەکانیانەوە، هەندێکیان تیر باران دەکرێن، ئەوانەی کە دەمێننەوە و بە زیندوویی دەردەچن جگە لەوەی لە ناو وێرانە و خەراباتی شارەکەیاندا درێژە بە ژیان بدەن چارێکی دییان نییە. لە پێنجەمین شەوی کەوتنی دێلاواردا، سوپا سنوورەکان دەکاتەوە و ڕێگا بە تالانچی و خەڵکانی تورەی مەمەدحەسار دەدات برژێنە ناو شارەکەوەوە و ئەوەی دەیانەوێت تالانیبکەن، من و ئەمین لاهور بە لۆری یەکێک لە تالانکەران گەڕاینەوە بۆ دێلاوار. دوای حەوت ڕۆژ بەسەر داگیرکردنی دێلاواردا هێشتا شارەکە نوقمی دوکەڵ و بۆسۆ و تەپوتۆزە، هەندێک گەڕەک لەگەڵ زەویدا تەختکرابوون، هەندێکیش زیانێکی وەهایان بەر نەکەوتبوو. زیندانەکانی دێلاوار نەبێت وەک خۆیان مابوون، تەواوی شوێنە دەوڵەتییەکان خاپووربوون، زانکۆی دێلاوار تەواو سووتابوو، مۆزەخانەکەی پرۆفیسۆر بەهنام کرابوو بە بنکەی حەوانەوەی هێزەکانی مەمەدحەسار، وەزارەتی ئاوەدانی کە دەکەوتە سەنتەری دێلاوار هێشتا هەر گڕی لێ هەڵدەستا. لە ماوەیەکی کەمدا دەیان هەزار کەس لە خەڵکی مەمەدحەسار بۆ تالانکردن ڕژانە دێلاوارەوە، لە زۆر جێگادا تەنیا کەلوپەل و خشڵ و پارەیان نەدەبرد، بەڵکو خێزانە دێلاوارییەکانیان لە ماڵی خۆیان دەردەکرد و دەچوونە جێگاکەیان. هیچ کەس نەیدەزانی سەی ئەسڵان یان قەرەقازانییەکان بۆ کوێ هەڵهاتوون، لە ناکاو زەوی قڵیشتبوو و ئەوانی قووت دابوو. گردی جیلوەدار بوو بە نیشتەجێی فەرمانداری سەربازیی نوێی دێلاوار، «موهیب ماماد» لەوێ بنکەی داکوتا و ماڵەکەی میر سەلیمی قەرەقازانی کرد بە کۆشکی نوێی فەرمانڕەوایی خۆی، هەموو ئەفسەرە بالاکانی دیکەش چوونە ناو کۆشکەکانی دیکەی گردی جیلوەدار و لەوێ نیشتەجێبوون. لە زۆر گەڕەکدا بۆنی لاشە نەیدەهێشت کەس نزیک

بکەویتەوە، لە هەندێ جێگادا سەدان پیاوانی دێلاواریمان دەبینی کە زنجیر کرابووە دەست و قاچیان و بە ڕیز بۆ جێگایەکی نادیار دەبران، خەڵکانی برسیمان بینی کە هەندێ جار سەربازەکانی مەمەدحەسار بەرماوەی خۆیان بۆ فڕێدەدان تا بیخۆن. لە هیچ جێگایەک دێلاوارییەکان بەرگرییەکی توندیان پیشان نەدا، هەندێ جار وا دەمبینی وەک ئەوەی دڵخۆشبن بەم شکستە، ڕازیبن بەم کۆتاییە. دەڵێن موهیب «جەنگی ماماد» کە یەکەم شەو لە دێلاوار خەوتووە، بۆ بەیانی بە خەیاڵێکی گەلێک ئاسوودەوە هەستاوە، دەڵێن پەنجەرەکانی کردۆتەوە و دوکەڵی سووتانی دێلاواری هەڵمژیوە و گەلێک شادومان بووە، پێشتر لە هیچ جێگایەک وا ئاسوودە نەخەوتووە، شەویکی بێ خەون ژیاوە، بێ مۆتەکە. بەیانی بە ئەفسەرەکانی گووتووە «هیچ سەر زەمینێک وەک دێلاوار بۆ خەوتن خۆش نییە».

ئەو ڕۆژە کە من و ئەمین لاهور دەگەینە دێلاوار، هەستدەکەین چیتر خەڵکی ئەم شارە نین، کەس ناناسینەوە و کەس ناماننناسێتەوە، دوو ساڵ جەنگ بە ئەندازەی سەد ساڵی غوربەت شێوە و ڕوخساری شوێنەکان و مرۆڤەکان دەگۆڕێت. بڕیارمانداوە جارێ تەنیا ناوە ساختەکانمان بەکاربهێنین، جگە لەو ناوانە، جگە لەو شوناسنامانە هیچ بەڵگەیەکی ترمان پێ نییە بیسەلمێنێت ئێمە کێین. دوای ئەم هەموو جەنگ و وێرانییە ئێمە چیتر بە ئاسانی نابینەوە بە ڕێنواری زەریاواری و زەهاو عەبدی جاران، بەڵکو بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ هەر حەسەن تاج و ئەمین لاهورین، دوو مرۆڤی ون و بێشوناس و بێ شار و بێ نیشتیمان. هیچ شەرەف و شانازییەک لەوەدا نابینین خەڵکی ئەم دوو شارە بین. هەردووکمان هەستدەکەین ئەو دوو ناوە لەم دونیا دزێوانە دوورمان دەخەنەوە، ئەو مێژووە تاریک و ڕۆژە ترسناکانەشمان لە یادەوەریدا بۆ دەپارێزن کە نابێت بیرمان بچنەوە. من و ئەو یەکی کوڵەپشتێکمان پێیە کە پرۆفیسۆر شابەندەر بە دەستی خۆی بۆی پێچاوینەتەوە، تەنیا نان و خواردنی قوتو و هەندێک داڕووی پێویست

و وزەبەخشی تێدایە، لەگەڵ دوو پارچە سابوون و جلی ژێرەوە. دەمێک دەگەینە سەنتەری دیلاوار هەلایەکی گەورەیە، هەزاران کەس کۆبوونەتەوە، قسە لەوە دەکەن کە بۆقبۆقیلە گیراوە و ئەمڕۆ لەم مەیدانەدا بە دەستی سکینان سەردەبڕدرێت. گەرچی بۆقبۆقیلەم نەدیوە، بەڵام لە چیرۆکەکانی ئاڵ مورادەوە دەیناسم، هەست بە ئاڵۆزی و وروژانێکی دەروونی گەورە دەکەم، دەزانم گەر ئاڵ موراد لێرەبایە، گەر بەخۆی و چاوە کز و لووتە زیبکاوییەکەیەوە ئێستا لەگەڵ مندابایە، ئەم دیمەنانە بەشێک بوون لە چیرۆکی ئەو، ئەمین لاهور هێندە ئەو دیمەنانەی بینیوە کە دەڵێت «ئینسانم لە پێشچاو کەوتووە». من دەمەوێت دەستی بگرم و لەگەڵمدا سەیری ئەم بەشەی کارەساتەکەش بکات، بەڵام نایەوێت... ئەمین لاهور هەستدەکات ئارەزوویەکی نەماوە سەیری ئەم دیمەنانە بکات، لە دوێنێ شەوەوە کە پێمان خستۆتە سەر خاکی دیلاوار هەورەکان لەخەیاڵ و خەونماندا نەماون، سەر بۆ ئاسمان بەرزدەکەمەوە و ساماڵێکی شین و ڕوون دەبینم، هەتاوێک تەنیا دوکەڵی ئاگرەکانی ناو شار بەریان گرتووە، چیتر ئاسەوارێک لە هەورە خوێنینەکان دیار نییە. سەربازەکانی مەمەدحەسار دەبینم کە لە سەنتەرەکەدا سەکۆیەکی ئاسنینی بچوک دروستدەکەن. ئەوە بەشێکە لە کولتووری مەمەدحەسارییەکان کە جەلاد هەمیشە دەبێت لە جێگایەکی بەرزدا بوەستێت و بە شێوەیەک سەری قوربانییەکەی بپەڕێنێت، کە لە هەموو گۆشەیەکی مەیدانەکەوە ببینرێت. ئەمین لاهور دەچێتە جێگایەکی دوور و من لە ناو حەشاماتەکەدا دەوەستم، سەربازەکانی مەمەد حەسار بەزۆر خەڵکانی ماندوو و ترساو و بێخەوی دیلاوار دەدەنە پێش خۆیان و دەیانهێنن بۆ مەیدانەکە تا بە چاوی خۆیان کوشتنی دوا جەنگاوەری خۆیان ببینن. ئایا بۆقبۆقیلە لە دیلاوار خۆشەویست بووە یان نا؟ نازانم. بەڵام ئێستا هەم غەم، هەم شکست، هەم بێباکی لە چاوەکاندا دەبینم... هەست ناکەم ئەو شکستەی لە چاوی خەڵکی دیلاواردایە، پەیوەندی بە بۆقبۆقیلەوە هەبێت،

شکستێکی قووڵتر و درێژخایەنترە، ئاماژەیە بۆ ڕۆحێک لە مێژە توچیاوە و هەلاهەلا بووە. لە سەرەتای مەراسیمەکەدا جارێکی تر سکینان دەبینمەوە، دوو ساڵە ئومێدی هەرە گەورەی سکینان ئەوەبووە ڕۆژێک سەری بۆقبۆقیلە بخاتە بندەست و گەردنی بنێتە ژێر چەقۆی خۆی. لەسەر ئەو سەکۆیەوە سکینان هاواردەکات هەر ئەمڕۆ سوێند و پەیمانی خۆی جێبەجێدەکات. خۆی وەک نوێنەری خودا لەسەر زەوی ناودەنێت و دوو چەقۆکەی دەستی بە زولفەقار دەشوبهێنێت، بەڵام دەنگی لەرزێکی تایبەتی تێدایە کە پێشتر لێم نەبیستووە، دەنگی کەسێکی هەیە لە ناکاو ناخی پڕبووبێت لە ترسێکی کتوپڕ. گەرچی مەیدانەکە پڕە لە سەربازی مەمەدحەسار، گەرچی خەڵکی دێلاوار لەژێر حوکمی چەقۆ و گوللەی سەربازە دڕندەکانی موهیبدان، بەڵام مەیدانەکە گڕ و تین و جۆشی دەروازەی فیردەوسی نییە. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت جەنگ کۆتایی هاتووە، دۆڕاوەکان لەوە بێهێزترن مردنیان نرخی هەبێت، کوشتنی مرۆڤێکی شکستخواردو خاڵییە لە هەر جۆش و خرۆشێک، سەرکەوتووی ڕاستەقینە کەسێکە لێدەگەڕێ دۆڕاوەکان بژین و شکستی خۆیان ببینن. هەر سەرکەوتوویەک بە کوشتنی دۆڕاوەکان دڵخۆش بێت، سەرکەوتوویەکی ترسنۆکە کە لە هێزی خۆی دڵنیا نییە. کاتێک بۆقبۆقیلەیان هێنایە سەر سەکۆ چاویان بەستبووەوە، بەر لەوەی بیکوژن پەڕۆکەی سەرچاویان لابرد و لێگەڕان بۆ دواجار سەیرێکی ئەو حەشاماتە گەورەیە بکات. ئەو بە ڕوخسارێکی گەلێک ترساوەوە سەیری مەیدانەکەی کرد، پێشتر تەنیا وەک جەلاد لەو جۆرە جێگایانەدا وەستابوو. من لەو باوەڕەدا نەبووم دوای ئەو هەموو ماوەیە، دوای سەربڕینی سەدان کەس، وا لاواز و ئەژنۆشل ڕووبەڕووی مەرگ ببێتەوە. چاوانی پڕبوون لەسەرسامی و حەپەسان، وەک باوەڕنەکات، وەک ئەوەی وایزانیبێت ئەوەی لە خەونەکاندا بینیویێتی، بۆئەو تەنیا لە سنووری خەوندا دەمێنێتەوە. بۆقبۆقیلە وەها نیگای خەڵکی دەکرد، وەک ئەوەی زوڵمێکی گەورەی لێ بچێت، وەک ئەوەی بێ

گوناهێکی گەورە بێت و بە ناهەق ڕوو بە ڕووی سزای وەها ببێتەوە. من تورە بووم لەو نیگا بێگوناهانە، بۆقبۆقیلە و سکینان بۆ من یەک کەس بوون، یەک جانەوەربوون بە دوو سەری جیاوە... ئەوەی یەکێکیان سەری ئەویدیان دەپەڕاند، هیچی لەوە نەدەگۆڕی کە هەردووکیان سەری جیاوازی یەک مەخلوقن، هەر دووکیان دوو بوونەوەری ئاوێتەین کە هەمیشە یەکتریان دروستکردوە. لەو ساتەدا کە هەستم بە ترس و لەرزی ناو جەستەی بۆقبۆقیلە دەکرد، هەستم بە ترسێکی گەورە لە دەست و نیگا و وەستان و ڕەفتاری سکینانیشدا دەکرد. چەند بۆقبۆقیلە دەترسا، هێندەش سکینان دەترسا، ساتێکی سەیربوو، هەستمکرد ئەوە تەنیا سکینان نییە کە بۆقبۆقیلە سەردەبڕێت، بەڵکو هەردووکیان بە جۆرێک لە جۆرەکان یەکتری دەکوژن. بە درێژایی ئەم دوو ساڵە، جەنگ بووبوو بە جەنگی نێوان دوو جەلاد، کە مردنی هەر یەکێکیان مانای مەرگی ئەوی دیکەش بوو. سکینان لە هەر کەس باشتر دەیزانی کوشتنی بۆقبۆقیلە، کوشتنی خۆشییەتی. بەزمی کوشتنەکە سارد و بێ خرۆشان و بێ گەرمی تێپەڕی، هات و هاواری سەربازەکانی مەمەدحەسار و تالانچییەکان نەیانتوانی بەسەر ئەو ترسەدا سەربکەون کە یەکجار باڵی بەسەر هەمووواندا کێشابوو. فەرمانداری مەمەدحەسار بڕیاریدابوو کە لاشەکەی بۆقبۆقیلە و کەللەسەرەکەی تا بۆگەندەکات لە مەیداندا بمێنێتەوە. بەلام هەمان شەو، هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە، کە سکینان خۆی کوشتووە... ئەوە چەندە دروست بوو نازانم؟ بەلام لەو ئێوارەیەوە سکینان لە هیچ جێگایەک و شوێنێکی دیکە نەبینرا و هیچ هەواڵێکی دیکەی لێ نەبیسترا....

ئەو ڕۆژە من گەڕامەوە بۆ ماڵ و ئەمین لاهوریش چووەوە بۆ باشوری دێلاوار تا لەوێ بە دوای خانەوادە و خێزانیدا بگەڕێت. ڕێکەوتین کە بۆ سبەی یەک ببینینەوە و پلانی پاشەڕۆژ دابڕێژین...

# ٥٠

گەڕەکی ئێمە لەو گەڕەکانە بوو کە زیانێکی کەمی بەرکەوتبوو، ماڵەکەی ئێمە وەک لە کەشتی نوحدا بووبێت هەر هیچ زیانێکی نەدیبوو، کە چوومە ژووری، خوشکەکانم سەرسام سەیریانکردم و چاویان باوەڕی نەدەکرد و لەگەڵ دیتنی مندا کردیانە هاوار و قریکە و هەلهەلە و گریانی خۆشی. لە کاتێکدا هەمووان چاوەڕوانی هەواڵی مردنی زیندووەکان بوون، ئەوان بە چاوی خۆیان زیندووبوونەوەی مردوویەکیان دەبینی. هەڵبەت وەک نەریتی هەمیشەیی خوشکان و برایانی دیلاوار هەموو خۆیان گەیاندە دۆخێکی ڕۆحی سەخت و خۆیان بوراندەوە و بە دەم فرمێسکەوە، خۆیان بە ملی مندا هەڵواسی. کەس باوەڕی نەدەکرد لە ناو ئەو ترس و دوکەڵ و بای کارەساتەدا، مردوویەک زیندووبێتەوە. من دوو ساڵ بوو بە مردوو حسابکرابووم، وەفاتنامەی ڕەسمیم بۆ دەرهاتبوو و لە قەیدی بنەماڵە و لە نفوس سڕابوومەوە. لە ڕاستیدا گەڕانەوەم بۆ ماڵ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبوو کە بمەوێت دڵی خێزانەکەم خۆشبکەم یان بمەوێت وەک کوڕێکی باش بگەڕێمەوە ئامێزی خانەوادە. من وەک هەمیشە نە کوڕی خانەوادەبووم، نە کوڕی شار، نە کوڕی نیشتیمان... کوڕی گریانێک بووم کە بۆ هیچ هۆ و بەهانەیەک ناگەڕێت، فرمێسکێک کە تەنیا دێتەخوارێ و دەیەوێت هەموو ئازارەکان لە خۆیدا جێ بکاتەوە. من وەک حەسەن

تاج گەڕامەوە بۆ ماڵ نە وەک ڕێنواری زەریاواری... کە چوومە ژووری بۆ لای باوکم، ئەو لەسەر جێگا کەوتبوو. لە دەمی ئەوەوە بیستم کە مامە سیام لە ڕۆژی دووهەمی داگیرکردنی دیلاواردا لەگەڵ ژمارەیەک لە پیاوان و کاربەدەستانی دەوڵەتدا هەوڵی هەڵهاتنیان داوە و کەوتوونەتە بۆسەی سەربازەکانی مەمەدحەسار و هەموو کوژراون. من دواتر و دوای پشکنینێکی درێژ لە کۆمەڵێک بەڵگەنامە و دۆسیە بۆم دەرکەوت کە لەو دوو ساڵەدا مامە سیام چەندە لە کاری ترسناکەوە ئالاوە و چ ڕۆڵێکی خراپی لە تیربارانکردن و ئەشکەنجەدان و زیندانکردنی گەنجاندا بووە. باوکم لە جێگاکەی خۆیدا نیوە گیان کەوتبوو، هەر لە ژوورە کۆنەکەی جارانی خۆیدا بوو، ژوورەکە تیشکێکی زۆر کەمی تێدابوو، هەموو پەنجەرەکان بە پەردەی ئەستوور بەریان گیرابوو، باوکم لە ناو پێخەفەکەیدا تەنیا وەک تارماییەک دیاربوو. پیدەچوو جوڵە و هەستان و دانیشتنی ئاسایی نەبێت، زۆر پیرتر لە دوو ساڵ لە مەوبەر دەردەکەوت، بیجامەیەکی خەت خەتی سپی و شینی لەبەردابوو لەگەڵ کڵاوێکی سپی بەندا، وەک هەمیشە پاک و تەمیز و تەراشکراو، بەڵام چرچتر و بێحاڵتر لە جاران. بە هۆی بینینی منەوە کەمێک خۆی لە جێگاکە بەرزکردەوە و بەرلەوەی ماچمبکات گووتی «لەو دوو ساڵەدا تاکە منداڵێک کە بیرم نەکردوە تۆ بوویت، ژیانی تۆ هیچ کات لە دەستی مندا نەبووە، یان لە دەستی خۆتدا بووە یان لە دەستی قەدەردا». توڕەیی و بێزاریی پێوە دیار نەبوو، پاش ئێستێک دەستی برد و لە ژێر سەرینەکەیەوە سێ وەفاتنامەی دەرهێنا، هەر سێکیانی بە وردی سەیرکرد و دووهەمین دانەی ڕادەستی من کرد و گووتی «ئەوە وەفاتنامەکەی خۆتە. تۆ بە مردوو حیساب بوویت، هەڵیگرە با لای خۆت بێت، ڕەنگە ڕۆژێک پێویستت پێی بێت تا بیسەلمێنیت کە مردوویت». هەستمکرد باوکم وادەزانێت من لە خەوندا سەردانیدەکەم، چەند زیاتر قسەمان بکردایە، زیاتر دڵنیادەبوو کە من لە خەوندا دەرکەوتووم. گووتی «دڵنیام خوشک

و براکانت باوەڕناکەن کە تۆ دەگەڕێیتەوە، هەر جارێک من باسی ئەوەیان بۆ دەکەم، دەڵێن بابە واز لەم خەوە شێتانە بهێنە، ڕێبوار کوژراوە... ئەو هەر لە شەوی یەکەمی جەنگدا کوژراوە». گووتم «بابە من خەون نیم، من گەڕاومەتەوە، جەنگ بە شکست و وێرانبوونی دێلاوار کۆتایی هات». گووتی «لە گەنجیمەوە من تەنیا خەونی خۆشم بینیوە، بەڵام هەمیشە کەسێک لە خەونەکەدا دێت و پێم دەڵێت ئەمە خەون نییە. لە ڕاستیدا لە ژیاندا شتی خۆش ڕوونادات، چەند ڕۆژ لە مەوپێش مامە سیاتیان کوشت، ئەوەیە ژیان». ئەوە یەکەمجار بوو هەواڵی کوشتنی مامە سیام ببیستم، بەڵام سارد و بێباک سەیری باوکم کرد و هیچم نەگووت. من ئێستا بە ناو وێرانەکانی دێلاواردا هاتبوومە ژووری و هێشتا بۆی سەدان لاشەی گەنیوی سەرجادەکان لە لووتمدا بوو. بە درێژایی ڕێگای گەڕانەوەم لە مەمەدحەسارەوە تا ئێرە، تەنیا لاشەی گەنجان و خەڵکانی بێ گوناهم بینیبوو، هەواڵی هیچ مردنێک نەیدەجوڵاندم. لەو دوو ساڵەدا زۆر کەم بیری مامە سیام کردبوو، ئەو مەودایەی کەوتبووە نێوان من و ئەوەوە هەموو پردێکی عاتیفی لە نێوانماندا پچڕاندبوو، وەک ئەوە بوو باسی مردنی کەسێکم بۆ بکات کە نایناسم، وەک هەر لاشەیەک لەو لاشانەی ئێستا لە کوچە و کۆڵانەکاندا کەوتوون، وەک هەر مردوویەک کە گوللەی سەربازەکانی مەمەدحەسار کۆتاییان بە ژیانی هێنابێت. من گووتم «شەڕێکی سەخت بوو، مان و نەمان تەنیا مەسەلەی شانس بوو و هیچی تر». باوکم گووتی «لەو دوو ساڵەدا مامە سیاتم وەک تۆ تەنیا لە خەوندا بینیوە. لەو کاتەوەی جەنگ دەستی پێکرد ئیتر سەردانی منی نەکرد، تەنیا لە خەودا دەیبینم، بەڵام ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە بلیمەتێکی گەورە بوو، یەکێک بوو لە گەورەترین پیاوانی زەریاوارییی. لەو ڕۆژەوەی جەنگ دەستی پێکرد هەموو کاتی خۆی بۆ خزمەتی باغەوانەکان تەرخانکرد ، دەڵێن سەی ئەسڵان دووجار خەلاتیکردوە. بەڵام کە دێتەخەوم زۆر کاتی

ئـەو قسـانەمان نییـە». چیرۆکـی کوژرانـی دوو براکەمـی بـۆ گێڕامـەوە، مـن نەگریام، ئـەو بـە شـتێک لـە ساردییەوە گووتـی «بەسـەرهاتەکە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵێک لەوەوبـەر، مـن چەندجـاری تریـش بـۆم گێڕاویتـەوە، وەک چـۆن بـەردەوام باسـی کوژرانـی تـۆش بـۆ براکانـت دەگێڕمـەوە... ئەوانیـش وەک تـۆ زوو زوو دێنـە خـەوم».

هیـچ ئارەزوویەکـم نەبـوو کـە زۆر پێداگـری لـەوە بکـەم کـە مـن بـە ڕاسـتی گەڕاومەتـەوە، چونکـە لـە ئێسـتێکدا هەمـوو شـتەکان وەک خەونێکـی ناخـۆش هاتنـە پێشـچاوی خۆشـم. منیـش هەسـتمکرد ئێسـتا باوکـم لـە خەونـدا دەبینـم، بـۆ سـاتێک چـاوم لێکنـا و تـەواوی ژوورەکـەم وەک ژووری نـاو خەونێکـی تاریـک هاتـە پێشـچاو. هیـچ مانایەکـی نەبـوو بـە باوکـم بڵێـم «مـن خـەون نیـم». ئـەو زیاتـر بـەوە دڵخـۆش دەبـوو کـە مـن خـەون بـم نـە ڕاسـتی. دواتـر لـە ڕێگای خوشـک و براکانمـەوە زانیـم کـە سـاڵێکی تـەواوە، هەمـوو دیوارەکانـی نێوان خـەون و ڕاسـتی لـە سـەری باوکمـدا ڕوخـاون و ئیتـر ناتوانێـت ئـەو دوو دونیایـە لـە یەکتـر جیابکاتـەوە.

ئـەو شـەوە لـە قاتـی سـەرەوە، لـە ژووره کۆنەکـەی خۆمـدا خەوتـم، جگـە لـە تەختـی خەوەکـەم و دۆلابێـک هیـچ شـتێک لـە ژوورەکـەدا نەمابـوو. مـن هیـچ کات هەسـتم نەکـردوە کـە ئەمـە ژووری منـە... ئێسـتاش ئـەو هەسـتەم نییـە کـە ئێـرە ژووری منـە. لـە بـەر پەنجەرەکـەدا دەوەسـتم ... دەمەوێـت بگریـم و ناتوانـم... ترسـی هـەرە گـەورەی ژیانـم ئەوەیـە ڕۆژێـک بێـت نەتوانـم بگریـم، وای چ کارەسـاتێک دەبێـت گـەر نەتوانـم بگریـم، مرۆڤەکانـی تـر بـە جەنـگ دەژیـن، بـە ئیمـان، بـە نیشـتیمان، بـە عەقیـدە... بـەڵام مـن بـە گریـان دەژیـم. مـن لـەو کەسـانەم کـە تەنیـا بـە گریـان دەتوانـم پەیامـی خـۆم بـە دونیـا بگەیێنـم، گـەر ترسـە، گـەر غـەم ... گـەر تووڕەییـە، گـەر خۆشەویسـتی... گـەر شـادییە، گـەر نائومێـدی، مـن تەنیـا بـە گریـان دەتوانـم شـتێک بڵێـم. گریـان هیـچ کات

زمان نەبووە، شتێکە پێش زمان، کەرەستەی ڕۆحێکە پاشەکشەیکردوە و گەڕاوەتەوە بۆ جێگایەک بەر لە هەر گوزارشت و قسەیەک... ئەو دڕندەیەی من دەمبینی، ئەو پاشەکشە قووڵەی لە ئینساندا دەمبینی بۆ جێگاو پلەی دڕندەکان، پاشەکشەی هەموو دونیا و هەموو جیهان بوو بۆ پێش وشە، پێش قسەکردن. من لە سەردەمێکدا ژیام، لە شارێکدا ژیام کە زمان، وشە ، نوسین تەنیا کەرەستەی فریوی گەورەبوون، لە سەردەمی وێرانە و جەنگە گەورەکاندا، کە ملیۆنەها مرۆڤ هەست و زمان و عەقڵییان لە دەست دەدەن، مرۆڤ یان دەبێت ببێت بە جەنگاوەر یان بە گرینۆک. ئەوانەی دەبن بە گرینۆک کەمینەیەکی بچوکن، یاخود لەوانەیە چەند کەسێک بن. فرمێسک چەک نییە، من بۆیە لەم جەنگەدا بە فرمێسک بەشداریمکرد ... چونکە تەنیا کەرەستەیەک بشێت لە جەنگدا بەشدار بیت و چەک نەبێت فرمێسکە. ئێستا پڕ بە سییەکانم هەوای دوکەڵاویی دێلاوار هەڵدەمژم، بۆنی برا کوژراوەکانم دەکەم و ناتوانم بگریم... ئایا جەنگ تەواو بووبوو؟ ئایا من وەک هەموو مەخلوقاتەکانی تر هەموو هەستەکانم لە دەستدابوو، ئایا وێرانەکانی دێلاوار و وێرانەکانی ڕۆحی من بووبوون بە یەکێک؟ ... نازانم. لەو ساتەدا کە دوکەڵی وێرانەکان دەچوون بە سەرمدا، هەستمدەکرد شار بە جۆرێک لە جۆرەکان لەدایکدەبێتەوە... هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو کە دەبێت چۆن لەدایک ببێتەوە، بەڵام دێلاوارێکی سووتاو، دێلاوارێکی شەل، دێلاوارێکی لە خوێندا شەلاڵ لە ژێر ئەم خۆڵەمێشەوە دەبینرا، دێلاوارێک کە من هیچ شتێکم لەسەر داهاتووی نەدەزانی. ئەوە بڕیاری ژیانم بوو کە وەک مرۆڤێک، نە وەک کەسێکی ئێرە، نە وەک دێلاوارییەک لەم شارەدا بمێنمەوە و بهێڵم ئەو دێلاوارە لە دایک بێت، دێلاوارێک کە ئێستا هەموو جەستەی خوێن و برین بوو.

ژوورە خاڵییەکەم وەک نیشانەیەک بوو بۆ هەموو ئەو پوچییەی کە ڕابورد، هیچ ئارەزوویەکم نەبوو بپرسم جلەکانم و کتێبەکانم چییان لێ

هاتووە، لە ناو ئەو هەموو ویرانەیەدا جۆرە پرسیاری وەها چەند دڵی ئازار دەدا، هێندەش بیمانا بوو. دەمەویت هەموو شەو پەنجەرەکە بکەمەوە و بخەوم، دڵم لای ئەمین لاهورە، ناونیشانی تەواوی ماڵەکەی خۆمانم داوەتێ تا گەر شتێک بوو خۆی بگەیێنیتە من... نازانم لە کوێوە ژیان دەست پێبکەمەوە، مرۆڤ دەتوانێت دوای عەشق، دوای مردنی ئازیز، دوای نەخۆشی و ئافات و کارەسات ژیان دەست پێبکاتەوە، بەلام دوای جەنگ نا، دوای جەنگ مرۆڤ ناتوانێت ژیان دەست پێبکاتەوە، ناتوانێت وابکات وەک ئەوەی شتێک لە جێگایەکدا پچڕاوە و سەرلە نوێ گرێی دەدەینەوە، تۆ دەتوانیت تەنیا هەندێک لەو شتانەی ڕوخاون دروستیانبکەیتەوە. هەموو ئەوانەی لە سەردەمی جەنگدا ژیاون، دواتر تەنیا توانیویانە خەریکی چاککردن و تیمارکردنی ئەو ویرانە و برینانەبن کە جەنگ لەسەر دیمەنی شارەکان، شوێنەکان، سروشت، جەستە، ڕۆح جێیهێشتووە. دوای جەنگ تا ماوەیەکی درێژ ناتوانین بیر لەسەرەتا بکەیتەوە، بیر لە نوێ بکەینەوە، تەنیا شتک بتوانین بیکەین ئەوەیە جیهانی کۆن، دارمانە گەورەکان وەک خۆیان دروستبکەیتەوە.

بەر لەوەی بخەوم دەرگای دۆلابەکە دەکەمەوە و وەفاتنامەکەی خۆم دەخەمە ناوی، جگە لە بەستەیەک کاغەزی پێچراوە هیچی دیکەی تێدا نییە، دەستدەبەم بەستەکە دەکەمەوە، وێنەکانی قاسم وەلید و ئاسەف بورهان و مستەفا لەیلانن ڕۆژێک وێنە زیادەکانیانم هەڵگرت، دەمێک نیگاری گوناهبارێکی خەیاڵیان کێشا. لەسەر زەوییەکە دادەنیشم و یەک یەک وێنەکان سەیردەکەم، دەیان وێنەن کە هیچ کامیان لەویدی ناچێت، دەیان وێنەن کە تاقیکردنەوەی هەڵەی مرۆڤن لەسەر وێناکردنی شتێک کە ویناناکرێت، وێنەی پیاوێکن کە هیچ کات نەیانزانیوە کێیە و چییە و لە کێ دەچێت، وێنەیەکە دەتوانین تا قیامەت تاقیکردنەوەی لەسەربکەین... دەیان و هەزاران سکێچی تری بۆ دروستبکەین، بەلام دواجار وەک خەونێک دەمێنێتەوە کە

مەحاڵە بتوانین شێوەی پێببەخشین. سەیری دوکەڵەکان دەکەم، سەیری وێنەکان دەکەم، دڵنیام دوژمنێک کە لە خەونەکانماندا دروستیدەکەین، ناتوانین بۆ ئەبەد هەر لە خەونەکانماندا دیلیبکەین، دوژمنێک کە لە سەرەتاوە وەک دوژمن هەڵیدەبژێرین، لە هەر بۆتەیەکدا بەسترابێتەوە و لە پشت هەر خەونێکەوە هەڵگیرابێت، دواتر هەر دێتەدەرێ. ئێستا دوای ئەو هەموو خەراباتە دەپرسم: ئایا دەکرا دوژمن دروست نەکەین؟ نا، گەر دوژمنمان دروست نەکردایە چیمان بکردایە، گەر دوژمن ئێمەی دروست نەکردبایە چییان بکردایە؟ ئەم سکێچانە چین، جگە لە کۆمەڵێک هێڵکاری و تاقیکردنەوە کە هەر یەکەمان بەردەوام بە خەیاڵ دەیکێشین، چ یەکێک لە ئێمە دەیان سکێچی خەیاڵی دوژمن لە سەریدا نییە؟ . ئێستا بۆ یەکەم جار شتێک لە دکتۆری مامم تێدەگەیشتم ... ئەم هەموو وزە وێرانکارەی کە دوو ساڵە ئەم سەرزەمینە وێراندەکات، بچووبایە بۆ کوێ، گەر لە جەنگێکی وەها خویناویدا، گەر لەم وێرانکردنە پەیتاپەیتایەی خۆمان و ئەوانی دیدا خاڵی نەبایەتەوە. سەیری وێنەکان دەکەم و دەزانم کە دەیان ساڵە دیلاوار لە ناخی ترساوی خۆیدا ڕوخساری ئەم پیاوە ترسناکانە دەبینێت... بیردەکەمەوە و دڵنیام، هیچ گەشبینییەکی درۆزن ئەم جەنگەی نەدەوەستان، هیچ شتێک نەبوو بتوانێت بەر بەم کارەساتە بگرێت، جەنگێک بوو جەنگی هەموومان، جەنگی دۆڕاو و جەنگی براوەکان... ئەوەی دیلاوار ئەم شەڕەی دۆڕان، ئەوەی ئەم شارە خاپوور بوو، ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئێمە بێخەتاین. سەیری وێنەکان دەکەم و دەڵێم «دیلاوارَ ئەوە تۆیت، کە بۆ دوژمن دەگەڕایت». بە پەلە لە ژوورەکەم دادەبەزم و داوای چەرخێک یان شقارتەیەک لە خوشکەکانم دەکەم، دەگەڕێمەوە سەرێ و لە بەردەم پەنجەرەکەدا دەوەستم و بە هێمنی وێنەکان گڕدەدەم، دەمەوێت دوکەڵ و خۆڵەمێشەکەیان تێکەڵ بە دوکەڵ و خۆڵەمێشی دیلاوار ببێتەوە، وێنەکان دەسووتێن و با بەگڕەوە دەیانبات، هەستدەکەم ئەوەی لە دیلاوار بۆی

دەگەڕاین دۆزیمانەوە، ئەوەی قاسم وئاسەف و مستەفا سکێچیان کێشا، ئەوەی هەزاران لە خەونەکانیاندا دەیانبینی، ئیدی خۆی لێرەیە، دوژمن چیتر وێنەیەک یان خەیاڵێک نییە، بەڵکو ئێستا و پاشەڕۆژی دیلاوارە. ئەوانەی ڕۆژێک وەک شێر بە دوای دوژمندا دەگەڕێن، زۆرجار دەگەنە جێگایەک کە دەبێت وەک مشک، خۆیانی لێ بشارنەوە. سەربەرزدەکەمەوە و ئاسمانێکی سامالی دەمەو ئێواران دەبینم. تا چاو بڕبکات سەیری هەندێک لە پارچە کاغەزە سووتاوەکان دەکەم کە با دەیانبات، سەیری دوکەڵی وێنەکان و دوکەڵی حەقیقەت دەکەم پێکەوە تێکەڵاودەبن و بەسەر دیلاواردا پەخشدەبنەوە. تەنیا شتێک ئاسوودەم دەکات ئەوەیە کە لە ناو هەموو ئەم ئۆقیانوسە تاریکەدا مرۆڤ دواجار ڕەنگە بتوانێت یەکێک ڕزگاربکات. خۆشحاڵم من لەو هەموو ماوەیەدا، لەو هەموو سەختییەدا، دەستم لە ئەمین لاهور بەرنەدا، خۆشحاڵم پرۆفیسۆر شابەندەرێک لەسەر زەوی هەیە کە ئێمەی ڕزگارکرد، هەمیشە لە بەرچاومە بە ڕیشە سپی و قژە ڕەشەکانییەوە، بە چاویلکەکەی دەستییەوە، بە قیافەتێکەوە کە ئارامی و دڵنیایی دەهێنێت، دەڵێت «سەیرکە هەتا مرۆڤی ترسنۆکی وەک منیش گەر بیەوێت دەتوانێت کەسانێک ڕزگاربکات»... چاو دادەخەم و دەیبینم بە خۆی و چەترەکەیەوە لە مەیدانی دەروازەی فیردەوس دەپەڕێتەوە و دەچێت بۆ جێگایەکی نادیار. شەوێک بە منی گووت «ئەوەی مانا دەدات بەم ئیشەی من و پرۆفیسۆر بەهنام، ئەوە نییە ژمارەی کوژراوەکان کەمتر دەکەینەوە، بەڵکو مانای ڕاستەقینەی لەوەدایە کە دەشێت شتێک بوونی هەبێت ناوی ڕزگاریی بێت. هەتا لە ناوەڕاستی دۆزەخیشدا، هەتا لە ناو جەرگەی گڕ و بڵێسەی ئاگری جەهەنەمیشدا، دەبێت شتێک هەبێت ناوی نەجات بێت، ناوی دەرباز بوون بێت».

بەر لە هەر شت، من دەبێت هەموو ئەو کون و کەلەبەرانە بگرم کە دەشێت لە یادەوریمدا دروست ببن، دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ هەر جێگایەک کە مێژووی من و مێژووی دێلاوار بەیەکەوە گرێدەداتەوە .... لەسەر جێگاکەم پاڵدەکەوم و بیر لە ئال موراد دەکەمەوە، دەمەوێت بچمە ئەو ژوورە و بەر ئەو پەنجەرەیەی کە لەوێوە تەقەی لە فەرماندار کردوە، حەزدەکەم بزانم ئێستا لە کوێیە. بەڵام دەنگێک لە ناخمدا پێم دەڵێت کە جارێکی دی نایبینمەوە. لە خۆم دەپرسم «دەبێت خۆشبەخت بێت؟ دەبێت گەیشتبێتە ئەو جێگایەی کە خۆی دەیەوێت؟ دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان هەتا گەر لە پیریدا بووە بیر لە گەڕانەوە بکاتەوە؟»، زۆرجار هەوڵدەدەم کە ڕقم لێی بێت، کە بیری نەکەم، کە ڕوخساری لە پێشچاوم بسڕمەوە، بەڵام ناتوانم... لەگەڵ ئەو خەیالاتانەدا خەوم پێدادەکەوێت و شەوێکی ئارام، بەڵام درێژ و تاریک دەبەمەسەر.

***

دوای دوو هەفتە لە گرتنی دێلاوار ، هێزەکانی مەمەدحەسار لە کوشتن و سووتاندن و ڕوخاندن بێزاردەبن. تا ئەندازەی تێربوون لە خەڵک تیرباراندەکەن و لە گەنجان سەردەبڕن، زۆربەی سەنتەرە گرنگەکان دەسووتێنن، شارێکی نیمچە ڕوخاو و تێکشکاو بەجێدەهێڵن و زۆرینەی هێزە شەڕکەرەکانیان دەبەنە دەرەوەی شار. شارێکە بێ بیمارستان، بێ ئاو، بێ کارەبا، پڕ لە بۆنی مردن و تەنهایی. هەر هەفتەی یەکەم کورە بچکۆلەکەی عەبدولسەلام ماروفی، کە ناوی موعتەسەمی ماروفییە وەک فەرماندار دادەنێن و بە چوار ڕاوێژکاری خەڵکی مەمەدحەسار ئابڵۆقەی دەدەن. بە فەرمانی فەرمانداری نوێ، هەموو ئەوانەی کە بەزیندوویی ماون، دەبێت دەستبکەنەوە بە ژیان. وەکو چۆن لێرە مردن بە فەرمانە، ژیانیش هەر بە فەرمانە. دوای دوو هەفتە، ئیدی ژیان دەست پێدەکاتەوە،

ئیدی قوتابییەکان دەگەڕێنەوە بۆ قوتابخانەکانیان و وەک ئەوە وایە هیچ نەبووبێت، من دەچمە دەرێ و سەیری ئەو دایک و باوکانە دەکەم کە هێشتا زیندوون و لە ناو داروپەردووی وێرانەکاندا منداڵەکانیان دەبەن بۆ قوتابخانە، سەیری ئەو فەرمانبەرانە دەکەم کە بە پەلە بەرەو سەرکار دەڕۆن، سەیری ئەو دوکاندار و فرۆشیارانەی کە بە پەلە دوکانەکانیان دەکەنەوە... ئاسوودەگی و بەختەوەرییەکی نهێنی لە چاوی هەمووانداییە. بە فەرمانی فەرماندار، ئەوانەی لە دەزگای پۆلیسی کۆن کاریانکردوە و زیندون، دەتوانن بگەڕێنەوە سەر کاری خۆیان. هێزەکانی مەمەدحەسار تەنیا بوار بە هێزێکی پۆلیس و ئیدارەیەکی مەدەنی لە دیلاوار دەدەن. لە کۆبوونەوەیەکی بچوکدا کە هەندێک لە بنەماڵەکانی دیلاوار تێیدا بەشدارن، بابەعەلی وەزیری کە تازە لە زیندان هاتۆتە دەر، دەکرێت بە بەڕێوەبەری نوێی پۆلیس. ژیان، هێمن و سادە دەست پێدەکاتەوە. بەلام شارەکە پێکرا قسە لەوە دەکەن کە چەندین شەوە کەس خەون نابینێت. بەلام من وا نیم، من هەر خەون دەبینم، خەونەکانم هیچ مانایەکیان نییە، هیچ نەزمێکیان نییە، هیچ شتێکی دیاریکراوم پێ نالێن، بەلام خەونن و دەیانبینم. ئایا بە ڕاست هەموو دیلاوار خەون نابینێت؟ ... ئایا هەموو شارەکە پێکەوە و بۆ هەتاهەتایە، بە یەکجار خەونەکانی خۆیان قووتداوەتەوە و چیتر خەون نابینن؟ یان ئەوەش نمایشێکی ترە کە دەبێت هەموومان تێیدا بەشداربین، هەموو پێکەوە خەونەکانمان بشارینەوە، هەموو پێکەوە بیخنکێنین تا بۆ هەمیشە لە یەک بچین، تا هەمیشە دیلاواری بین، لە ئازایی و ملکەچیدا، لە خەون و بێخەونیدا، لە جەنگ و لە کۆیلەییدا؟ .

من بۆ دوو هەفتە بەردەوام بەیانیان زوو دەچمە دەرێ و شەو بۆ خەوتن دەگەڕێمەوە، سەیری مەمەدحەسارییەکان دەکەم ماڵەکان و دوکانەکان و کۆگاکان تاڵاندەکەن، سەیری قەیسەری و بازاڕەکان دەکەم کە هەندێکیان سووتاون و هەندێکیان کراونەتەوە و هەندێکیان هێشتا هەر داخراون، زۆر

کوچە هێشتا هەر بەستراوە و هەندێک تیپی تایبەت کە لەلایەن فەرمانداری نوێوە دانراون لاشەکان دەردەهێنن و لە گۆڕی دەستەجەمعیدا دەیاننێژن. دەچمەوە بۆ جێگای مۆزەخانەکەی پرۆفیسۆر بەهنام و دەبینم کە هێزەکانی مەمەدحەسار چۆڵیانکردوە و قفڵێکی گەورە لە دەرگاکەی دراوە. دوو جار لەگەڵ ئەمین لاهور یەک دەبینین، دەڵێت کە دایکی و براکەی باشن و دەبێت لە داهاتوودا ئیشێک بدۆزێتەوە تا بتوانێت بژی. یەکەم هەواڵی پرۆفیسۆر بەهنام لە دەمی ئەوەوە وەردەگرم، بەپێی زانیارییەکانی ئەو کە لە خزمەکانی خۆی بیستوێتی. پرۆفیسۆر شەش مانگ دوای لە گیرانی لەلایەن سەی ئەسڵانەوە گوازراوەتەوە بۆ زیندانێکی دی لە دەرەوەی شار و لەوێ دادگایەکی کورت کراوە و لەگەڵ کۆمەڵێک نوسەر و مێژوونوسی دیکەی دیلاواردا بە تۆمەتی خیانەت تیربارانکراون. ئەو دەڵێت تاکە شتێک لە پرۆفیسۆر لە زیندانەوە هاتۆتەدەرێ، دوو نامەیە کە بەر لە مردنی بە نهێنی نوسیونی، یەکێکیان بۆ کچەکەی و یەکێکیان بۆ پرۆفیسۆر شابەندەر. ئەو کەسەی قسەکانی بۆ ئەمین لاهور کردوە گوتویەتی ئێستا هەردوو نامەکە لای کچەکەی پرۆفیسۆر بەهنامە و بەستەزمانە ڕێگایەک شک نابات، نامەکە بگەێنێتە دەست پرۆفیسۆر شابەندەر. ئەوە خولیای ئەوە دەخاتە سەرمانەوە بچین و کچەکەی پرۆفیسۆر بدۆزینەوە، لایەنیکەم تا هەوڵبدەین دوا نامەی پیاوێکی وەک پرۆفیسۆر بەهنام بگەێنین بە پرۆفیسۆر شابەندەر.

خۆم وەک ڕێنواری زەریاواری بە کچەکەی پرۆفیسۆر بەهنام دەناسێنم، تا باوەڕم پێ بکات. هەموو چیرۆکی خۆم و ئەمین لاهور لە نوکەوە دەگێڕمەوە، کیژەکە هەر بە گومانە لێمان. تا وشەی نهێنی «هەورەکانی دانیال» نادرکێنم، خانم ئامادەنابێت گوێمان لێ بگرێت. هەر گوێی لەو دوو وشەیە دەبێت ڕووی دەگەشێتەوە و بەو پەڕی جیدییەت و دڵنیاییی لەلامان دادەنیشێت. کچەکەی پرۆفیسۆر بەهنام کەسێکە وەک باوکی، بچکۆلە و لاواز، بە ناوچاوانێکی بڵند و قژێکی پڕەوە، بە هەمان زەردەخەنەوە کە

زۆربەی کات لە سەر لێوی پرۆفیسۆریش بوو. پێدەچێت کچێکی تەنیا بێت، ئێستا لە ماڵی پورێکی لە دیلاواری ڕۆژهەڵات دەژی. ماڵەکە تا بڵێی سادە و ئاساییە، کچەکەی پرۆفیسۆر ماکسییەکی ژنانەی درێژی لە بەردایە و وەک باوکی کتێبێکی بە دەستەوەیە. بە غەمگینی دەڵێت «باوکم هەموو کاروباری مۆزەخانەکەی بۆ من جێهێشتووە، ئەو ئەرکەی داوە بەسەر مندا کە تا دەتوانم مۆزەخانەکە بپارێزم و کتێبخانەکەی لە فەوتان ڕزگاربکەم. سەربازەکانی مەمەدحەسار و پێشتریش ئەو کەسانەی کە سەی ئەسڵان کردبوونی بە پاسەوان، زیانێکی زۆریان لە هەموو بیناکە داوە، بەشێکی کتێبخانە و ئاسەوارەکان تەلەفبوون، بەڵام زۆر شتیش وەک خۆی ماوە، بەپێی سەنەد و بەڵگەی دائیرەی موڵکییەت مۆزەخانەکە ئێستا موڵکی منە. من ساڵێک خەریکی هاتوچۆ بووم تا موڵکییەتی جێگاکە هاتەوە بەلای مندا. من ئومێدێکی زۆرم نییە دەسەڵاتی تازە لە دیلاوار بهێڵێت لە داهاتووی نزیکدا مۆزەخانەکە بکەینەوە، بەڵام دەبێت ئیشی تێدابکەم و ئامادەیبکەم ». من سەیری «نادین» خانم دەکەم و دەڵێم « خانم من مێژوونوس نیم، شتێکی ئەوتۆ لە مێژوو نازانم. نامەوێت هیچ شتێک هەڵبگرم یان بیپارێزم ... حەزم لە هیچ شتێکی کۆن نییە، بەڵام دەمەوێت لە شوێنێکدا بژیم، مرۆڤ ئومێدێکی بە نەجات و دەربازبوون هەبێت، هەر ئەوەندە. ئەو مۆزەخانەیەئ لای من وەک بنکەیەکە بۆ ئەو ئومێدە».

نەمدەویست هیچی تر بڵێم، باوەڕم بە هیچ عەقیدە و فەلسەفەیەک نەبوو، بەڵام دەمویست ئەو کارەی لەگەڵ پرۆفیسۆردا دەستم پێکردوە درێژەی پێبدەم. دەزانم هەمیشە مرۆڤێک هەیە کە دەبێت ڕزگارییبکەین... ئێستا پێویستیم بەم خانمە بوو، پێویستیم بەم مۆزەخانەیە بوو تا بەو ئیشە هەستم. من نامەکەی پرۆفیسۆر شابەندەر وەردەگرم و پەیمان بە خاتوو نادین دەدەم کە پەیامەکەی باوکی دەگەێنمە جێگای خۆی. نادین خانم دەڵێت «باوکم لە نامەکەیدا بۆ من داوای کردوە هەمیشە بۆ ڕاوێژ و

پرسوڕا، پرس بە پرۆفیسۆر شابەندەر بکەم. لە ماڵی ئێمە هەموو دەزانین باوکم و پرۆفیسۆر شابەندەر گەرچی لە گەنجییەوە یەکتریان نەبینیبوو، بەڵام دۆستی هەرە نزیکی یەک بوون. لە هەموو ئەو ساڵانەی دواییدا، بەردەوام ماڵی ئێمە میوانێکی غەریبی لێ بووە، باوکم هەمیشە دەیگووت هاوڕێی قاسمن. ئەو دوو وشەیە بەس بوون بۆئەوەی هەموومان ڕێز لەو غەریبانە بگرین».

من لە ناو ئەو خەڵکانەدا کە هاتوون بۆ دێلاوار کەسێک دەدۆزمەوە کە زۆر جار بۆ کاری چاپ هاتۆتە چاپخانەکە و نامەکەی پرۆفیسۆری پێدا دەنێرم. خۆشم نامەیەک بۆ پرۆفیسۆر دەنوسم و داوای لێ دەکەم باوەڕی پێم بێت، داوای لێ دەکەم چەند ساڵ چی لەگەڵ پرۆفیسۆردا کردوە لەگەڵ مندا درێژەی پێبدات، بە قوتابییەکی بچوک و هاوکارێکی خۆی و پرۆفیسۆر بەهنامم دابنێت. پرۆفیسۆر دەزانێت هەموو شتەکان چەند ترسناکن... دێلاوار بووە بە جێگایەکی تاریک و پڕ مەترسی. بەڵام من دەمەوێت بەردەوام بین... دەمەوێت.

هەموو ئەو ماوەیە بێهودە و بێ مەبەست تەنیا بە کوچە و کۆڵانەکانی دێلاواردا دەسوڕێمەوە. ئێوارەیەک بڕیاردەدەم بچم بۆ گەڕەکی غەفاریی تا دایکی ئاڵ موراد ببینم. پاش گەڕانێکی زۆر دەگەمە بەردەم ماڵەکەیان. خۆمی پێدەناسێنم «من حەسەن تاجم بە ئەسڵ خەڵکی ئەلائاباد، دوو ساڵ لە مەوبەر کوڕەکەی ئێوە ئاڵ موراد‌م لە مەمەدحەسار بینیوە، ئەو منی ڕاسپارد گەر ڕۆژێک ڕێمکەوتە دێلاوار بێم و پێتان بڵێم کوڕەکەتان کاتی خۆی بە سەلامەت لە دێلاوار دەرچووە و بە نهێنی لە مەمەدحەسارەوە چووە بۆ بەندەرەکانی باشوور، تا لەوێوە بتوانێت بەرەو خۆرئاوا سەفەربکات، یان هەر جێگایەکی تری دونیا». دایکی لەو ژنانەیە کە بەتەمەن گەنجە، بەڵام دەرد و ماندوێتی و بەدبەختی پیریانکردوە، کراسێکی

ئاودامانی لەبەردایە، دەموچاوێکی ڕەق و باریک و پێستێکی سپی و کاڵ، دوو چاوی بچوک و تیژ، وەک چاوانی کوڕەکەی. بە هێمنی سەیرمدەکات و هەست ناکەم شتێکی تایبەتی لە چاویدا بێت. وەک من چاوەڕوانمدەکرد نەگریا، نەکەوتە بە سەر ملمدا و شێوەنبکات، پەرۆشییەکی تێدا نەبوو... منیش نەگریام، منیش کە دەبوو بە ڕاستی لێرەدا بگریم، هەموو شتێکم سارد و بێوزە و بێ هەڵچوون گێڕایەوە. دایکی داوەتی نەکردمە ماڵ و بە گسکێکەوە لە دەستیدا گووتی «بەرلەوەی بیبەن و بیکەن بە پیاوکوژ، کوڕی من بوو... بەڵام لەو ڕۆژەوەی بردیان و شاردیانەوە، ئیتر زانیم کوڕی من نییە. ئینسان هەر بەوە نابێت بە پیاوکوژ بێ خەتایەک بکوژێت، بەوەش دەبێت بە پیاوکوژ گەر تاوانبارترین و خەتاکارترین کەس بکوژێت. کەس هیچ بەهانەیەکم بۆ نەهێنێتەوە، کە تۆ لە یەک پیاوکوژ خۆش بوویت وەک ئەوەیە لە هەرچی دەعبا و جینایەتکار و قەتڵچی دونیایە خۆش بوویبیت. لەو ڕۆژەوە کە تفەنگێکی ژەنگاویان دایە دەست و چووە ناو ئەو سەگانە، زانیم عاقیبەتی چییە ... وادەزانی ئەمانە قسەی ئێستەمن، نەخێر ... من ئەم شتانەم لە یەکەم ڕۆژەوە پێ گووتووە». نازانم بڵێم چی. بەڵام دڵنیام کە نەگەڕانەوەی ئاڵ موراد بۆ لای دایکی، باس نەکردنی لە حیکایەتەکاندا، کپبوونی بەرامبەری، سەرهەڵگرتنی لەوەوە هاتووە کە ئەم ژنەی ناسیوە. بە تووڕەییەوە گووتی «لە منداڵییەوە پێم گووت، درۆت لێدەبوورم، دزیت لێ دەبوورم، بەڵام یەک شتت لێ نابوورم، کوشتن. من دەڵێم گەر خوداش هەقی کوشتنی دابێتە ئینسان، بەشەر بۆی نییە ئەو هەقە بەکاربهێنێت. سەیربکە... ئەم شارە بۆ وێران بووە، گەر لە یەکەم جارەوە ئینسان کوشتنی حەرامبکردایە، ئەم شارە ئێستا بەم جۆرە دەبوو؟ ئاوا کاول دەبوو؟ ئەم ژیانە ئاوا دەبوو؟ من ئەم دەرد و چەرمەسەرییەم بەسەر دەهات؟». چاوەڕێی ئەوە نەبووم، قسەی وا لە دایکی ئاڵ موراد ببیستم. منیش دەمزانی ئاڵ موراد پیاوکوژە، هەتا زۆر

لەو زیاترم دەزانی، بەڵام لە قوولایی دڵەوە ئەوم بەخشیبوو، هیچ كات و هیچ ساتێک وەک بکوژ و درندە سەیرم نەکردبوو ... بۆ؟ نازانم. ئایا لە بەر ئەوە بوو خۆی لە پیاوکوژ نەدەچوو؟ لە بەرئەوە بوو زۆر ڕاستگۆ بوو لەگەڵمدا؟ لەبەرئەوە بوو، توانایەکی گەورەی لە گێڕانەوەی چیرۆکدا هەبوو کە منی سەرسامدەکرد؟ یان لە بەر ئەوە بوو کە لە بنەڕەتدا ئاڵ موراد بێگوناهـ بوو، ڕۆحی پیاوکوژی نەبوو، جارێک لە بەزمێکەوە ئالابوو و ئیتر تا کۆتایی، تا هەڵهاتنی نەیتوانیبوو بوەستێت، نەیزانی بوو چۆن کۆتایی پێ بهێنێت؟ . دایکی وەک بیەوێت من دەربکات بە توڕەییەوە گسکەکەی دەستی ڕاوەشاند و گووتی «خەڵکی ئەلائاباديت، خەڵکی هەر کوێیت، بڕۆ بە ڕێگای خۆتەوە، نامەوێت هیچ بزانم. هەزارجار خێرت بنوسێت و تەشەکور بۆ هیلاکیت. ئەوەی من دایکم، ئەوەی تاقە منداڵم بووە، ئەوەی لە گلێنەی خۆم خۆشترم ویستوە. مەعنای ئەوە نییە کە پیاوکوشتن قەبووڵبکەم... بمبەخشە بە قوربان، لە کوێوە هاتوویت بچۆرەوە بۆ ئەوێ... سەلامم بگەێنە ئەلائاباد».

من دەبوو ماڵی مامۆستا سمکۆ سوهەیبیش بچم، ئەوە سوێندێک بوو بۆ ئاڵ مورادم خواردبوو کە ڕۆژێک گەڕامەوە دیلاوار، دیدەنی مامۆستا سوهەیب بکەم. دوزینەوەی ماڵی ئەوان ئاسان بوو، خۆی دەرگاکەی بۆ کردمەوە و گووتی «ها بەقوربان، ئەمرکە ... فەرموو چاوەکەم». من خۆم پێناساند «من ناوم حەسەن تاجە، خەڵکی ئەلا ئابادم، دوو ساڵ لە مەوبەر لە شاری مەمەدحەسار بە خزمەتی کەسێک گەیشتم ناویان ئاڵ موراد بوو، ئەو بە منی گووت کە بێم و سەردانی ئێوە بکەم». مامۆستا سوهەیب هەر ناوی ئاڵ موڕادی بیست قوڵی گرتم و گووتی «سووک قسەبکە، عاسمان، ئەوە تۆ دەڵێی چی، وای هەرک بەسەر باوکم، کوڕە یەکێ ئەو ناوەی گوێ لێ بێت، شەش پشتم قوڕدەکرێت بەسەریاندا ... ناوی مەبە... بۆ خاتری ئەلا». من گووتم «دەی دەور و زەمان گۆڕاوە، ئێستا لە دیلاوار کوتەک

بە دەست کەسانێکی ترن، ئیتر ترسی ناوێت، بۆیە ناوم هێنا». مامۆستا سوهەیب گووتی «دەی قابیلە نەزانم، بەس من دوو ساڵم دەوێت، تا ترسی ئەو دەور و زەمانەش لە مێشکمدا دەسڕێتەوە، قابیلە من بە چی دەزانیت». من گووتم «مامۆستا من هاتووم، ئەو باڵندەیە ببینم کە ئەو هاوڕێییەمان دەیگووت تۆ لە پەڕی باڵندەکان دروستیدەکەیت... پەیکەری باڵندەیەک لە پەڕی هەرچی باڵندەی دونیایە». مامۆستا سوهەیب چاوانی کرایەوە و بە سەرسامی و خۆشییەوە سەیری منی کرد و گووتی «تو شەرەف بەراستە، تۆ لە ئەلائاباوە هاتوویت، بۆ ئەوەی ئەو باڵندەیە ببینیت؟ ... بڵێ بە ئەسحابە بۆ ئەوە هاتووم». من دڵنیامکردەوە کە بە تایبەت لە ئەلائاباوە بۆ ئەوە و هەندێک وردە ئیشی تر هاتووم. گووتی «یەعنی خوانەناسی لامەزەب ئەو ڕێگا خەتەرەت بۆ ئەوە بڕیوە ئەو باڵندەیە ببینیت؟». گووتم «بێگومان، تۆ لەو باوەڕەدا نیت کە ئەو باڵندەیە وەها بە نرخە، شایەنی ئەوە بێت مرۆڤ ئەو ڕێگایەی بۆ ببڕێت؟». گووتی «دەی چوزانم، لێرە هەموو پێم دەڵێن سمکۆ شێت، خالق لێرە فەن و مەن نازانن، لیۆنارد داڤینشی بە بە جڕت شێتتدەکەن، هەموو دەڵێن بخۆ و بکوژە، بخۆ و سووکایەتی بە خەڵک بکە، بخۆ و گاڵتە بە دنیا و قیامەت بکە. من دوو ساڵە لەو تەیرەدا ئیشدەکەم... ئەوە تەیری خەونەکانمە، وەرە وەرە پیشانت بدەم». مامۆستا سوهەیبم وەک پیاوێکی شیرین و مەیلە و شێت هاتە بەرچاو، گەنجێکی جوان ، ترسنۆک و ڕۆحسوک. گووتی «عەفومکە بەر لەوەی بچینە ژووری، دەبێت بە خانمم، کەیبانووی ماڵ بڵێم خۆی جەموجۆرکات». من گووتم «بێگومان فەرموو». پاش تۆزێک گەڕایەوە و گووتی «برا ڕۆ، ئەسڵەن هەر ناچێت بە مێشکمدا، بەشەری وەهاش هەیە لە ئەلائاباوە ملی ڕێگا بگرێت بۆ بینینی شتێکی وەها. بەس تو ئەسحابە پێم بڵێ ئەو زمانەی ئێمە چۆن ئاوا فێربوویت». گووتم «دەی مامۆستا، من دایکم خەڵکی دێلاوار بووە و بابم بازرگانێکی ئەهلی ئەلائاباد،

ئیتر چۆن دیلاواری نازانم؟». منی بەرەو ژێر زەمینێک برد، ژێرزەمینێکی زۆر تاریک، سەرەتا مۆمێکی داگیرساند و دواتر بە ئاگری مۆمەکە نزیکی دە چرا و چەندین مۆمی ڕۆشنکردەوە، ئێستا ژێر زەمینەکە وەها ڕۆشن بوو، مەگەر لەبەر ڕۆشنایی خۆردا نیگا وەها ڕوون و ساف هەبێت. هەر گەیشتینە ناوەوە گووتی «دەی توخودا ئێستا پێم بڵێ، ئەو مەلعونە باشە، تەندروستی باشە، خۆشی لێ دەگوزەرێت؟». من گووتم «مامۆستا، من دواجار دوو ساڵ لەمەوبەر سەرەتای هەڵگیرسانی شەڕ لە مەمەدحەسار بینیومە، بە ڕێگاوە بوو بۆ باشوور، دەچوو بۆ بەندەر سادق، ئەو شەوێک باسی تۆی بۆ کردم، باسی ئەوەی دەتەوێت باڵندەیەک دروستبکەیت لە پەڕی هەموو باڵندەکانی دونیا». چاوانی پڕبوون لە بریسکە و شادی، وەک کەسێک بوو پەیوەندی بەم شار و مێژووەوە نەبێت، بە ڕوویەکەوە کە پڕبوو لە پێکەنینێکی پەنهان گووتی «ئا، دایە ڕۆ، چۆن منی بیربووە، چۆن. دەمەوێت باڵندەیەک دروستبکەم لە پەڕی هەموو باڵندەکانی جیهان... هەموو باڵندەکان. هیچ کات باڵندەیەک بە تەنیا جوان نییە، بەڵام تەیرێک... تەیرێکی گەورە کە هەر پەڕێکی و لە باڵندەیەکەوە هاتبێت، هەر پەڕێکی و لە تەیری شارێک و گوندێک و جەنگەڵێکەوە هاتبێت، تەیرێک هەموو تەیرەکانی دونیا لە خۆیدا کۆبکاتەوە، عاسمان، تەیرێک بێت هەموو دونیا، هەموو عاسمانەکان، باکان، هەورەکان لە خۆیدا کۆبکاتەوە». چاوانی پڕبوون لە شەیدایی و سۆزێکی زۆر ، لە مێژبوو لە چاوی هیچ مرۆڤێکدا هەستی لەوجۆرەم نەبینیبوو، پڕبوون لە ئومێدێک کە من چەندین ساڵ بوو نە لە دیلاوار و نە لە مەمەدحەسار و نە لە چاوی کرێکار و ئیشکەرە بیانییەکانیشدا نەمبینیبوو. لە ناوەڕاستی ژێر زەمینەکەدا شتێکی زەبەلاح هەبوو، جێگایەک وەک سەکۆیەکی گەورە، بە پەردەیەکی چیتی هەرزان لە هەموو لایەکەوە داپۆشرابوو، دەستی برد و لە سێ لاوە پەردەکەی کردەوە، پەیکەری باڵندەیەکی گەورە دەرکەوت، باڵندەیەک لە هەزاران

چەشنە پەڕی جیاواز، ڕەنگی جیاواز، من هیچ کات باڵندەی وەها جوانم نەبینیبوو، سەری وەک سەری هەڵۆیەکی دڕی ناو شاخان بوو، بەڵام لەشی و باڵە کراوەکانی وەک شەبەنگێک لە ڕەنگ، لێشاوێک لە تیشکی نهێنی بوون، ڕەنگ شەپۆلانی دەدا، ئارامی و دڵنیایی دەبەخشی. مامۆستا سوهەیب ئەو شادی و سەرسامییەی لە چاوانی مندا خوێندەوە و گووتی «کوڕی عاسمان، ئەمە پیشانی هەر کەس نادەم، بەڵام تۆ لە ئەلائابادەوە تا ئێرە هاتوویت، زەحمەتت داوەتە بەر خۆت، عەیبە بۆ من، جوان نییە دەست بنێم بە ڕووتەوە. بەڵام ئەمە خەونی منە... من خەونم زۆرە ... ئەمە تەنیا خەونێکیانە. خەون بە درەختێکەوە دەبینم لە گەڵای هەموو درەختەکان، خەون بە وێنەیەکەوە دەبینم لە هەموو ڕەنگەکانی دونیا کێشرا بێت، خەون بە زمانێکەوە دەبینم لە وشەی هەموو زمانەکانی دونیا دروستبووبێت، ئا گیان... ئا، من خەون بە ئامێرێکی مۆسیقاوە دەبینم، دەنگی هەموو ئامێرەکانی کۆکردبێتەوە، بە ئینسانێکەوە جوانی هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی هەڵگرتبێت». دەنگی پڕبوو لە خۆشییەکی منداڵانە، لە خرۆشانێکی کتوپڕ، وەک یەکێک لە ناکاو کەسێکی دۆزیبێتەوە کە تێیدەگات. دەستی برد و لە ژێر سەکۆکەدا دوو بەستە زەرفی نامەنوسینی دەرهێنا «دەبینیت، دەبینیت، لە هەموو شوێنێکی دونیاوە پەڕی باڵندەیان بۆ ناردوم، لە هەموو شوێنێکەوە، خالق شوێنی وای تێدایە هەر خۆشم نازانم لە کوێیە، لەسەر نەخشەش نایدۆزیتەوە ... گەر ڕۆژێک بە ڕێگادا ڕۆیشتی و باڵندەیەکی جوانت بینی، گەر ڕۆژێک لە جێگایەک دانیشتیت و بە ڕێکەوت پەڕێکی جوان، ئا... پەڕێکی زۆر جوانت دۆزییەوە، منت لە بیر بێت، مامۆستا سمکۆ سوهەیبت لە بیر بێت، خۆت دەزانی ئەم پەیکەرە تەواوبوونی بۆ نییە». ئینجا کەمێک بە سەرسامییەوە سەیری باڵندە ئەفسانەییەکەی خۆی کرد و بە دەنگێکی کەمێک غەمگینەوە گووتی «نا ئەم پەیکەرە تەواو نابێت، بۆ پەڕی باڵدارێکی نوێ هەمیشە شوێنم هەیە...

هەمیشە شوێنم هەیە». بە سەرسامییەوە سەیری مامۆستا سوهەیبم کرد و پرسیم «بەڵام مامۆستا، تۆ ئەو خەونەت نەبینی، ئەو خەونە کە زۆربەی خەڵکی دیلاوار بینیان، خەونی ئەوەی یەکێک سەرت دەبڕێت؟». چاوانی بە خۆشییەکی گەورە کرانەوە و گووتی « نا... نا ... من خەونی وا نابینم، من گەر خەون ببینم بە پەڕی باڵندەکانەوە دەیبینم، بە ڕەنگەکانەوە، بە شەوەوە پڕبێت لە مۆسیقا. ئەو خەونە هەمووی درۆیە ... هەمووی درۆ».

ئەو ڕۆژە کە لەماڵی مامۆستا سوهەیب هاتمە دەری، ئاواتێکی سەیر لە دڵمدا بوو، ڕۆژێک ئەم باڵندە قەشەنگە لە هۆڵێکی گەورە و تایبەتی مۆزەخانەکەی پرۆفیسۆردا دابنێم و خەڵک لە هەموو جێگایەکی دونیاوە بانگبکەم بۆ تەماشاکردنی.

# ٥١

ئێوارەیەکیان دەگەڕێمەوە بۆ جێگای عیادە کۆنەکەی مامەسیام. لە پلەکەکان سەردەکەوم. سەرسام لە دەرگای عیادەکە دەڕوانم، دوای زیاد لە دوو ساڵ هەمان ئەو نووسینە کۆنە بە دەرگاکەوەیە «تکا لە هەموو ئەو برا و خوشکانە دەکەین کە بۆ سەردانی دکتۆری دەروونناس سیامەند زەریاواری دێنە ئێرە، لە هەفتەی داهاتووەوە، ڕووبکەنە بنکەی یەک بۆ تەندروستی دەروونی لە سەر شەقامی شەهرەیار، شوێنی زیندانە کۆنەکەی بنەماڵەی شوکور ئاغا ... سوپاس بۆ هاوکاریتان». لەگەڵ هەموو کارەساتەکاندا، لەگەڵ ئەو هەموو تۆز و دوکەڵەدا کە بە ناو کوچە و کۆڵانەکانی دیلاواردا گوزەریانکردوە، نوسینەکە هێشتا نوێ دەنوێنێت. من دوو قاتی تر چوومە سەرێ و لە دەرگای بیرۆکەی مام سوڵتانم دا، کە خاوەنی هەموو باڵەخانەکە بوو. پیاوێکی بە تەمەن بوو، لەسەر کرێی موڵکەکانی دەژیا. وەک جاران بەردەستە پیرەکەی کردییەوە، کە ئێستا لە چاو جاراندا کۆماوەتر و کزتر دەینواند. گەر مام سوڵتان لەوێ نەبووایە، ئەو لە بری مام، کرێی بیرۆ و موڵک و عەمبارەکانی وەردەگرت. مام سوڵتان هەمیشە جلی کاسبکارە کۆنەکانی دیلاواری دەپۆشی، کڵاوێکی سپی لەسەردا بوو، کەشییەکی حەج بە پشتییەوە بوو، ڕوخسارێکی هێمن و کەمێک نورانی هەبوو، کە خاڵی نەبوو لە شتێک لە سەرسەختی و

وشکی و پیداگری. وەک پیاوێکی پیسکە ناوبانگی ڕۆیشتبوو، کە هیچ کات لە دواکەوتنی کری نابوریت و توند لە هەر تێکدان و شکان و وێرانکردنێکی موڵکەکانی دەپرسیتەوە. بە حورمەتێکی زۆرەوە پێشوازی لێکردم و گووتی «باش بوو هاتیت، بەخێربێیت، من خەمم بوو چۆن یەکێکتان بدۆزمەوە. دکتۆر خودا لێی خۆش بێت، جگە لە تەلەفونی سەر ئیش، ژمارەیەکی تری بە من نەدابوو. ئێستا کە تۆ هاتوویت، ئیتر دڵنیام». دیاربوو مام سوڵتان هەواڵێکی لە ژیانی ئەم دوو ساڵەی من نییە. من پرسیم «خێرە مام سوڵتان، من تەنیا ڕێکەوت لێرەوە ڕابوردم و گووتم سەرێک لە جێگاکە بدەم». گووتی «ئەڵبەت ... ئەڵبەت... کارێکی باشە، نا، کوڕم مەبەستی خراپم نییە. هەر هێندەیە گەر دکتۆر سیامەند کۆچی کردبێت و گەڕابێتەوە بەر قاپی خودا، پاشەڕۆژی موڵکەکە بە کوێ دەگات، کێ لێرە بە دواوە کرێی مانگانەی شوێنەکە دەدات؟ گەر چۆڵیشی دەکەن، ئەوا کەلوپەلەکانی ناوی ببەن بە لایەکدا». سەیرم لێهات، بۆچی مامم لە دوو ساڵی ڕابوردوودا ئەم جێگایەی چۆڵ نەکردوە. من بە سەرسامییەوە گووتم «من ئاگام لەوە نییە کە لەم دوو ساڵەشدا مامە سیام هەر کرێی ئەم جێگایەی داوە. ئەوەی من ئاگادارم دوای کردنەوەی سەنتەری چارەسەرییەکە، لە شوێنی زیندانەکەی ماڵی شوکور ئاغا، مامم ئێرەی وەک شوێنی ئیش بەکارنەهێناوە». گووتی «ڕاستە... ڕاستە. دوو ساڵ زیاترە کە ئێرە عیادە نییە، بەڵام خۆی جارجار دەهات، بە دوو هەفتە جارێک ... بە سێ هەفتە جارێک... چەند سەعاتێک دەمایەوە و دەڕۆی. هەستدەکەم هەندێک شتی لەوێ هەیە نەیدەویست بیانباتە ماڵەوە، یان بیانخاتە بەر دەستی ئەم و ئەو. گەر ئێوە دەتوانن کرێکەی بدەن ئەوا باشە، گەر نا... هەر خۆتان سەرپشکی کەلوپەلەکانی بن. من لە ئێوە زیاتر کەس شک نابەم لە دکتۆرەوە نزیک بێت». من گووتم «مام سوڵتان، من کلیلی بیرۆکەم نییە، گەر بفەرموون و ڕێگا بدەن چاوێک بە جێگاکەدا بخشێنم. گەر کلیلێک بدەنە من، لە چەند ڕۆژی

داهاتوو هەموو شتێکتان بۆ یەکلایی دەکەمەوە». مام سوڵتان دەستی برد و لە چەکمەجەیەکی بچوکدا دەستەیەکی زۆر گەورە کلیلی دەرهێنا و دوای گەڕانێکی کورت، کلیلێکی درێژی دۆزییەوە و دوو جار سەیری ژمارەکەی کرد و لەگەڵ ژمارەیەکی تردا لەسەر دەفتەرێک بەراوردیکردن و گووتی «ئەوە کلیلەکەیە، تا زوو ئەو مەسەلەیە بەلادا بخەن باشترە، دکتۆر خۆی بە ڕەحمەت بێت شوێن متمانە بوو، لەو هەموو ساڵەدا هیچ کات کرێیەکی ئێمەی دوا نەخستووە. بەڵکو خوا لە گوناهی ئەو و گوناهی هەموومان خۆش بێت».

من کلیلەکەم وەرگرت و بەخێرایی هاتمە خوار. لە بەر دەرگاکە دەستم برد و ئەو ڕاگەیاندنەم لێکردەوە و قەدمکرد و خستمە گیرفانمەوە. لە ساڵۆنەکەدا هەموو شتێک وەک خۆی بوو، چۆن عیادەکەم بەجێهێشتبوو هەر بەو جۆرە مابووەوە، سەیرێکی بنمیچ و پانکە و پەنجەرەکانم کرد، پێدەچوو لە خەوێکی قووڵدا بن، دڵنیابووم مامم چەند هاتبێتە ئێرە، وەک نەریتی هەمیشەیی، لە ساڵۆنەکەدا ئیستی نەکردوە و دەم و دەست و بە پەلە چۆتە ژوورەکەی خۆی. یەکەم شت چەرچەفە سپییەکەم لە دۆلابێکی چکۆلانەی ناو ساڵۆنەکە دەرهێنا و بۆنمکرد، بۆنی زەمانێکی دێرینی لێدەهات، بۆنی مۆتەکە دوورەکان و نائارامییە کۆنەکانی من، بۆنی ئەو شەوە درێژانەی تەنهایی کە لەم ساڵۆنەدا بێدەنگی دەیترساندم. دەچمە ژوورەکەی مامم، لەسەرەخۆ دەرگاکەی دەکەمەوە ... زۆر لەسەرەخۆ... وەک ئەوەی بترسم ئەو لەوێ بێت، هەموو دەرگاکە دەکەمەوە و دەوەستم، جووتێک دەستکێشی سپی دەبینم لەسەر مێزەکەی دانراون، چاویلکەیەک دەبینم لەسەر مێزەکە بە کراوەیی جێماوە. دەفتەرێکی کراوە و قەڵەم پاندانێک کە لە نێوان دەفتەرەکەدایە. دڵنیام جارێکی تر مامە سیام نایەتەوە ئەم ژوورە... دەمەوێت بگریم و ناتوانم... دەمەوێت پێش ئەوەی پێ بخەمە ژوورەکەوە بە گریان شتێک لە پەشێویم ئارامبکەمەوە... بەلام ناتوانم.

هەنگاو هەنگاو دەچمە ژووری، سەیری ڕەفی کتێبەکان دەکەم، هیچ شتێک نەگۆڕاوە، مامم هیچ کات بۆ خوێندنەوە نەهاتۆتە ئێرە. هەموو شتەکان لە جێگای خۆیانن، هیچ دەستێک بەر دۆلابەکان، بەر ئەرشیفەکە، بەر کتێبەکان نەکەوتووە. بە ترسەوە دەچمە پشتی مێزەکەی، بەترسەوە دادەنیشم، یەک یەک چەکمەجەکان دەکەمەوە، جگە لە هەندێک دەستکێشی سپی هیچیان تێدا نییە. ئەو دەفتەرەی سەر مێزەکە دەکەمەوە. لەسەر دێڕی سەرەوەدا دەخوێنمەوە

«نامە بۆ مردوویەک»

بەسەرسامییەوە لاپەڕەکانی هەڵدەدەمەوە. چاوانم کراونەتەوە ... دەخوێنمەوە:

« ... تۆ ئێستا مردویت، ئیتر من و تۆ یەکتر نابینینەوە. ئەفسوس کە هیچ کات ئەم دێڕانە ناخوێنیتەوە. من هەموو شتێکم لە دەمی نەقیب یوکسەل خۆیەوە بیست. هەر ئەو ڕۆژەی نەقیب گەیشتەوە دێلاوار، دەستکێشەکانم هەڵکێشا و چووم بۆ لای. هەموو دڵنیان لە شەهیدبوونی تۆ و هاوڕێکانت. من نەگریام، توند دەستی نەقیبم گووشی و گووتم «شەهیدبوون بۆ دێلاوار، مایەی سەربەرزی بنەماڵەکەمانە»».

بە پەلە بە لاپەڕەکاندا دێمە خواری

«.. مردن بەشێک بووە لە ئێمە، کە کاتی خۆی لە وڵاتی ئینگلیزەکان گەڕامەوە، زۆر بیرم لە مردن دەکردەوە. سەیرم لێهات کە گەڕامەوە دێلاوار، بینیم خەڵکی ئەم شارە هەست بە مردن ناکەن، خەڵکی ئێرە هەموو وا هەستدەکەن دەکوژرێن. هەتا ئەوانەی بە دەردی پیری دەمرن، بە نەخۆشی دەمرن، ئەوانەی بە هۆی دەردێکی زگماکەوە دڵیان دەوەستێ، ئەوانیش ئەو هەستەیان هەیە کە کوژراون... من وەک دکتۆر، وەک کەسێک

کە چارەسەری مرۆڤەکانم لەسەر بووە بەردەوام ئەو هەستەم هەبووە، کە هەموو دێلاوارییەک وا هەستدەکات، خەڵکانی تر بۆیە لە دایک بوون تا ئەو بکوژن».

........

«... دێلاوار شارێک بوو شێت. من هەموو شەوێک کە چاوم ناوەتە خەو، لەوە ترساوم بەیانی لە خەو هەستم و ببینم هەموو دێلاوار چووبێتە جەنگی دەستەویەخەوە لەگەڵ یەکدا. لەسەر زەوی هیچ شارێک نییە وەک دێلاوار، شێتی خۆی ناو بنێت یاخی بوون، شۆڕش، نیشتیمان پەروەری، ئازادی، هیچ شارێکی تری وەها نادۆزیتەوە ......

... من دەزانم تۆ چاوەڕوانی شتی گەورەترت لە من دەکرد، دەزانم چاوەڕوانی زیاترت لە من هەبوو، بەڵام پێم باش بوو لە بری ئەوەی وەک دکتۆر ڕەفتاربکەم، ببم بە خودی شێتەکان... دوای چەند ساڵ لە پزیشکی زانیم ناتوانم هەتا مرۆڤێکیش چارەسەربکەم، شێتی هەموو حوکمەکانی خۆی کردبوو بە یاسا. هەتا بەر لەوەی تۆ بێیت بۆ عیادەکە و ببیتە هاوکارم. بڕیارمدابوو کە ئیتر واز لەوە بهێنم یاری پزیشکەکان بکەم، ئەوەی من دەمکرد ئیتر یاری شێتەکان بوو ... ».

........

«... هیچ هێزێکم نەما بتوانم شێتەکان و عاقڵەکان لە یەک جیابکەمەوە»

........

« ... جەنگ تاکە ڕێگایەک بوو بتوانێت دێلاوار ڕزگاربکات، گەر جەنگ نەبایە، بەس خودا دەیزانی چۆن بنەماڵەکانی دێلاوار دەکەوتنە گیانی یەک. گەورەترین کارەساتێک ڕووبکاتە خەڵکی ئەم شارە ئەوەیە دوژمنیان

نەبێت. دیلاوار، شکست و دۆڕان و ویران بوونی لە نەبوونی دوژمن پێخۆشترە ...

... دوژمن لە ئاو، لە نان، لە هەوا گرنگترە بۆ ئەم شارە».

........

«... من نەمتوانی پزیشک بم، لەبەر ئەوە بڕیارمدا نەخۆش بم ...».

........

«...گەر لێرە بوویتایە دەتبینی چەند ڕۆژە دەستکیشەکانم فڕێداوە ... ئیتر ئەو ترسەی جارانم نییە، ئێستا وەک نەخۆشەکان لەزەت لە ژیان دەبینم...».

بە پەلە بەسەر هەموو لاپەڕەکاندا هاتم، لێرە دێڕێک و لەوێ دێڕێکم دەخوێندەوە. مامەسیام کە پێی وابووە من چیتر مالاوایم لە دونیا کردوە، دوا نامەی خۆی بۆ من نوسی بوو. بۆ یەکێک لەو باوەڕەدا نەبووە بتوانێت بیخوێنێتەوە. نامەکەی بە جۆرێک نوسراوە تا هەرگیز نەخوێنرێتەوە. وەک ئەوەی، بیەوێت وەک جاران هەموو شتێکم بۆ ڕوونبکاتەوە، وەک ئەوەی هەستبکات قەرزاری تەفسیرێکە و دەبێت لە بەردەم مندا ڕوونکردنەوەیەکی هەبێت. لە جێگایەکدا نوسیویتی «کە جەنگ هەڵگیرسا دەبێت هەموو مرۆڤەکان وەک یەک ئامادەگی مردنیان تێدا بێت. وەک یەک، بە یەکسانی». بە پێنوسەکەی دوو جار هێڵی بە ژێر وشەی یەکسانیدا هێنا بوو. پێدەچێت ویستبێتی تەفسیرێک بۆ ئەو فەرمانانەی مردن بدۆزێتەوە، کە بە هۆی لیژنەکانی ئەوەوە دەرچوون. هەستمکرد زۆرجار لاپەڕەکانی دڕاندوە و سەر لە نوێ نوسیویتییەوە، تەواوی نامەکەی لە بەرگرییەک دەچێت بۆ دادگایەک نوسرابێت، دادگایەک مامەسیام هەستیکردوە دەبێت لە بەردەمیدا

بوەستێت و قسەبکات. من ئەو ڕستەیەی خۆی دەپەڕێتەوە یادم، دەربارەی هەندێک مرۆڤ کە تەنیا بۆئەوە لە دایکدەبن تا مردن دووبارەبکەنەوە، ئێستا مامم وەک یەکێک لەوانە دەبینم، وەک یەکێک لەو مرۆڤانەی تەنیا و تەنیا مردن دووبارەدەکەنەوە.

دەفتەرەکە دادەخەم و چاو لێک دەنێم. هەستدەکەم لە بەردەم نوسینێکدام دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆن، بۆ زەمانێکی بە سەرچوو، نوسینێک کە پزیشکێکی شێت بۆ برازایەکی مردووی نوسیوە کە من نیم. هەستێکی سەیر پاڵم پێوە دەنێت، نوسینەکە نەخوێنمەوە، لە بەرئەوەی ئەو کەسەی نوسیویێتی مردووە و ئەوەشی بۆی نوسراوە مردووە. دەفتەرەکە هەڵدەگرم و هەست بە گێژییەک دەکەم، وەک تەواوی ئەم جێگایە بەشێک بێت لە زەمەنێکی دی، بەشێک بێت لەسەردەمێک کە بۆ هەتاهەتایە تێپەڕیوە و جارێکی تر ناگەڕێتەوە، هەستدەکەم مانەوەی زۆر لەم ژوورەدا، لەسەر ئەم مێزە، بە دیار ئەم دیوارانەوە وەک مانەوە وایە لە ناو گۆڕێکی گەورەدا، لە ناو جەرگەی مردندا. بە کاوەخۆ دێمەدەری و کلیلەکە دەدەمەوە بە مام سوڵتان و دەڵێم «دوو ڕۆژی تر دێمەوە و کەلوپەلەکان دەگوازمەوە». ئارەزووم نییە لەوە زیاتر هیچی تر بڵێم، نەمانی ئەم شوێنە بە نەمان و تەواوبوونی بەشێک لە مێژوو دەزانم، ئەو بەشە لە مێژووی شتەکان کە دەبێت بڕوات و ونبێت و ببێت بە ژێر کارەساتەکانەوە. هیچ ئارەزوویەکم نییە دەنگی مامە سیام بەسەر ڕۆحی کوژراوی مندا بگەڕێتەوە بۆ دیلاوار، دەفتەرەکە هەڵدەگرم و بە خێرایی دەگەڕێمەوە بۆ ژوورەکەی خۆم و لەوێ بە هەمان شێوەی وێنەکان دەیسووتێنم... پەڕە پەڕە دەیکەمەوە و بێئەوەی لە هیچ وشەیەکی بنواڕم ئاگری دەدەم، خۆشحاڵم کە دەتوانم شتێک بسووتێنم، خۆشحاڵم کە من و مامە سیام مردووین، خۆشحاڵم کە بەشێک لە شتەکان دەبن بە خۆڵەمێش.

شەو ئەمین لاهور دێت بۆ لام و دەڵێت نامەیەک لە پرۆفیسۆر شابەندەرەوە بۆ نادین خاتوون هاتووە، نامەکە لای ئەوە و دەبێت پێکەوە بیدەینە دەست خاتوون. بە تاکسییەکی کۆن لە باکوری دیلاوارەوە دەچین بۆ ڕۆژهەلات، سەعاتێک بە ڕێگاوە دەبین، شۆفێرەکە زۆر خێرا لێدەخوڕێت، من و ئەمین لاهور بەردەوام قسە لەسەر داهاتوو دەکەین، هەموو ئومێدمان ئەوەیە ئەم وێرانییە سەرەتای کۆتایی کارەساتەکان بن. شارەکە ئێستا هێمن و خامۆش دەنوێنێت، زۆرینەی هێزەکانی مەمەدحەسار کشاونەتەوە بۆ کەناری شار، هێزی پۆلیسی ناوخۆ لەوە لاوازترە بتوانێت دەست بە سەر هەموو جێگاکاندا بگرێت، مەترسی دز و ڕێگران لە زۆربووندایە، بەڵام بە پەرۆشم هەواڵی پرۆفیسۆر بزانم، بەردەوام داوا لە شۆفێرەکە دەکەم خێراتر و خێراتر ماشینەکەی بئاژوێت. دەگەینە ماڵی خانم، وەک هەمیشە بە خەندەیەک و بە کتێبێکەوە پێشوازیمان لێ دەکات، ئەمجارە بچوکتر و بزێوتر لە جاری پێشوو دێتە بەرچاوم. بە پەلە نامەکەی پرۆفیسۆر دەکاتەوە و لەبەر تیشکی زەردی چرایەکدا دەیخوێنێتەوە، بە پێکەنینەوە دەڵێت «ئێوەن حەسەن تاج و ئەمین لاهور؟». هەر دووکمان سەر دەلەقێنین، ژوورەکە هەوایەکی زەرد و غەمگینی هەیە، لە هەوای ئەو ژوورە دەچێت شەوێک لە دیلاواری ڕەش پرۆفیسۆرم تیاناسی. نادین خانم دەڵێت «پرۆفیسۆر منی ڕاسپاردوە لەگەڵ ئێوەدا مۆزەخانەکە بخەمەوە سەر پێ». من و ئەمین لاهور شادمانین، شابەندەر لە نامەکەیدا نوسیویتی « دەبێت هەموو ئیشەکانمان لە مۆزەخانەکەدا نهێنی بێت. دەبێت تا دەمێک هەموو شت ئاسایی دەبێتەوە، دەرگای مۆزەخانەکە نەکەینەوە، لە ناوەوە شتەکان بگێڕنەوە بۆ دۆخی جارانی و بوەستین تا بارودۆخی سیاسی زیاتر ڕووندەبێتەوە». من خۆشحاڵم، دەمەوێت بۆ ماوەی داهاتوو کارێکی گرنگمان هەبێت بیکەین. «بەو نزیکانە پێویستمان بە جێگای نهێنی دەبێت، بە شوێن بۆ حەشاردانی خەڵکانی بێگوناهـ». پرۆفیسۆر وای نوسیوە. هەر

سیکمان دڵمان دەترسێت، پرۆفیسۆر بە زمانێکی غەمگین دەڵێت «جەنگ کۆتایی نایەت، هەمیشە هەورەکان دەبارێن، دێن و دەڕۆن و دەگەڕێنەوە. دەبێت هەم من ئامادەبم و هەم ئێوە». هەر سیکمان نیگای یەک دەکەین و هەستدەکەم یەک هەستمان هەیە، ئەوەی پێمان بکرێت دەیکەین. نادین خانم دەڵێت «ڕەنگە پرۆفیسۆر لە داهاتوودا خۆی بێت بۆ ئێرە، دوور نییە قاسمی شابەندەر لێرەش چاپخانەیەک بکاتەوە، دەڵێت تەنیا شیعر چاپدەکەین... شیعر و هیچی تر». کە ناوی چاپخانە دێت، من هەوای کتێبەکان دەچێتەوە سەرم، دەنگی ئامێرەکانی چاپ جارێکی تر لە گوێمدا دەزرنگێنەوە، کەپووم پڕدەبێت لە بۆی مەرەکەبێکی بۆنخۆش. نادین دەڵێت «ئێوە هەردوکتان لە بەیانییەوە لای من موچەیەکی مانگانەتان هەیە، لە سبەینێوە دەستدەکەین بە کار لە دروستکردنەوەی جێگاکەی پرۆفیسۆری باوکمدا». هەر دووکمان لەماڵی خانم دێینە دەرێ و دڵمان پڕە لە ترس... دڵمان پڕە لە هیوا. بە خۆشییەکەوە خاڵی نییە لە هەستی مندالانە، بە کوچەکەدا ڕادەکەین، دڵخۆشین بەوەی کە دەتوانین شتێک بکەین... دەگەینە سەر شەقامێک و هەر یەکەمان دەبێت بە جیا تاکسییەک بگرێت و بگەڕێتەوە بۆ ماڵی دووری خۆی لەو پەڕی شار. من دەڵێم «ئەمینی هاوڕێم، پرۆفیسۆر ڕاستدەکات، ڕۆژانی ترسناکی تر زۆر بەڕێوەن، بەلام ئەمجارە ئێمە ئامادەین... وانییە ... ئەمجارە ئێمە ئامادەین؟». تاکسییەک دێت و ئەمین لاهور سواردەبێت، لە پەنجەرەکەوە دەست ڕادەوشێنێت و دەڵێت «تا سبەی... تا سبەی هاوڕێم». ئەوە یەکەمجارە بە هاوڕێ بانگمبکات، یەکەمجارە ئەو دیوارە ئەستوورەی لە نێوانماندا بووە دەڕوخێت. تاکسییەکە دەڕوات، من بە خۆشحاڵییەوە دەست بەرزدەکەمەوە و دەڵێم «تا سبەی هاوڕێم... تا سبەی هاوڕێی ئازیزم ... تاسبەی ... تا سبەی». من تەنیا دەوەستم و لە تاریکیدا، چاوەڕوانی تاکسییەکی دی دەکەم، سەیری ئاسمان دەکەم... هەورەکان، مانگ، ئەستێرەکان لەوە جوانتر و ڕۆشنترن

مرۆڤ هەستبکات، بۆ ساتێکیش چییە، ئاگایان لە غەمی دیلاوار بووە.

بەیانی کاتژمێری دە، هەردووکمان لە بەردەم مۆزەخانەکەدا دەوەستین. خانمی نادین لە کاتی خۆیدا، بە کتێبەکەی بەر سنگییەوە دەگات و بەستەیەک کلیلی گەورە دەردەهێنێت و دەرگاکە دەکاتەوە. سێ قۆڵی دەچینە ناو مۆزەخانەکەوە، لەگەڵ هەموو ڕووداوەکاندا، لەگەڵ ئەو دەستە جیاوازانەی یارییان بە شتەکانی ئەم جێگایە کردوە، لەگەڵ ئەو پژان و پیسی و شکانەدا کە جوانی شوێنەکەی تێکداوە، مۆزەخانەکە هەیبەتی هەمیشەیی خۆی هەیە. پیاوەکانی سەی ئەسلان و سەربازەکانی مەمەدحەسار، شێوانێکی گەورەیان دروستکردوە، کتێبەکانیان لە سەر ڕەفەکانەوە فڕێداوەتە خوارێ. هەندێک دۆلابیان بە دەمدا خستوە، بە چەکمە و پۆستاڵەکانیان هەندێک دەستنوسی کۆنیان خستۆتە ژێر پێیان، هەندێک کتێبیان بێهۆ پەڕەپەڕەکردوە. زۆر لە ئاسەوارە کۆنەکانی پێشانگا مێژووییەکەیان شکاندوە، زیانیان بە چەند پەیکەرێکی مێژوویی گەیاندوە، بەڵام نەیانویستوە هەموو شت بە بەرنامە و بە پلان وێرانبکەن، هەندێک بەشی ژێر زەمینەکە و زۆر لەو جێگایانەی پرۆفیسۆر وەک کۆگای نهێنی بەکاریهێنابوون، تەواو سەلامەت بوون. بیرۆکەی پرۆفیسۆر درابوو بەسەر یەکدا، دیاربوو سەربازەکانی مەمەدحەسار وەک بنکەی خەوتن و حەوانەوە بەکاریانهێناوە، جێگای ئاگرکردنەوە و پاشماوەی سفرە و خۆراکیان لەو ناوەدا بڵاوبۆتەوە، بۆنی گۆشتی گەنیو و نانی کەڕووکردو ئەو ناوەی تەنیوە. دیاربوو بە پەڕەی کتێبەکان ئاگریانکردۆتەوە، قوڕی پێڵاوەکانیان سڕیوە، لە زۆر جێگادا کە فەرشی گرانبەها ڕاخرابوون، زەخرەفەی شێوە تەلا دیوارەکانی ڕازاندبووەوە، ئەوان میزیانکردبوو. بەڵام هیچ یەک لەو بۆنانە، بینینی هیچ یەک لەو دیمەنانە، شکۆی مۆزەخانەکەی لکەدار نەدەکرد. ئێستا لەو قسەیەی پرۆفیسۆر تێدەگەیشتم کە نائاگا بە منی گووت «ڕێنوار، بزانە جێگام زۆر زۆرە، ژێر پێی ئێمە بە دوو قات، چەندین

ژێرزەمینی گەورەی تێدایە، جێگای ئەوەی تێدا دەبێتەوە هەم ئێستای تێدا بشارینەوە و هەم ڕابوردوو ...هەم پاشەڕۆژ... هەم پاشەڕۆژ ... ئەوەت لە بیر نەچێت». ئەم جێگایە شوێنێک نەبوو بۆ هەڵگرتنی ڕابوردوو، بەڵکو پرۆفیسۆر لە پێناوی داهاتوودا دروستیکردبوو، لە پێناوی مندا، لە پێناوی ئەمین لاهوردا، لە پێناوی خانمی کچیدا. لە سەرەتاوە ئیشەکانمان بەشکرد، من چاککردنی کتێبخانەکەم گرتە ئەستۆ، ئەوانیش دەبوو دوو قۆڵی لە پێشانگا مێژووییەکە و ژێر زەمینەکان و ڕاڕاوە نهێنییەکاندا کاربکەن. من قسەکانی دکتۆرم هاتەوەیاد، ڕۆژێک کە قسەی لەسەر خنکانی کتێبەکان کرد... بەر لەوەی هیچ شتێک بکەم، هەندێک لە کتێبەکان هەڵدەگرم و دەیانبەمە باڵکۆنەکە، لە بەر خۆرەکەدا دایاندەنێم، هەستێکی غەمگینم هەیە، لە هەموو شوێنێکی مۆزەخانەکەدا خەندەکەی پرۆفیسۆر بەهنام دەبینمەوە. هەموو جێگایەکی ئەم شوێنە بە عەشق دروستکراوە... کە دەست لە کتێبەکان دەدەم هەستیان پێدەکەم ڕادەچڵەکن، وەک ئەوەی ترسابن یان بزانن کە هەر دەستێک لە ئێستا بە دواوە بەر لاپەڕەکانیان دەکەوێت، دەستی میهرەبانی پرۆفیسۆر نییە. وەک دەست بە سەر باڵندەیەکدا بهێنم دەست بە سەر کتێبەکاندا دەهێنم، دەمەوێت لە ئێستا بە دواوە لەگەڵ پەنجەی مندا ڕابێن، هەستبکەن دەستێکی میهرەبانی تریش لە دونیادا هەیە. گەورەیی کتێبخانەکە دەمترسێنێت ... زۆر کتێب هەڵدەدەمەوە، زۆر ناونیشان دەبینم کە هەرگیز نەمدیون، زۆر نوسەر کە ناوەکانیان نازانم، لە نێو کتێبەکاندا کتێبێک دەکەمەوە «ئاناباس» سان ژۆن پێرس، لەسەری نوسراوە «پێشکەشە بە دانیالی ئەم ڕۆژگارە، بە هاوڕێم بەهنام، ڕزگارکەری ڕوحە قەڵەندەرەکان، بە کەسێک دەزانێت تاریکی دێت و ڕوحی خۆی بۆ ئامادەدەکات. برات ئەندازیار مورتەزا حەساری». کتێبەکە دەخەمە لاوە و بە یەکجار دەکەومە داگرتنی ڕیزێک کتێبی دی، دەبێت تەواویان پاکبکەمەوە، بە هەموویان ئاشنابم، دەست لە هەموویان بدەم... سەیری گەورەیی کتێبخانەکە دەکەم

و جارێکی تر سەراسیمە دەوەستم، وەک جێگایەک دەبینم کە خۆی بە ئەندازەی هەموو دیلاوار نهێنی تێدایە. بە خۆم دەڵێم «کێ دەڵێت لەم جێگایەدا نهێنی زۆر گەورە نادۆزمەوە». هەموو ڕۆژەکە تەنیا سەرسامانە کتێب دادەگرم و جیایان دەکەمەوە. ئێواریَ کتێبی ئاناباس هەڵدەگرم و سەر لە نویَ پێشکەشکردنەکەی دەخوێنمەوە... «بە کەسێک دەزانێت تاریکی دێت و ڕۆحی خۆی بۆ ئامادەدەکات». سەر بەرزدەکەمەوە و لە پەنجەرەکانەوە لە دەرەوە دەڕوانم، لە ئاسۆکان دەڕوانم، وەک ئەوەی ئیتر ئیشی من بێت هەموو ڕۆژێک سەیری دووربکەم و بۆ هەوری خوێنین بگەڕێم، دڵنیام کە تاریکی دووبارە دێت و دەبێت ڕۆحی خۆمی بۆ ئامادەبکەم. ئێوارە هەر یەک لە ئەمین لاهور و نادین دێنەوە سەریَ، هەر دووکیان ماندوون... بەڵام شادومانن، هەر سێکمان هەستدەکەین ژیانێکی نوێمان دەست پێکردوە. خانمی نادینم وەک ژنێک دێتە بەرچاو کە ئیشێتی هەموو ئەو مێژووە بسڕێتەوە کە پیاوانی دزێو لێرە بەجێیان هێشتووە. ئیشێکی کەممان کردوە، بەڵام کاتمان دەوێت تا لە دیمەنی ئەم هەموو شکۆیە، لە بیستنی ئەو مۆسیقا نهێنییە، لە پەیامی ئەو هەموو شفرە داخراوانە، تێدەگەین ... پێکەوە دەچینە دەریَ... هێشتا دونیا ڕوناکە. من جیادەبمەوە، ئەمین لاهور و نادین پێکەوە بەرەو باشوور دەڕۆن.

ئێوارەیەکی فێنکە، شەقامەکان وەک جاران جەنجاڵ نین، بە هێمنی ڕووە و باکوور دەکەومە ڕیَ. سەر بەرزدەکەمەوە و پۆلێک باڵندەی سەیر دەبینم بەسەر سەرمدا دەفڕن.هەرگیز ئەو باڵندانەم لە دیلاوار نەبینیوە، وەک بزانن چ خۆشحاڵم لە بینینیان، دێن و بەسەر سەرمدا دەفڕن و دەگەڕێنەوە، من دەوەستم و تەماشایان دەکەم... خەیاڵم لای باڵندە هەرە گەورەکەی مامۆستا سوهەیبە، خەیاڵم لای پەڕێکی نوێیە بۆ ئەو باڵندە گەورەیە. دەبینم کە باڵندەکان بەرزدەبنەوە، دەبینم لە ئاسماندا گێژ دەخۆن، دەبینم دوو جار بە بەرزیدا خولدەخۆن و دەگەڕێنەوە... وەک بزانن چاوەڕوانی

چیم... وەک بزانن بۆ وەستاوم و سەیریاندەکەم...من دەڕۆم و ئەوان بۆ دوور دەفڕن، دەڕۆم و لە یادم دەچنەوە... بەڵام سەیری سەر شانم دەکەم و دەیبینم، دەست درێژژژژ دەکەم ... دەست درێژ دەکەم و پەڕێکی قەشەنگ لەسەر شانم هەڵدەگرم، جوانترین پەڕێک تا ئێستا بە چاوانی خۆم دیبێتم، سەرسام سەیری ڕەنگەکانی دەکەم، وەک مامۆستا سوهەیب دەڵێم «وای خالق لەو ڕەنگانە». پەڕەکە دەگرم بە دەستمەوە و بە خێرایی بەرەو باکوور دەڕۆم... بەرەو غەفاریی... بەرەو لای باڵندەکەی مامۆستا سوهەیب... باڵندەیەک کە دەبێت لە پەڕی ناوازەی هەموو باڵندەکانی دونیا دروست ببێت... باڵندەیەک کە ئەفسانەیە و ئەفسانەش نییە. من بەخۆم دەڵێم، خێراکە، خێرا، بەرەو لای باڵندەکەمان... بەرەو باکوور ... بەرەو غەفاریی... بەرەو غەفاریی... هەنگاو هەڵدەهێنم و دەڕۆم، خێراتر و خێراتر و خێراتر و خێراتر ....

# کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | بنەڕەتەکانی فەلسەفە | حەمید عەزیز | |
| ٢ | کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە (چ٢) | فەرهاد پیرباڵ | |
| ٣ | ڕێبازە ئەدەبییەکان (چ ٢) | فەرهاد پیرباڵ | |
| ٤ | مۆزەخانەی پاکیزەیی | ئۆرهان پامۆک | بەکر شوانی |
| ٥ | نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٦ | ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی (چ٢) | جەعفەر عەلی | |
| ٧ | سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | جەعفەر عەلی | |
| ٨ | مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... (چ٢) | ئەحمەدی مەلا | |
| ٩ | نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ١٠ | کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین حوسەینی<br>هیوا عومەر |
| ١١ | کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١٢ | فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٣ | شۆرشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |
| ١٤ | دەسەڵات و جیاوازی | مەریوان وریا قانع | |
| ١٥ | لە چ ئێستایەکدا دەژین | مەریوان وریا قانع | |
| ١٦ | شوناس و ئاڵۆزی | مەریوان وریا قانع | |
| ١٧ | سیاسەت و دونیا | مەریوان وریا قانع | |
| ١٨ | جەمشید خانی مامم | بەختیار عەلی | |
| ١٩ | کەشتی فریشتەکان (کتێبی ١) | بەختیار عەلی | |
| ٢٠ | کەشتی فریشتەکان (کتێبی ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٢١ | لە دیارەوە بۆ نادیار | بەختیار عەلی | |
| ٢٢ | وەک باڵندەی ناو جەنگەڵە ترسناکەکان | بەختیار عەلی | |
| ٢٣ | چێژی مەرگدۆستی | بەختیار عەلی | |
| ٢٤ | مەعریفە و ئیمان | بەختیار عەلی<br>هێمن قەرەداخی | |
| ٢٥ | دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندییەکانی ئەمریکاو... | گۆران ئیبراهیم صاڵح | |
| ٢٦ | سەمەرقەند (چ٢) | ئەمین مەعلوف | ئەحمەدی مەلا |
| ٢٧ | وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٢٨ | ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٢٩ | گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٠ | مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | جەمال ڕەشید<br>فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣١ | منداڵانی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٢ | مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٣٣ | پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٣٤ | مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٣٥ | سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا ڕەشید کەریم | |
| ٣٦ | شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٣٧ | کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٣٨ | فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانع | |
| ٣٩ | فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانع | |
| ٤٠ | دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانع | |
| ٤١ | کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانع | |
| ٤٢ | کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٤٣ | زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٤٤ | فرانسیسکۆس قەدیسی من (چ٢) | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٤٥ | ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |
| ٤٦ | شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ڕیمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٤٧ | من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |

| ٤٨ | میرنامە (چ٢) | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
|---|---|---|---|
| ٤٩ | ڕووخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | ڕووناک شوانی |
| ٥٠ | قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥١ | خەونی پیاوە ئێرانییەکان و کەوتنی بۆرە قەلا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٢ | گر گن | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٥٣ | ١٩٨٤ (چ٢) | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٥٤ | سوور و ڕەش | ستاندالْ | سیامەند شاسواری |
| ٥٥ | دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٥٦ | جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٥٧ | جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٥٨ | ئێوارستان | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٥٩ | دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٠ | ئێوارەی پەروانە (چ٦) | بەختیار عەلی | |
| ٦١ | شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٢ | مەرگی تاقانەی دووەم (چ ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٦٣ | کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٦٤ | تا ماتەمی گوولْ.. تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٥ | سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٦ | ئاورەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٦٧ | غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٨ | ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩ | دواهەمین هەناری دونیا (چ ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠ | ئێمەی پەنابەر | کۆمەڵێ نووسەر | |
| ٧١ | گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢) | عەتا نەهایی | |
| ٧٢ | عێراقییەک لە پاریس | سەمۆئێل شەمعون | سەباح ئیسماعیل |
| ٧٣ | جیهانی سۆفیا و فەرهەنگی سۆفیا (چ٤) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٤ | کچەی پرتەقاڵ (چ٣) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٥ | لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٦ | کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٧ | نهێنی یاری کاغەز (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٨ | مایا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٧٩ | ئینسایکلۆپیدیایەکی مێژوویی وێنەدار | کۆمەڵێ نووسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٨٠ | فەلسەفەی بوون | محەمەد کەمال | |
| ٨١ | وەک ڕووبارە بەخورەکە | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٨٢ | دیارییە مەزنەکە | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٨٣ | سیشەممان لەگەڵ مۆریی | میچ ئەلبۆم | جوتیار ژاژڵەیی |
| ٨٤ | دوالیزمی دژ یەک لە هۆنراوە لیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و... | لهۆن قادر عەبدولڕەحمان | |
| ٨٥ | ڕووناک وەک ئەوین، تاریک وەک مردن | مەمەد ئوزون | وریا غەفووری |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨٦ | کاندید | ڤۆڵتێر | بەیان سەلمان |
| ٨٧ | باوکە گۆریۆ | بەلزاک | ئەحمەدی مەلا |
| ٨٨ | زێبرا | جەبار جەمال غەریب | |
| ٨٩ | مَنداڵی سووتاو | ستیگ داگەرمان | دلاوەر قەرەداغی |
| ٩٠ | وڕێنە | ئەنتۆنیۆ تابوکی | عەتا محەمەد |
| ٩١ | مردن لە ڕوانگەی ئایینەکانەوە | بوساحە ئەحمەد | دانا مەلا حەسەن |
| ٩٢ | گوێ بگرە، پیاوی بچووک | ویلهێلم ڕایش | خەبات عارف |
| ٩٣ | ڕێبەری کتێبسازە کوژراوەکان | عەتا محەمەد | |
| ٩٤ | کچە فیلم گێڕەرەوەکە | هێرنان ڕیڤێرا لێتێلیێر | عەتا محەمەد |
| ٩٥ | باوکی ئەو | پەرینوش سەنیعی | ڕووناک شوانی |
| ٩٦ | داوێنپیسی | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٩٧ | کیمیاگەر (چ٢) | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٩٨ | ڕۆژهەڵاتی عەدەن، ڕۆژئاوای خودا | محەمەد ماغوت | حسەین لەتیف<br>کارزان عەلی |
| ٩٩ | خۆشی پیشەی من نییە (چ٢) | محەمەد ماغوت | حسەین لەتیف<br>کارزان عەلی |
| ١٠٠ | خیانەت لە نیشتمانەکەم دەکەم | محەمەد ماغوت | حسەین لەتیف<br>کارزان عەلی |
| ١٠١ | ڕۆژژمێری کیژۆڵەیەک | ئان فرانک | عەلی عوسمان یاقووب |
| ١٠٢ | مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢) | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ١٠٣ | تۆ مەچۆ بۆ شەڕ (چ ٢) | ماردین ئیبراهیم | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٤ | سەگوەڕ (چ ٥) | محەمەد موکری | |
| ١٠٥ | چاوەکانی (چ١٠) | بوزورگ عەلەوی | ئازاد بەرزنجی |
| ١٠٦ | A-6171<br>من لە ئاوشفیتز دەرباز بووم | فێرێنک گوێندوێر | عەتا محەمەد |
| ١٠٧ | باراباس | پێیێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ١٠٨ | تۆڵە | محەمەد موکری | |
| ١٠٩ | سڵاو؟ کەس لەوێیە؟ (چ٢) | یۆستاین گاردەر | سیروان مەحمود |
| ١١٠ | هەورەکانی دانیال | بەختیار عەلی | |

